# برایانی کارامازۆف

## (٢)

**فیۆدۆر داستایێفسکی**

وەرگێڕانی
ئەمین گەردیگلانی








**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **برایانی کارامازۆف (٢)**
- **نووسینی:** فیۆدۆر داستاییێفسکی
- **وەرگێڕانی:** ئەمین گەردیگلانی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** ئاسۆ مامزادە
- **پیتچنین:** شاسەنەم
- **ژمارەی سپاردن:** ١٣٥٩
- **نرخ:** ١٥٠٠
- **چاپی یەکەم :** ٢٠٠٧
- **تیراژ:** ١٥٠٠
- **چاپخانە:** چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٢٦٦)**

**هەموو مافێکی بۆ دەزگای موکریانی پارێزراوە**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

## بەرگی دووەم


کتێبی هەشتەم: میتا ............ ٦٠٣

کتێبی نۆهەم: لێپرسینەوەی سەرەتایی............ ٧٣٥

**بەندی چوارەم**

کتێبی دەیەم: منداڵەورکە ............ ٨٤٠

کتێبی یازدەهەم: ئیوان فیۆدۆرۆویچ............ ٩٢١

کتێبی دوازدەهەم: حوکمی ناهەق............ ١٠٧٩

**پاشینە**............ ١٢٣٩

# (١)

## کۆزما سامسانۆڤ

بەڵام دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، نەیدەزانی گرووشنکا چووە بۆ کوێ و بەجارێ تووشی شڵەژان بووبوو و ئارا و قارای لێهەڵگیرابوو، نەشیدەزانی گرووشنکا کاتی باڵگرتن بەرەو ژیانی تازە، دوایین سڵاوی خۆی بەجێ هێشتووە و «فەرمان»ی داوە بە هیچ شێوەیەک ئەو یەک سەعاتە خۆشەویستییە لەبیر نەباتەوە.

لە ماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا وا کەوتبووە ژێر گوشاری ڕۆحی و خەیاڵی ناخۆش لەوانەبوو بەهۆی تاویاوی مێشکەوە لە پێ بکەوێ. ئەوەش دواتر خۆی گێڕایەوە. ئالیووشا نەیتوانیبوو بەیانیی ڕۆژی پێشوو بیدۆزێتەوە، و ئیوانی براشی هەر ئەو ڕۆژە لە مەیخانەکە چاوی پێی نەکەوتبوو. دەرو جیرانەکانیشی لە سەر داوای خۆی ڕاستیان نەدەگوت چۆن و کەنگێ هاموشۆ دەکات. ئەو دوو ڕۆژە وەک خولخولە بە هەموو لایەکدا هەڵسووڕا بوو و وەک دواتر خۆی گوتی «لەگەڵ چارەنووسم کەوتبوومە کێشە و هەوڵمدەدا خۆم دەرباز کەم.» تەنانەت چەند سەعاتیش بۆ بەڕێوەبردنی کارێکی خێرا وەک بای شەماڵ لە شار چووبووە دەرێ، چونکە چاو هەڵگرتن لە سەر گرووشنکای بۆ تاقە سەعاتێکیش پێتامڵ نەدەکرا. ئەوەشی دواتر بە تێرو تەسەلی گێڕاوە و بە دەلیل و بەڵگەوە سەلماندی. بەڵام ئێستا تەنیا دەچینە سەر باسی ڕووداوە بنەڕەتییەکانی ئەو دوو ڕۆژە سامناکە، چونکە نیشاندەری کارەساتێکی ترسناک بوو و زۆر لە ناکاو بە سەریدا کەوتبوو. ئەگەرچی گرووشنکا بەڕاستی ماوەی سەعاتێک بە دڵ و بە گیان خۆشی ویستبوو، هێندێ جاریش زۆر دڵڕەقانە و بێبەزەییانە ئازاری دەدا.

له هەمووشی خراپتر ئەوە بوو نەیدەزانی گرووشنکا چ خەیاڵێکی لەسەردایە. زاڵ بوون بە سەریشیدا بە زۆری یان بە خۆشی مەحاڵ بوو: کەوی نەدەبوو. ئاکامەکەشی ئەوە بوو بە تووڕەیی ڕووی وەردەگێڕا و دەڕۆیشت. میتیا ئەوەشی بە باشی بۆ دەرکەوتبوو. هەستیشی پێکردبوو، بە ڕاستیش هەر وابوو، دەیزانی کە گرووشنکاش تووشی کێشەیەکی دەروونی هاتووە و واسەری لێشێواوە و زەینی ئاڵۆز بووە خۆشی نازانێ چدەکا. هەر بۆیە بە دڵێکی شکاوەوە بۆی دەرکەوت کە گرووشنکا دەبێ ماوەیەک لە ئەو و لە ئەشقە ئاگرینەکەی بێزار بووبێ. ڕەنگە هەرواش بووبێ، بەڵام نەیدەزانی گرووشنکا بۆ ئەوەندە پەرۆش و دڵەدوایە. لە دڵی خۆیدا ئەو پرسیارە پڕ ئازارەی بەخۆی و فیۆدۆر پاولۆویچی باوکییەوە پێوەند دەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا جێی خۆیەتی سەرنج بدەینە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگر: بە تەواوی باوەڕی کردبوو کە فیۆدۆرپاولۆویچ دەیهەوێ گرووشنکا بە دەست بگرێ. ویدەچێ ئەو داوایەشی کردبێ، بەڵام هەرچی دەکرد نەیدەتوانی باوەڕ بکا کە ئەو پیرە تۆلازە بە هیوایە بە سێ هەزار ڕۆبڵ بە ئامانجی خۆی بگا. میتیا بە ناسینی گرووشنکا و تێگەیشتن لە خووخدەی بەو ئاکامە گەیشتبوو. هەر بۆیە جاروبار بەو یەقینە دەگەیشت کە تەواوی پەرۆشی و دڵەخورپەی گرووشنکا ئەوەیە نازانێ کامیان هەڵبژێرێ و کامیانی زیاتر بە قازانجە.

سەیرە لە ماوەی ئەو چەن ڕۆژەدا بۆ جارێکیش بە بیریدا نەهاتبوو کە کۆنە مێردەکەی خەیاڵی گەڕانەوەی کتوپڕی هەیە. یانی هەر ئەو کەسەی کە شوێنێکی زۆر نەخس و ناپیرۆز لە سەر ژیانی گرووشنکا دادەنێ و ئەو خاتوونە بە دڵەخورپە و پەرۆشییەکی زۆرەوە چاوەڕوانی بوو. لە ڕاستیدا ماوەیەک بوو گرووشنکا لەو بارەوە گوێی خۆی لێخەواندبوو و ناویشی نەدەهێنا. لەگەڵ ئەوانەشدا، میتیا خەبەری ئەو نامەیەی بوو کە مانگێک لەمەوبەر گەیشتبووە دەستی و لە زمانی خۆشی بیستبوو. هەتا ڕادەیەکیش دەیزانی ناوەڕۆکی نامەکە چییە. گرووشنکا جارێک بە بێزاری پیشانی دابوو، بەڵام بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە بۆی دەرکەوتبوو کە گرنگایەتییەکی ئەوتۆی پێنادا. باسکردنی

ئەوەش کە بۆ ئاوا بوو، زۆر دژوار بوو. وادیارە ترسی دوژمنایەتی و کێشەی خۆی و باوکی لە سەر ئەو ژنە وای بەستبۆوە، کە نەیدەتوانی بیر لە شتێکی بەسام بکاتەوە. هەرچۆنێک بوو، بڕوای نەدەکرد خوازبێنیکەرێک دوای پێنج ساڵ خۆ شاردنەوە، دیسان قوت بێتەوە، چبگا بە سەرهەڵدانی تروسکەی ئۆخژن و ئۆقرە گرتن. جگە لەوەش، لە یەکەمین نامەی ئەو ئەفسەرەدا کە میتنکا چاوی پێی کەوتبوو، ئاماژەیەکی زۆر کورت و تەماوی بە ڕەقیبە تازەکەی و چاوپێکەوتنی کرابوو. نامەکە زۆر بەتام و خۆی و پڕ لە هەست و سۆزی ئاشقانە بوو. دەبێ سەرنجبدەین کە گرووشنکا دواپین دێڕەکانی نامەکەی لە میتیا شاردەوە کە بە ڕوونی باسی گەڕانەوەی کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆر دواتر وەبیری هاتەوە، لەو ساتەدا هەستی بە پەستییەکی بێئیختیار کردبوو لە ڕوخساری گرووشنکادا، کە ئەوەیش لەبەر ون بووە سیبریاییەکەی. گرووشنکا داوتر باسی نێوانی خۆی و ئەو ڕەقیبەی بۆ میتیا نەگێڕایەوە. هەر بۆیە وردە وردە بە تەواوی ئەو ئەفسەرەی لەبیر چووبۆوە. هەستی دەکرد هەرچییەک لە داهاتوودا ڕووبدا و بارودۆخەکە بە هەرلایەکدا بشکێتەوە، شەڕی نێوان خۆی و باوکی نزیکە و بەر لە هەموو شتێک، دەبێ بڕیاری لە سەر بدرێ. بە دڵێکی شکاوەوە سات لە دوای سات چاوەڕوانی بڕیاری گرووشنکا بوو، لە سەر ئەو باوەڕەش بوو کە لە ناکاو بەهۆی پاڵنەرێکی کتوپڕەوە، وەڕاست دەگەڕێ. لە ناکاو پێیدەڵێ: «بمبە لەگەڵ خۆت، هەتا هەتایە هی تۆم،» هەموو شتێکیش تەواو دەبێ. ئەویش داگیری دەکا و لەگەڵ خۆی دەیبا بۆ ئەوسەری دنیا. ئاخ، ئەو کاتە لەڕێوە لەگەڵ خۆی دەیبا. زۆر دووری دەبا، ئەگەر نەیبا بۆ ئەوسەری دونیاش، بۆ دوورترین شوێنی ڕووسیای دەبا. ئەو کاتە مارەی دەکات و بە ناوێکی خوازراوەوە لەگەڵ ئەودا ماڵ و ژیان پێکەوە دەنێن. وا خۆیان شرت و گوم دەکەن هیچکەس پێیان نەزانێ. لێرە و لەوێ و لە هەرکوێ بن. ئەو کاتە، ئاخ، ئەو کاتە. ژیانێکی تازە دەستپێدەکەن! هەموو ساتێک بە گوڕ و تینەوە خەون بەو ژیانە جیاواز و شیرینەوە دەبینن کە «پڕ لە سەربەرزییە» («دەبێ پڕ لە پاکی و سەربەرزیش بێ») تینووی ئەو ڕاسان و نوێ بوونەوەیە بوو. لەدەست ئەو

زەلکاوە گەمارە وەزاڵە هاتبوو کە بێئیختیار بە ناخیدا ڕۆچووبوو، وەکو زۆربەی خەڵکیش لە بارودۆخێکی وادا، زیاتر لە هەموو شتێک پێیخۆش بوو شوێنی نیشتەجێ بوونی بگۆڕدرێ. ئەگەر لەبەر خاتری ئەو خەڵکە نەبوایە، ئەگەر لەبەر خاتری ئەو بارودۆخە نەبوایە، ئەگەر لەو شوێنە تووک لێکراوە دەرباز بووبایە و دوور کەوتبایەتەوە - وەک تازە لەدایکبووبێ وادەبوو، ڕێگایەکی نوێی دەگرتە بەر. ئەوە بوو ئەو شتەی کە ئیمانی پێی هەبوو و ئۆقرەی لێبڕیبوو.

بەڵام ئەم تاسەمەندییە دەبوو هەلێکی لەباری بۆ بڕەخسێ، یانی ئەو گرفتە بە خێر و خۆشی چارەسەر بکرێ، شتێکی دیکەش هەبوو، یانی کۆتاییەکی جیاواز و سامناک. یان کتوپڕ لەوانەبوو، گرووشنکا پێیبڵێ: «بڕۆ وازم لێبێنە، ئیتر لەگەڵ فیۆدۆرپاولۆویچ پێکهاتووین و دەمەوێ شووی پێبکەم و تۆم هەر ناوێ» - جا ئەو کاتە... بەڵام ئەو کاتە... بەڵام میتیا نەیدەزانی ئەو کاتە چی دەقەومێ و هەتا دوایین سەعاتیش نەیدەزانی. پێویستە بە قازانجی ئەو ئەمەش بڵێین. قەستێکی دیاریکراوی نەبوو، پیلانی جینایەتێکیشی دانەڕشتبوو. تەنیا کاری چاوەچاو کردن و سایەدبوون بوو لە نێوان ئەو ڕەنج و ئازارەدا و هەر لەو کاتەشدا خۆی بۆ هەلێکی لەبار ئامادە دەکرد. یانی چارەسەر بوونی چارەنووسی بەخێر و خۆشی. لە ڕاستیدا هەموو بیرۆکەیەکی دیکەی لەخۆی دەتاراند. بەڵام بۆ کۆتاییەکی ئاوا دڵەڕاوکێیەکی جیاواز سەری هەڵدا، گیرو گرفتێکی تازە و لەناکاو، هەروەها نەخس و گرێپووچکە ئاسایی بەر بینگی پێگرت.

ئەگەر گرووشنکا گوتیشی «من بۆ تۆ باشم، بمبە لەگەڵ خۆت، » چۆن دەیتوانی لەگەڵ خۆی بیبا؟ پارە لە کوێ بێنێ؟ هەر لەو کاتەدا بوو تەواوی ئەو سەرچاوەی داهاتانەی لەلایەن فیۆدۆرپاولۆویچەوە، وەک کۆمەگ خەرجی ساڵانێک بوو بەردەوام دابین دەکرا، لێی هەڵبڕی. هەڵبەت گرووشنکا پارەی هەبوو، بەڵام میتیا لەوبارەوە زۆری خۆی بە ڕۆحزل دەزانی و دەیویست لە سەر خەرجی خۆی بیگوێزێتەوە و چاوی لە دەستی ژنەکەی نەبێ. هەروەها بە

غروورێکی پیاوانەوە ژیانی هاوبەشی پێکبێنێ. نەیدەتوانی بیریشی لێبکاتەوە کە ڕۆژێک چاوی لە دەستی گرووشنکا بێ و تەنانەت بێزی لە بیر لێکردنەوەکەشی هەڵدەستا. ئەو ڕاستییە ناشارمەوە و لێرەدا ناشمهەوێ شییکەمەوە، تەنیا ئەوەندە دەڵێم لەو کاتەدا هەڵوێستێکی ئاوای گرتبوو. لەوانەیە هەمووشی بە شێوەی ناڕاستەوخۆ و بێئیختیار بووبێ و بە هۆی هەڵگرتنی ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەی کاترینا ئیواناوە کەوتبێتە بەر چزووی نهێنیی ویژدانی خۆی. هەروەک دواتر خۆی باسیکرد لەو کاتەدا هەستی وابووە: «دەرهەق بە یەکیان مرۆڤێکی هەرزە و خوێڕی بووم و دیسان دەرهەق بە ئەوی دیکەشیان هەروا دەبم. هەر کاتێکیش گرووشنکا ئەوەی بۆ دەردەکەوێ، مرۆڤێکی ئاوا خوێڕی و هیچوپووچ بە هیچ نازانێ» کەوایە چبکا و ڕوو لە کوێ کات. چۆن دەرووییەکی بۆ دەکرێتەوە و ئەو پارە دوابڕاوەی وەگیر دەکەوێ؟ بەبێ ئەوەش هەموو شتێکی لەکیس دەچوو و کارەکەی سەری نەدەگرت، «ئەویش تەنیا بەو هۆیەوە کە پارەم بەدەستەوە نەبوو، بەجارێ تووشی شەرمەزاری دەبووم.»

با ئەوەش لە پێشدا بڵێم کە میتیا، ڕەنگە زانیبێتیشی پارەکەی چۆن وەگیر دەکەوێ، هەروەها دەشیزانی لەو کاتەدا پارەکە لەکوێیە. لێرەدا لەوە زیاتر لە سەر ئەو مەسەلەیە ناڕۆم. چونکە دواتر ڕوون دەبێتەوە. بەڵام گرفتە سەرەکییەکەی هەرچۆنێک بێ ناچارم ئاماژەیەکی پێبکەم، ئەویش هەڵگری ئەو ڕاستییەیە کە بۆ وەدەستهێنانی ئەو پارەیە کە بە شوێنەکەی دەزانی و هەقی خۆشی بوو بیستێنێ، سەرەتا دەبوو ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەی کاترینا ئیوانا بداتەوە. ـ دەنا «دەڵە دزێکی هیچو پووچم و نامەوێ ژیانی نوێ وەک مرۆڤێکی هەڵە و هەرزە دەستپێبکەم.» کەوایە بڕیاریدا بۆ دانەوەی ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەی کاترینا ئیوانا خۆ بە ئاووئاوردا دا و زەمین و زەمان بشڵەقێنێ. لە دوایین ساتەکاندا بڕیاری سەرکیی دا ئەویش دوای ئاخافتنەکەی لەگەڵ ئالیووشا، دوو ڕۆژ پێشتر، لە سەر شاڕێ، عەسری ئەو ڕۆژەی کە گرووشنکا سووکایەتیی بە کاترینا ئیوانا کردبوو، میتیا دوای بیستنی ئەو قسانە لە زمانی ئالیووشا، دانی پیانابوو کە مرۆڤێکی هیچوپووچ و خوێڕییە و داوای لێکردبوو

ئەوە بە کاترینا ئیوانا بڵێ، هەڵبەت «ئەگەر زانیت دەبێتە هۆی دڵدانەوەی.» ئەو شەوە دوای هەڵبڕان لە براکەی، وەک شێت و هاری لێهاتبوو و هەستیکردبوو «دزی و کوشتوبڕ» چاکترە لەوەی «نەتوانم ئەو قەرزە بە کاترینا ئیوانا بدەمەوە. بە چاکتری دەزانم هەموو بە دز و پیاوکوژم بزانن، ڕۆیشتن بۆ بەندیخانەی سیبیریام پێباشترە لەوەی کاترینا ئیوانا بڵێ: «فریویدام و پارەکەمی دزی، کەڵکی لە پارەکەم وەرگرت، تا لەگەڵ گرووشنکا تێی تەقێنێ و ژیانێکی تازە و پڕ لە شادی و خۆشی دەستپێبکا! ناتوانم ئەو کارە بکەم!» میتیا لەکاتێکدا لێوی خۆی دەکرۆشت، ئەو بڕیارەی دا، لەوانەیە جاروباریش پێیوابووبێ شێتبووە. بەڵام هەر لەو کاتەدا کێشە و هەرای ساز کرد...

سەیریش ئەوەیە، پیاو پێیوابوو بەجارێ هیوابڕاو بووە - چونکە بۆ پەیدا کردنی پارەیەکی وا هیچ شانسێکی نەبوو - زۆریش بەهیوا بوو کە ئەو سێ هەزار ڕۆبڵە وەدەستدێنێ و بە پێی خۆی بۆی دێتەماڵێ، هەروەک لە ئاسمانەوە بۆی داباری. ئەمەش ڕاست نەقڵی کەسانێکی وەک دیمیتری فیۆدۆرۆویچە، کە هیچ کارێکیان بە پارە نەبووە، جگە لە هەڵەخەرجی و بە ئاوەدانی ماڵ و میراتێک کە پێیان براوە و هەر نازانن پارە چۆن پەیدا دەبێ. دوو ڕۆژ لەمەوبەر، دوای ئەوەی لە ئالیووشا هەڵبڕا، خەیاڵێکی تاڵ و پڕ لە ناهومێدی زەینی داگرت و تووشی ئاڵۆزی و شڵەژانێکی ڕۆحی بوو. هەر لەبەر ئەوەش بوو لەڕێوە بیری لە کارێکی شێتانە کردەوە. ڕەنگە بۆ کەسانێکی وەک ئەو بارودۆخێکی ئاوا، بەر لە هەموو شتێک تووشی بیر کردنەوە لەو جۆرە پیلان و کردەوە مەحاڵ و بێبنەمایەیان بکا و بە گونجاوترین ڕێگە چارەشی بزانێ.

لەناکاو بڕیاریدا بچێ بۆلای سامسانۆف، هەر ئەو بازرگانەی پارێزەری گرووشنکا بوو. «پیلان»ێکی پێ پێشنیار بکا و بە هۆی ئەوەوە تەواوی ئەو گوژمە پارەیەی پێویستییەتی یەکجێ لێی وەرگرێ. گومانی لە پڕ بایەخ بوونی پلانەکەی نەبوو. تەنیا دڵ لە دڵدانی ئەوە بوو کە سامسانۆف چۆن دەڕوانێتە پلانەکەی. ئەگەرچی میتیا ئەو تاجرەی بە ڕواڵەت دەناسی، بەڵام ئاشنایەتیی لەگەڵی نەبوو قەتی قسە لەگەڵ نەکردبوو. بەڵام بە هۆیەکی نامەعلوومەوە، لەمێژ

بوو لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەو پیرە خەرەفاوە کە پێی لە لێوی گۆڕە، ڕەنگە ئێستا ڕازی بێ گرووشنکا بکەوێتە بارودۆخێکی ئابروومەندانەوە و لەگەڵ پیاوێک زەماوەند بکا کە «بۆی ببێتە یار و پشتیوان.» لە سەر ئەو باوەڕەش بوو کە نەک یارمەتییەکی باشی دەدا. لە ڕێی دەمگۆ، یان ڕەنگە قسەی کتوپڕی گرووشنکاوە کە جاروبار لە دەمی دەردەچوو، کە سامسانۆف ئەوی لە فیۆدۆرپاولۆویچ پێ باشترە و پێیوایە شوو بەو بکات بە قازانجی ۰.ەتی. ڕەنگە زۆربەی خوێنەرانی ڕۆمانەکەم پێیان وابێ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ زۆر خاوو خلیچکانە خۆی نیشان داوە، کە بە هیوای یارمەتییەکی ئاوا بووە و ویستوویە ژنە لە پارێزەرەکەی بستێنێ. هەر ئەوەندەش وەبیر دێنمەوە کە میتیا ڕابردووی گرووشنکای بە یەکجاری لە زەینی خۆیدا سڕیبۆوە. ئەو ڕابردووەشی بە چاوێکی دڵسۆزانە دەدی و بەوپەڕی ئەشق و کوڵوکۆوە بەو ئاکامە گەیشت کە سازبوونی گرووشنکا و دەربڕینی هەستی خۆشەویستی و ڕازی بوونی سەرچاوەی خوڵقانی گرووشنکایەکی نوێیە و دیمیتری فیۆدۆرۆویچی نوێش هەرچی خوێڕییەتییە وەلای ناوە و سەر تا پای گەورەیی و ماریفەتە. لە یەکتر دەبوورن و ژیانێکی تازە و شیرین دەستپێدەکەن. بەڵام دیمیتری بە چاوێک لە کۆزما سامسانۆفی دەڕوانی کە شوێنێکی نەخسی لە سەر ڕابردووی گرووشنکا داناوە، ئەگەرچی گرووشنکا قەتی خۆش نەویستبوو و ئێستاش دڵی لە داوی ئەشقی ڕابردوویدا بوو، لە پیاوەتی کەوتبوو و وەک دەڵێن وشکاوی هاتبوو. هەر بۆیە میتیا بە چاوی پیاوێک تەماشای نەدەکرد و هەموو خەڵکی شار دەیانزانی لانکە شکاوێکە و بەس. پێوەندیشی لەگەڵ گرووشنکا گۆڕاوە و پێوەندیی ئێستایان پێوەندییەکی باوک و کچانەیە، زۆر لەمێژە هەر بەو شێوەیە بووە.

وەلحاسڵ میتیا لەو بارەوە ساویلکەییەکی زۆری لە خۆ نیشاندا، چونکە لەگەڵ هەموو خراپییەکانی، مرۆڤێک بوو هیچی لەدڵدا نەبوو. بۆ سایلۆحییەکەشی هەر ئەوەندە بەسە کە بە تەواوی پێیوابوو کۆزمای پیر عومری پیرە مەڕێکی ماوە و سادقانە تۆبە لە ڕابردووی خۆی و پێوەندییەکانی لەگەڵ گرووشنکا دەکا

و گرووشنکاش دۆست و پارێزەرێکی سەر لە پێناوی جگە لەو پیرە پیاوە بێئازارەی ئێستای لە دنیادا نییە.

دوای ئاخافتەنەکەی لەگەڵ ئالیووشا، شەو و نیوەشەو لە سەر ڕێگا چاوی لێکنەدەنا و سەعات دەی سەرلەبەیانیی ڕۆژی دوایی لە ماڵی سامسانۆف بوو و داوای لە پێشخزمەتەکە دەکرد، هاتنەکەی ڕاگەیێنێ. ماڵێکی دووقاتیی زۆر کۆن و گەورە و خەفە بوو. وەتاغی تایبەتی خزمەتکارانیشی هەبوو. لە قاتی خواروودا دوو کوڕی خاوەن ژن و ماڵی سامسانۆف و بنەماڵەکەیان و خوشکە پیرەکەی و کچە شوونەکردووکەی، دەژیان. دوو کەس لە نووسیارەکانی لە ژووری خزمەتکاراندا دەژیان، کە خاوەن ژن و ماڵ بوون. ژووری خزمەتکارانیش و قاتی خوارووش زۆر پڕ خێزان بوون، بەڵام پیرە پیاو قاتی سەووری بۆ خۆی دانابوو و تەنانەت ئیزنی بە کچەکەشی نەدەدا بچێتە سەرێ و لەگەڵیدا بژی. ئەگەرچی کچەکەی خزمەتی دەکرد و کاتی هەناسە سواربوون و نەخۆشی و هەرکاتێک بانگی بکردبایە ناچار بوو بە هەڵەداوان وەسەر کەوێ.

قاتی سەروو وەتاغی گەورەی هەبوو و ڕواڵەتێکی تەواو ڕازاوەیان پێوە دیار بوو و بە شێوازێکی لە باوکەوتووی بازرگانانە ڕازێندرابۆوە، لە بن دیوارەکانی کورسیلەی درێژۆکەی دارین بە ڕیز داندرابوون. چلچرای شووشەیی و ئاوێنەی غەور گرتوو بە دیوارەکانییەوە هەڵواسرا بوون. هەموو ئەو وەتاغانە خاڵی و خۆڵی بوون و کەسیان لێ دانەدەنیشت. چونکە پیرە هەر لە وەتاغێکی چکۆلەدا دەژیا و کڵفەتێکی پیری لەچکە بە سەر و کوڕێکی لە داڵانەکە لە سەر کورسیلەیەک دادەنیشتن و هەر کارێکی ببوایە بۆیان ئەنجامدەدا. پیرە پیاو لاقوقولی وەک خیگە ماسی بوو و نەیدەتوانی بە ڕێدا بڕوا. جاروبار لە سەر کورسیلە چەرمینە پێچکە دارەکەی هەڵیان دەستاند، ئەویش کاتێک کە کڵفەتەکەی دەچووە ژێر پیلی و دوو سێ جار ئەمسەر و ئەوسەری ژوورەکەی پێدەکرد.

کاتێک کە هەواڵی هاتنی «سەروان»یان پێدا، نەیویست چاوی پێبکەوێ، بەڵام میتیا پێداگریی کرد و دیسان کوڕەی ناردەوە سەرێ و گوتی بڵێ سەروان میتیا هاتووە. سامسانۆف لە کوڕەی پرسی: قەڵافەتی چۆنە؟ مەستە؟ خۆ شەڕی

بەدەستەوە نییە؟ کوڕە گوتی: مەست نییە، بەڵام نارِواتە دەرێ. پیرە پیاو دیسان پێیخۆش نەبوو چاوی بە چاوی بکەوێ. بەڵام میتیا پێشبینیی ئەوەی کردبوو بۆیە قەڵەم و کاغەزی لەگەڵ خۆی هێنابوو، بە خەتێکی خۆش ئەم وشانەی بۆ نووسی: «سەبارەت بە مەسەلەیەکی زۆر گرینگ، سەبارەت بە ئاگرافنا ئەلکساندرفنا هاتووم» بە کوڕەدا بۆ پیرە پیاوی ناردە سەرێ.

سامسانۆف دوای تۆزێ مات بوون، بە کوڕەی گوت میوانەکە بەرێتە ژووری میوانداری و پیرێژنی ناردە خوارێ تاکو کوڕە لاوەکەی خێرا بنێرێتە سەرێ. کوڕە، لاوێکی باڵابەرز و بەهێز بوو، سەر و ڕدێنی شەش تیخ تاشیبوو و بە شێواز و مۆدەی فەڕەنگی جلوبەرگی پۆشیبوو. ئەگەرچی باوکی هەمیشە پەستەک لەبەر و ڕیشن بوو. کوڕە هەر خێرا بە دەنگی باوکییەوە چوو و خۆی کرد بە ژوورەکەیدا. تەواوی ئەندامانی بنەماڵە بە ترس و لەرزەوە چاویان لە سامسانۆف دەکرد و کەس نەیدەوێرا قسە لە قسەیدا بکا. پیرە پیاو لە ترسی «سەروان» نەبوو کە ناردی بە دوای کوڕە ملکەڵەکەیدا، (چونکە ترسەنۆکی لە زاتیدا نەبوو). تەنیا لەبەر ئەوە بوو، ئەگەر پێویست بوو شایەدێکی هەبێ. کوڕەکەی و کوڕێژگە خزمەتکارەکە چوونە بن پیلی و بە لەقەلەق هێنایان بۆ وەتاغی میوانداری. دیار بوو هەستێکی کونچکاوانە شڵەژاندوویەتی و چاوڕەوانی شتێکە. ژووری میوانداری کە میتیا لەوێ چاوەڕێ بوو، وەتاغێکی گەورە و بەرژەوەند خۆش بوو و دڵت نەدەهات بێیە دەرێ. دوو ڕیزی پەنجێرە تێدا بوو و دیوارەکانی بەردی مەڕمەڕ و سێ چلچرای گەورەش بە دیوارەکەوە.

میتیا لای درگاکەوە لە سەر کورسیلەیەکی چکۆڵە دانیشتبوو. بێسەبرانە چاوەڕوانی چارەنووسی خۆی بوو. کاتێک پیرەپیاو لەلای درگاکەی ئەوبەرەوە وەدەر کەوت، میتیا خێرا قرچەپێ هەستا و بە هەنگاوی پتەو و نیزامییانە بەرەوپیری چوو. میتیا جلوبەرگێکی ڕێکوپێک و کوڵە باڵتەیەکی لەبەردا بوو، هەموو دوگمەکانی داخستبوو. دەستکێشی ڕەش لە دەستدا و کڵاوی تاسەیی لەسەردا، هەروەک سێ ڕۆژ لەمەوبەر کە هات بۆ حوجرەکەی پیری کلێسە، پیرەپیاو قورساخ و قیتوقۆز ڕاوەستابوو، میتیا هەروا کە دەچووە پێشێ

هەستیکرد ناخی پیرەپیاو دەخوێنێتەوە و تێی گەیشتبوو. میتیا کە چاوی بە ڕوخسارە پەنەماوەکەی سامسانۆف کەوت واقی وڕما. لچە ئەستوورەکەی ئەوەندەی دیکە شۆڕ بووبۆوە و دەتگوت کولێرەیە. بە بێدەنگییەکی قورساخانەوە کڕنۆشێکی بۆ میوانەکەی برد و داوای لێکرد لە سەر کورسیلەی تەنیشت قەنەفەکە دانیشێ، خۆشی هێزی دابووە سەر باسکی کوڕەکەی و لەگەڵ ئەوەی لەبەر ژانی جەستەی نالاندی، بە ئەسپایی لە سەر قەنەفەیەکی ڕووبەڕووی میتیا دایاننیشاند. میتیا کە زانی بۆتە هۆی زەحمەت و ئازاری ئەو پیرە خاوەن ویقارە، سووکوچرووکیی خۆی بۆ دەرکەوت و هەستی بە پەشیمانی کرد.

پیرەپیاو لەگەڵ ئەوەی لەجێی خۆی دانیشت، بە لەبزێکی جیددی و توند و ڕاشکاوانە، بەڵام بە ئەدەبەوە، گوتی: «کاکی خۆم چ کارێکت پێمە؟»

میتیا داچڵەکی، هەستا سەرپێ، بەڵام دیسان دانیشتەوە. پاشان بە دەنگێکی بەرز و تووڕە و ڕاوەشاندنی دەستی، کەوتە قسە. دیاربوو تووشی تەنگژە هاتووە و کەوتۆتە گێژاوێکەوە چنگ بۆ پەلەپووشێکیش دەبا و ئەگەر هیوا بڕاو بێ ئامادەی نوقم بوونە. سامسانۆف هەر بە دیتنی هەستی بەوە کرد، ئەگەرچی ڕوخساری وەک داوەڵێک وشک و بێجووڵە مابوو.

ـ حەزرەتی کۆزماکۆزۆویچی بەڕێز، بێگومان لە کێشەی نێوان من و فیۆدۆرپاولۆویچی باوکم ئاگاداری، کە تەواوی میراتەکەی دایکمی داگیر کرد و لە چنگی دەرهێنام. تەواوی خەڵکی شاریش ئەوە دەزانن... چونکە لێرە هەر ئەوەندەیە شتێکیان کەوتە سەر دەم... وەک دەهۆڵ دەنگدەداتەوە... لەوانەیە لە زمان گرووشنکاشت بیستبێ... داوای لێبووردن دەکەم، لە زمانی ئاگرافنا ئەلکساندرفنا.... ئاگرافنا ئەلکساندرفنا، خاتوونێک کە لە ڕادەبەدەر ڕێزم بۆی هەیە...

میتیا ئاوا دەستی بە قسەکرد و هەر لە یەکەم ڕستەوە زمانی کەوتە تەتەڵە کردن. وتەکانی وشە بە وشە داناڕێژینەوە، تەنیا ئاماژە بە خاڵە گرینگەکەی دەکەین. گوتی: «سێ مانگ لەمەوبەر بەپەلە (میتیا بە تایبەت ئەم وشانەی

لەجیاتی «بە ئانقەست» بەکار دەبرد) لە ناوەندی پارێزگا بۆ تەگبیر چوومە لای وەکیلێک، وەکیلێکی بەناوبانگە، ناوی "پاول پاولۆویچ کۆرنیلۆدۆف"ە. ڕەنگە ناویت بیستبێ. پیاوێکە خاوەنی بیر و باوەڕێکی ژیرانەیە و سیاسەت زانیشە... ئێوەش دەناسێ... بە ڕێزێکی زۆرەوە باسی ئێوەی دەکرد...» میتیا دیسان بێدەنگ بوو. بەڵام ئەم ڕاوەستانە لە درێژە پێدانی قسەی نەخست. هەر خێرا بە سەر باسە ئاساییەکاندا بازیدا و چووە سەر باسە پێوەندیدارەکان.

ئەم کورنیلۆدۆفە، دوای ئەوەی بە وردی پرسیار بارانی کرد، چاوی بەو بەڵگانەدا خشاند کە توانیبووی بیبا (میتیا سەرسەرەکی ئاماژەی بەو بەڵگانە کرد و بە پەلە بە سەریاندا تێپەڕی.) گوتی گوندی چێرماشنیا، کە هی دایکی بووە، یاسا بە دیمیتری دەدا و دەتوانن پێوشوێنی بگرن و لە چنگ ئەو پیرە دڵڕەشە، واتا باوکی، دەریهێنن و داخ بنێنە سەر دڵی... «چونکە هەموو درگاکانی لێدانەخرابوو و عەداڵەت دەیتوانی دەروویەکی بۆ بکاتەوە.» لە ڕاستیدا ئەو دەیتوانی شەش حەوت هەزار ڕۆبڵ لە باوکی بستێنێ. چونکە چێرماشنیا لانیکەم بیست و پێنج هەتا بیست و هەشت هەزار ڕۆبڵ دێنێ. ئەوە دەڵێم چی «سی هەزار ڕۆبڵ دێنێ، کۆزما کۆزۆویچ، بڕوام پێبکە ئەو کابرا دڵڕەقە حەڤدە هەزاریشی بۆ نەناردم!» هەر بۆیە میتیا کە سەری لە یاسا دەرنەدەچوو، وازی لە مەسەلەکە هێنا، بەڵام کاتێ هاتن بۆ ئێرە زۆر دڵڕەقانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کرد و ئەو کارە ناحەزەی باوکی برینی کولاندەوە و ناچار بوو دیسان شکایەتی لێبکاتەوە. (لێرەدا دیمیتری دیسان تووشی شڵەژان هات و بە سەر هێندێ باسوخواسی ئاساییدا بازیدا). «ئێستا جەنابی کۆزماکۆزۆویچ ئامادەی سێ هەزار ڕۆبڵم پێ بدەی و تەواوی ئەو مافە یاساییانەی هەمە وەعۆدەی بگری و ببیتە خاوەنی گوندی چیرماشینا؟... دڵنیابە ئێوە لەو مامەڵەیەدا تووشی زیان نابن. سوێند دەخۆم، بە ویژدانی هەرچی پیاوە لەو مامەڵەیەدا شەش حەوت هەزار ڕۆبڵ قازانج دەکەی، بەڵام ئەم مەسەلە گرینگە دەبێ هەر ئەمڕۆ یەکلایی بێتەوە. من لە نووسینگە بەڵگە و سەنەدەکانت بۆ ئیمزا دەکەم.... من ئامادەم بۆ هەموو کارێک و هەر بەڵگەیەکتان پێویست بێ ئیمزای دەکەم. ئەم گرێبەستەش

هەر ئەمڕۆ یەکلایی دەکەینەوە و کۆتایی پێ دێنین... ئەگەر بۆت هەڵدەسووڕێ، ئەگەر بۆت هەڵدەسووڕێ هەر ئەو ڕۆژە بەیانی... ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەم بدەیە. چونکە ئەم شارە هیچ دەوڵەمەندێکی لێنییە بتوانێ شان لە شانی ئێوە بدا. هەر بۆیە دەبنە هۆی نەجاتم... دەبنە هۆی نەجاتم. لە ڕاستیدا... ئەو کارە خێرەتان دەبێتە هۆی کڕینەوەی ئابڕووم... چونکە دڵم لێوڕێژە لە هەست و ڕێزێکی تایبەت بۆ کەسێک، ئەو کەسەش بە جوانی دەیناسن و وەک باوک چاوتان بە سەریەوە بووە. لەڕاستیدا ئەگەر ئەو دڵسۆزییە باوکانەی ئێوەم شک نەبردایە، نەدەهاتم. بەڕاستی لەم نێوانەدا کێشەکە کەوتۆتە بەینی سێ کەس، چونکە چارەنووس وایە - جەنابی کۆزماکۆزۆویچ، کێشەکە بە جێیەکی باریک گەیشتووە! ژیانی من لە دەستی دێوزمەیەکی دڵڕەشدایە. ئەوە ڕاستییەکە جەنابی کۆزماکۆزۆویچ، فریامکەوە، چونکە ئێوە ماوەیەکە پێتان کێشاوەتەوە و کێشەکە ئێستا بۆتە ململانێی دوو کەس. ڕەنگە ناشیانە بدوێم، چونکە نووسەر نیم. سەرنج بدە قوربان، من لایەنێکی کێشەکەم و ئەو ڕمووزنەش لایەنەکەی دیکەیە. کەوایە دەبێ دەسنیشانی بکەی، یان من یان ئەو ڕمووزنە. هەموو شتێک لە دەست ئێوەدایە - چارەنووسی سێ کەس و بەختەوەریی دوو... بمبوورە، بەجارێ دۆ و دۆشاوم تێکەڵ کردووە. بەڵام ئێوە تێدەگەن... بە چاوی پڕ کەرامەتتاندا دیارە... ئەگەر تێنەگەی و فریام نەکەوی بەجارێ لێم دەقەومێ... تکات لێدەکەم!» میتیا بەو «تکات لێدەکەم!»ە دەستی لە قسەی ناشارەزایانە هەڵگرت و لە جێی خۆی دەرپەڕی و چاوەڕوانی وەڵامە گەوجانەکەی خۆی بوو. لە کۆتاییی قسەکانیدا لە ناکاو تێگەیشت، تیرەکەی لە بەرد دراوە و لە هەمووشی گرینگتر، تەواوی قسەکانی وڕێنە بووە. لە ڕاستیدا ئاسنی ساردی کوتاوە.

«زۆر سەیرە! لە ڕێگا کاتێک دەهاتم بۆ ئێرە دەشمبڕی و دەشمدووری، بەڵام ئێستا وڕێنە و قسەی قۆڕە.» ئەو بیرە لە ناکاو بە زەینی ناهومێدی میتیادا تێپەڕی. لە تەواوی ماوەی قسەکردنی میتیادا پیرەپیاو جووڵەی نەکرد و بە شێوەیەکی ساردوسڕ چاوی تێبڕیبوو. دوای تاوێک بێدەنگی و چاو لە دەمی سامسانۆف بڕین، ئاخری بە لەبزێکی سارد و لێبڕاوانە و پڕ لە ناهومێدی گوتی:

- ببووره ڕۆڵەگیان ئێمە مامەڵەی ئاوا ناکەین.

میتیا لە ناکاو هەستیکرد بەری پێی دەرزی ئاژن دەکەن.

بە بزەیەکی سارد و سڕەوە، منجاندی: «ئەی قوڕی کوێ بە سەرما کەم، جەنابی کۆزماکۆزۆویچ؟ پێموایە ئیتر من لێم قەوما - بڕوام پێبکە قوربان.

- ببووره، کاکە...

میتیا کە لە جێی خۆی وشک بووبوو، لە ناکاو گۆڕانێکی لە ئەدگاری پیرە پیاودا هەستپێکرد و وەخۆ هاتەوە.

سامسانۆف لە سەرەخۆ گوتی: «گوێبگرە کاکی خۆم ئەو جۆرە مامەڵانە بۆ ئێمە نابێ. دادگا هەیە. وەکیل هەن - ئەوە گێرەوکێشەی بە دواوەیە. بەڵام ئەگەر پێت خۆش بێ، کەسێک هەیە دەتوانی بچی بۆ لای.»

میتیا بە زمان تێکەڵ هاتنەوە گوتی: «ئەک لەبەرت مرم! لە کوێیە؟ خودایە زۆر شوکور. کۆزماکۆزۆویچ تۆ فریشتەی نەجاتی.»

- لەم شارە نییە، یانی ئێستا لێرە نییە. لادێییەکە مامەڵەی دار و تەختە دەکا. ناوی "لیاگافی"یە. لە پارەکەوە لەگەڵ باوکت لە سەر ئەو دارستانەی چێرماشنیا چەنەچەنیانە و لە سەر قیمەتەکەی یەک ناکەون، ڕەنگە بیستبێتت. ئێستا - گەڕاوەتەوە و لە ئیلینسکۆ، نزیکەی هەشت فرسەخێک لە چاپارخانەی ولۆفیاوە دوورە. لەگەڵ قەشە پێکەوە دەژین. سەبارەت بە مامەڵەی دارستانەکە و بۆ ئەوەی بیروڕای من بزانێ نامەیەکی بۆ نووسیم. فیۆدۆرپاولۆویچ دەیهەوێ خۆی بچێت و چاوی پێی بکەوێ. بۆیە ئەگەر بەر لە باوکت بچی و ئەو پێشنیارەی بە منت کرد بە ئەوی بکەی لەوانەیە...

میتیا بە شڵەژاوی و جۆرێک نەشەی کتوپڕەوە، پەڕییە نێو قسەکانی: «بە خوای فکری چاکە! ئەو ئەو کەسەیە وا من لێی دەگەڕێم. مامەاڵەکەیان سەری نەگرتووە و باوکم قیمەتێکی زۆری لە سەر داناوە، ئێستا ئەو قەباڵە و بەڵگانەی بۆ بەرم و بزانێ بۆتە خاوەنی ئەو ملکە، لە خۆشیانا پێی وەعەرز ناکەوێ. هە، هە، هە!»

میتیا دای لە قاقای پێکەنین و سامسانۆفی داچڵەکاند. بە زمانێکی چەور و گەرموگوڕەوە نەڕاندی: «لە دەورت گەڕێم کۆزماکۆزۆویچ، قەتم ئەو چاکەیەی تۆ بۆ نادرێتەوە!»

سامسانۆف سەری داخست و گوتی: «چاکەی چیم کردووە قسەی وا مەفەرموو.»

ـ بەڵام تۆ نازانی لە چ تەنگژیەکت ڕزگار کردووم. ئاخ، لە دڵمی دابوو بێم بۆلای تۆ کارەکەم ڕاست دێنیَ... ئەو دەڕۆم بۆ لای ئەو قەشەیە! زۆرت سپاس دەکەم.

ـ کاکی خۆم سپاسی ناویَ.

ـ زۆر بە پەلە دەچم. بمبوورە بەو حاڵەوە تووشی زەحمەتم کردی. قەتم ئەو چاکەیەت لەبیر ناچیَ. ئەوە قسەی پیاوێکی ڕووسییە، کۆزماکۆزۆویچ پیاوێکی ڕووسی.

دیمیتری ویستی دەستی پیرەپیاو بگریَ و ماچیبکا. بەڵام لە ناکاو هەستی بە بریقەیەکی فێڵاوی کرد لە چاویدا. دەستی کێشا دواوە، بەڵام لەبەر ئەو دڕدۆنگییە لە دڵەوە خۆی لۆمە کرد و لەبەرخۆیەوە گوتی: «هی ئەوەیە نەخۆش و ماندووە.»

هاواریکرد: «لەبەر خاتری ئەو! لەبەر خاتری ئەو کۆزماکۆزۆویچ! خۆ دەزانی لەبەر خاتری ئەوە.» زایەڵەی دەنگی لە ژوورەکەدا دەنگی دایەوە. کڕنۆشێکی برد و وەرسووڕا، بە هەنگاوێکی پتەو بیَئەوەی ئاوڕ بداتەوە، ڕۆیی بۆلای درگاکە. لە خۆشیانا دەلەرزی.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «خەریک بوو بەجاریَ لە نێو دەچووم، فریشتەی نگابانم نەجاتی دام.» بازرگانێکی وەک سامسانۆف (ئەو پیرەپیاوە بەڕێز و قورساخە)، ڕێنوێنی کردووم، بۆیە... بۆیە دڵنیام کارەکەم بە دەستەوە دیَ. بە لەز وەڕیَ کەوت. «بۆ ئێواریَ دەگەڕێمەوە، هەتا شەویَ کارەکەم تەواو دەکەم.» هەروا کە بەرەو ماڵەکەی خۆی دەڕۆیشت بە سەرسوڕمانەوە پرسیی: «بڵێی پیرەپیاو بە کەری زانیبێتم؟» هەڵبەت لەوە زیاتر بیری لێنەکردەوە، جگە لەوەی پێشنیاری

«بازرگانێکی ئاوا» کە سەری لە مامەڵە دەردەچێ، دیارە لیاگافیش دەناسێ (چ نازناوێکە!) دیارە کارەکە سەر دەگرێ. بڵێی پیرە پیاو بە کەری نەزانیبێ؟

بە داخەوە گریمانەی دووهەم ڕاست بوو. ماوەیەک دوای ڕووداوەکە، سامسانۆفی پیر، بە پێکەنینەوە گوتبووی چاکم «سەروان» بە کەر زانی.

سامسانۆف پیاوێکی سارد و سڕ و خوێنتاڵ و بە تیروتانە بوو و وەک مار بە هەموو کەسییەوە دەدا. بڵێی ڕوخساری هەڵەشە بووی «سەروان» یان بڕوای ئەم لاوە «گەوج و هەڵەخەرجە» سامسانۆفی وا لێکردبێ ئەو پێشنیارە بکا، یان بە هۆی بەخیلی بردن بەو ڕەقیبە تۆڵازەی کە ئاوا هاتووە و داوای پارەی لێدەکا؟ ـ جا کام خەیاڵیان شوێنی لە سەر پیرەپیاو دانا، ناتوانم بیڵێم. بەڵام هەر لەو کاتەدا کە میتیا لە هەمبەریدا ڕاوەستا بوو و هەستی دەکرد ئەژنۆی دەلەرزێ و وەک شێت و نەفام دەیگوت لە نێو چووم. هەر ئەو کاتە پیرەپیاو بە ڕقێکی ئەستوورەوە چاوی لێکرد و بڕیاریدا بیکاتە مەڵحەکە. کاتێک میتیا ڕۆیشتبوو، کۆزماکۆزۆویچ لە داخانا لەرزیبوو. بە کوڕەکەی گوتبوو جارێکی دیکە نەهێڵێ ئەو سواڵکەرە سەر بەمماڵەدا بکاتەوە. تەنانەت نەهێڵێ بێتە حەوشەش، دەنا...

هەڕەشەکەی خواردەوە. بەڵام تەنانەت کوڕەکەشی کە زۆرجار بە تووڕەیی دیبووی، لە ترسانا لەرزیبوو. سەعاتێکی تەواو دوای ئەوە، پیرەپیاو لەبەر ڕقی زۆر جینگڵی دەدا و دەلەرزی. هەتا ئێوارە سات لە دوای سات خراپتر دەبوو و ناردیان بە دوای دوکتۆردا.

# (٢)

# لیاگافی

ناچار بوو بە چوار ناڵ بەرەو ماڵی قەشە بڕوا و پارەی نەبوو کرێی ئەسپەکانیش بدا. چل کۆپکی پێبوو، تەنیا ئەوەندە، تەواوی ئەو پارەیەی لە دوای ئەو هەموو ساڵە پڕ لە ناز و نیعمەتە بۆی مابۆوە، هەر ئەوەندە بوو! بەڵام سەعاتێکی دەستیی زیوینی کۆنی لە ماڵێ هەبوو، کە ماوەیەکی زۆر بوو لەکار کەوتبوو. سەعاتەکەی برد بۆ دوکانێکی نێو بازاڕ کە خاوەنەکەی جوویەک بوو، بە شەش ڕۆبڵ فرۆشتی. میتیا لە خۆشیانا هاواری کرد «قەت چاوەڕوانیی ئەوەم نەدەکرد.» (هەر وا شاد و بە نەشە بوو.) شەش ڕۆبڵەکەی نایە گیرفانی و بە هەڵەداوان ڕۆیشتەوە بۆ ماڵێ. سێ ڕۆبڵیشی لە خاوەن ماڵەکەی قەرز کرد. ئەوان هێندەیان خۆشدەویست کە هەر لەڕێوە، ئەو بڕە پارەیان پێدا، ئەگەر دارونەداریشیان ئەوەندە بوایە هەر پێیان دەدا. میتیا لە خۆشیانا پێی وەعەرز نەدەکەوت. پێیگوتن هەر ئەمڕۆ چارەنووسی مەعلووم دەبێ. پاشان بە پەلە پەلێکی هیوا براوانەوە تەواوی پلان و ڕووداوەکەی لای سامسانۆفی بۆ گێڕانەوە. ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە زۆربەی ڕاز و نهێنییەکانی میتیایان دەزانی، هەر بۆیە ئەویان بە کەسێکی دڵفراوان دەزانی و پۆز و دەماریان پێوە نەدەدی و وەک کەسی خۆیان چاویان لێدەکرد.

میتیا، کاتێک ئەو نۆ ڕۆبڵەی وەدەستکەوت، ناردی بەدوای کابرایەکی ئەسپەواندا، تاکو بیبا بۆ چاپاڕخانەی ولۆفیا. هەر بۆیە ئەم ڕاستییە لەبیری خەڵک نەچۆوە «نیوەڕۆی، ڕۆژی بەر لە ڕووداوەکە، میتیا تەنانەت پارەیەکی

قەڵبی نەبوو، سەعاتەکەی فرۆشتبوو و سێ ڕۆبڵیشی قەرز کردبوو، بۆ هەموو ئەوانەش شایەدی زەق و زیندووی هەبوو.»

با بێمە سەر باسی ئەو ڕاستییە؛ دواتریش دەردەکەوێ بۆ ئاوا دەکەم.

ئەگەرچی زۆر هیوادار بوو لە دڵی خۆیدا دەیگوت «هەموو تەنگو چەڵەمەکانی» ژیان وەلاچوو. کاتێ لە چاپارخانەی ولۆفیا نزیکبۆوە، بیری لەوە کردەوە بڵێی گرووشنکا چاوی منی لێدوور بێ چبکا؟ هەر بۆیە گیانی بەو خەیاڵە وەلەرزین کەوت. نەکا ئەمڕۆ گرووشنکا بڕیار بدا و بڕوا بۆلای فیۆدۆرپاولۆویچ. هەر بۆیە میتیا بێئەوەی خەبەری پێبدا ڕۆیشتبوو، خاوەن ماڵەکەشی ڕاسپاردبوو هەر کەسێک لێی پرسی، پێی نەڵێن لە کوێیە، کاتێ عارەبانەکە وەڕێ کەوت، دووپاتی کردەوە: «حەتمەن دەبێ ئەمشەو بگەڕێمەوە. هەر چۆنێک بێ لیاگافی لەگەڵ خۆم دێنم بۆ ئێرە.... تاکو قەباڵەکە ئیمزا بکا.» میتیا بە دڵەکوتێوە ئاوا بیری کردەوە، بەڵام مخابن خەونەکانی نەهاتنە دی.

لە چاپارخانەی ولۆفیاوە نێوبڕ ڕۆیشت و بەجێی هەشت کیلۆمەتر دوازدە کیلۆمەتری ڕێ بڕێ و درەنگ گەیشتێ. کە گەیشتە ئیلینسکۆش قەشە لە ماڵێ نەبوو. ڕۆیشتبوو بۆ گوندێکی ئەو دەوروبەرە. کاتێک میتیا هەر بەو ئەسپە شەکەت و ماندووانەوە گەیشتە ئەوێ و چاوەڕوانی هاتنەوەی قەشە بوو، هەوا تاریک داهات.

قەشە، گردە پیاوێکی بەحەیا و دڵۆڤان بوو، لەڕێوە پێیگوت کە لیاگافی جاران لەلای ئەو دەماوە و ئێستا لە «سۆخای پۆسیۆلۆک»ە و شەوانە لە ماڵۆچکەی جەنگەڵبان دەخەوێ، چونکە لەوێ خەریکی کڕینی دار و کاریتەیە. میتیا پێداگرانە لەبەر قەشە پاڕایەوە بیبا بۆلای لیاگافی و «ئەو کارە خێرەی دەرهەق بکا و نەجاتی بدا» قەشە دوای تۆزێ بیر کردنەوە ڕازی بوو هەتا سۆخاپۆسیۆلۆک لەگەڵی بچی. دیاربوو ئەویش هەستی کونچکاوی دایگرتووە. بەڵام نێوچاوانەکەی نەیهێنا و قەشە وای بە چاک زانی بە پێیان بڕۆن. چونکە هەتا ئەوێ هەر کیلۆمەترێک دەبوو یان نەدەبوو. میتیاش ڕازی

بوو و بە هەنگاوی پتەو و خێرا وەڕێکەوت. وا دەڕۆیشت قەشەی بێچارە دەبوو بە دوایدا هەڵێ. قەشە پیر نەبوو، بەڵام مرۆڤێکی زۆر وریا بوو. میتیا لەڕێوە نەخشە و پلانەکەی خۆی بۆ ئەویش باسکرد و بە تین و تاوەوە سەبارەت بە لیاگافی پرسیاریدەکرد. لە ڕێگا هەر قسەی کرد، قەشەش پرسیارەکانی میتیای بە «نازانم، ئاخ، ناتوانم بیڵێم، بڵێمچی، چووزانم» وەڵام دەدایەوە. میتیا کاتێک باسی کێشەکەی خۆی و باوکی کرد کە لە سەر میرات لێیان پەیدا بووبوو، قەشە زۆری پێناخۆش بوو، چونکە بە شێوەیەک پشتی بە فیۆدۆرپاولۆویچ بەستبوو. لەگەڵ ئەوەشدا بە سەرسوڕمانەوە پرسیی بۆ بە گورستکین دەڵێن لیاگافی، گوتی ئەگەرچی ناوی ڕاستەقینەی لیاگافییە، بەڵام کەس بەو ناوە بانگی ناکا، چونکە زۆری پێناخۆشە و بە دڵییەوە دەگرێ. میتیاش دەبێ وشیار بێ و بە ناوی گورستکین بانگی نەکا، «دەنا»، قەشە لە کۆتاییدا گوتی: «مامەڵەکەتان سەر ناگرێ. چونکە گوێ ناداتە قسەی ئێوە.»

میتیا بۆ چەن ساتێک تووشی سەرسوڕمان بوو، پاشان گوتی سامسانۆف ئەو نێوەی بەسەردا بڕیوە. قەشە بە بیستنی ئەو ڕاستییە لە خێر و بێری مەسەلەکە گوزەرا. ئەگەرچی وا باشتر بوو ئەو دڕدۆنگییەی خۆی بدرکێنێ. یانی ئەگەر سامسانۆف ئەوی بۆلای ئەو لادێییە ناردبێ، کە لیاگافیی پێدەڵێ، مەبەستی ئەوە بووە سەر بخاتە سەری و بیکاتە مەڵحەکە و بە کەری بزانێ. بەڵام میتیا دەرفەتی بیر کردنەوەی «لەو قۆڕیاتە» نەبوو. بە هەنگاوی پتەو و خێرا ڕێی دەپێوا و کاتێک گەیشتنە سۆخای پۆسیۆلۆک، تێگەیشت نەک کیلۆمەترێک و کیلۆمەتر و نیو، بەڵکو لانیکەم سێ کیلۆمەتریان ڕێ بڕیوە. ئەو قسانە تا ڕادەیەک تووشی پەرۆشیی کرد، بەڵام وەڕووی خۆی نەهێنا.

چوونە نێو ماڵۆچکەکەوە. کابرای جەنگەڵبان دۆستی قەشە بوو، ئەو لە بەرێکی ماڵەکەدا بوو، گورستکینیش لەوبەرەی دیکە. یانی لە بەری لای ڕێڕەوەکە کە تۆزێ خاوێن و خۆشتر بوو. چوونە ئەو وەتاغە و مۆمێکیان هەڵکرد. ژوورەکە زۆر گەرم بوو. لە سەر مێزێکی دارین سەماوەرێکی

کوژاوە داندرابوو، کەشەفیکیش بە چەن پەرداخەوە، بترییەکی بەتاڵی «ڕۆم» و بترییەکی نیوەی ودکا، لەگەڵ تۆزێکیش ورکەنانی لە سەر بوو. میوانەکە لە سەر چرپایەک خۆی ڕاکێشابوو و کۆتەکەی گرمۆڵە کردبوو و بەجێی باڵنج نابوویە ژێر سەری و پرخە پرخی ژوورەکەی داگرتبوو. میتیا لەجێی خۆی مات بوو.

بە شڵەژاوییەکی زۆرەوە گوتی: «دەبێ خەبەری کەمەوە. کارەکەم زۆر زەرووره. بە هەڵەداوان هاتووم و دەبێ هەر ئەمڕۆش بگەڕێمەوە.» بەڵام قەشە و جەنگەڵبان بێدەنگ ڕاوەستا بوون و هیچیان نەدەکوت. میتیا چووە پێشێ و دەیویست خەبەری کاتەوە. زۆری هەوڵدا، بەڵام نەیتوانی لە خەوی هەستێنێ. میتیا گوتی: «مەستە. خودایە گیان، چبکەم؟ دەبێ چبکەم؟» بێسەبرانە قۆڵی دەکێشا و ڕایدەتڵەکاند. لاقی کێشا، سەری گرت و هەڵیهێنا، باوەشی پێداکرد و هەڵیستاندە سەر قوون. لەگەڵ ئەوەشدا، دوای حەول و تەقەلایەکی زۆر، تەنیا توانیی ئەو کابرا مەستە وا لێبکا، جنێو بدات و تەپوتۆزیان لێهەستێنێ.

قەشە وەدەنگ هات: «واچاکە تۆزێ دەست ڕاگری، چون دیارە حاڵی باش نییە.»

جەنگەڵبانیش هەڵیدایە: «لە بەیانییەوە خەریکی خواردنەوەیە.»

میتیا گوڕاندی: «خودایە گیان! خۆزگە دەتزانی ئەم مەسەلەیە چەندەم بۆ گرینگە و چەندە هیوابڕاوم!»

قەشە دووپاتی کردەوە: «بە پەلە نابێ، واچاکە تا بەیانی دەست ڕاگری.»

ـ هەتا بەیانی؟ شتی وا هەر نابێ! مەحاڵە!

ناهومێدی وایلێکردبوو دەیویست دیسان ئاوقای کابرا بێتەوە، بەڵام بۆی دەرکەوت کەڵکی نییە و دەستی لێهەڵگرت. قەشە هیچی نەگوت، جەنگەڵبانی خەواڵووش خەمباری دەنواند.

میتیا بە هیوابڕاوی گوتی: «ژیان دیوتە چ بەڵا و بەدبەختییەک بۆ پیاو دروست دەکا.» تکتک ئارەقە لە ڕوخساری دەچۆڕا. قەشە بە دەرفەتی زانی

و زۆر ماقووڵانە بە میتیای گوت، ئەگەر لە خەویشی هەستێنی، مەستییەکەی هەروا دەمێنێ و ناتوانێ قسە بکا. «کارەکەی ئێوەش گرینگە، بۆیە وای بە باش دەزانم هەتا بەیانی دەست ڕاگرن.» میتیا شانی هەڵتەکاند و قەبووڵی کرد.

«باوە بە مۆمێکەوە لێرە دەبم، با لە کاتی خۆیدا قسەی لەگەڵ بکەم. هەر لە خەو هەستێ ئیتر خەمم نییە.» بە کابرای جەنگەڵبانیشی گوت: «پارەی مۆمەکەت دەدەمێ، کرێی ئەمشەویشت پشتگوێ ناخەم. دیمیتری کارامازۆفت لەبیر نەچێ. بەڵام باوە نازانم تۆ چ لێبکەین. لە کوێ دەخەوی؟»

«من دەڕۆمەوە بۆ ماڵێ.» چاوی لە کابرای جەنگەڵبان کرد و گوتی: «ئەسپەکەی ئەو وەردەگرم و دەڕۆمەوە بۆ ماڵێ. هەر ئێستا وەڕێ دەکەم، خوداحافیز. هیوادارم سەرکەوتوو بی.»

هەرواشی کرد. قەشە لە خۆشیی ئەوەی دەرباز دەبێ گەشابۆوە. سواری ئەسپەکەی جەنگەڵبان بوو و تێیتەقاند. ئەگەرچی بە خەمباری سەری ڕاوەشاند و لە خۆی پرسی بڵێی گەیاندنی ئەو هەواڵە بە دۆستە سایە چەورەکەی، فیۆدۆرپاولۆویچ، لە سەر شانی ئەو بێ یان نا، «چونکە ئاخری دەزانێ و مەسەلەکە بە گوێی دەگاتەوە، ڕقی هەڵدەستێ و ئیتر خێر و یارمەتی نانێرێ.» جەنگەڵبان بەخۆ هەڵکڕاندن خۆی کردەوە بە ژوورەکەی خۆیدا، میتیا بە دیارییەوە دانیشت، تاکو خۆی گوتەنی «لە کاتی خۆیدا» قسەی لەگەڵ بکا. دڵەڕاوکێ و پەرۆشی وەک تەمومژێکی چڕ دەوری تەنی. خەمێکی قورس و جەرگبڕ! دانیشتبوو فکری دەکردەوە، بەڵام بیری بۆ هیچ لایەک بڕی نەدەکرد. مۆمەکە داییسا و سیسرکێک جریکەی دەهات؛ لەو ژوورە گەرمەدا دەنگی وا لە نزیکەوە دەهات، ئیتر تامڵ نەدەکرا. میتیا لە ناکاو باخەکەی هاتەوە بیر، ڕێگای پشت باخەکە و درگای ماڵی باوکی کە بە شێوەیەکی ڕازاوی دەکرێتەوە و گرووشنکا بە هەڵەداوان خۆ دەکا بە ژووریدا. میتیا لە سەر کورسیلەکە قرچە پێ هەستا و لێوی خۆی گەست: «تراژیدیایە!»

بێئیختیار ڕۆیی بۆلای لیاگافی و چاوی لە ئەدگاری بڕی. کابرا، لادێییەکی بەلەباریک و چل ساڵان دەبوو. ڕوخسارێکی درێژۆکە و تووکە سەری لوول و کەتانی. ڕیشێکی درێژ و باریک و مەیلەوسوور. کراسێکی کەتانیی شین و جلیسقەیەکی ڕەشی لەبەردا بوو. زنجیرێکی زیوین بە گیرفانی جلیسقەکەیدا شۆڕ بووبۆوە. میتیا بە ڕقێکی ئەستوورەوە تێیڕوانی. بە تایبەت تووکەسەرە لوولەکەی، لەبەر هۆیەکی نادیار بووە هۆی شڵەژانی. ئەوەی لە هەموو شتێک شوورەییتر بوو، دیمیتری ئاوا بەپەلە و هەڵەداوان هاتبوو و پشتی لە هەموو شتێک کردبوو، بەڵام ئێستا شەکەت و ماندوو لە پشت سەری گەمژەیەکی ئاوا دانیشتبوو کە تەواوی چارەنووسی ئەوی لە دەستدا بوو، بەڵام ئەویش بێخەم و خەیاڵ لە دنیای خۆیدا بوو و پرخوهۆڕی ڕۆژەڕێیەک دەڕۆیشت و دەتگوت لە دنیایەکی دیکەوە هاتووە. میتیا گوڕاندی: «داخ لە دەستی چارەنووسی موقرباز» وەک شێت و هار دیسان ئاوقای کابرای لادێیی بوو، دەیویست لە خەوی هەستێنێ. بە هێز و قەوەتی باوەشی پێدا کرد و هەڵیستاندە سەر قوون، ڕایوەشاند و تەنانەت بە زللەش لێیدا، بەڵام دوای پێنج دەقیقە هەوڵدان، هیوابڕاوانە گەڕایەوە سەر کورسیلەکەی و دانیشت.

میتیا گوڕاندی: «گەوجییەتییە، گەوجییەتییە!» هەروەها شتێک وایلێکرد بشڵێ: «بەڕاستی شوورەییە!» ژانەسەری کردبوو. لە خۆی پرسی: «باشتر نییە وازی لێبێنم . بگەڕێمەوە؟ وەڵامی خۆی دایەوە نا، هەتا بەیانی ڕادەوەستم. بەئانقەست ناڕۆم. بۆچی هاتووم؟ بە چێ بڕۆم؟ خۆ بەو شەوە ڕێ دەرناکەم. لەو گەوجییەتییە!»

ژانەسەرەکەی ئۆقرەی لێبڕی. بە ئەسپایی لە سەر عەرزەکە دانیشت و دەستەوئەژنۆ سەری نایە سەر پشتی دەستی و دوای چەن وەنەوز و خەونووچکە خەوی لێکەوت. نزیکەی دوو سەعات یان زیاتر خەوت. لەبەر ژانی سەری خەبەری بۆوە. ژانەکەی هێندە زۆر بوو لەوانەبوو لەحەیبەتا بقیژێنێ. دەتگوت بە کوتک لە لاجە سەری ڕادەکێشن و تەپڵەسەری ژانی دەکرد. ماوەیەکی زۆری پێچوو تا بۆی دەرکەوت چیی بەسەر هاتووە.

ئاخری بۆی دەرکەوت وەجاخەکە دووکەڵی کردووە و ژوورەکەی پڕ کردووە و خەریکە دەخنکێ. کابرای لادێیش هەروا پرخو هۆر خەوتبوو. مۆمەکە کەوتبووە پرتەپرت و خەریک بوو دەکوژایەوە. میتیا هاواریکرد و بە ڕەتەڵدان لە ڕێڕەوەکەوە بەرەو ژووری کابرای جەنگەڵبان هەڵات. جەنگەڵبان خێرا لەخەو ڕاچەنی. بەڵام کە بیستی وەتاغەکەی دیکە دووکەڵ دایگرتووە، سەری لە میتیا سووڕما و زۆر بە کەمتەرخەمی گوێیدا مەسەلەکە، ئەگەرچی هەستا و لەگەڵی ڕۆیشت.

میتیا وەک شێت و ماخولیا هاواری کرد: «مردووە، ئەو کابرایە مردووە!». من قوڕی کوێ بەسەرما کەم؟»

دەرگا و پەنجێرەکانیان کردەوە و سەری دووکەڵکێشەکەشیان لابرد. میتیا سەتڵێکی ئاو لە دالانەکە هێنا، سەرتا سەری خۆی خووساند، پاشان گوتێ پەڕۆی پەیدا کرد و لە ئاوەکەی هەڵکێشا و نایە سەر نێوچاوانی لیاگافی. جەنگەڵبان سەبارەت بە مەسەلەکە هەروا کەمتەرخەم و سەرسارد بوو. کاتێک خەریکی کردنەوەی پەنجێرەکە بوو، بە مڕومۆچی گوتی: «ئیتر خەمت نەبێ دووکەڵەکە دەڕوا.» لەنتەرێکی بۆ میتیا بەجێ هێشت و ڕۆیشتەوە بۆ ژووری خەوتنەکەی. میتیا نیو سەعاتێک بە دەوری لیاگافیدا هات و پەڕۆی تەڕی بە سەروچاویدا هێنا. بڕیاریشیدا هەتا بەیانی نەخەوێ. بەڵام هێندە شەکەت و هیلاک بوو، کاتێک بۆ حەسانەوە دانیشت، بێئیختیار چاوی قوچاو، لە سەر تەختەکە خۆی ڕاکێشا و لە حەوت ساڵان ڕاست بۆوە.

درەنگانێک خەبەری بۆوە. نزیک سەعات نۆی بەیانی بوو. خۆر بە دوو پەنجەرە چکۆلەکەی وەتاغدا تیشکی ڕژاندبووە ژوورێ. لادێیی سەرئاڵۆز لە سەر چرپاکەی دانیشتبوو و کۆتەکەی لەبەردا بوو. سەماوەرەکە دەکوڵا و بترییەکی دیکە لەبەر دەمی بوو. بترییەکەی دوێنێ تەواو بووبوو. بترییە تازەکەش نیوەی زیاتری خاڵی کرابوو. میتیا گورج هەستا پێ و تێگەیشت لادێیی مەلعوون دیسان مەستە، مەست و سەرخۆش. چاوی پێ زەق بوو و ماوەیەک تێیڕاما. لیاگافی ئارام و فێڵبازانە چاوی لێدەکرد، ڕوانینێکی

تەوساوی و تەنانەت جۆرێک بەزەیی پێداهاتنی پڕ لە سووکایەتی ـ یانی میتیا وای هەستدەکرد. هەڵات بۆلای.

ـ ببووره، ڕەنگە ناوی... منت... لەو جەنگەڵبانەی ئێرە بیستبێ و باسی مەسەلەکەی بۆ کردبێتی. من سەروان دیمیتری کارامازۆفم، کوڕی کارامازۆفی پیر کە دەتهەوێ دارستانەکەی لێبکڕی.

لیاگافی، هێدی و ئەرخەیان گوتی: «درۆیە!»

ـ درۆ؟ فیۆدۆرپاولۆویچ دەناسی؟

لیاگافی بە توندی گوتی: «فیۆدۆرپاولۆویچ و مالۆویچ ناناسم.»

«لەگەڵ ئەو دەتانهەوێ مامەڵەی دارستانەکە بکەن، بەڵێ دارستان، تکات لێدەکەم گوێبگرە، وەرەوە سەر هۆش. باوە پاول ئیلینسکۆیی هێنامی بۆ ئێرە.»

میتیا بە هەناسەبڕکێوە درێژەی پێدا: «نامەت بۆ سامسانۆف نووسیبوو، ئەویش منی نارد بۆلاتان.»

لیاگافی بە سەرساردی گوتی: «د ـ درۆ دەکەی!» میتیا ئەژنۆی سڕ بوو.

ـ بەخودا بە ڕاستمە، ئێستا وەختی گاڵتە و گەپ نییە! وادیارە مەستی. بەڵام خۆ دەتوانی قسە بکەی و تێبگەی... یان من ئەقڵم پارسەنگ هەڵدەگرێ!

ـ تۆ تەڵەکەبازی.

ـ بیکە بۆخاتری خودا! من کارامازۆفم، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ کارامازۆف. پێشنیارێکم هەیە بۆتان، پێشنیارێکی پڕ قازانج... زۆرت بە قازانجە، سەبارەت بە دارستانەکە!

لیاگافی دەستێکی بە ڕیشیدا هێنا و گوتی:

گرێبەستی مامەڵەکەت ئیمزا کردووە و بە خوێڕی دەرچووی. تۆ خوێڕی و هیچوپووچی!

میتیا، لە حەیبەتا دەستی خۆی هەڵدەگوڵۆفی، هاواریکرد: «دڵنیابە بە هەڵەچووی.» لادێیی دیسان دەستێکی بە ڕیشیدا هێنا و لە ناکاو فێڵبازانە چاوی زیت کردەوە.

ـ نا، بڕوات پێناکەم، ئەگەر ڕاست دەکەی نیشانمدە: ئەو یاسایەی ئیزنی سەرەڕۆیی و فیڵی پێداوی کامەیە؟ دەزانم تۆ هیچوپووچی! تێگەیشتی؟

میتیا خەمبار و هیوابڕاوانە کشایە دواوە و هەروەک دواتر خۆی گێڕایەوە دەتگوت، «ئاسمان بە سەرمدا ڕووخا.» لە ناکاو تیشکێک لە زەینیدا درەوشایەوە، «تروسکەیەک لە مێشکی دام و لە هەموو شتێک گەیشتم.» واق وڕماوانە لەجێی خۆی ڕاوەستا و لەخۆی پرسی: "بەلای ناخێرم ئاقڵ و وریام، چۆنم ئەو گەوجییەتییە نواندووە خۆشم نازانم. نزیکەی بیست و چوار سەعات بە خوتەخوت بە دەوری ئەم لادێییە بەدفەڕەدا هاتم و پەڕۆی تەڕم بە سەروچاویدا هێنا، جا ئەوە گەوجییەتی نییە چییە؟"

ـ ئاخر ئەو کابرایە مەستە، خۆ هۆشی لایخۆی نییە. لە ئێستاوە هەتا حەوتوویەک دەست لە خواردنەوە هەڵناگرێ، بۆ لەخۆڕا لێرە مەحتەل بم؟ لەوانەیە سامسانۆف بە ئانقەست بۆ ئێرەی ناردبێتم! ئەگەر گرووشنکا؟... ئاخ... خودایە چ کارێکی بێجێم کرد!

کابرای لادێیی دانیشتبوو و چاوی لێدەکرد و لە بنەوە زەردەی دەگرت. میتیا لەوانەیە ڕقی لێهەڵگرێ و ڕۆژێک ئەو گەوجە پیاوە بکوژێ. بەڵام ئێستا خۆی وەک منداڵێکی بێدەسەڵات دەهاتە بەرچاو. بە هێواشی چوو بۆلای کورسیلەکە، چاکەتەکەی هەڵگرت و بێئەوەی زمانی بگەڕێ، لەبەری کرد و ڕۆیشتە دەرێ، کابرای جەنگەڵبان لە ژوورەکەی خۆی نەبوو، کەسی لێنەبوو. پەنجا کوپکی لە گیرفانی دەرهێنا و بۆ کرێی شەوێ و مۆمەکە لە سەر مێزەکەی دانا. کاتێک لە ماڵەکە هاتە دەرێ، هەر چوار دەوری دارستان بوو.

بێئەوەی بزانێ بۆکوێ دەچێ، بەلای ڕاستیدا بڕوا یان بە چەپدا، وەڕێ کەوت. دوێ شەو کاتێ لەگەڵ قەشە بە هەڵەداوان هاتن، سەرنجی ڕێگاکەی نەدا. هەستی تۆڵەی دەرهەق بە کەس لە دڵدا نەبوو، تەنانەت سامسانۆفیش. بە توولە ڕێیەکی باریکدا هەنگاوی دەنا. گێژ و چەواشە. بە «بیرۆکەی چەواشە»وە، بێئەوەی سەرنجبدا و بزانێ بۆکوێ دەچێ، ملی ڕێیی گرتبوو. ئەوەندە شەکەت و بێهێز بووبوو منداڵێکیش دەیتوانی لە عەرزی بدا. بەو

حاڵەشەوە، هەرچۆنێک بوو لە لێرەوارەکە چووە دەرێ. دەشتێکی بەرین، جارە گەنمی دروێنەکراو، هەتا چاو هەتەری دەکرد دەشتێکی کاکیبەکاکی. هەروا کە دەڕۆیشتە پێشێ، لەبەر خۆیەوە گوتی: «چ ناهومێدییەک، چ کوڵەمەرگییەک دەوری تەنیوم!»

چاوی بە بازرگانێکی پیر کەوت کە عارەبانەیەکی بەکرێ گرتبوو، میتیا بە هەڵاتن چووە سەر ڕێگاکەیان و پرسیاری لێکردن. دەرکەوت کە بازرگانە پیرەش دەچێ بۆ ولۆفیا. دوای تاوێک مشتومڕ، میتیا سوار بوو، دوای سێ سەعات گەیشتن. لە ولۆفیا میتیا لەڕێوە ئەسپی بەکرێ گرت تاکو بیبەنەوە بۆ شاری. وردە وردە هەستیکرد برسییەتی خەریکە بڕستی لێدەبڕێ. هەر لەو کاتەدا کە ئەسپەکانیان بە خاموت و هێلینگەوە دەبەست، هێلکە و تەماتەیەکیان بۆ ساز کرد. لە چاوترووکانێکدا قرتەی لێبڕی، نانێکی گەورە و سۆسیسێک و سێ پەرداخ ودکاشی پێدا کرد. دوای خواردنەکە، هێزی هاتەوە بەر و بەرەو شاری وەڕێ کەوت. بە عارەبانەچییەکەی گوت بە پڕتاو بڕوا. لە ناکاو پلانێکی تازەی دارشت. «پلانێکی نەگۆڕ». دەبوو هەرچۆنێکە ئەو «پارە نەگبەتییە» بەر لە ئێوارە وەدەست بێنێ. بە لەبزێکی پڕ سووکایەتی گوراندی: «بیری لێبکەوە، بیری لێبکەوە بۆ سێ هەزار ڕۆبڵی بێقابیلەت ژیانی مرۆڤێک لە نێو دەچێ! ئەمڕۆ یەکلاییی دەکەمەوە.» ئەگەر بیرکردنەوە لە گرووشنکا و پێشهاتی چاوەڕوان نەکراو لە گۆڕێدا نەبوایە، لەوانەبوو بە تەواوی هەست بە شادی بکا... بەڵام بیرکردنەوە لەو ژنە شۆخوشەنگە، بەردەوام وەک چەقۆیەکی تیژ دڵی تواتوا دەکرد.

گەیشتنە شاری و میتیا لەڕێوە بە هەڵەداوان ڕۆیی بۆلای گرووشنکا.

# (٣)

# كانگەی ئاڵتوون

ئەمە هەر ئەو دیدارە بوو کە گرووشنکا بە مەترسییەوە بۆ ڕاکیتین و ئالیووشای باسکرد. گرووشنکا ڕاست لەو کاتەدا چاوەڕوانی «ڕاسپاردە» بوو. دڵی حەسایەوە کە ئەو ڕۆژە و ڕۆژی پێشووی نەچووبوو بۆ دیدەنیی. هیوادار بوو کە «خودا کارێک دەکا هەتا لێرە نەڕوا، میتیا نەیەت،» بەڵام میتیا وەک مووت لێ هەڵپڕوزاندبێ لێی پەیدا بوو. پاشماوەی بەسەرهاتەکەش دەزانین. گرووشنکا بۆ ئەوەی لە کۆڵ خۆی کاتەوە، خێرا پێشنیاری پێکرد لەگەڵی بچێ بۆ ماڵی سامسانۆف. جێگایەک کە خۆی گوتەنی حەتمەن دەبێ بچێ «بۆ ئەوەی بە حیسابەکانی سامسانۆف ڕابگا.» کاتێکیش کە میتیا لەگەڵی چوو، گرووشنکا لەبەر دەرگای ماڵی سامسانۆف پێی گوت سەعات دوازدە بێتەوە بە دوایدا و بیباتەوە بۆ ماڵێ. میتیاش بەو قسە و بەڵێنە تەواو گەشایەوە. ئەگەر گرووشنکا لە ماڵی سامسانۆف دانیشێ، ناتوانێ بچی بۆ ماڵی فیۆدۆرپاولۆویچ، بۆیە لەڕێوە گوتی: «ئەگەر درۆی نەکردبێ.» بەڵام پێیوابوو گرووشنکا درۆ ناکا.

میتیا لەو جۆرە مرۆڤە دڵپیس و خانەگومانانە بوو، کە دوور لە خۆشەویستەکەیان هەموو جۆرە بیر و خەیاڵێکی ترسناک لە مێشکیاندا دێنن و دەبەن، بیریش دەکەنەوە چیی بەسەر دێ و چۆنیان خەیانەت پێدەکا. بەڵام لە کاتی دڵشکان و دڵنیا بوون لەوەی کە هاوسەرەکەیان خەیانەتی پێکردوون، بە تووڕەیی دەگەڕێنەوە بۆلای؛ بە چاو لێکردنی و دیتنی ڕوخساری گەشاوە و لێوی بە بزەی، وەک گوڵ دەگەشێنەوە و گومان و دڵپیسی وەلا دەنێن و

لەبیریان دەچێتەوە، بە شەرمەزاری و خۆ لۆمە کردنەوە پەشیمان دەبنەوە. میتیا دوای ئەوەی لەبەر درگاکە لە گرووشنکا هەڵبڕا، بەپەلە ڕۆیشتەوە بۆ ماڵێ. چونکە ئەو ڕۆژە کاری زۆر مابوو بەڕێوەی ببا! بەڵام هەستی بە دڵنیایی دەکرد و تۆزێ باری دڵی سووک بووبوو. بیرۆکەیەک لە زەینییدا شەپۆلی دەدا: «ئێستا دەبێ بچم بۆلای ئیسمیردیاکۆف و هەرچۆنێکە لێیدەرکێشم کە دوێشەو لەوێ چی ڕووی داوە و گرووشنکا چووە بۆلای فیۆدۆرپاولۆویچ یان نا؟» بەر لەوەی بگاتەوە مەزڵەکەی، گڕی گومان و دڵپیسی دڵە بێقەرارەکەی هەڵدەچۆقاند.

گومان و دڵپیسی! پووشکین گوتەنی: «ئەتێللۆ خانەگومان نییە، سەرتاپا باوەڕ و متمانەیە.» ئەم وتەیەش بە تەنیا نییە، بۆ ئەوەی ڕوانگەی قووڵی ئەو شاعیرە مەزنەمان بۆ دەرکەوێ. گیانی ئەتێللۆ لەبەریەک دەچێ، تەواوی ڕوانگەی سەبارەت بە ژیان ڕەش دادەگەڕێ. تەنیا لەبەر ئەوەی ئامانجەکەی لە نێو چوو. بەڵام ئەتێللۆ دەستی نەکرد بە خۆ داگرتن و سەرەتاتکێ و سیخۆڕی کردن. ئەو سەرتاپا متمانە بوو. بە پێچەوانە، بەر لەوەی بیر لە بیرۆکەی فێڵاوی بکاتەوە، دەبێ بە دژواری دنەی بدەی و ئەو کارەی پێبکەی. خانە گومانی ڕاستەقینە وانییە. هێنانە بەرچاوی شوورەیی و سووکایەتی کە مرۆڤی دڵپیس بە بێ، ئازاری ویژدان، قەبووڵی دەکا، مەحاڵە. لەگەڵ ئەوانەشدا، هەموو مرۆڤە خانەگومانەکان خوێری و هیچوپووچ نین. بە پێچەوانە، کەسێک کە سۆز و خۆشەویستی لە ناخی دایە و خاوەنی ئەشقێکی پاکەو زۆریش لەخۆ بوردووە، لەوانەیە لە ژێر مێزدا خۆیان بشارنەوە، بەرتیل و سمێڵچەورانە بە خوێڕیترین کەس بدەن و بە شوورەییترین شێوە خۆ لە خەڵکی داگرن و سیخوڕی بکەن.

ئەتێللۆ نەیدەتوانی لەگەڵ بێوەفایی ئاشت بێتەوە ـ نەک ئەوەی توانایی لێبوردنی نەبێ، نا، نەیدەتوانی خۆی لەگەڵیان ئاشت بێتەوە ـ ئەگەرچی ڕۆحی وەک ڕۆحی منداڵێک بێگەرد و بەری لە ڕق بوو. سەبارەت بە دڵپیسی ڕاستەقینە، مەسەلەکە ئاوا نییە. هێنانە بەرچاوی ئەو خاڵە زۆر دژوارە کە

دڵپیس چۆن دەتوانێ خۆی ئاشت بکاتەوە و چاوپۆشی بکا. لە چیش دەتوانێ خۆشبێ! ئەو مرۆڤانەی خانەگومانن بۆ لێبوردن لە زۆر کەسانی دیکە ڕۆحسووکترن، هەموو ژنانیش ئەوە دەزانن. دڵپیس دەتوانێ هەر لەڕێوە بەخشەر بێ، (هەڵبەت جاری وایە دوای شەڕ و قرەیەکی زۆر) دەتوانێ زۆر جار خەیانەتی سەلمێندراویش، ئەو ماچومووچ و ژوانانەی دیتوویەتی، چاوپۆشییان لێبکا و لێیان ببووری. بە مەرجێک بتوانێ جۆرێک خۆی قانع بکا کە «ئەمجارە دوایینجار» دەبێ. ڕقیبەکەشی لەو ڕۆژە بەدواوە خۆی شرتون بکا و بڕوا بۆ ئەوپەڕی دنیا. یان خۆی دڵدارە خۆشەویستەکەی دەبا بۆ جێگایەک کە ئەو ڕەقیبە ترسناکە تخوونی نەکەوێ. هەڵبەت ئەو ئاشتییەش لە سەعاتێک زیاتر ناخایێنێ. چونکە ئەگەر ڕۆژی دوایی شرت و نیش بێ، ڕەقیبێکی دیکە دادەتاشێ و دڵپیسی لێدەکا. بەڵام ئەشقێکی ئاوا بەکاری چی دێ کە مرۆڤ دەبێ بەردەوام کێشکی بدێرێ. بۆ ئەشق چییە وا پیاو ئەو هەمووە ئاگادارییی لێدەکا. بەڵام مرۆڤی خانەگومان هیچ کاتێک لەوە ناگا. بەڵام بەو حاڵەشەوە کەسانێکی زۆر ڕۆحزل و دڵفراوان لە نێویاندا هەڵدەکەون. دیسان شایانی باسە، هەر ئەم مرۆڤە دڵفراوانانەی خۆیان لە نێو دۆڵاب و کەلوکوندا دەشارنەوە و خۆیان دەگرن و دەیانهەوێ سەر لە کاروباری هاوسەرەکەیان دەرهێنن. لەوکاتەشدا تێدەگەن کە لە نێو گۆمی شەرمەزاریدا ئەوق بوون و هەست بە پەشیمانیش ناکەن.

میتیا هەرکە چاوی بە گرووشنکا کەوت، گومان و دڵپیسیی لەبیر چۆوە و لەڕێوە متمانە و دڵنیایی گیانی داگرت، لەبەر ئەو هەستە شەیتانییەش بە توندی خۆی سەرکۆنە کرد. بەڵام تەنیا ئەو خاڵە سەلمێندرا کە عەشقی ئەو سەبارەت بەو ژنە زۆر لەو ئەوینە بەرز و پیرۆزتر بوو کە خۆی بیری لێدەکردەوە و بە هیچ شێوەیەک پێوەندیی بە هەوا و هەوەسەوە نەبوو. بە هۆی «لەشە نەرمونۆڵەکەی» گرووشنکاشەوە نەبوو، کە بۆ ئالیووشای باس کردبوو. بەڵام لەگەڵکو گرووشنکا دوور کەوتەوە، میتیا کەوتە ژێر تەوژمی

گومان و دڵپیسی و هەموو جۆرە فێڵ و خەیانەتێکی دەهێنایە بەرچاوی خۆی و هەستی بە چزووی ویژدانیش نەکرد.

هەر بۆیە کڵپەی دڕدۆنگی و گومان بەربۆوە گیانی. هەرچۆنێک بوو ئەو دەبوو ڕانەوەستێ. یەکەم کارێک کە دەبوو بیکا ئەوە بوو، لانیکەم وامێکی کەمماوە وەرگرێ. نۆ ڕۆبڵەی تەنیا بەشی خەرجی ڕێگاکەی کردبوو. ئەوەش هەموو کەس دەزانێ کە مرۆڤ بەبێ پارە ناتوانێ هەنگاو هەڵێنێتەوە. بەڵام لە نێو عارەبانەکەدا بیری کردبۆوە لە کوێ دەتوانێ پارە وەگیرخا. دوو دەمانچە و فیشەکلغەکەی هەر مابوو، هەتا ئەو کاتەش لە هیچ کوێ بە بارمتەی دانەنابوو. چونکە هۆگرییەکی زۆری پێیان هەبوو و تەواوی ماڵ و سامانەکەی لە لایەک و دەمانچەکەشی لەلایەک.

لە مەیخانەی مترۆپۆلیس، ماوەیەک لەمەوبەر لەگەڵ کارمەندێکی لاو ئاشنا بووبوو و بۆی دەرکەوتبوو ئەو لاوە زۆر هۆگر و تامەزرۆی تفەنگە. ئەو کوڕە دەمانچە و شەشلوول و خەنجەری دەکڕی و بە دیواردا هەڵیدەواسی و نیشانی دۆست و ئاشناکانی خۆی دەدا. پۆز و هەوای پێوە لێدەدان و شارەزاییەکی باشی لە شەشلوولدا هەبوو. میتیا بەبێ ڕاوەستان، ڕۆیی بۆلای کوڕە و پێشنیاری پێکرد کە لە بری دە ڕۆبڵ، ئامادەیە دەمانچەکانی بە بارمتە لەلای دانێ. کارمەندی لاو کە لە خۆشیانا پێی وەعەرز نەدەکەوت، هەوڵیدا پێی بفرۆشێ. بەڵام میتیا قەبووڵی نەکرد، هەر بۆیە کوڕە دە ڕۆبڵی پێدا و بە قەڵسی گوتی: هیچ شتێک هانم نادا بەهرە وەرگرم. پاشان وەک دوو هاوڕێ لەیەک هەڵبڕان. میتیا بەپەلە بوو، بە هەشتاو بەرەو ماڵی فیۆدۆرپاولۆویچ ڕۆیشت و لە ڕێگای پشتەوە چووە نێو باخەکەوە، تاکو بە زووترین کات چاوی بە ئیسمیر دیاکۆف بکەوێ. ئەم ڕاستییە لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە سێ چوار سەعات بەر لەو ڕووداوەی کە دواتر باسی دەکەم، میتیا فلسێکی نەبوو و حازر بوو بۆ دە ڕۆبڵ پڕبایەخترین ملکی خۆی - دەمانچە و فیشەکلغەکەی - بە بارمەتە دانێ. ئەگەرچی سێ سەعات دواتر بوو بە خاوەنی هەزاران ڕۆبڵ... بەڵام وا باشە جارێ باسی ئەو ڕووداوانە نەکەم....

لە زمانی ماریا کاندراتیفنای بیست کە ئیسمیر دیاکۆف زۆر نەخۆشە. ماریا کاندراتیفنا جیرانی ماڵی فیۆدۆر پاولۆویچ بوو. هەواڵی فێ لێهاتن و چۆنیەتیی کەوتنە نێو هەمارەکەوە. هەروەها باسی دڵەخورپەی فیۆدۆرپاولۆویچیشی کرد دوای ڕۆیشتنی دوکتۆرەکە. هەروەها پێیان گوت کە ئیوانی برای هەر ئەو ڕۆژە سەر لە بەیانی بەرەو مۆسکۆ وەڕێ کەوتووە. دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لە دڵی خۆیدا گوتی: «کەوایە بەر لەوەی من بگەمێ، بە سواری لە ولۆفیاوە تێپەڕیوە.» بەڵام سەبارەت بە ئیسمیر دیاکۆف و نەخۆشییەکەی زۆر دڵتەنگ و پەرۆش بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «جا لەمەولەولاوە چیبکەم؟ کێ نیگابانیم بۆ دەدا؟ کێ هەواڵم بۆ دێنێ؟» بە تامەزرۆیی لە ژنانی دەپرسی دوێنێ عەسر چاویان بە شتێک کەوتووە یان نا. ئەوان تێگەیشتن کە بە دوای شتێکەوەیە و دەیهەوێ سەری لێدەرهێنێ، بۆیە تەواو دڵنیایان کرد کە هیچکەس نەهاتووە و ئیوان شەوێ لە ماڵێ نەبووە؛ «هەموو شتێکیش ئاسایی بووە.» میتیا کەوتە گێژاوی خەیاڵەوە. ئەمڕۆ حەتمەن دەبێ کێشک بدێرێ، بەڵام لە کوێ؟ لێرە یان لەبەر دەرگای ماڵی سامسانۆف؟ بڕیاریدا چاوی بە سەر هەردوو لاوە بێ. هەر لەو کاتەشدا... وەبیری هاتەوە دەبێ ئەو پیلانە تازەی لە ڕێگای گەڕانەوە لە سەفەرەکەی دایڕشتبوو، بەڕێوە بەرێ. دڵنیا نەبوو بە دەستییەوە دێ یان نا. بەڵام نەدەبوو لێی ڕاوەستێ. میتیا هاتە سەر ئەوەی سەعاتێک وەخت بۆ ئەو کارە تەرخانبکا. «لەو سەعاتەدا لە هەموو شتێک ئاگادار دەبم و کارەکە یەکلایی دەکەمەوە. جا ئەو کاتە، هەر خێرا دەچم بۆ ماڵی سامسانۆف، دەپرسم بزانم گرووشنکا لەوێیە یان نا و هەر خێرا دەگەڕێمەوە بۆ ئێرە. هەتا سەعات حەوت لێرە دەبم، ئەو کاتە دیسان دەچمەوە بۆ ماڵی سامسانۆف بۆ ئەوەی گرووشنکا بەرمەوە بۆ ماڵێ. ئەوەش بڕیارەکەی بوو.

بە پڕتاو ڕۆیشتەوە بۆ ماڵێ، خۆی شت و سەری داهێنا و، جلەکانی شەی کێشا. خۆی پۆشتە کردەوە و ڕۆیی بۆ ماڵی مادام خۆخلاکۆف. حەیف کە هیوایەکی زۆری بەو خاتوونە بوو و دەیویست سێ هەزار ڕۆبڵەکە لە ئەو

قەرز بکا! ئەمجار، لە ناکاو دڵنیا بوو کە ئەو خاتوونە دەست بە ڕوویەوە نانێ. ئەگەر ئاوا هەستی بە دڵنیایی دەکرد، وەک دەشڵێن هەردووکیان قوڕی کۆڵانێکن، بۆیە لە پێشدا نەچوو بۆلای ئەو و ملی لەبەر سامسانۆف خوار کردووە کە نەیدەناسی. چونکە هاوشانی ئەو نەبوو نەیدەزانی چۆنی قسە لەگەڵ بکا. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە مادام خۆخلاکۆفیشی بە باشی نەناسیبوو، مانگێک بوو چاوی پێی نەکەوتبوو، دەیزانی مادام خۆخلاکۆف چاوی بەرایی نادا بیبینێ. چونکە هەر لەو کاتەوە بووبووە دەزگیرانی کاترینا ئیوانا، مادام خۆخلاکۆف ڕقی لێیبوو. لەبەر هۆیەک لە ناکاو ئارەزووی کردبوو کاترینائیوانا واز لە ئەو بێنێ و شوو بکا بە «ئیوان فیۆدۆرۆویچ کە لاوێکی جوانچاک و جوامێر و خوێندەوار و خاوەن ئەدەب و ئاکارێکی بێوێنەیە.» ڕقی لە ئاکار و هەڵسوکەوتی میتیا بوو. میتیا پێی پێکەنیبوو و گوتبووی مادام خۆخلاکۆف بەقەد دڵ بە دنیایی و لە سەرەخۆییەکەی بێفەرهەنگ و دواکەوتووە. بەڵام ئەو ڕۆژە لە نێو فایتوونەکەدا بیرۆکەیەکی سەیر بە زەینیدا هاتبوو. «ئەگەر ئەو ئەوەندە تامەزرۆیە لەگەڵ کاترینا ئیوانا زەماوەند بکا» ـ دەشیزانی ئەو سەبارەت بەو مەسەلەیە ئاوا کەم جیکەڵدانەیە ـ «بۆ دەبێ بۆ سێ هەزار ڕۆبڵ دەست بە ڕوومەوە بنێ؟ ئەو پارەیە توانایی ئەوەم دەداتێ واز لە کاتیا بێنم و بە یەکجاری لێی دوور کەومەوە. ئەو ژنە شۆخوشەنگ و بەناز و نووزانە، هەر ئەوەندە لە شتێک هەڵپێچن، ئیتر دەستبەرداری نابن و بۆ گەیشتن بەو مەیل و مگێزە خۆ بە ئاو و ئاوردا دەدەن. ئیتر بۆ ئەو کارە پارەیەکی وا هەر هیچ نییە، چونکە زۆر دەوڵەمەندە.»

بەڵام پیلانەکەی هەر ئەو پیلانەی پێشوو بوو. یانی دارستانەکەی چیرماشینا بدا بە مادام خۆخلاکۆف، ئەویش نەک وەکو مامەڵەیەکی پڕ قازانج چاوی لێبکا وەک ئەو پێشنیارە بە سامسانۆفی کردبوو، بۆ ئەوەش نەبوو ئەو ژنە سەر تەماح بخا و بەجێی ئەو سێ هەزار ڕۆبڵە، حەوت، هەشت هەزار ڕۆبڵ قازانج بکا، بەڵکو وەک بارمتەی ئەو قەرزە قەباڵەکەی لەلا دانێ. ئەو

خەیاڵە تازەیە خستبوویە شادی و قلەسەما، هەر خووخدەی وابوو هەرکاتێک بڕیاری دەدا کارێکی دڵخوازی خۆی سەرکەوتوانە ئەنجامبدا، ئاوا لە خۆشیانا باڵی دەگرت. زۆر بە تامەزرۆیی بەرەو ماڵی مادام خۆخلاکۆف وەڕێ کەوت، لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک لە پلیکانەکانی ماڵی ئەو ژنە وەسەر کەوت، ترسێک لە دڵی نیشت و ئەژنۆی لەرزی. لەو کاتەدا تێگەیشت ـ وەک ڕۆژیش لێی ڕوون بوو ـ ئەوە دوایین هیوایەتی و ئەگەر بە دستییەوە نەیەت چارەیەکی نامێنێ جگە لەوەی «کەسێک بکووژێ و تاڵانی بکا بۆ سێ هەزار ڕۆبڵ.» کاتێ لە زەنگی دەرگاکەی دا، سەعات حەوت و نیو بوو.

سەرەتا وەک ئەوە دەچوو ناوچاوانەکەی هێنابێتی. هەر هەواڵی هاتنەکەی ڕاگەیاندرا، لەڕێوە بانگیان کردە ژووریێ. پێیوابوو «چاوەڕوانی بوون، » هەرکە پێی نایە ژووری میوانداری، خاتوونی ماڵێ خێرا هاتە ژووریێ و گوتی چاوەڕوانی بووە.

ـ چاوەڕێت بووم! چاوەڕێت بووم! ئەگەرچی، ئەو جۆرەی خۆت دەڵێی هیچ هۆیەک نەبوو کە پێموابێ دێی بۆ دیدەنیم. وەلحاسڵ چاوەڕوانت بووم. دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، ناهەقت نییە سەرت لە غەریزەی من سوور بمێنێ، بەڵام ئەمڕۆ لە بەیانییەوە لە دڵی دابووم دێی.

میتیا کە بەلارەوە لارەوە دەیویست دانیشێ گوتی: «خاتوون، بەڕاستی جێی سەرسووڕمانە، بەڵام بۆ مەبەستێکی زۆر گرێنگ هاتوومەتە خزمەتتان... یانی سەبارەت بە مەبەستێکی زۆر زۆر گرینگ، خاتوون.... تەنیا بۆخۆم و... بێ ئەوەی کات بەفیڕۆ بچێ...»

ـ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، دەزانم بۆ کارێکی زۆر گرینگ هاتووی؛ باسی ئیلهام و کەرامات لە گۆڕێدا نییە. وەبیر هێنانەوەی کۆنەپەرستانەی مەبەستێکی مۆجزەئاساش نییە (سەبارەت بە باوە زووسیما هەواڵت پێگەیشتووە؟) ئەوە مەبەستێکی بیرکارییە: دوای ئەو هەموو ڕووداوەی بە سەر کاترینا ئیوانا هاتووە، نەتتوانی خۆ لە هاتن ببوێری؛ نەتتوانی، نەتتوانی، ئەویش یەقینێکی بیرکارییە.

ـ مادام، ڕاستییەکانی ژیانێکی ڕاستەقینە، هەر ئەوەیە و بەس. بەڵام ئیزن بفەرموو عەرزت بکەم کە...
ـ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، گاڵتە ناکەم، ڕاستەقینەیەکە. ئێستا ئیتر لایەنگری سەرسەختی ڕاستیم. زۆرم مۆجزە دیوە. بیستووتە باوە زووسیما مردووە؟
«نا، مادام ئەوە لە تۆی دەبیستم.» میتیا تۆزێ سەری سووڕما. ئالیووشای هاتەوە بیر.
ـ شەوی ڕابردوو، بیهێنە بەرچاوی خۆت...
میتیا پەڕییە نێو قسەکانی: «مادام، ناتوانم بیر لە هیچ شتێک بکەمەوە، زەینم بەستوویەتی. تووشی بارودۆخێکی زۆر تاڵوتوون هاتووم، ئەگەر یارمەتیم نەدەی بە ڕێوی دەردەچم، بمبوورە ڕەشۆکییانە دەدوێم، سەرم لێشێواوە...»
ـ دەزانم، دەزانم عەجمانت لێ هەڵگیراوە. چارەیەکی دیکەت نییە و هەرچیت دەوێ پێمبڵێ، تێتدەگەم. ماوەیەکی زۆرە بیر لە چارەنووست دەکەمەوە. دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، خستوومیەتە ژێر چاودێری و زۆرم بیر لێ کردۆتەوە... بڕوام پێبکە، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، من پزیشکی بە ئەزموونی ڕۆحی تۆم.
میتیا هەوڵی دەدا بە ئەدەب بێ، گوتی: خاتوون، ئەگەر ئێوە پزیشکی خاوەن ئەزموونن، منیش نەخۆشێکی خاوەن ئەزموونم، هەستدەکەم ئەگەر لەم لایەنەوە بیر لە چارەنووسم دەکەیتەوە، کاتی لە نێوچوون وەفریام دێی، هەر بۆیە ئیزنم بدە لانیکەم باسی ئەو پیلانەتان بۆ بکەم کە بۆ ئەوە ئاوا ڕوو هەڵماڵدراوانە هاتوومە خزمەتتان... هیوای گەورە و گرانم ئێوەن... خاتوون هاتووم تاکو...»
ـ مەیلێ، ئەوە زۆر گرینگ نییە. بەڵام یارمەتی، تۆ یەکەم کەس نیت کە یارمەتیم داوە. حەتمەن ناوی ئەو کچەی پوورزامت بیستووە، مادام بلیسمۆف. مێردەکەی وەرشکەست بوو، خۆت گوتەنی «بە ڕێوی دەرچوو.» پێشنیارم پێکرد دەستبکا بە پەروەردەکردنی ئەسپ، ئێستاش کارەکەی

بەدەستەوە هاتووە و هەستاوەتەوە. دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، سەرت لە پەروەردە کردنی ئەسپ دەردەچێ؟

میتیا هەستا سەرپێ و بێسەبرانە گوڕاندی: «مادام، هەر باسی مەکە، نا، من سەرم لەو شتانە دەرناچێ و ئەوە کاری من نییە. مادام، تکات لێدەکەم گوێم بۆ ڕادێرە و دوو دەقیقە ئیزنم بدەی هەموو شتێکت بۆ باسدەکەم، تەواوی پیلانەکەی خۆمت پێدەڵێم کە هەر بۆ ئەوەش هاتووم. چونکە دەرفەتم بۆ نەماوەتەوە.»

میتیا، هەستیکرد مادام خۆخلاکۆف دەیهەوێ دیسان دەستبکاتەوە بە قسەکردن، دەنگی هەڵێنا و بەو هیوایەی قسەکەی پێببڕێ، هاواریکرد: «زۆر بەپەلەم. لەبەر ناچاری هاتووم... هیوای گەورە و گرانم تۆی، بەوپەڕی ناهومێدییەوە پەنام بۆ ئێوە هێناوە و سێ هەزار ڕۆبڵم پێویستە بە قەرز بمدەنێ، بارمتەیەکی زۆر باشیشت لەلا دادەنێم، بارمتەیەکی جێی متمانە! بەڵام ئیزن بفەرموو عەرزتبکەم...»

«دوایی باسی ئەوەم بۆبکە، دوایی!» مادام خۆخلاکۆف بە دەستی ئاماژەی کرد بێدەنگ بێ. «دەزانم دەتەوێ بڵێی چی، پێشتریش پێمگوتی. بڕێکی بێقابیلەتت پارە دەوێ، سێ هەزار ڕۆبڵ، بەڵام دەتوانم زۆر لەوە زیاترت بدەمێ. دیمیتری فیۆدۆرۆویچ یارمەتییتدەدەم، بەڵام دەبێ گوێم بۆ شل کەی.»

میتیا دیسان هەستایە سەرپێ و بە تینوگوڕێکی ئاوێتەی شادییەوە هاواری کرد: «مادام، گەورەیی لە هەقی مندا دەکەی! خودایە گیان، زۆر شوکور. نەجاتت دام، پیاوێکت لە مەرگێکی دڵتەزێن، لە گوللە، نەجاتدا... هەتا دەمرم لەبیرم ناچێ...»

مادام خۆخلاکۆف بە بزەیەکی شیرینەوە چاوی لە میتیا بڕیبوو، گوتی: «زۆر لە سێ هەزار ڕۆبڵ زیاتر، یەکجار زیاترت دەدەمێ!»

ـ یەکجار زیاتر؟ بەڵام من ئەو هەموو پارەیەم پێویست نییە. تەنیا ئەو سێ هەزار ڕۆبڵە چارنووسسازەم پێویستە و دەتوانم لە هەمبەر ئەو گوژمە

پارەیەدا، لەگەڵ سپاس و پێزانینی لە ڕادەبەدەر بارمتە دانێم. پێشنیاری پیلانێکتان پێدەکەم کە...

مادام خۆخلاکۆف زاڵ و لەخۆدەرچوو قسەکەی پێبڕی: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، بەسی کە. قسەکراو بڕایەوە. بەڵێنمدا نەجاتت دەم، نەجاتت دەدەم. هەر وەک چۆن بلیسمۆفم نەجاتدا، ئاوا تۆش نەجاتدەدەم. بیر و ڕات سەبارەت بە کانگەی ئاڵتوون چییە، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ؟»

- سەبارەت بە کانگەی ئاڵتوون؟ خاتوون قەتم بیر لە شتی وا نەکردۆتەوە.

- بەڵام من بەجێی تۆ بیرم لێکردۆتەوە. یەکجار زۆریشم بیر لێکردۆتەوە. لە مانگی ڕابردووەوە تۆم خستۆتە ژێر چاوەدێری. کاتێ لەم دەورووبەرانەوە تێدەپەڕیت، سەد جار زیاتر بیرم لێکردۆتەوە و بە خۆمم گوتووە: ئەوە ڕاست ئەو پیاوە بە توانایەیە کە دەبێ بڕوا بە دوای کانگەی ئاڵتوونا. خودا تۆی بۆ ئەو کارە داناوە. شێوەی ڕەوت و ڕۆیینەکەشت دڵنیای کردووم، سوڕ دەزانم و بەو ئاکامە گەیشتووم کە تۆ ئەو پیاوەی کە گانگای ئاڵتوون دەدۆزییەوە.

میتیا بە پێکەنینەوە گوتی: «بە شێوەی ڕەوت و ڕۆیینما، مادام؟»

- بەڵێ، بە شێوەی ڕەوت و ڕۆییتنا. حەتمەن حاشای لێدەکەی کە بە ڕەوت و ڕۆیینی کەسێکدا دەتوانی لە خووخدەی بگەی؟ زانست ئەو بیرۆکەیەی سەلماندووە. من ئێستا لایەنگری زانست و ڕاستەقینەخوازیم. دوای ئەوەش مەسەلەی باوە زووسیما زۆری تووشی پەرۆشی کردووم. لەمڕۆش بە دواوە ڕاستەقینەخوازم و دەمهەوێ خۆم بۆ قازانج و بەرژەوەندیی گشتی تەرخانکەم. من ماریجە کراوم. تۆرگنیف گوتەنی: «ئیتر بەسە!»[1]

- بەڵام، خاتوون ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەی دەستودڵبازانە بەلێنیت پێدام، بە قەرز بمدەیە...

---

1- تۆرگنیف بەو چەشنەماڵئاوایی لە ئەدەبیات دەکا «١٨٦٢» هەڵبەت هەتا کاتی مەرگ (١٨٨٣) درێژەی بە نووسین دا.

مادام خۆخلاکۆف خێرا قسەکەی پێبڕی: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، خەمی ئەوەت نەبێ، وەبزانە لەگیرفانتدایە. نەک سێ هەزار بەڵکو سێ ملوێن. ئەویش لە ماوەیەکی زۆر کورتدا. ئەو بیرۆکەیە پێشکەش بە تۆ دەکەم: کانگەی ئاڵتوون دەدۆزییەوە، ماڵ و سامانی زۆر پێکەوە دەنێی، دەگەڕێیتەوە و دەبیتە ڕێبەر. ڕامان دەپەڕێنی و بۆ شتی چاکتر ڕێنوێنیمان دەکەی. بۆ هەموو شتێکی خۆمان بکەینە مشتی جوولەکانەوە؟ هەموو چەشنە دامەزراوە وشوێن و بنکەی کڕین و فرۆشتن وەڕێ دەخەی. یارمەتیی لێقەوماوان دەدەی و ئەوانیش دوعای بەخێرت بۆ دەکەن. ئێستا سەردەمی هێڵاسنە، حاڵییە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ. ناوبانگ دەردەکەی و بوونت بۆ وەزارەتی دارایی -کە ئێستا زۆر لە بارودۆخێکی خراپدایە - زۆر پێویست دەبێ. بێبایەخ بوونی ڕۆبڵ شەوانە ناهێڵێ خەو بچێتە چاوم. جەنابی دیمیتری، خەڵکی لەو ڕووکارەیانم ناگەن...»

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ دڵی ناخۆش بوو، پەڕییە نێو قسەکانی: «مادام، مادام! ڕەنگە ئەو ئامۆژگارییەی ئێوە، ئەو ئامۆژگارییە حەکیمانەتان لە گوێ بگرم و بەکاریبێنم، مادام... ڕەنگە وەڕێکەوم... بەرەو کانگە ئاڵتوون... دێمەوە و لەوبارەوە قسەی لێدەکەین... لە ڕاستیدا پێت لێنابڕم، زوو زوو دێم... بەڵام ئێستا ئەو سێ هەزارڕۆبڵەم... ئاخ نازانی چەندە لە تەنگژەدام. ئەو پارەیە ڕزگارم دەکا، ئەگەر بتوانی ئەمڕۆ... دەزانیچی ئەمڕۆ ئیتر دەرفەتم بۆ نەماوە... ئەمڕۆ هەرچۆنێک بێ دەبێ....»

مادام خۆخلاکۆف بە لەبزێکی توندەوە پەڕییە نێو قسەکانی: «بەسی کە، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ ئیتر بەسی کە! قسە لەوەیە دەچی بە دوای کانگەی ئاڵتووندا یان نا؛ بە تەواوی بڕیارتداوە؟ ڕاست و ڕەوان جوابمدەوە.»

- خاتوون دەستم لێڕاگرە... هەر کوێت پێخۆشبێ دەچم... بەڵام ئێستا....

مادام خۆخلاکۆف گوڕاندی: «سەبرکە!» هەستا سەرپێ و هەڵات بۆلای دۆلابێکی جوان کە چەند چەکمەجەی هەبوو چەکمەجەکانی دەکێشایەوە و بەپەلە بە دوای شتێکدا دەگەڕا.

میتیا کەوتبووە دڵەکوتێ و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «سێ هەزار ڕۆبڵ، ئەویش خێرا... بە بێ هیچ بارمتە و... بەوە دەڵێن جوامێری! ئەوەیە ژن. حەیفێ زۆر قسە دەکا!»

مادام خۆخلاکۆف بە شادی هەڵات بۆلای میتیا و گوتی: «ئەوەتا! خەریک بووم لەوە دەگەڕام!»

سووڕەتێکی زیوینی چکۆلە بوو بە دزوویەکەوە کرابوو. وەک ئەوانەی هێندێ جار بە خاچەوە لە ملی دەکەن.

مادام خۆخلاکۆف بە ڕووخۆشییەوە درێژەی بە قسەکانیدا: «ئەمە هینی کییۆفە، لە پاش شەهیدی پیرۆز باربارا بەجێ ماوە. بێنە با بیکەمە ملت. بەوەوە دەتنێرم بەرەو ژیانی نوێ و کاروباری نوێ.» دەزووەکەی لە ملی کرد و سووڕەتەکەی لە سەر سنگی میتیا ڕاستەو پاستە کرد. میتیا بە شڵەژاوی سەری داخست و لە ژێر بۆینباخەکە و یەخەی کراسەکەیەوە خستییە ژووری.

مادام خۆخلاکۆف هەستی بە سەرکەوتن دەکرد و شاد و لێو بەبزە لە سەر جێگاکەی دانیشتەوە و گوتی: «ئێستا دەتوانی وەڕێکەوی.»

- خاتوون، من بەجارێ کەوتوومەتە ژێر کارتێکەری. بە ڕاستی نازانم چۆنتان سپاس لێبکەم... ئەو هەموو چاکەیەتم بۆ قەرەبوو ناکرێتەوە، بەڵام... خۆزگە دەتزانی کات بۆ من چەندە بەنرخە... ئەو پارەیە کە لەبەر ئەو بوومەتە بەرمنەتی ئێوە... خاتوونی هێژا، ئێستا کە ئەو چاکە گەورەیەم لەگەڵ دەکەی و گەورەییی خۆت نیشاندەدەی (میتیا بە پێی پاڵنەرێکی کتوپڕ گوتی) ئیزن بفەرموون بە ڕاشکاوی عەرزتان بکەم... ئەگەر لەمێژە لەوە ئاگاداری... لەم شارە کەسێکم خۆش دەوێ... خەیانەتم بە کاتیا کردووە.... بڵێم کاترینا ئیوانا باشترە... زۆر ناپیاوانە بێحورمەتیم پێکردووە، بەڵام چبکەم ئاشقی ژنێکی دیکە بووم.... مادام ئێوەش ڕەنگە ڕقتان لەو ژنە بێ، چونکە ئاگاداری هەموو شتێکی، بەڵام بە هیچ شێوەیەک ناتوانم واز لەو ژنە بێنم. هەر بۆیە ئێستا ئەو سێ هەزار ڕۆبڵە...

مادام خۆخلاکۆف بە لەبزێکی تەواو لێبڕاوانە پەڕییە نێو قسەکانی: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، دەست لە هەموو شتێک هەڵگرە. واز لەو شتانە بێنە. بەتایبەت ژنان. ئامانجی تۆ کانگای ئاڵتوونە و لەوێ ژن جێی نییە. دواتر کە دەوڵەمەند بووی و ناوبانگت دەرکرد، کچی دڵخوازی خۆت لە باشترین کۆمەڵگادا پەیدا دەکەی. ئەو کچەش، کچێکی ڕووکراوەی ئەمڕۆیی دەبێ، کچێکی خوێندەوار و خاوەن فام و شعوور. تا ئەو کاتە مەسەلەی ژنان چارەسەر دەکرێ و ژنی نوێ و ئەمڕۆیی سەرهەڵدەدەن.»

«خاتوونی بەڕێز جارێ لەوە گەڕێین، باسی ئەو مەسەلەیە هەر مەکە.» میتیا بە نیشانەی پاڕانەوە دەستی لێک هەڵپێکا.

ـ دەنا زۆریش گرینگە، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ ڕاست ئەو شتەیە کە پێویستت پێیەتی، ئەو شتەی ئاواتی بۆ دەخوازی. ئەگەرچی خۆت لێکیان ناکەیتەوە. من بە هیچ شێوەیەک دژی بزووتنەوەی ئێستای ژنان نیم. سەرکەوتنی ژنان و ئازادیی سیاسی ژنان لە داهاتوویەکی نزیکدا ئامانجی سەرەکیی منە. دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، خۆشم کچێکم هەیە، لەو بارەوە خەڵک نامناسن. سەبارەت بەوەش نامەیەکم بۆ ئەشچێدرین[٢] نووسی. ئەو نووسەرە زۆر شتی فێرکردووم، سەبارەت بە شارەزاییی ژن. هەر بۆیە ساڵی ڕابردوو وەک نەناسراوێک نامەیەکی دوو دێڕیم بۆ نووسی: «نووسەری خۆشەویست، لە لایەن ژنێکی مودێڕنەوە، ماچتدەکەم و لە ئامێزت دەگرم، خۆڕاگر بە...» پاشان ئیمزام کرد «دایکێک.»

پێموابوو بە «دایکی سەردەم» ئیمزاکەم باشە، لەوەش دوودڵبووم، بەڵام ئاخری قەناعتم بە «دایک»ی وشک و خاڵی کرد. چونکە زیاتری جوانیی ئەخلاقی تێدایە. لەوانەبوو وشەی «سەردەم» ڕۆژنامەی سەردەمی

---

2- م.ئی. سالتیکۆف ئەشچێدرین (١٨٨٩ـ١٨٢٦) تەنزنووس و ڕۆژنامەنووسی ڕووسی وتەبێژی لیبرالەکان و سەرنووسەری ڕۆژنامەی سەردەم، کە لە ١٨٦٦ بە هۆی سانسۆرەوە داخرا. ئەو ڕووداوەش بۆ ئەو زەبرێکی گران بوو. دواتر یادداشتەکانی وڵاتی باوکیی بڵاو کردەوە.

وەبیر بێنێتەوە ـ بیرەوەریی تاڵوتوونی سانسۆر... خودایەگیان، تۆ چیت لە سەردایە؟

میتیا ئاخری لەجێی خۆی هەستا و لە هەمبەریدا هەردوو دەستی هەڵپێکا و بە پاڕانەوەیەکی هیوابڕاوانەوە هاواریکرد: «خاتوون! ئێوە وەگریانم دەخەن، ئەگەر لەوە زیاترم ماتڵ بکەی و گەورەییی خۆت...»

ـ ئەرێ بگری دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، بگری، چونکە هەستێکی بەرزە... ڕێگایەکی ئاوات بۆ کراوەتەوە! گریان سوکنایی بە دڵت دەبەخشێ و دوای ئەوە بە شادی کردن دەگەڕێیتەوە. بە هەشتاو لە سیبریاوە دێی بۆلام تاکو لەو شادییەتدا منیش بەشدار بم...

میتیا لە ناکاو گوتی: «بەڵام ئیزنم بدەیە، بۆ دوایینجار تکات لێدەکەم، پێمبڵێ، ئەو پارەیەی ئەمڕۆ بەڵێنت دامێ، پێمدەدەی؟دەنا بفەرموون کەی بێمەوە بۆ وەرگرتنی؟»

ـ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، کام پارە؟

ـ ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەی بەڵێنیت پێداوم... ئەویش ئاوا دەست و دڵبازانە.

مادام خۆخلاکۆف بە سەرسام بوونێکی شێتەیییەوە گوتی: «سێ هەزار ڕۆبڵ، ڕۆبڵ؟ ئەیەڕۆ کوا، من سێ هەزار ڕۆبڵم لەکوێ بوو.»

میتیا حەپەسا.

ـ چۆن هەر ئێستا نەتگوت؟... گوتت... گوتت وەبزانە هەر ئێستا لە گیرفانتدایە...

ـ ئەیەڕۆ، لە مەبەستم نەگەیشتی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لەو بارەوە لە مەبەستم نەگەیشتی. من باسی کانگای ئاڵتوونم کرد. ڕاستە بەڵێنی زیاتر و لەڕادەبەدەرترم پێدای، ئێستا وەبیرم هاتەوە، بەڵام من مەبەستم کانگای ئاڵتوون بوو.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، بە شێوەیەکی گەوجانە گوتی: «بەڵام پارە؟ ئەو سێ هەزار ڕۆبڵە؟»

ـ ئەیەڕۆ، ئەگەر مەبەستت پارەیە، هەر نیمە. تاقە کۆپکێکیش شک نابەم. لەگەڵ وەکیلەکەم لە سەر پارە کێشەمان لێپەیدا بووە و لەم ڕۆژنەدا پێنجسەد ڕۆبڵم لە میۆسۆف قەرز کردووە. نا، نا، باسی پارە هەر مەکە. خۆشت دەزانی ئەگەر بشمبوایە پێمنەدەدای. جارێ عادەتم وایە قەت پارە بە قەرز نادەم. چونکە پارە بە قەرزدان یانی لە دەستدانی دۆست و ئاشنا. بەتایبەت تۆ، هەر ناتدەمێ. بۆیەش قەرزت لەگەڵ ناکەم چونکە خۆشمدەوێی و دەمهەوێ نەجاتت دەم. تۆ پێویستیت بە شتێکی دیکەیە، کانگەی ئاڵتوون، کانگەی ئاڵتوون، کانگەی ئاڵتوونت پێویستە!

میتیا گوڕاندی: «بە جحەندەم، هەر نامەوێ!» بەهێز و قەوەتی خۆی مشتێکی بە میزەکەدا کێشا.

مادام خۆخلاکۆف بە شلەژاوی هاواریکرد: ›ئەیڕۆ!» هەڵات بۆ ئەوسەری ژوورەکە.

میتیا تفێکی لە عەرزەکە کرد و بە تاڵووکە لە وەتاغەکە هاتەدەرێ. لە ماڵەکەش دەرپەڕی و پێی نایە سەر شەقام و لە تاریکیدا بزر بوو! وەک شێت و ماخولیا هەنگاوی دەنا و لە سینگی خۆی دەدا، ڕاست لەو شوێنەی دەدا کە دوو ڕۆژ لەمەوبەر لە هەمبەر ئالیووشادا، دوایینجار لە تاریکیدا، لە سەر ڕێگاکە تووشی هات. ئەو لەسینگدانە و لەو شوێنەی، چ مانایەکی بوو، مەبەستیشی لەو کارە چ بوو ـ ئەو شوێنە، لەو کاتەدا، ڕازێک بوو هیچ عەبدوڵبەشەرێک نەیدەزانی چییە و ئالیووشاش هەر نەیدەزانی. بەڵام ئەو ڕازە بۆ ئەو مانای ئابڕووچوون و شوورەیی بوو؛ مانای لە نێو چوون و خۆکوژی. ئەو بڕیارەشی دابوو. هەڵبەت ئەگەر نەیتوانیبایە ئەو سێ هەزار ڕۆبڵە بە کاترینا ئیوانا بداتەوە، نەتوانێ ئەو شوورەیییە لە سنگی و لەو شوێنەی سینگی دەرهێنێ، کە تووشی ئازاری ویژدانی کردبوو. بڕیارەکەی دەبردە سەر و خۆی دەکوشت. دواتر سەر لەبەری ماجەراکە بۆ خوێنەران ڕوون دەبێتەوە. بەڵام ئێستا کە دوایین هیوای خۆی لەدەستداوە، ئەم پیاوە کە ڕواڵەتەن ئاوا بەهێز دیار بوو، کاتێک چەند هەنگاوێک لە ماڵی خۆخلاکۆف

دوور کەوتەوە دای لە پڕمەی گریان. هەنگاوی دەنا و بێ ئەوەی بزانێ چ دەکا و بۆکوێ دەچێ، بە لەپی دەستی فرمێسکی دەسڕی. ئاوا بە شڵەژاوی گەیشتە گۆڕەپانەکە و لە ناکاو خۆی دا بە شتێکدا. دەنگی ناڵەی پیرێژنێکی هاتە گوێ کە بە عەرزیدا دابوو.

ـ ئەوە بۆ وادەکەی خودابتگرێ، خەریک بوو بمکوژی! بۆ چاو لەبەر پێی خۆت ناکەی، هیچوپووچ؟

میتیا بەو تاریکییە پیرێژنەی ناسییەوە، هاواریکرد: «ئەوە تۆی!» کڵفەتێکی پیر بوو، خزمەتی بە سامسانۆف دەکرد، میتیا ڕۆژی پێشوو دیبووی.

پیرێژنەش بە لەبزێکی تەواو جیاواز گوتی: «کاکی بەڕێز ئێوە کێن؟ بەو تاریکە ناتناسمەوە.»

ـ تۆ کڵفەتەکەی ماڵی کۆزماکۆزۆویچ نیت؟

ـ با، خۆمم، بەپەلە دەمویست بچم بۆ ماڵی پرۆخۆویچ... بەڵام ئێستا ئێوە ناناسم.

میتیا کە دڵەڕاوکێ بەجارێ هۆشی لێبڕیبوو، گوتی: «خاتوونی بەڕێز، پێم بڵێ ئاگرافنا ئەلکساندرفنا ئێستا لەلای سامسانۆفە؟ چەند سەعات لەمەوبەر هەتا بەردەرگا لەگەڵی هاتم.»

ـ گرووشنکا! هات بەڵام دوای تاوێک ڕۆیشت.

میتیا گوڕاندی: «چی؟ ڕۆیشت؟ کەنگێ ڕۆیشت؟

ـ هەر ئەو کاتەی هات. یەک دوو دەقیقە ڕاوەستا و ڕۆیشت. قسەیەکی بۆ کۆزماکۆزۆویچ گێڕایەوە و وەپێکەنینی خست و پاشان بەپەلە هەڵات.

میتیا گوڕاندی: «نەگبەتی، درۆ دەکەی!»

پیرێژنە قیژاندی: «های! های!» بەڵام میتیا غەیب بووبوو.

میتیا بە پڕتاو بەرەو ماڵی گرووشنکا هەڵات. کاتێک گەیشتە ئەوێ، گرووشنکا بەرەو ماکرۆیە وەڕێ کەوتبوو، چارەگێک دوای ڕۆیشتنەکەی بوو. فینیا لەگەڵ دایەگەورەی، ماتریۆنا، کە ئاشپەزێکی پیر بوو، لە چێشتخانەکە

دانیشتبوون، سەروان خۆی کرد بە ژووریدا. فینیا هەرکە چاوی پێیکەوت قیژاندی.

میتیا گوڕاندی: «قیژە قیژ مەکە، لە کوێیە؟» بەڵام بێئەوەی دەرفەتی قسەکردن بە فینیای ترس لێنیشتوو بدات، لەبەر پێیدا سەری نایە زەوی.

- فینیا گیان تۆ گیانی مەسیح پێمبڵێ لە کوێیە؟

فینیا بە سوێند و حاشاوە گوتی: «نازانم. دیمیتری فیۆدۆرۆویچی بەڕێز، نازانم. ئەگەر بشمکوژی ئیختیارت هەیە، بەڵام ناتوانم پێتبڵێم. خۆت چەند سەعات لەمەوبەر لەگەڵی ڕۆیشتییە دەرێ...»

- ئەو گەڕاوە؟

- ڕاستت دەوێ نا، بەخودا نەگەڕایەوە.

میتیا هاواریکرد: «درۆ دەکەی. بەو ترسەتدا دەزانم لە کوێیە.»

میتیا دەرپەڕی بۆ دەرێ. فینیا لەگەڵ ئەوەی نیوەگیان بووبوو لە ترسانا، گەشایەوە کە ئاوا بە ئاسانی نەجاتی بووبوو. بەڵام دەیزانی میتیا لەبەر پەلەپەل فریا نەکەوتووە، دەنا سەد ڕۆحی پێبوایە ڕۆحێکی دەرنەدەبرد. بەڵام میتیا بەو هەڵاتنە کتوپڕەی و بەو کردەوە چاوەڕوان نەکراوەی فینیا و ماتریۆنای تووشی سەرسووڕمان کرد. ئاونگێکی برنجی لە سەر مێزەکە بوو، دەسکاونگەکەی لە نێویدا بوو، دەسکاونگێکی چکۆلەی برنجی، درێژییەکەی بستێک دەبوو. میتیا بە دەستێکی دەرگاکەی کردەوە و بە دەستەکەی دیکەی دەسکاونگەکەی نایە گیرفانی و هەڵات.

فینیا لەگەڵ ئەوەی دەستی هەڵێنا هاواریکرد: «خودایە! ئەو دەیهەوێ کەسێک بکووژێ!»

## (٤)

# له تاریكیدا

هەڵدەهات بۆ كوێ؟ وادیاره گرووشنكا «جگه لهماڵی فیۆدۆرپاولۆویچ بۆ هیچ كوێیەكی دیكه نەچووه! ڕەنگه هەر له ماڵی سامسانۆفەوه هەڵاتبێ بۆلای ئەو، ئێستا ئەوەی لێ ڕوون بوو. هەموو فێڵ و تەڵەكەكەی ئاشكرا بوو»... هەموو ئەوانه وەك گێژەڵووكه له مێشكی هالان. بەرەو ماڵی ماریا كاندراتیفنا نەچوو، «پێویست نەبوو بچێ بۆ ئەوێ... چوونی ئەوێ ڕێزەیەكیش پێویست نەبوو... چونكه ئەوان به هەڵەداوان دەچوون و هەواڵەكەیان ڕادەگەیاند.... ماریا كاندراتیفنا به ئاشكرا دەستی لەو دۆلاب و دەهۆیەدا بوو. ئیسمیر دیاكۆفیش، بەڵێ ئەویش، هەموویانیان كڕیبوو!»

پیلانێكی دیكەی دارشت: دەورێكی ماڵی فیۆدۆرپاولۆویچی لێدا و له كۆلانەكه تێپەڕی، به هەڵاتن بەرەو شەقامی دیمیترڤێسكیدا گەڕا. پاشان له پردی چكۆڵه پەڕییەوه و ڕاست به كۆلانه چۆڵەكەی پشتەوەدا ڕۆیی، كۆلانێكی چۆڵوهوڵ كه هاتوچۆی به سەروه نەبوو، لایەكی تەیمانی جیران باخەكه بوو، لایەكەی دیكەشی نەرده و پرژینی باخەكەی فێودۆر پاولۆیچ بوو. بۆ چوونه نێو باخەكەی باوكی شوێنێكی هەڵبژارد، وادیار بوو هەر ئەو شوێنه بوو ـ وەك دەیانگوت ـ كه لیزاوتای بۆگەنیو كاتی خۆی پێیدا هەڵگەڕا بوو. ئەم بیرۆكەیەش خودا دەزانێ بۆ ـ بەزەینیدا هات. «ئەگەر ئەو توانیبێتی لەو نەردانه وەسەركەوێ، منیش دەتوانم.» لەڕاستیدا خۆی هەڵدا و هەر لەڕێوه و به ئاسانی دەستی له لای سەرووی نەردەكه گیركرد. پاشان چالاكانه پێیدا هەڵگەڕا و له سەر لاتەنیشت دانیشت. لەو نزیكانه، له نێو

باخەکەدا حەمامێکی لێبوو، بەڵام لە سەر نەردەکانەوە پەنجێرە ڕووناکەکەی ماڵی فیۆدۆر پاولۆویچیش دیار بوو، «بەڵێ، چرای ژووری خەوەکەی باوکی نەکوژابۆوە، گرووشنکا لەوێیە!» بە سەر نەردەکاندا بازیدا ئەودیو. ئەگەرچی دەیزانی گریگۆری و ئیسمیر دیاکۆف هەردووکیان نەخۆشن و هیچکەس گوێی لە ترپەی پێی نابێ، بەڵام بە شێوەیەکی غەریزی خۆی شاردەوە، ئارام لەجێی خۆی ڕاوەستا و هەستی ڕاگرت. بێدەنگییەکی قورس وڵاتی داگرتبوو. وادیار بوو پیلانەکەی تائیرە بە دڵ بوو. «لە هیچ لا خشپەیەک نایە، جگە لە ویرەویری بێدەنگی،»[3] ئەم دێڕە لەبەر هۆیەک بەزەیندا تێپەڕی. «خودا بکا کەس گوێی لە تەپەی پێم نەبووبێ کاتێک بە سەر نەردەکاندا بازمدا! پێشم وانییە کەس گوێی لێبووبێ.» دوای تاوێک ڕاوەستان، بەئەسپایی بە سەر گژ و گیای باخەکەدا هەنگاوی نا.خۆی لە داروبنچکەکان لادەدا. بە پێدزکە لاقی دادەنا و گوێی لە خشپەی بەئاستەمی هەنگاوی خۆی بوو. تا گەیشتە بەر پەنجەرەکە پێنج دەقیقەی خایاند. وەبیری هاتەوە ڕاست لە بن دیواری بەر پەنجەرەکەدا چەند بنجە تووترک و فندقی سپی لێیە. دەرگای لای دەستەچەپی ماڵەکە داخرا بوو. کاتی تێپەڕین بە وردی سەرنجی دابوو. ئاخری خۆی گەیاندە بنچک و دەوەنەکان و لە بنیاندا خۆی حەشاردا. پشووی لە سنگیدا ڕاگرت. لەدڵی خۆیدا: «ئێستا دەبێ سەبر بگرم، با ئەگەر گوێیان لە تەپەی پێم بووبێ دڵنیا بن... خودا بکا کۆخین و پشمین لام لێ لادەن.»

دوو دەقیقە هەستی ڕاگرت. دڵی بە پڕتاو لێیدەدا، چەند ساتێک لەوانە بوو هەناسەی ڕاوەستێ. لەبەر خۆیەوە گوتی:«وادیارە، ئەم دڵەتەپییەم تەواو نابێ، ئیتر ناتوانم ڕاوستم.» لەبن سێبەری بنچکێکدا چەقیبوو. شەوقی پەنجێرەکە لەلای پێشەوەی بنچکەکەی دابوو. ورتەیەکی لێوەهات و نەشیزانی بۆ:«ئەو دەنکە فندقە سپیانە چەندە سوورن!» بە ئەسپایی و پێدزکە لە

3- وەرگێراوێکی ناڕاستەوخۆ لە دێڕە شیعرێکی پووشکین، لە زمان «ڕۆسلان ڤۆلی یۆدمیلا»وە. ئەسڵی دێڕە شیعرەکە ئاوایە: «بیر دەکاتەوە... بێدەنگی ویرەویری دێ.»

پەنجێرەکە نزیک بۆوە و لە سەر نووکی لاقی خۆی هەڵێنا. چاوی بە ژووری خەوەکەی باوکیدا گێڕا. وەتاغێکی گەورە نەبوو، پەردەیەکی سوور کردبووی بەدوو بەشەوە. فیۆدۆرپاولۆویچ بەو پەردەیەی دەگوت «چینی» وشەی «چینی» لەزەینی دیمیتری دەرپەڕی و لە دڵی خۆیدا گوتی:«گرووشنکا لە پشت پەردەکەیە.» چاوی لە فیۆدۆرپاولۆویچ کرد جلە خەوێکی هەوریشمین و ڕی ڕێی لەبەردا بوو -کە میتیا ئەوەی پێشتر نەدیبوو- بەنە خوێنێکی هەورێشمینی گوڵنگە داریشی لە نێو قەدی بەستبوو. کراسێکی خاوێن و جوانی کەتانیی بە دوگمەی زێڕینەوە لە بەردا بوو، لە بەرۆکی ئاوەڵای جلە خەوەکەیەوە دیار بوو. فیۆدۆرپاولۆویچ ئەو پەڕۆ سوورەی لە سەری پێچابوو کە میتیا دیتبووی.

میتیا لە دڵی خۆیدا گوتی: «چۆنی خۆی ڕازاندۆتەوە و نەخەوتووە.» باوکی لە نزیک پەنجێرەکە ڕاوەستابوو. لەوەش دەچوو نوقمی بیر و خەیاڵ بێ. لە ناکاو سەری هەڵێنا، تۆزێ هەستی ڕاگرت، کە زانیی هیچ خشپەیەک نایە، چوو بۆلای مێزەکە و لە تۆنگەڵەکە نیوە پەرداخێکی براندی تێکرد و نای بە سەریەوە. پاشان هەناسەیەکی هەڵکێشا و ساتێک ئارام ڕاوەستا. بە شڵەژاوی ڕۆیی بۆ بەر ئاوێنە بالانوێنەکە. بە دەستی ڕاستەی پەڕۆ سوورەکەی تۆزێ لە سەر نێوچاوانی هەڵکێشا و چاوی بە برین و هەڵتۆقیوییەکانی تەوێڵ و لاجانگیدا گێڕا کە هێشتا چاک نەبووبوونەوە. میتیا لەبەر خۆیەوە گوتی: «بەتاقی تەنیایە، دیارە بە تەنیایە.» فیۆدۆرپاولۆویچ لە ئاوێنەکە دوور کەوتەوە، لە ناکاو هاتە بەر پەنجێرەکە و چاوی لە دەرێ کرد. میتیا خێرا بەرەو تاریکی خوشی. «لەوانەیە گرووشنکا لە پشت پەردەکە بێ.» بە دڵگوشراوی بیریکردەوە: «ڕەنگە ئێستا خەوی لێکەوتبێ.» فیۆدۆرپاولۆویچ لە پەنجێرەکە دوور کەوتەوە. «بۆ دیتنی ئەو لە پەنجێرەکەوە دەڕوانێ، کەوایە ئەو لەوێ نییە. دەنا بۆ لەخۆڕا چاو لە تاریکی دەبڕێ. ئاراوقارای لێهەڵگیراوە.» میتیا خێرا گەڕایەوە جێگاکەی پێشووی و چاوی لە نێو وەتاغەکە بڕی. پیرەپیاو وا دیارە هیوابڕاوانە، لە پشت مێزەکە

دانیشتبوو. ئاخری هەنیشکی لە سەر مێزەکە دانا و ڕوومەتی ڕاستەی نایە سەر لەپی دەستی. میتیا بە وردی و تامەزرۆیی چاوی لە سەر هەڵنەدەگرت.

دیسان دووپاتیکردەوە: «بە تاقی تەنیایە، بە تەنیایە! ئەگەر گرووشنکا لێرە بوایە، وا نەدەبوو.» سەرسام بوون لەوەی گرووشنکا لەوێ نییە، خەمێکی سەیر و گەوجانە دڵی داگرت. هەر لەڕێوە دڵخۆشیی خۆی دایەوە: «مەسەلە ئەوە نییە کە لێرە نییە، بەڵام مەسەلە ئەوەیە لێمڕوون نییە لێرەیە یان نا.» میتیا دواتر وەبیری هاتەوە لەو ساتەدا زەینی لە ڕادەبەدەر ڕووناک بوو، لە هەموو شتێکیش دەگەیشت. بەڵام دڵەڕاوکێ و خەم و دڕدۆنگی جار لەگەڵ جار زیاتر دڵی دادەگرت. «بڵێی لێرە بێ یان نا؟» ئەو گومانە پڕ لە حەسرەتە دڵی داگرت و لە ناکاو بڕیاریدا، دەستی بردە پێشێ و بە نەرمی لە شووشەی پەنجێرەکەی دا. هەر ئەو جۆرەی لەگەڵ ئیسمیر دیاکۆف قەراری دانابوو، دوو جار هێواش و پاشان سێ جار بە توندی، تەق ـ تەق ـ تەق، کە ماناکەشی ئەوە بوو، «گرووشنکا لێرەیە!» پیرەپیاو داچڵەکی، سەری هەڵێنا و بەپەلە دەرپەڕی و هات بۆبەر پەنجێرەکە. میتیا بەرەو تاریکییەکە خوشی. فیۆدۆرپاولۆویچ پەنجەرەکەی کردەوە و ملی کێشا دەرێ.

بە سرتەیەکی لەرزۆک گوتی: «تۆی گرووشنکا؟ تۆی؟ لەکوێی فریشتەکەم، لەکوێی؟ تینوتاو وە هەناسەبڕکێی خستبوو.

میتیا بۆی دەرکەوت «بەتاقی تەنیایە.»

پیرەپیاو دیسان بە نەرمی هەرای کرد: «لەکوێی؟» زیاتر سەری کێشایە دەرێ و هەتا شانی لە دەرێ بوو چاوی بە ڕاست و چەپدا گێڕا. «وەرە بۆ ئێرە، دیارییەکی چکۆلەم بۆ داناوی، وەرە با نیشانتی دەم...»

میتیا لە دڵی خۆیدا گوتی: «مەبەستی ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەیە.»

ـ ئاخر لە کوێی؟ لەبەر دەرگاکەی؟ هەر ئێستا دێم دەیکەمەوە.

پیرە پیاو سەری لە پەنجێرەکە هێنابووە دەرێ و بەلای ڕاستدا دەیڕوانی، بۆلای درگایەک کە بەرەوڕووی باخەکە دەکرایەوە. چاوی لە تاریکییەکە بڕیبوو و هەوڵی دەدا تارماییەک ببینێ. ساتێکی دیکە، بێ ئەوەی چاوەڕوانی

وەڵامی گرووشنکا بێ، حەتمەن هەڵدەهات بۆ کردنەوەی دەرگاکە. میتیا بێئەوەی لەجێی خۆی جووڵە بکا، چاوی لێدەکرد. لاسەری پیرەپیاو و بەرخەبەبە شۆڕەکەی و لووتە قەڵەنگییەکەی، میتیا پێی خۆشبوو کوێر بێ و نەیبینێ. لێوی بە پێکەنینێکی تامەزرۆ دەلەرییەوە، کە شەوقی چرای ژوورەکە لەلای چەپەوە لە ڕوخساری دابوو و میتیا دەیدی. ڕقێکی ئەستوور لە ناکاو دڵی میتیای داگرت و خوێن بەری چاوی تەنی: «ئێستا ئەو ڕەقیبەی، پیاوێک کە ئازاری دەدا و ژیانی لێتاڵکردبوو و وەزاڵەی هێنابوو!» ئەم ڕقەش هەر ئەو قینە ئەستوور و لەناکاوەی چوار ڕۆژ لەمەوبەری نێو خانەباخەکە بوو کە ئالیووشا لە وەڵامی هەڕەشەکەیدا گوتبووی: «چۆن دەتوانی بڵێی باوکی خۆت دەکوژی؟»

ئەویش گوتبووی: «نازانم، نازانم، ڕەنگە بیکوژم، یان نەیکوژم. بەداخەوە لەو کاتەدا، بەو دەمووچاوە قێزەونەیەوە، بەجارێ ئاراوقارام لێهەڵدەگرێ. ڕقم لەو بەرخەبەبە و کەپوو و چاوانەی و ئەو تاڵەبزە حێز و تۆلازانەیەتی. بێزم لێی هەڵدەستێ. هەر لەوە دەترسم، هەر بۆیە دەترسم وام لێبێ نەتوانم خۆم ڕاگرم و...»

ئەو هەستە تاڵ و قێزەونە ئیتر تاقەتی لێبڕیبوو. میتیا ئیتر هۆش و ئیختیاری نەمابوو. لە ناکاو دەسکاونگەکەی لە گیرفانی دەرهێنا.

***

میتیا دواتر خۆی گوتی: «لەو کاتەدا خودا خستبوومیە ژێر چاوەدێری.» لەو کاتەدا گریگۆری بە نەخۆشی لە پێخەفەکەی هاتە دەرێ. سەر لە ئێوارێ دەوا و دەرمانیان پێدابوو، کە ئیسمیر دیاکۆف بۆ ئیوان فیۆدۆرۆویچی باسکرد. گریگۆری لەشی خۆی بە ماجوومێکی دروستکراو بە ودکا و دەمکراوێکی گیایی داماڵیبوو، ماجوومەکە زۆر بە قەوەت بوو، پاشماوەکەشی دوای ئەوەی مارتای ژنی «دۆعایەکی تایبەت»ی بەسەردا خوێند و فووی لێکردبوو، خواردبوویەوە و خزابووە جێوبانەکەیەوە. مارتا ئیگناتیفناش

قومێکی لێخواردبۆوە و چونکە عادەتی بە خواردنەوەی مەشرووب نەگرتبوو، وەک مردوو لە پاڵ مێردەکەیدا تخێڵ بووبوو.

بەڵام گریگۆری، شەوێ لە ناکاو خەبەری بۆوە و دوای تاوێک هەستا و لە سەر جێوبانەکەی دانیشت، ژان و برکێکی تاقەتبڕ لە پشت و کەلەکەی گەڕابوو. دوای ئەوەی تۆزێ دانی بە خۆیدا گرت هەستا سەرپێ و خۆی پۆشتە کردەوە. ڕەنگە وەبیری هاتبێتەوە، خەوی لێکەوتووە و ماڵەکە «لە کاتێکی ئاوا پڕ مەترسیدا» بەبێ کێشکچی ماوەتەوە، بۆیە تووشی ئازاری ویژدان بوو. ئیسمیر دیاکۆفیش نەخۆشی کەلەلا و کۆڵەکوتراوی کردبوو و لە وەتاغەکەی دیکە جووڵەی لێبڕابوو. مارتا ئیگناتیفناش نەدەبزووت. گریگۆری چاوێکی لێکرد و لەبەر خۆیەوە گوتی: «کوا تۆ قەوەت بەو ماجوومە دەشکێ ژنەتیوە.» بە ناڵە ناڵ هاتە دەرێ و گەیشتە سەر قاڵدرمەکان. بێگومان دەیویست لە سەر پلیکانەکانەوە چاوێک بە حەوش و بانەکەدا بگێڕێ، چونکە بەحاڵ دەیتوانی بەڕێدا بڕوا. ژانی پشت و لاقی ڕاستەی بڕستی لێبڕیبوو. بەڵام لە ناکاو وەبیری هاتەوە ئێواری دەرگا چکۆڵەکەی باخەکەی دانەخستووە، ئەو لە وردبینی و مشوور خواردندا بێ وێنە بوو. پێڕەویی لە بارودۆخێکی نەگۆڕ و خووخدەیەک دەکرد کە ساڵانێکی زۆر دەوامی دێنا. بە شەلەشەل و لەخۆ نووسان و تاملکردنی ژان، لە پلیکانەکان هاتە خوارێ ڕۆیی بۆلای باخەکە. بەڵێ دەرگاکە لە سەر ڕەقی پشت کرابۆوە. بێئیختیار ڕۆیی بۆ نێو باخەکە. ڕەنگە هەستی بە شتێک کردبێ. ڕەنگە دەنگێکی بیستبێ. سەری بۆلای چەپ وەرسووڕاند و دیتی پەنجێرەی ژووری ئەربابەکەی ئاوەڵایە. لەوکاتەدا، چاوی بە کەسێک کەوت لەوێوە ملی کێشابوو و چاوی لە دەرێ دەکرد.

گریگۆری لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەو پەنجەرەیە بۆ کراوەتەوە؟ خۆ هاوین نییە، » لەو کاتەدا کتوپڕ چاوی بە شتێکی سەیر کەوت لە نێو باخەکەدا، لەدوورەوە تاپۆیەکی دی لە نێو باخەکەوە هەڵدەهات. کەسێک بوو بە پڕتاو هەڵدەهات. گریگۆری بێئیختیار هاواریکرد: «خودایەگیان!» ژانی پشتی لەبیر

چۆوه وبه هەڵاتن چوو ڕێ لەو تاپۆیه بگرێ. ویستی نێوبڕ وەدووی کەوێ و پێشاوبڕی بداتەوە، دیاربوو باخەکەشی وەک لەپی دەستی دەناسی. تاپۆ ڕاکردووەکه ڕۆیی بۆلای حەمامەکە. خۆی گەیاندە پشتی و هەڵات بۆلای شیشبەندەکە. گریگۆری بێئەوەی چاوی لە سەر هەڵگرێ، هەموو شتێکی لەبیر چۆوە و وەدوای کەوت. کاتێک گەیشتە نەردەکان، کابرا خەریک بوو پێیدا هەڵدەگەڕا. گریگۆری ـ بێئیختیار ـ هاواریکرد و هێرشی بۆبرد و بە هەردوو دەستی لاقی گرت.

بەڵێ، دڵی خەبەری پێدابوو. ناسییەوە، خۆی بوو، ئەو «دێوە باوککوژە بوو.»

پیرەپیاو نەڕاندی: «هەی باوککوژ» وای نەڕاند تەواوی جیرانەکان گوێیان لێبوو. بەڵام فریا نەکەوت لەوە زیاتر هاوار بکات، وەک ئەوەی برووسکە لێیدابێ کەوت بە عەرزیدا. میتیا گەڕایەوە سەری و دانەوی چاوی لە گریگۆری کرد. دەسکاونگێکی بە دەستەوە بوو، فڕێیدا نێو گژ و گیای باخەکەوە. دەسکاوەنگەکە دوو هەنگاو لەولای گریگۆرییەوە کەوت، بەڵام نەکەوتە نێو گیا و گژەکەوە، هەڵبەزییەوە و کەوتە سەر توولە ڕێی نێو دارەکان، شوێنێکی ئاشکرا و بەرچاو. تاپۆکە چەند ساتێک لە ژوور سەری گریگۆری چۆکیدا و چاوی لێکرد. سەری پیرەپیاو لە خوێنا شەڵتان بووبوو. میتیا دەستی برد و بە نووکی قامکی سەری بەلادا خست. دواتر بە ڕوونی وەبیری هاتەوە کە زۆری خەم بووە. «بۆ ئەوەی دڵنیا بێ» کاژەڵاکی پیرەپیاوی شکاندووە یان تەنیا بە زەبری دەسکاوەنگەکە «گێژی کردووە.» بەڵام بە خوڕ خوێنی لێدەهات؛ خوێنێکی گەرم، لەڕێوە پەنجەی میتیای خووساند. وەبیری هاتەوە و دەسرەیەکی سپیی خاوێنی دەرهێنا کە بۆ دیدار لەگەڵ مادام خۆخلاکۆف نابوویە گیرفانی. سەری گریگۆریی بە دەسرەکە پێچا و بە دەستە بێهێز و سڕەکەی هەوڵیدا خوێنی سەر و ڕوومەت و لاجانگی پاککاتەوە.

میتیا لە ناکاو خۆی کۆ کردەوە و کەوتە بیر کردنەوە: «خودایە گیان! بۆ ئاوام کرد؟ ئەگەر کاسە سەریم شکاندبێ، چۆن بزانم؟» پاشان بە هێوابڕاوی گوتی: «ئێستا فەرقی چییە؟ ئەگەر کوشتبێتم، کوشتوومە...» بە دەنگێکی بەرزیش گوتی: «پیرەپیاو بە ڕێوی دەرچووی، کەوایە هەر لێرە لالەخەو بکە!» لە ناکاو گەڕایەوە بۆلای نەردەکە و پێیدا هەڵگەڕا و بازیدایە کۆڵان و دەرباز بوو ـ دەسرە خوێناوییەکەی هەروا لە مشتیدا گرمۆڵە کردبوو، بە دەم هەڵاتنەوە نایە گیرفانی باخەڵی باڵتەکەی. بە شڵەژاوی هەڵدەهات و چەن کەسی ڕێبوار بەو تاریکە لە سەر شەقامەکە دیتبوویان، دواتر وەبیریان هاتەوە ئەو شەوە پیاوێکیان دیتووە، دەم لە سەر پشت هەڵدێ. دیسان هەڵات بۆلای ماڵی ژنەکەی مارازۆفی ڕەحمەتی.

ئەو ڕۆژە عەسر، دوای ئەوەی میتیا لەو ماڵە هاتە دەرێ، فینیا هەڵاتبوو بۆلای نازار ئیوانیچی درگاوان و سوێندی دابوو کە «لەمەبە بەولاوە ڕێگا بە «سەروان» نەدا بچێتە ژووری.» ئەویش بەڵێنیدا نەهێڵێ. بەڵام کاتێک ئەربابەکەی بانگیکرد بۆسەرێ، چوو بۆلای ئەرباب و لەوێ چاوی بە کوڕێکی بیست ساڵان کەوت کە تازە لە گوندەوە هاتبوو، کوڕەی لەجێی نازار ئیوانیچ دانا، بەڵام درگاوانی پێشوو لەبیری نەبوو ناوی سەروانی پێ‌بڵێ. میتیا هەڵات بۆ بەر درگاکە و لە درگای دا. کوڕە هەر لەڕێوە ناسییەوە، چونکە میتیا چەند جاری پارە پێ‌دابوو. خێرا دەرگای لێکردەوە و بە بزەیەکی شیرین و خوڵک خۆشانەوە پێی‌گوت: «ئێستا ئاگرافنا ئەلکساندرفنا لە ماڵێ نییە.»

میتیا لەجێی خۆی وشکبوو و پرسیی: ئەی چووە بۆ کوێ، پیرۆخۆر؟»

ـ ئەمڕۆ ئێوارە نزیکەی دوو سەعات لەمەوبەر، لەگەڵ تیمووتی بەرەو ماکرۆیە وەڕێکەوت.

میتیا گوڕاندی: «بۆ چوو؟»

ـ ئیتر نازانم، چووە بۆ دیدەنیی ئەفسەرێک، کەسێک بانگهێشتی کرد و عارەبانەی نارد بە دوایدا.

میتیا لەوێ دوور کەوتەوە و وەک شێت و هار ڕۆیی بۆلای فینیا.

# (٥)

## بڕیارێکی کتوپڕ

فینیا لەگەڵ دایەگەورەی لە چێشتخانەکە دانیشتبوو. ئەوان دەیانویست بڕۆن بخەون. لە نازار ئیوانیچ خاترجەم بوو، بۆیە دەرگاکەی دانەخستبوو، میتیا خۆی کرد بە ژووریدا، هێرشی بۆ فینیا برد و دەستی نایە گەرووی.

بە ڕقێکی ئەستوورەوە گوڕاندی: «زووکە پێمبڵێ لەکوێیە؟ ئێستا لە ماکرۆیە لەگەڵ کێ دەژی؟»

هەردوو ژنەکە قیژاندیان.

فینیا لە ترسانا وەک شەقشەقە دەلەرزی، بە هەناسەبڕکێ گوتی: «باشە، پێتدەڵێم، باشە دیمیتری فیۆدۆرۆویچی بەڕێز پێت دەڵێم. هەموو شتێکت پێدەڵێم، بەخودا هیچت لێناشارمەوە. ڕۆیشت بۆ ماکرۆیە، چووەوە بۆلای ئەفسەرەکەی»

میتیا گوڕاندی: «کام ئەفسەر؟»

فینیا تا ئەوجێیەی بۆیکرا دەنگی هەڵێنا و بە قرخەقرخ گوتی: «ئەو ئەفسەرەی گرووشنکای دەناسی، هەر ئەوەی پێنج ساڵ لەمەوبەر دەری کرد.»

میتیا دەستی لە قوڕقوڕاچکەی کچە کردەوە: وەک مردوو، لە هەمبەر فینیادا ڕاوەستا، سپی هەڵگەڕا، زمانی لەگۆ کەوت، بەڵام چاوی هەموو شتێکی دەنواند، هەموو شتێک، هەر لە یەکەم وشەوە تا ئاخر هەموو شتێکی بۆ دەرکەوت و تێگەیشت. فینیای بەستەزمان لەو کاتەدا وا ترسابوو نەیدەوێرا چاوی لێبکا، چاویشی لێبکردایە لە بارودۆخێکدا نەبوو کە بزانێ میتیا تێگەیشتووە یان نا. لە سەر یەغدانێک دانیشتبوو، هەر بەو شێوەی کاتێ میتیا خۆی کرد بە ژووریدا، سەرتاپای دەلەرزی و هەر دوو دەستی بەرز

کردبۆوە وەک ئەوەی بپارێتەوە و داوا لە کەسی ڕووبەڕووی بکا لێی نەچێتە پێشێ. دەتگوت بەو شێوەیە وشک بووە. چاوی ترساو و بە مۆلەق وێستاوی لە میتیا بڕیبوو. ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر تۆقاندبووی دەستی خوێناویی میتیا بوو. لە ڕێگا، کاتێ هەڵاتن، وا دیارە ئارەقەی نێوچاوانی سڕیوە، بۆیە ڕوومەتی ڕاستەی و نێوچاوانی خوێناوی بوو. فینیا هەر ئەوەندە بوو گیانی دەرنەدەچوو. دایەگەورەی فینیاش هەستابووە سەرپێ و لە ترسانا دەتگوت شێتبووە، هۆش و ئیختیاری لێبڕابوو و بە چاوانی ترس لێنیشتووەوە لە میتیای دەڕوانی.

میتیا چەند چرکە ڕاوەستا، لە ناکاو وەک ئەوەی بکەوێ و هێزی لێبڕابێ لە سەر کورسیلەیەکی پەنا فینیا دانیشت. بەڵام نەک بڵێی بیری دەکردەوە، دەتوانین بڵێین بێهەست و زرا و تۆقیو. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شتێک مەعلووم بوو: نەقڵی ئەو ئەفسەرەی بیستبوو و لە هەموو شتێک ئاگادار بوو. لە گرووشنکای بیستبوو کە مانگێک لەمەوبەر نامەیەکی ناردووە. وادیارە مانگێک، مانگێکی تەواو ئەو مەسەلەیە بە دزیی ئەوەوە لە گۆڕێدا بووە و فینیا تەنیا لە بیری کۆنە مێردەکەیدا بووە و ئەمی هەر بە پیاویش نەزانیوە و بیری لێنەکردۆتەوە! بەڵام چۆن، چۆن بیری لەم نەکردۆتەوە؟ ئاخەر بۆ ئەو ئەفسەرەی ئاوا بە ئاسانی لەبیر بردبۆوە؟ خۆ گرووشنکا پێشی گوتبوو بەڵام ئەم بۆ هەمیەتێکی نەدابوویە و لەبیری چوو بۆوە؟ ئەمە پرسیارێک بوو وەک ڕمووزن لە هەمبەر میتیادا قوت بووبۆوە. بە ترسەوە چاوی لەو دێوەزمەیە دەکرد و لە ترسانا وشک بووبوو.

بەڵام لە ناکاو، وەک منداڵێک بە ئارامی و نەرمونیانی دەستیکرد بە قسەکردن. چاوی لە فینیا بڕیبوو، دەتگوت هەر لە بیریشی نییە تاوێک لەمەوبەر ئەو کچە فەقیرەی چۆن ترساندووە و ئازاری داوە. زۆر بە وردی دەستیکرد بە پرسیار کردن لە فینیا، ئەو پرسیارانەش لەو بارودۆخە ڕۆحییەی ئێستایدا جێی سەرسووڕمان بوو. کچە چاوی زەق کردبۆوە و چاوی لە دستە خوێناوییەکانی بڕیبوو. بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر و خێرا

وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە. دەتگوت تامەزرۆیە هەموو ڕاستییەکان بدرکێنێ و ئەوەی دەیزانێ پێیبڵێ. وردە وردە تەنانەت بە جۆرێ تاموچێژەوە قسەی بۆ میتیا دەگێڕایەوە، بێئەوەی بیهەوێ ئازاری بدا، یان داخ بنێتە سەر دڵی، بە پێچەوانە تامەزرۆ بوو گەورەترین خزمەتی پێبکا. تەواوی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەی بە وردی بۆ گێڕایەوە. دیداری ڕاکتین و ئالیووشا، کێشک دێرانی خۆی، ڕۆیشتنی گرووشنکا و لە پەنجێرەوە سەر دەرهێنانی و بە ئالیووشای گوتبوو سڵاوی میتیا بگەیەنێ و پێیبڵێ «قەتی لەبیر نەچێ کە تاقە سەعاتێک خۆشم ویستووە.» میتیا بە بیستنی ئەم قسەیە، لە ناکاو زەردەیەکی گرت و گەشایەوە. هەر لەو کاتەدا فینیا بێئەوەی بترسێ گوتی:

ـ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، چاو لە دەستت کە هەمووی خوێناوییە!

میتیا لە ناکاو وەڵامی دایەوە: «ئەرێ.» بە وردی چاوی لە دەستی خۆی کرد و لەڕێوە لەبیری چۆوە، تەنانەت پرسیارەکەی فینیاش. دیسان لە دەریای بێدەنگیدا نوقم بۆوە. لەو کاتەوە خۆی کردبوو بە ژووریدا، بیست دەقیقە گوزەرابوو و ئەو ترسەی پێشووی نەمابوو، بەڵام دیاربوو بڕیارێکی تازە و لێبڕاوانە سەرتاپای داگرتووە.

فینیا دیسان ئاماژەی بە دەستی کرد، گوتی: «قوربان، چیبووە، بۆ دەستت خوێناوییە؟» دڵسۆزانە قسەی لەگەڵ دەکرد. دەتگوت لەو خەمەی میتیادا خۆی بە شەریک دەزانێ و لە دڵەوە هەستیپێدەکا. میتیا دیسان چاوی لە دەستی کردەوە.

لەگەڵ ئەوەی بە شێوەیەکی سەیر چاوی لە فینیا دەکرد گوتی: «فینیا ئەمە خوێنە، خوێنی مرۆڤ، بەڵام، خودایە بۆ، بۆ ڕژاوە؟ بەڵام... فینیا... لێرە نەردەیەکی بەرز هەیە.» (جۆرێک چاوی لە فینیا دەکرد کە دەتگوت دەیهەوێ مەتەڵۆکەیەکی لێداهێنێ.) «نەردەیەکی بەرز، کە چاو لێکردنەکەشی پیاو دەتۆقێنێ. بەڵام سبەینێ بەیانی، کە خۆر هەڵات، میتیا بە سەر ئەو نەردەیەدا بازیدەدا.... فینیا، نازانی کام نەردە دەڵێم، بەڵام گوێی مەدەیە... سبەینێ بۆت دەردەکەوێ... بەڵام ئێستا خوداحافیز. ئیتر خۆم تێهەڵناقوتێنم. وازیلێدێنم،

دەزانم چۆن وازی لێبێنم. کەیفی خۆت بکە، مایەی ژیانم.. سەعاتێک خۆشت ویستم، میتینکا کارامازۆفت هەمیشە ئاوا لەبیر بێ... هەمیشە میتنکات پێدەگوتم، لەبیرتە؟»

ئەو قسانەی کرد و لە ناکاو لە چێشتخانەکە چووە دەرێ. ئەو ڕۆیشتنە کتوپڕەی میتیا، لە کاتی خۆ بە ژووریدا کردن و ئاوقابوونی زیاتر فینیای شڵەژاند.

دوای دە دەقیقەی تەواو، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ ڕۆیشت بۆلای پیووتێر ئیلیچ پێرخۆتین، ئەو کارمەندە لاوەی دەمانچەکەی لەلای بە بارمتە دانابوو. سەعات هەشت و نیو بوو، پیوتێر ئیلیچ چایی عەسرۆژەی خواربۆوە، باڵتەکەی لەبەر کردبۆوە و دەیویست بۆ کایەی بیلیارد بچێ بۆ میترۆپۆلیس. خەریکبوو دەهاتە دەرێ میتیا خافڵگیری کرد. پیووتێر ئیلیچ کە چاوی بە دەمووچاوە خوێناوییەکەی میتیا کەوت، بە سەرسوڕمانەوە هاواریکرد:

ـ خوایە گیان! ئەوە چبووە؟

میتیا بە توندی گوتی: «هاتووم بۆ دەمانچەکەم، پارەم بۆ هێناوی. زۆریشت لێ مەمنوونم. پیوتێر ئیلیچ، زۆر بە پەلەم، تکایە مەحتەلم مەکە.»

پیوتێر ئیلیچ زۆر زیاتر لە پێشوو سەرسام بوو. لە ناکاو چاوی بە چەکەیەک پارە کەوت بە دەست میتیاوە. چونکە میتیا جۆرێک پارەکەی بە دەستی ڕاستەی گرتبوو و دەتگوت دەیهەوێ خۆی پێوە بنوێنێ، جۆرێکی بە دەستەوە گرتبوو کە هیچکەس کاری وا ناکا. وڕوێرکەکەی پێرخۆتین کە میتیای لە دالانەکە دی، دواتر گوتی هەر بەو جۆرە هاتۆتە ژوورێ و پارەکەی بە دەستەوە بووە و لە پێش خۆیەوە گرتوویە. بۆیە وێدەچێ لە سەر شەقامیش هەر ئاوا پارەکەی بە دەستەوە بووبێ. هەموو گەڵاکان سەد ڕۆبڵی بوون و گوڵیان بە پشتەوە بوو. ئەو قامکانەی گرتبوونی توێژێکیان خوێن و قەتماخە پێوە بوو. دواتر کە سەبارەت بە بڕی پارەکە پرسیاریان لە پیوتێر ئیلیچ کرد، گوتی ڕادەی پارەکە بەچاو مەعلووم نەدەبوو. بەڵام نزیکەی دوو یان سێ هەزار ڕۆبڵ دەبوو، بەڵام چەکەیەکی گەورە و «درشت» بوو.

سەبارەت بە دیمیتری فیۆدۆرۆویچیش شایەدیی‌دا: «ئەو وەک خۆی نەدەچوو، مەست نەبوو، بەڵام دەتگوت بە ئاسمانا دەفڕێ و سەیران دەکا. جار ناجارێک مات دەبوو، دەتگوت بیر لە شتێک دەکاتەوە و ناتوانێ لە سەر بڕیارێک ساغ بێتەوە. بێ‌ئۆقرە بوو، بە شێوەیەکی کتوپڕ و سەیر وەڵامی پرسیاری دەدایەوە و هێندێ جار پەرۆشیی پێوە دیاربوو، بەڵکو شاد و بەنەشە دیاربوو.»

پیووتێر ئیلیچ کە بە شێوەیەکی نامۆ چاوی لە میوانەکەی دەکرد، گوڕاندی: «پێمبڵێ چیت بە سەر هاتووە؟ چبووە؟ بۆ ئاوا شەڵاڵی خوێن بووی؟ لە جێگایەک کەوتوویە خوارێ؟ چاوێک لە خۆت کە!» باسکی گرت و بردی بۆبەر ئاوێنەکە.

میتیا، بە دیتنی دەموچاوە خوێناوییەکەی خۆی واقی وڕما و گرژ بوو.

لەگەڵ ئەوەی بە تاڵووکە پارەکەی لە دەستە ڕاستەوە دەدایە دەستە چەپی، لە ژێر لێوەوە منجاندی: «قوڕ بەو ناوچاوانەم! هەر ئەمەم کەم بوو، » بەپەلە دەستیکرد بە گیرفانیدا دەسرەکەی دەرهێنێ، کە دەریهێنا ئەویش خوێناوی بوو. ( ئەو دەسرەیە بوو کە سەروچاوی گریگۆریی پێ سڕیبوو.) شوێنی خاوێنی نەمابوو، ئەویش نەک وشک بووبێتەوە، وەک تۆپێکی تەڕ گرمۆڵە بووبوو. میتیا بە تووڕەیی فڕێیدا و گوتی:

ـ بەزیاد نەبێ! کوتە پەڕۆیەک نییە... دەموچاومی پێ‌خاوێن بکەمەوە؟

ـ کەوایە بریندار نەبووی؟ وا چاکە دەست و دەموچاوت بشۆی. دەستشۆرییەکە لێرەیە. ئاو دەکەم بە دەستتدا.

«دەستشۆری؟ زۆر چاکە... بەڵام ئەمە لە کوێ دانێم؟» بە شێواوی و پەرۆشییەکی سەیر ئاماژەی بە گەڵا سەد ڕۆبڵییەکان کرد و بە چاوێکی پڕ پرسیارەوە چاوی لە پیووتێر ئیلیچ کرد، دەتگوت ئەو دەبێ بڕیاربدا میتیا پارەکەی لە کوێ دانێ.

ـ بیخە گیرفانت، یا لە سەر ئەو مێزەی دانێ، مەترسە ون نابێ.

«گیرفانم؟ ئەریٚ، گیرفانم. باشە...» وەک ئەوەی لە ناکاو لەو ماتی و خۆ خواردنەوەیە هاتبێتە دەریٚ، گوتی: «بەڵام، هەمووی وڕێنەیە. دەزانی چی، وەرە با لە پێشدا مەسەلەی دەمانچەکان یەکلایی بکەینەوە. دەمانچەکانم پیٚ بدەوە. ها، ئەوەش پارەکەت... چونکە زۆرم پێویستی پێیەتی... دەقیقەیەکیش، تەنانەت دەقیقەیەکیش ناتوانم کات بەفیڕۆ بدەم.»

گەڵایەکی سەد ڕۆبڵیی لە چەکە پارەکە دەرکێشا و بۆلای پیووتێر ئیلیچی ڕاداشت.

ـ ئاخەر وردەم پیٚنییە باقییت بدەمەوە، لەوە کەمترت پیٚنییە؟

میتیا دیسان چاوێکی لە چەکەی پارەکە کردەوە و گوتی: «نا» وەک ئەوەی بڕوای بە قسەکەی خۆی نەبیٚ، دوو سیٚ جار گەڵاکانی ئەمدیوە ودیو کرد و دیسان گوتی: «نا، هەمووی سەد ڕۆبڵییە، » دیسانیش بە چاوێکی پڕ پرسیارەوە لە پیوتێر ئیلیچی ڕوانی.

پیووتێر ئیلیچ پرسیی: «ئەو هەموو پارەیەت لەکویٚ بوو؟ ڕاوەستە با ئەو کوڕە ورویٚرکەیەم بنێرم بۆ فرۆشگەی پلاتینکۆف، هەتا درەنگانیٚ دووکانەکەی داناخا. ـ بزانین پارەکەمان بۆ ورد ناکاتەوە.» سەری لە دەرگاکە بردە دەریٚ و هەرایکرد: «میشا، وەرە بۆ ئێرە!»

میتیا وەک ئەوەی بیرۆکەیەکی بەزەین گەیشتبیٚ، گوتی: «فرۆشگەی پلاتینکۆف زۆر چاکە!» کاتێک کوڕە هاتە ژووریٚ.ڕووی تێکرد: «میشا گیان، بەغار بچۆ بۆ فرۆشگەی پلاتینکۆف و بڵیٚ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ سڵاوی دەگەیاندی و دەیگوت هەر ئێستا دێم بۆ ئەویٚ... بەڵام گویٚ بگرە، گوێبگرە، بڵیٚ بەر لەوەی بگەمە ئەویٚ سیٚ جینم شامپانی بۆ ئامادە بکا و وەک جاری پێشوو بیپێچێتەوە دەمهەویٚ بیبەم بۆ ماکرۆیە.» (لە ناکاو ڕووی کردە پیووتێر ئیلیچ)و گوتی: «جاری پێشوو چوار جینم برد.» دیسان ڕووی کردە کوڕە: «خەمت نەبیٚ میشاگیان، خۆی دەزانیٚ. سەبرکە، گویٚ بگرە، بڵیٚ پەنیر و پاتەی ئیستراژبۆرگی و ماسی سۆڵ و ژامپۆن و خاویارم بۆ دانیٚ، هەرچییەکی هەیە بایی سەد ڕۆبڵم بۆ دانیٚ، یان وەک جاری پێشوو بایی

سەدوبیست ڕۆبڵ... بەڵام ڕاوەستە، بڵێ میوە و شیرینیی لەبیر نەچێ، هەرمێ و شووتی. بڵێ دوو یان سێ، یا چوار دانە. ـ نا شووتییەکم بەسە. نوقڵ و چوکلێتیشی لەبیر نەچێ. پێیبڵێ تەواوی ئەو شتانەی جاری پێشوو بردم بۆ ماکرۆیە. بایی سێسەد ڕۆبڵ بوو...

واچاکە دیسان بەقەد ئەوجارم بۆ دانێ لەبیرت نەچێ میشا، ئەگەر ناوت میشایە...» دیسان ڕووی کردە پیووتێر ئیلیچ: «ناوی میشایە، وانییە؟»

پیووتێر ئیلیچ، بە پەرۆشییەوە گوێی ڕاگرتبوو و چاوی لێدەکرد، هەڵیدایە: «جارێ ڕاوەستە. وا چاکترە خۆت بچی. ئەو نازانێ.»

ـ ئەرێ ڕاست دەکەی، میشا گیان دەمهەوێ بۆ ئەو کارە ماچتبکەم. ئەگەر بچی و لەبیرت نەچێ، دە ڕۆبڵت زەحمەتانە دەدەمێ. دا هەڵێ بزانم چدکەی. خێراکە... شامپانی لە هەمووی گرینگترە. براندی و شەڕابی سوور و سپیش، تەواوی ئەو شتانەی جاری پێشوو کڕیم... خۆیان دەزانن ئەوجارەی دیکە چیمکڕیوە.

پیووتێر ئیلیچ بێسەبرانە قسەی پێبڕی: «بەڵام گوێبگرە! من پێموایە واچاکە بۆ وردکردنەوەی پارە بچێ و پێیانبڵێ جارێ دوکانەکە دانەخەن، پاشان خۆت بچۆ... سەد ڕۆبڵەکەی بدەیە، با بچێ وردی کاتەوە. هەڵێ بزانم، میشا گورج بچۆ و وەرەوە!» پیووتێر ئیلیچ دەتگوت بە قەستی دەیهەوێ بەپەلە بەڕێی بکا، چونکە کوڕە دەمی بووبوو بە تاقی چرا و بە چاوی زەقەوە ڕاوەستابوو، دیاربوو ڕاسپاردەکەی میتیای لەبیر نەماوە و هەر حاڵیش نەبووە. بە ترس و سەرسووڕمانەوە چاوی لە دەمووچاوی خوێناوی و قامکە لەرزۆکەکانی بڕیبوو کە پارەکەی پێگرتبوو.

پیووتێر ئیلیچ بە گرژی و تووڕەیی گوتی: «چاکە، ئێستا وەرە دەست و دەموچاوت بشۆ. پارەکە یان لە گیرفانت نێ یان لە سەر مێزەکە داینێ... ئاوەتا، وەرە دەی. باڵتەکەشت داکەنە.»

لەگەڵ ئەوەی یارمەتییدەدا باڵتەکەی داکەنێ، گوتی:

ـ چاوکە، باڵتەکەشت هەمووی خوێناوییە!

میتیا بە شێوەیەکی سەیر و ساویلکانە گوتی: «ئەمە... هیچ نییە تۆزێ سەر قۆڵەکەی خوێناوییە، ئەو لاگیرفانەشی دەسرەکە خوێناویی کردووە. ڕەنگە لە ماڵی فینیا لەسەری دانیشتبێتم و خوێنەکە دایدابێ. چونکە دەسرەکە خووسابوو.» پیووتێر ئیلیچ بە مڕومۆچی گوێی گرتبوو، لە ژێر لێوییەوە منجاندی:

- دەی، وادیارە شەڕت کردووە.لەگەڵ کێ بەشەڕ هاتی.

خەریکی شتنەوە بوون، پیووتێر ئیلیچ مەسینەکەی بە دەستەوە گرتبوو، ئاوی بە دەستیدا دەکرد. میتیا لەبەر پەلەپەل بە جوانی سابوونی لە دەستی نەدا (دەستی دەلەرزی، پیووتێر دواتر ئەوەی لەبیر هاتەوە.) بەڵام کارمەندی لاو پێداگریی لە سەر ئەوە بوو، باشترە سابوون لە دەستی بدا و خاوێنی بکاتەوە. جارلەگەڵ جار زیاتر بە سەر میتیادا زاڵ دەبوو. هەر لێرەدا دەبێ ئەوە بڵێم پیووتێر ئیلیچ لاوێکی خاوەن کەسایەتی بوو.

- چاو لە نینۆکت کە، جوانت نەشۆردووە. ئێستا دەموچاوت بشۆ، ئێرەی لاجانگت، نزیک گوێچکەت... جوان دەستی لێخە دەتەوێ بەو کراسەوە بڕۆی؟ دەچی بۆ کوێ؟ دیوتە سەرقۆڵی ڕاستەت هەمووی خوێناوییە.

میتیا چاوی لە سەر قۆڵی کرد و گوتی: «وایە، بەخوێن شەقیلەی داوە.» - کەوایە کراسەکەت بگۆڕە.

میتیا بە ساکارییەکی پڕ لە بڕواوە، لەگەڵ ئەوەی بە خاولی دەست و دەموچاوی وشکدەکردەوە و باڵتەکەی لەبەر دەکرد، گوتی: «وەختم نییە. هەڵیدەکەم، قۆڵم هەڵدەدەمەوە، لە ژێر باڵتەکەدا دیار نابێ... چاو لێکە ئاوا!»

پیووتێر ئیلیچ بە لۆمەوە گوتی: «دەی پێمبڵێ ئەو کێشەیە چۆن بوو؟ لەگەڵ کێ بەشەڕ هاتی؟ دیسان وەک جاران لە مەیخانە؟ دیسان لەو سەروانەت داوە؟ ئەمجارە لە کێت داوە... یان ڕەنگە کوشتبێتت؟»

میتیا گوتی: «وڕێنەیە!»

- بۆ «وڕێنە؟»

میتیا گوتی: «خەمت نەبێ، » لە ناکاو پێکەنی. «هەر ئێستا لە نێو بازاڕ پیرێژنێکم تخێڵکرد.»
ـ تخێڵتکرد؟ پیرێژنێک؟
میتیا بە قاقاوە چاوی لە چاوی پیووتێر ئیلیچ بڕی و وەک ئەوەی کەڕ بێ، نەڕاندی: «پیرە پیاوێکیش!»
ـ نەگبەتی! پیرێژنێک، پیرە پیاوێک... کێت کوشتووە؟
«لەگەڵ یەکتر پێکهاتین، شەڕمانکرد و ـ پێکهاتین. ئەوەندەی لە بیرم بێ، وەک دوو هاوڕێ لێک هەڵبڕاین. گەوجێکە... ئەو لێم خۆش بووە... دڵنیام تا ئێستا لێم خۆش بووە،... ئەگەر هەستایەتەوە، لێم خۆش نەدەبوو.»
ـ میتیا لە ناکاو چاوێکی قرتاند ـ «بەڵام چاوی دەرێ، دەزانی پیووتێر ئیلیچ بۆ دەڵێم چاوی دەرێ! خەمت نەبێ! بە جحەندەم، هەرکەسێکە چاوی دەرێ! من هەر گوێشم لێ نییە!»
ـ بۆ لەگەڵ خەڵکی شەڕ دەکەی؟... بۆ وێنە ئەو کێشەیەی لەگەڵ ئەو سەروانە لە سەر هیچوپووچ وەڕێت خست... شەڕت کردووە و ئێستا بۆ کەیف و نەهەنگ و ڕابواردن پەلەتە ـ خووخدەیەکی قۆڕت هەیە! سێ جین شامپانی ـ ئەو هەمووەت بۆ چییە؟
«ئافەرین! ئێستا دەمانچەکانم بدەوە. بە شەرەفم ئیتر وەختم نییە. پێم خۆشە لەگەڵ تۆی خۆشەویست دەمەتەقێ بکەم، بەڵام وەختم نییە. پێویستیش نییە، ئیتر درنگە و کاتی دەمەتەقێ نییە.» دەستیکرد بە گیرفانیدا و هاواری کرد: «پارەکانم! کوا پارەکانم؟ لە کوێم دانان؟»
ـ لە سەر مێزەکەت دانا... خۆت... ئەوەتا. لەبیرت چۆتەوە؟ خۆ لەلای تۆ پارە وەک چڵکی دەست وایە. ها، ئەوەش دەمانچەکانت. سەیرە، سەعات شەش بۆ دە ڕۆبڵ بە بارمتەت دانان، بەڵام ئێستا هەزاران ڕۆبڵت پێیە، دوو سێ هەزار ڕۆبڵ زیاترە.
میتیا کە پارەکەی لە گیرفانی پاتۆڵەکەی دەئاخنی، بە پێکەنینەوە گوتی: «تۆ سەری خۆت، سێ هەزار!»

ـ ئاوا لێت ون دەبێ. لە سەر کانگای ئاڵتوون دانەنیشتووی!

«کانگا؟ کانگای ئاڵتوون؟ میتیا دای لە قاقای پێکەنین و بە پڕمەپڕم گوتی: «پێرخۆتین، پێتخۆشە بچی بۆ کانگای ئاڵتوون؟ ژنێک لێرەیە لەڕێوە سێ هەزار ڕۆبڵت دەداتێ، بەو شەرتەی بچی. ئەو چاکەیەی لەگەڵ من کرد. بۆ کانگای ئاڵتوون نەماوە». ناوی مادام خۆخلاکۆفە، دەیناسی؟»

پیووتێر ئیلیچ بە گومان و دڕدۆنگییەوە چاوی لێکرد و گوتی: «نایناسم، بەڵام تاریفیم بیستووە و دیتووشمە. یانی هەر بە ڕاستی ئەو سێ هەزار ڕۆبڵی پێدای؟»

ـ سبەینێ لەگەڵ هەلاتنی خۆر، لەگەڵ ئەوەی «فیبس[4]»ی هەمیشە لاو لەگەڵ ڕێز و پاکیی خودا بەرەو تەشق باڵ دەگرێ، بچۆ بۆلای ئەو مادام خۆخلاکۆفە و لێی بپرسە ئەو سێ هەزار ڕۆبڵی پیداوم یان نا. هەوڵ بدە و تێبگە.

ـ نازانم پێوەندیتان لەگەڵ یەکتر چۆنە... بەڵام چونکە ئاوا لێبڕاوانە دەیڵێی، پێموایە بەڕاستی ئەو پارەیەی پێداوی. پارەت بە دەستەوەیە، بەڵام بەجێی ئەوەی بچی بۆ سیبریا، خەریکی هەمووی خەرج دەکەی... هەر بەڕاست پێمبڵێ بزانم دەچی بۆکوێ؟

ـ بۆ ماکرۆیە.

ـ بۆ ماکرۆیە؟ بەڵام ئەوە نیوەشەوە!

میتیا لە ناکاو گوڕاندی: «سەردەمێک کوڕە هەموو شتێکی هەبوو، بەڵام ئێستا هیچی نییە.»

ـ چۆن «هیچی نییە؟» بەو هەزاران ڕۆبڵەوە وا دەڵێی!

ـ باسی هەزارییەکان ناکەم. بەزیاد نەبن. باسی کەسایەتیی ژن دەکەم.

لەرزۆکە بناغەی دڵی ژن

لێوڕێژە لە دەهۆ و فێڵ کردن

لەگەڵ ئۆلیس هاوڕام، ئەوە قسەی ئەوە.

---

4- فیبس: ناوێکیتری ئاپۆلۆ ـ خودای ڕووناکی.

- سەرم لە قسەکانت دەرناچێ!
- بۆ مەستم؟
- نا، مەست نیی، بەڵام خراپتر.
- ڕۆحم مەستە، پیووتێر ئیلیچ ڕۆحم مەستە! بەڵام ئیتر بەسە!
- چی دەکەی، دەمانچەکە پڕ دەکەی؟
- دەمانچەکە پڕ دەکەم.

میتیا کالانی دەمانچەکەی کردەوە و سەری قوتووی باڕووتەکەی هەڵپچڕی و بە ئارامی باڕووتی لە لوولەکەی کرد بە شیشە دایگرتەوە. پاشان گوللەکەی دەرهێنا و بەر لەوەی بیخاتە نێو لوولەکەوە بە دوو قامکی گرتی و لەبەر چاوی ڕایگرت.

پیووتێر ئیلیچ بە پەڕۆشی و کونچکاوی چاوی لێکرد و پرسیی: «بۆ ئاوا تەماشای ئەو گوللەیە دەکەی؟

- هەر لەخۆڕا، دەڵێم بزانم ئەگەر بتهەوێ گوللەیەک لە مێشکی خۆت بدەی، چاو لە گوللەکەی دەکەی یان نا؟
- بۆ چاوی لێکەم؟

«لە مێشکم ڕادەچێ، بۆیە زۆر خۆشە چاوی لێبکەم و بزانم چۆنە. بەڵام ئەمە گەوجییەتییە، گەوجییەتییەکی کتوپڕ» لەگەڵ ئەوەی گوللەکەی خستە نێو لوولەکەوە و شیشکوتی کرد، گوتی: «ئێستا تەواوە. پیووتێر ئیلیچی بەڕێز، قۆڕیاتە، هەمووی قۆڕیاتە، خۆزگە دەتزانی چ قۆڕیاتێکیشە! ئەگەر هەیە کوتێ کاغەزم دەیە.»

- ها ئەوەش کاغەز.
- ئەوە نا، کاغەزێکی تازە و خاوێنم دەیە. دەمەوێ لێی بنووسم. پیووتێر ئیلیچ کوتێ کاغەزی سپیی پێدا. «ئەوە باشە، » میتیا قەڵەمێکی لە سەر مێزەکە هەڵگرت و بەپەلە دوو دێڕی نووسی. پاشان چوارقەدی کرد و نایە گیرفانی جلیسقەکەی. دەمانچەکانیشی نایەوە نێو کالانەکەیان، قرتەکەی داخستن و بە

دەستییەوە گرت. پاشان بە بزەیەکی ئارام و خەیاڵییەوە چاوی لە پیووتێر ئیلیچ کرد و گوتی:
ـ ئەمجار با بڕۆین.
پیووتێر ئیلیچ بە شڵەژاوی پرسیی: «بچین بۆکوێ؟ نا، جارێ سەبرکە... ناکا بتهەوێ ئەو گوللەیە لە مێشکی خۆت دەی؟»
ـ گاڵتەم دەکردا دەمهەوێ بژیم. ئاشقی ژیانم! لەوبارەوە دڵنیابە. ئاشقی فیبسی قژ زێڕین و تیشکە گەرموگوڕەکەیم... پیووتێر ئیلیچی ئازیز، دەزانی چۆن پاشگەز بیتەوە؟
ـ مەبەستت لە «پاشگەزبوونەوە» چییە؟
ـ دەست لەکۆڵ کردنەوە. واز هێنان لە بوونەوەرێکی خۆشەویست و کەسێک کە لێی بێزارم. هەروەها ئیزنی خۆشەویست بوون بە کەسێکدان کە لێی وەڕەزم ـ واز هێنان و دەستبەردار بوون یانی ئەوە! یانی پێیان بڵێی: «خودا چاکتان بۆ بکا، بڕۆن بەدوای ژیانی خۆتاندا، بڕۆن، منیش...
ـ تۆش؟
ـ بەسە، با بڕۆین.
پیووتێر ئیلیچ چاوێکی لێکرد و گوتی: «وەڵڵا بە کەسێک دەڵێم نەهێڵێ بچی، بۆ دەچی بۆ ماکرۆیە؟
ـ ژنێک لەوێیە ژنێک، حاڵی بووی، ئیتر دەمت لێکنێ.
ـ گوێبگرە، ئەگەرچی زۆر وەحشی و بێڕەحمی، بەڵام هەمیشە خۆشم ویستووی، دڵم ناحەسێتەوە، خەممە.
ـ هاوڕێ گیان سپاستدەکەم. دەڵێی وەحشیم. وەحشی، وەحشی! ئەوە شتێکە هەمیشە خۆم دەیڵێم. وەحشی! ها ئەوەش میشا هاتەوە! خەریک بوو لەبیرم دەچۆوە.
میشا بەغار خۆی کرد بە ژووریدا، چەکەیەکی پارەی ورد بە دەستەوە بوو. گوتی فرۆشگاکەی پلاتینکۆف هەموو کەوتوونە جمووجۆڵ. «خەریکن ماسی و بتری و چایی دادەگرن، بە زووترین کات هەمووی ساز دەکەن و

دەپیێچنەوە.» میتیا گەڵایەکی دە ڕۆبڵیی دا بە پیووتێر ئیلیچ، پاشان گەڵایەکی دە ڕۆبڵیی‌تری بۆ میشا فڕێدا.

پیووتێر ئیلیچ نەڕاندی: «دەست هەڵگرە! لە ماڵی مندا هەقی ئەو کارەت نییە. خووخدە و ئاکارێکی ناحەز و گەندەڵە. پارەکەت هەڵگرە. هانێ. بیخە ئێرەتەوە، بۆ زایەی دەکەی؟ سبەینێ بەکارت دێ، دڵنیام بۆ قەرز کردنی دە ڕۆبڵ دیسان دێیتەوە بۆلام. بۆ پارەکانت ناخەیتە گیرفانی باخەڵتەوە؟ لێت گوم دەبێ!»

- هاوڕێ گیان، وەرە پێکەوە بچین بۆ ماکرۆیە.

- من بۆ بێم؟

- وەرە با بە سەلامەتیی ژیان بترییەک هەڵدەین! دەمەوێ مەی بنۆشم، ئەویش بەتایبەت لەگەڵ تۆ.تا ئێستا لەگەڵ تۆ دانەنیشتووم، وا نییە؟

- زۆر چاکە دەتوانین بچین بۆ مترۆپۆلیس. هەر ئێستا دەمویست بچم بۆ ئەوێ.

- وەختم نییە. وەرە با بچین لە خەڵوەتیی دووکانەکەی پلاتینکۆف دەخۆینەوە. دەکرێ مەتەڵۆکەیەکت لێ داهێنم؟

- دایهێنە بزانم چییە.

میتیا کوتێک کاغەزی لە گیرفانی دەرهێنا و کردیەوە و دایە دەست پیووتێر ئیلیچ. بە خەتێکی خۆش لێی نووسرابوو: «لەبەر خاتری ژیان خۆم سزا دەدەم، تەواوی ژیانم سزا دەدەم!»

پیووتێر ئیلیچ دوای خوێندنەوەی گوتی: «بەڕاستی دەبێ لەگەڵ کەسێک قسە بکەم. هەر ئێستا دەڕۆم کەسێک ئاگادار دەکەم.»

- دەرفەتی ئەوەت نابێ کوڕیچاک، وەرە پەرداخێک هەڵدە. وەرە با بڕۆین!

فرۆشگەی پلاتینکۆف لە سووچێکی شەقامەکە هەڵکەوتبوو، دوو سێ دەرگا لە ماڵی پیووتێر ئیلیچەوە دوور بوو. گەورەترین سۆپەرمارکێتی شارەکەمان بوو و لە بارەی چاکییەوە قسەی لە سەر نەبوو. چەند بازرگانی دەوڵەمەند بە شەریکایەتی دایاننابوو. هەرچییەکت ویستبایە بوویان. ئەوەی لە فرۆشگەکانی پترزبۆرگ بوو، ئەمانیش بوویان: هەموو چەشنێک کەلوپەل و خواردەمەنی،

شەڕابی «سازکراو بە دەستی برایانی ئیلی‌سۆف»، میوە و جگەرە و چایی و شەکر و قاوە و هتد... سێ فرۆشیار و دوو وڕوێڕەکە کاریان تێدا دەکرد. ئەگەرچی شارەکەی ئێمە فەقیرتر بووبوو، خاوەن زەوی و زارەکان کۆچییان کردبوو و کاروباری بازرگانی لە کزیی دابوو، بەڵام سۆپەرمارکێت و فرۆشگاکان ڕمێنی باشتریان هەبوو. کڕیاری زیاتر ڕووی تێکردبوون. کار بەڕێوەبەرانی فرۆشگاکە تێکڕا چاوەڕوانی میتیا بوون. سەودای سێ چوار حەوتوو لەمەوبەری، هەروا لە بیریان مابوو: هەموو جۆرە شەراب و خواردەمەنییەک بایی چەندسەد ڕۆبڵ، هەمووشی بە نەغد (دیارە خۆ قەرزی لەگەڵ ناکەن). لە بیریانە ئەو کاتەش وەک ئێستا، میتیا چەکەیەکی پارەی سەد ڕۆبڵی بە دەستەوە بوو. بەبێ حیساب و کیتاب پێیدا دەدا و بەم دەست و بەو دەست خەرجی دەکرد. بەبێ ئەوەی چەنە لێدا و بیری لێبکاتەوە ئەو هەموو شەڕاب و خۆراکە بەکاری چی دێ. تەواوی خەڵکی شار دەیانزانی میتیا ئەو کاتە لەگەڵ گرووشنکا چووە بۆ ماکرۆیە «بە شەو و ڕۆژێک سێ هەزار ڕۆبڵی لە ئاو کردووە و دوای کەیف و ڕابواردن حەتاڵ و بەتاڵ گەڕاوەتەوە.» خێڵێکی قەرەچیش (کە ئەو کاتە لە قەراغ شاری چادریان هەڵدابوو.) لەگەڵ خۆی بردبوو.قەرەچییەکانیش دوو ڕۆژی تەواو مەستیان کردبوو و بە کەیفی خۆیان پارەیان لێهەڵکڕاند بوو، بە دڵی خۆشیان شەڕابی گرانباییان خواربۆوە. خەڵک هەموو بە میتیا پێدەکەنین کە شامپانیی داوە بەو قەرەچییە چڵکن و پڵکنانە و شیرینیی و پاتەی ئیستراسبۆرگی داوە بە ژنان و کچانی لادێیی، بۆیە ئەو هەڵەخەرجییەی میتیایان کردبووە بنێشتە خۆشکەی سەر زاریان. ئەگەرچی بەرەوڕوو نەیاندەوێرا پێبکەنن و لەبزیان بگەڕێ. چونکە زۆر کارێکی پڕ مەترسی بوو، پاشملە قسەیاندەکرد. بەتایبەت لە مەیخانە میتیا خۆی دانی بەوەدا نا کە دوای ئەو هەموو عەبلەخەرجی و پارە لە ئاو کردنە گرووشنکا ئیزنی دابوو «لاقی ماچبکا» بۆیە کۆڕی بادەنۆشان زۆری پێپێکەنین.

کاتێک میتیا و پیووتێر ئیلیچ گەیشتنە فرۆشگاکە، چاویان بە عارەبانەیەک کەوت بە سێ ئەسپی زەنگوڵە لەملەوە. «ئاندرێ»ی عارەبانەچی لەوێ چاوەڕوانی میتیا بوو. نێو کەژاوەکەشی بە فەڕش و پەردە ڕازاندبۆوە. کاروباری پێچانەوەی کەلوپەلەکانیش تەواو بووبوو. تەنیا مەحتەلی ئەوە بوون میتیا بێ، سیاییی بدەنە دەست و پارەی لێوەرگرن و بیانخەنە سەر عارەبانەکە. پیووتێر ئیلیچ بە واق وڕمانەوە لە میتیای پرسی:

ـ ئەم عارەبانەیان بەو دەمودەستە لەکوێ هێناوە؟

ـ کاتێک بە هەڵاتن دەهاتم بۆلای تۆ، تووشی ئاندرێ بووم و پێمگوت ڕاست بچێ بۆبەر فرۆشگای پلاتینکۆف و لەوێ چاوەڕوانم بێ. بەجارێ وەدرەنگ کەوتین. جاری پێشوو تیمووتی بردمانی بۆ ماکرۆیە. بەڵام ئێستا تیمووتی ژنێکی جادووبازی بردووە. ئاندرێ، بڵێی زوو بگەینێ؟

ئاندرێی عارەبانەچی پیاوێکی موو زەرد و نزیکەی چل ساڵانە دەبوو. باڵتەیەکی درێژی لەبەردا بوو ، کەپەنکێکیشی بە سەر شانەوە بوو، بە گەرمی وەڵامی دایەوە: «ئەگەر زۆر توند ڕۆیشتبێتن، سەعاتێک بەر لە ئێمە دەگەنێ، لەوانەیە لە سەعاتێکیش کەمتر. خۆم تیمووتیم بەڕێکرد. دەزانم چۆن دەڕوا. ئەوان لە پێی ئێمە دەرناچن. شتیوا هەر نابێ، لەوانەیە پێشیان بگەینەوە.»

ـ ئەگەر تەنیا سەعاتێک دوای ئەوان بگەینێ، پەنجا ڕۆبڵت دەستخۆشانە دەدەمێ.

ـ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، لە سەر گرێو ناهێڵم نیو سەعاتیش بەر لە ئێمە بگەنێ، ئیتر سەعاتێک جێی خۆی هەیە.

ئەگەرچی میتیا کەوتبووە پەلە و سەرحیسابی کەلوپەلەکانی دەبوو، فەرمانی سەیر و سەمەرەی دەردەکرد، زۆر بێ جێ قسەیدەکرد و جاری وابوو بۆخۆشی لە خۆی نەدەگەیشت. پیووتێر ئیلیچ وای بە باش زانی یارمەتیی بدا و لەو تەنگژەیە دەربازی بکا.

میتیا فەرمانی دا: «بایی چوارسەد ڕۆبڵی تەواو، لە چوارسەد ڕۆبڵ کەمتر نەبێ. ڕاست وەک کەڕەتی پێشوو. چوار جین شامپانی، نابێ بترییەکی کەمتر بێ.»

پیووتێر ئیلیچ گوڕاندی: «پیاوی چاک، ئەو هەمووەت بۆ چییە؟ سەبرکە! ئەو جەعبەیە چییە؟ چیی تێدایە؟ لێم ڕوونە بایی چوارسەد ڕۆبڵی تێدا نییە.»

میتیا فەرمانی دا: «بایی چوارسەد ڕۆبڵی تەواو، لە چوارسەد ڕۆبڵ کەمتر نەبێ. ڕاست وەک کەڕەتی پێشوو. چوار جین شامپانیی، نابێ بترییەکی کەمتر بێ.»

پیووتێر ئیلیچ گوڕاندی: «پیاوی چاک، ئەو هەمووەت بۆ چییە؟ سەبرکە! ئەو جەعبەیە چییە؟ چیی تێدایە؟ لێم ڕوونە بایی چوارسەد ڕۆبڵی تێدا نییە.»

دووکان دارەکان زمان چەورانە هەڵیان دایە. ئەم جەعبەیەش بتریی شامپانیی تێدایە و «پێویستترین کەلوپەل» وەک مەزە و شیرینی و چۆکلێت و هتد. بەڵام بەشی سەرکیی شتەکان بەجیا دەپێچینەوە و وەک جاری پێشوو بە عارەبانەیەکی تایبەت دەینێرین، بە عارەبانەیەکی سێ ئەسپەدا بەڕێی دەکەین کە هێندە بە پرتاو دەڕوا سەعاتێک دوای گەیشتنی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ ئەویش دەگاتێ.

میتیا بە توندی پێداگریی کرد کە: «لە سەعاتێک زیاتر نەبێ! لە سەعاتێک زیاتر نەبێ! شیرینی و شەگەڵاتی زیاتر دانێن. کچانی ئەوێ بۆ شیرینی و شەگەڵات نەماون.»

پیووتێر ئیلیچ بە گرژی و شڵەژاوی گوتی: «شیرینی و شەگەڵات قەیناکا، بەڵام چوار جین شامپانیت بۆ چییە؟ جینێک بەسە.» پاشان دەستیکرد بە چەنە لێدان و داوای فاکتۆری فرۆشی دەکرد. بەڵام تەنیا توانیی سەد ڕۆبڵی لێکەم کاتەوە. لە کۆتاییدا هاتنە سەر ئەوەی بایی سێسەد ڕۆبڵی شتومەک بۆ بنێرن.

پیووتێر ئیلیچ بیرێکی‌تری کردەوە و گوتی: «جا ئێستا چۆنت پێ‌خۆشە وابکە، بە جحەندەم! بە من چی؟ پارەی مفتەت وەگیر کەوتووە، خودای دەکرد ئاورت تێ‌بەردەدا.»

میتیا دەستی گرت و بردی بۆ خەڵوەتیی پشتەوەی دووکانەکە. «وەرە لێرەوە، جەنابی ئابووری‌زان، لێرەوە، تووڕە مەبە. هەر ئێستا لەگەڵم وەرە، چونکە مرۆڤێکی لەبەر دڵانی، هەر لەوجۆرە کەسانەی کە من خۆشم دەوێن.»

میتیا لە پشت مێزێکی چکۆڵە دانیشت کە سفرەیەکی سپی لە سەر ڕاخرا بوو. پیووتێر ئیلیچیش بەرەورووی دانیشت. خێرا بترییەکیان شامپانی بۆ هێنان. لێیان پرسین سەدەف مەیل دەکەن یان نا. «سەدەفی تازە و بێ وێنەمان بۆ هاتووە.»

پیووتێر ئیلیچ بە تووڕەیی گوڕاندی: «بەزیاد نەبێ، من سەدەف ناخۆم. هیچی دیکەشم پێویست نییە.»

میتیا گوتی: «فریای خواردنی سەدەف ناکەوین، منیش برسیم نییە.» پاشان بە نەرموونیانی گوتی: «هاوڕێ گیان، دەزانم بە عومراتی خۆم ئەوەندەم هەڵەخەرجی و کاری بێ‌سەرەو بەرە نەکردووە.»

ـ کێ ئەوەی پێ‌خۆشە؟ سێ جین شامپانی بۆ لادێییەکان، وەڵڵا هەر ئەوە پیاو لە دین دەردەکا!

ـ مەبەستم ئەوە نییە. باسی نەزمێکی زاتی دەکەم، کە لە ژیانی مندا هەرگیز ئەو نەزمە نەبووە. تەواوی ژیانم لێوڕێژ لە بێ‌نەزمی و بێ‌سەرەوبەرەیی بووە و کەسێک پێویستە نەزمێکی پێ‌بدا. وانییە؟ ئەوە جیناسە وانییە؟

ـ جیناسی چی، تۆ خەریکی وڕێنە دەکەی!

سپاس بۆ خودای ئاسمانەکان

سپاس بۆ خودای وجوودی خۆشم...

ئەم شیعرە ڕۆژێک لە دڵم کەلاوڕێژی کرد، شیعریش نییە، فرمێسکە... خۆم دامناوە... هەڵبەت نەک ئەو کاتەی ڕیشی سەروانی گۆرینم دەکێشا...

ـ بۆ لە ناکاو ئەوت وەبیر هاتەوە؟

ـ بۆ وەبیرم هاتەوە؟ گەوجییەتی! هەموو شتێک کۆتاییی پێدێ؛ هەموو شتێک هاوتەراز دەبێ. ئەسڵ و فەرعی مەسەلەکە ئەوەیە.

ـ دەزانی چی، ئەو دەمانچەیەم لەبیر ناچێتەوە.

ـ ئەوەش گەوجییەتییە! مەی فڕکە و بیری لێمەکەوە. من ژیانم خۆش دەوێ. یەکجار زۆریش. زۆر زۆر حەز بە ژیان دەکەم. تێگەیشتی؟

هاوڕێ گیان. وەرە با بە سڵامەتیی ژیان دوو پەرداخ بخۆینەوە.

دەزانی بۆ لەخۆ ڕازیم؟ من هیچوپووچم، بەڵام لووت بەرز و لەخۆڕازیم. لەگەڵ ئەوەشدا کە بیر لە هیچوپووچیی خۆم دەکەمەوە ئازار دەکێشم، بەڵام هەروا لەخۆ ڕازیم، تەواوی دنیا تەقدیس دەکەم. خودا و تەواوی مەخلووقاتەکەی تەقدیس دەکەم. بەڵام... دەبێ بوونەوەرێکی مزێڕ لە نێو بەرم، چونکە دەترسم بخوشێ و ژیانی خەڵکی بخاتە مەترسییەوە... برای خۆشەویست، وەرە با بە سەڵامەتیی ژیان پێیدا کەین. چی دەتوانێ لە ژیان خۆشەویستتر و شیرینتر بێ؟ هیچ، هیچ شتێک! بە سەڵامەتیی ژیان و بە سڵامەتیی شاژنی شاژنان.

ـ ئێستا کە پێتخۆشە بە سەڵامەتیی ژیان و شاژنی شاژنانت با بخۆینەوە.

یەکی پەرداخێکیان هەڵدا. ئەگەرچی میتیا شڵەژا بوو و دەست و دڵبازیی دەکرد، بەڵام لە ناخەوە پەرۆش بوو. دەتگوت دڵەڕاوکێیەکی تاڵ و تاقەتپڕووکێن لە سەر شانی بارە.

ـ میشا... ئەوەش میشای تۆ! میشا گیان وەرە بۆ ئێرە و ئەم جامە بە سەڵامەتیی فیبسی قژ زێڕینی بەیانی بخۆوە.....

پیووتێر ئیلیچ بە تووڕەیی گوڕاندی: «بۆ ئاوا دەکەی؟»

ـ بەتۆ چی، وام پێخۆشە!

ـ ئا، ئاخ!

میشا جامەکەی نا بەسەریەوە و کڕنۆشێکی برد و دەرپەڕی بۆ دەرێ.

میتیا گوتی: «ئەمەی دواتر وەبیر دێتەوە. ژن، من ژنم خۆش دەوێ! ژن چییە؟ فریشتەی سەر زەوی! دڵم گیراوە، زۆر دڵتەنگم پیووتێر ئیلیچ. هاملێتت

لەبیرە؟ «زۆر دڵتەنگم ئەی هۆراشیوی خۆشەویست، بۆت بەداخم! مخابن ئەی یۆریکی چارەڕەش؟» ڕەنگە یۆریک من بم، بەڵێ، ئێستا من یۆریکم. داهاتووش ئەوە ڕوون دەکاتەوە.»

پیووتێر ئیلیچ بە بێدەنگی گوێی ڕاداشتبوو. میتیا تۆزێ بێدەنگ بوو، چاوی بە سەگێکی چکۆڵەی جوان و چاوڕەش کەوت، لە سووچێک هەڵتووتکا بوو، لە دوکاندارەکەی پرسی: «ئەوە سەگی کێیە؟»

ـ سەگی باربارا ئەلکسیفنایە. لەگەڵ خۆی هێنای بۆ ئێرە و لەبیری چوو بیباتەوە. دەبێ بۆی بنێرینەوە.

میتیا مات و مەلوول منجاندی: «لە گوردان... سەگێکی ئاوام... دیوە. بەڵام ئەو لاقی چەپەی شکابوو... ئەرێ پیووتێر ئیلیچ دەمەوێ لێت بپرسم، تا ئێستا دزیت کردووە؟

ـ ئەوە چ پرسیارێکە؟

ـ مەبەستێکی ئەوتۆم نییە. پێمبڵێ تا ئێستا گیرفانی کەست بڕیوە. مەبەستم پارەی دەوڵەت نییە، هەموو کەس دەیدزێ، بێگومان تۆش کارمەندی و دزیت کردووە...

ـ جوانەمەرگ بی بۆ قسەت.

ـ مەبەستم پارەی خەڵکانیترە. بڕینی گیرفانی خەڵکی؟ لە جزدانەکانیان، ها؟

ـ کاتێک نۆ ساڵان بووم بیست کۆپکم لە دایکم دزی. بە دزییەوە لە سەر مێزەکە هەڵمگرت و توند لە قولەمیچەم نا.

ـ دەی پاشان چتکرد؟

ـ ئاخ، هیچ. سێ ڕۆژ شاردمەوە. پاشان هەستم بە شەرمەزاری کرد، ڕاستیم گوتو دامەوە بە دایکم.

ـ ئەی دوای ئەوە؟

ـ زەبری قامچی. بۆ پرسیاری وادەکەی؟ دزیت کردووە؟

میتیا فێڵبازانە چاوێکی قرتاند و گوتی: «ئەرێ.»

پیووتێر ئیلیچ بە کونچکاوییەوە پرسیی: «چت دزیوە؟»

میتیا گوتی: «کاتێک نۆ ساڵان بووم، بیست کۆپکم لە دایکم دزی و دوای سێ ڕۆژ دامەوە.» دوای ئەوە لە ناکاو هەستا سەرپێ.

ئاندرێ لە دەرگای فرۆشگاکەوە هەرای کرد: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، وەڕێ نەکەوین؟»

ـ ئامادەی؟ ئەوە هاتین! چەند وشەی دیکە و.... ئاندریێش، کاتی وەڕێ کەوتن، پەرداخێکی ودکا پێداکرد.

هێندێکیشی براندی بدەنێ! ئەو قوتووە ـ (قوتووی دەمانچەکان) ـ بخە ژێر کورسییەکەی منەوە. خوداحافیز، پیووتێر ئیلیچ، ئێمەت لەبیر نەچێ، گەردنم ئازاکە.

ـ مەگین تۆ سبەینێ ناگەڕێیەوە؟

ـ جارێ نازانم.

ـ کابرای دوکاندار وەک کارگ لەبەر دەمی هەڵتۆقی و گوتی: «جەناب حیسابەکەت لەبیر نەچێ!»

ـ ها، بەچاوان، هەر ئێستا.

چەکەی پارەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و سێ گەڵای سەد ڕۆبڵی دەرکێشا و لەبەر دەمی کابرای دوکاندار داینا و بە هەڵەداوان دەرپەڕی بۆ دەرێ. هەموو کاربەڕێوەبەرانی فرۆشگاکە دەستیان بە سینگیانەوە گرت و لەگەڵ دوعا و ماڵئاوایی بەدوایدا هاتنە دەرێ. ئاندرێ، پەرداخێکی یەکبین هەڵدابوو و لەبەر پەلەپەل لە گەرووی گیرابوو و دەکۆخی. پەڕییە سەر فایتوونەکە و لەجێی خۆی دانیشت. بەڵام میتیا تازە سوار بووبوو، لە ناکاو بە سەرسووڕمانەوە چاوی بە فینیا کەوت لە هەمبەریا ڕاوەستاوە. فینیا بە هەناسەبڕکێ پەڕییە سەر عارەبانەکە و بە گریانەوە لە هەمبەر میتیادا دەستی لێک هەڵپێکا و خۆیدا بە سەر کەوشەکانیدا:

ـ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، دیمیتری فیۆدۆرۆویچی خۆشەویست و دڵۆڤان، کارت بە خاتوونەکەم نەبێ، تۆ خودا ڕوحمی پێبکە. من هەموو شتێکم پێکوتی... ئەو کابرایەش مەکوژە، لە پێشدا ئەو هات، ئەو ئاشقی خاتوونەکەمە!

ئەو لەگەڵ ئاگرافنا ئەلکساندرفنا زەماوەندی کردووە. هەر بۆ ئەوە لە سیبریا گەڕاوەتەوە. دیمیتری فیۆدۆرۆویچی ئازیز، تکات لێدەکەم، مەیانکوژە!

پیووتێر ئیلیچ منجاندی: «ئاوا، ئاوا، ئاوا، ئەوە تازە تێگەیشتم، کەوایە ئەو خەیاڵەت لەسەردایە؟ ئێستا بۆم دەرکەوت، چیت لەسەردایە.» پاشان بە دەنگێکی بەرز گوڕاندی بە سەر میتیادا: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، ئەگەر پیاوی، ئەو دەمانچانەت بدە بە من. گوێت لێیە دیمیتری؟»

میتیا وەڵامی دایەوە: «دەمانچە؟ براکەم، مەترسە، لە شار بچمە دەرێ فڕێیان دەدەمە نێو زەلکاوێکەوە.» دوای ئەوەی لە سەر جێگاکەی دانیشت، گوڕاندی: «هەستە فینیا، لەبەر دەممدا چۆک دامەدە. خەمت نەبێ، میتیا کاری بە سەر کەسەوە نییە، ئەم گەوجە کەرمێشکە ئیتر ئازار بە هیچ کەس ناگەیەنێ. بەڵام فینیا، تاوێ لەمەوبەر ئازارم بە تۆ گەیاند، کەوایە بمبوورە لە منی چارەڕەشی هیچوپووچ خۆش بە... ئەگەر لێشم خۆش نەبی، گرینگ نییە. ئێستا ئیتر بۆ من فەرق ناکا. ئاندرێ، لێخوڕە، بە چوارناڵ لێخوڕە!»

ئاندرێ خەرەزەنگی هەڵسووڕاند و زرینگەی زەنگوڵە هەستا.

ـ خوداحافیز، پیووتێر ئیلیچ! دوایین فرمێسکم پێشکەش بە تۆ دەکەم!...

پیووتێر ئیلیچ هەروا کە چاوی لە ڕۆیشتنیان بڕیبوو، لەبەرخۆیەوە گوتی: «ئەو مەست نییە، بەڵام وەک شێت و دلووکار هەروا چەقە چەق دەکا.» بڕیاریدا لەوێ بمێنێتەوە، چاوەدێریی پێچانەوەی کەلوپەلەکان بکا. چونکە دەیزانی فێڵ لە میتیا دەکەن. بەڵام لە ناکاو ڕقی لە خۆی هەستا تفێکی لە عەرزەکە کرد و فرۆشگاکەی بەجێ هێشت، پاشان بە هەڵەداوان ڕۆیشت بۆ بیلیارد کردن لە مەیخانەی میترۆپۆلیس.

هەروا کە دەڕۆیشت، لەبەرخۆیەوە گوتی: «ئەگەرچی مرۆڤێکی باشە، بەڵام زۆر گەوجە. نەقڵی ئەو ئەفسەرە، کۆنە مێردەکەی گرووشنکاشم بیستووە. چاکە ئەگەر ئەو کابرایە هاتبێتەوە بۆ ماکرۆیە... ئاخ، ئەو دەمانچانە! قیروسیا! خۆ من لەلەی نیم چاوی دەرێ. هەرچییەکیان پێخۆشە با بیکەن! ئەی بڵێی نەقەومێ؟ نا، ئەوانە تاقمێکی جینگزین، هیچیان لە دەست نایە. دەخۆنەوە و پێک

هەڵدەپڕژێن، شەڕە دەندووکە دەکەن و ئاشت دەبنەوە. وەک منداڵ وان. مەبەستی لە «پاشگەز دەبمەوە و واز دێنم و خۆم سزا دەدەم» چییە؟ بڵێی نەیقەومێنێ. لە مەیخانەکان و لە کاتی مەستیدا هەزار جار ئەو قسانە دەردەفرتێنێ. بەڵام ئێستا خۆ مەست نییە. «مەستی ڕۆحی» ـ ئەو لاتولووتانە ئاشقی گیان لە سەر دەستی ئەو قسە جوانانەن. کوڕە چیدەکا با بیکا، بە قەرەقەمەر! خۆ من لەلەی ئەو نیم؟ پێموا شەڕی کردبوو، تەواوی دەست و چڕوچاوی خوێناوی بوو. لەگەڵ کێ؟ لە میترۆپۆلیس هەموو شتێکم بۆ ڕوون دەبێتەوە. دەسرەکەشی لە خوێنا خوسا بوو... هێشتا لە چەقی ژوورەکەدا کەوتووە... هەر دووک چاوی دەرێ، بە منچی، خودا جوانەمەرگی کا!»

بە مڕومۆچی خۆی کرد بە مەیخانەکەدا و دەستیکرد بە یاری بیلیارد. یارییەکە تۆزێ هێنایەوە سەرخۆ، دەستێکی دیکەشی کرد، لە ناکاو بە یەکێ لە هاویارییەکانی گوتکە دیمیتری کارامازۆف دیسان بە برێک پارەوە پەیدا بووە. خۆم دیم سێ هەزار ڕۆبڵی بە دەستەوە بوو، دیسان ڕۆیشت بۆ ماکرۆیە تاکوو لەگەڵ گرووشنکا ڕایبوێرێ... ئەو هەواڵە هەموویانی تووشی واقوڕمان کرد و دەستیان لە یاری هەڵگرت. هەموویان بە سەرسووڕمانەوە باسیاندەکرد و هەر کەسە و بۆچوونێکی هەبوو.

ـ سێ هەزار؟ یانی ئەو سێ هەزارەی لە کوێ وەگیر کەوتووە؟

لەپەستا پرسیاریان لە پیووتێر ئیلیچ دەکرد. بڕوایان نەدەکرد مادام خۆخلاکۆف ئەو پارەیەی پێدابێ.

ـ بڵێی دزیی لە باوکە پیرەکەی نەکردبێ؟

ـ سێ هەزار! ئەو ماستە بێموو نییە.

ـ ئەو بە عالەم ئاشکرا دەیگوت باوکم دەکوژم. هەموومان بیستوومانە. باسی سێ هەزار ڕۆبڵیشی دەکرد...

پیووتێر ئیلیچ گوێی ڕاگرتبوو. لە ناکاو خۆی لە پرسیارەکان گێلکرد و بە چاکی زانی بێدەنگەی لێبێنێ. باسی خوێنی دەست و دەموچاوی میتیای نەکرد. ئەگەرچی سەرەتا دەیویست باسیبکا.

ـ دەستی سێهەمی یارییەکەیان دامەزراند و وردە وردە مشتومڕ سەبارەت بە میتیا دامرکا. بەڵام لە کۆتاییی دەستی سێهەمدا پیووتێر ئیلیچ لە یاری تاقەتی بە سەر چوو، داری بیلیاردەکەی دانا و بەبێ ئەوەی شێو بخوا لە مەیخانە چووە دەرێ. کاتێ گەیشتە نێو بازاڕ، لەبەر پەرۆشی لەجێی خۆی ڕاوەستا و سەری لە خۆی سوڕما. بۆی دەرکەوت هەوای چوون بۆ ماڵی فیۆدۆرپاولۆویچ لەسەری داوە، بۆ ئەوەی بزانێ ڕووداوێک قەوماوە یان نا. لەبەر خاتری مەسەلەیەکی قۆڕ ـ کە دڵنیام هەرواش دەبێ ـ دەمهەوێ هەموو ئەندامانی ماڵەکە لە خەو هەستێنم و هاوار و هەڵلا وەڕێ بخەم؟ بە گۆڕی بابیانەوە، بە منچی، خۆ من وەکیل و هەقداری ئەوان نیم.»

بە خەمباری و دڵتەنگی بەرەو ماڵ بۆوە و لە ناکاو فینیای وەبیر هاتەوە. بە قەڵسی بە خۆی گوت: «دەبوو چەند دەقیقە لەمەوبەر نەمهێشتایە بڕوا و پرسیارم لێبکردایە، ئیتر هەموو شتێکم بۆ ڕوون دەبۆوە.» لە ناکاو تاسەی تێگەیشتن لەو مەسەلەیە وەها ناخی تەنی، لە نیوەی ڕێگادا وەڕسووڕا و بەرەو ماڵی فینیا، شوێنی ژیانی گرووشنکا ملی ڕێی گرت. گەیشتە بەر درگا گەورەکە و تەق تەق لێیدا. تەقەی دەرگاکە بەو شەوە کڕوکپە وەخۆی هێنایەوە و هەستی بە شەرمەزاری کرد. هیچکەس وەڵامی نەدایەوە، هەموو خەوتبوون. بە دڵێکی خەمبارەوە لەخۆی پرسی: «بۆ لەخۆڕا دەمهەوێ هەروا قاڵمە قاڵم وەڕێخەم؟» بەڵام بەجێی ئەوەی ملی ڕێ بگری و بگەڕێتەوە، بەهێز و قەوتی خۆی دەستیکرد بە لێدانی دەرگاکە و بێدەنگی ئەو گەڕەک و شەقامەی شڵەقاند.

لەگەڵ ئەوەی ڕقی هەستابوو، هەر مشتێکی لە دەرگاکە دەدا و لەبەر خۆیەوە دەیگوت: «یانی کەس نایە بیکاتەوە؟ باشە، خەوی مەرگیش چووبێتە چاوتان هەڵتاندەستێنم، ئەرێ هەڵتاندەستێنم.» لەو کاتەدا توندترلە پێشوو وەرگەڕایە دەرگاکە.

## (٦)

## «منیش دێم»

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بە پڕتاو بەرەو ماکرۆیە بەڕێوەبوو. هەتا گەیشتنە ماکرۆیە نزیکەی دوازدە کیلۆمەتریان مابوو. بەڵام ئەسپەکانی ئاندریێ هێندە بە تاو دەڕۆیشتن ئەو مەودایەیان بە سەعات و چارەکێک دەبڕی. میتیا لە خۆشیانا دەتگوت باڵی گرتووە. هەوا خاوێن و فێنک بوو، ئەستێرەی گەش و گەورە بە ئاسمانەوە دەدرەوشانەوە. لە شەوێکی ئاوا و ڕەنگە هەر لەو سەعاتەدا بوو کە ئالیووشا چۆکی دادا و ناوچاوانی نایە عەرزی و وەک حاڵ لێ‌هاتوو سوێندی خوارد «هەتا دنیا بە دنیایە زەویی خۆشبوێ» بەڵام گیانی میتیا لێوڕێژ بوو لە خەم و دڵەخورپە، ئەگەرچی زۆر شت دڵی دەرزی ئاژن دەکرد، لەو کاتەدا تەواوی گیانی تاسە و ئەوینی فریشتەکەی تێگەڕا بوو و بەرەو ڕووگەی ئاواتی دەفڕی، تاکو بۆ دوایین‌جار چاوی بە فریشتەکەی ڕوون بێتەوە. دەتوانم بە دڵنیایی ئەوە بڵێم، بۆ تاقە ساتێکیش دڵی نەلەرزی. ڕەنگە بڕوام پێنەکەن ئەگەر بڵێم ئەم ئاشقە دڵ سووتاوە، دەرهەق بەو کەسە نوێیە، ئەو ڕەقیبە تازەیە، ئەم ئەفسەرە، کە دەتگوت مووت لێ هەڵپڕوزاندووە و لەپڕ پەیدا بووە، بەخیلیی لە دڵدا نەبوو. بەخیلیی بەو ئەفسەرە نەدەبرد، بەڵام هەر کەسێکی دیکە ببوایەتە ڕەقیبی، میتیا لەڕێوە ڕەگی غیرەتی دەبزوا و دیسان خوێن بەری چاوی دەگرت و پەنجەی بە خوێن ڕمووده دەبوو. بەڵام هەروا کە لە ناخی شەودا دەفڕی، دەرهەق بە پیاوێک کە یەکەم ئەویندارى گرووشنکا بووە، ڕێزەیەک ڕق و ئێرەیی و دوژمنایەتیی لە ناخی خۆیدا هەست پێنەدەکرد. ڕاستییەکەی هێشتا ئەو کابرایەی نەدیبوو. لێرەدا خۆ تێهەڵقوتاندنی خۆی بە کارێکی نابەجێ دەزانی و هەقی بە گرووشنکا و ئەو ئەفسەرە دەدا. «ئەو یەکەم ئەشقی گرووشنکا بووە و دوای پێنج ساڵ لەبیری نەبردۆتەوە. هەر بۆیە لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا دڵی

هەر لەلای ئەو بووە و من کوا هەقی ئەوەم هەیە بمبە چقڵی سەر ڕێگایان؟ میتیا پاشگەز بەوە و ڕێگا چۆڵکە! ئێستا من چیم، و چکارەم؟ گریمان ئەو ئەفسەرەش پەیدا نەبوایە، بۆ من هەموو شتێک گەیشتۆتە کۆتایی...»

ئەگەر میتیا ئەقڵی بڕی بکردبایە. ئەو وشانە تا ڕادەیەک نیشاندەری هەست و سۆزی بوو. بەڵام لەو کاتەدا کوا توانایی بیر و ئاوەز هەیە؟ پیلانە تازەکەشی بەبێ هیچ بیر کردنەوەیەک دارشتبوو. لەگەڵ قسەکانی فینیا ئەو پیلانە وەک برووسکە بە مێشکیدا تێپەڕیبوو، بێ ئەوەی بیر لە ئاکامەکەی بکاتەوە، دەیویست جێبەجێی بکا. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بڕیارە تووشی شڵەژانی کردبوو ئاراوقارای لێهەڵگرتبوو: بڕیارەکەی هێمنایەتیی بە دڵی نەدەبەخشی. لە پشتەوەشی زۆر شت هەبوو ئازاری دەدا. تاوناتاوێکیش بیر کردنەوە لە حوکمی ئیعدامی خۆی کە بە دەستی خۆی نووسیبووی، تووشی سەرسووڕمانی دەکرد: «تۆڵە لە خۆم دەکەمەوە، » کاغەزەکەش ئامادە لە گیرفانیدا بوو؛ دەمانچەکە پڕ بوو؛ بڕیاریشی دابوو کە بەیانیی ڕۆژی دوایی لەگەڵ گزنگی خۆر، «فیبسی قژ زێڕین» چۆن دیدار بکا. لەگەڵ ئەوانەشدا نەیدەتوانی خۆی لە ڕابردوو بدزێتەوە و بیری ئەو هەموو شتەی لە دوای خۆی بەجێی هێشتبوو، ئازاری دەدا. بە داماوی هەستی بەوە دەکرد و بیرۆکەکەی لەگەڵ ناهومێدی لە دڵیدا زەق دەبۆوە. لەو کاتەدا تەنیا بیری بۆ ئەوە چوو و ئەو هەستە لە ناخیدا هەڵقوڵا کە فەرمان بە ئاندرێ بدا عارەبانەکە ڕاگرێ. لە کەژاوەکە دابەزێ، دەمانچە پڕەکەی دەرهێنێ و بێ ئەوەی چاوەڕێی بەیانی بێ، کۆتایی بە هەموو شتێک بێنێ. بەڵام ئەو کاتە وەک برووسکەیەک تێپەڕی. ئەسپەکان وەک بای شەماڵ دەفڕین و دەتگوت «مەوداکان هەڵدەلووشن» لەگەڵ ئەوەی لە شوێنی مەبەست نزیک دەبۆوە، دیسان بیرۆکەی گرووشنکا زیاتر گیانی ئابلۆقە دەدا و ئەو خەیاڵە ترسناکانەی بە سەر گیانیدا سەپا بوون و دانەچیرەیان لێدەکرد، دەیتاراندن. پەککو چەندە تاسەمەندی دیتنی بوو، تەنانەت بۆ ساتێک، چاوترووکانێک. تەنانەت ئەگەر بکرێ لە دوورەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئێستا لەگەڵ ئەوە. ئێستا بڵێی لەگەڵ ئەو، لەگەڵ یەکەم دڵداری چبکا و چۆن ڕایبوێرێ، دەمهەوێ

هەر ئەوە بزانم.» ئەو ژنە، کە ئاوا شوێنی لە سەر ژیانی دانابوو، میتیا قەت هەتا ئەو ڕادەیە بە گڕی ئەشقی هەڵنەقرچابوو، ئەو هەموو هەستە تازە و پڕ لە ڕازە، کە خۆشی تووشی سەرسامی کردبوو، هەستێکی تێکەڵ بە فیداکاری و لە نێو بردنی خۆی لە هەمبەر ئەودا! لە ناکاو کەوتە بەر هێرشی جەزم بوون و حاڵ لێهاتنێکی پڕ لە خولیا و گوتی: «خۆم لە نێو دەبەم!»

نزیک سەعاتێک بوو بە چوارناڵ ڕێیان دەبڕی. میتیا بێدەنگ بوو، ئەگەرچی ئاندرێ، پیاوێکی سوێرقسە بوو، بەڵام زمانی نەگەڕا... دەتگوت ناوێرێ قسە بکا، تەنیا ئەسپە کەلەکە قوپاو و تیژتێپەڕەکانی دابووە بەر زەبری خەرەزەنگ. لە ناکاو میتیا بە ترس و دڵەخورپەوە هاواریکرد: «ئاندرێ، ئەگەر خەوتبێتن چبکەین؟

ئەو بیرۆکەیە وەک زەبرێکی کاریگەر تەزاندی. پێشتر بیری لەوە نەکردبۆوە.

ـ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، ڕەنگە تا ئێستا خەوتبێتن.

میتیا وەک ئەوەی زەرگی لە دڵ ڕاچێ، لە ناکاو گرژ بوو. ئەرێ ڕاستە... جا بڕوانە ئەویش چۆن بە پڕتاو دەچێ بۆ ئەوێ... بە هەستێکی ئەوتۆوە... کە ئەوان خەوتوون... گرووشنکاش ڕەنگە لەوێ خەوتبێ... هەستێکی پڕ لە ڕق و تووڕەیی لە دڵی هەڵدەقوڵا. بێئیختیار هاواریکرد:

ـ ئاندرێ، توندتر! خەرەزەنگەکەت وەکارخە! خێراتر لێخوڕە.!

ئاندرێ، دوای تۆزێ بێدەنگی، گوتی: «ڕەنگە نەشخەوتبێتن. تیمووتی دەیگوت خەڵکێکی زۆری لێیە.»

ـ لە چاپاڕخانە؟

ـ لە چاپاڕخانە نا، لە کاروانسەرای پلاستۆنۆف کە ئەسپەکان لەوێ دەگۆڕن.

میتیا کە بەو هەواڵە چاوەڕوان نەکراوە شڵەژابوو گوڕاندی: «دەزانم، گوتت خەڵکێکی زۆری لێیە؟ یانی چی؟ ئەوانە کێن؟

ـ تیمووتی دەیگوت هەموویان کەسانێکی باش و حیسابین. دوو کەسیان خەڵکی شارەکەی خۆمانن ـ نازانم کێن ـ دوو کەسی دیکەشیان غەریبەن، ڕەنگە

کەسانێکی دیکەشی لێبێ. زۆرم پرسیار لێنەکرد. تیمووتی دەیگوت خەریکی گەنجەفەن.

- گەنجەفە؟

- بەڵێ. ئەگەر خەریکی قومار بن، ڕەنگە نەخەوتبێتن. پێموانییە سەعات لە یازدەی لادابێ.

- میتیا بە ڕقهەستاوی دیسان گوڕاندی: «ئاندرێ، خێراتر! خێراتر لێخوڕە!»

ئاندرێ دوای ساتێ بێدەنگی گوتی: «قوربان، دەکرێ پرسیارێکت لێبکەم، بەڵام دەترسم قەڵس بی قوربان.»

- دەتەوێ چیم لێبپرسی؟

- هەر ئێستا فینیا خۆی بە سەر کەوشەکانتا دا و تکای لێکردی ئازار بە خاتوونەکەی و ئەو کابرایە نەگەیەنی... دەزانیچی قوربان... ئەوە منم تۆ دەبەم بۆ ئەوێ... لێم بببوورە قوربان.ویژدانم ئازارم دەدا... ڕەنگە ئەو قسانە گەوجانەش بن.

میتیا لە ناکاو لە دواوە چنگی لە شانی گیر کرد و شێتانە پرسیی:

- تۆ فایتوونەوانی؟ فایتوونەوان!

- بەڵێ قوربان.

- کەوایە دەزانی پیاو دەبێ ڕێگا بکاتەوە. تۆ ئەگەر فایتوونەوانێک ڕێگا لە خەڵکی بگرێ و هەر لێخوڕێ و خەڵک وەبەردا، دەڵێی چی؟ نا، فایتوونەوان نابێ خەڵکی وەبەردا. پیاو ناتوانێ کەس بکا بەژێرەوە. پیاو ناتوانێ ژیانی خەڵکی بخاتە مەترسییەوە. تۆ ئەگەر کەسێکت لە نێو بردووە ـ تۆڵە لە خۆت بکەوە... ئەگەر کەسێکت کوشتووە، ئەگەر تەنیا ژیانی کەسێکت بەبا داوە ـ تۆڵە لە خۆت بکەوە و خۆت لە نێو بەرە.

ئەو قسانە بە شێوەیەکی شێتانە لە دەمی میتیا هاتە دەرێ. ئەگەرچی ئاندرێی تووشی سەرسووڕمان کرد، درێژەی بە قسەدا.

- وایە، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ هەق بە ئێوەیە، پیاو نابێ هیچکەس وەبەردا، یان ئازاری پێبگەیەنێ. بوونەوەرانی دیکەش هەروا، چونکە تەواوی بوونەوەران

خوڵقاوی دەستی خودان. ئەسپ بێنە بەرچاوی خۆت، چونکە هێندێک لە خەڵک، تەنانەت لە نێو ئێمەی عارەبانەچیدا، ڕایان دەدەن. بەزەییان لە دڵدا نییە، بە زۆر لێیان دەخوڕن و زیاتر لە تواناایان کاریان لێدەکێشن...

میتیا پەڕییە نێو قسەکانی: «لەسەر ئەوە دیانخەنە جحەندەم؟» دای لە قاقای پێکەنین و دیسان چنگی لە شانی ئاندرێ گیر کرد و گوتی: «ئاندرێی ساویلکە، پێمبڵێ بزانم دیمیتری فیۆدۆرۆویچ کارامازۆف دەچێتە دۆزەخ یان نا؟ بیروڕای تۆ لەم بارەوە چییە؟»

- کاکی بەڕێز نازانم، پێوەندیی بە خۆتەوە هەیە. چونکە ئێوە... چاو لێکە قوربان، کاتێک کوڕی خودا لەخاچدرا و مرد، ڕاست لە سەر خاچەکەوە ڕۆیشت بۆ دۆزەخ و تێکڕای ئەو تاوانبارانەی ئازاد کرد کە سزا دەدران.[5] شەیتانیش دەستیکرد بە پرتەوبۆڵە، چونکە پێی وابوو ئیتر دۆزەخ تاوانبار بەخۆیەوە نابینێ. هەر بۆیە مەسیح پێیگوت: «بۆڵە بۆڵ مەکە، چونکە تەواوی بەهێزەکانی سەر زەوی لە ئیختیاری تۆدان: حاکم و قازی و دەوڵەمەندان، دیسان وەک پێشوو دۆزەخ پڕ دەبێتەوە هەتا جارێکی دیکە دەگەڕێمەوە.» ئەوە دەقی قسەکانی ئەو بوو....

- ئەوسانەی لادێیی! سەرنج ڕاکێشیش بوو. ئاندرێ لەو ئەسپەی لای چەپەت ڕاکێشە!

ئاندرێ لەگەڵ ئەوەی ئەسپی لای چەپەی وەبەر خەرەزەنگ دا، گوتی: «کەوایە دیوتە قوربان، دۆزەخ بۆ کێیە. ئێوە وەک منداڵێکی چکۆڵە وان... من ئێوە وا دەبینم... ئەگەرچی توند تەبیعەت و ئاڵەدینی، بەڵام خودا بە هۆی دڵە پڕ بەزەییەکەتانەوە لێتان خۆشدەبێ.»

- تۆ چی، ئاندرێ تۆ لێم خۆشدەبی؟

- من بۆ دەبێ لە ئێوە خۆشبم قوربان، خۆ هیچ ئازارێکت بە من نەگەیاندووە.

---

5- لە ئاییندا دەڵێن مەسیحییەت «دۆزەخ وێران دەکا» Harrowing of Hell هەڵبەت ئەو باوەڕەش لە دینی سەرەکیدا نییە و قەشەگەلی سەدەکانی ناوەڕاست دایانتاشی.

ـ نا، بەجێی هەمووان، لەجیاتی هەمووان، هەر خۆت، لەو ڕێگا چۆڵە، لەباتی هەمووان لێمخۆشدەبی؟ دە پێمبڵێ دەی گوندنشینی دڵپاک و ساویلکە!
ـ ئاخ قوربان، هەست بە مەترسی دەکەم ئێوە دەبەم بۆ ئەوێ. قسەکانت زۆر سەیرە.
بەڵام میتیا گوێی لێنەبوو. لەبەرخۆیەوە شێتانە دۆعایەکی دەخوێند.
ـ خودایە، بە هەموو تاوان و سەرپێچییەکانمەوە وەرمگرە و مەحکوومم مەکە. لە تاوانم خۆشبە. مەحکوومم مەکە، چونکە من خۆمم مەحکووم کردووە. مەحکوومم مەکە خودایە چونکە زۆرم خۆشدەوێی. ئەگەر بمخەیتە دۆزەخیشەوە هەر خۆشم دەوێ و هاوار دەکەم هەتا دنیا بە دنیایە هەر خۆشمدەوێی... بەڵام لێمگەڕێ با هەتا کۆتایی هەر خۆشمبوێی... لێرە هەر ئێستا تەنیا پێنج سەعات... تا کاتی وەدەرکەوتنی پڕشنگی بە تینی تۆ... چونکە شاژنی ڕۆحی خۆمم خۆشدەوێ... خۆشمدەوێ و لە خۆشویستنی حاشا ناکەم... تۆ خۆت ئاگات لە دڵمە... بە پڕتاو دەڕۆم، لەبەر دەمیدا چۆک دادەدەم و دەڵێم: «تۆ مافی خۆتە واز لە من بێنی و بڕۆی. خوداحافیز. ئەم قوربانییەی خۆتت لەبیر نەچێتەوە... قەتیش لەبەر خاتری من دڵتەنگ مەبە!»
ئاندرێ، بە خەرەزەنگەکەی ئاماژەی بە پێشەوە کرد و گوڕاندی: «ماکرۆیە!»
لەنێو تاریکاییی کەمڕەنگی شەودا، پۆلێک تاپۆی یەکدەست و ڕەشی ماڵەکان، کە دەتگوت لە دەشتێکی بەریندا هەڵکەوتوون، وەدەر کەوتن. گوندی ماکرۆیە گوندێکی دوو هەزار کەسی بوو. بەڵام لەو کاتەی شەودا هەموو لە خەودا بوون و تەنیا تاکوتەرا چرایەک سۆڵەی دەهات.
میتیا بە تینوتاوێکەوە گوتی: «ئاندرێ، بۆ پێشەوە، توندتر لێخوڕە!»
ئاندرێ بە خەرەزەنگەکەی ئاماژەی بە کاروانسرای پلاستۆنۆف کرد کە لە نێوەڕاستی ئاوایی هەڵکەوتبوو. دیسان گوتی: «نەخەوتوون.» هەر شەش پەنجێرەی سەر شەقامی ڕووناک بوون.
میتیا بە دڵشادی دووپاتیکردەوە: «نەخەوتوون ئاندرێ، خێراتر! بە پڕتاو! زەنگوڵەکان بزرینگێنەوە! با هەموو بزانن من هاتووم. من دێم، منیش دێم!»

ئاندرێ ئەسپە وەهەناسەبڕکێ کەوتووەکانی بە چوارناڵ گەیاندە بەر سەکۆی پلیکانەکان و ڕایگرتن. ئەسپەکان ئارەقەیان کردبوو و هاڵاویان لێ‌هەڵدەستا. میتیا ڕاست لەو کاتەدا دابەزی کە خاوەنی کاروانسەراکە دەیویست بچێ بخەوێ، لە سەر پلیکانەکانەوە چاوی لە تاریکی بڕی بزانێ کێ هاتووە.

- ئەوە تۆی، تریفۆن بۆریسیچ؟

خاوەن کاروانسەرا دانەوی و بە وردی ڕوانیی، لە پلیکانەکان هەڵاتە خوارێ و بە شادی و نەشەوە چوو بەرەوپیری میوانەکەی.

- جەنابی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، ئێوەن! بەخێر بێی؟، چاوم ڕوون بۆوە!

تریفۆن بۆریسیچ لادێیەکی ساخ و تێکسمڕاو بوو، پیاوێکی دەستەو توندوتۆڵ. تووڕە و تۆسن بوو، بەتایبەت لەگەڵ خەڵکی ماکرۆیە، بەڵام کاتێک بۆنی پارەی دەکرد، دەگەشایەوە و ڕووخۆشی وەک خۆی نەبوو. بە شێوازی ڕووسی جلوبەرگی دەپۆشی. کراسێکی قۆپچەدار و باڵتەیەکی درێژی لەبەردا بوو. زۆری پارە وەسەریەک نابوو. بەڵام هەروا چاوبرسی بوو و خەونی بە پارەوە دەدی. زۆربەی خەڵکی گوندەکەی هەتا بینەقاقا لە قەرز گرتبوو، زەوی و زاری لە مالیکان دەکڕی، یان ئیجارەی دەکرد. خەڵکی ڕەشووڕووتی ئاواییش لە سەر ئەو زەوییانە کاریان دەکرد و ئارەقەیان دەڕشت، بەڵام قەت نەیاندەتوانی قەرزەکانی پاک بکەن. بێوە پیاوێک بوو خاوەنی چوار کچی گەورە. یەکیان بێوەژن بوو و بە دوو منداڵەوە لەو کاروانسەرایە دەژیا و وەک کڵفەت کاری بۆ دەکرد. کچێکی دیکەشی ژنی ئەفسەرێکی نافەرمی بوو، لە ژوورێکی کاروانسەراکەدا بە دیوارەکەوە، لە نێوان وێنەکانی بنەماڵەدا، وێنەیەکی چکۆڵەی ئەو ئەفسەرە بە جلوبەرگی نیزامی و سەرشانەوە بەرچاو دەکەوت. دوو کچی عازەبیشی لە ڕێوڕەسمی کلێسەدا جلوبەرگی شین یان سەوزیان لەبەر دەکرد کە لە پشتەوە دەچەسپا بە لەشیانەوە و داوێنێکی شۆڕی هەبوو. جلوبەرگی مۆدەی ڕۆژیان لەبەر دەکرد، بەڵام ڕۆژی دوایی کەرەی بەیانی هەڵدەستان و دەروژووری کاروانسەراکەیان دەماڵی، چڵکاوی نێو تەشتەکانیان دەڕشت و کاری خاوێن کردنەوەی ئەو کاروانسەرایە لە ئەستۆی ئەوان بوو. تریفۆن

بۆریسیچ، ئەگەرچی وەک بانبانک لە سەر خەزێنە دەخەوت، بەڵام دیسان تامەزرۆی هەڵتەکاندنی گیرفانی میوانە سەرخۆشەکانی بوو، هەر لە بیریشی بوو پازدە بیست ڕۆژ لەمەوبەر لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا دووسەد سێسەد ڕۆبڵی لە دیمیتری هەڵکڕاندبوو. هەر لەڕێوە کە بەرەوپیری میتیا چوو بۆنی پارەی کرد و بە زمانێکی چەور و شیرینەوە بەخێرهاتنی کرد.

ـ جەنابی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، بەخێر بێی، پێت لە سەر چاوم دانا!

میتیا بێسەبرانە گوتی: «سەبرکە، تریفۆن بۆریسیچ، جارێ پێمبڵێ ئەو لە کوێیە؟»

خاوەنی کاروانسەرا خێرا تێگەیشت. چاوێکی مووقڵشانەی لە میتیا کرد و گوتی: «ئاگرافنا ئەلکساندرفنا؟ ئەویش لێرەیە...»

ـ لەگەڵ کێ؟ لەگەڵ کێ؟

ـ تاقمێک غەریبە. یەکیان ئەفسەرە و بە شێوەی قسەکردنیدا دەبێ لەهێستانی بێ. هەر لێرەوە عارەبانەکەی نارد بە دوایدا. پیاوێکی دیکەشیان لەگەڵدایە، کە نازانم دۆستییەتی یان هاوسەفەری. جلوبەرگی ئاساییی لەبەردایە.

ـ چاکە، بەزمیان وەڕێ خستووە، پارەیان هەیە؟

ـ بەزمێکی هەژارانە! شتێکی وا نییە پیاو کەیفی پێیساز بێ، جەنابی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ.

ـ شتێکی وا نییە پیاو کەیفی پێی سازبێ؟ ئەو کەسانەی دیکە کێن؟

ـ دوو پیاوی دیکەن، خەڵکی شارین... لە چێرنی گەڕوانەتەوە و شەوێ لێرە دەمێننەوە. یەکیان پیاوێکی جحێڵە و دەڵێن خزمی ئاغای میۆسۆفە، بەڵام ناوەکەیم لەبیر نەماوە... ئەوی دیکەشیان پێموایە خۆت دەیناسی، پیاوێکە ناوی ماکسیمۆفە. وەک خۆی دەڵێ چۆتە زیارەتی کلێسە. لەگەڵ ئەو خزمەی ئاغای میۆسۆف هاوسەفەرە.

ـ هەر ئەوەندە؟

ـ بەڵێ.

ـ سەبرکە، تریفۆن بۆریسیچ، گوێبگرە. ڕاست و ڕەوان پێمبڵێ: ئەو چی؟ ئەو حاڵی چۆنە؟

ـ گرووشنکا، هەر ئێستا پێش ئێوە گەیشتە ئێرە. لەگەڵیان دانیشتووە.

ـ شاد و بەکەیفە؟ پێدەکەنێ؟

ـ نا پێموایە پێناکەنێ، دڵتەنگ و خەمبار دانیشتووە. خەریکە سەری ئەو کابرا جحێڵە دادێنێ.

ـ سەری ئەو لەهێستانییە؟ ئەفسەرەکە؟

ـ ئەو جحێڵ نییە، ئەفسەریش نییە. ئەو نا، قوربان. ئەو کابرا جحێڵەی وا خزمی ئاغای میۆسۆفە... ناوەکەیم لەبیر چۆتەوە..

ـ گالگانۆف؟

ـ خۆیەتی، گالگانۆف!

ـ زۆر چاکە. خۆم هەموو شتێک ڕوون دەکەمەوە. خەریکی گەنجەفەن؟

ـ بەڵێ قوماریان دەکرد، بەڵام دەستیان لێکێشایەوە. چایشیان خواردەوە و ئەو کابرا ئەفسەرە داوای لیکۆری کرد.

ـ تریفۆن بۆریسیچ، سەبرکە، بە قوربانت بم، سەبرکە، خۆم هەموو شتێک مەعلووم دەکەم. ئێستا وەڵامی پرسیارێکی دیکەم بدەوە: ئەرێ قەرەچییەکان لێرەن؟

ـ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، ئەمجارە قەرەچی و شتی لێنییە. خەڵکی ئاوایی دەریان کردن. بەڵام چەن جوولەکەی لێیە تار و دمەک لێدەدەن. دەتوانین بنێرین بە دوایاندا. لەڕێوە دێن.

میتیا بەپەلە گوتی: «بنێرە بە دوایاندا. حەتمەن بنێرە بە دوایاندا. وەک جاری پێشوو کچانیش کۆکەوە. بەتایبەت ماریا. هەروەها ئێستیپاندیا و ئاریناش. دووسەد ڕۆبڵ دەدەم بە چاوەشەکان!

ـ جا بەو پارەیە دەتوانم تەواوی خەڵکی نێو دێ کۆکەمەوە. بەڵام ئێستا هەموو خەوتوون. جەنابی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، یانی لادێییەکان شیاوی ئەو هەموو خۆشەویستییەن، تەنانەت کچەکانیشیان؟ حەیف نییە ئەو هەموو پارەیە

سەرفی تاقمێک مرۆڤی گۆشتتاڵ و بێئەدەب بکەی؟ لادێیی هەرزە و چەپەڵ تەنانەت حەیفە جگەرەیەکیشی بدەیەی! کچەکانیشیان هەموو ڕشکن و بۆگەنن. بەڵام دەتوانم بێئەوەی چاوم لە هیچ بێ کچەکانی خۆم لە خەو هەستێنم. تازە لە پێخەفەکەیان خزاون، بە پێلاقە هەڵیان‌دەستێنم، هانیاندەدەم گۆرانیتان بۆ بڵێن و سەما بکەن. جاری پێشوو ئەو هەموو شامپانییەت دا بەو لادێییە هیچوپووچانە، حەیف و خەسار!

ـ تریفۆن بۆریسیچ، جاری پێشوو کە لێرە بووم، زیاتر لە هەزار ڕۆبڵم بە با دا. لە بیرتە؟

ـ بەڵێ، بەڕاستی بتسووتاندایە باشتر بوو. چاکم لەبیرە. پێموا سێ هەزار ڕۆبڵت لە ئاو کرد و ڕۆیشتی.

ـ چاکە، ئێستاش هاتووم ئەو کارە بکەم، تێگەیشتی؟

چەکەی پارەکەی دەرهێنا و لەبەر چاوی کابرای خاوەن کاروانسەرا ڕایگرت.

ـ ئێستا گوێبگرە و لەبیرت نەچێ. هەتا سەعاتێکی دیکە شەڕاب و مەزە و شیرینی و چۆکلێت دەگاتێ ـ خێرا هەمووی بێنە. ئەو جەعبەی لای ئاندرێیە، دەبێ خێرا بیهێننە سەرێ. جەعبەکە هەڵپچڕە و شامپانی بۆ میوانەکان تێکە. بەڵام ئەو کچانە، کچەکان دەبێ بێن بۆ ئێرە، بەتایبەت ماریا.

میتیا گەڕاوە بۆلای عارەبانەکە و جەعبەی دەمانچەکانی دەرکێشا.

ـ ئاندرێ، وەرە با حیساب و کیتابەکەمان بکەین، ئەم پازدە ڕۆبڵە کرێکەتە. ئەمەش پەنجا ڕۆبڵ بۆ ودکا... لەبەر ئەوەی زۆر بە پڕتاو هاتی، لەبەر دڵپاکییەکەشت... بەڵام کارامازۆفت لەبیرنەچێ!

ئاندرێ بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی: «قوربان، من دەترسم. پێنج ڕۆبڵم لە کرێکەی خۆم زیاتر بدەیە باشە، لەوە زیاترم مەدەیە. تریفۆن بۆریسیچ، تۆ شایەد بە. ئەگەر قسەیەکی گەوجانەشم کردووە بمبوورە...»

میتیا چاوێکی لە سەرتاپای کرد و پرسیی: «لەچی دەترسی؟» پاشان پێنج ڕۆبڵی بۆ فڕێدا و گوتی: ئێستا کەوای لێهات، بڕۆ بۆ جحەندەم! وەرە تریفۆن

بۆریسیچ بێدەنگ بمبە سەرێ، دەمەوێ چاوم پێیان بکەوێ، بەڵام نابێ بمبینن. لەکوێن؟ لە وەتاغە شینەکەن؟»

تریفۆن بۆریسیچ بە خەمباری چاوێکی لە میتیا کرد، بەڵام دەسبەجێ فەرمانەکەی بەڕێوە برد و بەرەو سەرسەرا ڕێنوێنی کرد و خۆی چووە وەتاغێکی گەورەوە کە میوانەکان لە وەتاغی پەنایدا دانیشتبوون. چرای ئەو ژوورەی هێنا دەرێ. پاشان میتیای بردە ژوورێ و بە دزییەوە لە سووچێک داینیشاند. تاکو لەوێوە بە جوانی چاوی لە میوانەکان بێ. بەڵام چاو لێ کردنەکەی زۆری نەخایاند، لە ڕاستیدا نەیتوانی چاویان لێبکا، کە چاوی پێی کەوت، دڵی بە توندی وە کوتەکوت کەوت و چاوی لە ڕەشەوە هات. گرووشنکا لە سەر کورسیەک دانیشتبوو، لە پەناشیدا گالگانۆفی لاو و جوانچاک لە سەر قەنەفەیەک دانیشتبوو. گرووشنکا دەستی لە دەستی گالگانۆف دابوو، لەوە دەچوو پێبکەنێ. گالگانۆفیش کە ڕەنگی بزڕکابوو چاوی لە گرووشنکا نەدەکرد. لەگەڵ ماکسیمۆف قسەیدەکرد کە ئەویش بەرەو ڕووی گرووشنکا دانیشتبوو. ماکسیمۆف قاقا پێدەکەنی. ڕەقیبەکەی لە سەر کاناپایەک دانیشتبوو، کابرای غەریبەش لە سەر کورسیەکی پەنای دانیشتبوو. لەگەڵ کێشانی قەننە، خۆی ڕادەژاند و میتیا ئەوی وەک پیاوێکی قەڵەوی ڕووکراوە و کورتەباڵا هاتە بەرچاو، کە لەوە دەچوو ڕقی لە شتێک هەستابێ. دۆستەکەی، ئەو غەریبەی دیکە، ئالیووشا پێیوابوو زۆر کەڵەگەتە، بەڵام لەوە زیاتر هیچی دەستنەکەوت. هەناسەی لە سینگیدا کۆ کردەوە و نەیتوانی لەوە زیاتر خۆ بگرێ. جەعبەی دەمانچەکەی لە سەر دۆڵابێک دانا و بە دڵەکوتێوە، کە سەرتاپای جەستەی دەلەرزی و هەستی بە سەرما دەکرد. ڕاست ڕۆیشت بۆ وەتاغە شینەکە. گرووشنکا، یەکەم کەس چاوی پێیکەوت و قیژاندی: «های!»

## (٧)

# یەکەم ئەویندار، هەقی بە دەستە

میتیا بە هەنگاوی پتەو و خێرا، ڕاست ڕۆیشت بۆلای مێزەکە،
بە دەنگێکی بەرز، وەک ئەوەی هاوار بکا، بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: «ئاغایان، من... گورگ نیم... لێم مەترسن!» لە ناکاو ڕووی لە گرووشنکا کرد کە خۆی بۆلای گالگانۆف خوار کردبۆوە و توند دەستیگرتبوو: «چبووە؟ بۆ لەخۆڕا شڵەژاون... منیش هاتووم. هەتا بەیانی لێرە دەبم. ئاغایان ئیجازە دەفەرموون ڕێبوارێکی ڕێ‌لەبەر... هەتا بەیانی لە لای ئێوە بمێنێتەوە؟ تەنیا هەتا بەیانی، بۆ دوایین‌جار، لەم وەتاغەدا؟»
میتیا، ڕوویکردە ئەو کابرا کوڵەبنەیەی قەنەنەی دەکێشا و لە سەر قەنەفەیەک دانیشتبوو، کاتێ ئەو قسانەی کرد، ئەو گردە پیاوە قەڵەوە بە قورساخی قەنەنەکەی لە لێوی کردەوە و بە توندی گوتی:
- پانیە، ئێمە لێرە کۆڕەکەمان تایبەتییە. ئەوە ژووری دیکە هەیە.
گالگانۆف لە ناکاو وەڵامی دایەوە: «ئەوە تۆی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ؟ وەرە لەگەڵمان دانیشە. چۆنی، چاکی؟»
میتیا کە بە سۆز و تامەزرۆییەوە دەستی بۆلای درێژ کردبوو و دەیویست تەوقەی لەگەڵ بکا، گوتی: «هاوڕێی خۆشەویست و بەڕێز، چاوم ڕوون بۆوە بە دیتنت. هەمیشە تۆم لەبیر بووە.»
گالگانۆف بە پێکەنینەوە گوتی: «وەی دەستم! بۆ ئاوا دەستم دەگوشی، قامکم شکا.»

گرووشنکا، کە زانیی میتیا لەسەرخۆیە و قەستی گێرەوکێشە سازکردنی نییە، بە بزەیەکی نەرمونیانەوە گوتی: «ئەو هەمیشە هەروا تەوقە دەکا.» بە کونچکاوی و لەگەڵ ئەوەشدا بە دڵەخورپەوە چاوی لە میتیا دەکرد. هەستی بە شتێک کرد لە وجوودی میتیادا و بەڕاستی چاوەڕوانیی ئەوەی لێدەکرد کە ئاوا بێتە ژووریٚ و بەو شێوە قسە بکا.

ماکسیمۆف لەلای چەپەوە، بە شێوەیەکی دۆستانە گوتی: «سڵاو.» میتیا بەپەلە دەستی لە دەستی ئەویش نا.

«سڵاو. تۆش لێرەی! بە دیتنی تۆش چاوم ڕوون بۆوە! ئاغایان، ئاغایان، من...» (دیسان ڕووی لە کابرای قەننە بەدەستی لەهێستانی کردەوە. دیاربوو لە نێو کۆڕەکەدا ئەوی بە گرینگترین کەس هاتۆتە بەرچاو.) «بەپڕتاو هاتم بۆ ئێرە... دەمهەویٚ دوایین ڕۆژ، دوایین سەعاتم لەم ژوورەدا، لەم ژوورەدا، ڕابوێرم... شوێنێک کە منیش فریشتەکەمم... مەتحکردووە...» بە شێوەیەکی تۆسنانە گۆڕاندی: «پانیە[6]، بمبوورە، بۆیە بەرەو ئێرە باڵم گرتووە، بڕیارم داوە... مەترسە، ئەمشەو دوایین شەوی ژیانمە! وەرن با بە خۆشیی ئەم دۆستایەتی و پێکەوە بوونەمان شاد بین و مەی فڕکەین. هەر ئێستا شەڕاب دێنن... لەگەڵ خۆم هێناومە.» (شتێک هانیدا کە چەکەی پارەکەی دەرهێنیٚ.) «ئیزن بدەن پانیە! پێمخۆشە گوێمان لە گۆرانی و مۆسیقاش بیٚ، یانی وەک جاری پێشوو بە شادی ڕاببوێرین. بەڵام کرم، کرمی ناچیزە لە سەر زگ بەرەو دەریٚ دەخوشی و ئیتر چاوم پێی ناکەوێتەوە. یادی ڕۆژی شادی و دوایین شەوی خۆم زیندوو ڕادەگرم.»

هێندەی قسە لە دڵدا بوو، خەریکبوو دەخنکا. بەڵام لە قسەی سەیر و سەمەرە زیاتر لە دەمی نەدەهاتە دەریٚ. کابرای لەهێستانی چاوی لە میتیا و پارەکانی دەستی بڕی، سەرنجێکی گرووشنکای دا و بە ئاشکرا تووشی سەرسوڕمان بوو.

---

6- Panie، وشەیەکی ڕێزدانانە، واتا «گەورەی بەڕێز» ـ کۆی وشەکەش «پانوویە»یە. Pan ـ یانی «ئاغا» و Pani ـ پانی واتا «خاتوون» ـ دواتر لە ڕۆمانەکەدا لەکار کراون. ئەم وشانەش لەهێستانین.

میتیا دیسان گوتی: «ئەگەر ئەو فریشتە شەرمنە ئیزن بفەرموون...»
گرووشنکا قسەکەی پێبڕی و گوتی: «تۆ زۆر سەیر قسە دەکەی، نا هەقم نییە پێکەنینم دێ. دانیشە دیمیتری! تۆ دەڵێی چی؟ تکات لێدەکەم مەمانترسێنە... بەڵێن دەدەی؟ ئەگەر نەمانترسێنی، دڵشاد دەبم بە دیتنت...»
میتیا لە کاتێکدا دەستی هەڵدەتەکاند، گوتی: من، من و ترساندنی ئێوە؟ دڵنیابە قەت نابمە هۆی ئازارتان، هەرچیت پێخۆشە بیکە، نابمە کۆسپی سەر ڕێت!» لە ناکاو خۆی دا بە سەر کورسییەکەدا و دەستیکرد بە گریان ـ لەگەڵ ئەوەی سەری بۆلای دیوارەکە سووڕاند و دەستی لە کەمەی کورسییەکە وەرهێنا، وەک ئەوەی لە باوەشی بکا ـ هەموویان و تەنانەت خۆشی تووشی سەرسووڕمان کرد.
گرووشنکا بە لەبزێکی سەرکۆنە کەرانەوە گوتی: «دەست هەڵگرە، دەستهەڵگرە، تۆ مرۆڤێکی سەیری! لە ماڵێش کاتێک دەهات بۆ دیدەنیم هەر ئاوا بوو. دەستدەکا بە قسەی سەیر و سەمەرە و هەرچی دەکەم تێیناگەم. پێشتریش جارێکی دیکە ئاوا دەستیکرد بە گریان، ئێستاش ئەوە دەستی پێکرد! شوورەییە! بۆ دەگریی؟» پاشان بە لەبزێکی ڕازاوی و بە تووڕەبوونێکی کتوپڕ و پێداگری لە سەر وشەکان گوتی: «وادیارە بۆ گریان بەهانەشی بە دەستەوەیە!»
«من ناگریم... چاکە، سڵاو!» میتیا خێرا لە سەر کورسییەکە سووڕا و دەستیکرد بە پێکەنین، جۆرێک پێکەنینی وشک کە تایبەتی خۆی بوو، پێکەنینێکی سارد و سڕ کە هەموو گیانی لەگەڵیا دەلەرییەوە.
گرووشنکا بە لەبزێکی هاندەرانە گوتی: «چاکە، ئاوا باشە... سەرودڵ خۆش بە، سەرودڵ خۆش. بە هاتنت زۆر دڵشادم، زۆر دڵشاد، گوێت لێیە میتیا، زۆر دڵشادم!» لەگەڵ ئەوەی ڕووی لە کۆڕەکە بوو، بە شێوەیەکی ئاشکرا ڕووی قسەی لەو کابرایە بوو کە لە سەر قەنەفەیەک دانیشتبوو، بە لەبزێکی فەرمانپێدەرانەوە گوتی: «من دەمهەوێ ئەویش لەگەڵمان بێ. ئەوە

لە ناخی دڵەوە دەڵێم!» پاشان بە بزەیەکی نەرمەوە چاوی گرشەی هات و گوتی: «ئەگەر ئەو بڕوا، منیش دەڕۆم!»

کابرای لەهێستانی لەگەڵ ئەوەی دەستی گرووشنکای ماچدەکرد، بە ڕێزێکی تایبەتەوە گوتی: «فریشتەکەم هەر فەرمانێک بدا، یاسا هەر ئەوەیە!» پاشان ڕووی کردە میتیا و بە ڕێزەوە درێژەی بە قسەکانیدا: «پانیە، تکاتان لێدەکەم ئێوەش بێنە کۆڕەکەمانەوە.»

میتیا خۆی ئەمبارەوبار کرد و هات مژولیایشێکی حیسابی بکا بەڵام قسەی بۆ نەهات.

لەجیاتی وتاردان گوتی: «پانیە، وەرە با بخۆینەوە.» هەموویان دەستیان کرد بە پێکەنین.

گرووشنکا بە تووڕەیی هەڵیدایە: «خودایە گیان، پێموابوو دیسان دەستپێدەکا.» بە لەبزێکی ڕازاویش لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «میتیا گوێبگرە، هەڵبەز دابەز مەکە. کارێکی باشت کرد شامپانیت هێنا. منیش چەند پەرداخ دەخۆمەوە، بەڵام ئیشتیام لیکوور نابا. لە هەموو چاکتر هاتنی خۆتە. چاکت کرد هاتی، ئێمە وشک و بێدەنگ دانیشتبووین و پیاو هەستی بە غەریبی دەکرد و هەموو گیانمان داگیرابوو... پێموایە دیسان بۆ کەیف و نەهەنگ هاتووی! بەڵام پارەکەت بنێوە گیرفانت. ئەو هەمووەت لەکوێ بوو؟»

میتیا هەتا ئەو کاتە چەکەی گرمۆڵەکراوی پارەکەی هەر بە دەستەوە بوو کە هەموویان و بەتایبەت لەهێستانییەکان چاویان تێبڕیبوو. بە شێواوی و هەڵەپڕووکێ پارەکانی ئاخنییە گیرفانییەوە. سوور هەڵگەڕا. هەر لەوکاتەدا، خاوەنی کاروانسەرا لە سەر کەشەفێک، بترییەک شامپانی و چەن پەرداخی هێنا. میتیا خێرا پڕیدا بترییەکە، بەڵام لەبەر شێواوی نەیدەزانی چیی لێبکا. گالگانۆف لێی وەرگرت و پەرداخەکانی پڕ کرد.

میتیا گوڕاندی بە سەر خاوەن کاروانسەرادا: «یەکێکی تریش! بترییەکی‌تریش بێنە! هەروەها لەبیری نەبوو پەرداخەکەی لە پەرداخی کابرای لەهێستانی بدا کە قورساخانە داوای لێکردبوو بەخۆشی ئەو پێکەوە بخۆنەوە،

بێ ئەوەی لە سەر ئەوانی دیکە ڕاوەستێ، یەکبین نای بەسەریەوە. لە ناکاو ڕەنگ و قەڵافەتی گۆڕا، ئەو حاڵەتە قورساخانە و تراژیکەی پێوەی هاتبووە ژووریێ، بە تەواوی لە نێو چوو، حاڵاتێکی ساکار و منداڵانە باڵی بەسەردا کێشا. دەتگوت لە ناکاو ئارامبۆتەوە و موو ناپسێنێ. شاد و شەرمن چاوی لە هەموویان دەکرد. بە پێکەنینێکی سارد و سڕ و بەردەوام و خۆگرانەوە دانیشتبوو، وێنەی سەگێک کە هەڵەیەکی کردووە و تەمبێکراوە و چاوپۆشی لە هەڵەکەی کراوە، خەریکی شادی و کلکەسووتێ بوو. دەتگوت هەموو شتێکی لەبیر چۆتەوە، بە پێکەنینێکی شیرین و منداڵانەوە چاوی بە هەموویاندا دەگێڕا. بەردەوام بە دەم گرووشنکاوە دەگرژییەوە و کورسییەکەی لێدەبردە پێشێ. وردە وردە خەریکبوو لەو دوو لەهێستانییە شتێک هەڵکڕێنێ. ئەگەرچی هێشتا لەو بارەوە دڵنیا نەبووبوو. هەڵسووکەوتی قورساخانە و زاراوەی لەهێستانیی ئەو کابرایەی کە لە سەر قەنەفەکە دانیشتبوو -لە هەمووشی گرینگتر، قەننەکەی - سەرنجی ڕاکێشابوو. بیریکردەوە: «دەی چاکە، کارێکی باش دەکا، قەننە دەکێشێ.» ڕوخساری پەنەمیوی ئەو کابرا لەهێستانییە، بە لووتی باریک و سمێڵی تەنک و بۆیەکردوو و ڕووی هەڵماڵدراوییەکەی تا ئێستا زەرڕەیەکی گومان لە ناخی میتیادا هەڵنەخڕاند بوو. تەنانەت ئەو کڵاوتیسکنەش کە دەستکاری سیبریا بوو و تیسکەکانی بە شێوەیەکی گەوجانە کەوتبووە سەر لاجانگی و شانە کرابوو. سەرنجی میتیای ڕانەکێشا. بە حاڵ و هەوایەکی شادانەوە لە درێژەی بیر کردنەوەکەیدا گوتی: «پێموایە لە سەر کردنی کڵاوی تیسکن خراپ نییە.» ئەو لەهێستانییەی دیکەش کە جحێڵتر بوو، بە شێوەیەکی جینگزییانە و بە چاوێکی پڕ سووکایەتییەوە، چاوی بە کۆڕەکەدا دەگێڕا و گوێی ڕاگرتبوو، ئەو لاوێکی کەڵەگەت بوو، ئەفسەری لەهێستانیش خڕیلانە لە سەر قەنەفەیەکی تەنیشتی دانیشتبوو، قەڵافەتیان هێندە پێکەوە ناتەکووزی دەنواند، سەرنجی ڕاکێشا بوو. «ئەگەر بە پێوە ڕاوەستێ شەش بست نابێ.» میتیا لەخۆڕا ئەوەش بە زەینیدا هات. هەروەها بیری لەوە کردەوە کە دەبێ ئەو

جووتە هاوڕێی یەکتر بن. دەشکرێ بڵێین: «پاسەوانییەتی»، بێگومان ئەو لەهێستانییە زلە لە خزمەت ئەو لەهێستانییە وردیلە و قەننەکێشە دایە. چونکە جاروبارە ئەفسەرە خڕە فەرمانی بەو تەژەیە دەدا. کە میتیا ئەوەی سروشتی هاتە بەرچاو.

میتیا وەک گەماڵێکی چکۆڵەی کەوی، کەمترین هەستی بەخیلایەتی لە دڵیدا نەبوو. هێشتا لە هەڵسوکەوت و قسە بە توێکڵەکانی گرووشنکا هیچی بۆ هەڵنەکڕابوو. تەنیا بە دڵەکوتێوە دەیدی کە گرووشنکا لەگەڵی ڕوو خۆش و دڵۆڤانە، لێی خۆشبووە و لە پەنا خۆیدا داینـاوە. لە خۆشیانا پێی وەعەرز نەدەکەوت، چاوی لە گرووشنکا بڕیبوو کە قومقوم شامپانیی دەخواردەوە. بەوحاڵەشەوە ئاگای لە بێدەنگ بوونی کۆڕەکە بوو و بە چاوێکی پڕ چاوەڕوانییەوە تێیدەڕوانین. چاوە زیتەکانی دەتگوت دەپرسێ: «ئاغایان بۆ ئاوا بێدەنگ دانیشتووین؟ بۆ کارێک نەکەین؟»

گالگانۆف، وەک ئەوەی فکری میتیای خوێندبێتەوە، ئاماژەی بە ماکسیمۆف کرد و گوتی: «ئەو قسەی قۆڕمان بۆ دەکا و ئێمەش پێدەکەنین.»

میتیا خێرا چاوی لە گالگانۆف کرد و پاشان سەرنجی لە سەر ماکسیمۆف گیرسایەوە. لەناکاویش وەک ئەوەی شتێک بووبێتە هۆی گەشانەوەی، بە پێکەنینێکی کورت و وشکەوە گوتی: «قسەی قۆڕ دەکا؟ ها! ها!»

ـ ئەرێ. باوەڕ دەکەی، دەڵێ تەواوی ئەفسەرانی سوارە نیزامی ئێمە لە دەیەی بیستدا ژنی لەهێستانییان هێناوە. قسەیەکی قۆڕە؟ مەگین نا؟

میتیا وەک ئەوەی حاڵی لێ‌هاتبێ، دووپاتیکردەوە: «ژنی لەهێستانی؟»

گالگانۆف تەواو ئاگای لە هەستی میتیا دەرهەق بە گرووشنکا بوو، سەبارەت بەو کابرا لەهێستانییەش لە مێشکی خۆیدا شتێکی لێکدابۆوە، بەڵام زۆری گوێ بەوە نەدا، یان هەر بیری لێنەدەکردەوە؛ زیاتر ماکسیمۆف سەرنجی ڕاکێشابوو. بە هەڵکەوت لەگەڵ ماکسیمۆف هاتبوو بۆ ئێرە. یەکەمجار بوو لەم کاروانسەرایە چاوی بەو لەهێستانیانە نەدەکەوت. پێشتریش گرووشنکای دەناسی، جارێک لەگەڵ کەسێکی دیکە چووبوو بۆ

دیدەنیی، بەڵام گرووشنکا ئەوی بەردڵ نەکەوتبوو. بەڵام گرووشنکا لێرە بەچاوی خۆشەویستی تێی دەڕوانی: بەر لە هاتنی میتیا، دەستی لە ملی کردبوو، نازی کێشابوو. بەڵام گالگانۆف سارد و سڕ و بێهەست گوێی پێنەدابوو. لاوێکی بیست ساڵانەی تەڕپۆش بوو، ڕوخسارێکی جوان و دلڕفێن و قژێکی پڕ و بۆری هەبوو. چاوی شینێکی کاڵ و جوان بوو، نیشاندەری هۆش و وردبینی بوو، کە لەڕاستیدا زۆر لە تەمەنی زیاتر دیار بوو، ئەگەرچی هێندێ جار قسەی منداڵانەی دەکرد، بەڵام هەستی بە شەرمەزاری نەدەکرد، تەنانەت کاتێک کە دەشیزانی قسەیەکی وای کردووە. لە سەر یەک دەکرێ بڵێین پیاوێکی سەیر و بیرەبیرە بوو، ئەگەرچی هەمیشە دۆستانە خۆی نیشاندەدا. جاری وابوو قەڵافەتی وەک پیاوێکی نەگۆڕ و خیشەسەر دەچوو. چاوی لە پیاو دەکرد و گوێی ڕادەگرت، لە تەواوی ئەو ماوەیەشدا لەوە دەچوو لە بیر و خەیاڵی شتێکیتردا بێ. زۆربەی کات سەرسارد و تەوەزەل بوو، جاری واش بوو لەخۆڕا تووشی دڵەخورپە و بێئۆقرەیی دەبوو، ئەویش بە هۆی مەسەلەیەکی زۆر ئاسایی و کەم بایەخ. لەگەڵ ئەوەی بۆ هەر وشەیەک دەنگی درێژ دەکردەوە و مەبەستیشی خۆنواندن نەبوو، لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: لە چوار ڕۆژ لەمەوبەرەوە، یانی لەو کاتەوە کە - ئەگەر لە بیرت بێ - ئیوانی برات لە سەر عارەبانەکە خستییە خوارێ، لەگەڵ خۆم بەملاوبەولایدا دەگێڕم. هەر ئەو ڕووداوەی ئەو ڕۆژە بووە هۆی ئەوەی سەرنجی پێبدەم، لەگەڵ خۆم بردم بۆ دێ، بەڵام ئەوەندەی قسەی قۆڕ کردووە ئیتر پێم عەیبە لەگەڵی بم. دەمەوێ بیبەمەوە بۆ ناوچەکەی خۆی.»

لەهێستانیی قەننەکێش ڕوویکردە ماکسیمۆف و گوتی: «ئەم ئاغایە، ژنانی لەهێستانیی هەر نەدیوە و قسەیەک دەکا کە بەڕاستی مەحاڵە.»

زمانی ڕووسیی زۆر باش دەزانی، زۆر لەوە باشتر کە چاوەڕوانیی لێدەکرا. کاتێ وشەیەکی ڕووسیی بەکار دێنا، هەمیشە بە شێوەی وشەی لەهێستانی دەریدەبڕی.

ماکسیمۆف گوتی: «بەڵام من خۆم ژنێکی لەهێستانیم هێناوە.»

گالگانۆف هەڵیدایە: «تۆ مەگین لە سوارەنیزامدا خزمەتت کردووە؟ تۆ باسی سوارە نیزامت دەکرد. یانی تۆ ئەفسەری سوارە نیزام بووی؟

میتیا بە تامەزرۆیی گوێی شلکردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا چاوانی پڕ لە پرسیاری بە هەموویاندا دەگێڕا، لە ناکاو هەڵیدایە: «یانی هەر بەراستی ئەفسەری سوارە نیزام بووە؟ ها! ها!»

ماکسیمۆف ڕووی تێکرد و گوتی: «نەخێر، نەخێر قوربان، دەزانیچی قوربان، مەبەستم ئەوەیە کە ئەو ژنە شۆخوشەنگە لەهێستانییانە، قوربان، کاتێک لەگەڵ سوارەکانی ئێمە، سوارەی مازورکا سەمایان دەکرد... یان کاتێک یەکیان لەگەڵ سوارچاکێکی مازورکا سەما دەکا، وەک بەچکە پشیلە خێرا خۆ دەخاتە باوەشی، قوربان... بەچکە پشیلەیەکی سپی... دایک و باوکی دادە خانمیش چاوی لێدەکەن و هیچ ناڵێن... خۆیان ئیزنی پێدەدەن... ڕۆژی دواییش سوارە دەچێ بۆ خوازبێنی دادەخانم... مەسەلەکە ئەوەیە قوربان... دەچێتە خوازبێنیی دادەخانم، هی - هی!»

لەهێستانیی کەڵەگەت لە ناکاو گوڕاندی: «ئەم "پان"ە Lagdak (هیچوپووچ)ە!» لاقی نایە سەر لاقی. میتیا چاوی بە پۆستاڵە زەلام و چەورەکەی کەوت بەبنی ئەستوور و قوڕاوییەوە. لەهێستانییەکە تا ڕادەیەک چەور و چڵکن دیاربوو.

گرووشنکا لە ناکاو بە تووڕەییەوە گوتی: «یەکەم پیاڵە و بەدمەستی!»

لەهێستانیی قەننەکێش بە گرووشنکای گوت: «پانی ئاگریپینا، ئەوەی ئەو جەنابە لە لەهێستان دیتوویە، کچە کلفەت بوون، نەک خاتوونی ڕەسەن و نەجیمزادە.»

لەهێستانیی تەژە بە ڕقهەستاوی گوتی: «دەتوانن لە سەر ئەوە مەرج دانێن.» گرووشنکا بە ڕقهەستاوی گوتی: «دەڵێی چی؟ لێگەڕێ با قسە بکا، بۆ دەبێ نەهێڵی خەڵک قسەی خۆی بکا؟ لێگەڕێ با کۆڕەکەمان گەرم کا.»

لەهێستانیی کڵاوتیسکن، بە ڕوانینێکی مانادارەوە چاوی لە گرووشنکا بڕی و گوتی: «پانی، من بۆ نەمهێشتووە قسە بکەن؟» پاشان قورساخانە خۆی ماتکرد و دەستیکردەوە بە مژلێدانی قەننەکەی.

گالگانۆف، وەک ئەوەی مشتومڕێکی زۆر گرینگ لە گۆڕێدا بێ، دیسان بە دڵەخورپەوە گوتی: «نا، نا. جەنابی لەهێستانی ڕاست دەکا، ئەو بە عومراتی خۆی لەهێستانی نەبووە، کەوایە چۆن دەتوانێ سەبارەت بەوە قسە بکا؟ من باوەڕ ناکەم لە لەهێستان ژنت هێنابێ، وا نییە؟»

ـ نا قوربان، لە پارێزگای ئیسمالنێسک، قوربان. بەڵام سوارێک ئەوی هێنابوو بۆ ڕووسیا، یانی ژنی داهاتوومی لەگەڵ دایکی و پووری و ژنێکی دیکەی خزمیان و کوڕە گەنجەکەی هێنابوونی. ئەو سوارە ئەوانی ڕاست لە لەهێستانەوە هێنابوو و... بە منی سپاردن. ئەو سوارە لاوێکی جوانچاک و کوڕە خاسە بوو، لە گوردانەکەی ئێمەدا ملازم بوو. یانی دەیویست خۆی مارەیکا، بەڵام پەشیمان بۆوە. چونکە ژنە شەل بوو.

گالگانۆف دەنگی هەڵێنا: «کەوایە تۆ ژنێکی شەلت هێنا؟»

ــ بەڵێ قوربان. لەو کاتەدا هەردووکیان فریویاندام و باسی ئەو نەقوستانییەیان نەکرد. سەرەتا پێموابوو حەلوا دەکا، لە پەستا حەلوای دەکرد.... پێموابوو لە خۆشیانا وادەکا.

گالگانۆف بە دەنگێکی جیکن و منداڵانەوە، قیژاندی: «یانی ئەوەندە دڵخۆش بوو کە شووی بە تۆ کردووە؟»

ـ بەڵێ، قوربان، دوایی بۆم دەرکەوت، یانی کاتێک کە زەماوەندمان کرد، هەر شەوی یەکەم دانیپیانا و بە گریان و پاڕانەوە داوای لێبووردنی کرد و گوتی: «کاتێک منداڵ بووم لە جۆگەیەک بازمدا و لاقم شکا.» ها! ها!

گالگانۆف وای دا لە قاقای پێکەنین خەریک بوو بکەوێ بە عەرزدا. گرووشنکاش پێکەنی: میتیا دەتگوت ڕۆن قازت لێداوە. هێندە شاد بوو، گوێزی بە کلک دەشکاند.

گالگانۆف ڕووی کردە میتیا و گوتی: «دەزانی ئەوەیانی بەڕاستە، ئەمەیان درۆ نییە. با پێتبڵێم ئەو دووجاری ژن هێناوە. ئەوە نەقڵی ژنی یەکەمیەتی. ژنی دووهەمیشی.عەرزی بە خزمەتتان دەکەم، هەڵات، ئێستاش هەر ماوە.»

میتیا بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە بۆلای ماکسیمۆف وەرسووڕا و گوتی: «ڕاست دەکا؟»

ماکسیمۆف خاکەڕایانە گوتی: «بەڵێ قوربان، هەڵات. ئەو ئەزموونە تاڵەم تاقیکردۆتەوە قوربان. لەوەش ناخۆشتر ئەوە بوو لەگەڵ پیاوێکی فەڕنسی هەڵگیرا، ژنە بەر لە هەڵگیرانەکەی هەموو ملک و ماڵەکەمی بە ناوی خۆی تاپۆ کردبوو، پێیدەگوتم: «تۆ خوێندەواری. لەبن بەردیش دەتوانی بژیوی خۆت دابینکەی.» بەو قسەیەش کۆتاییی بە مەسەلەکە هێنا: ئۆسقۆفێکی ڕێزدار جارێکیان پێیگوتم: "تۆ یەکێک لە ژنەکانت شەل بوو بەڵام ئەوی دیکەیانت گورج و گۆڵ". «هی ـ هی!»

گالگانۆف کە لە بنەوە دەکوڵی، هەڵچوو: «گوێبگرن، گوێبگرن! ئەگەر درۆ بکا ـ کە زۆر جاریش دەیکا ـ بۆ ئەوەیە سەرگەرممان کا. با بیکا، خۆ زەرەدی نییە، وانییە؟ هێندێجار خۆشم دەوێ. مرۆڤێکی شەرمنە، بەڵام تەبیعەتی وایە، پێتان وانییە وابێ؟ هێندێ کەس لەبەر قازانجی خۆیان خۆ مات دەکەن، بەڵام ئەو تەبیعەتەکەی وایە. ڕەنگە پێتانوابێ خۆی هەڵدەکێشێ ( دوێنێ لە ڕێگا هەر لەوبارەوە مشتومڕمان کرد) کە "گۆگۆل" "ڕۆحە مردووەکان"ی سەبارەت بە ئەو نووسیویە. ئەگەر لەبیرتان بێ لەو کتێبەدا وەرزێرێک هەیە ناوی ماکسیمۆفە و نازدیرۆف بە قامچی لێیدەدا. ئەگەر لەبیرتان بێ، نازدێریۆف بە مەستی ماکسیمۆف دەداتە بەر زەبری قامچی و بریندااری دەکا، دوای لێدان و ئەو سووکایەتییە لە لایەن یاساوە مەحکووم دەکرێ و بڕوا دەکەن کە سوورە لە سەر ئەوەی کە ئەو ماکسیمۆفەیە و قامچیشی خواردووە! پێتانوایە ڕاستدەکا؟

چیچیکۆف سەرەتای دەیەی بیست، سەفەری دەستپێکرد، هەر بۆیە ئەم مێژووانە یەک ناگرنەوە. قەت باوەڕ ناکەم ئەو قامچیی خواردبێ، باوەڕ ناکەم. ئێوە دەڵێن‌چی؟»

تووڕە بوون و هەڵچوونی گالگانۆف هەستپێنەدەکرا، بەڵام بەڕاستی تووشی دڵەخورپە بووبوو. میتیاش بێ‌ئەوەی نارەزایەتی دەربڕێ، قسەکەی ئەوی سەلماند و بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ ئەگەر قامچیی خواردبێ چی!

ماکسیمۆف هەڵیدایە: «مەسەلە ئەوە نییە، بەڕاستی قامچیم خواردبێ، بەڵام هەروا...»

ـ مەبەستت لە «هەروا» چییە؟ قامچیت خوارد یان نا؟

لەهێستانیی قەننەکێش، بە ناوچاوانێکی گرژەوە و بە زمانی لەهێستانی بە هاوڕێکەی گوت: «پانتە، سەعات چەندەیە؟.

ـ تەژەی هاوڕێی لە وەڵامیدا شانی هەڵتەکاند. هیچکام سەعاتیان پێنەبوو.

گرووشنکا ڕاشکاوانە دەستیکرد بە دۆزینەوەی عەیبەکانی و بە توندی گوتی: «بۆ قسە کردن قەدەغەیە؟ دەفەرموون کەس زمانی نەگەڕێ چونکە جەنابتان گیانی مەبارەکی دادەگیرێ؟» دەتگوت بۆیەکەم جار شتێک لە زەینی میتیادا دەبریسکێتەوە. ئەمجارە لەهێستانیی بە تووڕەییەکی ئاشکراوە وەڵامی دایەوە:

ـ پانی، خۆ من دژایەتیم نەکردووە. کوا، چیمگوتووە؟

گرووشنکا قیژاندی بە سەر ماکسیمۆفدا: «باشە ئیتر، زووکە چیرۆکەکەتمان بۆ بگێڕەوە. بۆ هەموو مەیموونەکەتان تۆپیوە؟»

ماکسیمۆف بە شادییەکی ئاشکراوە، لەگەڵ ئەوەی نەختێ نێوچاوانی تێکنا، دەستەوبەجێ وەڵامی دانەوە: «خاتوون، شیاوی گێڕانەوە نییە، هەمووی قۆڕیاتە. نووسراوەکەی گۆگۆڵ گێڕانەوەی نەقڵە و بە کینایە دەربڕیوە، چونکە ئەو ناوانەی لە کتێبەکەشدایە مانای تایبەتیان هەیە. و بە ئانقەست گۆڕیویەتی. ناوی ڕاستەقینەی نازدێریۆف بوو. کۆفیشنیکۆف ناوێکی دیکە

بوو، پێیان دەگوت ئیشکفۆرنۆف. تەنیا ناوی فیناردی هەر ئەو ناوەی خۆی بوو، چونکە ئەو ئیتالیایی نەبوو، ڕووسی بوو. مادمۆزێل فیناردی کچێکی شۆخ و دەلال بوو، لاقە چکۆلە و جوانەکانی دەتگوت لە قالبدراوە. مینی ژۆپێکی گولنکەداری قۆلەی لەبەردا بوو، دەستیکرد بە سەما، بەلام نەک چوار سەعات، تەنیا چوار خولەک، هەر بەو ماوە کەمەش هەمووانی سەرسام کرد...»

گالگانۆف گوڕاندی: «باسی قامچی خواردنەکەت بکە، بۆ لێیاندای؟»

ماکسیمۆف وەلامی دایەوە: «لەسەر پایرۆن»

میتیا گوتی: «کام پایرۆن؟»

- ئەو نووسەرە بەناوبانگەکەی فەڕەنسا. لە مەیخانەیەک دانیشتبووین و خەریکی خواردنەوە بووین. بانگهێشتیان کردبووم. لە پێش هەموویاندا دەستمکرد بە فرهاویشتن و شیعری داشۆرین. «بۆیلۆ تۆی؟ بەو جلوبەرگە قۆڕەوە!» بۆیلۆش لە وەلامدا گوتی: دەچم بۆ بالماسکە، یانی بۆ حەمام هی - هی! زانیم بەوە تێکچوون، هەر بۆیە خێرا فرێکی دیکەم هاویشت، کە هەموو دانیشتووان بیستبوویان و زۆریش تەشەراوی بوو:

تۆ سافۆی منیش فائۆنم!

بەلام ئەو داخە کوشتوومی

تۆ ڕێگای دەریا نازانی!

ئیتر دانیشتووان بەجارێ قەڵسبوون و بە جنێو و ناونیتکە کوێریان کردم. بەلام ناوچاوەکەم هێنابووی، بۆ ئەوەی تێی‌هەڵێنمەوە و تۆزێ دڵیان چاکەمەوە، دەستمکرد بە گێڕانەوەی حەقایەتێکی ڕۆشنبیرانە سەبارەت بە پایرۆن، کاتێک ڕێگای نادەن بچێتە ئەکادمیای فەڕەنسا، لە داخانا ئەم دوو دێڕە بۆ سەر کێلی گۆڕەکەی دەنووسێ:

Gi-git piron qui ne futrien

Pas même academician[7]

---

7- «پایرۆن لەم شوێنە نێژراوە، لە ژیانا هیچی بە هیچ نەکرد و ئەندامی ئەکادیمیاش نەبوو.»

لەسەر ئەوە گرتیانم و چیت خواردووە ترش و چەوەندەر.
- ئاخر بۆ؟ لەبەرچی؟
- لەبەر کەماڵ و زانست. خەڵک دەتوانن کەسێک لە سەر هیچوپووچ قامچی کاری بکەن.
گرووشنکا لە ناکاو قسەکەی پێبڕین: «ئاهە دەبەسیکەن. هەمووی قۆڕیاتە، نامەوێ گوێم لێبێ. پێموابوو قسەی خۆش دەکەن.» میتیا واقێکی بردەوە و لە پێکەنین کەوت. لەهێستانییە کەڵەگەتەکە، هەستا سەرپێ و وەک مرۆڤێکی خەمبار و بێتاقەت دەستی لە پشتەوە هەڵپێکا و دەستیکرد بە ڕاوێچکە کردن بە نێو ژوورەکەدا.
گرووشنکا، بەڕقەوە چاوی لێدەکرد، گوتی: «ئیتر ناتوانم دانیشم.» هەستی بە خەمباری کرد. لەگەڵ ئەوەشدا بۆی دەرکەوت لەهێستانیی خڕیلە بە چاوێکی دەخەزدارانەوە چاوی لێدەکا.
میتیا گوڕاندی: «پانییە وەرە بخۆینەوە! ئەو پانەی دیکەش هەروا! وەرن با بخۆینەوە.»
هەر خێرا سێ پەرداخی هێنا پێشێ و پڕیکردن لە شامپانی.
میتیا دیسان گوڕاندی: «پانوویە، بەخۆشیی لەهێستان دەخۆینەوە، بەخۆشیی لەهێستانی ئێوە!»
ئەو لەهێستانییەی لە سەر قەنەفەکە دانیشتبوو، بە خۆگرتنێکی قورساخانەوە گوتی: «پانییە، زۆریشم پێخۆشە، » خێرا پەرداخێکی هەڵگرت.
میتیا بە پێدارگرییەوە گوتی: «ئەو پانەی دیکە ناوی چییە؟ بخۆوە، ئەی بەناوبانگترینی بە ناوبانگەکان، پەرداخەکەت هەڵگرە!»
لەهێستانیی خریلانە گوتی: «پان وێرۆبلێفسکی.»
پان وێرۆبلێفسکی، کە بە دەم پیاسەوە خۆی دەلەقاند، هات بۆلای مێزەکە.
میتیا پەرداخەکەی هەڵگرت و گوتی: «پانوویە، بە خۆشیی لەهێستان!»
هەرسێکیان خواردیانەوە. میتیا دەستیدا بترییەکە و دیسان سێ پەرداخەکەی پڕ کردەوە.

ـ پانوویە، ئێستا بە سەلامەتیی ڕووسیا، وەرن پێکەوە ببینە برادەر!

گرووشنکا گوتی: «بۆ ئێمەش تێکە. منیش دەخۆمەوە بە خۆشیی ڕووسیا!»

گالگانۆف گوتی: «منیش.»

ماکسیمۆف گوتی: «منیش دەخۆمەوە... بە سەلامەتیی ڕووسیا، دایەگەورەی خۆشەویست.»

میتیا هاواریکرد: «هەمووومان! هەمووومان! تریفۆن بۆریسیچ، چەند بتریی دیکەمان بۆ بێنە!»

سێ بتریی دیکەیان شامپانی لەوانەی میتیا لەگەڵ خۆی هێنابووی، لە سەر مێزەکەیان دانا. میتیا هەموو پەرداخەکانی پڕکرد.

دیسان گوڕاندی: «بەخۆشیی ڕووسیا! هورڕا!» هەموو بە سەریانەوە نا، جگە لە لەهێستانییەکان. گرووشنکاش یەکبین نای بەسەریەوە. بەڵام لەهێستانییەکان دەستیان بۆ نەبرد.

میتیا گوتی: «پانوویە، یانیچی؟ ناخۆنەوە؟»

پان وێرۆبلێفسکی پەرداخەکەی هەڵگرت. بە دەنگێکی بەرز و ئاهەنگدار گوتی: «بە سلامەتیی ڕووسیا بەر لە ساڵی ١٧٧٢.»[8] لەهێستانیی گردە پیاو گوتی: «ئاوا باشە!» پاشان هەردووکیان پێکەوە پەرداخە شامپانییان هەڵدا.

لەناکاو میتیا لەدەمی دەرچوو: «پانوویە، ئێوە گەوجن.»

هەردوو لەهێستانییەکە بە لەبزێکی هەڕەشە ئامێزەوە گوڕاندیان: «پانیە!» وەک کەڵەشێری لاری هۆمەنیان بۆ میتیا برد. پان وێرۆبلێفسکی بەتایبەت زۆر بە ڕق هەستاوی و بە زمانی لەهێستانی گوتی: «مەگین پیاو دەتوانێ وڵاتەکەی خۆی خۆشنەوێ؟»

گرووشنکا بە لەبزێکی فەرمانپێدراوانەوە گوڕاندی: «بێدەنگبن! شەڕ مەکەن، من تاقەتی شەڕ و کێشەم نییە!» لاقی لە عەرزی کوتا. سوور هەڵگەڕا

---

8- ساڵی ١٧٧٢ لەهێستان لە نێوان ڕووسیا و نەمسا و پیرۆسدا بەشکرا و حکوومەتی پاشایەتی کۆتایی پێهات.

و چاوی زیتەی هات. ئەو پەرداخە شامپانییەی تازە خواردییەوە شوێنی لە سەر دانابوو. میتیا ئۆقرەی لێبڕا.

ـ پانوویە، بمبوورن! خەتای من بوو، داوای لێبوردن دەکەم. وێرۆبلێفسکی، پانیە وێرۆبلێفسکی، داوای لێبوردنتان لێدەکەم.

گرووشنکا بە ڕق و تووڕەیی و لۆمەوە گوتی:«تۆش دەمت لێکنێ! بێدەنگ دانیشە، هەقمەق!»

هەموو دانیشتن و بە بێدەنگی لە یەکتریان دەڕوانی.

میتیا سەری لە قسەکانی گرووشنکا دەرنەدەچوو، دیسان گوتی: «ئاغایان، من داممەزراندووە.وەرن دەستپێبکەین، بۆ ئاوا دەست لە سەر دەست دانیشتووین؟ چیبکەین... با دیسان خۆمان سەرگەرم کەین!»

گالگانۆف، بە ناقایلی لە ژێر لێوەوە منجاندی: «پەککو دەتوانی هەموو ناوێکی قۆڕی لێبنێی، جگە لە سەرگەرمی!»

ماکسیمۆف گوتی: «وەرن گەنجەفە بکەین، قوربان. هەروەک پێشتر دەمانکرد.

میتیا دەنگی هەڵێنا: «گەنجەفە؟ کەیفی لەلایە! بەڵام ئەگەر پانوویە...»
لەهێستانیی قەننەکێش، زۆر بە لەشگرانی وەڵامی دایەوە: «پانوویە، دوورە.»

پان وێرۆبلێفسکی گوتی: «ڕاستدەکا.»

گرووشنکا پرسیی: «دوور؟ دوورە یانی چی؟»

لەهێستانی قەننەکێش گوتی: «درەنگ، پانی، مەبەستم ئەوەیە درەنگ وەختە.»

گرووشنکا بە تووڕەیی قیژاندی: «هەمیشە درەنگیانە. هیچ کارێکیان لە دەست نایە. خۆیان بەڕەڵڵا و هەڕەڵڵان، بۆیە دەیانەوێ خەڵکیش وەک ئەوان بەڕەڵڵا و هەڕەڵڵا بێ، میتیا بەر لەوەی تۆ بێی، هەر ئاوا قڕوقەپیان کردبوو و بە بێزاری چاویان لێدەکردم.»

لـەهێـستانیی خریلانـەی قـەننـەکـێش بـە زمـانی لـەهێـستانی گوڕانـدی: «فریشتەکـەم، دیـارە لووتمـان پێدا نـاهێنی، هـەر لـەبـەر ئـەوەیـە مـاتم.» پاشـان میتیای کردە بەردەنگی خۆی و گوتی: «پانییە، من ئامادەم.»

میتیا، پارەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و دووسەد ڕۆبڵی لە سەر مێزەکە داکرد: «پانییە، دەستپێبکە. دەمەوێ زۆرت پێبدۆڕێنم. پەڕی خۆت هەڵگرە و لـە سـەر بانک دانیشە.»

لـەهێستانی گـردە پیـاو بـە شـێوەیـەکـی جیـددی و لێبڕاوانـە گـوتی: «پانیـە، گەنجەفە لە خاوەنی کاروانسەرا وەردەگرین.»

لەهێستانیی تەژە گوتی: «ئەوە زۆر چاکترە.»

میتیـا پرتانـدی: «لـە خـاوەنـی کاروانسـەرا؟ زۆر چاکـە، تێگـەیشتم، پـەڕ لـەو وەردەگرین. پانوویە، بژیی بۆ ئەو ئەقڵەت، تریفۆن بۆریسیچ، گـەنجـەفـەمـان بۆ بێنە!»

خـاوەنـی کاروانـسەرا دەسـتێکی پـەڕی تـازە بـۆ هێنـان. میتیـا بـەسـتەکـەی هەڵپچڕی.

تریفۆن بۆریسیچ سەری لە میتیا بردە پێشێ و گـوتی: «کچـەکـان ئامـادەن. جوولەکەکانیش عەدوسەدی ئەوەیە بە تار و دەمەکەوە بگەنێ. بەڵام عارەبانەی هەڵگری کەلوپەلەکان نەگەیشتوتێ.» میتیا هەستا پێ و بە هـەڵـەداوان ڕۆیـی بۆ ژوورەکـەی دیکـە تـاکو کاروبـارەکـان وەڕێ بخـا و فـەرمـانی پێویـستیان پێبـدا. بەڵام تەنیا سێ کچ هـاتبوون و هێشتا ماریا نـەهـاتبوو. خۆشـی نـەیدەزانی چ فـەرمانێک بدا و بۆچی ئاوا بـە هـەڵـەداوان هـاتووە بۆ ئێرە. هـەر ئـەوەنـدەی پێگـوتن کـە دیاریی ئـەو کچانـە ـ شـیرینی و شـەگـەڵات و نوقڵ ـ لـە جـەعبـەکـە دەرهێنن. زۆریش بـە هـەڵـە پڕووکـی گـوتی: «ودکـاش بـۆ ئانـدرێ، بـۆ ئانـدرێ ودکا، ودکا! سووکایەتیم بە ئاندرێ کرد!»

لەناکاو ماکسیمۆڤ، کە بە دوایدا هاتبوو دەستی نایە سەر شانی و بە سرتە پێیگوت:

ـ پێنج ڕۆبڵم بدەیە. منیش دەمهەوێ پەڕێن بکەم. هی ـ هی!

ـ کەیفە! زۆرم پێخۆشە! هانێ ئەوە دە ڕۆبڵ!

دیسان هەموو پارەکانی لە گیرفانی دەرهێنا و گەڵایەکی بەجێی دە ڕۆبڵ دەرکێشا. «ئەگەر دۆڕاندت، وەرەوە هی دیکەشت دەدەمێ.»

ماکسیمۆف بە دڵخۆشی چپاندی بە گوێیدا: «زۆر چاکە قوربان» هەر خێراش بە قلەسەما گەڕایەوە بۆ وەتاغە شینەکە و داوای لێبوردنی لێکردن کە چاوەڕوانی ڕاگرتوون. لەهێستانییەکان دانیشتبوون . پەڕی گەنجەفەیان بڵاو کردبۆوە. دۆستانە و تاڕادەیەک خۆمانە دیاربوون. لەهێستانیی خریلە دیسان قەننەکەی داگیرساند بوو و ئامادەی دەسپێکردن بوو. حاڵ و هەوایەکی قورساخانەی بەخۆوە گرتبوو.

پان وێرۆبلێفسکی گوڕاندی: «پانوویە، لە سەر جێی خۆت دانیشە.»

گالگانۆف گوتی: «من ئیتر یاری ناکەم، هەر ئێستا پەنجا ڕۆبڵم پێدۆڕاندن.»

لەهێستانیی قەننەکێش پێیگوت: «ئەم پانە نێوچاوانەکەی نەیهێنا، ڕەنگە ئەمجارەیان بیهێنێ.»

میتیا پرسیی: «بانکەکە چەند بێ؟ چەندەتان پێباشە؟»

ـ پانییە، یارییەکە جیاوازە، سەد ڕۆبڵ، دووسەد، هەرچەندت پێخۆشە داینێ.

میتیا بە پێکەنینەوە گوتی: «ملوێنێک!»

ـ پان سەروان ڕەنگە نەقڵی ”پان پادفیسۆتسکی“ت بیستبێ!

ـ کام پادفیسۆتسکی؟

ـ بانکێک لە وارشۆ بووە، هەموو هاتوون و لە سەر داراییەکەی مەرجیان داناوە. پادفیسۆتسکیش دێ، هەزار کوتە ئاڵتوون دەبینێ، لە سەر داراییەکەیان شەرت دەبەستێ. بانکدار دەڵێ: «پانیە پادفیسۆتسکی، بەقەد نرخی ئەو ئاڵتوونانە پارە دادەنێی، یان قەولی شەرەف دەدەی؟» پادفیسۆتسکی دەڵێ: «قەولی شەرەف پانیە.» «زۆر چاکترە.» بانکدار گەنجەفە دێنێ. پادفیسۆتسکی دەیباتەوە. بانکدار دەڵێ: پانیە، هەڵیگرە، » چەکمەجەی مێزەکە دەکێشێتەوە و ملوێنێکی پێدەدا. «پانیە هەڵیگرە، بردووتەوە.» ملوێنێک لە بانکەکەدا بووە.

پادفیسۆتسکی ئەڵێ: «ئەوەم نەدەزانی.» بانکدار دەڵێ: «پانیە پادفیسوتسکی، تۆ شەرەفت نایە گرەو و ئێمەش هەروا.» بۆیە پادفیسۆتسکی ملوێنەکە هەڵدەگرێ.
گالگانۆف گوتی: «من باوەڕ بەوە ناکەم.»
- پانیە گالگانۆف، پیاو لە کۆڕێکی ئاوا پڕ لە پیاوی موحتەرەمدا شتی وا ناڵێ.
میتیا دەنگی بەرز کردەوە: «وا دیارە قوماربازی لەهێستانی چاوپۆشی لەو ملوێنە دەکا!» بەڵام خێرا قسەی خۆی خواردەوە. «پانیە، بمبوورە، دیسان خەتامکرد. ئەو لە ملوێنەکە چاوپۆشی دەکا. لەبەر شەرەفی، لەبەر شەرەفی لەهێستانی. دیوتە زمانی لەهێستانی چۆن دەزانم، ها - ها! وەرە، من دە ڕۆبڵ لە سەر سەرباز دادەنێم.»
ماکسیمۆف پێکەنی و گوتی: «منیش ڕۆبڵێک لە سەر بیبی دادەنێم، لە سەر بیبیی دڵەکان. پانیە نووچکای جوان و وردیلە، هی - هی!» پەڕی بیبیی هەڵگرت و وەک ئەوەی قەستی شاردنەوەی هەبێ، خۆی ڕەپکردەوە و بەپەلە لە ژێر مێزەکەدا خاچی خۆی کێشا. میتیا بردییەوە ماکسیمۆفیش بردییەوە.
میتیا گوڕاندی: «یاڵڵا دەی!»
ماکسیمۆف کە لە خۆشیی بردنەوەی ئەو یەک ڕۆبڵە پێی وەعەرز نەدەکەوت لە ژێر لێوەوە گوتی: «من ڕۆبڵێکی دیکەش دادەکەم.»
میتیا نەڕاندی: «دۆڕاندی. دووبل لە سەر حەوت!»
حەوتیش دۆڕاندی.
گالگانۆف لە ناکاو وەدەنگ هات: «بەسیکەن!»
«دووبل! دووبل!» میتیا داوەکەی کردە دوو بەرانبەر، هەر جارێکیش کە دەیکرد دوو بەرانبەر، ڕاست لە سەر ئەو پەڕەی شەرتی دەبەست، دەیدۆڕاند. داوی نێوەڕاست ڕێکوپێک بوو.
میتیا بە تووڕەیی گوتی: «دووبل!»

لەهێستانیی قەنەکێش گوتی: «پانیە تۆ دووسەد ڕۆبڵت دۆڕاندووە. سەدی دیکەش دادەکەی؟»
- چی؟ دووسەدم دۆڕاندووە؟ کەوایە دووسەدیتر! هەمووی دووبل!
میتیا پارەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و خەریکی دانانی دووسەد ڕۆبڵ لە سەر بیبی بوو گالگانۆف دەستی لە سەر دانا و بە دەنگێکی زایەڵەدار گوتی: «بەسسە ئیترا.»
میتیا چاوی لێزەق کردەوە: «مەسەلە چییە؟»
- ئیتر بەسسە! ئیتر ناهێڵم بیکەی، مەگین!
- بۆ؟
- چونکە پێم خۆش نییە. دەست لە کایە هەڵگرە. ئەوە پێمگوتی ئیتر ناهێڵم بیکەی.
میتیا بە سەرسووڕمانەوە چاوی تێبڕی.
گرووشنکا بە دەنگێکی خەماوییەوە گوتی: «میتیا، دەست لە یاری هەڵگرە. ڕاستدەکا. تا ئێستا زۆرت دۆڕاندووە.» هەردوو لەهێستانییەکە، بە شێوەیەکی تۆراوانە هەستانە پێ.
لەهێستانیی وردیلە، کە بە مۆڕەوە چاوی لە گالگانۆف دەکرد، گوتی: «پانیە پێت وایە گاڵتەیە؟»
پان وێرۆبلێفسکی گوڕاندی بە سەر گالگانۆفدا: «تۆ چکارەی؟»
گرووشنکا گوتی: «تۆ هەقت چییە دەگوڕێنی؟ کەڵەشێری گەمژە!»
میتیا هەر جارێ چاوی لە یەکیان دەکرد. لە ناکاو لە ڕوخساری گرووشنکادا شتێکی بۆ دەرکەوت، هەر لەو کاتەدا شتێکی تازە بە زەینییدا هات - خەیاڵێکی تازە و سەیر!
لەهێستانیی وردیلە، لە داخانا سوور هەڵگەڕابوو، تا هات بڵێ: «پانی ئاگرییینا،» میتیا بەپەلە چوو بۆلای و دەستی دا بە شانیدا.
- بەناوبانگترینی بەناوبانگان، دەمەوێ دوو قسەت لەگەڵ بکەم.
- چیت دەوێ؟

ـ لەو ژوورەی دیکە، دوو قسەت لەگەڵ دەکەم، قسەیەکی خۆش، زۆر خۆش. بە بیستنی دڵشاد دەبی.

لەهێستانیی خڕیلە داچڵەکی و بە نیگەرانی تەماشای میتیای کرد بەو حاڵەشەوە لەڕێوە قەبووڵیکرد، بەو شەرتەی پانویرۆبلیڤسکی لەگەڵیدا بێ.

میتیا گوتی: «پاریزەر؟ قەیناکا با بێت کارم بە ئەویشە. دەبێ ئەویش لەوێ بێ. پانوویە، با بڕۆین دەی!

گرووشنکا بە نیگەرانییەوە پرسیی: «بۆ کوێ دەچن؟»

میتیا وەڵامی دایەوە: «هەر ئێستا دەگەڕێینەوە.»

جۆرێک باوەڕی کتوپڕ و جەسارەت لە چاویدا دەدرەوشایەوە. ڕوخساری لەگەڵ سەعاتێک لەمەوبەر کە هاتە ژووریێ زۆر جیاواز بوو. لەهێستانییەکانی نەبرد بۆ وەتاغێک کە کچان لێی کۆ بووبوونەوە و مێزەکەیان بە شیرینی و شەگەلات و شامپانی چنی بوو، بردنی بۆ وەتاغی خەوێک کە لای دەستە ڕاست بوو. ئەو دیوەی کە سەندووق و بەستەکانی لێداندرابوو. دوو چرپای گەورەی لێبوو کە یەکی کۆمایەک باڵنجیان لە سەر هەڵچندرا بوو. مۆمێک لە سەر مێزێکی چکۆڵەی دارین داییسا. میتیا و کابرای لەهێستانی لە پەنای مێزێکەدا ڕووبەڕووی یەکتر دانیشتن. ویرۆبلیڤسکیی تەژەش دەستی نایە پشت قوونی و لە لایان ڕاوەستا. لەهێستانییەکان کرژ و مۆن بوون، بەڵام دیاربوو وەدڵەخورپە کەوتوون.

لەهێستانیی وردیلە گوتی: «پانیە، چ فەرمایشتێکت بوو؟»

پانیە، زۆرتان ماتڵناکەم، » پارەکانی لە گیرفانی دەرهێنا. «ئەم پارەیە بۆ تۆ، لەگەڵ سێ هەزار ڕۆبڵ چۆنی؟ وەریبگرە و برۆ بەڕێی خۆتا.»

لەهێستانی، سەرسوڕماوانە چاوی لە میتیا بڕی. لەگەڵ ویرۆبلیڤسکی چاوێکیان لە یەکتر کرد و گوتی:

ـ پانیە، سێ هەزار ڕۆبڵ؟

ـ پانوویە، سێ هەزار، بەڵێ سێ هەزار! پانییە گوێ بگرە، دەزانم پیاوێکی ماقووڵی. سێ هەزار ڕۆبڵ وەرگرە و بۆ هەرکوێ دەچی بچۆ. ئەو پان

وێرۆبلێفسکییەش لە سەر تۆ ـ حاڵی بووی؟ بەڵام خێرا، هەر ئێستا و ئیتر پێتان بێرەدا نایەتەوە. پانیە تێگەیشتی، بۆ هەمیشە دەڕۆی. ئەوەش دەرگاکە بڕۆ دەریَ و ئاورِ مەدەوە. لەو وەتاغەی دیکە چیت هەیە بۆتی دێنم، ڕووپۆشێک و باڵتەیەکی پەشمی، هەر ئێستا، دەچم بۆت دێنم. ئەسپەکانیشتان خێرا بۆ ئامادە دەکەن. ئیتر خوداتان لەگەڵ، پانیە!

میتیا بە دڵنیایی چاوەڕوانی وەڵام بوو. ڕێزەیەک دوودڵ نەبوو. کابرای لەهێستانی وەک ئەوەی بڕیارێکی باشی دابێ ڕەنگ و ڕووی گەشایەوە.

ـ پارەی نەغد پانیە؟

میتیا گوتی: «پارەی نەغد پانیە، پێنجسەد ڕۆبڵ هەر ئێستا بۆ خەرجی ڕێگە و وەکو بێحانە دەدەمە خزمەتتان، دوو هەزار و پێنجسەد ڕۆبڵەکەی دیکەشی سبەینێ لە شاری، بە شەڕەفم لەبن بەردیش بێ بۆتان پەیدا دەکەم.»

لەهێستانییەکان دیسان چاوێکیان لە یەکتر کرد. گردە پیاوەکەیان گرژ بووبوو.

میتیا هەستیکرد چەتێک لە کاردایە، بۆیە گوتی: «حەوسەد ڕۆبڵ، حەوسەد ڕۆبڵ، دەڵێی چی؟ ئەویش بەبێ ماتڵبوون، هەر ئێستا نەغد، دیدەمە خزمەتتان، باشە پانیە. چییە؟ متمانەم پێناکەن؟ ئێستا ناتوانم سێ هەزار ڕۆبڵەکەتان بدەمێ. ئەگەر ئێستا بتاندەمێ، لەوانەیە سبەینێ بگەڕێنەوە بۆلای... ئێستا سێ هەزار ڕۆبڵیشم پێنییە.» میتیا لەگەڵ هەر وشەیەکدا دەتگوت جەرگ و دڵی دادەکەوێ. بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی: «لە شاری ئەو پارەیەم هەیە، زیاتریشم هەیە. بە شەڕەفم پارەکەم لەوێیە، شاردوومەتەوە.» غرووریکی ڕۆحی لە ناکاو بە ڕوخساری لەهێستانیی وردیلەوە ڕەنگی دایەوە، بە تەشەرێکەوە گوتی: «دەی چیی دیکەش؟ خەجاڵەتیش شتی چاکە!» پاشان تفێکی کردەوە. پان وێرۆبلێفسکیش تفی کردەوە.

میتیا بە هیوابڕاوی بۆی دەرکەوت دەملەپووش ماوەتەوە، گوتی: «پانیە، بۆیە ئەو کارە دەکەی بە هیوای گرووشنکا پارەیەکی زیاتری بەنێو چاوانەوە بێ؟ ئێوە جووتێک کەڵەشێری نێرەمووکن، هەر ئەوەتان قابیلە!»

«ئەوە سووکایەتییەکی گەورەیە!» لەهێستانیی وردیلە وەک چەوەندەر سوور هەڵگەڕابوو، بە پڕتاو لە ژوورەکە دپەڕی، دەتگوت تاوانە گوێی لە وشەیەکی دیکە بێ. وێرۆبلێفسکیش بەپەلە بە دوایدا هاتە دەرێ، میتیاش، شێواو و سەر لە بەرد کەوتوو بە دوایاندا هاتە دەرێ. لە گرووشنکا دەترسا، ترسی ئەوەی بوو پان هەرا و هوریا وەڕێ بخا. لە ڕاستیدا هەرواشی کرد. گردە پیاو خۆی کرد بە وەتاغەکەدا و بە شێوەیەکی سەیر خۆی خستە بەرپێی گرووشنکا.

بە زمانی لەهێستانی گوتی: «پانیە ئاگریپپینا، سووکایەتییەکی گەورەم پێکراوە!» بەڵام گرووشنکا لە ناکاو ئاراوقارای لێ‌هەڵگیرا، وەک ئەوەی ژان بە جەرگی گەیشتبێ. قیژاندی: «بە زمانی ڕووسی بدوێ! ڕووسی! ئەگەر یەک وشەی دیکەت لەهێستانی لەدەم بێتە دەرێ، خۆت دەزانی! بەڵای ناخێرت ڕووسیت دەزانی، ناکا دوای پێنج ساڵ لەبیرت چووبێتەوە؟» لەداخا سوور هەڵگەڕا بوو.

- پانی ئاگریپپینا...

- ناوی من ئاگرافنایە، گرووشنکا، ڕووسی قسە بکە، دەنا گوێت لێناگرم!

لەهێستانی بە هەست و غرووڕێکی برینداروەوە کەوتبووە هەناسەبڕکێ. بە ڕقهەستاوی و پۆز و هەواوە، دەستیکرد بە ڕووسییەکی سەروگوێ شکاو:

- پانی ئاگرافنا، من هاتووم بۆ ئێرە تاکو ڕابردوو لەبیر بەرەمەوە و ئەوەی هەتا ئەمڕۆ ڕووی داوە بەیەکجاری لە یادمدا بیسڕمەوە...

گرووشنکا لەجێی خۆی جینگڵێکی دا و قسەکەی پێ‌بڕێ: «لەبیری بەریەوە؟ هاتووی بۆ ئێرە ڕابردوو لەبیر بەرییەوە؟»

- بەڵێ وایە پانی، من قڕنیس نیم، خاوەن پیاوەتیم، غیرەتی پیاوانە، بەڵام کاتێک ئاشقەکانی تۆم دی، چاوم هاتە تەپڵی سەرم. پان میتیا لەو ژوورەی دیکە پێشنیاری سێ هەزار ڕۆبڵی پێکردم، بۆ ئەوەی دەست لە تۆ هەڵگرم. بەڵام من تفێکم لەناو چاوانی کرد.

گرووشنکا شێتانە قیژاندی: «چی؟ پێشنیاری پارەی پێکردی؟ ڕاستدەکا میتیا؟ چۆن وێرات هەڵەی وابکەی؟ بۆ من فرۆشیم؟»

میتیا گوڕاندی: «پانیە، پانیە! ئەو پاک و بێ تاوانە. من قەت ئاشقی نەبووم! ئەوە درۆیە...»

گرووشنکا قیژاندی: «بە چ هەقێک لە هەمبەر ئەودا لەسەرم دەکەیتەوە؟ ئەوەی منی پاک ڕاگرتووە، کەماڵ و زانایی نەبوو، ترسان لە کۆزماش نەبوو، ڕاستییەکەی ئەوە بوو سەرم بەرز ڕاگرم و پێیبڵێم هیچوپووچی. هەر بە ڕاستی پارەکەی ڕەتکردەوە؟»

میتیا گوڕاندی: «قەبووڵیان کرد، قەبووڵیان کرد، بەڵام دەیانویست سێ هەزارەکە بە سەر یەکەوە وەرگرن. بەڵام من تەنیا حەوسەد ڕۆبڵم بۆ هەڵسووڕا.»

ـ ئاووا: بیستوویەتی پارەم هەیە بۆیە هاتۆتەوە زەماوەندم لەگەڵ بکا!

لەهێستانیی وردیلە دەنگی هەڵێنا: «پانی ئاگریپینا، من نەجیمزادە و خانەدانم، من ـ Lajdak نیم، هاتووم بۆ ئێرە زەماوەندت لەگەڵ بکەم و ئێستا دەبینم گۆڕاوی، بوویەتە ژنێکی تەورخراپ و بێحەیا.»

گرووشنکا، بە تووڕەیی گوتی: «بڕۆوە بۆ ئەو جێگایەی لێوەی هاتووی! ملی خۆت بشکێنە، دەنا فەرماندەدەم وەدەرت نێن. منی گەوج چەندە کەر بووم پێنج ساڵ شەو و ڕۆژ عەجمانم نەبووە! هەمووشی لەبەر ئەوە بوو، ڕقئەستووری بەو دەردەی بردم. ئەویش وەک خۆی نەماوە. یانی هەر ئاوا بوو؟ ڕەنگە باوکی بێت! ئەو کڵاوە تیسکنەت لەکوێ بوو؟ ئەو کەو بوو ئێستا بۆتە عەلەشیش. پێدەکەنی و گۆرانیی بۆ دەگوتم... منی گەوج و لەوج و حەیا لێهەڵگیراو چۆن لەخۆڕا پێنج ساڵ خۆم خواردەوە و فرمێسکم هەڵوەراند!»

گرووشنکا لە سەر کورسیلەکەی خۆی بە پشتدا خست و هەردوو دەستی بەبەر چاوییەوە گرت. هەر لەو کاتەدا کچانی گۆرانی بێژی ماکرۆیە لە وەتاغی دەستە چەپەوە تێیان چریکاند ـ گۆرانییەکی شاد و هەوای هەڵپەڕکێ.

وێرۆبلێفسکی لە ناکاو گوڕاندی: «ئێرە قەحبەخانەیە! تریفۆن بۆریسیچ، ئەم سەڵیتە حەیا لێهەڵگیراوانە دەرکە با بڕۆن!»

خاوەنی کاروانسەرا، کە گوێی لەگاڵوبوغری میوانەکان بووبوو، پێیوابوو شەڕ دەکەن بۆیە ماوەیەک بوو لە پشت دەرگاکە ڕاوەستابوو و سەرتاتکێی دەکرد. خێرا خۆی بە ژووریدا کرد، بەبێ ئەدەبییەکی سەرسووڕهێنەرەوە ڕووی کردە وێرۆبلێفسکی و گوتی:

ـ ئەو چەقەچەقەت لە چییە؟ دەتەوێ گەرووی خۆت بدڕێنی؟

وێرۆبلێفسکی نەڕاندی: «هەی حەیوان!»

«حەیوان؟ پێمبڵێ بزانم تاوێ لەمەوبەر بە کام گەنجەفە یاریتدەکرد؟ دەستێکم پەڕ پێدای شاردتەوە. بە پەڕی دیاریکراو یاریتکرد؟ دەزانی یاریکردن بە گەنجەفەی نیشانەکراو تاوانە و دەتوانم بەو تاوانە بەرەو سیبریا بتڕەتێنم؟ چونکە ئەو کارە لەگەڵ قۆپیکردنی پارە جیاوازیی نییە...» ئەوەی گوتو ڕۆیی بۆلای قەنەفەکە، دەستیکرد بە پشت قەنەفەکە و باڵنجەکەی سەریدا و دەستەیەک گەنجەفەی هەڵنەپچڕاوی دەرهێنا.

بەستە گەنجەفەکەی هەڵێنا و نیشانیدان: «فەرموون، ئەوەش بەستە هەڵنەپچڕاوەکەی من! لەو پشت درگایە ڕاوەستا بووم و چاوم لێبوو شاردییەوە و بەستەکەی خۆی لەجێی دانا ـ تۆ مرۆڤێکی گزیکاری!»

گالگانۆف گوتی: «منیش دووجار ئاگام لێبوو پەڕی گۆڕی!»

گرووشنکا، دەستی لێک هەڵپێکابوو و لە شەرمانا سوور هەڵگەڕابوو، گوتی: «داڕزینە، داڕزین! خۆ شەرم و حەیا نەماوە، خودایە گیان، دیوتە کاری بەکوێ گەیشتووە!

میتیا گوتی: «بیروڕای منیش هەروایە!» بەڵام بەر لەوەی ئەو وشانەی لە دەم بێتە دەرێ، وێرۆبلێفسکی ، بە نیوچاوانێکی مۆنەوە، مشتی بۆلای گرووشنکا ڕاتەکاند و گوڕاندی:

ـ هەی بەستۆکەی هیچوپووچ!

میتیا لەڕێوە شاڵاوی بۆ برد، هەردوو دەستیگرت، هەڵیهێنا و بردی بۆ ئەو ژوورەی کە تازە لێی هاتبوونە دەرێ.

دوای گەڕانەوە، هەروا بەدەم هانکە هانکەوە، گوتی: «ئەوم لەو ژوورە لە سەر عەرزەکە ڕاکێشاوە. بۆرەکەی خوێڕی هەوڵدەدا هەستێتەوە! بەڵام ئیتر ناگەڕێتەوە، خەیاڵتان تەخت بێ...» تایەکی دەرگاکەی پێوەدا و تایەکی بە ئاوەڵایی هێشتەوە و نەڕاندی بە سەر لەهێستانییە وردیلەکەشدا:

ـ حەزرەتی مەبارەکیش، ئەگەر زەحمەت نییە تەشریف بێنە بۆ ئێرە!

تریفۆن بۆریسیچ گوتی: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچی خۆشەویست، ئەو پارەیەی پێت دۆڕاندوون لێیان بستێنەوە. وەک ئەوە وایە دزییان لێکردبێتی.»

گالگانۆف هەڵیدایە: «من پەنجا ڕۆبڵەکەی خۆم ناستێنمەوە.»

میتیا گوتی: «منیش دووسەد ڕۆبڵەکەی خۆمیا ن لێوەرناگرمەوە. هەر نامەوێتەوە قەیناکا ئەوان دڵیان بەوە خۆشە.»

گرووشنکا هاواریکرد: «ئافەرین میتیا! تۆ دەستودڵبازی میتیا!» توڕەییەکی ناوەکی بە قسەکانییەوە دیاربوو. پانی وردیلە، لە ڕقا سوورهەڵگەڕابوو، بەڵام هەروا بە پۆز و هەواوە ڕۆیی بۆلای درگاکە و لەنگەرێکی گرت، ڕووی کردە گرووشنکا و گوتی:

ـ پانی، ئەگەر دەتەوێ لەگەڵم بێی، وەرە، دەنا خوداحافیز.

هەروا کە لەبەر قین و دەماری زۆر بای کردبوو، لە دەرگاکە چووە دەرێ و خۆی کرد بە ژوورەکەیتردا بەوە دەڵێن مرۆڤی خاوەن کەسایەتی، چونکە ئەوەندە لەخۆڕازی بوو، دوای ئەو هەموو ماجەرایە، هێشتا چاوەڕوانی ئەوە بوو گرووشنکا شووی پێبکا. میتیا دەرگاکەی لێپێوەدا.

گالگانۆف گوتی: «دەرکاکە گاڵە دە.» بەڵام کلیلەکە لە پشت دەرگاکەوە تەقەی هات. دیاربوو ئەوان لە پشتەوە دایانخست.

گرووشنکا بێبەزەییانە گوتی: «ئۆخەی لە دڵم کەوت، چەندەم پێخۆش بوو! هەقی خۆیانە.»

## (٨)

## جەزم بوون

دوای ئەوە بەزم و شادی دەستیپێکرد. سەما و کەیف و خواردنەوە. بەزمەکەش ئازاد بوو و بەرگێڕەوەی نەبوو. گرووشنکا یەکەم کەس بوو داوای شەڕابی کرد. «دەمەوێ بە دڵی خۆم بخۆمەوە و وەک جاری پێشوو مەست و سەرخۆش بم. لەبیرتە، میتیا لەبیرتە جاری پێشوو لێرە لەگەڵ یەکتر ئاشنا بووین؟» میتیا بەجارێ جەزم بووبوو، بە تەواوی هەستی بە نەشە و شادی دەکرد، چونکە بەختەوەری لەبەر دەستی بوو. بەڵام گرووشنکا جارلەگەڵ جار ئەوی لە خۆی دوور دەخستەوە: «بڕۆ کەیفی خۆتی بۆ بکە. پێیان بڵێ سەما بکەن و بەزم و شادی وەرێ بخەن. با دار و دیواریش بکەونە سەما و هەڵپەڕکێ، ڕاست وەک جاری پێشوو.» لە ڕادەبەدەر شاد و دڵخۆش بوو. میتیاش هەرکارێکی پێبسپێردرایە لەلایەن گرووشنکاوە بە سەر دەچوو و ملی خۆی بۆ دەشکاند. گۆرانیبێژان لە وەتاغەکەی دیکە بوون. وەتاغێک بوو تا ئێستا ئەوان لێی دانەنیشتبوون، ژوورێکی چکۆلە بوو، پەردەیەکی کەتانییان لێگیڕا بوو و کردبوویان بە دوو بەشەوە. پشت پەردەکەش چرپایەکی گەورەی لێبوو بارێکی دۆشەک و باڵنج لە سەر هەڵچندرابوو. هەر چوار ژوورەکەی تایبەتی میوانان قەرەوێڵەی لێبوو. گرووشنکا لای دەرگاکەوە جێی خۆی گرتەوە. میتیا کورسیەکی نەرم و خۆشی بۆ دانا. گرووشنکا بۆ سەیری بەزم و هەڵپەڕکێ لە شوێنەکەی پێشووی دانیشتبوو. هەر ئەو شوێنەی کە بە کەیفی دڵی عەیش و نۆشی

کردبوو. تەواوی ئەو کچانەی هاتبوون، جاری پێشووش هەر لەوێ بوون.کۆڕی جوولەکان بە تار و دمەکەوە هاتبوون، عارەبانەی هەڵگری شەڕاب و کەلوپەلەکان گەیشتێ.

میتیا کەوتبووە هەلەکە سەما. هەموو جۆرە مرۆڤێک خۆیان بە ژووریدا دەکرد. بۆ ئەوەی سەیری بەزم و هەڵپەڕکێ بکەن، خەڵکی نێو دێ بە ژن و منداڵەوە لە خەو هەستابوون، بەهیوا بوون وەک مانگی پێشوو بچنە سەیران و بەزم و بۆ ماوەیەک بە خۆشی ڕایبوێرن. میتیا قەڵافەتی هەموویانی لەبیر مابوو، تووشی هەرکامیشیان دەبوو و دەیناسییەوە، ماچوموچی لەگەڵ دەکرد. بتری شامپانیی هەڵدەپچڕی و هەرکەس لەڕێوە دەهات، پەرداخی بۆ پڕ دەکرد. تەنیا کچان حەزیان لە شامپانی بوو. پیاوەکان ڕۆم و براندی و پانچی گەرمیان پێخۆش بوو. میتیا فەرمانیدابوو نوقڵ و چۆکلێت بۆ کچەکان دانێن و نەهێڵن سێ سەماوەر هەتا بەیانی بکووژێتەوە، بۆ ئەوەی چایی و پانچ بۆ هەموان ببێ و کەمی نەهێنێ. وردە وردە وابوو بە تێکەولێکە، دەتگوت کاسەی قەرەچی ئاو بردوویە، بەڵام میتیا هێندە کەیفخۆشبوو، هەرچەندە تێکەو لێکە زیاتر دەبوو ئەو زیاتر دەگەشایەوە و نەشە دەبوو. ئەگەر لادێییەکان لەو کاتەدا داوای پارەیان لێبکردایە، چەکەی پارەکەی لە گیرفانی دەردێنا و بەم دەست و بەو دەست پێیدەدان. وادیارە هەر لەبەر ئەوەش بوو تریفۆن بۆریسیچ بە دەوری میتیادا دەهات و چاوی لە سەر هەڵنەدەگرت. وادیارە ئەو شەوە بە یەکجاری وازی لە خەوتن هێنابوو، ئەگەرچی برێکی خواردبۆوە، ئەویش تەنیا پەرداخێک پانچ، چونکە ئاگای لە میتیا و گیرفانی بوو و لەسەری سایەد بوو. کاتێک دەهات گیرفانی هەڵتەکێنێ، خێرا ناوبژیوانیی دەکرد و بە ڕێز و ئەدەبێکی زۆرەوە هانیدەدا «سیگار و شەڕابی ڕاین» خەسار نەکا و لەوەش گرینگتر بە پێچەوانەی جاری پێشوو پارە بە لادێییەکان نەدا. زۆریشی ڕق لە لیکۆرخواردنەوە و شیرینی خواردنی کچان هەستابوو. دەیگوت: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، ئەو

ڕشکنانە چین. ئەگەر لەجیاتی ئێوە بوایەم، شەپێکم تێهەڵدەدان، ئەوان تەنانەت ئەو شەپەش بە شانازی دەزانن ـ هەر شیاوی ئەوەشن!»

میتیا دیسان ئاندرێی وەبیر هاتەوە و فەرمانیدا پانچی بۆ بەرن. بە دەنگێکی نەرم و گیراوە دووپاتیکردەوە: «ناحەزی لەگەڵ جووڵامەوە، پێموا ڕەنجاندم.» گالگانۆف قەستی شەڕاب خواردنەوەی نەبوو، سەرەتا گرنگییەکی ئەوتۆی بەو کچانە نەدەدا، بەڵام دوای خواردنەوەی یەک دوو پەرداخ شامپانی بە تەواوی وە نەشەی خست. بە نێو ژوورەکەدا پیاسەی دەکرد و پێدەکەنی و تاریفی گۆرانی و مۆسیقاکەی دەکرد، هەموو شتێک و هەموو کەسێکی بەباش دەزانی. ماکسیمۆف، شاد و سەرخۆش لە گالگانۆف دوور کەوتەوە. گرووشنکاش خەریکبوو سەرخۆش دەبوو. ئاماژەی بە گالگانۆف کرد و بە میتیای گوت: «چ کوڕێکی جوانچاک و خوێنشیرینە!» میتیاش هەڵات بۆلایان و گالگانۆف و ماکسیمۆفی ماچکرد. زۆری ئارەزوو لە دڵدا بوو! گرووشنکا هێشتا هیچی نەگوتبوو، وێدەچوو بەقەستی لە قسە کردن پارێز بکا. بەڵام جاروبار بە چاوێکی بەسۆز و لاوێنەر لە میتیای دەڕوانی. ئاخری وایلێهات لە ناکاو دەستی میتیای گرت و کێشای بۆلای خۆی. لەو کاتەدا لە سەر کورسیلەی بەردەرگاکە دانیشتبوو.

ـ چۆنبوو هاتی؟ ها؟ کاتێ ئاوا بەپەلە هاتی!... زۆر ترسام. دەتویست من بە ئەو بسپێری، ها؟ هەر بە ڕاستی دەتویست ئەو کارە بکەی؟

میتیا سەرخۆشانە گوتی: «نەمدەویست شادییەکەتان لێ تێکبدەم!» بەڵام گرووشنکا گوێی لە وەڵامی ئەو نەبوو.

دیسان لەخۆی تاراند: «چاکە، بڕۆ کەیف بکە... مەگری، دیسان بانگت دەکەم.» میتیا بە هەڵاتن ڕۆیی بۆ ئەوسەری ژوورەکە و گرووشنکا گوێی لە گۆرانی گرتبوو و سەیری سەما و هەڵپەڕکێی دەکرد، ئەگەرچی چاوی لە سەر میتیا هەڵنەدەگرت. بەڵام دوای چارەگێک دیسان بانگیکردەوە و میتیا بە هەڵاتن چوو بۆلای.

ـ وەرە لەلام دانیشە، پێمبڵێ بزانم دوێنێ نەقڵی منت لەکوێ بیست و کێ پێیگوتی هاتووم بۆ ئێرە؟

میتیا بە شێوەیەکی تێکەڵ و پێکەڵ و پچڕ پچڕ هەموو شتێکی بۆ گێڕایەوە. زۆر سەیر قسەیدەکرد، جارجار گرژ دەبوو و لە قسە دەکەوت.

گرووشنکا پرسیی: «بۆ وا تێکدەچی؟»

ـ لەخۆوە... نازانم... ڕاستت دەوێ، پیاوێکی نەخۆشم لەوێ بەجێ هێشتووە. ئەگەر بلوایە بۆم دەساڵم لە تەمەنی خۆم پێدەدا بۆ ئەوەی چاکبێتەوە. بۆ ئەوەی بزانم چاکبۆتەوە!

ـ ئەگەر نەخۆشە، هەر بیریشی لێمەکەوە. دەی، سبەینێ دەتویست بە گوللە لە خۆت دەی! چەندە کوڕێکی گەوجی! بۆچی دەتویست خۆت بکوژی؟ من زۆرم مرۆڤی ئاوا نەترس و ئازا خۆشدەوێ. دەی، کەوایە ئامادەی لەبەر خاتری من هەموو کارێک بکەی، ها؟ گەوجەگیان، یانی هەر بەراستی دەتویست سبەینێ خۆت بکوژی؟ نا، ماوەیەک دەستڕاگرە، ڕەنگە قسەیەکت پێبڵێم... ئەمڕۆ پێتناڵێم، سەبەینێ ڕەنگە. پێت خۆشە ئەمڕۆ پێتبڵێم؟ نا، ئەمڕۆ پێتناڵێم. چاکە ئێستا هەستە برۆ. برۆ خوشی ڕابوێرە.

لەگەڵ ئەوەشدا، وەک ئەوەی تێگەیشتبێ ئۆقرەی لێهەڵگیراوە، بانگیکرد. بە وردی چاوی لە چاوی بڕی و گوتی: «بۆ خەمباری؟ خەمبارت دەبینم... ئەرێ دەزانم دڵتەنگی. پێت وایە دەگوڕێنی و قاقا دەکێشی و کچانی لادێی ماچدەکەی، ئێتر تێتناگەم، دەزانم لە ناخەوە چەندە ئاڵۆز و ناشادی. بیری لێمەکەوە، برۆ خۆشبە. من زۆر شادم، تۆش برۆ شادبە، خەمت نەبێ... لێرە کەسێکم خۆش دەوێ، بزانم دەزانی کێیە. ئەیەڕۆ چاوی لێکە، جەرگەکەم خەوی لێکەوتووە، مەستە.»

مەبەستی گالگانۆف بوو، بە سەرخۆشی، بۆ تاوێک لە سەر قەنەفەیەک دانیشت، بەڵام لەڕێوە، خەوی لێکەوتبوو. خەواڵوییەکەشی تەنیا بە هۆی مەستییەوە نەبوو. لە ناکاو هەستی بە دڵتەنگی کرد، یان خۆی گوتەنی، «تاقەتی بەسەرچوو» گۆرانیی ئەو کچانە بەجارێ خەمباریکرد. گۆرانییەکە و

خواردنەوەی پەیتا پەیتای شامپانی وردە وردە خەریکبوو لەبەر چاویان دەکەوت. سەما و هەڵپەڕکێکەش بەوڕادەیە لەبەر چاوی تاڵبوو. دوو کچیان خۆیان وەک ورچ لێکردبوو و کچێکی شاد و قۆشمەش بە ناوی ئیسپانیدا، بە داردەستێکەوە ئاگاداریی لێدەکردن و دەستیکرد بە «ڕێنوێنی کردنیان.» «ماریا هۆشت بە خۆتەوە بێ دەنا لێدان دەخۆی!» ورچەکان ئاخری بە شێوەیەکی ناحەز لەگەڵ پڕمووهۆڕی ژنان و پیاوان کە تێک ترینجابوون، لە چەقی ژوورەکەدا تلانەوە.

بە واقوڕماوی گوتی: «زۆر چاکە، لێیان گەڕێن! لێیان گەڕێن! کاتێک خەڵک بۆ شادی و خۆشی ڕۆژێکیان بۆ هەڵکەوتووە، بۆ شادی نەکەن؟»

بەڵام گالگانۆف دەتگوت ئازای ئەندامی لە پیسایی هەڵکشاوە، گرژ و مۆن، خۆی دوورە پەرێز ڕادەگرت، و لەبەر خۆیەوە دەیمنجاند: «تەواوی ئەو قۆڕیاتە لادێییانە، وەک کاری بەراز وایە. شەوانی هاوین کە مانگەشەو دەبێ، ئەو جۆرە بەزم و گەمانە ساز دەکەن.» ئەو بەتایبەت گۆرانییەکی تازەی زۆر پێناخۆش بوو کە هەوایەکی شاد بوو و پیرێژنی بە قوون هەڵدەپەڕاند. ئەو گۆرانییە باسی پیاوێک بوو کە دەهات بەختی خۆی لەگەڵ کچێک تاقی بکاتەوە، بۆ ئەوەی بزانێ خۆشیان دەوێ یان نا:

ئەربابێک دێ بۆ خوازبێنی:
تاکو بۆی دەرکەوێ کچە
خۆشی دەوێ و شووی پێدەکا؟
بەڵام کچان کوا دەتوانن ئەو ئەربابەیان خۆشبوێ:
ئەو زاڵمانە لێمدەدا
بە شووڵ و قامچی لێمدەدا
بەکاری چیدێ ئەشقی وا؟

پاشان قەرەچییەک دێ و ئەویش بەختی خۆی تاقی دەکاتەوە:
قەرەجێک دێ بۆ خوازبێنی:
تاکو بۆی دەرکەوێ کچە

خۆشی دەوێ و شووی پێدەکا؟
بەڵام ئەوان ناتوانن قەرەجیشیان خۆشبووی:
ترسم هەیە دەرچێ بە دز
ببێتە هۆی خەم و دەردم
داماوم کا و مات و سەرکز.

زۆر پیاوی دیکەش بۆ تاقی کردنەوەی بەختی خۆیان دێن، یەکیان سەرباز دەبێ:

سەربازێک دێ بۆ خوازبێنی
تاکو بۆی دەرکەوێ کچە
خۆشی دەوێ و شووی پێدەکا؟

بەڵام دەست بە ڕووی سەربازەکەشەوە دەنێن:

من چۆن شوودەکەم بە سەرباز
کۆڵەپشتی لەکۆڵ دەنێ
منیش دەبێ وەدوای کەوم
لە چۆڵ و هەرد و بەندەنێ.

لێرەدا دێڕێکی زۆر ناحەزیان بە ڕاشکاوی دەگوت، گوێگرانی توشی دڵەخورپە کرد. گۆرانییەکە بە خوازبێنیی بازرگانێک کۆتایی دێ:

بازرگان دێ بۆ خوازبێنی:
تاکو بۆی دەرکەوێ کچە
خوشی دەوێ و شووی پێدەکا؟

دردەکەوێ کە بە ئاواتی خۆی دەگا، چونکە:

بازرگان بۆم دێنێ پارە
منیش دەبم بە خاتوونی
ئەم ناوچە و مەڵبەند و شارە.

گالگانۆف زۆری ڕق هەستا. بە دەنگێکی بەرز گوتی: «ئەم گۆرانییە ئیتر باوی نەماوە. کێ ئەم هۆنراوانەیان بۆ دەنووسێ؟ بریا کرێکاری هێلاسن و

جوولـەکـەش بهاتبایـەن بۆ خـوازبێنی و تاقیکردنـەوەی بـەختی خۆیـان.» پێی وابوو زۆر دزێوە و سووکایەتیی پێوەیە، بۆیە لەڕێوە گوتی تاقـەتم بـە سـەر چووە. دوای ئـەو قسـەیـە لـە سـەر قـەنـەفـەیـەک دانیشـت و خـەو بردییـەوە. ڕوخساری جوان و چکۆڵەی کەوتە سەر باڵنجی قەنـەفـەکـە و هـەتـا ڕادەیـەک ڕەنگی پەڕیبوو.

گرووشنکا کە میتیای دەبرد بۆلای، گوتی: «چاوی لێکە چەندە جوانە. هـەر سـەعاتێک لـەمـەوبـەر سـەریـم دادێنا، قژی دەڵێی خـەیـاتـەی خـاوە، چـەنـدەش پڕە...»

بـەنـەرمـی داهاتـەوە و نێوچـاوانی مـاچکرد. گالگانۆف خێرا چـاوی هـەڵێنا. هەستا سەرپێ و بە شێوەیەکی تاسەمەندانە پرسیی ماکسیمۆف لەکوێیە.»

میتیا گوتی: «کەوایە ئەو کەسەی خۆشت دەوێ ئەوە.»

گرووشـنکا بـە پێکـەنینـەوە گـوتی: «گالگـانۆف تـاوێ لـەلام دانیشە. میتیا، هەڵێ ماکسیمۆف ببینەوە.»

دیار بوو ماکسیمۆف ناتوانێ واز لەو کچانە بێنێ و تەنیا جاروبار بەپەلە دەچێ پـەرداخێک لیکۆر بۆخـۆی تێدەکـا. دوو پیاڵـەشـی پـانج[9] خواردبـۆوە. دوموچاوی سـوور هـەڵگەڕابـوو، لووتیشی پـەمـەیی بـوو، چاوی تـەڕ بـوو و جوانییەکی بێتامی پێوە دیاربوو. هەڵاتە پێشێ و ڕایگەیاند کە دەیهەوێ سەما بکا.

ـ کاتێک منداڵ بووم تەواوی سەما دروست و حیسابی و ئەشـرافییەکانیان فێرکردم...

گرووشنکا گوتی: «میتیا تۆ لەگەڵی بچۆ، من دەمهەوێ هەر لێرەوە چاو لە سەما کردنەکەی بکەم.»

گالگانۆف بـە سـاویلکەییـەکی تـەواوەوە ڕازی نـەبـوو گرووشـنکا لـەگـەڵی دانیشێ، گوتی: «نا، نا، منیش دێم و تـەماشـا دەکـەم.» هـەموویـان چـوون بـۆ تەماشا کردن. ماکسیمۆف دەستیکرد بە سەما کردن. بەڵام جگە لە میتیا هـیچ

9- شەڕاب یان عارەقی تێکەڵ بە ئاوی گەرم و شەکر و لیمۆ و بیبەر و هتد...

کەس ئافەرینی پێنەکوت. سەماکەشی تەنیا هەڵبەزدابەز و هەڵێنانەوەی لاقی بوو لە پشتەوە، کە هەرجارێ هەڵدەبەزییەوە بە دەست لەولاقەی دەدا کە لە پشتەوە هەڵی دەهێنایەوە. گالگانۆف ڕێزەیەکیشی پێخۆشنەبوو، بەڵام میتیا باوەشی پێداکرد و ماچیکرد.

ـ بژی، سپاس بۆ ئەو سەما جوانەت وادیارە ماندوو بووی! لێرە بە دوای چیدا دەگەڕێی؟ تۆزێ شیرینی مەیل کە. یان جگەرەیەک داگیرسێنە.

ـ جگەرەیەک قوربان.

ـ ئەی مەشرووب ناخۆیتەوە؟

ـ تاوێ لەمەوبەر پەرداخێکم لیکۆر خواردەوە قوربان... شەگەلات نییە؟

ـ چۆن نییە، بارخانەیەک لە سەر مێزەکە هەڵڕژاوە. چ جۆرێکت پێخۆشە برۆ هەڵبژێرە ڕۆحەکەم!

ـ وانیلی، وانیلی ئەگەر هەبێ پێمخۆشە قوربان، تایبەتی پیرە پیاوانە. هی ـ هی!

ـ نا براکەم لەو جۆرە تایبەتەمان نییە.

ماکسیمۆف دانەوییەوە سرتاندی بە گوێی میتیادا: «دەڵێم ئەو کچە، ماریا چکۆل هی ـ هی! دەکرێ یارمەتیم بدەی لەگەڵی ئاشنا بم؟»

ـ کەوایە ئاوری ئەوە هەڵی گرتووی! نا، براکەم، ئەوە هاتوو نەسازای.!

ـ ماکسیمۆف بە لەبزێکی خاماوی گوتی: «نە بەخوا ئازاری نادەم.»

ـ باشە، باشە، بەڵام دەزانی چی براکەم، ئەوانە تەنیا بۆ سەما و گۆرانی هاتوون بۆ ئێرە. سەگی تێڕی بۆ ئەو هاتنەیان، سەبرکە بزانین!... جارێ خەریکی خواردن و خواردنەوە بە. پارەت ناوێ؟

ماکسیمۆف بە پێکەنینەوە گوتی: «دواتر ڕەنگە.»

ـ زۆر چاکە، زۆر چاکە...

میتیا سەری گەرم داهاتبوو، چووە بەر کەپرە دارینەکەی حەوشە، کە بە دەوری کاروانسەراکەدا لێدرابوو. هەوای فێنک تۆزێک هێنایەوە سەرخۆ. لەو تاریکییەدا ڕاوەستاو بە هەردوو دەستی سەری خۆی گرت. بیر و خەیاڵە

پەڕیوەکانی لە ناکاو گەڕانەوە و لە مێشکی وەرهاتن. هەست و بیری تێک هاڵان و برووسکەیەکی کتوپڕ لە زەینی دا و برووسکەیەکی بەسام و پڕ مەترسی! بە زەینیدا تێپەڕی: «ئەگەر بڕیارە خۆم بکووژم، بۆ هەر ئێستا ئەو کارە نەکەم؟ بۆ نەچم بۆ دەمانچەکان و بیانهێنم بۆ ئێرە، لێرە، لەم قوژبنە تاریک و تنووکەدا کارەکە یەکلایی کەمەوە؟» نزیکەی دەقیقەیەک، بە دوودڵی ڕاوەستا. چەن سەعات لەمەوبەر کە بە پڕتاو هات بۆ ئێرە، ئەو شوورەییەی بە دوایەوە بوو، ئەو دزییەی کردبووی، ئەو خوێنە، ئەو خوێنە!... بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەش لەو کاتەدا ئاسانتربوو بۆی. لەو کاتەدا هەموو شتێک کۆتاییی پێهاتبوو: گرووشنکای لە دەست دەرچووبوو، ئیتر دەستی لێداشتبوو. ئەو ئیتر لە دەستی دەرچووبوو ـ لەو کاتەدا مەرگ بۆ ئەو ساناتر بوو؛ دەبوو هەرچۆنێکە بمرێ، چونکە ئیتر هیچ هیوایەکی بۆ مانەوە لەم دنیایەدا نەبوو. بەڵام ئێستا؟ ئێستاش وەک ئەو کاتەیە؟ ئێستا ئیتر تارماییەک، لانیکەم ئەو ترسەی لە دڵدا نەمابوو: ئەو ئاشقە هەقبەدەستەی پێشوو، ئەو داهۆڵە نەخسە لە نێو چووبوو، ئیتر ئاسەواری نەمابوو. ئەو تاپۆ تۆقێنەر و بەسامە بووبووە شتێکی هیچەکە و قۆڕ و خوێڕی. بردبوویانە ژووری خەوتن و دەرگای لە سەر گاڵە درابوو. تازە گەڕانەوەی نەبوو. گرووشنکا تووشی شەرمەزاری بووبوو، میتیا لە چاویدا خوێندبوویەوە کە دڵی بە چ کەسێکەوەیە. ئێستا بۆ بەختەوەری لە ژیاندا، هەموو شتێکی لە ئیختیاردا بوو... بەڵام نەیدەتوانی درێژە بە ژیان بدا، نەیدەتوانی، ئەی هاوار، خودایە، ئاخ! خودایە ئەو پیاوی لای پەرژینەکە دام بە عەرزدا، نەمردبێ! ئەو مووسیبەتە گەورەم لێ دوور خەوە! خودایە! بۆ تاوانبارانی وەک من زۆرت مۆجزە نواندووە! بەڵام ئەگەر، ئەگەر ئەو پیرە پیاوە زیندوو بێ، هەرچۆنێک بێ ئەو پەڵەی شوورەییە دەسڕمەوە، پارەکە دەبەمەوە جێی خۆی. دیبەم دەیدەمەوە، بە هەر شێوەیەک پەیدایدەکەم و دەیبەمەوە. ناهێڵم هیچ ئاسەوارێک لەو شوورەییە بمێنێتەوە، مەگین لە دڵمدا بمێنێ! بەڵام نا، نا، چ خەونێکی مەحاڵ و ترسەنۆکانەیە! ئاخ، هاوارە لەم من!»

لەگەڵ ئەوەشداترووسکەی هیوایەک لەو شەوە نووتەکەدا خۆی بە زەینییدا کرد. هەستا پێ و بە هەڵەداوان ڕۆیشتەوە بۆ وەتاغ ـ بۆلای ئەو، بۆلای ئەو فریشتەی هیوایەی، کە سەعاتێک هێچ، تەنانەت دەقیقەیەک ئەشقی ئەو تەواوی پاشماوەی ژیان دێنێ. تەنانەت لەگەڵ ئازاری ئابڕووتکانیشدا؟ ئەو پرسیارە تاڵە چنگی لە دڵی گیر کرد. «بۆلای ئەو، بۆلای خۆی، بۆ دیتنی، بۆ بیستنی، ئیتر بیر لە هیچ نەکردنەوە و لەبیر بردنەوەی هەموو شتێک. تەنانەت ئەگەر تەنیا ئەو شەوەش بێ، سەعاتێک، یان بۆ چرکەیەک!» ڕاست لەو وەختەدا کە لەبەر هەیوانەکەوە ڕۆیی بۆ سەرسەرا. لووتی بە لووتی تریفۆن بۆریسیچدا تەقی. بۆی دەرکەوت کە خەمبار و نیگەرانە و پێیوابوو بە دوای ئەودا دەگەڕێ.

ـ تریفۆن بۆریسیچ، چبووە، لە من دەگەڕێی؟

خاوەن کاروانسەرا مات و خەمبار دیاربوو، گوتی: نا قوربان. بۆ لە تۆ بگەڕێم؟ مەگین چووبووی بۆ کوێ؟»

ـ بۆ وا ماتی؟ خۆ ڕقت هەڵنەستاوە؟ پەلەمەکە، هێندەی نەماوە، بڕۆی لە جێگاکەت خزێی... سەعات چەندەیە؟

ـ سەعات سێ. ڕەنگە لە سێش لایدابێ.

ـ ئیتر زۆری نەماوە، وردە وردە بەزمەکە کۆتایی پێدێنین.

ــ ئەوە چ فەرمایشتێکە قوربان. تا هەرکاتێک پێتان خۆشە، درێژەی پێبدەن...

میتیا بۆ ساتێک لە خۆی پرسی: «چبووە؟» ڕۆیی بۆ وەتاغێک کە کچەکان خەریکی سەما بوون. گرووشنکا لەوێ نەمابوو. میتیا سەری کێشا پشت پەردەکە ـ گرووشنکا لەوێ بوو. لە سووچێک، لە سەر سندووقێک دانیشتبوو. سەری کردبووە سەر قەرەوێڵەی بەردەمی و خۆی کۆم کردبۆوە. دەگریا و هەوڵی دەدا بە دەنگ نەگری، نەوەک گوێیان لە دەنگی بێ. کاتێ چاوی بە میتیا کەوت بانگیکرد بۆلای خۆی، توند دەستیگرت و بەسرتە گوتی:

ـ میتیا، میتیا، نازانی چەندەم خۆشدەویست. حەیفێ بۆ ئەو پێنج ساڵەی خۆشمویست! نازانم ئەوم خۆشدەویست یان ڕقی خۆم؟ نا ئەوم خۆشدەویست، ئەو. ئەوە درۆیە کە ڕقی خۆمم خۆش ویستبێ و ئەوم خۆش نەویستبێ. میتیا ئەو کاتە حەڤدە ساڵم تەمەن بوو. لەگەڵما زۆر دڵۆڤان بوو، زۆریش سەرو دڵخۆشبووین. گۆرانیی بۆ دەکوتم... یان ڕەنگە کچێکی گەمژەی وەک من پێیوابووبێ وایە.... خودایە ئێستا ئیتر وا نەماوە، گۆڕاوە. تەنانەت ڕەنگی ڕوخساریشی وەک ئەو کاتە نییە. تەواو جیاوازە. ئەو پیاوەی پێنج ساڵ لەمەوبەر نییە. هەر کەسێکی دیکە بوایە بەجێی من نەیدەناسییەوە. لەگەڵ تیمووتی هاتم بۆ ئێرە، لە تەواوی ماوەی ڕێگادا بیرم لێدەکردەوە چۆنی لەگەڵ بەرەوڕووبم؟ چیی پێبڵێم؟ چۆن چاو لە چاوی یەکتر بکەین؟ هۆشم لانەمابوو. کتوپڕ وەک ئەوەی سەتڵێکم ئاوی پیس بەسەردا کەن، داچڵەکیم. کە گەیشتمە ئێرە، وەک بەڕێوەبەری قوتابخانە، بە قەڵافەتێکی وشک و پۆز و هەوایەکی عالمانەوە، قسەی لەگەڵ کردم. هێندە بە ویقارڕ و دەمارەوە لەگەڵم بەرەوڕوو بوو، زمانم لە گۆ چوو. نەمتوانی لە ئەلفەوە بێمە بێ. سەرەتا پێموابوو لەبەر ئەو لەهێستانییە خۆبەزل زانەی هاوڕێی پێی عەیبە قسەم لەگەڵ بکا. دانیشتم و چاوم تێبڕی، لەخۆم پرسی بۆ ئێستا ناتوانم تەنانەت قسەیەکی لەگەڵ بکەم. ڕەنگە ژنەکەی ئاوا وشکی کردبێ؛ ئاخر خۆ دەزانی، منی لەخۆی تاراند، بۆ ئەوەی ژنێکی دیکە بێنێ. ڕەنگە ژنەکەی ئاوای لێکردبێ، ئەو ئاڵوگۆڕەی بە سەر هێنابێ. میتیا، چەندە شوورەیییە! ئاخ، میتیا نازانی هەست بە شەرمەزاری دەکەم. هەی نەحلەت لەو پێنج ساڵە!

دیسان دەستیکردەوە بە گریان. بەڵام دەستی میتیای توند گوشی و بەری نەدا. بە سرتە گوتی: میتیای خۆشەویست، لە لامبە.بەجێم مەهێڵە. دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم.» لە ناکاو سەری بۆیلای میتیا بەرز کردەوە. «گوێ بگرە پێمبڵێ بزانم کێم خۆشدەوێ؟ لێرە پیاوێکم خوشدەوێ. ئەو پیاوە کێیە؟

دەبێ ئەوەم پێبڵێی؟» بزەیەک، ڕوخسارە شێواوەکەی گەشاندەوە، چاوی زیتەی هات و لەو تاریکییەدا درەوشایەوە.

ـ بروسکەیەک لە دڵمیدا و ڕاچەنیم. هەڵۆیەک خۆی بە ژووریدا کرد. «گەوجە گیان ئەوە هەر ئەو پیاوەیە وا خۆشتدەوێ!» دڵم ئەوەی پێگوتم. تۆ هاتی و ڕووناکی لە دڵم گەڕا. لە خۆمم پرسی: ئەو لە چی دەترسێ؟ چونکە هەراسان و بێئۆقرە بووی؛ نەتدەتوانی قسە بکەی. لەوان ناترسێ ـ بۆ دەکرێ ئەو لە کەسێک بترسێ؟ لە دڵی خۆمدا گوتم: لە من دەترسێ وادیارە، تەنیا لە من. کەوایە فینیا بە تۆی گەوجیلەی گوت سەرم لە پەنجێرە بردۆتە دەرێ و بە ئالیووشام گوتووە بۆ ماوەی سەعاتێکم میتنکا خۆش ویستووە و ئێستا دەڕۆم تاکو کەسێکی دیکەم... خۆشبوێ. میتیا، میتیا، چەندە گەوج بووم کە پێموابوو دوای تۆ دەتوانم کەسێکی دیکەم خۆشبوێ! دەمبووری میتیا؟ لێم خۆشدەبی؟ خۆشت دەوێم؟ ها، خۆشت دەوێم؟

گرووشنکا هەستا سەرپێ و بە هەردوو دەستی شانی میتیای گرت. میتیا وەک جەزمبوو چاوی لە ڕوخسارە پڕ بزەکەی بڕی. لە ناکاو باوەشی پێدا کرد و دەمی نا بە ڕوومەتیەوە بە گەرمی ماچیکرد.

«بمبوورە کە ئازارم داوی! دەمبووری؟ لەبەر دڵڕەشی و قین ئازارم دەدان. هەر لەبەر ئەوش ئەو دەردەم بە پیرەپیاو دەدا و وەک شێتم لێکردبوو... لەبیرتە ڕۆژێک لەماڵی ئێمە شەڕابت خواردەوە و پەرداخەکەت شکاند؟ ئەوەم وەبیر هاتەوە و منیش ئەمڕۆ پەرداخێکم شکاند. پاشان «بە خۆشیی دڵە ئابڕووتکاوەکەم» پێکێکم هەڵدا. میتیا.هەڵۆکەم، بۆ ماچناکەی؟ جارێکت ماچکردم و کشایە دواوە، هەر ئەوەندە بوو؟ کشاویەتە دواوە و گوێت بۆ قسەکانم شلکردووە. گوێمەگرە، ماچمکە، بە کەیفی خۆت ماچمکە. دەی توند ماچم کە، ئاوا. ئەگەر خۆشتدەوێم، چاکە خۆشتبوێم، منیش دەبمە قەرەواشت، هەتا ئاخری تەمەنم قەرەواشیت دەکەم. زۆرم پێخۆشە ببمە کڵفەتت. ماچمکە، لێمدە، جەزرەبەم دە، هەرچیت پێخۆشە لەگەڵم بکە... مافی خۆمە ئازار بکێشم. ڕاوەستە، سەبرکە، ئەو کارە هەڵگرە بۆ دوایی، جارێ...»

گرووشنکا لە ناکاو خۆی کێشا دواوە. «میتیا، هەستە بڕۆین، منیش دێم چۆڕێ شەڕاب دەخۆمەوە. دەمەوێ سەرخۆش بم. دەمەوێ سەرخۆش بم و سەما بکەم. ئەرێ حەتمەن دەبێ سەرخۆش بم و سەما بکەم!»

گرووشنکا، خۆی لە چنگی میتیا دەرباز کرد و چووە پشت پەردەکە. میتیا وەک مەست و هۆش لێبڕاو وەدوای کەوت. لە دڵی خۆیدا گوتی: «هەرچی دەبێ با ببێ چش ـ لەوانەیە هەموو جۆرە ڕووداوێک بێتە پێشێ، بۆ ساتێک ئامادەم تەواوی دنیا بدەم.» گرووشنکا، بەڕاستی دوای ئەوەی پەرداخێک شامپانیی یەکبین نا بەسەریەوە، مەستیکرد و زەردە خەنەیەکی شیرین و پڕ شادی ڕوخساری خەملاند و بە ئارامی لە سەر جێگاکەی پێشووی دانیشتەوە. ڕوومەتی دەتگوت دەنکی هەنارە. لێوی بووبووە یاقووت، چاوە گەشەکانی نەرم و مەست. حەزێکی ئاگرین لە چاویدا شەپۆلی دەدا. تەنانەت دڵی گالگانۆفی خستە کەڵکەڵە و ڕۆیشت بۆلای.

گرووشنکا بە شێوەیەکی خۆمانە گوتی: «تاوێک لەمەوبەر کە خەوت لێکەوتبوو هەستتکرد چۆنم ماچکردی؟ ئێستا مەستم، هەر ئەوەندە... مەگین تۆ مەست نیت؟ میتیا بۆ ناخواتەوە؟ میتیا، ئەوە بۆ ناخۆیەوە؟ من مەستم و تۆش تەماتە نەخۆیەوە...»

من مەستم! قەت ئەوەندە مەست نەبووم... مەستی تۆم... ئێستا مەستی شەرابیش دەبم.

میتیا پەرداخێکی دیکەی پێدا کرد و ـ خۆشی پێی سەیر بوو ـ هەر ئەو پەرداخە مەست، مەستیکرد. لە ناکاو مەستیکرد، ئەگەرچی هەتا ئەو کاتە تەواو هۆشی لە سەر خۆی بوو. ئەوەی هەر لەبیرما. سەرە گێژەی گرت، وڵات لە دەوری سەری دەخولایەوە. شەشدانگ مەست، بە نێو وەتاغەکەدا دەگەڕا و پێدەکەنی، قسەی لەگەڵ هەمووان دەکرد، بێئەوەی بزانێ چدەکا و دەڵێ چی. تەنیا هەستێکی ئاورین و بەهێز لە دڵیەوە دەم بە دەم هەڵدەقولا. «وەک پۆلوویەکی گەشاوە لە ناخیدا» ـ هەروەک دواتر گوتی. ڕۆیشت بۆلای گرووشنکا و لە پەنایدا دانیشت. چاوی تێبڕی و گوێی بۆ ڕاگرت.... گرووشنکا

زۆربڵێ بووبوو؛ لە پەستا بانگی هەمووانی دەکرد. بانگی کچە گۆرانیبێژەکانی دەکرد. هەرکام لە کچەکان دەهاتن بۆلای ماچیدەکردن، یان خاچی دەکێشان. دەقیقەیەک دواتر ڕەنگبوو بگری. «پیرەپیاوی وردیلە»، ئاوا بانگی ماکسیمۆفی دەکرد، ئەوەشی بە ڕابواردنێکی باش دەزانی. ماکسیمۆف خێرا هەڵدەهات بۆلای و دەستی «دانەدانە قامکە شووش و باریکەکانی» ماچدەکرد و دوای ماچەکە بە هەوایەکی قەدیمی کە خۆی گۆرانییەکەی دەگوت، دەستیدەکرد بە سەما. کە دەگەیشتە سەربەندی گۆرانییەکە بە هەموو توانایەوە سەمای دەکرد و هەڵدەبەزی.

کوودەڵە دەڵێ ـ فس، فس، فس

گوێرەکە دەڵێ ـ مۆ، مۆ، مۆ

مراوی دەڵێ ـ واق، واق، واق

قازەکەش دەڵێ ـ قاغ، قاغ، قاغ

مامر بە لارولەنجە

دەچێ بەرەو سەرسەرا

دەگارکێنێ قود، قود، قود!

گرووشنکا گوتی: «میتیا شتێکی بدەیە. دیارییەک، شاباش. خۆت دەزانی فەقیرە. بەستەزمانە سووکایەتیی پێکراوە... دەزانێ میتیا من دەچم بۆ کلێسە، گاڵتە ناکەم، ئاخری ڕۆژێک دەچم. ئەمڕۆ ئالیووشا شتێکی پێگوتم کە هەتا بمێنم لە بیرم ناچێ... بەڵێ... بەڵام وەرن ئەمڕۆ با بە دڵی خۆمان سەما بکەین. سبەینێ دەڕۆین بۆ کلێسە، بەڵام ئەمڕۆ سەما دەکەین. خەڵکینە، ئازیزان، ئەمڕۆ دەمەوێ یارییبکەم، قەیناکا، خۆکفرمان نەکردووە!خودا لێمان خۆش دەبێ. ئەگەر لەجێی خودا بوایەم، لە هەموو عالەم خۆشدەبووم: «تاوانبارانی خۆشەویست، لەمڕۆ بەدواوە دەتانبەخشم. دەمهەوێ داوای لێبوردن بکەم: « خەڵکانی ئازیز، ئەم کچە گەوجە ببوورن.» من بوونەوەرێکم، تەنیا سەر و گوێم کون کراوە و هیچیتر. بەڵام دەمهەوێ دوعا بکەم. من پیوازێکم کردووە بە خێر. ئەگەرچی دڵڕەشم، دەمەوێ دوعا بکەم.

میتیا لێیانگەڕێ هەڵپەڕن. کارت بەسەریانەوە نەبێ. تەواوی خەڵکی دنیا باشن، هەموویان ـ تەنانەت خراپترینیان. دنیا جێگای چاکانە، ئەگەرچی ئێمە خراپین، بەڵام دنیا بێعەیبە. ئێمە چاک و خراپین، چاک و خراپ.... وەرن پێمبڵێن، دەمەوێ شتێکتان لێبپرسم، هەمووتان وەرەن بۆ ئێرە، دەمەوێ لێتان بپرسم: «بۆ ئەوەندە چاکم؟ دەزانن من چاکم، زۆریش چاکم... وەرن، بۆ ئەوەندە چاکم؟» گرووشنکا هەتا زیاتری مەستدەکرد، زیاتری زۆربڵەیی دەکرد. ئاخری ڕایگەیاند کە دەیەوێ ئەویش سەما بکا. بە لەتردان لە سەر کورسییەکە هەستا، «میتیا، ئیتر شەڕابم مەدەیە. شەڕاب هێمنایەتیم پێنابەخشێ. سەرم لە گێژەوە دێ. دەمەوێ سەما بکەم. لێگەڕی با هەمووان بزانن چۆن سەما دەکەم... با بزانن چەندە جوان سەما دەکەم...»

ئەو ڕاستی دەکرد. دەسرەیەکی کەتانیی سپیی لە گیرفانی دەرهێنا و سووچی دەسرەکەی گرت، بۆ ئەوەی کاتی سەماکردن هەڵی سووڕێنێ. میتیا بەملاوبەولادا هەڵدەهات، کچەکان بێدەنگ بوون و ئامادە بوون بە ئاماژەیەک هەوای هەڵپەڕکێ بچڕن. ماکسیمۆف، کە بیستی گرووشنکا دەیهەوێ سەما بکا، لەخۆشیانا قیژاندی و بە هەڵبەزدابەز چووە بەردەمی تێی هەڵکرد لە گۆرانی:

لاقی وردیلە و قەدی باریکە
کلکە چووکەکەی چرچ و لۆچ بووگە

بەڵام گرووشنکا دەسرەکەی بۆلای ئەو ڕاوەشاند و لە خۆیتاراند.

ـ ئەە! ئەوە میتیا بۆ نایە؟ لێگەڕێ هەمووان بێن... تەماشا بکەن. ئەوانەی دەرگاشیان لە سەر داخراوە، بانگیانکەن... بۆ دەرگاتان لە سەر داخستوون؟ پێیانبڵێن دەمهەوێ سەما بکەم. با ئەوانیش بێن تەماشا بکەن...

میتیا، بە لەتردان و لارەوە لارەوە ڕۆیی بۆلای دەرگا داخراوەکە و دەستی کرد بە لێدانی. بە مشت لە دەرگاکە بەربوو.

ـ هۆی... پادفیسۆتسکییەکان! وەرن، ئەو دەیەوێ سەما بکا. بانگتان دەکا.

یەکێ لە لەهێستانییەکان لە وەڵامیدا گوتی: «.Lajdak»

ـ Lajdak خۆتی! تۆ لەهێستانییەکی خوێڕی و هیچوپووچی، گوێت لێبوو.
گالگانۆف بە لەبزێکی حەکیمانەوە گوتی: «دەست لە پێکەنینی لەهێستانی هەڵگرە.» ئەویش مەستبوو.
ـ کوڕی چاک، بێدەنگ بە! ئەگەر ئەو بە خوێڕی و هیچوپووچ دەزانم، بە مانای ئەوە نییە کە هەموو خەڵکی لەهێستانی هەروان. خۆ تاقە یەک Lajdak لەهێستانی پێکنەهێناوە. کوڕی چاک، بێدەنگ بەو بڕۆ نەقوڵێک بنێ دەمت.
گرووشنکا گوتی: «پەککو لەو بەشەرانە! هەر دەڵێی بنیادەم نین. بۆ لەگەڵ یەکتر نابنە برادەر؟» ڕۆیشتە پێشێ بۆ سەما کردن. گۆرانیبێژان دەستیانکرد بە گۆرانی گوتن. «ئاخ، ماڵ و حاڵەکەم، ماڵ و حاڵەکەم!» گرووشنکا سەری خست بە پشتدا، زەردەیەکی گرت و دەسرەکەی هەڵتەکاند، لە ناکاو سووڕێکی خوارد و لەجێی خۆی چەقی. لە چەقی ژوورەکەدا ڕاوەستا و بە دەنگێکی ماندوو گوتی: «ناتوانم، هێزم نییە، بمبوورن... هێزم نییە، ناتوانم... بمبوورن.» پاشان کڕنۆشی بۆ گۆرانیبێژەکان برد و ئەنجا ڕووی لە هەموو لایەکی ژوورەکە کرد و دەستی بە سینگییەوە گرت.
ـ داوای لێبووردن دەکەم، بەداخەوە ناتوانم...
دەنگی خەڵکەکە لەملاولاوە: «خاتوون مەستیکردووە. خاتوونی شۆخوشەنگ مەستیکردووە.»
ماکسیمۆف بە پێکەنینەوە بە کچەکانی گوت: «خاتوون لاکەی سەری دێ.»
گرووشنکا بە بێوازی گوتی: «میتیا وەرە بمبە... وەرە بمبە.» میتیا، بە هەڵاتن چوو باوەشی پێداکرد و ئەو بارە خۆشەویستەی برد بۆ پشت پەردەکە. گالگانۆف لە دڵی خۆیدا گوتی: «چاکە، هەر ئێستا لێرە دەڕۆم، » لە وەتاغە شینەکە ڕۆیشتە دەرێ و هەردوو تای درگاکەی پێوەدا. بەڵام بەزموڕەزم لە ژووره گەورەکەدا هەروا بەردەوام بوو، دەنگی گۆرانی و مۆسیقا هەراوا گوێی شەوی دەزرینگاندەوە. میتیا گرووشنکای لە سەر چرپاکە ڕاکێشا و لێوی ماچکرد.

گرووشنکا بە دەنگێکی شەکەت و ناڕازی گوتی: «دەستم بۆ نەبەی... باسم مەکە... جارێ نەبوومەتە ژنت... پێمگوتی نەمرم هی تۆم، بەڵام جارێ دەستم بۆ مەبە... وازم لێبێنە... ئەو هەموو خەڵکەی لێیە، ئەوەتا لە بنەوپاڵمان دان، نابێ کاری وابکەی. ئێرە پیسە....»

میتیا لەبەر خۆیەوە گوتی: «بەسەر چاو! ئیتر هەر بیریشی لێناکەمەوە... دەتپەرەستم! وایە ئێرە پیسە، هەر عەیبیشە، ڕاستدەکەی.» هەروا کە لە ئامێزی گرتبوو لەپاڵ چرپاکەدا چۆکی دادا.

گرووشنکا بە گرانی لە ژێر لێوەوە گوتی: «دەزانم، ئەگەرچی دەعبایەکی هیچوپووچی، بەڵام دەستودڵبازی. ئەوینەکەمان دەبێ ئابڕوودارانە بێ... بۆ داهاتوومان ئابڕوومەندانە دەبێ... وەرە با دروستکار بین، وەرە با چاک بین، دەعبا نەبین، مرۆڤێکی باش بین... بمبە لەگەڵ خۆت، لەگەڵ خۆت بمبە بۆ ئەو دوور دوورانە، گوێت لێیە؟ نامەوێ لێرە بم. دەمەوێ لەو دوور دوورانە...

میتیا کە توند لە باوەشی گرتبوو، گوتی: «ئەرێ، وایە، حەتمەن! دەتبەم لەگەڵ خۆم، بەرەو ئەو دوور دوورانە باڵ دەگرین... ئاخ، تەوای تەمەنی خۆم بە ساڵێک دەگۆڕمەوە، بەو مەرجەی لەو خوێنە ئاگادار بم!»

گرووشنکا بە سەرسووڕمانەوە گوتی: «کام خوێن؟»

میتیا لەبن لێوەوە گوتی: «هیچ، هیچ. گرووشا گیان، تۆ دەتویست دروستکار بی، بەڵام من دزم. بەڵام من پارەم لە کاتیا دزیوە... شوورەییە، شوورەیی!»

ـ لە کاتیا، لەو خاتوونە؟ نا، تۆ نەتدزیوە. دەیدەیەوە، خۆم دەتدەمێ... ئیتر ئەم هاتوهاوارەی ناوێ! ئیتر هەموو شتێکم هی تۆیە. پارە چییە، بە هەر شێوەیەک ویستمان بە بایدا دەدەین... مرۆڤی وەک ئێمەش چارەنووسەکەی وایە و دەبێ پارە بە فیڕۆ بدا. بەڵام وای بە باش دەزانم بچین لە سەر زەوی و زار ئیشبکەین. دەمەوێ بەو دەستانەی خۆم زەوییەکە بکێڵم. ئێمە دەبێ زحمەت بکێشین، گوێت لێیە؟ ئالیووشا وایدەگوت. من گراوی تۆ نابم، دەبمە ژنێکی وەفادار و تا ئاخری تەمەنم کڵفەتیت دەکەم. ئیشت بۆ دەکەم. پێکەوە

دەچین بۆلای ئەو خاتوونە بەڕێزە و کڕنۆشی بۆ دەبەین، بۆ ئەوەی لێمان خۆش بێ، دوای ئەوەش لەم مەڵبەندە دەڕۆین. ئەگەر لێشمان خۆشنەبوو، هەر دەڕۆین، پارەکەی بۆ بەرەوە و دڵت بدە بە من... ئەوت خۆشنەوێ، ئیتر خۆشتنەوێ، ئەگەر خۆشتبوێ، دەیخنکێنم... هەردوو چاوی بە شووژن هەڵدەکۆڵم...

ـ من تۆم خۆشدەوێ. تەنیا تۆ. لە سیبریاش هەر خۆشمدەوێی...

ـ لە سیبریا بۆ؟ باشە ئەگەر پێت خۆشە، با سیبریا بێ. بۆ گرینگ نییە... ئێمە زەحمەت دەکێشین... بە ڕەنجی شانی خۆمان بژیوی ڕۆژانە دابین دەکەین... سیبریا بەفری لێیە... شەیدای خێشکم لە سەر بەفر... دەبێ زنگوڵەشمان هەبێ... گوێت لە دەنگی ئەو زەنگوڵەیە؟ ئەوە دەنگی زەنگوڵەیە لە کوێوە دێ؟ خەڵکی خەریکن دێن... ئەوە بێدەنگ بوو.

گرووشنکا شەکەت و ماندوو چاوی نووقاند و لە ناکاو خەوی لێکەوت. هەر بە ڕاستی دەنگی زەنگوڵە لە دوورەوە دەهات. بەڵام دەنگەکە ڕاوەستا. میتیا سەری کەوتە سەر سینگی گرووشنکا. ئەو تێنەگەیشت کە دەنگی زەنگوڵەکە ڕاوەستاوە و بەجێی بەزم و ڕەزم و گۆرانی، بێدەنگییەکی کڕو کپ ژوورەکەی داگرتووە. گرووشنکا چاوی هەڵێنا.

ـ ئەوە چییە؟ خەوم لێکەوتبوو؟ بەڵێ... زەنگوڵە... خەوم لێکەوتبوو و لە خەوما لە سەر بەفر سواری خێشکی زەنگوڵەدار بووم و وەنەوزم دا. لەگەڵ کەسێک بووم کە خۆشم دەویست، لەگەڵ تۆ. لەو دوور دوورانە. تۆم لە باوەش گرتبوو و ماچمدەکردی. خۆم لە باوەشت توند کردبوو، سەرما بوو، بەفر ترووسکەی دەهات... خۆ دەزانی شەوانە کە مانگەشەو تریفەی لێدەبارێ، بەفر چۆن بریقەی دێ. دەتگوت لە سەر زەوی نیم. خەبەرم بۆوە و یاری خۆشەویستم سەری لە سەر دڵم بوو، چەندە شیرینە....

میتیا لەگەڵ ماچکردنی کراس و سینگ و قۆڵی، سرتاندی: «لەسەر دڵی تۆ.» لە ناکاو خەیاڵێکی غەریب هەڵیگرت: دیتی گرووشنکا ڕاست چاوی لە پێش خۆی بڕیوە، چاوی لەو نەدەکرد. نا، لە ژوور سەری ئەوەوە بە

شێوەیەکی سەیر و واقوڕمانەوە چاوی لە خاڵێک بڕیبوو. حاڵەتێکی ترس و سەرسووڕمان لە ناکاو ئەدگاری گرووشنکای داگرت. بە سرتە گوتی: «میتیا، ئەوە کێیە چاومان لێدەکا؟»

میتیا سەری وەرسووڕاند و دیتی کەسێک پەردەکەی لاداوە و تەماشایان دەکا. وادیارە چەن کەس بوون. هەستا پێ و بە توندی ڕۆیی بۆلای ملۆزمەکە.

دەنگێک هات، نەک بە توندی، بەڵکو ڕاشکاوانە فەرمانی پێدا: «وەرە بۆ ئێرە، وەرە دەی.»

میتیا چووە ئەودیوی پەردەکە و لەجێی خۆی وشک بوو. وەتاغەکە پڕبوو لە خەڵک، بەڵام ئەوانەی پێشوو نەبوون. تەزوویەک بە پشتیدا هات و دڵەکوتێ گیانی وەلەرزین خست. هەر لەڕێوە هەموویانی ناسییەوە. ئەو پیرەپیاوە کەڵەگەتە چوارشانە و یۆنیفۆرم لەبەرەی کڵاوی نیشانەداری لە سەر نابوو، میخاییل مارۆویچ، بەرپرسی ئاسایش بوو. ئەو تەڕپۆشە ڕەقەڵەی «هەمیشە پۆستاڵی بۆیەکراو لەپێ دەکا، » ـ جێگری دادوەر بوو. «ئەویش کرۆنۆمێرتێکی «Chronomêtre» هەیە چوارسەد ڕۆبڵ دەژی، جارێک نیشانی داوم.» ئەو لاوە چاویلکە لەچاوە وردیلەیەش... میتیا ناوەکەی لەبیر چووبۆوە، ئەگەرچی دەیناسی و دیتبووی: ئەویش وەکیلی ماف بوو کە ماوەیەک بوو هاتبوو بۆ شارەکەمان. ئەو پیاوەش ـ ماوریکی ماوریکیەویچ، بەرپرسی پۆلیس بوو کە زۆر باشی دەناسی. ئەو چەن پیاوەی دیکەش کە هەموویان خاوەنی پلە و پایە بوون. ئەوانە بۆ لێرەن؟ ئەو دوو کەسەی دیکەش... خەڵکی ماکرۆیەن.... تریفۆن بۆریسیچ و گالگانۆفیش لەلای درگاکە...

میتیا گوتی: «ئاغایان بۆ تەشریفتان لێرەن! ئەمە یانی چی؟» بەڵام کتوپڕ وەک ئەوەی ئاگای لە خۆی بڕابێ، بێ ئەوەی بزانی چ دەکا گوڕاندی «تێ ـ گە ـ یشتم!»

لاوە چاویلکە لەچاوەکە» هاتە پێشێ، چوو بۆلای میتیا و بەپەلە و قورساخانە گوتی: «ئێمە دەبێ لێکۆڵینەوە... بە کورتی، داواتان لێدەکەم

لێرەوە وەرن، وەرە بۆلای قەنەفەکە... پێویستە وەڵامی چەن پرسیارمان بدەیتەوە.»
میتیا شێتانە دەنگی هەڵێنا: «ئەو پیرەپیاوە! ئەو پیرە پیاوە و خوێنەکەی! تێگەیشتم!»
کەوتە سەر کورسیلەیەکی نزیک خۆی، وەک ئەوەی قەڵەمی لاقی شکابێ.
بەرپرسی ئاسایش هات بۆلای میتیا و لە ناکاو گوڕاندی: «تێگەیشتی؟ خۆ دەزانی! دێوەزمەی باوککوژ! خوێنی باوکت دەتگرێ!» سوور هەڵگەڕابوو، سەرتاپای دەلەرزی و هۆش و ئیختیاری نەبوو.
لاوی چاویلکە لەچاو نەڕاندی: «ئەو شتە مەحاڵە! میخائیل ماکرۆویچ، میخاییل ماکرۆویچ، خۆ ئاوا نابێ!... تکات لێدەکەم ئیزن بدەن قسە بکەم. بە هیچ شێوەیەک چاوەڕوانی ئەوەم لێتان نەبوو....»
بەرپرسی ئاسایش گوڕاندی: «ئەوە شێتییە، شێتی ئاغایان، شێتییەکی ورێنەئاسا، چۆن تووڕە نەبم! چاوی لێکە: مەست مەست، لەم کاتەی شەودا لەگەڵ ژنێکی سەڵیتە، خوێنی باوکیشی بە دەستییەوەیە... ئەوە شێتییە، شێتی!»
دادوەر سرتاندی بە گوێی بەرپرسی ئاسایشدا: «میخاییل ماکارۆویچ، بەڕێز گیان، تکاتان لێدەکەم تۆزێ دان بەخۆدا بگرن. دەنا ناچار دەبم پەنا بەرم بۆ...»
بەڵام وەکیلی وردیلە نەیهێشت قسەکانی ئەو تەواو بێ. ڕووی لە میتیا کرد و بە دەنگێکی بەرز و قورساخ وڕاشکاوانە گوتی:
- سەروان کارامازۆف، لە سەر منە پێتان ڕاگەیێنم کە ئێوە تۆمەتبارن بەوەی فیۆدۆرپاولۆویچ کارامازۆف، باوکی خۆت کوشتووە، کە هەر ئەمشەو ڕووداوەکە قەوماوە....
ئەو قسەی دیکەشی کرد و دادوەریش شتێکی گوت، بەڵام ئەگەرچی میتیا گوێی لە دەنگیان بوو، بەڵام یەک وشەیان لێ نەدەگەیشت.بە چاوی زەقەوە تێیان ڕامابوو.

# (١)

## سەرەتای کاری فەرمانبەریی پێرخۆتین

پیووتێر ئیلیچ پیرخۆتین، کە لەبەر دەرگای ماڵی ژنەکەی مارازۆف، یانی ئەو ماڵەی گرووشنکای تێدابوو و بەهێز و قەوەتی خۆی لە دەروازە گاڵە دراوەکەی دەدا، بەجێمان هێشت. ئەوەندەی لە درگاکەدا هەتا لێیان هەڵگرت. فینیا کە ترسی دوو سەعات لەمەوبەر هێشتا لە دڵیدا بوو و لەبەر دڵەخورپە نەیدەتوانی بخەوێ، لەگەڵ بیستنی تەقەی دەرگاکە خەریک بوو دڵی بتۆقێ لە ترسانا، ئەگەرچی بەچاوی خۆی دیتبووی میتیا بە سواری عارەبانە ڕۆیشتووە، بەڵام پێیوابوو ئەوە دیسان لە دەرگا دەدا. چونکە هیچ کەسێکی دیکە ئاوا «شێتانە» لە دەرگای نەدەدا. بە هەڵەداوان چوو بۆلای دەرگاوانەکە، کە هەستابوو بچێ دەرگاکە هەڵگرێ. دەستیکرد بە پاڕانەوە کە دەرگاکە نەکاتەوە. بەڵام دەرگاوان دوای پرسیار کردن لە پیووتێر ئیلیچ و ئاگاداربوون لەوەی سەبارەت بە «مەبەستێکی زۆر گرینگ» چاوی بە فینیا بکەوێ، بڕیاریدا دەرگاکەی لێبکاتەوە و ڕێی بدا بێتە ژووری. پیووتێر ئیلیچ بەرەو چێشتخانەکەی فینیا ڕێنوێنی کرا. بەڵام کچە داوایلێکرد «لەبەر ئەو شک و گومانەی، » ئیزن بدا دەرگاوانەکەش لەوێ بێ. پیووتێر ئیلیچ دەستیکرد بە پرسیارکردن لە فینیا و خێرا لە گرینگترین ڕووداو ئاگادار بوو. یانی کاتێک دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بۆ گەڕان بە شوێن گرووشنکادا دەرپەڕیبوو، دەسکاونگێکی لەگەڵ خۆی بردووە و کاتی گەڕانەوە، دسکاوەنگەکەی نەهێناوەتەوە و بە دەست و پلی خوێناوییەوە، هاتۆتەوە.

فینیا لەپەستا دەیگوت: «خوێنی لێدەچۆڕا، لێیدەچۆڕا!» ئەم گێڕانەوەیەش تەنیا خولقاوی زەینە ئاڵۆزەکەی بوو. ئەگەرچی لە ڕاستیدا خوێنی لێنەدەچۆڕا،

بەڵام پیووتێر ئیلیچ ئەو دەستە خوێناوییانەی بە چاوی خۆی دیتبوو، بۆ شتنەوەکەشی یارمەتیی دابوو. هەروەها، پرسیارێک کە دەبوو بڕیاری بۆ بدا ئەوە نەبوو کە ئەو خوێنە کەنگێ وشک بۆتەوە، بەڵکو دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بەو دەسکاوەنگەوە بۆکوێ هەلینگی دابوو. یان وردتر لەوە، بڵێی بۆ ماڵی باوکی چووبێ یان نا، لەو مەسەلەیەشدا دەتوانێ بە چ ئاکامێک بگا. پیووتێر ئیلیچ لە سەر گەڕانەوە بۆ ماڵی فینیا پێداگریی دەکرد و بە مەسەلەیەکیش نەگەیشت قانعی بکا، بەڵام ئاخری هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لە ماڵی باوکی زیاتر بۆ هیچکوێی دیکە نەچووە. کەوایە لەوێش ڕووداوێک قەوماوە.

فینیا بە هەڵەپڕووکێ و دڵەخورپەوە گوتی: «کاتێک گەڕاوە، هەموو شتێکم بۆ گێڕاوە و لێمپرسی: «فیۆدۆرپاولۆویچ، دەستوپلت بۆ خوێناوییە؟» ئەو لە وەڵامدا گوتی ئەم خوێنە خوێنی مرۆڤە و تازە کەسێکم کوشتووە. لەلای من دانی بە هەموو شتێکدا نا و لەپڕ وەک شێت دەرپەڕی بۆ دەرێ. دانیشتم و بیرمکردەوە ئاوا شێتانە هەڵات بۆ کوێ؟ پێموابوو دەچێ بۆ ماکرۆیە و خاتوو گرووشنکا دەکوژێ. هەڵاتم بە دوایدا تاکو لەبەری بپاڕێمەوە نەیکوژێ. بەرەو مەنزڵەکەی هەڵاتم، بەڵام کاتێک بەبەر فرۆشگای پلاتینکۆفدا تێپەڕیم چاوم پێیکەوت خەریکە سواری عارەبانە دەبێ و ئەو کاتە خوێن بە دەست و پلیەوە نەبوو.» (فینیا سەرنجی ئەو خاڵەی دابوو لەبیری مابوو.) دایەگەورەی فینیا تا ئەوجێیەی توانیی قسەکانی فینیای پشت ڕاستکردەوە. پیووتێر ئیلیچ دوای پرسینی چەند بەرسڤی دیکە، لە ماڵی مارازۆف چووە دەرێ، ئەویش زۆر شێواو و پەرۆشتر لە کاتی هاتنەکەی بۆ ئەو ماڵە.

سەرڕاستترین و سادەترین ڕێگاش بۆ دڵنیابوون لەو ڕووداوە ئەوە بوو بچێ بۆ ماڵی فیۆدۆرپاولۆویچ و بزانێ لەوێ ڕووداوێک قەوماوە یان نا، ئەگەریش قەوماوە، چییە. دوای ئەوەش تەنیا کار ئەوە بوو بچێ بۆلای بەرپرسی ئاسایش و بە پۆلیس ڕاگەیەنێ. پیووتێر ئیلیچ، کاتێک ئەو ڕاستییەی بە خۆی سەلماند کە کارەساتێکی وا لەگۆڕێدایە، لێبڕاوانە بڕیاریدا ئەو کارە بکا. بەڵام شەو تاریکبوو، دەروازەی ماڵی فیۆدۆرپاولۆویچیش وەک دەروازەی قەڵا وابوو، بۆیە ناچار بوو

دیسان تەقوهۆڕ لە دەرگا بدا. لەگەڵ فیۆدۆرپاولۆویچیش ئاشنایەتییەکی ئەوتۆی نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا گریمان دەرگایان کردەوە و هیچ ڕووداوێک نەقەومابوو، ئەو کاتە فیۆدۆرپاولۆویچ بەو ئەداوئەتوارەیەوە وەڕێ دەکەوت لە تەواوی شار قاوی بڵاو دەکردەوە کە غەوارەیەک با ناوی پێرخۆتین، نیوەشەو خۆی کردووە بە ماڵەکەیدا تاکو بزانێ کەسێک کوشتوویەتی یان نا. ئەو کارەش ئابڕووچوونی لێدەکەوێتەوە. پیووتێر ئیلیچ لە هیچ شتێک بەقەد ئابڕووچوون نەدەترسا. بەڵام هەستێک کە سەرتاپای تەنیبوو، ئەوەندە بەهێز بوو، ئەگەرچی بە تووڕەیی لاقی لە زەوی کوتا و جنێوی بەخۆی دا، دیسان ملی ڕێی گرت، بەڵام نەک بۆ ماڵی فیۆدۆرپاولۆویچ، بەرەو ماڵی مادام خۆخلاکۆف. هاتە سەر ئەوەی ئەگەر ئەو ژنە حاشا بکا و بڵێ پارەم بە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ نەداوە، ڕاست دەچێ بۆلای پۆلیس. بەڵام ئەگەر بڵێ من ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەم پێداوە، دەڕۆمەوە بۆ ماڵێ و هەتا بەیانی بێدەنگەی لێدێنم.

بەڵام بەو نیوەشەوە چوون بۆ ماڵی ژنێکی خاوەن کەسایەتی و نەناس و لەخەو هەستاندنی، بۆ پرسیارێکی سەرسوڕهێنەر، لەوانەیە لە چوونی ماڵی فیۆدۆرپاولۆویچ شوورەییتر بێ. بەڵام هێندێ جار، بەتایبەت لە کاتێکی ئاوادا بڕیاری کەسانێکی وردبین و خوێنسارد هەروایە. پیووتێر ئیلیچ لەو کاتەدا خوێنسارد و کەمتەرخەم هەر نەبوو. لە تەواوی ماوەی تەمەنیدا لە بیری بوو کە چەندەی هەست بە بێئۆقرەییەکی پڕ ئازار کردووە و ئەو ئاراوقارا لێهەڵگیرانە جارلەگەڵجار بەژانتر دەبوو و ئەوی بە پێچەوانەی ویستی خۆی، دەڕەتاند. لەگەڵ ئەوانەشدا بەهۆی چوون بۆلای ئەو ژنە، بەردەوام لە ماوەی ڕێگادا جنێوی بەخۆی دا. بەڵام هەروا کە لێوی خۆی دەگەست، بۆ دەهەمین جار پاتەی کردەوە کە : «حەتمەن دەبێ لێی بکۆڵمەوە و بە بنج و بناوانی بگەم!» ئاخری وازی هەر نەهێنا.

کاتێک گەیشتە ماڵی مادام خۆخلاکۆف سەعات یازدە بوو. خێرا دەرگای حەوشەکەیان بۆ کردەوە، بەڵام دەرگاوان، لە وەڵامی پرسیارەکەیدا کە، خاتوون خەوتووە یان بەخەبەر، نەیتوانی هیچ بڵێ، تەنیا گوتی وەک بزانم خاتوون

ئەمدەمانەی شەو دەخەوێ. «لەسەر پلیکانەکان پرسیار بکە. ئەگەر مادام تاقەتی هەبێ و دمی چوونە ژووریَ دەدا، ئەگەر تاقەتیشی نەبێ ئەوە هیچ.»

پیووتێر ئیلیچ ڕۆیشتە سەرێ، بەڵام بارودۆخەکە زۆریش سادە نەبوو. وڕوێڕکەکەی نەدەچوو هاتنی بە مادام ڕاگەیەنێ، ناچار کڵفەتەکەی بانگکرد. پیووتێر ئیلیچ بە ئەدەبانە و پێداگرییەوە تکای لێکرد بە مادام خۆخلاکۆف ڕاگەیەنێ کە کارمەندێک بە ناوی پێرخۆتین کە خەڵکی ئەم شارەیە، دەیهەوێ سەبارەت بە مەسەلەیەک بێتە خزمەتی. دیارە مەسەلەکەش زۆر گرینگە دەنا بەو درەنگ وەختە سەرودڵم نەدەگرتن. بە کچەی گوت: «ڕاست ئەو قسانەی پێ بڵێ.»

کچە ڕۆیشت. ئەویش لەبەر دەرگای پێشخانەکە چاوەڕێ ما. مادام خۆخلاکۆف لە وەتاغی خەوەکەی بوو، بەڵام وادیاربوو هێشتا خەوی لێنەکەوتبوو. لە دوای دیدارەکەی میتیا هەستی بە پەرۆشی کردبوو.لە دڵیشی دابوو کە ژانەسەر دەکا و هەمیشەش دوای دڵەخورپە و نیگەرانی ئەو ژانەسەرەی دەکرد و خۆی ئامادە کردبوو هەتا بەیانی بە ژانەسەرەوە جینگڵ بدا. بە بیستنی ئەو خەبەرە لە دەمی کڵفەتەکەی سەرسام بوو. بەو حاڵەشەوە بە تووڕەیی خۆی لەو دیدارە بوارد. ئەگەرچی ئەو دیدارە چاوەڕوان نەکراوە، بەو نیوەشەوە، ئەویش «کارمەندێکی دانیشتووی شارەکە» کە قەتی نەدیوە و نایناسێ، بەجارێ تووشی کونچکاوییەکی ژنانەی کرد. بەڵام پیووتێر ئیلیچ ئەمجارە وەک کەری کەندەڵان پێی چەقاند. دیسان لەبەر کڵفەتەکە پاڕایەوە، پەیامێکیتری «بەمچەشنە» بۆ بەرێ: «ئەو دەیهەوێ سەبارەت بە مەسەلەیەکی زۆر گرینگ قسەت لەگەڵ بکا، خاتوونی هێژا ئەگەر ڕازی نەبێ چاوم پێیبکەوێ، لەوانەیە دواتر پەشیمان بێتەوە و بە ڕانی خۆیدا بدا.»

دواتر دەیگوت: «بە سەرەوە خۆم خستە بەرپێی» کچەی کڵفەت، کە واقوڕمانەوە چاوی تێبڕیبوو، دیسان بۆ بردنی پەیامەکە ڕۆیشت بۆلای خاتوون. ئەمجارە مادام خۆخلاکۆف دڵی نەرمبوو، تۆزێ بیریکردەوە، گوتی چۆن پیاوێکە و بۆی دەرکەوت کە «زۆر تەڕپۆش و جوانچاک و جحێڵە و لە

ڕادەبەدەر بەئەدەبە» وا چاکە هەر لێرەدا، لە کەوانەدا ئەوەش بڵێم کە (پیووتێر ئیلیچ لاوێکی ڕێکوپێک بوو، خۆشی ئەوەی دەزانی.) مادام خۆخلاکۆف ڕازی بوو چاوی پێبکەوێ، بەرگی خەوی لەبەردا بوو و سەرپێیی لە پێدا و شاڵێکی ڕەشیشی بە سەر شانیدا دابوو. داوایان لە پیووتێر ئیلیچ کرد بچێ بۆ وەتاغی میوانداری. بۆ وەتاغێک کە ماوەیەک لەمەوبەر میتیا لێی دانیشتبوو. مادام هات بۆلای میوانەکەی. بە ئەدگارێکی مۆن و چاوی پڕ پرسیارەوە، بێ‌ئەوەی چاکوخۆشی لەگەڵ میوانەکەی بکا و داوای لێبکا دانیشێ، لەڕێوە گوتی: «چیتدەوێ؟»

پێرخۆتین گوتی: «مادام، بمبوورە بەو نیوەشەوە لە خەوم کردن. سەبارەت بە مەسەلەیەکی گرینگ کە پێوەندیی بە ئاشنا هاوبەشەکەمان، واتە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ کارامازۆفەوە هەیە، هاتوومە خزمەتتان.» بەڵام ئەم ناوەی دروست دەرنەبڕیبوو، بۆیە تووڕەیی لە ڕوخساری مادامدا وەدەرکەوت:

شێتانە هاواریکرد: «تا کەنگێ دەبێ لە دەستی ئەو کابرا بەسامە ئازار بکێشم؟ کاکی بەڕێز، چۆن دەتوانی مزاحیمی ژنێک بی کە نایناسی و هیچ ئاشنایەتییەکت لەگەڵیدا نییە! ئەویش لە ماڵەکەی خۆی و ئاوا درنگ‌وەختیش!... خۆتی بەسەردا بسەپێنی و باسی پیاوێک بکەی کە سێ سەعات لەمەوبەر هاتبوو بۆ ئێرە، هەر لەم ژوورەدا، دەیویست بمکوژێ. کاتێکیش ڕۆیشتە دەرێ وەها لاقی بە عەرزدا دا کە هیچکەس لە ماڵێکی ئابڕوومەند کاری وا ناکا. کاکی نەناس، با پێتبڵێم لە سەر ئەو کارەت شکایەتت لێدەکەم. تکایە خێرا لێرە بڕۆ دەرێ... من دایکم... من... من... »

- بتکوژێ، کەوایە ئەو دەیویست ئێوەش بکوژێ؟

مادام خۆخلاکۆف بێ‌ئیختیار پرسیی: «بۆ، ناکا کەسێکی کوشتبێ؟»

پێرخۆتین لێبڕانە وەڵامی دایەوە: «مادام، ئەگەر ئیزن بفەرمووی نیو دەقیقە گوێم بۆ بگرە، بە چەند وشە هەموو شتێکت عەرز دەکەم. دیمیتری فیۆدۆرۆویچ ئەمرۆ سەعات پێنجی دوانیوەڕۆ هات دە ڕۆبڵی لێ‌قەرز کردم، لە ڕاستیدا دەمزانی پارەی پێنییە. کەچی سەعات نۆ بە چەکەیەک گەڵای سەد ڕۆبڵییەوە،

نزیکەی دوو سێ هەزار ڕۆبڵ دەبوو، هات بۆ دیدەنیم. دەست و دەموچاوی هەمووی خوێناوی بوو، دەتگوت شێتە. کاتێک لێمپرسی ئەو پارەیەت لەکوێ بوو، وەڵامی دایەوە کە گوایە تۆ سێ هەزار ڕۆبڵت داوەتێ، بۆ ئەوەی بڕوا بەرەو کانگای زێڕ...»

مادام خۆخلاکۆف ئەوەندەی دیکە تووشی دڵەخورپە بوو و ڕەنگی تێکچوو، دەستی کێشا بە ڕوومەتی خۆیدا و هاواری کرد: «خودایە گیان! ناکا باوکە پیرەکەی خۆی کوشتبێ! من پارەم پێ نەداوە، نا قەت پارە بە کەسێکی ئاوا نادەم! زووکە زوو، هەڵێ، خێرا هەڵێ، ئیتر قسە مەکە! بڕۆ پیرەپیاو ڕزگار کە... هەڵێ بۆلای باوکی... بە هەڵەداوان بچۆ....

ـ ببوورە مادام، کەوایە تۆ پارەت پێنەداوە؟ کەوایە بە جوانی لەبیرتە کە پارەت پێنەداوە؟

ـ نا پێمنەداوە! من چۆن پارە بە شتی وا دەدەم. چونکە ئەو قەدری نازانێ. لاقی بە عەرزەکەدا کوتا و بە توورەیی دەرپەڕی بۆ دەرێ. شالاوی بۆ هێنام، بەلام من هەلاتم... با ئەوەشت پێبڵێم، چونکە ئیتر نامەوێ هیچ شتێکت لێبشارمەوە، تفی لێکردم، تۆ بیری لێبکەوە! سووکایەتی کردن بە کەسێکی وەک من. ئێستا بۆ ڕاوەستاوی؟ دانیشە،... بمبوورە، من... یان واچاکە هەڵێی، دەبێ هەڵێی ئەو پیرە پیاوە بێچارەیە لە مەرگ ڕزگار کەی!

ـ ئەگەر کوشتبێتی چی؟

ـ ئۆوەی، خودایە، ڕاست دەکەی! کەوایە چبکەین؟ بە بڕوای تۆ ئێستا چبکەین باشە؟

هەر لەو کاتەدا پیووتێر ئیلیچی خوڵک کرد دانیشێ و خۆشی بەرەوڕووی ئەو دانیشت. بە کورتی پیووتێر ئیلیچ، تا ڕادەیەک ڕۆشن و بە وردی ئەوەی بە چاوی خۆی دیتبووی بۆیگێڕایەوە. باسی دەسکاونگەکەشی کرد. ئەو قسانە وای شوێن لە سەر مادام خۆخلاکۆف دانابوو کە لەپەستا دەیقیژاند و بە لەپی دەستی لە ڕوومەتی خۆی دەدا...

ـ بڕوام پێبکە هەموو ئەوانەم پێشبینی کردبوو! من ئیستعدادێکی تایبەتم هەیە و بیر لە هەر شتێک بکەمەوە، وەڕاست دەگەڕێ. زۆرجار چاوم لەو مرۆڤە سامناکە کردووە لە دڵی خۆمدا گوتوومە ئاخری من بە دەستی ئەوە دەچم. ئێستا ئەوە وەڕاست گەڕاوە... چونکە دڵنیام بۆ کوشتنی منیش هاتبوو بۆ ئێرە، یان خودا ئاگای لە من بووە دەنا منیشی وەک باوکی دەکوشت. ڕەنگە لەڕووشی هەڵنەهاتبێ من بکوژێ، چونکە هەر لەم وەتاغە سووڕەتی پیرۆزم کردە ملی. سووڕەتێکی شەهیدی پیرۆز سێن‌باربارا بوو. بە ڕاستی لەو کاتەدا چەندە لە مەرگ نزیک بوومەتەوە، چووم بۆلای و ئەویش ملی بۆلای منەوە درێژ کردا!... دەزانی پیووتێر ئیلیچ (پێموا فەرمووت ناوت پیووتێر ئیلیچە، ) من باوەڕم بە پەرجۆ نییە، بەڵام ئەو سووڕەتە، بەڕاستی وەک مۆجزەیەک وابووە بۆ من ـ هەر ئەوەش وای کار تێکردووم. ئامادەم هەرچیت پێخۆشە ئیمانی پێ بێنم. نەقڵی باوە زووسیمات بیستووە؟.... بەڵام نازانم بڵێم چی؟... تۆ بیری لێبکەوە بەو سووڕەتەی ملیەوە تفی لێکردم. تەنیا تفی لێکردم، نەیکوشتم و... وەک تێسکەی تفەنگ بۆی دەرچوو! بەڵام ئێمە چیمان لە دەست دێ، ئێستا دەبێ چبکەین؟ بە بڕوای تۆ چبکەین باشە؟

پیووتێر ئیلیچ هەستا سەرپێ و گوتی دەمەوێ ڕاست بچم بۆلای بەرپرسی ئاسایش و هەموو شتێکی پێبڵێم، ئیتر خۆیان چۆنیان پێباشە با وابکەن.

ـ ئەرێ زۆر کاری چاکە، لێی ڕامەوەستە! میخائیل ماکارۆویچ دەناسم. پیاوێکی زۆر باش و شایستەیە بۆ ئەو کارە. پیووتێر ئیلیچ چەندە مرۆڤێکی بە سەلیقەی! چاکە بیرت لە هەموو شتێک کردۆتەوە! من قەت بیرم بۆ شتی وا نەدەچوو.

پیووتێر ئیلیچ بە پێوە ڕاوەستابوو، دیاربوو دەیهەوێ خێرا لە چنگ ئەو ژنە کە نەیدەهێشت خوداحافیزی بکا دەرباز بێ. گوتی: «منیش سەرۆکی ئاسایش زۆر چاک دەناسم.»

ـ حەتمەن، حەتمەن وەرە و پێمبڵێ لەوێ چت دیوە و چی قەوماوە.... هەرچییەکت بۆ دەرکەوت... شێوەی دادگایی کردنەکەی... و مەحکووم

بوونەکەی... پێموا ئێمە سزای ئێعدامان نییە، هەمانە؟ حەتمەن ئاگادارم کەوە، تەنانەت ئەگەر سەعات سێ و چواری شەویش بوو... پێیان بڵێ خەبەرم کەنەوە، ئەگەر خەبەرم نەبۆوە ڕامتڵەکێنن... بەڵام خودایە گیان، من ناخەوم! خەوم هەر لێناکەوێ. بەڵام سەبرکە، واچاکە منیش بێم لەگەڵتان!

ـ نا.. نا... مادام. تۆ تەشریف مەهێنە، بەڵام بە دەستوخەتی خۆت، سێ دێڕ بنووسی کە پارەت بە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ نەداوە ڕەنگە.. ئەگەر پێویست بێ پیشانیاندەدەم...

مادام خۆخلاکۆف بەپەلە ڕۆیی بۆلای دۆلابەکە: «بەسەر چاو! بەڕاستی لە هۆش و تەگبیری ئێوە بۆ ئەو کارە ماق ماوم. فەرمانبەری دەوڵەتی؟ زۆر خۆشحاڵم کە لەم شارە خزمەت دەکەی!»

هەروا بە قسەکردنەوە، لە سەر نیوە لاپەڕەیەکی دەفتەری یادداشت چەند دێڕی بە خەتێکی درشت نووسی:

«من ئەمڕۆ بە هیچ شێوەیەک سێ هەزار ڕۆبڵم بە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ کارامازۆف، ئەو پیاوە ناشادە (چونکە هەرچۆنێک بێ ئەو ناشادە) نەداوە. قەتم پارە پێنەداوە و پێشینادەم! سەبارەت بەوەش، ئامادەم سوێند بخۆم!»

«ک. خۆخلاکۆف.»

بەپەلە ڕووی لە پیووتێر ئیلیچ کرد: «فەرمووا بڕۆ ڕزگاری بکە، ئەو کارەی تۆ بەڕاستی کارێکی گەورە و مرۆڤدۆستانەیە!»

سێ جار لە سەر یەکیش خاچی کێشا. پاشان هەڵات بۆ دەرێ بۆ ئەوەی هەتا سەرسەرا بەڕێی بکا.

ـ زۆر زۆر سپاسی ئێوە دەکەم! بەقەد تەواوی دنیات مەمنوونم کە بەر لە هەموو کەس هاتووی بۆلای من. بۆ تا ئێستا پیاوی وەک ئێوە لەم شارە هەیە و من زیارەتم نەکردووە؟ لە داهاتوودا زۆر زۆر خۆشحاڵ دەبم ئەگەر تەشریف بێنی، بە ماڵی خۆتی بزانە. زۆریش خۆم بە بەختەوەر دەزانم کە لەگەڵ کارمەندێکی دڵسۆزی وەک ئێوە ئاشنا بووم!... بەڕاستی ئەو وردبینی و بەرژەوەندخوازی و ئیستیعدادەی ئێوە جێی ڕێزە!... دەبێ ڕێزێکی زۆر لە ئێوە

بگیرێ، دەبێ لە زمانحاڵی ئێوە بگەن. ئەگەر بتوانم پێمخۆشە خزمەتێکتان پێبکەم، باوەڕ بفەرموو.... من زۆرم لاوان خۆشدەوێ! هیوای گەورە و گرانم بە لاوەکانمانە! بەرەی نوێ تەنیا پشتیوان و پارێزەری ڕووسیای ئازار چێشتوومانن. تەنیا هیوای.... ئاخ، بڕۆ، ئیتر بڕۆ!

بەڵام پیووتێر ئیلیچ دەرباز بووبوو، دەنا مادام خۆخلاکۆف وا زوو بەری نەدەدا. لەگەڵ ئەوانەشدا، مادام خۆخلاکۆف شوێنێکی باشی لە سەر دانا، کە هەتا ڕادەیەک دڵەخورپە و دڵاودڵ بوونەکەی بۆ ئەو کارە کەم کردەوە. هەر وەک هەموومان دەزانین، سەلیقە جیاوازن. پیووتێر ئیلیچیش بە هەستێکی ئاوێتەی خۆشی و ڕەزایەتەوە بەخۆی گوت: «زۆر جحێڵە. لەوانە بوو لەگەڵ کچەکەی لێکییان نەکەمەوە.»

چۆن باسی مادام خۆخلاکۆف بکەم کە شەیدای ئەم پیاوە لاوە بووبوو. «چ هۆشێک!» چ وردبینییەک! ئەویش بۆ پیاوێکی ئاوا کەم تەمەن! ئەویش لەم سەردەمەی ئێمەدا! ئەویش بەو ئاداب و ئەخلاق و قەڵافەتەوە! خەڵکی دەڵێن لاوانی ئەمڕۆ بەکاری هیچ نایەن، بەڵام فەرموو، ئەمە نموونەیەکی!» بەم شێوەیە ئەو «مەسەلە سامناک»ەی لەبیر بردەوە، تەنیا کاتێک لە پێخەفەکەی خزا لە ناکاو وەبیری هاتەوە «چەندە لە مەرگ نزیک بوومەتەوە»، گوتی: «ئەی بەدبەخت نەخۆم هەی!» بەڵام خێرا خەوێکی خۆش و شیرین باڵی بەسەردا کێشا.

بەوحاڵەشەوە ئەگەر ئەو دیدارە کتوپڕەی کارمەندی لاو لەگەڵ ئەو بێوەژنە شۆخ و جحێڵە، نەبوایەتە بنەمایەک بۆ بەرژەوەندیی داهاتووی ژیانی، خۆم لە قەرەی ئەو لایەنە کەم بایەخە نەدەدا کە هیچ پێوەندییەکی بە چیرۆکەکەوە نییە. بەسەرهاتی ئەو هەتا ئەمڕۆش لە شارەکەمان بە سەرسوڕمانەوە باسی لێدەکرێ. ڕەنگە دوای تەواو بوونی سەربردەی دوور و درێژی برایانی کارامازۆف، چەند وشەش سەبارەت بەوە باسبکەین.

# (٢)

# هەواڵی ترسناک

سەرۆکی ئاسایشی شارەکەمان، میخاییل ماکارۆویچ ماکارۆف، سەرهەنگ دووی خانەنشینکراو، بێوە پیاوێکی ڕەزا سووک بوو. سێ ساڵ لەمەوبەر هات بۆ شارەکەی ئێمە، هەموو کەس ڕێزی بۆ دادەنا. ئەوەش بە هۆی ئەوە بوو کە «ڕێگای پیکەوە ژیان و یەکیەتیی کۆمەڵگای دەزانی.» شەو نەبوو میوانی نەبێ، بەبێ میوان هەڵی نەدەکرد. هەر شەوێ کەسێک شێوی لەگەڵ دەخوارد، هەتا میوانێک یان چەند میوانی نەبوایە نانی نەدەخوارد. زۆربەی کاتیش شێوی سادە و ئاسایی سازدەکرد. ئەگەرچی سفرەکەی ڕەنگین نەبوو، بەڵام نانوچێشتی کەم نەدەهێنا. کوتلێتی ماسییەکەی بێوێنە بوو، قەرەبووی کەم بوونی شەڕابی دەکردەوە.

یەکەم وەتاغێک کە میوانەکان دەچوونە ناوی، وەتاغی بیلیارد بوو، ژوورێکی خەڵوەت بوو، وێنەی ئەسپ و کێبەرکێی ئینگلیزی لە قەتحە گیرابوون و بە دیواری وەتاغەکەدا هەڵواسرابوون. ئەو دار و دیوار ڕازاندنەوەش وەک دەزانین تایبەتی ژووری بیلیاردی ڕەبەنانە. هەموو شەوێ لە ماڵەکەی یاریی گەنجەفە دەکرا. بەڵام لە کاتی دیاریکراودا تەواوی خەڵکی شارەکەمان بە ژن و پیاو و کچانەوە لە ماڵەکەی کۆ دەبوونەوە و بەزمی سەما و هەڵپەڕکێیان وەڕێ دەخست. ئەگەرچی میخاییل ماکرۆویچ بێوە پیاو بوو، بەڵام قەت بە تەنیا نەبوو. کچێکی بێوەژنی لەگەڵ دوو گەورە کچی شوو نەکردووی هاتبۆوە ماڵی باوکی. ئەو دوو نەوەی خوێندنیان تەواو کردبوو، زۆر جوان و شۆخوشەنگ بوون بە بۆنەی ئەوانەوە پیاوانی جحێڵ بۆ ماڵی باوەگەورەیان دەهاتن، ئەگەرچی هەموو دەیانزانی میخاییل ماکارۆویچ ناتوانێ جیازی بە نەوەکانی بدا.

میخاییل ماکارۆویچ لە کاری خۆیدا زۆر شارەزا نەبوو، ئەگەرچی ئەرکی خۆی بە باشی بەڕێوە دەبرد و ڕوونتر بڵێم: ئەو خوێندەوارییەکی زۆری نەبوو. ئەو تێگەیشتنێکی زۆری نەبوو لەکارەکەی خۆیدا و توانایی بەڕێوەبەرییەکەشی جێی باوەڕ نەبوو. وا نەبوو کە نەتوانێ لەو بەرژەوەندییانە بگا کە لە حکوومەتی ئێستادا وەدی هاتبوو. بەڵکو لە شرۆڤەی ئەو بەرژەوەندییانەدا هێندێ جار بە هەڵە دەچوو. ئەوەش بە هۆی کەم هۆشییەوە نەبوو، بەڵکو بە هۆی سەرساردییەوە بوو. چونکە هەمیشە هێندە بەپەلە بوو نەیدەتوانی لە کاکڵی مەبەست بگا. بە خۆی دەگوت: «من دڵێکی سەربازانەم هەیە، نەک دڵی کەسێکی سویل.» تەنانەت بیروڕایەکی تایبەتی سەبارەت بە بنەمای بەرژەوەندییەکانی پێوەندیدار بە ئازادیی کۆیلە و ڕەعیەتە زەرخڕیدەکان نەبوو. تەنیا ساڵە و ساڵ ئەو بیر و ئەندێشانەی وەدەست دێنا و لەبەرەوە دەیخستە سەر زانیارییەکانی. لەگەڵ ئەوانەشدا خۆی خاوەن زەوی و زار بوو. پیووتێر ئیلیچ لێی ڕوون بوو کە ئەو شەوە تاقمێک لە میوانەکانی میخاییل ماکارۆویچ دەبینێ، بەڵام نەیدەزانی کامیان و کێ. خوداوڕاستان ئەو شەوە دادوەر و وارۆینسکی، پزیشکی شارەکەمان، لاوێک بوو دوای وەرگرتنی بڕوانامەی دەرەجە یەک لە «فەرهەنگستانی پزیشکی»ی پترزبۆرگ تازە هاتبۆوە بۆ شارەکەمان و لە ماڵی سەرۆکی ئاسایش پەڕێنی دەکرد. ئیپۆلیت کیریلۆویچ (کە لە ڕاستیدا جێگری دادوەر بوو، بەڵام هەموو کەس بە دادوەر بانگیان دەکرد)، مرۆڤێکی سەیر بوو، نزیکەی سی و پێنج ساڵی تەمەن بوو، کز و مردەلۆخە بوو، بەڵام ژنەکەی زۆر قەڵەو بوو، منداڵیشیان نەبوو. زۆر پیاوێکی لووت بەرز و تووڕە بوو. ئەگەرچی پیاوێکی ئاقڵ بوو و خاوەنی دڵێکی نەرم و پڕ بەزەییش بوو. عەیبەکەشی ئەوە بوو زیاتر لە توانایی و ئیستعدادی خۆی چاوەڕوانیی لە خۆی بوو. هەر ئەوەش بووبووە هۆی ئەوەی هەمیشە بێئۆقرە بنوێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا هۆگرییەکی زۆری بە هونەر بوو، با بڵێین لە زانستی ڕەوانناسیدا شارەزا بوو، لە ڕۆحیاتی مرۆڤ و ناسینی تاوان و جینایەت بە

باشی دەگەیشت. هەر بۆیە دایمە خۆی دەخواردەوە و پێی وابوو لە شوێنی کارەکەی هەمیەتێکی ئەوتۆی پێنادەن. بڕواشی وابوو کە مەقاماتی بالا ئەو جۆرەی کە پێویستە قەدری لێناگرن و ڕێزی بۆ دانانێن و تەنانەت نەیاریشی هەیە. لە کاتی تووڕە بوون و خەمباریدا هەڕەشەی دەست لە کارکێشانەوەی دەکرد و دەیگوت دەستدەکەم بە کاری وەکیلایەتی لە سەر پەروەندەی جینایی. پەروەندەی چاوەڕوان نەکراوی کارامازۆف، بەجارێ تووشی هەیەجانی کرد: «پەروەندەیەک بوو کە وێدەچوو لە نێو تەواوی خەڵکی ڕووسیادا دەنگبداتەوە.» بەڵام خەریکم پێشدەستی دەکەم.

نیکۆلای پارفنۆویچ نێلی‌یۆدۆف بازپرسی لاو کە دوو مانگ لەمەوبەر لە پترزبۆرگەوە هاتبوو، لە وەتاغێکی دیکە لەگەڵ کچان دانیشتبوو. دواتر ئەو مەسەلە بووە بنێشتەخۆشکەی خەڵک کە تەواوی ئەو کەسانەی لە شەوی «جینایەت»دا لە ماڵی میخاییل ماکارۆویچ سەرۆکی ئاسایش کۆ بووبوونەوە، دەتگوت بەقەست لەوێ کۆبوونەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا مەسەلەکە تەواو سادە و سروشتی بوو. ژنەکەی ئیپۆلیت کیریلۆویچ دوو ڕۆژ بوو ددانی دێشا. ئەویش لەبەر ناچاری لە ماڵێ وەدەر کەوتبوو، بۆ ئەوەی گوێی لەناڵە و نووزەی ژنەکەی نەبێ. پزیشکیش خووخدەی وابوو شەوانە نەیدەتوانی بەبێ یاریی پاستۆڕ هەڵبکا. نیکۆلای پارفنۆویچ نێلی‌یۆدۆف سێ ڕۆژ بوو بڕیاری دابوو لەو شەوەدا سەربەخۆ و لە ناکاو خۆ بە ماڵی میخاییل ماکارۆویچدا بکا، تاکو زراوی نەوە گەورەکەی ـ ئێلگا میخائیلفنا ـ بتۆقێنێ، بە درکاندنی ئەو ڕازەی کە دەزانێ ڕۆژی لەدایک بوونیەتی، چونکە ئێلگا میخائیلفنا هەوڵی دەدا بیشارێتەوە، نەکا ببێتە هۆی وەڕێخستنی کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێ. ئەو ڕابواردن و شادییەکی زۆری پێشبینی دەکرد، گاڵتە و گەپی زۆر خۆش سەبارەت بە تەمەنی کچە و ترسان لە ئاشکرا کردنی، سەبارەت بە ئاگاداربوونی ئەو لە ڕازی کچە و درکاندنی بۆ هەمووان و هتد... ئەم لاوە جوانچاکە بۆ ئەو کارانە سەری پێوە نەبوو. کچان نازناوی «چاولەوەڕێن»یان بەسەردا بڕیبوو. ئەویش وێدەچوو ئەو نازناوەی

پێخۆشبێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەهلی خۆش ڕابواردن بوو، مرۆڤێکی زۆر ئاکار جوان و خانەدان و بەهەست و خوێندەوار بوو. گاڵتەکانیشی دڵپاکانە و بێغەرەز بوون. کورتە باڵا و بەلەباریکە و لاواز بوو. قامکە شووش و سپی و باریکەکانی هەمیشە چەن ئەنگوستیلەی گەورە و بریقەداری تێدەکرد. لە کاتی کاروباری ئیداریدا زۆر جیددی بوو و بە جوانترین شێوە ئەرکی خۆی بەڕێوە دەبرد. لە ماوەی لێپرسینەوەدا قاتڵان و تاوانبارانی چینی خوارووی کۆمەڵی تووشی سەرسوڕمان دەکرد و لەو بوارەدا ئیستعدادێکی تایبەتی هەبوو. ئەگەر لەبەر ڕێزدانان نەبوایە، دەیتوانی زۆر لەوە زیاتریان تووشی سەرسامی بکا.

پیووتێر ئیلیچ گەیشتە ماڵی سەرۆکی ئاسایش و کە چووە ژووری واقی وڕما. خێرا بۆی دەرکەوت کە هەموویان دەزانن. پەڕیان وەلانابوو و تێکڕا هەستابوونە سەرپێ و قسەیاندەکرد. تەنانەت نیکۆلای پارفنۆویچیش کیژەکانی بەجێ هێشتبوو و بە هەڵەداوان خۆی کردبوو بە وەتاغی بیلیارددا و ئامادەیی خۆی بۆ بەدواداچوون دەربڕی. پیووتێر ئیلیچ لەگەڵ ئەو هەواڵە سەرسووڕهێنەرە بەرەوڕوو بوو کە فیۆدۆرپاولۆویچی پیر ئەمشەو لە ماڵەکەی خۆیدا کوژراوە و پارەکانیان بە تالان بردووە. ئەم هەواڵە تازەیان بەو شێوەی خوارەوە پێگەیشتبوو.

مارتائیگنا تیفنا، (کە مێردەکەی واتە گریگۆری لە نزیک تەیمانی باخەکە بە زەبرێک بێهۆش بووبوو.) لە پێخەفەکەیدا خەوێکی خۆش دایگرتبوو. دوای خواردنی ئەو دەمکراوە گیاییە لەوانەبوو هەتا بەیانی خەبەری نەبێتەوە. بەڵام لە ناکاو ڕادەپەڕێ، بێگومان بە هاوار و ناڵەی ترسناکی ئیسمیر دیاکۆف کە لە ژوورەکەی پەنایاندا بێهۆش کەوتبوو خەبەری بووبۆوە. ئەو هاوارانەی ئیسمیر دیاکۆف هەمیشە بەر لە سەرودڵ لێهاتنەکەی سەری هەڵدەدا و هەمیشەش دەبووە هۆی ترس و پەرۆشیی مارتائیگنا تیفنا و قەت نەیدەتوانی خووی پێبگرێ. لە جێگاکەی دەردەپەڕێ و بە خەواڵوویی هەڵدێ بۆ ژوورەکەی ئیسمیر دیاکۆف. ژوورەکەی تاریک و تنۆک بووە و تەنیا

توانیویەتی گوێی لە ناڵە و هەناسەبڕکێ و تەقەللای بێ. ئەو کاتە مارتائیگنا تیفنا هاوار دەکا و دەیهەوێ مێردەکەی بانگبکا، بەڵام لە ناکاو وەبیری دێتەوە کاتێک لە پێخەفەکەی هاتە دەرێ مێردەکەی لە پاڵیدا نەبووە. دەگەڕێتەوە بۆلای جێوبانەکە و بە کوێرە کوێرە و دەستەکوتێ دەگەڕێ، بەڵام جێوبانەکە خاڵی بووە. ڕەنگە دوای ئەو هاتبێتە دەرێ ـ لە کوێیە؟ هەڵدێ بۆلای پلیکانەکان و بە ترس و لەرزەوە قاوی لێدەکا. بەڵام وەڵامێک نابیستێ، لەوسەری باخەکەوە گوێی لە دەنگی ناڵەیەک دەبێ. گوێ ڕادەگرێ. ناڵە ناڵەکە دیسان دووپات دەبێتەوە و بۆی دەردەکەوێ لە نێو باخەکەوە دێ.

بە دڵێکی پەرۆشەوە بە خۆی دەڵێ: «خودایەگیان! لە ناڵە ناڵەکەی لیزاوتا ئیسمیردیاشچانا دەچێ!» بە ترس و لەرزەوە لە پلیکانەکان دەچێتە خوارێ و دەبینێ دەرگای ڕوو لە باخەکە کراوەتەوە. بە خۆی دەڵێ: «مێردە بێچارەکەم ڕەنگە لەوێ بێ.» دەچێ بۆلای دەرگاکە، بە جوانی بۆی دەردەکەوێ گریگۆرییە بە دەنگێکی کز و ترسناک دەناڵێنێ و بە ناو بانگی دەکا: «مارتا! مارتا!»

مارتائیگنا تیفنا لەبەر خۆیەوە دەپاڕێتەوە: «خودایە، لە بەڵامان بپارێزە!» هەڵدێ بۆلای دەنگەکە و بەو شێوەیە گریگۆری دەدۆزێتەوە. بە کەلەلایی لە پەنا تەیمانەکە دەیدۆزێتەوە، هەر لەو شوێنەی کە درابوو بە زەویدا نایدۆزێتەوە، بەڵکو بیست هەنگاوێک لەولاترەوە. دواتر مەعلووم بوو کە کاتێک وەخۆ دێتەوە، بە سکەخشێ و ڕەنگە دوای ماوەیەکی زۆر و چەن جار لەهۆش‌خۆ چوون، خۆی هەتا ئەوێ بکێش کردووە. مارتائیگنا تیفنا، لەڕێوە تێدەگا کە شەلاڵی خوێنە، بۆیە بە هێز و قەوەتی خۆی دەقیژێنێ. گریگۆری بە ناڵە ناڵ چەند وشەی بە دەمدا هاتووە: «کوشتی... ئەو باوکی خۆی کوشت... گەوجە بۆ دەقیژێنی.... هەڵێ... کەسێک بێنە....»

بەڵام مارتا ئیگنا تیفنا، هەروا قیژاندبووی، چونکە دەبینێ پەنجەرەی وەتاغی ئەربابەکەی ئاولایە و مۆمێکی هەڵکراو لەبەر پەنجێرەکەیە، هەڵدێ بۆ ئەوێ و هەرا لە فیۆدۆرپاولۆویچ دەکا. بەڵام کاتێک لە پەنجێرەکەوە سەر

دەکێشێتە ژووری، دیمەنێکی ترسناک دەبینێ. ئەربابەکەی بێ جووڵە لەبەر مێزەکە بە پشتدا کەوتووە. بەرگی خەو و کراسە سپییەکەی لە خوێن هەڵکشاوە. مۆمی سەرمێزەکە شۆقەکەی لە خوێنی سەر ڕوومەتی بێجووڵە و مردووی فیۆدۆرپاولۆویچ دراوە، مارتا ئیگنا تیفنا ترساو و زاروتۆقیو لەبەر پەنجەرەکەوە هەڵدێ و لە باخەکە دەڕواتە دەرێ. شەوژەنی دەروازە گەورەکە لادەبا و لە ڕێگەی پشتەوە بە هەڵاتن دەچێ بۆلای ماریا کێندراتیفنای جیرانیان. دایک و کچ خەویان لێکەوتبوو، بەڵام بە تەقە تەقی توند و پەیتا پەیتای دەرگاکەیان خەبەریان دەبێتەوە. مارتا دوای قیژ وهۆڕ و داد و هاوارێکی زۆر هەرچۆنێکە تێیان دەگەیێنێ کە پێویستی بە یارمەتییە. ئەوانیش خێرا هەڵدەستن و بە هەڵەداوان هەرسێکیان خۆ دەگەیەننە شوێنی ڕووداوەکە. لە کاتی هەڵاتندا ماریا کیندراتیفنا وەبیری دێتەوە کە نزیک سەعات هەشت گوێی لە هاوارێکی ترسناک بووە لە نێو باخەکەوە، کە بێگومان نەڕەی گریگۆری بووە، کە لاقی میتیای گرتبوو و نەڕاندی: «باوککوژ!»

ماریاکیندرا تیفنا بەدەم هەڵاتنەوە دەڵێ: «گوێم لە هاواری کەسێک بوو، پاشان بێدەنگ بوو.» هەڵدێن بۆ ئەو شوێنەی گریگۆریی لێکەوتووە، دوو ژن بە یارمەتیی تۆماس هەڵیدەگرن و دەیبەنە ژووری. مۆمێک دادەگیرسێنن و چاویان بە ئیسمیر دیاکۆف دەکەوێ خەریکە جینگڵ دەدا و چاوی بە مۆلەق وێستاوە و کەف بە لادەمیدا دێتە دەرێ. بە ئاو و سرکەی تێکەڵکراو ناچاوانی گریگۆری دەخوسێنن و خێرا دێتەوە سەرخۆ و دەپرسێ: «ئەرباب کوژراوە؟» ئەمجار تۆماس و دوو ژنەکە هەڵدێن بۆ ماڵەکەی فیۆدۆرپاولۆویچ، دەبینن نەک هەر پەنجێرەکە بەڵکو درگای ڕووبەڕووی باخەکەش کراوەتەوە. ئەگەرچی پیرەپیاو لە ماوەی حەوتوووی ڕابردوودا هەموو شەوێک دەرگای لە سەر خۆی دادەخست و تەنانەت ودمی بە گریگۆریش نەدەدا بە هیچ شێوەیەک بچێتە ژووری. کاتێک دەرگاکە دەبینن کراوەتەوە ناوێرن بچن بۆلای تەرمەکەی فیۆدۆرپاولۆویچ. «لە ترسی ئەوەی

نەکا پاشان تووشی گێرەوگێشە بن.» بەپەلە دەگەڕێنەوە بۆلای گریگۆری، پیرە پیاو پێیاندەڵێ، خێرا بچن بەشوێن سەرۆکی ئاسایشدا. ماریا کیندرا تیفنا بە هەڵەداوان دەچێ و ئەو هەواڵە ترسناکە بە میخاییل ماکارۆویچ و میوانەکانی ڕادەگەیەنێ. ئەو تەنیا پێنج دەقیقە بەرلە پیووتێر ئیلیچ گەیشتبووە ئەوێ، هەر بۆیە قسەکانی پیووتێر ئیلیچ، نەک بە شێوەی شک و گومان، بەڵکو وەک پشتڕاست کەرەوەی هەواڵەکە چاو لێدەکەن و هەموویان دێنە سەر ئەو باوەڕە کە شاهیدی عەینییە و گومانی تێدا نییە کاری میتیایە. (لەگەڵ ئەوانەشدا پیووتێر ئیلیچ هەتا ئەو ساتە بڕوای نەدەکرد کاری دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بێ.)

بڕیار دەدەن خێرا دەستبەکار بن. جێگری سەرۆکی ئاسایش فەرمانی پێدەگا کە بۆچوونە شوێنی ڕووداوەکە، چوار شاهید لەگەڵ خۆی بەرێ و بەپێی یاسای باو، لەڕێوە لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە دەست پێبکا، کە لێرەدا جارێ خۆ لەو لایەنە نادەین. پزیشکی شارستان، پیاوێکی بە غیرەت و تازەکار بوو، پێداگری دەکا کە لەگەڵ سەرۆکی ئاسایش و دادوەر و بازپرس بچێ.

بە کورتی ئەوەش بڵێم، کاتێک گەیشتنە سەر تەرمەکەی فیۆدۆرپاولۆویچ، بە کاژەڵاڵی ورد و ئەنجن ئەنجنەوە لە نێوەڕاستی ژوورەکەدا کەوتبوو. بەڵام کاسە سەری بەچی ئاوا ئەنجن ئەنجن کرابوو؟ زۆر وێدەچێ هەر بەو دەسکاونگە وایلێکرابێ کە گریگۆریی پێ بریندار کرا. لە داوای ئەوەی گریگۆری هەموو چەشنە دەوا و هەتوانێکیان بۆ کرد، بە دەنگێکی نووسا و پیرانەوە باسی کەوتن و زەبرخواردنەکەی گێڕایەوە. بە لەنتەرەوە دەستیان کرد بە گەڕان، هەموو دەوروبەری شوێنەکە و پەنا پەرژین و نەردەکان گەڕان، ئاخری دەسکاونگە برنجییەکەیان لە سەر ڕێچکەیەکی بەرچاوی نێو باخەکە دۆزییەوە. ئەو وەتاغەی فیۆدۆرپاولۆویچی لێ کوژرابوو، دیاردەیەک لە شپرزەکردن و شێواندنی کەلوپەلەکانی بەرچاو نەدەکەوت. بەڵام لە پەنا چرپاکە، لە پشت پەردەکە، پاکەتێکی گەورە و ئەستووریان هەڵگرتەوە ئەم

نووسراوەیەی لە سەر بوو: «دیارییەکی سێ هەزار ڕۆبڵی بۆ فریشتەکەم، گرووشنکا، ئەگەر بێت بۆلام.» لەلای خوارووی پاکەتەکەشەوە نووسیبووی: «بۆ مەلووچکەکەم.» پاکەتەکە سێ مۆری سووری پێوەبوو، بەڵام پاکەتەکە دڕابوو و پارەکەیان لێ دەرهێنابوو. هەروەها تەنزیلێکی باریکی پەمەییان لە سەر عەرزەکە دییەوە کە ڕەنگە پاکەتەکەی پێبەسترابێ.

کاتێک پیووتێر ئیلیچ گوتی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بەیانی بەر لە هاتنی خۆی خۆی دەکوژێ، بەجارێ شوێنی لە سەر دادوەر و بازپرس دانا. چونکە پێی گوتن کە لەبەر چاوی ئەو دەمانچەکەی پڕ کردووە و بڕیاریداوە بە گوللە لە خۆی بدا، نامەیەکیشی نووسیوە لە گیرفانی دایە... کاتێک پیووتێر ئیلیچ کە هێشتا باوەڕی نەدەکرد خۆکوژی بکا، هەڕەشەی ئەوەی لێدەکا کە بە هەر شێوەیەک بێ بەر بەوکارە دەگرێ، میتیاش بە بزەیەکی مانادارەوە وەڵامی دەداتەوە: «کاتێک دەگەنێ کارلەکار ترازاوە.» هەر بۆیە بۆ دۆزینەوەی تاوانبار کەوتنە پەلەپەل و ویستیان بەر لەوەی ئەو بە گوللە لە خۆی بدا، بگەنە ماکرۆیە و قۆڵبەستی بکەن.

دادوەر بەپەلە پڕووزێ و هەڵەشەیی گوتی: «وەک ڕۆژ ڕوونە، ئەوە وەک ڕۆژ ڕوونە! ئەمە ڕاست کردەوەی دەلووکارانە: "«سبەینێ خۆم دەکووژم، کەوایە هەتا کاتی مردن بە خۆشی ڕایدەبوێرم.»"

باسی کڕینی شەڕاب و کەلوپەل، دادوەری ئەوەندەی دیکە تووشی سەرسوڕمان کرد: «ئاغایان، لەبیرتانە ئەو کەسەی ئۆلسی فیۆفی بازرگانی کوشت، هەزار و پێنجسەد ڕۆبڵی دزی و سەر و فۆکلەی لە دەق دا و بێئەوەی پارەکە بشارێتەوە ڕۆیشت بۆلای کچان.»

لە ماڵی فیۆدۆرپاولۆویچ، بە هۆی گەڕان و لێپرسینەوە و تەشریفات و هتد، وەدرەنگ کەوتن. ئەو کارانە کاتی گرتن و هەر بۆیە دوو سەعات بەر لە وەڕێکەوتن، سەرۆکی ئاسایشی ناوچەکە، ماوریکی ماوریکییەویچ، کە بەیانی ڕۆژی پێشوو بۆ وەرگرتنی مووچەکەی هاتبوو بۆ شاری، لە پێشەوە ناردیان بۆ ماکرۆیە. پێشیان ڕاگەیاند کە کاتێ دەگاتە ماکرۆیە بە بێدەنگی چاوی بە

سەر تاوانبارەوە بێ و نەیان هارووژێنێ هەتا مەقاماتی بالا دەگەنێ. هەروەها شایەدی پێویستیان بۆ قۆڵبەست کردنی «تاوانبار» و کاروباری پۆلیس و دادگا کۆ کردەوە. ماوریکی ماوریکییەویچ بەپێی فەرمانێک کە پێیدرابوو، بە شێوەیەکی شاراوە گەیشتە ماکرۆیە. جگە لە ئاشنای لەمێژینەی، تریفۆن بۆریسیچ نەیهێشت هیچکەس لە کارە نهێنییەکەی بگا. ڕاست ئەو کاتە لەگەڵ تریفۆن بۆریسیچ دوابوو کە میتیا لەبەر هەیوانەکە دیتی کە بەدوایدا دەگەڕا، میتیاش لەڕێوە هەستی بە شڵەژانی کردبوو. هەر بۆیە نە میتیا خۆی و نە هیچ کەسی دیکە ئاگاداری ئەوە نەبوو کە لە ژێر چاوەدێریدایە. تریفۆن بۆریسیچ سندووقی دەمانچەکانی هەڵگرتبوو و لە شوێنێکی باش شاردبوویەوە. بەر لە سەعاتی چواری بەیانی و لەگەڵ تاریک و ڕوون، مەقاماتی دەوڵەتی، سەرۆکی ئاسایش و دادەوەر و بازپرس بە دوو عارەبانەی سێ ئەسپە وەڕێکەوتن. دوکتۆر لە ماڵی فیۆدۆرپاولۆویچ مایەوە، تاکو بەیانی دەستبکات بە پشکنینی لەش. بەڵام بارودۆخی ئیسمیر دیاکۆف و بەتایبەت نەخۆشییەکەی سەرنجی ڕاکێشا. بە سەرسووڕمانەوە بە هاوڕێکانی گوت: «ئەم هێرشە سەخت و درێژخایەنانە، کە دوو ڕۆژی پێ بچێ، بە دەگمەن لە مرۆڤی فێداردا دەبیندرێ و لە باری زانستییەوە جێی سەرسووڕمانە و دەبێ پشکنینی پزیشکیی بۆ بکرێ.» هاوڕێکانیشی بە پێکەنینەوە پیرۆزباییان پێگوت کە نەخۆشێکی ئاوا کەم وێنەی دیوەتەوە. دادوەر و بازپرس وتەکانی دوکتۆریان هەر لەبیر بوو کە گوتبووی ئیسمیر دیاکۆف ناگاتە بەیانی دەمرێ.

ئێستا دوای ئەم باسوخواسە دوور و درێژە، کە پێموایە زۆریش پێویست بوو، دێینەوە سەر چیرۆکەکە و لەو شوێنەوە کە هەڵمان بڕی، تێهەڵدەچینەوە.

## (٣)

## داخ و کەسەری ڕۆح. ئازاری یەکەم[1]

بەمشێوەیە، میتیا دانیشت و وەک شێت چاوی لەو کەسانەی دەوروبەری خۆی دەکرد. بێ ئەوەی بزانێ وتێ بگا باسی چی دەکەن و چیی پێدەڵێن، لە ناکاو هەستا سەرپێ و دەستی هەڵێنا و بە دەنگی بەرز هاواریکرد:

ـ من بێتاوانم! تاوانی ئەو خوێنە لە ئەستۆی من نییە! تاوانی خوێنی باوکم لە ئەستۆی من نییە... دەمویست بیکوژم، بەڵام نەمکوشت، من بێتاوانم. من نەمکوشتووە.

هێشتا ئەو قسانەی تەواو نەکردبوو گرووشنکا لە پشت پەردەکە هاتە دەرێ و خۆی خست بە سەر کەوشەکانی سەرۆکی ئاسایشدا. لە کاتێکدا فرمێسک بە چاویدا دەهاتە خوارێ، دەستی بۆلای ئامادەبووان درێژ کرد و بە هاوارێکی دڵهەژێن گوتی: «خەتای منە، خەتای منی نەگبەتییە، خەتای منە! منی دڵڕەش، من بوومە هۆی ئەوەی ئەو کارە بکا. من بووم کە بەردەوام ئازارم دا و تووشی ئەو تاوانەم کرد. ئەو پیرە پیاوە بێچارەیەش، کە مردووە، منی دڵڕەشی ناپاک ئازارم دا و تووشی ئەو ڕۆژەم کرد! هەمووی خەتای منە، خەتای من!»

سەرۆکی ئاسایش، کە بە دەستی هەڕەشەی لێدەکرد، گوڕاندی: «ئەرێ، خەتای تۆیە! تاوانباری سەرەکی تۆی! هەی بەستۆکە، هەی خونکی سەلیتە!» بەڵام بەپەلە و لێبڕاوانە قسەکەیان پێبڕی. دادوەر گرتی و دەنگی هەڵێنا: «میخاییل ماکارۆویچ، کردەوەی ئێوە بەڕاستی نایاساییە! بەڕاستی دەتەوێ

---

1- ئەمە بەپێی ئایینی ئۆرتۆدۆکسی ڕووسی، نیشاندەری ماوەی چل ڕۆژ بەر لە مەرگە، کە دوای ئەوە ڕۆح بە شوێن و ئامانجی خۆی دەگا.

لێکۆڵینەوەکەمان تووشی کۆسپ و تەگەرە بکەی... خەریکی کاری پەروەندەکە ئاڵۆز دەکەی... » هەتا ڕادەیەک کەوتبووە هەناسەبڕکێ.

نیکۆلای پارفنۆویچ کە بەجارێ تووشی شڵەژان بووبوو گوتی: «لە ڕێی یاساوە بڕۆنە پێشێ! لەڕێی یاساوە! دەنا مەحاڵە کارەکەمان بە ئاکامێکی باش و عادڵانە بگا!»

گرووشنکا هەروا کە چۆکی دادابوو بە پاڕانەوە گوتی: «هەردووکمان دادگایی بکەن! هەردووکمان سزا بدەن. ئێستا ئامادەم لەگەڵیدا سەرم بە پەتی سێدارەوە بکرێ!» میتیا لەبەردەمی گرووشنکادا چۆکی دادا و توند لە باوەشی گرت. «گرووشاگیان، ژیانەکەم، خوێنەکەم، خوداکەم!» پاشان هاواری کرد: «بڕوا بە قسەکانی مەکەن! ئەو تاوانی هیچ خوێنێکی لە ئەستۆ نییە، هیچ تاوانێک!

دواتر وەبیریهاتەوە کە چەند کەس بە زۆر لە گرووشنکایان جیا کردەوە و بە ڕاکێش ڕاکێش بردیان. گرووشنکایان لەوێ ڕاگوێست و میتیا کاتێک وەخۆ هاتەوە لە پشت مێزێک دانیشتبوو. لە پشت سەری و لە پەنایدا پیاوانی خاوەن نیشان ڕاوەستابوون. بەرەوڕووشی لەولای مێزەکەوە، نیکۆلای پارفنۆویچ دانیشتبوو. داوای لێدەکرد قومێک ئاو لەو پەرداخەی سەر مێزەکە بخواتەوە. بە ئەدەبێکی زۆرەوە گوتی: «دەتهێنێتەوە سەرخۆ، ئارامت دەکاتەوە. لەسەرەخۆ بە، مەشڵەژێ.» لە ناکاو سەرنجی میتیا (ئەوەی دواتر وەبیر هاتەوە) لە سەر ئەنگوستیلە گەورەکانی گیرسایەوە، کە یەکیان نقێمەکەی یاقووت بوو، ئەوی دیکەشیان نقێمەکەی گەوهەرێکی بریقەداری زەرد بوو. ماوەیەکی زۆر دواتر بە سەرسوڕمانەوە هاتەوە بیری کە ئەو ئەنگوستیلانە لە کاتی لێپرسینەوەدا، وەهای سەرنجی ڕاکێشابوو کە بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی وازیان لێبێنێ و چاویان لە سەر هەڵگرێ. ئەو ئەنگوستیلانەی کە ڕێزەیەک پێوەندیی بە حاڵوباڵی ئەوەوە نەبوو. لەلای چەپەی میتیاوە ئەو شوێنەی کە هەوەڵی شەو ماکسیمۆفی لێدانیشتبوو، دادوەر دانیشتبوو، لای ڕاستەشییەوە لە شوێنەکەی هەوەڵی گرووشنکا،

لاوێکی سوورهووله به کۆتێکی کۆنه و تایبەتی ڕاوەوه دانیشتبوو، جەوهەر و کاغەزیشی لەبەر دەم بوو. ئەو کەسەش میرزا بنووسی بازپرسەکە بوو لەگەڵ خۆی هێنابووی. سەرۆکی ئاسایش لەوبەری وەتاغەکە، لە پەنا گالگانۆف ـ کە دانیشتبوو ـ لەبەر پەنجێرەکە ڕاوەستابوو.

بازپرس، بۆ جاری دەهەم بە نەرمی گوتی: «چۆڕێ ئاو بخۆوه.»

میتیا کە بە چاوی زەقەوە لە بازپرسەکە ڕامابوو، دەنگی بەرز کردەوە: «ئاغایان، من خواردمەوە، خواردمەوە... وەرن لەتوکوتم کەن، سزامبدەن، بەڵام چارەنووسم ڕوون بکەنەوە!»

بازپرس، لەسەرەخۆ و پێداگرانە پرسیی: «کەوایە جەنابت لێبڕاوانە دەڵێی باوکی خۆتت کوشتووە و حاشای لێدەکەی؟»

ـ نا، من نەمکوشتووە. من تۆمەتبارم بەوەی کە خوێنی پیرەپیاوێکی دیکەم ڕشتووە، نەک خوێنی باوکم. هەر لەبەر ئەوەش دەگریم! ئەو پیرەپیاوەم کوشت، کوشتم و لە سەر عەرزەکە درێژم کرد.... بەڵام ئەگەر تۆمەتی قەتڵێکی دیکەم لێبدرێ زۆر دژوارە، قەتڵێکی ترسناکە و من حاشا لەوە دەکەم و کاری منیش نییە... ئاغایان، ئەوە تۆمەتێکی سەختە، زۆر زەبرێکی کاریگەرە. باوکم کێ کوشتوویەتی؟ کێ کوشتوویە؟ ئەگەر من نەمکوشتووە کەوایە کێ کوشتوویەتی؟ جێی سەرسووڕمانە، بەڕاستی مەحاڵە و پیاو نازانێ بڵێ چی؟

بازپرس خەریکی لێپرسینەوە بوو: «بەڵێ وایە، کەوایە کێ کوشتوویە؟» جێگری دادوەر (کە لەبەر کورت کردنەوەی ناوەکەی دادوەری پێدەڵێین) چاوێکی لە میتیا کرد و گوتی:

ـ پێویست ناکا خەمی خزمەتکاری پیر، گریگۆری واسیلیەویچت هەبێ. ئەو زیندووە، وەهۆش هاتۆتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو زەبرە کوشندەیەت لێداوە و بەپێی دانپیانانی خۆتان و ئەویش، کاری تۆیە. شکی تێدا نییە کە زیندوو دەمێنێ. دوکتۆرەکەشی لەوبارەوە دڵنیای کردووین.

میتیا دەستی بۆ ئاسمان هەڵبڕی و لەخۆشیانا گەشایەوە و قیژاندی: «زیندووە؟ ئەو زیندووە؟» خاچی خۆی کێشا. «خودایە، زۆر شوکر سپاست

دەکەم کە ئەو مۆجزەیەت لە هەقی منی تاوانبار و ئاکار ناشیرینداکرد. ئەوە پاداشی دوعاکانمە. شەوگاری ئەمشەو دوعامکردووە.» سێ جاریشی خاچی خۆی کێشا. وەهەناسەبڕکێ کەوتبوو.

«سەبارەت بە تۆ گریگۆری زۆر شتی بۆ ڕوون کردووینەتەوە کە...» دادوەر درێژەی بە قسەکانی دەدا، بەڵام میتیا لە سەر کورسییەکەی هەستا.

ـ ئاغایان، دەقیقەیەک، بۆخاتری خودا تاقە یەک دەقیقە، دەچم بۆلای ئەو {گرووشنکا}...

نیکۆلای پارفنۆویچ گوڕاندی: «ببوورە، لەم کاتەدا ئەوە مەحاڵە.» ئەویش هەستا سەرپێ. پیاوانی خاوەن نیشان میتیایان گرت، بەڵام ئەو بە ئیختیاری خۆی دانیشتەوە....

ئاغایان، بەداخەوە! تەنیا یەک دەقیقە دەمویست چاوم پێیبکەوێ؛ دەمویست پێیبڵێم کە ئەو خوێنە شۆرایەوە و ڕۆیشت، ئەو خوێنەی کە شەوگاری ئەمشەو لە سەر دڵم قورساییی دەکرد و جینگڵی پێدەدام، ئێستا زۆر دڵخۆشم کە قاتڵ نیم!» میتیا وەک حاڵ لێهاتوو، بەڵام بەڕێزەوە لە کاتێکدا کە چاوی بە هەموویاندا دەگێڕا گوتی: «ئاغایان، ئەو دەزگیرانی منە. ئاخ برایان سپاستان دەکەم! ئاخ، لە دەقیقەیەکدا ژیانێکی نوێ و دڵێکی نوێتان بە من دا!... برایان، ئەو پیرەپیاوە بەخێوی کردووم و بە باوەش گێڕاومی. منداڵێکی سێ ساڵان بووم و بێکەس و بێپەنا مابوومەوە، لە نێو تەشتدا دەیشۆردم، هەقی باوکایەتیی بە سەرمەوەیە....»

بازپرس گوتی: «کەوایە بەم پێیە ئێوە....»

میتیا هەنیشکی نایە سەر مێزەکە و هەردوو دەستی بە بەر دەموچاویەوە گرت و قسەکەی پێبڕی: «ئاغایان، ئیزنم پێبدەن، دەقیقەیەکی دیکە ئیزنم بدەنێ. ئاغایان لێمگەڕێن تاوێک بیربکەمەوە، لێمگەڕێن پشوویەک بدەم. ئەو ماجەرایە زۆر ناخۆش و دڵهەژێنە. مرۆڤ خۆ تەپڵی بەتاڵ نییە، دڵی هەیە، بەڕێزان!»

نیکۆلای پارفنۆویچ لەسەرخۆ گوتی: «چۆڕێ ئاو بخۆوە.» میتیا دەستی لە سەر دەموچاوی لابرد و پێکەنی. چاوی پڕ لە متمانە بوو. دەتگوت لە ساتێکدا

بۆتە مرۆڤێکی دیکە. تەواو ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتبوو. جارێکی دیکە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە ئاشنایەتیی لەگەڵ هەموویان بوو، بووبووە هاوڕێ. دەتگوت دوێنی، کە هیچ نەقەومابوو، لە بەزمێکدا یەکتریان دیوە. با بە شێوەیەکی سەرپێی وەبیرتان بێنەمەوە کە میتیا، کاتێک بۆ یەکەم جار دەچێتە ماڵی سەرۆکی ئاسایش زۆری ڕێز لێدەگرن، بەڵام دوای ئەوە بەتایبەت لە ماوەی مانگی ڕابردوودا، پێی بەوێدا نەچووبوو، کاتێکیش لە سەر شەقام سەرۆکی ئاسایش تووشی دەبوو، میتیا تێدەگەیشت کە نیوچاوانی تێکناوە و تەنیا بە هۆی ئەدەب و کەسایەتییەوە وەڵامی سڵاوەکەی دەداتەوە. ئاشنایەتییەکەی لەگەڵ دادوەر زۆر گەرموگوڕ نەبوو، ئەگەرچی هێندێ جار دەچوو بۆ دیدەنیی ژنەکەی، دیدارەکەشیان زۆر بە ئەدەبانە بوو، چونکە ژنێکی تووڕە و خەیاڵاوی بوو، بێ ئەوەی بزانێ بۆچی ئەو خاتوونە ئاوا بە گەرموگوڕی پێشوازیی لێدەکا. لەبەر هۆیەک هۆگریی پێ‌پەیدا کردبوو. دەرفەتی ئاشنایەتیی لەگەڵ بازپرس بۆ هەڵنەکەوتبوو. ئەگەرچی دووجار دیدار و وتوێژی لەگەڵ کردبوو، هەردوو جارەکەش باسی ژنیان کردبوو.

میتیا شاد و دڵخۆش پێدەکەنی، بە دەم قاقاکێشانەوە گوتی: «نیکۆلای پارفنۆویچ، دەزانم وکیلێکی زۆر شارەزای، بەڵام ئێستا لەخزمەتتدا هەم. ئاخ، بەڕێزان هەست دەکەم بوومەتە مرۆڤێکی دیکە. بە دڵنیایی‌یەوە نەگری کە ئاوا سادە و ڕاشکاوانە لەگەڵتا دەدوێم. ڕاستت دەوێ تا ڕادەیەک مەستم. نیکۆلای پارفنۆویچ، پێموایە شانازی، ئەو شانازیی و بەختەوەرییەم بە نسیب بووە و لە ماڵی خزمەکانم، ماڵی میۆسۆف بە خزمەتت گەیشتووم. بەڕێزان، براکانم، من خۆم بە هاوقەتاری ئێوە دەزانم. هەڵبەت دەشزانم لەبەرچی لە هەمبەر ئێوەدا دانیشتووم. ئاخ، بڕوا بکەن، گومانێکی ناجوامێرانە... لە دەوری سەرم دەسووڕێتەوە... ئەگەر گریگۆری شایەدیی دابێ... گومانێکی ناجوامێرانەیە! ناجوامێرانەیە، بەڕاستی ناجوامێرانەیە! ئەوە تێدەگەم! بەڵام بەڕێزان با بچینە سەر ئەسڵی مەتڵەب. من ئامادەم، هەر لەڕێوە کۆتاییی پێ‌دێنم؛ چونکە،

گوێبگرن، گوێبگرن، بەڕێزان! چونکە لێمڕوونە بێتاوانم، دەتوانم لە ماوەی دەقیقەیەکدا کۆتاییی پێبێنم. وانییە؟ وانییە بەڕێزان؟»

میتیا بە تووڕەیی، هێندە توند و خێرا خێرا قسەیدەکرد، وێدەچوو بیسەرانی بە چاکترین هاوڕێی خۆی بزانێ.

نیکۆلای پارفنۆویچ، بە لەبزێکی ڕەوان گوتی: «کە وایە ئێستا دەنووسم حاشا لەو تۆمەتە دەکەی»، خۆی بۆلای میرزا بنووسەکەی خوار کردەوە و پێی دیکتە دەکرد چی بنووسێ.

«ئەوە دەنووسن؟ دەتانەوێ بینووسن؟ چاکە بینووسن، بەڕێزان ڕەزایەت دەدەم، ڕەزایەتی تەواوم هەیە، بەڵام... بڕوانن... پەلە مەکەن، ئەمە بنووسن. سەبارەت بە کردەوەی ناحەز تاوانبارم، سەبارەت بە دەست هەڵێنانەوە لە پیرە پیاوێکی بێچارە تاوانبارم. شتێکی دیکەشم لەدڵدایە کە بۆ ئەویش خۆم بە تاوانبار دەزانم ـ بەڵام پێویست بە نووسین ناکا.» (میتیا لە ناکاو ڕووی کردە میرزا بنووسەکە) «بەڕێزان ئەوە ژیانی تایبەتیی خۆمە و پێوەندیی بە ئێوەوە نییە، دڵم وا دەڵێ... بەڕێزان، پێدەکەنن. بەو گومانەی خۆتان پێدەکەنن!...»

بازپرس کە دیاربوو هەوڵدەدا، بەو نەرمی نواندنە، میتیا خاو کاتەوە گوتی: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لەسەرەخۆ بە. بەر لەوەی بچینە سەر لێپرسینەوە، هەڵبەت ئەگەر پێتخۆشبێ وەڵام بدەیتەوە، دەمهەوێ لە زمانی خۆتی ببیستم کە لەگەڵ باوکت دانووتان پێکەوە نەدەکوڵا و، ڕقت لێیبوو و بەردەوام لەگەڵی بە کێشە دەهاتی. لێرە هەر چارەگێک لەمەوبەر خۆت دانت پیانا کە دەتویست بیکوژی: «گوتت نەمکوشت، بەڵام دەمویست بیکوژم؟»

ـ ئەوەم گوت؟ ئاخ، بەڕێزان، ڕەنگە هەروا بێ! بەڵێ، بۆ بەدبەختی دەمویست بیکوژم... زۆرجار بڕیارم دەدا... زۆرجار!

ـ دەتویست بیکوژی. دەکرێ پێمانبڵێی چ پاڵنەرێک بووە هۆی ئەوەی تا ئەو ڕادەیە ڕقت لە باوکت هەستێ؟

میتیا سەری داخستبوو، بە مڕومۆچی شانی هەڵتەکاند: «بەڕێزان پێویست بە گوتن ناکا! من هیچ کاتێک هەستی خۆمم نەشاردۆتەوە. تەواوی خەڵکی

شارەکە لەوە ئاگادارن - هەموو خەبەریان لە مەیخانەکە هەیە. هەر لەم دواییانەشدا لە حوجرەکەی باوە زووسیما نەمشاردەوە... و عەسری ئەو ڕۆژە لە باوکمدا. هێندەی نەمابوو بیکوژم، سوێندم خوارد دەگەڕێمەوە و حەیاتی لێدەبڕم، ئەویش لەبەر چاوی چەند شایەد.... ئاخ، هەزار شایەدا مانگی ڕابردوو بە دەنگی بەرز لە قاوم داوە، هەموو دەتوانن لەوبارەوە پێتان بڵێن! ڕاستی لەبەر چاوتاندا زەق بۆتەوە. وەک ڕۆژ ڕوونە، بە دەنگی بەرز هاوار دەکا، بەڵام ئیحساسات، بەڕێزان، ئیحساسات شتێکی دیکەیە.

«بڕوانن، بەڕێزان» (میتیا ناوچاوانی تێکنا) «پێموایە هەقتان نییە سەبارەت بە ئیحساسات پرسیارم لێبکەن. ئەوەش دەزانم کە ئێوە پێبەندی ئەرکی خۆتانن، زۆر چاک لەوە دەگەم. بەڵام مەسەلەی ئیحساسات پێوەندیی بە بارودۆخی ژیانی تایبەتیی خۆمەوە هەیە. سەرەڕای ئەوەش... چونکە لە ڕابردوودا ئیحساساتی خۆم دەرنەدەبڕی... بۆ وێنە لە مەیخانە لەلای هەمووان درکاندوومە. «هەر بۆیە.... ئێستاش نامەوێ لێتانی بشارمەوە... بڕوانن بەڕێزان، دەزانم کە ئەم مەسەلەیە ڕاستییەکی تێدایە کە بە زەرەدی من تەواو دەبێ. بە هەمووانم گوتووە دەیکوژم و ئێستا ئەو لە ناکاو کوژراوە. کەوایە زۆر وێدەچێ من کوشتبێتم! ها، ها! ئاغایان هەق بە ئێوەیە، بەڕاستی هەق بە ئێوەیە، من خۆشم سەرم سوڕماوە، چونکە جگە لە من کێ توانیویەتی بیکووژێ؟ مەسەلەکەش هەر ئەوەیە، مەگین نا؟ ئەگەر منیش نەبووم، کەوایە کێ بووە؟ هەروەها لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «بەڕێزان، دەمهەوێ بزانم، بۆ زانینیشی پێداگری دەکەم!» پاشان چاوی لە دوو وەکیل کرد و بە تاڵووکە پرسیی: لەکوێ کوژراوە؟ چۆن کوژراوە؟ چۆن و بە چێ؟ پێمبڵێن.»

دادوەر گوتی: «ئەومان لە ژووری متاڵا کردنەکەی دییەوە، کاژەڵاکی وردوپرد بووبوو و بە پشتدا کەوتبوو.»

«هەی داد و بێدادا» میتیا کەوتە لەرزین و هەنیشکی لە سەر کورسییەکە دانا و دەستی بەبەر دەموچاوییەوە گرت.

نیکۆلای پارفنۆویچ هەڵیدایە: «دەی پێمان بڵێ، چی بووە هۆی ئەوەی ئەوەندەت ڕق لە باوکت هەستێ؟ پێموایە لە حوزووری خەڵکدا گوتووتە بە هۆی بەخیلایەتییەوە بووە؟»

ـ بەڵێ بەخیلایەتی. هەر ئەوەش نا.

ـ دەمەقاڵێ لە سەر پارە؟

ـ بەڵێ لە سەر پارە.

ـ پێموایە دەمەقاڵێکەشتان لە سەر سێ هەزار ڕۆبڵ بووە، کە وەک بەشە ماڵ داوات کردووە؟

میتیا بە تووڕەیی گوڕاندی: «سێ هەزار زیاتر، زۆر زیاتر، زیاتر لە شەش هەزار، ڕەنگە زیاتر لە دە هەزاریش. ئەوەم بە هەموو کەس گوتووە، لە هەموو شوێنێک باسمکردووە. بەڵام بڕیارمدا بە سێ هەزار ڕۆبڵ ڕەزایەتی پێبدەم. چونکە زۆر زۆرم پێویستی بەو سێ هەزار ڕۆبڵە بوو... بۆیە ئەو چەکە پارەیەی کە سێ هەزار ڕۆبڵ بوو و دەمزانی ناویەتە ژێر باڵنجەکەی بۆ گرووشنکا، بە هەقی خۆمم دەزانی و دەتگوت پارەی خۆم بووە و لێم دزراوە. بەڵێ، ئاغایان وەک بەشە ماڵی خۆم چاوم لێدەکرد. بە هەقی خۆمم دەزانی...»

دادوەر چاوێکی ماناداری لە بازپرس کرد و بە دزییەوە چاوێکی لێقرتاند.

بازپرس لەڕێوە گوتی: «دوایی دەچینە سەر ئەو مەسەلەیە. ئیزن دەفەرمووی ئەوە یادداشت کەین کە بە چاوی بەشەماڵی خۆت لەو پارەیەت دەڕوانی؟»

«بەڵێ هەر لێی ڕامەوەستن، بینووسن. دەزانم ئەوەی بە زەرەدی منە شتێکی دیکەیە، بەڵام باکێکم لە ڕاستییەکان نییە و ئەگەر بە زەرەدیشم بێ هەر دەیڵێم، گوێتان لێیە؟» لە ناکاو خەمبار و مات درێژەی پێدا: «ئێوە لە من تێناگەن و پێچەوانەم لێحاڵین. ئێوە لەگەڵ مرۆڤێکی بەشەڕەف، مرۆڤێکی زۆر بەشەڕەف تێکەوتوون؛ لەوانەش گرینگتر ـ لەبیرتان نەچێ ـ مرۆڤێک کە دەستی بۆ زۆر کاری دزیو بردووە، بەڵام هەمیشە لە ناخی خۆیدا شەرافەتمەند بووە و هەر هەشە. نازانم چۆنتان عەرز بکەم. شتێک کە لە ماوەی تەمەنمدا تووشی

داماویی کردووم ئەوە بووە، هەر بۆیە بە ئاواتەوە بووم هەمیشە شەرافەتمەند بم و وەک دەڵێن، شەهیدی مانای شەڕەف بم. بە چراوە بە دوایدا بگەڕێم و بە چرای پیوسۆزەوە[2]. سەرەڕای ئەوەش، لە تەواوی ماوەی تەمەنمدا کاری دزێوی کردووە. وەک هەموومان، ئاغایان مەبەستم ئەوەیە تەنیا وەک خۆم، هەڵەمکرد، تەنیا وەک خۆم، هەر خۆم!... بەڕێزان سەرم دێشێ...» لەبەر ژانی سەری برۆی ویکهێنا و گرژ بوو. «بڕوانن بەڕێزان، چاوم بەرایی نەدەدا بیبینم، بە دیتنی دەتگوت کوێر بووم. شوورەیی و قیزەونییەک سەرتاپای داگرتبوو کە تەواوی شتە پیرۆزەکانی پێشێڵدەکرد، شتێکی دزێو و ناپاک، قێزەون، زۆر قێزەون. بەڵام ئێستا کە مردووە هەستێکی دیکەم هەیە.»

ـ مەبەستتان چییە؟

ـ هەستێکی دیکەم نییە، بەڵام بەداخەوم کە تا ئەو ڕادەیە ڕقم لێیبوو.

ـ هەست بە پەشیمانی دەکەی؟

ـ نا، نا پەشیمان نیم. ئەوە مەنووسن. خۆشم ئەوەندە باش نیم، ئەوەندە پاک نیم، بۆیە هەقم نییە ئەو بە دزێو و قێزەون بزانم. مەبەستم ئەوە نییە. ئەگەر پێتان خۆشە ئەوە بنووسن.

میتیا کە ئەوەی گوت، خەم دایگرت. لێپرسینەوە بەردەوام بوو، بەجارێ کەوتبووە گۆمی خەم و پەژارەوە. هەر لەو ساتەدا، دیمەنێکی چاوەڕوان نەکراوی دیکە هاتە گۆڕێ. ئەگەرچی گرووشنکایان بردبوو.بەڵام بۆ شوێنێکی دووریان ڕانەگوێستبوو، بردبوویانە وەتاغەکەی دیکە، پەنای وەتاغە شینەکە کە لێپرسینەوە لەوێ بەڕێوە دەچوو. وەتاغێکی چکۆلەی یەک پەنجێرە بوو، ڕاست لەولای وەتاغە گەورەکە بوو کە لەوێدا بەزم و ڕەزم و عەیش و نۆشیان دەکرد. گرووشنکا لەوێ دانیشتبوو، کەسی لەلا نەبوو، جگە لە ماکسیمۆف کە زۆر پەرۆش و بێئۆقرە بوو و دەتگوت بۆ پارێزگاری خۆی

---

2– مەبەست شیعرەکەی مەولەوییە کە حەکیمی بەناوبانگی یۆنانی بە (شێخ) دادەنێ:

شێخێ دەگەڕا دوێنێ لە شارا بە چراوە

جاڕز لە دڕندان و بە تاسەی مرۆڤەوەم.

پێوە هەڵواسیوە. لەبەر دەرگاکەدا لادێیەک ڕاوەستا بوو کە نیشانەی بە سەر سینگەوە بوو. گرووشنکا دەگریا، لە ناکاو ئاراوقارای لیٚهەڵگیرا و هەستایە سەرپیٚ، دەستی ڕاوەشاند و بە پڕمەی گریانەوە دەرپەڕی بۆ دەریٚ و هەڵات بۆلای، بۆلای میتیا، ئەویش هێندە کتوپڕ و چاوەڕوان نەکراو خۆی بە وەتاغی لیٚپرسینەوەدا کرد، هیچکەس فریا نەکەوت پێشی پیٚبگریٚ. میتیا بە بیستنی شین و گریانەکەی، لەرزی لیٚهات، لەجێی خۆی هەستا و بە گوڕە گوڕ و بە هەشتاو خۆی ڕاپسکاند و هەڵات بۆلای. بیٚ ئەوەی بزانیٚ چدەکا. بەڵام سەرەڕای ئەوەی چاویان بە یەکتر کەوت، نەیانهێشت لە یەکتر نزیک ببنەوە، قۆڵی میتیایان گرت، زۆری هەوڵدا خۆی لە دەستیان ڕاپسکێنیٚ بەڵام نەیتوانی، بە سیٚ چوار کەس گرتیان. گرووشنکاشیان گرت و کاتێک دووریان دەخستەوە، میتیا دیتی دەستی بۆلای ئەو درێژ کردووە. کاتێک میتیا وەخۆ هاتەوە، لە جێگای پێشوو بەرەوڕووی بازپرس دانیشتبوو و دەیگوڕاند بەسەریانا:

ـ بۆ دەست لە کۆڵ ئەو ناکەنەوە؟ بۆ ئازاری دەدەن؟ خۆ ئەو هیچی نەکردووە!...

دادوەر و هاوڕێکانی هەوڵیاندا دڵداریی بدەنەوە. دە دەقیقە بەو شێوە تێپەڕی. ئاخری میخاییل ماکارۆویچ، کە چووبووە دەریٚ، بە پڕتاو خۆی بە ژووریدا کردەوە و بە دەنگێکی پڕ لە هەیەجانەوە گوتی:

ـ بردیانە خواریٚ. بەڕێزان ئیزن بفەرموون دوو قسە لەگەڵ ئەم پیاوە ناشادە بکەم. بە حوزووری ئێوە بەڕێزان بە حوزووری ئێوە.

بازپرسەکە وەڵامی دایەوە: «ئیختیارت هەیە جەنابی میخاییل ماکارۆویچ، بەڵام خۆ هێشتا تاوانێکی لە سەر سابت نەبووە.»

سەرۆکی ئاسایش، کە دڵسۆزییەکی گەرم و تا ڕادەیەک باوکانە، دەرهەق بە بەندییەکی چارەڕەش بە ئەدگارییەوە دیاربوو، گوتی: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، گویٚ بگرە، خۆم ئاگرافنا ئەلکساندرفناتم بردە خواریٚ و بە کچەکانی کابرای خاوەن کاروانسەرام سپارد. ئەو ماکسیمۆفە پیرەش لێی دوور ناکەوێتەوە.

زۆرم دڵخۆشــی دایــەوە، گوێــت لێیــە؟ دڵخۆشــیم دایــەوە و ئــارامکردەوە. حاڵیمکرد کە تۆ دەبێ خۆت لەو تۆمەتانە پاک کەیتەوە، کەوایە نابێ بەرگریت لێبکا، نابێ پەرێشانت کا، دەنا لەوانەیە سەرت بە فەتەڕات بدەی و لەبەر ئاڵۆزی قسەیەکت لە دەم دەرچێ، بە زەرەدت تەواو بێ. قسەم لەگەڵ کرد و ئەویش تێگەیشت. کوڕی چاک، دەزگیرانەکەت کچێکی ماقووڵە. کچێکی ڕۆحسووکە و داوای یارمەتیی بۆ دەکردی و دەپاڕایەوە، ئەگەر بمهێشتبایە دەستمی ماچ دەکرد. خۆی منی نارد کە پێتبڵێم خەمت نەبێ. ئێستا دۆستی بەڕێز، دەبێ بچم، دەبێ بچم و پێیبڵێم هێور بوویەتەوە و لەمەڕ ئەوەوە خەیاڵت تەختە. دەبێ ئارام بێتەوە، تێدەگەی؟ هاوڕێیان من دەرهەق بەم پیاوە بێ ئینسافیم کرد؛ ئەو پیاوێکی مەسیحییە، بەڵێ ئەگەر بە گوێی من دەکەن پیاوێکی نەجیمە و نابێ سەرکۆنە بکرێ. دەی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ چی بە باش دەزانی پێیبڵێم، هەدا دەدەی یان نا؟»

سەرۆکی ئاسایش، دڵپاکانە زور شتی نایاساییی دیکەی بە دەمدا هات، بەڵام ئازاری گرووشنکا، ئازاری مرۆڤێک، شوێنی لە سەر دڵە پاکەکەی دانا و فرمێسک لە چاویدا قەتیس ما. میتیا هەستایە سەرپێ و هەڵات بۆلای.

گوڕاندی: «بەڕێزان، بمبوورن، ئاخ ئیزنم بدەن، ئیزنم بدەن! میخاییل ماکارۆویچ دڵی تۆ وەک فریشتە وایە، لە لایەن گرووشنکاوە سپاسی ئێوە دەکەم. دڵم ئارام دەبێتەوە، دڵم دەحەسێتەوە و زەردە دەزێتە لێوم. بەوپەڕی دڵۆڤانی و دڵپاکییەوە پێی بڵێ، کە هەر ئێستا پێدەکەنم. چونکە دەزانم فریشتەیەکی پارێزەری وەک تۆی هەیە. هەر ئێستا لەم کێشەیە ڕزگارم دەبێ و هەر لەگەڵ ڕزگاربوونم دێم بۆلای، پێی بڵێ دڵنیابێ و جارێ سەبر بگرێ.» پاشان ڕووی کردە دوو بازپرسەکە و گوتی: «بەڕێزان، ئێستا هەرچی لە دڵمدایە بۆتانی هەڵدەڕێژم؛ ئەوی لە دڵمدایە. هەر ئێستا کۆتایی بەو مەسەلەیە دێنین. بە شادی و خۆشی کۆتاییی پێدێنین. لە دواییشا پێکەنیمان بەو مەسەلەیە دێ، مەگین وا نییە؟ بەڵام ئاغایان، ئەو ژنە شاژنی دڵمە. ئاخ، واچاکە ئەوەتان پێبڵێم. ئەو شتەتان ئێستا پێدەڵێم... وادیارە لەگەڵ کەسانێکی بە

شـەڕەف تێکـەوتـووم. ئـەو ڕووناکیی ژیانمـە. خودامـە، خۆزگـە دەتـانزانی! خـۆ گوێتان لێبوو بە گریانـەوە دەیگوت: «ئێستا ئامادەم لـەگـەڵیا سـەرم بـە پـەتـی سێدارەوە کرێ.» ئاخر منی سوالکەری هیچوپووچ چیم بۆ کردووە؟ من کوا شیاوی ئەو خۆشەویستییەم؟ ئاخر بوونەوەرێکی گلاو و چەپڵی وەک من، بەو ڕوخسارە دزێوەوە، چۆن دەتوانێ شیاوی ئەشقی ئەو بێ و ئامادە بێ لەگەڵمدا شار بەدەریش بکرێ؟ مەگین نەتاندی هـەر ئێستا لـەبـەر خاتری من خـۆی بـە سـەر کـەوشـەکانتدا خست؟ سـەرەڕای ئـەوانـەش ئـەو زۆر لـەخۆباییە و هـیچ کارێکی نەکردووە! چۆن دەتوانم دەست لە خۆشەویستی و پەرستنی هـەڵگرم، چـۆن دەتـوانم دەسـت لـە هـاوارکردن و ڕاکـردن بـۆلای، هـەروەک سـاتێ لەمەوبەر، هەڵگرم؟ بەڕێزان بمبوورن! بەلام ئێستا، ئێستا دڵنیابووم.»

خۆی دابـەسـەر کورسییەکـەدا و بـە هـەردوو دەستی دەمووچاوی گرت و دای لە هۆڕژنی گریان. بەڵام فرمێسکەکانی فرمێسکی شادی بوو. خێرا وەخۆ هاتـەوە. سـەرۆکـی ئاسـایش زۆر دڵخـۆش و ڕازیبـوو و وەڤـدی داوەرانـیش هـەروا. هـەستیاندەکرد لێپرسینەوەکە گـەیشتۆتە قۆنـاخێکی تـازە. سـەرۆکـی ئاسایش کە ڕۆیشتە دەرێ، میتیا گەشایەوە.

ـ ئێستا لە ئیختیاری ئێوەدام بەڕێزان، بە تـەواوی لـە ئیختیارتـان دام. ئـەگـەر لەبەر ئەو هەموو شتە بێبایەخانە نەبوایە، لەڕێوە لە یەک تێدەگەیشتین. دیسان هاتمەوە سەر شتە بێبایەخەکان. ئاغایان، لە ئیختیاری ئێوەدام.

بەڵام با ئەوەش بڵێم، دەبێ متمانەمـان بـە یـەکتر هـەبێ، مـن بـڕوام بـە ئێوە هەبێ و ئێوەش بە من، ئەگەر وانەبێ ئەو مەسەلەیە کۆتایی پێنایە. بە قازانجی ئێوە قسە دەکەم. با بچینـە سـەر بابـەتی سـەرەکی، بـەڕێزان، با بچینـە سـەر بابەتی سەرەکی. بەڵام ڕۆحم مەکۆڵن؛ بەو پرسیارە بێبایەخانە ئازارم مـەدەن. تەنیا باسی ڕاستییەکان و ئەو شتانە بکەن کە بایـەخی هـەیە. پرسیارم لێبکـەم، منیش خاترجەمتان دەکەم.

میتیا بەم شێوەیە قسەی کرد و لێپرسینەوە دەستی پێکردەوە.

## (٤)

# ئازاری دووهەم

نیکۆلای پارفنۆویچ بە قەڵافەتێکی قۆز و ڕەزایەتێکی ئاشکراوە کە لە چاوە خۆڵەمێشینییە نزیک بینەکەیدا، کە تاوێک لەمەوبەر چاویلکەکەی لە سەر داگرتبوو، گوتی: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، نازانی بەو ئامادەیی دەربڕینەتان بۆ وەڵامدانەوە چەندەمان دڵگەرم دەکەی. سەبارەت بەو متمانە دوولایەنەش کە باست کرد زۆر قسەیەکی جوانە. کە بەبێ ئەوە هێندێ جار لە بارودۆخێکی وەک ئێستادا، کە کەسە تۆمەتبارەکە لە ڕاستیدا هیوادارە و دەیهەوێ بەرگری لە خۆی بکا و دەکەوێتە بارودۆخێکەوە کە کارێکی ئاوا بکا، بە ئاکام گەیاندنی مەسەلەکە زۆر دژوارە. ئێمە لەلایەن خۆمانەوە، ئەوەی لە تواناماندا بێ دریغی ناکەین خۆشت ئاگات لێیە چۆن لە پەروەندەکە دەکۆڵینەوە.» پاشان ڕووی کردە دادوەر و پرسیی: «قەبووڵتە، جەنابی ئیپۆلیت کیریلۆویچ؟»

دادوەر وەڵامی دایەوە: «بەڵێ، بێگومان.» لەبزەکەی لەچاو قسە نەکولاوەکانی نیکۆلای پارفنۆویچ هەتا ڕادەیەک سارد و سڕ بوو.

هەر لەڕێوە با ئەوە بڵێم، نیکۆلای پارفنۆویچ کە ماوەیەک بوو ماڵی هاتبووە شارەکەمان، هەر لە سەرەتای هاتنەکەیەوە ڕێزێکی زۆری بۆ دادوەرەکەمان ئیپۆلیت کیریلۆویچ دادەنا و کەموزۆر بووبووە هاوڕێی گەرماو و گوڵستانی. ئەو یەکەم کەس بوو کە بڕوایەکی تەواوی بە مرخی کەم وێنەی ئیپۆلیت کیریلۆویچ هەبوو و هەروەها بە ڕەوانناس و ئاخێوەری

دەزانی و سکالاکانی بە بەرهەق دەزانی. لە پترزبۆرگ نەقڵی ئەوی بیستبوو. لەلایەکی دیکەشەوە نیکۆلای پارفنۆویچ، لاوێک بوو لە تەواوی دنیادا تەنیا کەسێک بوو کە دادوەرە «بێچاو و ڕووەکەمان» ڕێزی بۆ دادەنا. کاتێک بەرەو گوندی ماکرۆیە بەڕێوە بوون سەبارەت بە لێکۆڵینەوە لە سەر ئەم پەروەندەیە پێکهاتبوون. ئێستاش هەروا لە پشت مێز دانیشتبوون، لاوی بەهۆش هەموو ئاماژەیەکی لە چاو و دەمی هاوکارە گەورەکەی وەردەگرت و لێکی دەدایەوە، هەروەها هەموو نیگایەک و چاو قرتاندن و وتەیەکی نیوەچڵیش.

میتیا بە شێواوی گوتی: «بەڕێزان، تەنیا لێمگەڕێن با قسەی خۆم بکەم، بە پرسیاری هیچوپووچ قسەکەم پێمەبڕن. هەر ئێستا هەموو شتێکتان پێدەڵێم.»

- بژیی! سپاست دەکەین. بەڵام بەر لەوەی گوێ بۆ قسەکانت ڕاگرین، ئێزن بفەرموو سەبارەت بە ڕاستییەکی چکۆڵەی دیکە کە بەلامانەوە زۆر گرینگە، پرسیارت لێبکەین. مەبەستم ئەو دە ڕۆبڵەیە کە دوێنێ نزیکەی سەعات پێنج دەمانچەکانت لە بارمتەیدا دانا و یانی دە ڕۆبڵت لە پیووتێر ئیلیچ پێرخۆتین قەرز کرد.

- بەڕێزان، ئەو دەمانچانەم بە بارمتە دانا، لە گرەوی دە ڕۆبڵدا دامنان. ئیترچی؟ هەر ئەوەندە. لەگەڵ گەڕانەوەم بۆ شار، لە گرەوم نان.

- گەڕایەوە بۆ شار؟ کەوایە لە شاریش چوویە دەرێ؟

– بەڵێ، چووم بۆ گوندێک لە بیست و پێنج کیلۆمەتریی شار. بۆ نەتانزانیوە.

دادوەر و نیکۆلای پارفنۆویچ چاوێکیان لە یەکتر کرد.

– چاکە، چۆنە بەسەرهاتەکەمان ڕێکوپێک و موو بە موو لە دوێنێ بەیانییەوە تا ئەمڕۆ بۆ بگێڕیتەوە. بۆ وێنە، ئێزن بفەرموو لێت بپرسین بۆ لە شار چووبوویە دەرێ؟ سەعات چەند ڕۆیشتی و سەعات چەندەش گەڕایەوە

- بە وردی هەموویمان بۆ بگێڕەوە.

میتیا بە قاقای پێکەنینەوە گوتی: «دەبوو هەر لە سەرەتاوە ئاوام پرسیار لێبکەن، ئەگەر پێتان خۆش بێ بەسەرهاتەکە لە دوێنێوە دەست پێناکەین، بەڵکو لە پێرێ بەیانییەوە؛ چونکە ئاوا باشتر تێدەگەن چۆن و بۆچی و بۆ کوێ چووم. بەڕێزان، پێرێ چووم بۆلای سامسانۆف کە بازرگانێکی شارەکەمانە، تاکو بارمتەیەکی جێی متمانەی لەلا دانێم و سێ هەزار ڕۆبڵی لێوەرگرم. ئاغایان کارێکی پێویست و بەپەلەم بەو پارەیە هەبوو.»

دادوەر بەئەدەبانە گوتی: «ئیزن بفەرموو قسەکەت پێببڕم. بۆ وا کتوپڕ پێویستت بەو بڕە پارەیە، یانی سێ هەزار ڕۆبڵ هەبوو؟»

ـ بەڵێ بەڕێزان پێویست ناکا باسی ئەو شتە ناسەرەکییانە بکەین. چۆن و کەنگێ و بۆ، بۆ ئەو بڕە پارەیە و بۆ ئەوەندە نا، ئەمانە هەموو قسەی قۆڕن. کە حەفتا مەنی کاغەز دەوێ و دەبێتە بەیتی بلە!

میتیا ئەم قسانەی بە لەبزێکی سادە و بێ گرێوگوڵ و دڵسۆزانە گێڕایەوە و دیاربوو تامەزرۆیە ئەوی ڕاستییە مووبەموو بێدرکێنێ.

وتەکەشی بەپەلە و خێرا بەم شێوەیە پشتڕاست کردەوە: «بەڕێزان ـ دیسان تکاتان لێدەکەم ئەگەر بێئەدەبی و ڕووهەڵماڵدراوییەکتان پێوە دیم، بە دڵییەوە مەگرن. بڕوام پێبکەن ڕێزێکی زۆرم هەیە بۆتان و لە بارودۆخی ڕاستەقینەی ئەرکەکەشتان دەگەم. پێتان وا نەبێ مەستم و ئاگام لەخۆم نییە. ئێستا تەواو مەستییەکە لە سەرم پەڕیوە. ئەوەش بەجێی خۆی، من بە مەستیش ئەوەندە تێکناچم بەیتەشە بم. بڕوام پێبکەن ئەم وتەیە دەڵێی بۆ من گوتراوە: «ئەگەر وشیار بێ گەوجە و مەستیش بێ ژیرە.» ها، ها! بەڵام ئاغایان، دەزانم گاڵتە کردن بە ئێوە کارێکی جوان نییە، یانی لە کاتی لێپرسینەوەدا. چونکە نابێ غرووری خۆشم پێشێلکەم. تەواو لەو مەسەلەیە دەگەم. هەرچی بێ ئێستا من وەک پیاوکوژێک لە هەمبەر ئێوەدا دانیشتووم، کەوایە هاوشانی ئێوە نیم. بۆیە ناچارن وەقسەم بێنن و بمخەنە ژێر چاوەدێری. منی دڵڕەق گریگۆریی بەستەزمانم بەو دەردە بردووە و نابێ چاوەڕوانی لاواندنەوەش بم، چونکە هەرکەسێک بەقەد سەرە دەرزییەک ئەقل

و ویژدانی هەبێ سەری پیرە پیاوێکی ئاوا ناشکێنێ. پێموایە لە سەر ئەو کارە دەبێ شەش مانگ یان ساڵێک لە کونە ڕەشدا ئاوی سارد بخۆمەوە. نازانم سزاکەم چییە ـ بەڵام دەرەجەکەم لێ دەستێننەوە، وا نییە، بەڕێزان؟ کەوایە بۆتان دەرکەوت کە جیاوازیی نێوان خۆم و ئێوە دەزانم... بەڵام دەبێ ئەوە بزانن، ئێوە بەو پرسیارانەتان سەر لە خوداش دەشێوێنن «چۆنت هەنگاو هەڵێناوە؟ پێت لەکوێ دانا؟ کەنگێ لاقت هەڵێنا و داتنایەوە و پێت لەچی نا؟» ئەگەر ئاوا بڕۆنە پێشێ، دۆ و دۆشاو تێکەڵدەکەم و ئێوەش تەواوی تاوانەکان دەخەنە ئەستۆم. دەی کارەکەمان بە کوێ دەگا؟ بە هیچ کوێ! کەوایە ئەگەر ئێستا قسەی قۆڕیش دەکەم، لێمگەڕێن با بیکەم و کارەکە کۆتایی پێ‌بێنین. بەڕێزان ئێوە کە خاوەن شەڕەف و ئادابن، بە گەورەیی خۆتان بمبوورن. ئاغایان با عەرزتان بکەم، تکایە شێوەی ئاسایی لێ‌پرسینەوە وەلانێن، یانی لێ‌پرسینەوەکەتان بەم پرسیارە قۆڕانە دەست پێ‌مەکەن کە چۆن لە خەو هەستای، ناشتایی چیت خوارد، چۆن تفت کردەوە و لەکوێ تفت کردەوە. بەو قسانە تۆمەتبار چەواشە دەبێ و لە ناکاو بە پرسیارێکی قۆڕ و سەرسووڕهێنەر دایدەچڵەکێنن، «کێت کوشتووە؟ کێت تالان کردووە؟؟» ها، ها! ڕەوشتی ئاسایی ئێوە ئاوایە. تەواوی فێڵ و دەهۆکانی ئێوەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێ. ئێوە دەتوانن لادێییەکان بەو شێوەیە سەر تەڵە پەڕێنن، بەڵام من، ئاگاداری هەموو فێڵێکم. منیش خزمەتم کردووە. ها، ها، ها!» میتیا، کە بە خولک خۆشییەکی سەرسوڕ هێنەرەوە تێی دەڕوانین گوتی: «بەڕێزان، لە دەست من قەڵس مەبن؟ بمبوورن دەمدرێژی دەکەم! میتیا کارامازۆفە ئێتر، بۆیە دەتوانن چاوپۆشیی لێبکەن. دەکرێ قسەی پیاوێکی ئاقڵ بەدڵەوە بگری، بەڵام قسەی میتیا بەدڵەوە ناگیرێ، ها، ها!»

نیکۆلای پارفنۆویچ گوێی گرتبوو و پێدەکەنی. ئەگەرچی دادوەر پێنەکەنی، بە وردی چاوی لە میتیا بڕیبوو، دەتگوت تامەزرۆیە لە چکۆلەترین هیجا و چکۆلەترین جووڵە و چکۆلەترین گرژی و ڕەنگ تێکچوونی خافڵ نەبێ.

نیکۆلای پارفنۆویچ هەروا بە پێکەنینەوە گوتی: «هەر لە سەرەتاوە هەڵسووکەوتمان وابووە لەگەڵتا. نەشمان ویستووە بە پرسیاری چۆن لە خەو هەستاوی و ناشتا چیت خوارد، سەرت لێ بشێوێنین. لە ڕاستیدا لێپرسینەوەکەمان بە پرسیاری زۆر گرینگ دەستپێکرد.»

ــ دەزانم. تێگەیشتم، زۆریشتان سپاس دەکەم، کە زۆر دڵسۆزانە هەڵسووکەوتتان لەگەڵ کردم و بە ڕاستی دڵسۆزییەکی بێوێنە بوو، هەر ئەوەش لە گەورەییی ئێوە دەوەشێتەوە، بۆیە لە ناخی دڵەوە سپاستان دەکەم. ئێمە هەرسێکمان مرۆڤگەلێکی شەریفین، لێگەڕێن با هەموو شتێک لە سەر بنەمای متمانەی دوولایەنە لە نێوان ئێمەی خوێندەوار و بەئەدەبدا بێ، کە بە هۆی پێوەندیی هاوبەشی شەرف و ڕەسەنایەتییەوە لێک نزیکن. هەرچۆنێکە ئیزنم دەنێ لەوساتەی ژیانمدا، لەم ساتەدا کە شەڕەفم کەوتۆتە بەر شالاو، بە چاوی چاکترین هاوڕێی خۆم لە ئێوە بڕوانم. بەڕێزان، خۆ بێ ئەدەبیم نەکردووە؟

نیکۆلای پارفنۆویچ بە شێوەیەکی نەرم و لەسەرەخۆ گوتی: «بەعەکسەوە ئێوە لە وتەکانتاندا زۆریش ڕووڕاست و هێدی بوون.»

میتیا بە گەشەونەشەوە دەنگی هەڵێنا: «بەڕێزان، پرسیاری بێبایەخ و فیلاوی وەلانێن! دەنا خودا دەزانێ کارەکەمان بە کوێ دەگا! وانییە؟» دادوەر ڕوویکردە میتیا و گوتی: «مووبەموو ئامۆژگارییە ئاقڵانەکانتان لە گوێ دەگرم. سەرەڕای ئەوەش لە پرسیارەکەی خۆم پاشگەز نابمەوە. ئێستا بۆ ئێمە زۆر گرینگە و دەمانەوێ بزانین بۆ پێویستیت بەو بڕە پارەیە بوو، مەبەستم ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەیە.»

ـ بۆ پێویستم بوو؟... ڕاستت دەوێ بۆ دوو سێ شت... زیاتر بۆ ئەوە بوو قەرزێکم لە سەر بوو، دەمویست بیدەمەوە.

ـ قەرزی کێت لە سەر بوو؟

ـ بەڕێزان، وەڵامی ئەو پرسیارە بە هیچ شێوەیەک نادەمەوە. نەک لەبەر ئەوەی نەوێرم بیڵێم، یان نەتوانم، یان لەبەر ئەوەی بەزەرەدم تەواو دەبێ.

چونکە مەسەلەیەکی بێبایەخ و قۆڕە و هیچیتر - بۆیە نایڵێم، چونکە پێوەندیی بە ژیانی تایبەتی خۆمەوە هەیە. هیچ کەس هەقی نییە خۆ لە ژیانی تایبەتیم هەڵقوتێنێ. ئەمە بیروڕای منە. پرسیاری ئێوە هیچ پێوەندییەکی بە پەروەندەکەوە نییە و هەر شتێکیش پێوەندیی بە پەروەندەکەوە نەبێ، ئەمرێکی تایبەتییە و ئێوە هەقتان بەسەریەوە نییە. دەمویست قەرزێک بدەمەوە. دەمویست بە دانەوەی ئەو قەرزە دڵ و ویژدانی خۆم ئاسوودە کەم. جا بەکێش قەرزدارم، مەحاڵە پێتانبڵێم.

دادوەر گوتی: «ئیزن بفەرموو با ئەوە بنووسین.»

- فەرموون. بینووسن کە نامەوێ بیڵێم. بنووسن گوتنەکەیم پێ شوورەییە. بەڵێ دەتوانن بینووسن، خۆ لەوە زیاتر کارێکی دیکەتان نییە.

دادوەر بە لەبزێکی جیددی گوتی: «جەنابی بەڕێز، ئیزن بدە پێتراگەیەنم و جارێکی دیکە وەبیرت بێنمەوە، هەڵبەت ئەگەر ئاگاداریت لێی نەبێ، هەقتە وەڵامی ئەو پرسیارانە نەدەیەوە کە لێت دەپرسین. ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە هەقمانە بە زۆر وەڵامت لێوەرگرین، ئەگەر خۆت لەبەر هەر هۆیەک نەتەوێ وەڵامی بدەیەوە. ئەوەش مەسەلەیەکە بە تەواوی پێوەندیی بە بڕیاری خۆتەوە هەیە. بەڵام لەلایەکی دیکەوە، ئێمە ئەرکی سەر شانمانە کە سەبارەت بە پەروەندەیەکی وەک ئەم پەروەندەی ئێستا، ڕوون کردنەوەیەکمان هەبێ و بڵێین کە بە وەڵام نەدانەوە و نەدرکاندنی هێندێ لە ڕاستییەکان تۆمەتبار چەندە زیان بە خۆیان دەگەیەنن. ئێستاش تکاتان لێدەکەم درێژە بە قسەکانتان بدەن.»

میتیا بە لەبزێکی خەماوی، لەبن لێوەوە گوتی: «بەڕێزان، من تووڕە نیم.... من.... بەڵێ، ئاغایان، بڕوانن، سامسانۆف کە ئەو کاتە چووم بۆلای...»

هەڵبەت نەقڵی ئەو چوونەی بۆلای سامسانۆف خوێنەر خۆی دەزانێ و دیسان نایگێڕمەوە. میتیا بێسەبرانە تامەزرۆ بوو بیگێڕێتەوە و چکۆلەترین مەسەلە نەپەڕێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا بەپەلە بوو کۆتاییی پێبێنێ. بەڵام هەروا کە دەدوا، قسەکانیان دەنووسییەوە، هەر بۆیە لە پەستا قسەکەیان پێدەبڕی.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچیش ئەوەی پێخۆشنەبوو، بەڵام تەسلیم بوو. زۆری ڕق هەستابوو، بەڵام هەروا بە ڕووخۆشی قسەی دەکرد. جارجاریش هەڵدەچوو: «ئاغایان بەسسە ئیتر، ئێوە فریشتەش وەڕەز دەکەن!» یان، «ئاغایان، ئیتر لەوە زیاترم ئیمان هەردە مەکەن.»

بەڵام ئەگەرچی ئەوەی گوت، تا ماوەیەک بە دڵفراوانی تاقەتی هێنا. تا هاتە ئەو جێیەی گوتی سامسانۆف دوو ڕۆژ لەمەوبەر گەمەی پێکردم. (تا ئێستا بە تەواوی تێگەیشتبوو کە گەمەی پێکراوە.) فرۆشتنی سەعاتەکەی بە شەش ڕۆبڵ، بۆ وەدەستهێنانی پارەی ڕێگا، بازپرسەکانی تووشی سەرسوڕمان کرد. زۆریان پێخۆشبوو ئاکامەکەی بزانن، تەنانەت لە کاتی ڕقهەستانی میتیادا، بە پێویستیان زانی ئەم ڕاستییە وەک قەبوولکردنێکی دیکەی بارودۆخەکە یادداشت بکەن، کە ئەو کاتە تەنانەت تاقە کۆپکێکی لە گیرفاندا نەبووە. میتیا وردە وردە جاڕز بوو. کاتێک لە باسی سەفەرەکەیدا هاتە سەر ئەوەی بۆ دیتنی لیاگافی چووە و شەوی لەوماڵۆچکە سامناکەدا ڕۆژ کردۆتەوە و گەیشتە ماجەرای گەڕانەوەی بۆ شار. لێرەدا بێ ئەوەی ناچاری کەن، دەستیکرد بە گێڕانەوەی وردی ئازار و بەخیلی و خانەگومانی، کە لەبەر خاتری گرووشنکا شانی وەبەر دابوو.

بەبێ بێدەنگی و بە وردی گوێیان بۆ قسەکانی ڕاگرت. ئەوان بەتایبەت داوایان لێکرد بچێتە سەر باسی چۆنیەتیی بۆسە نانەوەکەی لە ماڵی ماریا کیندراتتیفنا، کە دەکەوێتە پشت باخەکەی فیۆدۆرپاولۆویچ و ئاگادار کردنی ئیسمیر دیاکۆف، پێداگرییەکی تایبەتیان لە سەر ئەم بابەتە کرد و یادداشتیان کرد. میتیا بە وردی و گەرموگوڕی باسی خانەگومانییەکەی خۆی کرد، ئەگەرچی پێشتر تایبەتیترین ئیحساساتی خۆی ئاشکرا نەدەکرد و بە «شوورەییی» دەزانی، لە ناخەوە هەستی بە شەرمەزاری دەکرد. بەڵام بۆ درکاندنی هەقیقەت ڕواڵەتەن بە سەر شەرمی خۆیدا زاڵبوو. لە کاتی قسە کردنەکەشیدا دادوەر و بازپرس وایان چاو تێبڕیبوو، میتیا بەجارێ پێی تێکچوو.

به کەسەرباری بیریکردەوە: «ئەم کوڕە، نیکۆلای پارفنۆویچ، کە چەند ڕۆژ لەمەوبەر ئەو قسە قۆڕانەی سەبارەت بە ژنان لەگەڵ باسکردبوو، ئەو دادوەرە سیلۆخەش، شیاوی ئەوە نین قسەیان بۆ بکەم. بەڕاستی شوورەییە.» بیر کردنەوەکەشی بەم ڕستە شیعرە کۆک کرد: "خۆڕاگر و خاکەڕا بەو دەنگە مەکە"[3]. بەڵام خۆی ڕاستەوپاستە کرد بۆ ئەوەی دیسان درێژە بە قسەکانی بدا. کە گەیشتە سەر بابەتی دیدارەکەی لەگەڵ مادام خۆخلاکۆف، ورەی هاتەوە بەر، مەیلی لێبوو باسی ئەو خاتوونە بکا، ئەگەرچی پێوەندیی بە پەروەندەکەوە نەبوو. بەڵام بازپرس نەیهێشت لەسەری بڕوا و بەئەدەبانە پێشنیاری پێکرد بچێتە سەر باسی «بابەتە بنەڕەتییەکان» ئاخری کاتێک باسی ناهومێدییەکەی کرد و گوتی لە ماڵی مادام خۆخلاکۆف هاتمە دەرێ، لە دڵی خۆمدا گوتم هەرچۆنێک بێ دەبێ سێ هەزار ڕۆبڵ وەگیر خەم. «تەنانەت ئەگەر بۆ وەدەست هێنانەکەی ناچار بم کەسێک بکوژم.» دیسان قسەکەی پێبڕی و نووسییان کە «قەستی بووە کەسێک بکوژێ.» میتیا بێ ئەوەی ناڕەزایەتی دەربڕێ هێشتی بینووسن. ئاخری گەیشتە ئەو بەشەی گێڕانەوەکەی کە خەبەری زانی گرووشنکا فریوی داوە و لە ماڵی سامسانۆف، سێ چوار دەقیقە دوای ڕۆیشتنەکەی، گەڕاوەتەوە، ئەگەرچی گوتبووی هەتا نیوەشەو لەوێ دەبێ. لەم شوێنەی گێڕانەوەکەیدا لە ناکاو لە زمانی هەڵخلیسکا: «ئاغایان، ئەگەر ئەو کاتە فینیام نەکوشت، تەنیا لەبەر ئەوە بوو کە دەرفەتم نەبوو.» ئەوەشیان بە وردی تۆمار کرد. میتیا بە حاڵەتێکی خەمناکەوە بێدەنگ بوو. خەریک بوو باسی هەڵاتن بەرەو باخەکەی باوکی دەگێڕایەوە کە کتوپڕ بازپرس قسەکەی پێبڕی و پاکەتی گەورەی پەروەندەکەی لە سەر قەنەفەکەی پەنای هەڵگرت و دەسکاوەنگێکی برنجیی دەرهێنا، پێشانی میتیای دا و لێیپرسی:

ـ ئەو دەسکاوەنگە دەناسییەوە؟

---

3- دێڕێک لە شیعرێکی تیۆتیێچۆفە، بە ناوی «بێدەنگی.»

میتیا بزەیەکی خەماوی نیشتە سەر لێوی: «ئاخ، بەڵێ. زۆر چاکی دەناسمەوە. دابێنە با تەماشای کەم... باکێکم نییە... بەجحەندەم!»

بازپرس گوتی: «لەبیرت چوو باسی ئەوە بکەی.»

ـ سپاس بۆ ئەو کارەتان، نەمدەشاردەوە. پێتان وایە بەبێ ئەوە کارەکەم ئاسان دەبێتەوە؟ هەر لە خۆڕا لەبیرم نەبوو باسی ئەوە بکەم.

ـ تکایە بە وردی پێمانبڵێ چۆن بوو دەستت دا ئەو دەسکاونگە؟

ـ بەڕێزان، حەتمەن عەرزتان دەکەم.

پاشان میتیا باسی هەڵگرتنی دەسکاونگەکە و هەڵاتنی خۆی کرد.

ـ ئەی بە هەڵگرتنی ئەو ئاسنەواڵەیە، چ ئامانجێکت هەبوو؟

ـ چ ئامانجێک؟ هیچ. هەر لەخۆڕا هەڵمگرت و هەڵاتم.

ـ ئەی ئەگەر هیچ ئامانجێکت نەبوو، بۆ هەڵتگرت.؟

میتیا هەڵچوو: « بە وردی چاوی «لەو کوڕە» کرد و بزەیەکی تاڵ کەوتە سەر لێوی. کاتێک باسی بەخیلی و خانەگومانییەکەی، بەو هەموو سەداقەت و دڵە سافەوە بۆ «ئەو مرۆڤانە» درکاند، زیاتر لە پێشوو هەستی بە شەرمەزاری کرد.

لەناکاو لە دەمی دەرپەڕی: «بەقوڕمدا کرد چ دەسکاوەنگێکە!»

ـ بەڵام هێشتا...

ـ لە ترسی هێرشی سەگەڵ هەڵمگرت... چونکە زۆر تاریکبوو... گوتم نەوەک سەگێکی دڕ هێرشم بۆ بێنێ.

ـ بەڵام بەر لەوە کاتی چوونە دەرێ، لەبەر ئەو هەموو ترسانە لە تاریکی، چەکت لەگەڵ خۆت دەبرد؟

میتیا کە کاسەی سەبری پڕ بووبوو، هاواری کرد: «ئاخ، سپاس بۆ کردەوەتان، بەڕێزان! قسەکردن لەگەڵ ئێوە کەڵکی نییە!» پاشان ڕووی کردە میرزا بنووسەکە و لەبەر تووڕەیی سوور هەڵگەڕابوو و بە دەنگێکی قیناوی و گەرووی بوغز گرتووەوە، گوتی: «زووکە بنووسە... خێراکە دەی... بنووسە

دەسکاوەنگێکم هەڵگرت و چووم بۆ کوشتنی باوکم. دەمویست بەو دەسکاوەنگە سەری بڕەقێنمەوە.»

چاوێکی جینگیزییانەی لە بازپرسەکان کرد و گوتی: «دەی ئاغایان، ئێستا، دڵتان حەساوە؟ ڕازیبوون؟»

دادوەر لە وەڵامی میتیادا بە لەبزێکی وشک گوتی: «ئێمە لێمان ڕوونە لەبەر تووڕەیی وەڵامی پرسیارەکانمان دەدەیتەوە، پرسیارێک کە بە هیچ و بێبایەخی دەزانی و ئێستا دەرکەوت گرینگ و بنەڕەتین.»

- چاکە، ئاغایان، بە شەرەفم سوێند دەخۆم! بەڵێ دەسکاونگەکەم هەڵگرت... لەو کاتانەدا، پیاو شتێکی وا بۆچی هەڵدەگرێ؟ نازانم بۆچی. هەڵمگرت و هەڵاتم - هەر ئەوە. بەڕێزان شوورەییە، دەنا بڕیارمدەدا یەک وشەی دیکەتان پێنەڵێم.

هەنیشکی نایە سەر مێزەکە و سەری کردە سەر لەپی دەستی و ڕووی لێ وەرگێڕان. سەری لەگێژەوە دەهات و خەریک بوو پەرۆش بکا، بەڵام هەوڵی دەدا و دانی بەخۆیا دەگرت و چاوی لە دیوارەکە بڕیبوو. لە ڕاستیدا زۆری پێخۆشبوو هەستێ و بڵێ ئیتر یەک وشەم لێنابیستن، «تەنانەت ئەگەر لە سێدارەشم دەن.»

ئاخری، هەر لەو حاڵەدا کە بە دژواری دانی بە خۆیدا گرتبوو، گوتی: «سەرنجبدەن، ئاغایان سەرنجبدەن. گوێم لێتانە، بەڵام خولیایەک وجوودی داگرتووم. هێندێجار ئەو خەونە دەبینم... زۆر جاریش - هەمیشە هەر ئەوەیە... خەونەکەشم ئەوەیە، کەسێک وەدوام کەوتووە، کەسێک کە زۆری لێدەترسم... شەوێ، بەو تاریکەشەوە وەشوێنم کەوتووە... پێ بە پێی من دێ، دەم لە سەر پشت، لەپشت دەرگا یا دۆڵابێک، خۆم دەشارمەوە، بە سووکوچرووکی خۆم حەشار دەدەم. لە هەمووشی خراپتر ئەوەیە ئەو هەمیشە دەزانێ لە کوێم. بەڵام بەقەستی وا دەنوێنێ کە نامبینێ و نازانێ لەکوێم. بۆ ئەوەی ئازارەکانم قورستر بکا. تاکو چێژ لە ترسان و تۆقینم وەرگرێ... ئێستاش ئەوە ئێوە ئەو کارە دەکەن، بەبێ کەموکووڕی!»

دادوەر پرسیی: «ئەوەیە خەونەکەت؟»
میتیا بە پێکەنینێکی ماتەوە گوتی: «بەڵێ، ناتانهەوێ بینووسن؟»
- نا، پێویست بە نووسین ناکا، بەڵام وادیارە خەونی زۆر سەیر دەبینی.
- ئاغایان، ئێستا ئیتر باسی خەون گرینگ و بەرچاو نییە - ئەوە ڕاستییەکە، کە ئەم ژیانە ڕاستییە! من گورگم و ئێوە ڕاوچی. چاکە شوێنی ئەو گورگە هەڵگرن!

نیکۆلای پارفنۆویچ، بە زمانێکی نەرم و چەور گوتی: «چ وێچواندنێک، وێچواندنێکی نالێک...»

میتیا دیسان قەڵس بوو: «نا، بە هیچ شێوەیەک وانییە!» ئەگەرچی سیڵاوی ڕق و تووڕەییەکەی نیشتبۆوە، بە ئارامی گوتی: «ئێوە باوەڕ بە قسەی تاوانبارێک، یان تۆمەتبارێک ناکەن، کە پرسیارەکانتان ئازاری دەدا. بەڵام ناکرێ مرۆڤێکی خاوەن شەڕەفیش، پاڵنەری شەرافەتمەندانەی دڵ (من ئەم ڕاستییە بەوپەڕی بێباکییەوە دەردەبڕم) هەر بەو چاوە تەماشا کەن و باوەڕی پێنەکەن، بەڕاستی هەقتان نییە... بەڵام -

خۆڕاگر و خاکەڕا بەو دەنگ مەکە.
ئەی دڵ، بێدەنگ بە،

دەی درێژەی پێبدەم؟
نیکۆلای پارفنۆویچ وەڵامیدایەوە: «ئەگەر مەیلت لێیە.»

# (٥)

# ئازاری سێهەم

ئەگەرچی میتیا بە مڕومۆچی قسەیدەکرد، دیاربوو هەوڵدەدا چکۆلەترین چەمکی بەسەرهاتەکەی لەبیر نەچێ و بەسەریدا تێنەپەڕێ ـ جۆری هەڵگەڕان و بازدانی بە سەر نەردەی باخەکەی باوکیدا و ڕۆیشتن بۆ بەر پەنجێرەکە و ئەوەی بە وەسفی ئەو ئیحساساتەی کە لەو کاتەدا لە نێو باخەکە ئازاری دەدا. یانی لەو کاتەدا بە ئاواتەوە بوو بزانێ گرووشنکا لای باوکییەتی یان نا. بەڵام سەیرە هەردوو بازپرسەکە بە سارد و سڕی و بێقەیدی گوێیان لێگرتبوو و چاویان لێدەکرد و تەنیا چەند پرسیاریان لێکرد. میتیا نەیتوانی لە ڕوخساریاندا شتێک هەڵکرێنێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: «خەمبار و دڵمەندن وادیارە. دەی گلێنەیان دەرێ!» کاتێک گەیشتە ئەوجێیەی کە بڕیاری دابوو «عەلامەت» بە باوکی بدا کە گرووشنکا هاتووە، بۆ ئەوەی پەنجەرەکە بکاتەوە، بازپرسەکان سەرنجیان بە وشەی «عەلامەت» نەدا، دەتگوت هەر لە بیریان چۆتەوە، کە لەوبارەوە سەرنج بە مانای ئەو وشەیە بدەن: بەجۆرێک کە میتیا تێگەیشت. ئاخری کە گەیشتە ئەو جێگایەی کە، باوکی لە پەنجێرەکەوە سەری دەرهێنابوو، لەناخەوە ڕق هەڵیچۆقاندبوو و دەسکاوەنگەکەی لە گیرفانی هێنابووە دەرێ، لە ناکاو بێدەنگ بوو ـ وەک ئەوەی پیلانێکی لە ژێر سەردا بێ. ئەگەرچی چاوی لە دیوارەکە بڕیبوو، بەڵام دەیزانی هەردووکیان چاویان تێبڕیوە.

بازپرس گوتی: «دەی؟ دوای ئەوەی دەسکاونگەکەت دەرهێنا... چیتکرد؟»

«پاشان. دەی پاشان کوشتم... کێشام بە سەریدا، کاسەسەریم لەبەریەک برد... پێموایە ئەوە چیرۆکی ئێوەیە. ئێوە دەتانهەوێ ئاوا بڵێم، وانییە؟» میتیا

لە ناکاو چاوی بریقەی هات. تەواوی ڕق و قین و پیشخواردنەوەکانی لە ناکاو لەگەڵ تووڕەبوونێکی بێوێنە لە ناخیدا بلێسەی ساند.

نیکۆلای پارفنۆویچ گوتی: «چیرۆکی ئێمە؟ باشە ئەی چیرۆکی تۆ چییە؟»

میتیا چاوی لەبەر پێی خۆی بڕی و ماوەیەک مات بوو. بە نەرمی هاتە قسە:

ـ بەڕێزان، چیرۆکی من؟ ڕاستتان دەوێ بەم جۆرە بوو کە عەرزتانی دەکەم. جا نازانم فرمێسک و دوعای کەسێکم لەپشت بوو، یان، یان دایکم لە بارەگای خودا بۆم پاڕابۆوە، یان فریشتەیەکی دڵۆڤان لەو کاتەدا ماچیکردم و لاواندمییەوە. نازانم. بەڵام شەیتان بەسەرمدا زاڵبوو. لە پەنجێرەکە دوور کەوتمەوە و بە هەڵاتن ڕۆیشتم بۆلای نەردەکان. باوکم ترسی لێ‌نیشت، کە بەو تاریکە و لەو ناوەختەدا چاوی پێمکەوت. نەڕاندی و بە پڕتاو سەری لە پەنجێرەکە بردە ژووری و خۆی فڕێدا دواوە. ئەوەم زۆر چاک لەبیرە. بەنێو باخەکەدا هەڵاتم بۆلای نەردەکان... و لەوێ، کاتێک لە سەر نەردەکە دانیشتبووم، گریگۆری لاقی گرتم.

لێرەدا ئاخری میتیا سەری هەڵێنا و چاوی لە گوێگرەکانی کرد. دیاربوو بە تەواوی هۆش و دالغەوە چاویان تێبڕیوە و گوێیان بۆ شل کردووە. ڕقێکی ئەستوور سەرتاپای میتیای خستە لەرزین. لە ناکاو لە دەمی دەرچوو:

ـ چاکە، ئاغایان، وادیارە لێرەدا پێکەنینتان پێمدێ!

نیکۆلای پارفنۆویچ گوتی: «بۆچی دەبێ وابیر بکەیتەوە؟»

ـ باوەڕ بە یەک وشەشی ناکەن ـ هۆیەکەی ئەویە! هەڵبەت، تێدەگەم کە گەیشتوومەتە چەتەڕێ. پیرەپیاو ئێستا بە کاژەڵەی شکاوەوە لەوێ کەوتووە. منیش ـ دوای وەسفکردنێکی ورد کە چۆن دەمویست بیکوژم و چۆن دەسکاوەگەکەم هەڵگرت ـ لە ناکاو بە هەڵاتن لە پەنجێرەکە دوور کەوتمەوە. بەڵام وەک گوێزتان بۆ ببژێرم وایە! پێموانییە بڕوا بە قسەی پیاوێکی گوستاخ و ڕووقایمی وەک من بکەن. ها! ها! ئاغایان ئێوە زۆر قۆشمەن!

لەسەر کورسیلەکەش خۆی وا سووڕاند کە کورسیلەکە جیڕەی لێ‌هەستا.

دادوەر وەک ئەوەی گوێی لە تێکچوونەکەی میتیا نەبێ، لە ناکاو پرسیی: «کاتێک بە هەڵاتن لەبەر پەنجێرەکە دوور کەوتیتەوە، چاوت بەو درگایەی بەرەوڕووی باخەکە کەوت کرابێتەوە یان نا؟»

ـ نا نەکرابۆوە.

ـ نەکرابۆوە؟

ـ داخرابوو. ئەی کێ دەتوانێ بیکاتەوە؟ هە، هە! دەرگا. تاوێ سەبرکەن!

میتیا لە ناکاو وەک ئەوەی فکری کردبێتەوە، بە سەر سوڕمانەوە پرسیی: «بۆ دەرگاکە کرابۆوە؟»

ـ بەڵێ کرابۆوە.

میتیا بە سەرسامییەکی زۆرەوە هاواری کرد: «جگە لە خۆتان کێ دەرگای کردۆتەوە؟»

دادوەر، دەتگوت هەر وشەی دەکاتە کۆتکێک و لەسەری میتیای ڕادەکێشێ، پێداگرانە گوتی: «دەرگاکە ئاوەڵا بوو و قاتڵەکەی باوکت بێگومان لەو درگایەوە چۆتە ژوورێ و دوای کوشتنی دیسان لەو دەرگایەوە هەڵاتووە. ئەوەش وەک ڕۆژ ڕوونە. لە نێو ژوورەکەدا کوژراوە، نەک لە پەنجێرەکەوە. ئەوەشمان بە دیتن و پشکنینی شوێنەکە و تەرمەکەی باوکتدا بۆ دەرکەوتووە و لێمان ڕوونە. هیچ گومانێکیشمان لەو بارەوە نییە.»

میتیا مات و خەمبار واقی بردبۆوە. بە داماوی هاواریکرد:

ـ من... من لە دەرگاکەوە نەچوومە ژوورێ.... بڕوام پێبکەن و بە ڕاستمە، تا ئەو کاتەی لە نێو باخەکەدا بووم و لە باخەکەش چوومە دەرێ درگاکە هەروا داخرابوو. من لە پاڵ پەنجەرەکەدا ڕاوەستام و لە کەلێنی پەنجەرەکەوە چاوم پێیکەوت. هەر ئەوە، بڕوام پێ‌بکەن... هەمووم لەبیرە و لێم ڕوونە، هەڵبەت ئەگەر لە بیریشم نەبوایە فەرقی نەدەکرد. ئەوەش دەزانم، هیچکەس جگە لە من و ئیسمیر دیاکۆف و باوکم خەبەری لەو «عەلامەتانە» نەبوو. ئەو بەبێ ئەو عەلامەتانە دەرگای لە هیچ کەسێک نەدەکردەوە.

دادوەر بە کونچکاوییەکی کتوپڕ و سەرسووڕمانێکی شـێتانەوە گوتی: «عەلامەت؟ عەلامەتی چی؟» ئەو بە تەواوی خۆی دۆڕاند و ئەوی غروور و خۆڕاگری لە وجوودیدا بوو لەبیری چۆوە و بە ترس و لەرزێکی کتوپڕەوە پرسیاری لێکرد. هەستی بە ڕاستییەکی گرینگ کرد کە سەری لێی دەرنەدەچوو. ترسی ئەوەی لێنیشتبوو میتیا پێیخۆشنەبێ ڕاستی بڵێ و ئەوی دەیزانی بیدرکێنێ.

میتیا بە پێکەنینێکی مانادار و تەشەراوییەوە چاوێکی لێقرتاند و گوتی: «ئەوەت نەدەزانی؟ ئەی ئەگەر نەیڵێم دەڵێیچی؟ دەتوانی ئەوە لە کێ دەرکێشی؟ هیچکەس خەبەری لەو عەلامەتانە نەبوو جگە لە من و باوکم و ئیسمیر دیاکۆف. هەر ئەو سێ کەسە. خوداش دەزانێ. بەڵام پێتان نالێ. بەڵام زۆر ڕاستییەکی سەرنجڕاکێشە. خودا دەزانێ چیی لێ سازدەکەن و چ جاوێک دەنێنەوە، ها، ها! خەمتان نەبێ، بەڕێزان، هەمووی دەدرکێنم. ئێوە بیرۆکەیەکی گەوجانەتان لە مێشکدایە. نازانن لەگەڵ کێ تێکەوتوون! لەگەڵ دیلێک تێکەوتوون، کە بە دژی خۆی و بە زیانی خۆی شایەدی دەدا! بەڵێ من لاوێکی جوامێر و بەشەرەفم بەڵام ئێوە ـ نین.»

دادوەر ئەوەی وەڕووی خۆی نەهێنا و هیچی نەگوت. بۆ بیستنی ڕاستی ئاراوقارای لێهەڵگیرابوو و دەلەرزی. میتیا باسی ئەو عەلامەتانەی کە فیۆدۆرپاولۆویچ بۆ ئیسمیر دیاکۆفی دانابوو، مووبەموو بۆ باسکردن. بە وردی مانای هەر تەقەیەکی پەنجێرەکەی بۆ گێڕانەوە. بە قامکی لە مێزەکەی دەدا و کاتێک نیکۆلای پارفنۆویچ گوتی وێدەچێ ئەو ـ میتیاـ عەلامەتی «گرووشنکا هاتووە»ی لە پەنجێرەکە دابێ، میتیا وەڵامی دایەوە ئەو عەلامەتەی «گرووشنکا هاتووە»ی لە پەنجێرەکە داوە.

میتیا هەڵیدایە: «دەی فەرموون ئێستا لە کایەک کێوێک ساز کەن»، دیسانیش بە ڕقەوە ڕووی لێوەرگێڕان. نیکۆلای پارفنۆویچ جارێکی دیکە پرسیی: «کەوایە هیچکەس جگە لە باوکی ڕەحمەتیت و خۆت و ئیسمیر دیاکۆفی خزمەتکار خەبەری لەو عەلامەتانە نەبووە؟»

ـ بەڵێ وایە، ئیسمیر دیاکۆفی نۆکەر و خودا. خوداش بنووسن. ڕەنگە بە کارتان بێ. چونکە، خۆشتان پێویستتان بە خودا دەبێ.

هەڵبەت ئەوان ملیان لە نووسین نابوو، هەروا کە خەریکی نووسین بوون، دادەوەر وەک ئەوەی بیرۆکەیەکی نوێی وەگیر کەوتبێ گوتی:

ـ بەڵام ئەگەر ئیسمیر دیاکۆفیش خەبەری لەو عەلامەتانە بووبێ و ئێوەش لێبڕاوانە حاشا لە هەموو چەشنە بەرپرسیارییەک دەکەن سەبارەت بە مەرگی باوکت، تۆ پێت وانییە ئەو عەلامەتەکەی بە باوکت دابێ و باوکیشت دەرگاکەی بۆ کردبێتەوە و پاشان... ئەو جینایەتەی کردبێ؟

میتیا چاوێکی پڕ لە قین و قێزی تێبڕی. ڕاونینەکەشی هێندەی خایاند کە دادوەری تووشی چاوەترووکێ کرد.

میتیا ئاخری گوتی: «دیسان ڕێویتان گرتووە. کلکەکەشیتان گرتووە. ها، ها! جەنابی دادوەر، ناخێ دڵت دەبینم. تۆ پێتوابوو بەو قسەیە لەڕێوە دادەترووسکێم و دەگەشێمەوە، پڕ بە گەرووشم هاوار دەکەم: «خۆیەتی، ئیسمیر دیاکۆفە، قاتڵەکە ڕاست ئەوە.» وانییە؟ هەروات بیر نەدەکردەوە؟ ڕاستییەکەی بڵێ وایە یان نا؟ با درێژە بە قسەکانمان بدەین.»

بەڵام دادوەر دانی پیانەنا. لە ئەلفەوە نەهاتە بێ و چاوی لە دەمی میتیا بڕی.

میتیا گوتی: «بە هەڵەچووی. ناڵێم کاری "ئیسمیر دیاکۆف"ە»

ـ تەنانەت شکیشت لێی نییە؟

ـ بۆ ئێوە شکتان لەوە؟

ـ شکمان لەویش هەیە.

میتیا چاوی لەبەر پێی خۆی بڕی و هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «گاڵتە وەلا نێن. گوێبگرن. هەر لە هەوەڵەوە، ڕاست لەو کاتەوە کە لە پشت پەردەکە هاتم بۆلاتان، ئیسمیر دیاکۆفم لە زەیندا بوو. لێرە دانیشتووم و هاوارم کردووە کە بێتاوانم، لە دڵی خۆشمدا بەردەوام گوتوومە: «ئیسمیر دیاکۆفە.» ئیسمیر دیاکۆف بەجارێ بیر و خەیاڵی داگیر کردووم. لە ڕاستیدا منیش هەر

ئێستا بیرم لە ئیسمیر دیاکۆف دەکردەوە. بەڵام تەنیا ساتێک. زوو وەخۆ هاتمەوە و بەخۆمم گوت: «نا، کاری ئیسمیر دیاکۆف نییە. «ئاغایان کاری ئەو نییە.»

نیکۆلای پارفنۆویچ لەسەرەخۆ گوتی: «کەوایە، کەسێکی دیکە هەیە شکت لێی بێ؟»

میتیا بە حاڵەتێکی لێبڕاوانە گوتی: «نازانم کاری کێیە، دەستی خودا لەکاردا بووە یان شەیتان، بەڵام... ئیسمیر دیاکۆف نییە.»

- چی وای لێکردووی ئاوا لێبڕاوانە و بە متمانە بڵێی ئەو نەبووە؟

- دڵم وام پێدەڵێ - باوەڕم وایە. چونکە ئیسمیر دیاکۆف مرۆڤێکی زۆر سووکوچرووک و ترسەنۆکە. ترسەنۆک نییە، نموونەی تەواوی ئەو ترسەنۆکانەیە کە سەرو قوونیان کونکراوە و دوو پێیان هەیە. دڵی وەک دڵی جووجەڵە وایە. کاتێک لەگەڵ من دەدوا، لە ترسانا وەک شەقشەقە دەلەرزی، لەوە دەترسا بیکووژم، ئەگەرچی قەتم دەست لێ هەڵنەهێناوەتەوە. خۆی بە سەر کەوشەکانمدا دەدا نووزە نووزی دەکرد. ئەو سەد جاری ئەم پۆستاڵانەم ماچکردووە و لەبەرم پاڕاوەتەوە «نەیترسێنم.» گوێتان لێیە؟ «نەیترسێنم.» پێویست بە گوتن ناکا، بەڵام پێشنیاری پارەم پێکرد. ئەو جووجەڵەیەکی جیکنە - نەخۆش و فێدار و گەلحۆیە - منداڵێکی هەشت ساڵانیش دەرەقەتی دێ. هەر شیاوی ئەوە نییە قسەی لەگەڵ بکەی، بەڕێزان، کاری ئیسمیر دیاکۆف نەبووە، ئەو گرنگایەتی بە پارەش نادا؛ تەنانەت دستخۆشانە و دیاریش وەرناگرێ. کەوایە چ پاڵنەرێک بووە هانیدا بۆ کوشتنی پیرەپیاو؟ زانیوتانە گریمانی ئەوە هەیە کوڕی باوکم بێ - کوڕی ناشەرعی. خەبەری ئەوەتان هەیە؟

- ئەو هەقایەتەمان بیستووە. بەڵام خۆ تۆش کوڕی باوکتی، سەرەڕای ئەوەش خۆت لەلای هەمووان گوتووتە دەتهەوێ بیکوژی.

- ئەوە ئیتر بێ ئینسافییە! چەندەش دزێو و هیچوپووچ! من ناترسم! ئاخ، ئاغایان درکاندنی ئەو قسەیە لە ڕووی مندا ئەوپەڕی هیچوپووچیی ئێوە

دەگەیەنیێ؟ چونکە خۆم بە ئێوەم گوت. نەک ویستبێتم بیکوژم، بەڵکو دەمتوانی ئەو کارە بکەم. سەرەڕای ئەوەش، بە خواهانی خۆم بە ئێوەم گوتهێندەی نەمابوو بیکووژم. بەڵام نەمکوشت، فریشتەی نیگابانم نەجاتی دام ـ ئەوە شتێکە کە هەر لاتان لیێنەکردەوە. هەر لەبەر ئەوەشە بۆم دەرکەوتووە ئێوە سووکوچرووکن. یەکجار زۆریش سووکوچرووکن! چونکە نەمکوشتووە، نەمکوشتووە، نەمکوشتووە! حاڵیبوون، نەمکوشتووە.

هێندەی نەمابوو دڵی ڕاوەستێ. لە تەواوی ماوەی لێپرسینەوەدا تا ئەو ڕادەیە تووشی دڵەکوتێ نەبووبوو. دوای تۆزێ بێدەنگ بوون، لە ناکاو گوتی:
ـ مەگین ئەو چیی بە ئێوە گوتووە ـ ئیسمیر دیاکۆف دەڵێم؟ دەکرێ ئەو پرسیارەتان لێبکەم؟

دادوەر بە تووڕەبوونێکی تەواوەوە وەڵامی دایەوە: «دەتوانی هەموو پرسیارێک بکەی، هەر پرسیارێک کە پێوەندیی بە پەروەندەکەوە هەبێ، ئێمەش ئەرکی خۆمانە وەڵامی پرسیارەکانت بدەینەوە. ئیسمیر دیاکۆف کە سەبارەت بە ئەو پرسیارت کرد، بێهۆش و نیوە مردوو لە جێدا کەوتبوو. سەر و دڵەکەی زۆر بە قورسی لیێهاتبوو، وەک ئەوەی دە جار لەسەریەک فێی لیێهاتبێ. ئەو پزیشکەی لەگەڵمان بوو، دوای پشکنینی گوتی وێناچێ ڕۆژ بکاتەوە.»

میتیا، دەتگوت تا ئەو کاتە لەخۆی پرسیوە: «دەتەوێ بزانی ئیسمیر دیاکۆف بووە یان نا؟» گوتیشی: «دەی ئەگەر وابێ، لەوانەیە شەیتان باوکمی کوشتبێ.»

نیکۆلای پارفنۆویچ گوتی: «دەگەڕێینەوە سەر ئەو بابەتەش. ئێستا ناتهەوێ درێژە بە قسەکانت بدەی؟»

میتیا داوای پشوودانی کرد. بە ڕێزەوە داواکەی قەبووڵ کرا. دوای پشوودان درێژەی بە چیرۆکەکە دا. بەڵام دیاربوو خەم دایگرتووە. تاقەت و هێزی لێبڕابوو و ئەخلاقیشی گۆڕابوو. لەوەش خراپتر دادوەر، دەتگوت بە قەستی، قسەی پێدەبڕێ و سەبارەت بە «شتی بێبایەخ» پرسیاری لێدەکرد،

بۆیە میتیا چەقۆت لێدایە خوێنی نەدەهات. هێشتا میتیا نەقڵی دانیشتن لە سەر پەرژینەکە و بە دەسکاونگ لەسەری گریگۆری ڕاکێشان و باوەش بە لاقیدا کران لەلایەن گریگۆرییەوە تەواو نەبووبوو، دادوەر قسەکەی پێبڕی و داوای لێکرد بە وردی پێیانبڵێ چۆن لە سەر ئەو تەیمانە دانیشتووە. میتیا سەری سوڕما.

ـ ئاخ، ئاوا دانیشتبووم، کەرەکی سواری نەردەکان بووبووم، لاقێکم بەمدیوا شۆڕ کردبۆوە و لاقێکم بەودیوا.

ـ ئەی دەسکاونگەکە؟

ـ دەسکاونگەکە بە دەستمەوە بوو.

ـ لە گیرفانتدا نەبوو؟ بە جوانی لەبیرت ماوە؟ ئایا زەبرێکی قورست لێدا؟

ـ لەوانەیە زەبرەکە قورسیش بووبێ. بۆ دەپرسن؟

ـ قەیدێناکا هەر وەک ئەو کاتە چۆن لە سەر دیوارەکە دانیشتبووی ئاوا لە سەر کورسییەکە دانیشە، نیشانمان بدە دەستت چۆن و بە چ بارێک ڕاوەشاند و دەسکاونگەکەت کێشا بەسەری گریگۆریدا؟

میتیا کە لووت بەرزانە دەیڕوانییە لێپرسینەوەکە پرسیی: «بە شێتم دەزانن، ها؟ بەڵام بازپرس گوێی نەدایە. میتیا لە ناکاو وەرسووڕا، لە سەر لاتەنیشت سواری کورسییەکە بوو و دەستی ڕاوەشاند.

ـ ئاوا لێمدا! ئاوا کوشتم! ئیتر چیتان دەوێ؟

ـ سپاست دەکەم. ئێستا دەکرێ بفەرمووی بۆ بازتدا خوارێ، مەبەستت چی بوو، دەتویست چبکەی؟

ـ سپاس بۆ کردەوەتان!... بازمدا تاکوو بزانم ئەو کەسەی لێمداوە چاوی لێبکەم... خۆشم نازانم بۆچی!

ـ سەرەڕای ئەو هەموو دڵەخورپە و هەڵاتن و خۆدەرباز کردنە؟

ـ بەڵێ، سەرەڕای ئەوەی دڵەخورپەم پێکەوتبوو و دەمویست خۆم دەرباز کەم.

ـ دەتویست یارمەتیی بدەی؟

ـ یارمەتی؟ بەڵێ، پێموا دەمویست یارمەتیی بدەم... لەبیرم نییە.
ـ لەبیرت نییە؟ کەوایە خۆشت نەتدەزانی چدەکەی؟
ـ نا، وانییە. هەموو شتێکم لەبیرە ـ بە وردی. بازمدا خوارێ تاکو چاوی لێبکەم و دەموچاویم بە دەسرەکەم بۆ سڕی.
ـ دەسرەکەتم دیوە. بە هیوا بووی وەهۆشی بێنییەوە؟
ـ خۆ دکتۆر نیم. نەمدەزانی چبکەم. هەڵاتم و پێموابوو کوشتوومە. ئێستاش ئەوە دەفەرموون وەهۆش هاتۆتەوە.
دادوەر گوتی: «زۆرچاکە. سپاست دەکەم. هەر ئەوەم دەویست. تکایە درێژە بە قسەکانت بدە.»
مخابن! میتیا بە زەینی نەگەیشت، ئەگەرچی وەبیری هاتەوە، کە پێیان بڵێ لەبەر دڵسۆزی بازی داوەتە خوارێ و بە سەر کابرای بریندارەوە ڕاوەستاوە و چەند وشەی داخاویشی بە دەمدا هاتووە: «پیرەپیاو، بە ڕێوی دەرچووی ـ چار نییە، دەبێ هەروا لە جێی خۆت ڕەهێڵ بی.» دادوەر تەنیا بە ئاکامێک گەیشت. ئەویش ئەوە بوو «لەو ساتەدا بەو ترس و دڵەخورپەیەوە تەنیا لەبەر ئەوە بازی داوەتە خوارێ بۆ ئەوەی دڵنیا بێ «تەنیا» شایەدی تاوانەکەی مردووە یان نا، بەو پێیە بۆمان دەردەکەوێ ئەو مرۆڤێکی خوێنسارد و خاوەن بڕیار و داهاتوو بینە و لە کاتێکی ئاوا ناسکدا مێشکی کاری کردووە»... و هتد. دادوەر کەیفی ساز بوو: «چاکبوو بەو ”پرسیارە بێبایەخانە“ هانمدا و ئەو کوڕە تووڕە و تۆسنەم وا لێکرد ئەوەی نەشی دەیویست بیدرکێنێ، درکاندی.»
میتیا بە دڵێکی خەمبارەوە درێژەی بە قسەکانیدا: بەڵام ئەمجارەیان نیکۆلای پارفنۆویچ هەر خێرا پاشقولی قسەکانیدا.
ـ چۆنبوو بە دەستوپلی خوێناوی و هەروەک دەڵێن بە دەموچاوی خوێناویشەوە هەڵاتی بۆلای فینیا؟
ـ میتیا وەڵامی دایەوە: «ئاخر لەو کاتەدا (خوێنەکەم هەر نەدیبوو، نەمدەزانی دەست و چڕوچاوم خوێناوییە.»

دادوەر و نیکۆلای پارفنۆویچ چاویێکیان لە یەکتر کرد و دادوەر گوتی: زۆر ئاساییە. هێندێ جار پێش دێ.»

میتیا لە ناکاو بە نیشانەی ڕەزایەت گوتی: «وایە هەر نەمزانیبوو. جەنابی دادوەر بە ڕاستی هەق بەتۆیە.» دوای ئەوە هاتنە سەر باسی بڕیارە کتوپڕەکەی میتیا، یانی «ڕێگا چۆڵکردن» و بەر نەگرتن بە بەختەوەریی ئەوان. بەڵام نەیتوانی بڕیار بدا و وەک پێشوو درگای دڵی بکاتەوە و باسی "شاژنی ڕۆحی" بۆ ئەوان بکا. باسکردنی گرووشنکا لە هەمبەر ئەو پیاوە پشوو درێژانەدا کە «لێی بووبوونە قیلی کەوای سپی» زۆر ناخۆش بوو. هەر بۆیە وەڵامی پرسیارە پەیتا پەیتاکانی بە کورتی و پچڕپچڕ دەدانەوە:

ـ بەڵێ، بڕیارمدا خۆم بکوژم. ئیتر چی مابوو کە بمهەوێ لەبەر خاتری ئەو زیندوو بم؟ ئەم پرسیارە خۆی لە مێشکم هاڵاندبوو، ئاشقی یەکەمی گەڕاوەتەوە و هەقیش بەوە. ئەگەرچی زۆری ناپیاوی لەگەڵ کردبوو، بەڵام دوای پێنج ساڵ بەپەلە گەڕابۆوە تاکو ئەشقی خۆی پێشکەش بکا و بە زەماوەند کردن لەگەڵیا خراپەکانی پێشووی قەرەبوو بکاتەوە... هەر بۆیە پێموابوو هەموو شتێک بۆ من کۆتایی هاتووە... و شوورەیی و ئابڕووچوون و ئەو خوێنە ـ خوێنی گریگۆری... بە دوومەوەیە و ئیتر لە دنیادا هیچ هیوا و دڵخۆشییەکم نەمابوو. بۆیە چووم دەمانچەکانم لە بارمتە دەرهێنا تاکو پڕیانکەم و سبەینێ گوللەیەک لە مێشکی سەری خۆم بدەم.

ـ شەوی پێشووشی بەزموڕەزمێکی گەرموگوڕ ساز کەی؟

«بەڵێ، شەوی پێش ئەویش بەزمورەزمێکی باش. ئاغایان، لەبەر ئەو بیر و ئاکارەتان مرم! یاڵڵا زووکەن و تەواویکەن. دەمویست لە شوێنێکی نزیک ئێرە، لەولای ئاواییەوە، خۆم بکوژم. واشم بڕیار دابوو سەعات پێنجی بەیانی ئەو کارە بکەم. یادداشتێکم نابووە گیرفانمەوە. ئەو پسوولەیەشم لە ماڵی پێرخۆتین نووسی، کاتێک دەمانچەکانم پڕ دەکرد. ئەمەش نامەکە. ها، بیخوێننەوە!» میتیا بە لەبزێکی پڕ سووکایەتی گوتی: «با ئەوەشتان پێبڵێم بۆ

ئێوەم نەنووسیوە.» نامەکەی لە گیرفانی جلیسقەکەی دەرهێنا و لە سەر مێزەکە داینا.

ـ ئێوە تەنانەت لە ماڵی پێرخۆتین لە بیرتان نەبوو دەستتان بشۆن؟ ترسی ئەوەت نەبوو شکت تێبکەن؟

ـ شکی چی؟ شک بێ یان هەر شتێکی دیکە، من لەو کاتەدا گوێم لەو شتانە نەبوو. دەبوو هەرچۆنێکە بە چوارناڵ خۆم بگەیەنمە ئێرە و سەعات پێنج بە گوللە لە خۆم دەم، ئێوە فریا نەدەکەوتن دەستم بگرن. ئەگەر لەبەر ئەو کارەساتە نەبوایە کە بە سەر باوکم هاتووە، خەبەرتان نەدەزانی و خۆتان نەدەگەیاندە ئێرە. ئاخ، کاری شەیتان بووە. شەیتان باوکمی کوشتووە، ئێوەش هەر دەبێ شەیتان پێی گوتبێتن بۆیە ئاوا زوو زانیتان. چۆن توانیتان ئاوا خۆتان بگەیەننە ئێرە؟ بەڕاستی جێی سەرسووڕمانە. وەک موویان لێهەڵپڕووزاندبێتن وایە!

ـ ئاغای پێرخۆتین ئاگاداری کردین، دەیگوت کاتێک چووی بۆ ماڵەکەی پارەت بە دەستەوە بووە... بە دەستە خوێناوییەکەتەوە... بڕێکی زۆر پارە... چەکەیەک گەڵای سەد ڕۆبڵی، وڕوێڕکەکەشی دیتوویە بە دەستتەوە.

ـ ئاغایان، ڕاست وایە. لەبیرمە هەروا بوو.

نیکۆلای پارفنۆویچ بە ئەدەبێکی زۆرەوە گوتی: «ئێستا، پرسیارێکی چکۆلەم هەیە. دەکرێ پێمان بڵێی ئەو هەموو پارەیەت یەکجێ لەکوێ وەگیر کەوت؟ وەک دیارە و بۆمان دەرکەوتووە، حیسابی کاتیشمان لە دەستدایە. وادیارە لە ماڵی خۆت نەبووی؟»

دادوەر بە پرسینی ئەو پرسیارە ڕوون و ڕاشکاوانەیە، نێوچاوانی تێکنا، بەڵام قسەکەی بە نیکۆلای پارفنۆویچ نەبڕی.

میتیا کە وێدەچوو تەواو هێور بووبێتەوە، بەڵام چاوی لە بەرپێی خۆی بڕیبوو، وەڵامی دایەوە: «نا، نەچوومەوە بۆ ماڵێ.»

نیکۆلای پارفنۆویچ، کە زۆر وریایانە دەیویست ڕچەکە بشکێنی و بچێتە سەر بابەتەکە، لە درێژەی وتەکانیدا گوتی: «کەوایە ئێزن بفەرموون

پرسیارەکەم دووپات کەمەوە. ئەو هەموو پارەیەت لەکوێ وەدەست هێنا؟ وەک خۆشت دانی پیادەنێی سەعات پێنجی ئەو ڕۆژە...»

میتیا بە تووڕەیی قسەکەی پێ بڕی: «پێویستم بە دە ڕۆبڵ بوو، دەمانچەکانم لەلای پێرخۆتین بە بارمتە دانا و دوای ئەوە چووم بۆلای مادام خۆخلاکۆف ، تاکو سێ هەزار ڕۆبڵی لێ قەرز کەم. بەڵام نەیدامێ و... بەڵێ ئاغایان زۆرم پێویستی بەو پارەیە بوو و لە ناکاو خودا گەیاندی، ها؟ بەڕێزان ئێستا هەردووکتان ترسی ئەوەتان هەیە «ئەگەر پێمان نەڵێ ئەو پارەیەی لەکوێ هێناوە، چیبکەین؟» کە هەرواشە. ئاغایان پێتان ناڵێم. چاکی بۆچوون. قەتیش نایزانن، دڵنیا بن.» میتیا هەر وەشەیەکیشی بە شێوەیەکی قایم و لێبڕاوانە دەردەبڕی. هەردوو بازپرسەکە ماوەیەک بێدەنگ بوون.

نیکۆلای پارفنۆویچ، بە نەرمی و ئەدەبەوە گوتی: «ئەوە بزانە ئاغای کارامازۆف، بۆ ئێمە گرینگییەکی زۆری هەیە و دەمانەوێ بزانین.»

ـ تێدەگەم. بەڵام سەرەڕای ئەوەش پێتانناڵێم.

دادوەریش هەڵیدایە، بەڵام دیسان وەبیری هاتەوە کە زیندانی ئازادە ئەو پرسیارانەی لێیدەکرێ، ئەگەر بە قازانجی نەبێ، دەتوانێ وەڵامنەداتەوە. بەڵام لەوانەیە بەو بێدەنگ بوون و لارێ ڕۆیشتنە زیان بە خۆی بگەیەنێ. بەتایبەت پرسیارێکی ئاوا گرینگ...

میتیا دیسان پەڕییە نێو قسەکانەوە: «گرینگی و مرینگی دامەنێن! ئەم قۆڕیاتەم پێشتریش بیستووە. خۆم دەزانم زۆر گرینگە و خاڵێکی بنەڕەتیشە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش نایڵێم.»

نیکۆلای پارفنۆویچ بە تووڕەیی گوتی: «بە ئێمە چی! خۆ گرفتی ئێمە نییە، گرفتی خۆتە. وادیارە بە زەرەدی خۆت دەجووڵێیتەوە.»

«بڕوانن بەڕێزان، با گاڵتە و گەپ وەلانێین» ـ میتیا سەری هەڵێنا و بە تووڕەیی چاوی تێبڕین ـ «هەر لە سەرەتاوە لە دڵمی دابوو لێرەدا بە بنبەست دەگەین. بەڵام لە سەرەتادا کە دەستمکرد بە دان پیانان، هێشتا دوور و تەمومژاوی بوو، منیش هێندە ساویلکە بووم، خێرا کەوڵی دڵم

کردەوە «پێموابوو متمانەیەکی دوولایەنە لەنێوانماندایە». ئێستا تێگەیشتم کە متمانەیەکی ئاوا لە گۆڕێدا هەر نییە. چونکە لەو پەروەندەیەی مندا، بمانەوێ و نەمانەوێ، تووشی ئەو کۆسپە نەگبەتییە هەر دەبین. ئەوە ئێستاش تووشی بووین! ئیتر مەحاڵە و گەشتوینە کۆتایی! بەڵام سەرکۆنەتان ناکەم. باوەڕ بە تاقە قسەیەکم ناکەن. زۆر باش دەزانم باوەڕم پێناکەن.» میتیا کڕ و کپ سەری داخست.

ـ بێ ئەوەی دەست لەو بڕیارەت هەڵگرێ سەبارەت بە خاڵی سەرەکی، لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانی بە کورتی ئاماژەیەکی کورتی پێبکەی کە سەبارەت بە ویستە دەروونییەکانت کە زۆریش بەهێزن و لە شوێنێکی مەترسیداردا دەبنە هۆی ئەوەی خۆ لە وەڵامدانەوە ببوێری؟

میتیا بە شێوەیەکی خەمبارانە و تا ڕادەیەک خەونئاسایی بزەی هاتێ:

ـ ئاغایان من زۆر لەوە ڕۆحسووکترم کە بیری لێدەکەنەوە. هۆی «بۆچییە»کەشتان پێدەڵێم و ئەو ئاماژەیە بە ئێوە دەکەم. ئەگەرچی شیاویشی نین. بەڕێزان باسی ئەوە ناکەم، چونکە دەبێتە پەڵەیەک لە سەر شەڕافەتم. وەڵامی ئەو پرسیارەی کە پارەیەکی ئاوا زۆرم لەکوێ بوو، شوورەییەکی زۆر گەورەتر لە کوشتن و تاڵانی باوکمە. هەڵبەت ئەگەر ئەو کارە کاری من بوایە. هەر بەو هۆیەوە ناتوانم پێتانبڵێم. لە ترسی ئابڕووچوون ناتوانم. بەڕێزان چدەکەن، دەتانەوێ ئەمەش یادداشت بکەن؟

نیکۆلای پارفنۆویچ گوتی: «بەڵێ، تۆماری دەکەین.»

«ئێوە نابێ ئەو خاڵەی پێوەندیی بە «ئابڕووچوونەوە» هەیە، بینووسن. ئەوەشم لە ڕووی ڕۆحسووکییەوە پێگووتن. نەدەبوو پێتانبڵێم. ئەوەم وەک دیارییەک پێشکەش بە ئێوە کرد، کەچی خێرا بە سەریدا تێدەپەڕن.» میتیا بە ڕق و سووکایەتییەوە لە کۆتاییدا گوتی:

«چش بینووسن ـ هەرچیتان پێخۆشە بینووسن. لێتان ناترسم هێشتاش دەتوانم لە هەمبەر ئێوەدا سەربەرزانە ڕاوەستم.»

نیکۆلای پارفنۆویچ بێئەوەی دڵ لە دڵ بدا، پرسیی: «دەکرێ بنۆسی ئەو ئابڕووچوون و ڕیسواییەمان پێبڵێی؟»

دادوەر گرژ بوو.

ـ نا، نا C'est fini (ئیتر تەواو بوو)، خۆتان مەخەنە زەحمەتەوە. بایەخی ئەوەی نییە دەستی خۆتان پیسکەن. تا ئێرەش لەڕادەبەدەر خۆم ڕمووده کردووه. ئێوه شیاوی ئەوه نین ـ نەک هەر ئێوه، هیچکەس... ئاغایان، بەسی کەن. ئیتر زمانم ناگەڕێ.

ئەوەشی زۆر لێبڕاوانە گوت. نیکۆلای پارفنۆویچ لەوە زیاتر ئیسەرمی نەکرد، بەڵام بە چاوی ئیپۆلیت کیریلۆویچدا بۆی دەرکەوت ئەو هێشتا هیوابڕاو نەبووە.

ـ دەتوانی لانیکەم پێمانبڵێی کاتێک گەیشتیتە ماڵی پێرخۆتین چەندەت پارە پێ بوو. ـ دەقیق چەند ڕۆبڵت پێبوو؟

ـ ناتوانم ئەوەتان پێبڵێم.

ـ پێموایە لەلای ئاغای پێرخۆتین باسی وەرگرتنی سێ هەزار ڕۆبڵت لە مادام خۆخلاکۆف کرد.

ـ ڕەنگە. بەسە ئیتر ئاغایان. پێتاننالێم چەندەم پێبوو.

ـ ئەی دەکرێ بفەرمووی هاتی بۆ ئێرە و لە کاتی گەیشتنە ئێرە تا ئێستا چت کردووە؟

ـ ئەوەش، دەتوانن لە خەڵکانی ئێرە بپرسن. بەڵام ئەگەر پێتان خۆش بێ پێتاندەڵێم.

دەستیکرد بە قسە کردن، بەڵام قسەکانی ئەو دووپات ناکەینەوە. قسەکانی بە لەبزێکی وشک و ڕووو هەڵماڵدراوانە دەربڕی. باسی نەشەی ئەشقەکەی نەکرد. بەڵام پێیگوتن کە دەست هەڵگرتن لە بڕیاری خۆکوشتنەکەی بەهۆی «بارودۆخی نوێوە» وەلاناوە. بەبێ ئەوەی باسی پاڵنەرەکانی و وردە کارییەکان بکا، دەستیکرد بە گێڕانەوە. دادوەرەکانیش دەستیان لە ئازاردانی هەڵگرت. دیاربوو لێرەدا بارودۆخەکە بە قازانجی خۆیان دەزانن.

نیکۆلای پارفنۆویچ گوتی: «بە هەموو ئەوانە ڕادەگەین. کاتی لێپرسینەوە لە شایەدەکان، کە لە حوزووری خۆتدا بەڕێوە دەچێ، دێیتە سەر باسەکە. ئێستاش ئیزن بفەرموو، داوات لێبکەم، هەرچی پارەت پێیە لە سەر مێزەکە داینێی. تکایە تەوای پارەکانت لە سەر مێزەکە دانێ.»

ـ پارە؟ بە سەر چاو. تێدەگەم کە ئەو کارە زەروورییە. لە ڕاستیدا پێشم سەیرە بۆ پێشتر ئەو داوایەتان نەکرد. خۆ نەمدەتوانی لە دەستتان دەرباز بم. لە شوێنێک دانیشتووم چاوتان بەسەرمەوەیە. بەڵام ئەمەش پارەکەم ـ بیبژێرن ـ هانێ. پێموایە هەموو هەر ئەوەیە.

گیرفانی هەڵتەکاند و ئەوەی پارەی تێدا بوو لە سەر مێزەکە داینا؛ تەنانەت قەرە پووڵەکانیشی کە دوو دراوی بیست کۆپکی بوو لە گیرفانی هێلەگەکەی دەرهێنا. پارەکەیان بژارد، هەشتسەد و سیوشەش ڕۆبڵ و چل کۆپک بوو.

بازپرس پرسیی: «هەمووی هەر ئەوەیە؟»

ـ بەڵێ.

ـ هەر ئێستا لە کاتی لێپرسینەوەکەدا گوتت سێسەد ڕۆبڵت لە فرۆشگەی پلاتینکۆف خەرجکردووە. دە ڕۆبڵت داوە بە پێرخۆتین و بیست ڕۆبڵ بە عارەبانەچی. لێرەش دووسەد ڕۆبڵت بە قومار دۆڕاندووە، کەوایە....

نیکۆلای پارفنۆویچ هەمووی لێکدایەوە، میتیا لەگەڵی حیساب کرد. تەواوی پارەکانیان زیدە کرد و هێنایانە حیساب. نیکۆلای پارفنۆویچ بەپەلە هەمووی لێکدایەوە.

ـ بەم هەشت سەد ڕۆبڵەی پێشووەوە، نزیکەی هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵت پێبووە؟

میتیا بە توندی گوتی: «پێموایە.»

ـ ئەی بۆچی هەموو دەڵێن لەوە زیاترت پێبووە؟

ـ لەخۆڕا قسە دەکەن.

ـ خۆشت هەروات گوت.

ـ ئەرێ قسەیەکی وام کرد.

- هەموو ئەوانە لەگەڵ قسەی کەسانێکی دیکە کە هێشتا لێپرسینەوەیان بۆ نەکراوە، هەڵدەسەنگێنن. سەبارەت بە پارەکە نیگەران مەبە. لە کۆتاییدا... ئەو پارەیەی پێت داوین ئەگەر بۆمان ڕوون بێتەوە کە مافی خۆتە، بەبێ کەم و زیاد دەتدەینەوە.

نیکۆلای پارفنۆویچ لەپڕ هەستایە سەرپێ، لێبڕاوانە بە میتیای کوت: کە ئەرک و بەرپرسیەتی خستوویەتە ئەستۆی کە پشکنینێکی وردی تەواوی جلوبەرگ و شتەکانی دیکە... بکا.

- بە سەر چاو، بەڕێزان. ئەگەر پێتان خۆشبێ، گیرفانەکانم هەڵدەتەکێنم. خێراش دەستیکرد بە دەرکێشانی گیرفانەکانی و بەری گیرفانەکانی وەک توورەکە بە زارکەکەیاندا شۆڕ کردەوە.

- زەحمەت نەبێ دەبێ جلەکانیشت داکەنی.

- چی؟ ڕووت بمەوە! لەبەر ئەو ئاکارەتان مرم. شتی وا نابێ، هەر ئاوا بمپشکنن! ناتوانن؟

- دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، مەحاڵە. دەبێ جلەکانت داکەنی.

میتیا بە حاڵەتێکی خەمبارانەوە، خۆی بە دەستەوە دا:«هەرچۆنێکتان پێخۆشە. بەڵام تکاتان لێدەکەم لێرە نا، لە پشت پەردەکە. کێ جلەکانم دەپشکنێ؟»

- بەڵێ لە پشت پەردەکە، خۆ لێرە نابێ.

نیکۆلای پارفنۆویچ، بە نیشانەی ڕەزایەت سەری دانەواند. دەموچاوە وردیلەکەی ویقارڕ و قورساخییەکی سەیری بەخۆوە گرتبوو.

## (٦)

# دادوەر میتیا غافڵگیر دەکا

ئـەوەی بـە دوای ئـەم ماجـەرایـەدا هـات. بـۆ میتیـا چـاوەڕوان نـەکـراو و سەرسووڕهێنەر بوو. هیچکات و تەنانەت دەقیقەیەک بەر لـەوەش پێی وانـەبوو هیچکەس بتوانێ ئاوای لەگەڵ بجووڵێتەوە. هـەڵسووکەوتێکی ئـاوا لـەگـەڵ میتیا کارامازۆف بکا. لەوەش خراپتر ئەوە بوو، زۆر کارێکی پڕ لە سووکایەتی بوو، لەلای ئەوانیشـەوە شتێکی "قێزەون و سووکایەتی ئامێز". بۆ داکەندنی کۆتـە نوقڵییـەکـەی گوێی لێنـەبوو، بـەڵام داوایان لێکرد زیاتر ڕووت بێتـەوە. داوایان لێنەکرد، بەڵکو «فەرمان»یان پێدا، بە تـەواوی لـەو بابـەتـە بگـا. بـەڵام سـەرەڕای ڕق و قۆڕەدەماخی، بەبێ ئەوەی زمانی بگەڕێ ڕێیکرد لەگەڵیاندا. چـەند لادێیی لەگەڵ دادوەرەکان چوون و لەم دیوی پەردەکە ڕاوەستان. میتیا لـە دڵـی خۆیدا گوتی: «ڕەنگە بۆ ئەوە بێ، ئەگـەر هـاتو خـەیاڵی خۆبادان و دەست کردنـەوەم بوو - یان ڕەنگە هۆیەکی دیکەی هەبێ - ئامادە و حازر بەدەست بن.»

بە توندی پرسیی: «دەی، کراسەکەشم داکـەنم؟» بـەڵام نیکۆلای پارفنۆویچ وەڵامـی نـەدایـەوە.لـەگـەڵ دادوەر بـە وردی خـەریکـی پـشکنینی پـانتۆڵ و جلوبەرگەکانی بوون؛ دیاربوو هەردووکیشیان زۆر تامەزرۆن بۆ ئـەو پشکنینە و بـەدڵ دەگـەڕێـن. میتیـا بـە زەینیـدا هـات: «حورمـەت هـەر نـازانن چییـە، سەرەتاییترین ڕەوشتی ئەدەب لەبەرچاو ناگرن.»

هەروا بە ڕق و تووڕەیی گوتی: «بۆ جاری دووهـەم لێتان دەپرسم - دەبێ کراسەکەشم داکەنم یان نا؟»

نیکۆلای پارفنۆویچ گوتی: «خۆت شلوێ مەکە. پێتدەڵێین چبکـەی.» شێوەی قسەکردنەکەی فەرمان پێدەرانە بوو، یان میتیا وای هەست پێدەکرد.

لەوکاتەدا دادوەرەکان، بە سرتە دەستیانکرد بە تەگبیر و ڕا. کۆتەکەی بە تایبەت دیوی ناوەوەی لەلای چەپەی پەڵەی خوێنی پێوە وشکەڵاتبوو. پانتۆڵەکەشی لکەی خوێنی پێوە بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، نیکۆلای پارفنۆویچ لە حووزووری شاهیدانی گوندنشیندا، دەستی بە یەخە و سەرقۆڵ و پێسیری کۆت و پانتۆڵەکەیدا گێڕا. وادیار بوو لە شتێک دەگەڕێ. ـ لە پارە دەگەڕێ حەتمەن. تەنانەت شک و گومانی خۆی لە میتیا نەشاردەوە، کە میتیا لە دەستی دێ پارەکە لە ناوەوە بە جلەکانیدا بدووریێ. میتیا لەبن لێوەوە گوتی: «لەگەڵ من وەک ئەفسەرێک هەڵسووکەوت ناکەن، بەڵکو دەڵێی دزیان گرتووە.» ئەوان بیروڕای خۆیان ڕاشکاوانە و بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر ئاڵوگۆڕ کرد. بۆ وێنە میرزا بنووس کە ئەویش لە پشت پەردەکە بوو، بەملاوبەولادا دەخولاوە و گوێی ڕاگرتبوو. نیکۆلای پارفنۆویچ شکی پەڕییە سەر کڵاوەکەی و قامکیان بە ئەویشدا هێنا.

میرزا بنووس گوتی: «خۆ گریدیێینکۆی بنووستان لەبیرە. هاوینی ڕابردوو مووچەی تەواوی کارمەندەکانی وەرگرت و گوتی کاتی مەستی هەموو پارەکەی ون کردووە. لە کوێشدا دۆزییانەوە؟ لە درزی کڵاوەکەیدا. گەڵا سەد ڕۆبڵییەکانی لوولە کردبوو و لە دیوی ناوەوە بە کڵاوەکەیدا دووریبوو.» هەردوو بازپرسەکە پەروەندەی گریدی یینکۆیان بە جوانی لەبیر بوو، هەر بۆیە کڵاوەکەی میتیایان خستە لاوە و بڕیاریاندا دواتر تەواوی جلەکانی بە وردی بشکنن.

نیکۆلای پارفنۆویچ، کە چاوی بە سەر قۆڵی کراسەکەی میتیا کەوت داینووشتاندووە بە نێوەوەدا و خوێن ڕەقیتەی داوە پێوەی، لە ناکاو گوڕاندی: «ببوورە، ببوورە جەنابی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ کارامازۆف، ئەمە چییە، ئەم خوێنە چییە؟»

میتیا بە توندی گوتی: «بەڵێ خوێنە.»

ـ یانی، خوێنی چییە...، ئەی سەر قۆڵەکەت بۆ بەنێوەوەدا نووشتاندۆتەوە؟

میتیا گوتی سەرقۆڵی کاتێک سەروچاوی گریگۆریی سڕیوە لە خوێن هەڵکشاوە، کاتێکیش لە ماڵی پێرخۆتین دەستی شتووە، قۆڵی کراسەکەی کردووە بە ناوەوەدا.

ـ دەبێ کراسەکەشت داکەنی. وەک بەڵگەیەکی ئاشکرا، زۆریش گرینگە.

میتیا سوور هەڵگەڕا و قەڵس بوو. نەڕاندی:

ـ یانی دەفەرموون ڕووتوقووت ڕاوەستم؟

ـ دڵی خۆت نارەحەت مەکە. جێبەجێی دەکەین. تکایە گۆرەوییەکانیشت داکەنە.

میتیا چاوی بریقەی هات: «گاڵتە دەکەن؟ هەر بەڕاستی پێویستە دایکەنم؟»

نیکۆلای پارفنۆویچ بە ڕووگرژی گوتی: «لە بارودۆخێکی وادا نیم گاڵتە بکەم.»

میتیا لەبن لێوەوە منجاندی: «دەی باشە، ئەگەر گرینگە...» قوونی دا سەر چرپاکە و گۆرەوییەکانی داکەند. هەستی بە نارەحەتییەکی زۆر کرد. هەموو جلوبەرگیان لەبەردا بوو، ئەم ڕووت و قووت بوو. سەیرە کاتێک جلەکانی دادەکەند، لە هەنتەشی ئەواندا بە جۆرێک هەستی بە تاوان دەکرد. هێندەی نەمابوو بڕوا بکا لەوان کەمترە و ئێستا هەقیانە ڕقیان لێیبێ. لەپەستا دەیگوت: «لە شوێنێک کە هەموو ڕووت بن، پیاو هەست بە شەرمەزاری ناکا، بەڵام کە کەسێک ڕووت بێ و هەموو پۆشتە بن و تەماشای بکەن، زۆر ناخۆش و شوورەییە. لە خەون دەچێ. هێندێ جار لە خەونمدا دیتوومە ئاوا تووشی شەرمەزاری بووم.» داکەندنی گۆرەوی بەلایەوە شوورەیی بوو. گۆرەوییەکانی زۆر پیس بوون. جلەکانی ژێرەوەشی هەروا، هەمووشیان چاویان لێدەکرد. لەوەش خراپتر زۆری ڕق لە لاقی خۆی بوو. هەمیشە پێی وابوو قامکە کەڵەی لاقی زۆر قۆڕ و دزێوە. بەتایبەت قامکە کەڵەی ڕاستەی کە زۆر زل و پان و خوار و خێچ بوو، دەتگوت لەتکە کۆڵووە، هەموویان چاویان لێدەکرد. هەستی بە شەرمەزارییەکی لەڕادەبەدەر دەکرد، ئەوەندەی دیکە ڕقی هەستا و گرژ بوو.

- ئەگەر پێتان عەیب نییە؛ پێتان خۆشە، چاو لە شوێنێکی دیکەشم بکەن!
- نا، جارێ پێویست ناکا.

میتیا بە حاڵەتێکی شێتانەوە گوتی: «دەی، من دەبێ هەروا ڕووت و قووت ڕاوەستم؟»

- بەڵێ، جارێ چارەیەکی‌ترمان نییە. تکایە تاوێک لێرە دانیشە. دەتوانی لێفەیەک لە خۆت پێچی. منیش... سەرێک بەوانەدا ڕادەگەم.

هەموو ئەو جلوبەرگانەی لە بەریان داکەندبوو، پیشان شایەدەکانیان دا. ڕاپۆرتی پشکنین نووسرایەوە و پاشان نیکۆلای پارفنۆویچ ڕۆیشتە دەرێ، بەدوای ئەودا جلەکانیشیان بردە دەرێ. ئیپۆلیت کیریلۆویچیش چووە دەرێ، لەگەڵ گوندنشینەکان ماوە، هەموو بێدەنگ ڕاوەستابوون و چاویان لە سەر هەڵنەدەگرت. لێفەکەی لە خۆی پێچا. هەستی بە سەرما کرد و لاقە ڕووتەکەی لە لێفەکە هاتبووە دەرێ و نەیتوانی وا لێفەکە بە سەر خۆیدا بکێشێ لاقی بەدەرەوە نەبێ. پێی وابوو نیکۆلای پارفنۆویچ لەمێژە چۆتە دەرێ و «ئیتر تاقەتی لێبڕاوە.» میتیا لێوی خۆی گەست و لە دڵی خۆیدا گوتی:«پێیوایە من توڵەم. ئەو دادوەرە خوێن‌تاڵەش ڕۆیشتووە، بە چاوی سووکایەتییەوە تێی‌ڕوانیوم، ئەم لەشە ڕووت و قووتەی من قێزی هەڵشێواندووە.» لەگەڵ ئەوەشدا، میتیا پێی وابوو، جلەکانی دەپشکنن و بۆی دێننەوە. بەڵام کاتێک دیتی نیکۆلای پارفنۆویچ هاتەوە و چەن کەسی گوندنشین بە دوایدا هاتن و جلوبەرگی دیکەیان بۆ هێنا، ڕقی هەستا.

نیکۆلای پارفنۆویچ، کە بە هۆی سەرکەوتنی لە کارەکەیدا شاد و ڕازی دیاربوو، بە سەرساردی گوتی: «ئەم جلانە لەبەرکە. ماڵی ئاغای گاڵگانۆف ئاوەدان بێ، باش بوو ئەم جلە زیادییانەی پێبوو. ئەم کراسە خاوێنەش هەر لە جانتاکەیدا بوو. گۆرەوی و جلەکانی ژێرەوەت لەبەرکەوە.»

میتیا، بە تووڕەیی و هەڕەشەوە گوتی: «جلی کەسی‌تر لەبەر ناکەم! جلەکانی خۆمم بۆ بێننەوە!»

- نابێ، جلی خۆت هەر باسی مەکە!»

- جلەکانی خۆمم پێبدەنەوە. من قەت ئەم جلە پیسانەی گاڵگانوف لەبەر ناکەم.

زۆری خایاند تا توانییان ڕازییبکەن. بەڵام هەرچۆنێک بوو توانییان ئارامی بکەنەوە. پێیان گوت چونکە جلەکانی خوێناوییە دەبێ بخرێتە سەر دەوسیەکە و ئەوان «تەنانەت هەقیان نییە جلەکانی پێبدەنەوە... چونکە پێویستە بۆ ئاکامی پەروەندەکە.» میتیا ئاخری لە مەبەستەکەیان گەیشت. بە بێدەنگی و پەلەپەل جلەکانی لەبەر کرد. کاتێک خەریکی لەبەر کردنی جلەکان بوو بۆی دەرکەوت لە جلە کۆنەکانی خۆی چاکترە. بەڵام «ئەم گۆڕینی قەڵافەتە»ی خۆی بەدڵ نەبوو. جگە لەوەش «زۆر تەنگ» بوون بە بەری. «دەبێ وەک حەنەکچی خۆم بکەمە عەلامەت... ئەویش بۆ سەرگەرمیی ئێوە!»

دیسان پێیان گوت کە زۆری لە سەر نەڕوا و جلەکان عەیبیان نییە، گاڵگانۆف تۆزێ کەڵەگەتتر و ڕەنگە پانتۆڵەکەی نەختێ درێژ بێ. بەڵام شانی کۆتەکە لە ڕاستیدا زۆر تەنگ بوو.

میتیا بۆڵاندی: «لە دەوری ئەو کارە جوانانەتان گەڕێم! دوگمەکانی دەبێ بە زۆری داخەم، ناگاتەوە. تکایە لە لایەن منەوە عەرزی گاڵگانۆف بکەن من داوای جلوبەرگم لێنەکردووە، لە من ناوەشێتەوە وەک حەنەکچییان جلوبەرگم پێ‌لەبەرکەن.»

نیکۆلای پارفنۆویچ منجاندی: «لەو مەبەستە بە تەواوی حاڵییە و زۆریش بۆت بەداخەوەیە.... لەبەر جلەکانی بەداخەوە نییە، لەبەر ئەم بەسەرهات و ماجەرایە بۆت پەرۆشە.»

- چاوی دەرێ! دەی ئێستا بچم بۆ کوێ؟ دەبێ هەر لێرە ئاوا دانیشم؟

داوایان لێکرد بچی بۆ «وەتاغێکی دیکە». ئەویش لە ناخەوە ڕق هەڵیدەچۆقاند و نەیدەویست هەر چاویش لە دەوروبەرییەکانی بکا. سەری داخست و ڕۆیی بۆ وەتاغەکەی دیکە. بە لیباسی کەسێکی دیکەوە هەستی بە شەرمەزاری دەکرد. لەبەر چاوی گوندنشینەکان و بەتایبەت لەبەر چاوی تریفۆن بۆریسیچ، خۆی بە ئابڕووچوو دەزانی. چونکە تریفۆن بۆریسیچ لە

سووچی دەرگاکەوە سەرێکی کێشا و لەپڕ ون بۆوە. میتیا لە دڵی خۆیدا گوتی: «هاتووە بە جلی قەشمەرییەوە بمبینێ.» لە سەر کورسیلەکەی پێشوو دانیشت. هەستی بە سووکوچرووکییەکی لەڕادەبەدەر دەکرد، دەتگوت شێت بووە. وەددانەچیرە کەوتبوو، ڕوویکردە دادوەر و گوتی: «دەی ئەمجار چدەکەن؟» دەتانهەوێ فەلاقەم کەن؟ جگە لەوە چیی‌تر ماوە؟» چاوی لە نیکۆلای پارفنۆویچ نەدەکرد، دەتگوت چاوی بەرایی نادا بیبینێ. «بە وردی چاوی لە گۆرەوییەکانی کرد و ئەمدیوەودیوی کردن بۆ ئەوەی هەموو بیبینن چەندە پیسە ـ پیاویلکەی هیچوپووچ!»

نیکۆلای پارفنۆویچ، وەک ئەوەی وەڵامی میتیا بداتەوە، گوتی: «چاکە، ئێستا دەبێ دەستبکەین بە لێپرسینەوە لە شایەدەکان.»

دادوەر دەتگوت لەبیری بابەتێکدایە، بە شێوەیەکی بیرمەندانە گوتی: «بەڵێ.»

نیکۆلای پارفنۆویچ لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، ئێمە بە قازانجی تۆ ئەوەی لە دەستمان هاتووە کردوومانە، بەڵام چونکە لەبەر قۆڕەدەماخی و قرخەمەرەزی ناتەوەێ پێمانبڵێی ئەو پارەیەت لەکوێوە هێناوە، ئێستا ئێمە ناچارین...»

میتیا، دەتگوت لە گۆمی بیرکردنەوەدا نوقمبووە و لەپڕ سەری دەرهێناوە، پەڕییە نێو قسەکانی: «نقێمی ئەو ئەنگوستیلەی تۆ چییە؟ ئاماژەی بە یەکێ لە ئەنگوستیلەکانی نیکۆلای پارفنۆویچ کرد.

نیکۆلای پارفنۆویچ بە سەر سووڕمانەوە گوتی: «ئەنگوستیلە؟»

میتیا وەک منداڵێکی ڕق کردوو، پێی چەقاند: «ئەرێ، ئەوەیان... ئەوەی قامکی نێوەڕاست، دەڵێی ماست و دۆشاوە، بەڕاستی نقیمێکی جوانە!»

نیکۆلای پارفنۆویچ بە پێکەنینەوە گوتی: «زەبەرجەدی دوودییە. دەتەوێ چاوی لێکەی؟ ئێستا دایدەکەنم...»

میتیا، کە لە ناکاو لە بیر کردنەوە هاتبووە دەرێ، ڕقی لە خۆی هەستا و گوڕاندی: «نا، دایمەکەنە... دایمەکەنە..... پێویست ناکا... بەزیاد نەبێ.... ئاغایان،

دڵتان پیسکردووم! پێتان وایە ئەگەر باوکمم کوشتبێ، لێتانی دەشارمەوە، درۆدەکەم و خۆم دەشارمەوە؟ دڵنیا بن ئەگەر بمکوشتبایە حاشام لێنەدەکرد. نا، ئەوە ڕەوشتی دیمیتری کارامازۆف نییە، لە دەستم نایە، ئەگەر تاوانبار بوایەم، سوێندتان بۆ دەخۆم، چاوەڕوانی هاتنی ئێوە نەدەبووم، یان چاوەڕوانی هەڵاتنی خۆر. هەروەک سەرەتا. بڕیارمدابوو، بەڵکو بەر لەوەش، بێ ئەوەی چاوەڕوانی کازیوەبم، خۆم دەکوشت! سەبارەت بە خۆم لێم ڕوونە و زۆر باش دەزانم. لە ماوەی بیست ساڵدا بە ئەندازەی ئەم شەوە نەگبەتییە فێر نەبووم، زۆر شتم هاتە دەست!... ئەگەر لە ڕاستیدا قاتڵی باوکم بوایەم، لەم شەوەدا و لەم کاتەدا، چۆن ئاوا لەگەڵ ئێوە دادەنیشتم؟ ئاوا قسەمدەکرد و ئەوە هەڵسوکەوتم دەبوو، ئاوام لە ئێوە و لە دنیا دەڕوانی! من شەوی ئەمشەو لە تاوی ئەوەی نەکا گریگۆریم کوشتبێ عەجمانم نەبوو ـ نەک لە ترسانا ـ نەک لە ترسی سزای ئێوە! لە ترسی ڕیسوایی! ئێستاش دەتانهەوێ لەگەڵ ئێوەی قەشمەری، کە وەکو جرجە کوێرە هیچ نابینن و باوەڕ بە هیچ ناکەن، ڕاست و ڕەوان بدوێم؟ کارێکی درێوی دیکە بکەم، ڕیسواییەکی دیکە، بۆ ئەوەی ببێتە هۆی ڕزگاریم لە تۆمەتەکانتان؟ نا، ڕۆیشتن بۆ سیبریا زۆر بە باشتر دەزانم! ئەو کەسەی دەرگای وەتاغەکەی باوکمی کردۆتەوە، هەر ئەو لەو دەرگایەوە چۆتە ژوورێ و کوشتوویەتی و تالانی کردووە. ئەو کەسە کێیە؟ ـ خەریکم گوشار بۆ مێشکم دێنم، بەڵام تێناگەم کێبووە. بەڵام دەتوانم پێتان بڵێم کاری دیمیتری کارامازۆف نییە و لەوەش زیاتر هیچ قسەیەکم نییە پێتانی بڵێم، هەر ئەوەندە و تەواو، ئیتر دەستم لەکۆڵ کەنەوە... شاربەدەرم کەن، سزامبدەن، بەڵام ئیتر لەوە زیاتر ئازارم مەدەن. ئیتر زمانم ناگەڕێ. شایەدەکانتان بانگ کەن!»

میتیا ئەم دەردە دڵە لەناکاوەی وەها بە زماندا هات کە دەتگوت بڕیاریداوە لەمەبەدواوە متەق نەکا. دادوەر چاوی لە سەر هەڵنەدەگرت، تەنیا کاتێک کە میتیا دەستی لە قسەکردن هەڵگرت، بە قەڵافەتێکی جیددی و ئارامەوە، وەک ئەوەی قسەیەکی زۆر ئاسایی کردبێ، هەڵیدایە:

ـ سەبارەت بە کرانەوەی ئەو دەرگایەی ئێستا باستکرد، چاکتر وایە شایەدییەکی زۆر باش کە بۆتۆش و بۆ ئێمەش گرینگایەتییەکی زۆری هەیە و گریگۆری، ئەو پیرە پیاوەی بریندارتکرد، ئەم شایەدییەی داوە، دەبێ پێتانی ڕاگەیەنین، ئەو دوای چاک بوون و وەهۆش هاتنەوە، لە وەڵامی پرسیاری ئێمەدا بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا گوتی دوای ئەوەی دێتە سەر پلیکانەکان، لە نێو باخەکەدا گوێی لە دەنگە دەنگێک دەبێ. بڕیار دەدا بەو دەرگا چکۆڵەدا کە ئاوەڵا بووە، بچێتە نێو باخەکەوە، بۆی دەردەکەوێ ئێوە، هەر وەک خۆشت دانت پیانا، لە تاریکایی لای ئەو پەنجێرەیەوە کە چاوت بە باوکت کەوت، خەریکی هەڵاتنی و ئەویش، یانی گریگۆری، سەرنجی لای چەپ دەدا، کە دەبینێ پەنجێرەکە کراوەتەوە، هەر لەو کاتەدا دەبینێ کە لە مەودایەکی نزیکترەوە، دەرگای وەتاغەکەی باوکت کە بە سەر باخەکەوەیە لە سەر ڕەقی پشتکراوەتەوە ـ هەر ئەو دەرگایەی کە جەنابت دەڵێی لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە لە باخەکەدا بووی پێوەدراوە. لێت ناشارمەوە کە گریگۆری خۆی لێی ڕوونە و شایەدی دەدا کە لەو درگایەوە چوویەتە ژوورێ. ئەگەرچی، بە چاوی خۆی نەیدیوە ئەو کارە بکەی. چونکە لە مەودایەکی دوور لە دەرگاکە چاوی بە تۆ دەکەوێ کە بەرەولای نەردەکان هەڵدێی.

میتیا، لە نیوەی ئەو قسانەدا، لە سەر کورسیلەی هەستابووە پێ. بە شڵەژانێکی شێتانەوە گوڕاندی: «قسەی قۆڕە! درۆیەکە بە ڕێدا دەڕوا. ئیمکانی نییە ئەو دەرگایەی بە کراوەیی دیبێ، من بە چاوی خۆم دیم داخرابوو، درۆ دەکا!»

ـ بە ئەرکی خۆم دەزانم پێتڕاگەیەنم کە بە تەواوی لە سەر قسەکانی خۆی پێداگری دەکا. لەسەری سوورە و بە قسەی خۆی وەک ڕۆژ لێی ڕوونە. چەند جاریشمان لێپرسینەوە لەگەڵیا ئەنجامداوە، هەروا دەڵێ.

نیکۆلای پارفنۆویچ بە گەرموگوڕی وتەکانی دادوەری سەلماند: «بەڵێ وایە. چەنجارمان لێپرسینەوە لەگەڵیا ئەنجامداوە.»

میتیا دیسان گوڕاندی: «درۆیە، درۆ! هەوڵێکە بۆ ئابڕووبردنی من، ئەویش بە گومانی شێتوپێتێک. خوێنی لەبەر ڕۆیوە، بریندار بووە، ئەقڵی لە سەر خۆی نەماوە و وڕێنە دەکا. حەتمەن کاتێک تووشی ئەو گومانە بووە کە خۆی.... وڕێنە دەکا.»

ـ بەڵێ، بەڵام ئەو دەرگاکەی دیوە کراوەتەوە، ئەویش نەک دوای بریندار بوونەکەی، بەڵکو بەر لەوە، یانی کاتێک کە دەچێتە نێو باخەکەوە.

میتیا بە هەناسەبڕکێ گوتی: «بەڵام درۆیە! وانییە! ڕقی لێمە بۆیە دەیەوێ ئابڕووم بەرێ... لێم ڕوونە نەیدیوە... من لە دەرگاکەوە نەچوومە ژوورێ.»

دادوەر ڕووی لە نیکۆلای پارفنۆویچ کرد و فەرمانی پێدا:

ـ پیشانیدە.

ـ دەی ئەم پاکەتەت لەبیرە؟

نیکۆلای پارفنۆویچ پاکەتێکی گەورە و ئەستووری لە سەر مێزەکە دانا، کە سێ دانە لە مۆرەکانی هەروا دەست نەخواردوو مابۆوە. پاکەتە خاڵی بوو و سەرێکی هەڵپچڕابوو.

ـ حەت... حەتمەن پاکەتەکەی باوکمە، پاکەتێک کە سێ هەزار ڕۆبڵی تێدا بوو... ئەگەر لەسەری نووسرابێ: «بۆ کۆترەکەم»... ئەرێ ـ سێ هەزار! تێدەگەن، سێ هەزار، تێدەگەن؟

ـ هەڵبەت کە تێدەگەن. بەڵام پارەکەی تێدا نەمابوو. خاڵی بوو و لە سەر عەرزەکە لە پاڵ چرپاکەدا، لە پشت پەردەکە کەوتبوو.

میتیا چەن ساتێک وا وشکبوو دەتگوت لە کارەبات داوە.

لەناکاو ئەوەندەی هێزی تێدا بوو نەڕاندی: «ئاغایان کاری ئیسمیر دیاکۆفە! ئەو باوکمی کوشتووە و تاڵانی کردووە! هیچکەسی تر نەیدەزانی باوکم ئەو پاکەتەی لەکوێ شاردۆتەوە. کاری ئیسمیر دیاکۆفە، ئێستا ڕوون بۆوە!»

ـ بەڵام تۆش شوێنی پاکەتەکەت دەزانی کە لە بن باڵنجەکەیدایە.

«نا من خەبەری ئەوەم نەبووە. قەتیشم نەدیوە. ئەوە یەکەم جارە دەیبینم. لە ئیسمیر دیاکۆفم بیستووە... جگە لەو هیچ کەسی دیکە نەیدەزانی پیرەپیاو لەکوێی شاردۆتەوە، من نەمدەزانی....» میتیا بەجارێ کەوتبووە هەناسەبڕکێ.

ـ بەڵام ئێوە خۆتان پێتان گوتین کە پاکەتەکە لە ژێر باڵنجەکەی باوکی ڕەحمەتیت دایە، کەوایە خەبەرت بووە لە کوێیە.

نیکۆلای پارفنۆویچ سەلماندی و گوتی: «یادداشتیشمان کردووە.»

«قۆڕیاتە! وڕێنەیە! من نەمزانیوە لە ژێر باڵنجەکە دایە. ڕەنگە لە ژێر باڵنجەکەشیدا نەبوو بێ... لەخۆڕا کوتوومە لە ژێر باڵنجەکەی دایە. ئیسمیر دیاکۆف دەڵێ چی؟ لەوتان پرسیوە پاکەتەکە لەکوێبووە؟ ئیسمیر دیاکۆف دەڵێ چی؟ خاڵی سەرەکی ئەوەیە.... من بە هەڵە چووم و بە زیانی خۆم درۆم کرد... بەبێ بیرکردنەوە پێمگوتن لە ژێر باڵنجەکە دایە، ئێستاش ئێوە... ئەرێ، ئێوە دەزانن پیاو چۆن قسەی ناڕاست دەکا، بێ ئەوەی مەبەستێکی هەبێ. هیچ کەس جگە لە ئیسمیر دیاکۆف ئاگاداری ئەو پاکەتە نەبووە. تەنیا ئیسمیر دیاکۆف ئاگادار بووە و بەس... تەنانەت بە منیشی نەگوت پاکەتەکە لەکوێیە!» میتیا کە پەیتا پەیتا قسەکانی دووپاتدەکردەوە و جار لەگەڵ جار زیاتر تووڕە دەبوو و هەڵدەچوو، وەک شێت و هار نەڕاندی: «کار، کاری ئەوە، کاری خۆیەتی؛ شکی تێدا نییە، قاتڵ ئەوە، ئێستا ئیتر وەک ڕۆژ ڕووناکە. دەبێ سەرنجی ئەو بابەتە بدەن و خێرا قۆڵبەستی کەن... حەتمەن ئەو کاتە کوشتوویەتی کە من خەریک بووم هەڵدەهاتم و گریگۆری بێهۆش بووە، ئێستا ڕوون بۆوە... عەلامەتەکەی داوە و باوکم دەرگاکەی بۆ کردۆتەوە... چونکە جگە لە ئەو هیچ کەس ئەو عەلامەتەی نەدەزانی و بە بێ ئەو عەلامەتە باوکم دەرگای لە هیچکەس نەدەکردەوە....»

دادوەر هەروا خۆگرانە و بە لەسەرخۆیی قسەیدەکرد و هەوای سەرکەوتن بە وتەکانییەوە دیار بوو: «بەڵام تۆ دیسان خەریکی بارودۆخەکەت لەبیر دەچێتەوە، ئەویش ئەوەیە ئەو کاتەی تۆ لەوێ بووی، یانی ئەو کاتەی لە نێو باخەکەدا بووی دەرگاکە کرابێتەوە، پێویست بە عەلامەت نەبووە...»

میتیا لە ژێر لێوەوە منجاندی: «دەرگا، دەرگا»، ئیتر متەقی نەکرد و چاوی لە دادوەر بڕی. لەبەر ناچاری سەری بەخوزدا گرت. هەموو بێدەنگ بوون. ئەویش، بەوپەڕی واق وڕمانەوە چاوی لەبەر پێی خۆی بڕیبوو، بە سەر سووڕمانەوە گوتی: «ئەرێ، دەرگا!... ئەوە لە کامووس دەچێ! خودا غەزەبی لێگرتووم!»

دادوەر لە درێژەی قسەکانیدا قۆڕەدەماخانە گوتی: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، وەرە کڵاوی خۆت بکە قازی. لە لایەکەوە بەڵگەی ئەوەمان هەیە کە دەرگاکە کراوەتەوە و لەوێوە هەڵاتووی، ڕاستییەکە کە تۆش و ئێمەشی تووشی پەرۆشی کردووە. لە لایەکی دیکەشەوە ئەم ڕاستی نەگوتن و قرخەمەرەزی و خیشەسەرییەتان کە ناڵێن ئەو پارەیەی کە بە دەست ئێوەوە دیتوویانە، ئەوەش لە کاتێکدا کە چەند سەعات بەر لەوە بە قسەی خۆشت، بۆ دەرۆبڵ دەمانچەکانت بە بارمتە داناوە! بە سەرنجدان بەو ڕاستییە، خۆت قازی بەو قەزاوەت بکە. دەبێ ئێمە بڕوا بە چی بکەین و پشت بەچی ببەستین؟ ئەو تەشەر و توانجەشمان پێدامەدە کە «مرۆڤێکی وشک و قەشمەری و لاڕێین»، چونکە باوەڕ بە قسەکانت ناکەین کە لە دڵتەوە هەڵدەقوڵێ... تۆ ئەگەر خۆت لەجێی ئێمە بی چ دەکەی؟...»

میتیا بەجارێ شڵەژابوو. بە ڕەنگی هەڵبزڕکاوەوە هەڵیدایە: «زۆر چاکە! ڕازەکەی خۆمتان پێدەڵێم. پێتاندەڵێم پارەکەم لەکوێ هێناوە!... ڕیسواییەکەم ئاشکرادەکەم، با لەمەبەدواوە خۆم و ئێوە سەرکۆنە نەکەم.»

نیکۆلای پارفنۆویچ بە شادییەکی ئاشکراو تا ڕادەیەک نەرمونیانەوە گوتی: «بڕوا بکە، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، هەر چەشنە دانپیانان و ڕاستی گوتنێکی ئێوە لەم کاتەدا، دڵنیابە دواتر، کاردانەوەیەکی باشی دەبێ و بە قازانجتە. جگە لەوەش، لەوانەیە، لە ڕاستیدا...»

بەڵام دادوەر لە ژێر مێزەکەوە لاقی لە لاقیدا و ئەویش قسەکەی خۆی خواردەوە. لە ڕاستیدا میتیاش قسەکەی ئەوی نەبیستبوو.

## (٧)

# لە بێدەنگیدا گوێ لە ڕازی گەورەی میتیا دەگرن

میتیا، هەروا بە شڵەژاوی گوتی: «بەڕێزان، دەمەوێ ڕاست و ڕاوان دانی پیابنێم: ئەو پارەیە هی خۆم بوو.»

بازپرسەکان چاویان زەقکردەوە. چاوەڕوانی ئەوەیان هەر نەدەکرد.

نیکۆلای پارفنۆویچ پچڕ پچڕ گوتی: «مەبەستت چییە؟ ئەویش لە کاتێکدا کە سەعات پێنجی ئەو ڕۆژە، بە قسەی خۆت...»

ـ بە گۆڕی بابی سەعات پێنج و قسەی خۆمەوە. ئێستا هیچ پێوەندییەکی بەوانەوە نییە! ئەو پارەیە هی خۆم بوو، هی خۆم، یانی خۆم دزیبووم... یانی، نەک هی خۆم بێ، بەڵکو خۆم دزیبووم، هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵ بوو، هەمووشی لەلای خۆم بوو، تا ئێستا...

ـ ئاخر لەکوێت هێنا؟

ـ لە ملی خۆمم دەرکێشا، ئاغایان لەم ملەم.... ئالێرەدا بوو، لە ملم کردبوو، بە پەڕۆیەکمدا دووریبوو، لەمێژ بوو لە ملم دەکرد، مانگێک دەبوو لە ملمدا بوو.... بەوپەڕی شوورەیی و ڕیسواییەوە!

ـ ئەی لە کێت.... ڕفاندووە؟

ـ مەبەستت ئەوەیە کە «دزیومە؟» ڕوون قسەکەت دەربڕە. بەڵێ، بە بڕوای خۆم دزیبووم، بەڵام ئەگەر تۆ وات پێباشە، «ڕفاندم». بە بڕوای خۆم دزیم. ڕاستت دەوێ دوێشەو دزیم.

ـ دوێشەو؟ بەڵام گوتت مانگێک دەبێ... وەدەستت هێناوە؟...

ـ بەڵێ. بەڵام لە باوکمم نەدزی. لە باوکم نا، دڵی خۆتان شلوێ مەکەن. لە باوکمم نەدزی. بەڵکو لە ئەو. لێمگەڕێن با ڕاست و ڕەوان پێتانبڵێم. بڕوا بکەن

کوتنەکەی زۆر دژوارە. دەزانی چی، مانگێک لەمەوبەر کاترینا ئیوانا وێرخۆفتۆسۆف، دەزگیرانی پێشووم، ناردی بەدوامدا. دەیناسن؟

ـ بەڵێ، زۆر چاک.

ـ دەزانم دەیناسن. خانەدانە، خانەدانتر لە هەموو خانەدانان. بەڵام لەمێژە ڕقی لە من هەڵگرتووە، پێی خۆش نییە. بمبینێ. لەمێژە.... هەقیشیەتی لێم جاڕز بێ!

نیکۆلای پارفنۆویچ بە سەر سووڕمانەوە گوتی: «کاترینا ئیوانا!» دادوەریش چاوی زیت کردەوە.

ـ ناوەکەی بە کەم مەگرن! منی هیچوپووچ خەریکم پێی ئەویش تێوە دەدەم. بەڵێ، تێگەیشتووم لێم وەڕەزە... لەمێژە.... هەر لە سەرەتاوە، تەنانەت ئەو ڕۆژە عەسر لە وەتاغەکەی خۆمدا.... بەڵام بەسە، ئیتر بەسە. ئێوە شیاوی ئەوە نین بیزانن. هەر پێویستیش نییە.... تەنانەت پێویستە بڵێم مانگێک لەمەوبەر ناردی بە دوامدا و سێ هەزار ڕۆبڵی پێدام کە بۆ خوشکی و یەکێکیتر لە خزمەکانی بنێرم بۆ مۆسکۆ. (دەتگوت خۆی ناتوانێ بینێرێ!) منیش.... ڕاست لەو کاتە نەخسەی ژیانمدا بوو کە... من لە ڕاستیدا لەو کاتەدا دڵم لە داوی کەسێکی دیکەدا بوو، کە ئێستا لە خوارێ دانیشتووە. مەبەستم گرووشنکایە. هەر ئەو کاتە گرووشنکام هێنا بۆ ئێرە ـ ماکرۆیە ـ بە دوو ڕۆژ نیوەی ئەو سێ هەزار ڕۆبڵە نەگبەتییەم بە با دا، بەڵام نیوەکەی دیکەم لەلای خۆم ڕاگرت. بەڵێ، نیوەکەی دیکەی، ئەو هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵەم وەک قەڵادە لە ملی خۆم کرد، بەڵام دوێنێ دەرمهێنا و دەستمکرد بە خەرجکردنی. ئەوەی ماوەتەوە، ئەو هەشتسەد ڕۆبڵەیە کە بە دەست خۆتانەوەیە، نیکۆلای پارفنۆویچ، لەو هەزار و پێنجسەد ڕۆبڵەی دوێنێ پێمبوو، هەر ئەوەندەی ماوە.

ـ ببوورە. شتی وا دەبێ؟ مانگێک لەمەوبەر لێرە بووی، سێ هەزار ڕۆبڵت خەرجکرد، نەک هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵ، هەموو ئەوە دەزانن.

ـ کێ دەزانێ؟ کێ ئەو پارەیەی بژارد؟ هێشتوومە کەسێک بیبژێرێ؟

- ئاخر خۆتان بە هەمووانت گوتبوو کە سێ هەزار ڕۆبڵی تەواوت خەرج کردووە.

- ڕاست دەکەی، گوتم. ئەوەم بە تەواوی خەڵکی شاری گوت. لە نێو خەڵکیشدا بوو بە دەمگۆ. لێرەش لە ماکرۆیە، هەموو پێیانوابوو سێ هەزار ڕۆبڵ بووە. بەڵام سێ هەزار ڕۆبڵم خەرجنەکرد: هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵم خەرجکرد و هەزار وپێنج سەد ڕۆبڵەکەی دیکەم بە پەڕۆیەکدا دووری و لە ملمم کرد. ڕاستییەکەی ئەوەیە، ئاغایان. ئاوا بوو کە دوێنێ ئەو پارەیەم وەدەست کەوت....

نیکۆلای پارفنۆویچ سرتاندی: «وەک مۆجزە دەچێ.»

دادوەر گوتی: «ئیزن بدە بپرسم پێشتر کەست لەو مەبەستە ئاگادار کردۆتەوە، مەبەستم ئەو هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵەیە کە لە مانگی پێشووەوە بۆت مابۆوە؟

- بە هیچکەسم نەگوت.

- سەیرە. مەبەستت ئەوەیە بە هیچکەست نەگوتووە؟

- بەڵێ، بە هیچ عیباد بەشەرێکم نەگوتووە.

- لەبەر چ هۆیەک بە کەست نەگوت؟ مەبەستت لەو ڕازدارییە چی بوو؟ ڕوونتر پێتبڵێم: ئاخری ڕازەکەتان، کە خۆت گوتەنی زۆر «پڕ شوورەیییە»، بە ئێمەت گوتووە، ئەگەرچی لە ڕاستیدا - یانی، هەڵبەت وەک گریمانە - ئەم کارە یانی دزینی ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەی کە هی کەسێکی دیکەیە و هەڵبەت ئەویش بۆ ماوەیەک، لانیکەم بە بڕوای من، کاتێ چاو لە خووخدەی ئێوە دەکەین، کارێکی زۆر نەترسانەیە و زۆریش پڕ شوورەیی نییە... تەنانەت ئەگەر قەبووڵی کەین مەبەستێکی لە ڕادەبەدەر ناحەزە، بەڵام خۆ ناتوانین بە تاوانێکی گەورەی بزانین و پێمان وابێ پاک نابێتەوە. کەسانێکی زۆر، لە ماوەی مانگی ڕابردوودا، سەبارەت بەو سێ هەزار ڕۆبڵەی کاترینا ئیوانا کە خەرجتکردووە، بۆچوونی جۆراوجۆریان بووە، تەنانەت خۆشم بێجگە لە دانپیانانەکەت، ئەو نەقڵەم بیستووە... میخاییل ماکارۆویچیش، بیستوویەتی.

هەر بۆیە لە ڕاستیدا نەقڵ نییە، بەڵکو بنێشتە خۆشکەی سەر زاری هەموو خەڵکی شارییە. ئەگەر بە هەڵە نەچووبێتم، بەڵگە گەلێکیشمان بە دەستەوەیە کە ئێوە خۆتان لەلای کەسێک درکاندووتانە. مەبەستم ئەو پارەیە کە هی کاترینا ئیوانایە. کەوایە بۆ من جێی سەرسوڕمانە کە تا ئێستا، یانی تا ئەم ساتە، هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵت وەک ڕازێکی گەورە ڕاگرتووە و وادیارە هەستێکی پڕ لە ترست بەو ڕازەوە پێوەند داوە... ناتوانین بە ئاسانیش بڕوا بکەین کە ئەم دانپیانانە دەبێتە هۆی ئازارتان... هەر ئێستا گوتت ڕۆیشتن بۆ سیبریات پێ باشترە لەو دانپیانانە....

دادوەر دەستی لە قسە کردن هەڵگرت. بەجارێ شڵەژابوو. شلوێ بووبوو و هێندەشی نەمابوو تووڕەییەکەی هەڵچێ، بەڵام خۆی پێڕاگیرنەکرا و بەبێ ئەوەی بیر لە قسەکانی بکاتەوە، پچڕپچڕ و منجەمنج کۆلۆکۆی ناخی هەڵڕشت.

میتیا لێبڕاوانە گوتی: «ئەوەی پێم شوورەییە هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵەکە نییە، شوورەییەکە لەوەدایە ئەوەم لەو سێ‌هەزار ڕۆبڵە گێڕاوە و وەلام خست.»

دادوەر بە ڕقهەستاوی بزەی هاتێ و گوتی: «بۆ؟ وەلاخستنی نیوەی ئەو سێ هەزار ڕۆبڵە کە بە شیاوی نازانی، یان پێتوایە «شوورەیییە»، کەچی قاچاندت، دەی لەوە شوورەییتر چییە؟ قاچاندنی سێ هەزار ڕۆبڵ یانی گرینگتر لەو کارەیە وا کردت. لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەو کارەت کرد؟ ـ بۆ ئەو نیوەیت وەلاخست، بە چ مەبەستێک، چ قەستێکت بۆ ئەو کارە هەبوو، دەکرێ پێمان بڵێی؟»

میتیا گوڕاندی: «ئاغایان ویستی سەرەکیی من ئەو قەستەیە! بۆیە وەلامخست چونکە هیچوپووچ بووم. لەبەر خوێڕیەتی، یانی دەستپێوەگرتن، دەستپێوەگرتن لەکاتێکی واشدا ئەوپەڕی خوێڕییەتییە.... ئەو خوێڕییەتییەش مانگێکی تەواوی خایاند.»

ـ جێی باوەڕ نییە. لەگەڵ ئەقڵ ناگونجێ.

- ئێوەم پێسەیرە. بەڵام با ڕوونتر عەرزتان بکەم. ڕەنگە باوەڕ نەکەن. ئەوەی دەیڵێم ئەگەر سەرنجی بدەنێ، بڕوا دەکەن. من سێ هەزار ڕۆبڵم وەک ئەمانەت پێسپێردراوە، بەڵام ئەمانەتەکەم نەگەیاندووە و چووم ملم ناوە لە عەیش و نۆش، پێتانوایە هەمووی خەرج دەکەم و بەیانیی ڕۆژی دوایی دەچمەوە بۆلای و دەڵێم: «کاتیا، هەڵەمکرد و سێ هەزار ڕۆبڵەکەتم لە ئاو کرد،» دەی، ئەوە کارێکی ڕەوایە؟ نا، کارێکی باش نییە و زۆریش ناشیاو و خوێڕییانەیە. منیش دەبمە بوونەوەرێک و تەنانەت بەقەد بوونەوەرێکیشم خۆ پێڕاناگیرێ، وانییە؟ بەڵام ئەوە نابێتە دزی؟ قەبووڵیشی بکەن کە نابمە دزێکی دڵڕەش و خوێڕی! پارەکەم لە ئاو کردووە، بەڵام نەمدزیوە. ئەوە لەلایەک، لە لایەکی دیکەشەوە کە ئەو تۆزێ لەوی دیکە باشترە: جوان سەرنج بدەنە قسەکانم، دەنا لەوانەیە دیسان دۆ و دۆشاو تێکەڵکەم - ئیتر کەوتوومە ئەولای بێتفاقییەوە - جا جوان گوێبگرن: لە سێ هەزار ڕۆبڵ، هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵی لێرە خەرجدەکەم، یانی نیوەی ڕاستی. ڕۆژی دوایی دەچم بۆلای و نیوەکەی بۆ دەبەمەوە: «کاتیا ئەم هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵەم لێوەرگرەوە، من دەعبایەکی هیچوپووچ و خوێڕیم و جێی متمانە نیم، نیوەی پارەکەم زایە کرد و نیوەکەی دیکەشی زایە دەکەم، کەوایە لە دەست ئەو وەسوەسەیە ڕزگارم کە!» دەی ئەمەیان چۆنە؟ منی دەعبای هیچوپووچ، هەر ناوێکم لێدەنێن، بینێن، بەڵام دز نیم، بە هیچ شێوەیەک نابمە دز، ئەگەر دز بوایەم پاشماوەی پارەکەم نەدەبردەوە و هەڵمدەگرت بۆخۆم. ئەویش خێرا تێدەگا، چونکە نیوەی پارەکەم بۆ بردۆتەوە و نیوەکەی دیکەشی کە خەرجم کردووە، بۆی دەبەمەوە. هەوڵدەدەم کاربکەم و ئەو پارەیە پەیدا کەم و بیدەمەوە. کەوایە لەو کاتەدا، بە خوێڕی دەردەچووم، بەڵام بە دز نا، هەرچیتان پێخۆشە پێمبڵێن، بەڵام بە دزم دامەنێن. چونکە ئەو کارە نابێتە دزی!

دادەوەر بسکەی سمێڵی هات و گوتی: «دەزانم جیاوازییەکیان لە نێوان‌دایە، بەڵام سەیر ئەوەیە تۆ تا ئەو ڕادەیە بە جیاوازییەکی بنەڕەتیی دەزانی.»

ـ بەڵێ، پێموایە زۆر جیاوازن! هەموو کەسێک لەوانەیە هیچوپووچ بێ و ڕەنگە هەموو مرۆڤەکانیش هیچوپووچ بن، بەڵام ناتوانن دز بن. بوونە دز هەزار هێندەی هیچوپووچی و خوێڕییەتی دژوارە. هەڵبەت شارەزاییەکی وام نییە ئەو جۆرە جیاوازییانە لێکهەڵاوێرم، ئەویش جیاوازییەکی ئاوا ناسک.... بەڵام دەزانم دز زۆر خوێڕیترە لە مرۆڤی هەرزە و هیچوپووچ، ئەمە بڕوای منە. گوێبگرن، ئەو پارەیەم مانگێکی تەواو لەگەڵ خۆم بەملاوئەولادا گێڕا. لەوانەبوو بڕیار بدەم سبەینێ بیبەمەوە بۆ خاوەنەکەی، ئەو کاتە ئیتر هیچوپووچیش نیم، بەڵام ناتوانم بڕیاربدەم، ئەگەرچی هەموو ڕۆژێ دێمە سەر ئەوەی کارەکە یەکلایی کەمەوە، بڕیاریش دەدەم، بەڵام مانگێکی ڕەبەقە هەرچی دەکەم دەستم لە دڵم نابێتەوە. بە بڕوای ئێوە کارێکی دروستە، بە کارێکی دروستی دەزانن؟

دادوەر بە هێمنی وەڵامیدایەوە: «من ڕێزەیەکیش لەوە ناگەم و بە دروستیشی نازانم. هەروەها قسەشی لێناکەم. ئێستا واچاکە واز لەو باسوخواسە ناسک و پڕ لە جیاوازییە بێنین، ئێوەش تکایە بگەڕێنەوە سەر بابەتی سەرەکی. ئەو بابەتەش کە هێشتا بە ئێمەت نەگوتووە، ئەگەرچی لە ئێوەمان پرسیوە، ئەویش ئەوەیە سەرەتا پێمانبڵێ بۆ پارەکەت کرد بە دوو بەشەوە؟ بۆ نیوەیەت لە ئاو کرد و نیوەکەی دیکەیت شاردەوە؟ ڕاست و ڕەوان پێمان بڵێ لەبەر چ هۆیەک وەلات خست و شاردتەوە، دەتویست ئەو هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵە چی لێبکەی؟ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ ئەو پرسیارە زۆر جیددییە دەبێ وەڵاممان بدەیەوە.»

میتیا بە نێوچاوانی خۆیدا کێشا و هاواریکرد: «باشە، بەسەرچاو! بمبوورن خەریکم ئازارتاندەدەم و ناچمە سەر بابەتی سەرەکی. دەنا لەڕێوە تێدەگەن بۆ ئەو کارەم کردووە، چونکە پێم شوورەییە، لەڕووم هەڵنایە. دەزانی چی، هەمووی خەتای ئەو پیرە پیاوە ڕەحمەتییە، یانی باوکمە. وەک چەققە بە ئاگرافنا ئەلکساندرفناوە نووسابوو، دەستبەرداریشی نەدەبوو، منیش پێمناخۆشبوو و بەخیلیم پێدەبرد. ئەو کاتە پێموابوو گرووشنکا لەو

نێوانەدا گیریکردووە و نازانێ شوو بە کاممان بکا. هەر بۆیە بەردەوام بە خۆمم دەگوت: وایدانێ لە ناکاو بڕیار دەدا و دەست لە ئازاردانی من هەڵدەگرێ و پێمدەڵێ، «تۆم خۆشدەوێ، نەک ئەو؛ بڕۆی بۆ ئەوسەری دنیاش لەگەڵتام.» ئەو کاتە منێکی دەستکورت کە چل کۆپکم زیاتر شک نەدەبرد، چۆن دەمتوانی لەگەڵ خۆم بیبەم، چیم پێدەکرا؟ هەر بۆیە دەفەوتام. ئەو کاتە نەمدەناسی، ئاگام لە دڵیشی نەبوو، پێموابوو پارە بە لای ئەوەوە گرینگە و ناتوانێ ئەو دەستکورتی و نەبوونییەم قەبووڵ بکا. هەر بۆیە دێوئاسایی نیوەی ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەم وەلاخست و لە توورەکەیەکم نا و زارکەکەیم دووری و لە ملم کرد، بەر لەوەی سەرخۆشبم، پارەکەم جیا کردەوە و خستمە توورەکەکەوە؛ پاشان ڕۆیشتم تا بە پاشماوەی پارەکە بەزموڕەزم ساز کەم و چەن سەعاتێک بە سەرخۆشی ڕایبوێرم. بەڵێ، کارێکی خوێڕییانە بوو. ئێستا تێگەیشتن؟»

هەردوو بازپرسەکە دایان لە قاقای پێکەنین.

نیکۆلای پارفنۆویچ بەدەم قاقاوە گوتی: «ئەگەر تەواوی پارەکەت زایە نەکردایە، بە بڕوای من کارەکەت ماقووڵانە و باش دەبوو. چونکە، ئاخرسەر نازانی کارەکەت بە کوێ دەگا و دەبێ بەچی؟!»

ـ کارەکەم بەو جێیە دەگا کە دزیم نەکردووە! خودایەگیان، بەو حاڵی نەبوونەتان وەختە شێتمدەکەن! هەر ڕۆژێک تێدەپەڕێ و ئەو هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵەم دەدی بە ملمدا هەڵواسراوە، بە خۆمم دەگوت: «تۆ دزی! تۆ دزی، دز!» بەڵێ هەر لەبەر ئەوەیە لەم مانگەدا وەک شێت و هارم لێهاتبوو، هەر لەبەر ئەوەش لە مەیخانەی میترۆپۆلیس شەڕ و قڕەم سازکرد، لەبەر ئەوەش شاڵاوم بۆ باوکم برد، هەمووی لەبەر ئەوە بوو خۆم بە دز دەزانی. نەمتوانی بڕیار بدەم، تەنانەت نەموێرا سەبارەت بەو هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵە لەگەڵ ئالیووشای برام بدوێم: یانی ئەوەندەم خۆم بە دز و گیرفانبڕ دەزانی. بەڵام ئەگەرچی پارەکەم هەر پێبوو، سات بە سات بە خۆمم دەگوت: «نا، دیمیتری کارامازۆف، هێشتا تۆ دز نییت.» بۆ؟ چونکە لەوانە بوو ڕۆژی

دوایی ئەو هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵە بەرمەوە بۆ کاتیا و بیدەمەوە. بەڵام هەر دوێنێ، کاتێک لە ماڵی فیناوە ڕۆیشتم بۆ ماڵی پیرخۆتین بڕیارمدا نووشتەکەی ملم هەڵپچڕم. هەتا ئەو کاتە دەستم لە دڵم نەدەبۆوە ئەو کارە بکەم. بەڵام کاتێک هەڵمپچڕی بوومە دزێکی خوێڕی، یانی دزێکی نابار هەتا کۆتاییی تەمەنم. بۆ؟ چونکە بەو کارەم ئەو خەونەشم خراپکرد کە بچم بۆلای کاتیا و بڵێم: «من هیچوپووچم، بەڵام دز نیم! ئێستا تێگەیشتن؟

نیکۆلای پارفنۆویچ پەڕییە نێو قسەکانی: «چی هانیدای دوێنێ نوشتەکەی ملت هەڵپچڕی؟»

- بۆ؟ پرسیارێکی قۆڕە! چونکە دەمویست هەر لێرە سەعات پێنجی بەیانی بەر لە هەڵاتنی خۆر خۆم بکوژم. پێموابوو جیاوازییەکی نییە ئیتر دز بم یان دروستکار. بەڵام ئێستا دەزانم وانییە، دیارە جیاوازیشی هەیە. ئاغایان، بڕوام پێبکەن، ئەوە لە هەموو شتێک زیاتر ئەمشەو ئازاری دەدام و دڵی ڕێک دەکوشیم، بۆ ئەوە نەبوو کە ئەو پیرە پیاوە نۆکەرەم کوشتووە و ڕاست لەو سەروبەندەدا کە بە ئەشقەکەم دەگەم و دەرگای بەختەوەریم بۆ کراوەتەوە، لەوانەیە تووشی مەترسیی سیبیریا بم و شاربەدەر کرێم. ئەوەش ئازاری دەدام، بەڵام نەک بە ئەندازەی ئاشکرا بوونی ئەو پارە نەگبەتییە و خەرج کردنی و بە دز دەرچوونم! ئاخ، برایان، بە دڵێکی پڕ لە کوڵ و زووخاوەوە پێتاندەڵێم کە ئەمشەو زۆر شت فێربووم. تێگەیشتووم هەر وەک بە هیچوپووچی ژیان مەحاڵە، بە هیچوپووچی مردنیش مەحاڵترە... نا، برایان، پیاو دەبێ بە دروستکاری بمرێ...

میتیا ڕەنگی پەڕیبوو. وا شڵەژابوو ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو.

دادوەر بە لەبزێکی ئارام و تا ڕادەیەک دڵسۆزانەوە گوتی: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، خەریکم وردە وردە لە قسەکانت تێدەگەم. بەڵام هەمووی، بە داوای لێبووردنەوە، بە بڕوای من پێوەندەیی بە هەستەدەمارەوە هەیە... تۆ شەکەتی و دیارە هەستەدەماریشت نارەحەتە، جگە لەوەش هیچیتر نییە. بۆ وێنە، بۆ نەدەچووی ئەو هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵە بدەیەوە بەو خاتوونە کە

بە ئەمانەت پێی‌سپارد بووی و خۆت لەو ئازارە ڕزگارکەی و مانگێک خۆتت خستۆتەوە تەنگژەوە؟ بۆ نەدەچووی هەموو شتێکی پێبڵێی؟ ئەوە خۆشت دەڵێی تووشی چ ڕۆژە ڕەشییەک بووی، بۆ پیلانێکی وات دانەڕشت کە بە قازانجت بێ و ئەوەش ئەوەندە دژوار نەبوو بە بیرتدا نەیەت. دەتتوانی بچی زۆر سادقانە دان بە هەڵەکەتدا بنێی، بۆ داوات لێنەدەکرد ئەو بڕە پارەیەت بە قەرز بداتێ کە پێویستت پێیبووە. دڵنیام ئەویش لەبەر دەستودڵبازی درێغیی نەدەکرد و پێیدەدای، چونکە دەیزانی لێتقەوماوە و پێویستیت پێیەتی. بەتایبەت ئەگەر بارمتەشی بۆ دانێی. هەر ئەو وەسیقەی کە پێشنیارت کرد بە سامسانۆف و مادام خۆخلاکۆف. پێموایە ئێستاش ئەو وەسیقەیە بە بایەخ دەزانی.»

میتیا لە ناکاو سوور هەڵگەڕا. لەگەڵ ئەوەی چاوی لە چاوی دادوەر بڕیبوو، دەتگوت بڕوای بەو قسانە نەدەکرد کە گوێی لێبووە، بە تووڕەیی گوتی: «حەتمەن پێتوانییە هیچوپووچێکی خوێڕی و بەدخووم؟ ئەوەت بەڕاستی نییە؟»

ئێستا نۆرەی دادوەر بوو سەری سوڕ بمێنێ: «دڵنیابە بە ڕاستیمە... بۆ پێتوایە بەڕاستم نییە؟»

ـ ئا، ئەگەر ئەو کارەم بکردایە زۆر کارێکی خوێڕییانە دەبوو! ئاغایان، دەزانن، خەریکن ئازارمدەدەن! ڕاوەستن با هەموو شتێکتان پێبڵێم. بەڵێ، دان بە تەواوی ناپاکییەکانمدا دەنێم، بەڵام بۆ ئەوەی ئێوە ڕیسوا بکەم و دەزانم ئێوەش سەرسام دەبن کە بۆتان دەرکەوێ مرۆڤ دەکەوێتە چاڵی شوورەیی و نەنگەوە. ئەوە بزانن خۆشم ئەو پیلانەم لەسەردا بوو، هەر ئەو پیلانەی جەنابی دادوەر ئێستا باستکرد! بەڵێ، ئاغایان، منیش لە ماوەی ئەم مانگەدا ئەوەم لە زەیندا بوو و هەر بەو هۆیەشەوە هێندەی نەمابوو بڕیاربدەم و بچم بۆلای کاتیا ـ بڕیارێکی ئاواش خوێڕییەتیی منی دەگەیاند، بەڵام چوونم بۆلای و داننان بە خەیانەتەکەمدا، هەر لەبەر ئەو خەیانەتەمە، یانی بۆ وەرگرتنی خەرجی ئەو خەیانەتە و بەڕێوەبردنی، سواڵی لێبکەم و دەستی بۆ پان

کەمەوە، یانی دەست بۆ کاتیا پانکەمەوە (سوالّکردن، گوێتان لێیە سوالّکردن)، کە زۆری ڕق لێیەتی و جنێوی پێدەدا ـ ئەوە بۆ قسە لێکردنیش نابێ! جەنابی دادوەر، بۆ شێت بووی شتی وا دەڵێی؟»

دادوەر بە بزەیەکەوە گوتی: « شێت نیم، بەڵام بە تاڵووکە قسە دەکەم، بەبێ بیرکردنەوە... لەو بەخیلییە ژنانەیە... ئەگەر بەوجۆرەی بەیانتکرد، بەخیلایەتییەک لەگۆڕێدا بێ... بەڵێ، ڕەنگە شتێکی لەو چەشنە بووبێ.»

میتیا بە توندی مشتی بە مێزەکەدا کێشا: «بەڵام زۆر شوورەیی دەبوو! ئەوەندە دزێو دەبوو کارەکە، هەر باسیمەکەن! بەڵێ، ڕەنگبوو ئەو پارەیەم بداتێ. حەتمەن دەشیدامێ. ئەو پارەیەی دەدامێ بۆ ئەوەی داخی دڵی خۆیم پێبڕێژێ، تۆڵەم لێبکاتەوە. چونکە خووخدەیەکی دۆزەخییانەی هەیە و زۆر ژنێکی دەخەزدار و بوغزلەزگە. منیش پارەکەم لێ وەردەگرت، ئەرێ وەرمدەگرت. وەرمدەگرت و پاشان هەتا ئاخری عومرم... ئاخ خودایە! ئاغایان بمبوورن، ئەم هەموو هاتوهاوارەم بۆ ئەوە وەڕێ خستووە کە لەم دواییانەدا ئەو بیرەم لە مێشکدا بووە، هەر پێرێ، یانی ئەو شەوەی لەگەڵ لیاگافی تووشی ئەو دەردەسەرییە بووم، دوای ئەویش دوێنێ، کە ئەو ڕووداوەم بۆ هاتە پێشێ...»

نیکۆلای پارفنۆویچ زیرەکانە پرسیی: «ڕووداوت بۆ هاتە پێشێ؟» بەڵام میتیا گوێی لێنەبوو.

میتیا لە کۆتاییدا بە لەبزێکی خەمتێزاوەوە گوتی: «دانپیانانەکەم زۆر ناجۆر بوو. دەبێ قەدری ئەو کارەم بزانن، لەگەڵ ئەوەشدا، دەبێ حورمەتی ڕاگرن. چونکە ئەگەر جگە لەوە بێ، ئەگەر شوێنی لە سەر دانەنابێتن، هیچ ڕێزێکم بۆ دانانێن. بەڕێزان ئەوە بە ئێوە دەڵێم، وەختە لە شەرمانا بشمرم کە لای کەسانێکی وەک ئێوە دانم پیانا. ئاخ، خۆم هەر دەکوژم! بەڵێ، دەزانم، دەزانم بڕوا بە قسەکانم ناکەن.» بە پەرۆشییەوە هاواریکرد: «چی؟! دەتانەوێ ئەوەش یادداشت کەن؟»

نیکۆلای پارفنۆویچ، که به سەر سوڕمانەوە چاوی لێدەکرد گوتی: «بەڵێ، ئەوەی هەر ئێستا گوتت. یانی تا ئەو دوایین کاتەی کە هەروا بیرت دەکردەوە و بۆ قەرز کردنی پارە چووی بۆلای خاتوو وێرخۆفتیسۆف.... دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، دڵنیات دەکەم کە ئەمە بەڵگەیەکی زۆر گرینگە بۆ ئێمە. مەبەستم بۆ پەروەندەکە.... بەتایبەت بۆ خۆت، بەتایبەت بۆ تۆ زۆر گرینگە.»

میتیا دەستی هەڵتەکاند: «ئاغایان، پیاوەتی بکەن ئەوە مەنووسن؛ تۆزێ شەرم بتانگرێ. من لێرە ئەوی لە دڵما بوو بۆم هەڵڕشتن، ئێوەش بە هەلتان زانیوە و دەتانەوێ خوێ لە برینی دڵم بپرژێنن.... ئاخ، خودایە!»

لەبەر هیوابڕاوی هەردوو دەستی بەبەر دەموچاوییەوە گرت.

دادوەر گوتی: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، دڵی خۆت ناڕەحەت مەکە. ئەوەی دەنووسرێ، دواتر بە وردی بۆتانی دەخوێننەوە و هەر بەشێکیت بەدڵ نەبێ، بە مەیلی خۆت دەیگۆڕین. بەڵام ئێستا بۆ سێهەم جار پرسیارێکی چکۆڵەت لێدەکەم. یانی هیچکەس، تەنانەت کەسێک، ئاگاداری ئەو پارەیە نەبووە کە وەک نووشتە دووریوتە و لە ملت کردووە، لای هیچ کەسیش دەنگت نەکردووە؟ دەبێ ئەوەت پێبڵێم، بەڕاستی بڕوا پێکردنەکەی مەحاڵە.»

ـ هیچکەس، بڕوام پێبکەن هیچکەس ئاگادار نەبووە. خۆ پێشتریش پێمگوتن، وادیارە لێم حاڵی نەبوون و تێناگەن! کەوایە بۆ دەستبەردارم نابن؟

ـ زۆر چاکە، بەڵام ئەم مەبەستە هەرچۆنێکە دەبێ لێکۆڵینەوەی لە سەر بکرێ. دەرفەتی زۆریشمان هەیە. بەڵام ئەوەش بزانە ئێمە ڕەنگە دە دوازدە شایەدمان هەبێ، کە خۆت لە لایان باسی خەرجکردنی سێ هەزار ڕۆبڵت کردووە. تەنانەت لە چەند شوێنیش بە دەنگی بەرز گوتووتە؛ سێ هەزار ڕۆبڵ، نەک هەزار و پێنج سەد. ئێستاش، ئەو پارەیەی دوێنێ کە نازانم لەکوێت هێناوە، لە زۆر کەست گەیاندووە کە سێ هەزار ڕۆبڵت پێیە.

میتیا گوڕاندی: «دە دوازدە شایەد سەهلە، سەدان شایەد، یان هەزاران شایەدتان ببێ!»

ـ دەبینی کە هەموو دێن شایەدی دەدەن. وشەی «هەموو» شتێک دەگەیەنێ.

ـ هیچ شتێک ناگەیەنێ. من قسەیەکی قۆڕم کردووە و هەموو کردوویانەتە بنێشتە خۆشەکە.

ـ دەی ناچار بووی ـ خۆت گوتەنی ـ قسەی قۆڕ بکەی؟

ـ شەیتان دەزانێ، ڕەنگە بۆ خۆهەڵکێشان... بۆ ئەوەی ئەو هەموو پارەیەم خەرج کردبوو و خۆی پێوە ڕانێم،.... ڕەنگە بۆ ئەوە بووبێ، ئەو پارەیە لەبیر خۆم بەرمەوە کە لە کیسەکەم دووریبوو و لە ملم کردبوو... ئەرێ، هۆیەکەی ئەوە بوو... لەبەر ئەو کارەتان مرم.... چەندجارم ئەو پرسیارە لێدەکەن؟ جارێک، قۆڕیاتێکم بەڕەڵلا کرد و ئێوەش نایبڕنەوە، جارێک لە دەمم دەرپەڕی، چونکە درۆ بوو نەمویست قسەی خۆم بخۆمەوە، دەی پیاو جاری وایە درۆش دەکا، خۆشتان دەزانن درۆ بۆ چییە؟

دادوەر بە لەبزێکی ماناداراوە گوتی: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، بڕیاردان لەو بارەوە کە چی مرۆڤ هاندەدا بۆ درۆ کردن، زۆر دژوارە. لەوە گەڕێین، پێمبڵێ بزانم ئەو کیسەی پارەکەت تێدووریبوو و لە ملت کردبوو، گەورە بوو یان چکۆلە؟

ـ زۆریش گەورە نەبوو.

ـ ئەندازەکەی چەند دەبوو؟

ـ بە ئەندازەی گەلایەکی سەد ڕۆبڵی کە لە نێوەڕاستدا بینووشتێنییەوە.

ـ واچاکە پەڕۆکەمان نیشاندەی. حەتمەن لە جێیەکت داناوە.

ـ قسەی پووچ! من چووزانم لە کوێیە.

ـ بەڵام ببوورە: کەنگێ و لەکوێ لە ملی خۆت داماڵی و هەڵت پچڕی؟ بە قسەی خۆت نەچوویەوە بۆ ماڵێ.

ـ کاتێ لە ماڵی فینیاوە چووم بۆ ماڵی پێرخۆتین، بە ڕێگاوە هەڵمپچڕی و پارەکەم دەرهێنا.

ـ بەو تاریکە؟

ـ ڕۆشناییم بۆچی بوو؟ بە دەقیقەیەک هەر بە قامک هەڵمپچڕی.

ـ لەو شەقامە، بەبێ مقەست؟

- پێموا لە نێو بازاڕ بوو. مقەستی بۆچبوو؟ کوتە پەڕۆیەکی ڕزەڵۆک بوو. هەر لەڕێوە دڕاندم.

- دوای ئەوە پارەکەت لێدەرهێنا، پەڕۆکەت لەکوێ دانا؟

- هەر لەوێ فڕێمدا.

- ڕاست لە چ شوێنێک؟

- لە نێو بازاڕ، نێوەڕاستی بازاڕ! شەیتان دەزانێ لەکوێ، بۆ دەتانەوێ بزانن؟

- دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، ئەوە زۆر گرینگە. بەڵگەیەکی زیندووە و بە قازانجی خۆتە. چۆن تێناگەی؟ مانگێک لەمەوبەر، کێ یارمەتیدای بیدرووی؟

- هیچکەس، خۆم درووم.

- دروومان دەزانی؟

- سەرباز دەبێ درووما‌ن بزانێ. دوورینی ئەوەش ئەوەندە گرینگ نەبوو شارەزایی بوێ.

- پەڕۆکەت لەکوێ هێنا؟ مەبەستم ئەو تیتۆڵەیە کە پارەکەت تێنا و دووریت؟

- بە شێتم دەزانن؟

- نا، نا، بە هیچ شێوەیەک. دڵنیابە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، نامانەوێ سەر بخەینە سەرت.

- نازانم ئەو تیزماڵکە پەڕۆیەم لەکوێ پەیدا کرد - پێموایە، لە جێگایەک.

- دەمزانی نابێ لە بیرت چووبێتەوە!

- بە شەڕەفم لە بیرم نییە. ڕەنگە لەتێکم لە کراسەکەم بڕیبێ.

- زۆر چاکە. سبەینێ لە مەنزڵەکەتان، ڕەنگە بتوانین کراس یان هەرشتێک کە ئەو کوتەتان لێبڕیوە، بدۆزینەوە. پەڕۆکە ماڵەکەی چیبوو، پەشم بوو یان جاو؟

- خودا دەزانێ چ ماڵێک بوو. تاوێ سەبر کەن... پێموایە لە هیچم نەبڕی. کوتێ جاو بوو... پێموا کڵاوە کۆنێکی خاوەن ماڵەکەم بوو.

- کڵاوی خاوەن ماڵەکەتان؟

- بەڵێ. لەوم وەرگرت.

- چۆنت لێ وەرگرت؟

ـ چاو لێکەن، لەبیرمە جارێک کڵاوێکم لێوەرگرت، کوتیێ پەڕۆم پێویست بوو، بەبێ ئیزنی خاوەن ماڵەکەم هەڵمگرت، پێموا بۆ پاک کردنەوەی قەڵەمەکانم دەمویست. چونکە کڵاوە کۆنێکی لە کەڵک کەوتوو بوو. دڕاندم و پارەکانم نایە بەینی و دووریم. پێموایە ڕاست وابوو، بەڵێ کوتە جاوێک بوو، هەزار جار شۆرابوو.

ـ بە دڵنیایی لەبیرتە؟

ـ تەواو لێم ڕوون نییە. پێموایە هەر لەو کوتە پەڕۆیەم ناودووریم. باشە ئەوە چ گرینگایەتییەکی هەیە؟

کەوایە دەبێ خاوەن ماڵەکەت لەبیری بێ کە کڵاوەکەی ون بووە؟

ـ نا، لەبیری نایە. چونکە ونی نەکرد. تێزماڵکێکی کۆن بوو. با پێتانبڵێم، شیتاڵێک بوو بەکاری هیچ نەدەهات.

ـ دەرزی و دروومانت لەکوێ هێنا؟

میتیا ئاخری لە دین دەرچوو، گوتی: «ئیتر هیچ ناڵێم، بیبڕنەوە.»

ـ باوەڕ ناکەم لە بیرتان چووبێتەوە، کە پەڕۆکەت لە چ شوێنێکی بازاڕ فڕێ داوە.

میتیا بە بزەیەکی تاڵەوە گوتی: «فەرمان بدە سبەینێ تەواوی بازاڕ گسک دەن، ڕەنگە بیدۆزنەوە.» بە دەنگێکی نووساویش درێژەی پێدا: «بەسیکەن، ئاغایان، بەس! دەزانم بڕوا بە قسەکانم ناکەن! تەنانەت بەقەد سەرە دەرزییەکیش! خەتای خۆمە، خەتای ئێوە نییە. نەدەبوو ئاوا حازرجواب بوایەم. بۆ؟ بۆ بەو دانپیانانە و درکاندی ڕازی خۆم بۆ ئێوە، خۆم سووککرد؟ ئێوە بە گاڵتەی دەزانن. ئەوە لە چاوتاندا دەخوێنمەوە. جەنابی دادوەر، تۆ بووی منت تووش کرد! ئەگەر دەتوانی تێهەڵکە لە سروودی سەرکەوتن.... نەحلەت لە ئێوە، هەمووتان ئەشکەنجەگەرن!»

سەری داخست و هەردوو دەستی بەبەر چاوییەوە گرت. بازپرسەکان بێدەنگ بوون. دوای دەقیقەیەک سەری هەڵێنا و بە تووڕەیی چاوی تێبڕین. خەم و ناهومێدی بە ڕوخسارییەوە دیار بوو. ئەوەندە مات و بێدەنگ دانیشتبوو

دەتگوت ئاگای لە دنیا نەماوە. لەم نێوەدا، ئەوان پێویست بوو کۆتایی بە کارەکانیان بێنن. دەبوو خێرا دەستبکەن بە لێپرسینەوە لە شایەدەکان. سەعات بووبووە هەشتی بەیانی، لەمێژ بوو چراکانیان کوژاندبۆوە. میخاییل ماکرۆویچ و گالگانۆف، کە لە هەوەڵ تا ئاخری لێپرسینەوەکە بەردەوام خۆیان بە ژووریدا دەکرد و دەچوونەوە دەرێ. ئێستا هەردووکیان دیسان چووبوونەوە دەرێ. بازپرسەکانیش زۆر شەکەت دیار بوون. بەیانییەکی لێڵ و خەماوی بوو، هەور ئاسمانی تەنیبوو و باران بەخوڕ دەباری. میتیا بە چاوێکی تووڕە و خەماوییەوە لە پەنجێرەکەوە دەیڕوانییە دەرێ.

کتوپڕ، لە نیکۆلای پارفنۆویچی پرسی: «ئیزن دەدن لە پەنجێرەکەوە چاو لە دەرێ بکەم؟»

نیکۆلای پارفنۆویچ وەڵامی دایەوە: «فەرموو، هەرچەندەت پێخۆشە چاو لێکە.»

میتیا هەستا و ڕۆیی بۆ بەر پەنجێرەکە. باران بە لێزمە دەهاتە خوارێ و لە شووشە مەیلە و سەوزەکەی دەدا. ڕێگا پڕ قوڕو چڵپاوەکەی دەدی بە بەر پەنجێرەکەدا هاتبوو. دوورتریش، لەو تەمەلێڵەدا ڕیزی ماڵە لاڕووخاوەکان ڕەش و خەماوی، لەو بارانەدا ڕەشتر و ڕووخاوتر دیار بوون. میتیا بیری لە «فیبسی قژ زێڕین» و هەروەها بڕیارەکەی خۆی کردەوە کە لەگەڵ یەکەم گزنگی بە گولله لە خۆی دەدا. بە بزەیەکەوە بە خۆی گوت: «لە بەیانییەکی ئاوادا تەنانەت زۆر باشتریش دەبوو.» لە ناکاو دەستی بەرداوە و ڕووی لە «ئەشکەنجەگەرەکانی» کرد و گوڕاندی:

ـ ئاغایان، دەزانم فەوتاوم! بەڵام ئەو؟ پێمبڵێن، تکاتان لێدەکەم، خۆ ئەویش لەگەڵ من نافەوتێ؟ خۆ دەزانن بێتاوانە، دوێشەویش کە هاواریکرد: «هەمووی خەتای منە»، هۆشی لەسەرخۆ نەبوو! ئەو هیچ خەتایەکی نییە. ئەمشەو هەتا بەیانی کە لەگەڵ ئێوە دانیشتبووم، بیرم هەر لەلای ئەو بوو، زۆرم خەمی ئەوە.... دەکرێ پێمبڵێن ئەو چ لێدەکەن؟

دادوەر بە تامەزۆییەکی ئاشکراوە گوتی: «خەمی ئەوت نەبێ، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ. تا ئەم ساتە هیچ بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نییە خۆ لە کاری ئەو خاتوونە هەڵقوتێنین کە تا ئەو ڕادەیە هۆگریت پێیەتی. دڵنیام لە داهاتووشدا هەروا دەبێ و کارمان بە سەر ئەوەوە نییە.... لەو بارەوە ئەوەی لە دەستیشمان بێ دریغی ناکەین. خاترجەم بە.»

ـ ئاغایان، زۆرتان سپاس دەکەم. دەزانم سەرەڕای ئەو شتانە، ئێوە مرۆڤگەلێکی دروستکار و ڕووڕاستن. بارێکتان لە سەر دڵم سووک کرد... چاکە ئێستا دەبێ چبکەین؟ من ئامادەم.

ـ دەبێ پەلە بکەین. دەبێ هەرچی زووتر دەستبکەین بە لێپرسینەوە لە شایەدەکان. ئەم کارەش دەبێ بە حزووری ئێوە بەڕێوە بچێ، کەوایە....

نیکۆلای پارفنۆویچ پەڕییە نێو قسەکانی: «چاکتر نییە جارێ چایەک بخۆینەوە؟ پێموایە هەقی ئەوەمان هەیە!»

هاتنە سەر ئەوەی ئەگەر چایی ئامادە بێ لە قاتی خوارێ (میخاییل ماکارۆویچ بێگومان بۆ خواردنەوەی چایی چووبووە خوارێ) چاییەک بخۆنەوە و پاشان «بچنەوە سەر لێپرسینەوەکە» و خواردنی ناشتاییش هەڵگرن بۆ دەرفەتێکی لەبار. وادیارە چایی ساز بووە و خێرا هێنایانە سەرێ. نیکۆلای پارفنۆویچ بە ڕێزەوە پەرداخێکی چایی هەڵگرت و خولکی کرد، میتیا لێی وەرنەگرت. بەڵام پاشان خۆی داوای چایی کرد و پەرداخێکی هەڵقوڕاند. زۆر شەکەت و بێهێزی دەنواند. کاتێک بیرت لە هێز و گوڕی دەکردەوە، قەت پێتوانەبوو شەوێک خواردنەوە و دڵەخورپە ئاوا شوێنی لە سەر دادەنێ. بەڵام هێندە ماندوو بوو، هەستیدەکرد بە زۆر سەری ڕاگرتووە و جارجار سەری لەگێژەوە دەهات و چاوی ڕێشکە و پێشکەی دەکرد. بە خۆی گوت: «تاوێکی دیکە، دەکەومە وڕێنە کردن.»

# (٨)

## شایەدانی پڕ مەترسی (زارۆکی بەستەزمان)

لێپرسینەوەی شایەدەکان دەستی پێکرد. بەڵام لە سەر ڕەوتی پێشوو درێژە بە چیرۆکەکەمان نادەین. کەوایە خۆ لەو باسە نادەین کە نیکۆلای پارفنۆویچ هەر شایەدێکی بانگدەکردە ژووریٚ، بە پێداگرییەوە داوای لێدەکرد، ڕاست و ڕەوان و بەبێ پێچووپەنا و بە ویژدانەوە شایەدییەکەی بدا و پاشان سوێند بخوا، داوا لە هەموو شایەدەکانیش دەکرا شایەدنامەکە ئیمزا بکەن و... هتد. تەنیا ئەوەندە دەڵێین کە ئەوەی لە کاتی لێپرسینەوەی شایەدەکاندا پێداگریی لە سەر دەکرا، لە بابەت سێ هەزار ڕۆبڵەکەوە بوو. یانی دەیانپرسی ئەو پارەیەی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ مانگی پێشوو لێرە، لە ماکرۆیە خەرجی کردووە، سێ هەزار ڕۆبڵ بووە یان هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵ؟ هەروەها دوێنێ سێ هەزار ڕۆبڵ، یان هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵی خەرجکردووە؟ بەداخەوە هەموو شایەدییەکان بە زەرەدی میتیا بوو. تەنانەت تاقە شایەدێک بە قازانجی ئەو نەدوا و هێندێکیان شتی وایان دەگوت، کە تا ڕادەیەک هیوابڕوای کردبوو. قسەکانیشیان تەواو بە دژی قسەکانی میتیا بوو.

یەکەم شایەد کە لێپرسینەوەی لێکرا، تریفۆن بۆریسیچ بوو. کاتێک لە هەمبەر بازپرسەکاندا ڕاوەستا، ڕێزەیەک شەرمی حزووری نەبوو و دەتگوت مێشێکیشی میوان نییە. بە پێچەوانە لە هەمبەر تۆمەتباردا قەڵافەتێکی وشک و تووڕەی بەخۆیەوە گرتبوو کە ڕاستوێژی و قۆڕەدەماخییەکی تایبەتی پێوە دیار بوو. هەتا قسەیان لێنەپرسیبایە نەدەدوا، ئەویش زۆر وشیار و لە سەرەخۆ وەڵامی دەدانەوە. زۆر بە دڵنیایی و لێبڕاوانە شایەدیی‌دا کە مانگی

پێشوو لە سێ هەزار ڕۆبڵی کەمتر خەرجنەکردووە. خەڵکی ئاواییش بە درشت و وردەوە شایەدی دەدەن کە بە گوێی خۆیان لە دیمیتری فیۆدۆرۆویچیان بیستووە. «هەر ئەوەی بۆ ئەو کچە قەرەجانەی خەرجکرد و پێیدان، دەتوانم بڵێم هەزار ڕۆبڵ دەبوو.»

وەڵامی خەمبارانەی میتیاش ئەمە بوو: «پێموانییە پێنج سەد ڕۆبڵم بەو کچانە دابێ. بەداخەوە ئەو کاتە نەمبژارد، چونکە مەست بووم...»

میتیا لە سەر لاشان و پشت بە پەردەکە دانیشتبوو. مات و بێدەنگ گوێی ڕاگرتبوو، بە حاڵەتێکی خەمبار و بێهێزەوە دەتگوت دەڵێ: «چش، هەرچی دەیڵێی بیڵێ. ئیتر بۆ من فەرق ناکا.»

تریفۆن بۆریسیچ لێبڕاوانە هەڵیدایە: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، هەزار ڕۆبڵت زیاتر بۆ ئەو کچە قەرەجانە خەرجکرد. وەک گەڵا تاڵوو پارەت فڕێ دەدا و ئەوانیش هەڵیاندەگرتەوە. ئەوان تاقمێکی خوێڕی و دز بوون، ئەسپ دز، لێرە نەماون ئەو قەرەجانە دەنا خۆیان شایەدییان دەدا چەندەیان پارە لێ وەرگرتووی. خۆم پارەکەم بە دەستتەوە دی - نەمبژارد، ڕاستییەکەی نەتهێشت - بەڵام بە دیتنی بۆم دەرکەوت هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵ دەبوو.... بەڵێ هەزار و پێنج سەد! خۆ نەدیوبدی نیم پارەم نەدیبێ. سەرم لە پارە دەردەچێ...»

بەڵام سەبارەت بە پارەی خەرجکراوی شەوی ڕابردوو، گوتی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لەگەڵ گەیشتنی بۆ ئێرە پێیگوتووە سێ هەزار ڕۆبڵی لەگەڵ خۆی هێناوە.

میتیا گوتی: « تریفۆن بۆریسیچ، ئیتر وادیارە لەگەڵمان پێکنایەی. کوا من گوتم سێ هەزار ڕۆبڵم هێناوە؟

ـ چۆن نەتگوت. ئاندریش لەوێ بوو گوتت. خۆ ئاندرێ هەر لێرەیە. بانگیکەن با بێ. لە سەرسەرا کاتێک چاوت بە دووگی گۆرانیبێژ و سەماکەرەکان کەوت، هاوارت کرد شەش هەزار ڕۆبڵ لێرە خەرج دەکەی.

ئیستیپان و سیمۆنیش گوێیان لێبوو، پیووتێر فۆمیچ گالگانۆفیش هەر ئەو کاتە لە پەنات ڕاوەستابوو. ڕەنگە لەبیری مابێ....

شایەدی لە سەر «شەش» هەزار ڕۆبڵ شوێنێکی سەیری لە سەر هەردوو بازپرسەکە دانا. بەو حیسابە تازە گەشانەوە، سێ و سێ دەبێتە شەش، سێ هەزار ئەو کاتە و سێ هەزار ئێستا دەبێتە شەش هەزار، ئەوە ڕوون و ئاشکرا بوو.

ئەو کەسانەی تریفۆن بۆریسیچ ناوی هێنان، لێپرسینەوەیان لەگەڵ کرا. ئیستیپان و سیمۆن و ئاندرێ، بە گومانەوە قسەکانی تریفۆن بۆریسیچیان پشتڕاست کردەوە. بازپرسەکان بە وردی دەمەتەقێی میتیا و ئاندرێیان نووسی کە کاتی هاتن بۆ ماکرۆیە لە ڕێگا کردبوویان: «من دیمیتری فیۆدۆرۆویچ دەچم بۆکوێ؟ بۆ بەهەشت یان دۆزەخ؟ وەک بزانی لەو دونیا دەبەخشرێم یان نا؟» ئیپۆلیت کیریلۆویچ «ڕەوانناس» بە بزەیەکی نەرمەوە ئەوەی بیست و لە کۆتاییدا پێشنیاری کرد کە ئەو قسانەی تایبەت بەو بابەتەن کە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ دەچێ بۆکوێ، واچاکە «لە پەروەندەکەدا تۆمار کەن.»

گالگانۆفیان بانگکرد، گرژ و بەدخوڵق هاتە ژووری و وای قسە لەگەڵ بازپرسەکان کرد کە دەتگوت بە عومراتی خۆی نەیدیون، ئەگەرچی پێکەوە دۆست و ئاشنا بوون و ماوەیەکی زۆر بوو هەموو ڕۆژێک دەچوو بۆلایان. بەم شێوەیە دەستیکرد بە قسەکردن کە «هیچ شتێک لەوبارەوە نازانێ و ناشیهەوێ بزانێ.» بەڵام دەرکەوت کە ئەویش نەقڵی «شەش» هەزار ڕۆبڵی بیستووە، دانی پیانا کە لەو کاتەدا لەو نزیکانە ڕاوەستاوە. بەڵام تا ئەو جێیەی لەبیری بێ و توانیبێتی ببینێ، «نەیدەزانی» میتیا چەندەی پارە بە دەستەوە بووە. ڕاستی ئەوەشی گوت کە لەهێستانییەکان لە کایەی پەڕێندا گزەیان کردووە. لە وەڵامی پرسیارە پەیتا پەیتاکانیاندا گوتی کە دوای وەدەرنانی لەهێستانییەکان، نێوانی میتیا و ئاگرافنا ئەلسکاندرفنا خۆش بووە و ئاگرافنا گوتوویە ئەوی خۆش دەوێ. زۆر بە ئارامی و ڕێزەوە ناوی

ئاگرافنا ئەلکساندرفنای هێنا، وەک ئەوەی خاتوونێکی بەڕێز بێ و جارێکیش ئیزنی بە خۆی نەدا گرووشنکای پێبڵێ. ئەگەرچی زۆری پێناخۆش بوو شایەدی بدا، بەڵام ئیپۆلیت کیریلۆویچ لێپرسینەوەیەکی تێر و تەسەلی لەگەڵ پێکهێنا. هەر بە هۆی ئەویشەوە تەوای وردەکارییەکانی ئەو شەوەی بۆ دەرکەوت کە وەک دەڵێن «ئەشقنامەی» میتیای پێکدێنا. میتیا بۆ تاقە جارێکیش نەپەڕییە نێو قسەکانی گالگانۆف. ئاخری ئیزنیان پێدا مەرەخەس بێ و ئەویش بە ڕق و تووڕەییەکی ئاشکراوە لە وەتاغەکە چووە دەرێ.

لێپرسینەوەیان لەگەڵ لەهێستانییەکانیش کرد. ئەگەرچی لە وەتاغەکەیاندا خۆیان لە پێخەف خزاندبوو و ئەو شەوە خەو نەچووبووە چاویان و لەگەڵ گەیشتنی ئەفسەرانی پۆلیس بەپەلە خۆیان پۆشتە کردەوە و خۆیان ئامادە کرد، چونکە دەیانزانی بانگیان دەکەن بۆ لێپرسینەوە. بە لووت بەرزییەکی تێکەڵ بە ترسەوە شایەدییان دا. لەهێستانیی وردیلە دەرکەوت کە ئەفسەری خانەنشینکراو، کە وەک جەڕڕاحی ئەرتەش لە سیبریا خزمەتی کردووە. ناوی مووسایالۆویچە. پان وێرۆبلێفسکیش دەرکەوت ددانسازێکی بێ ئیجازەنامەیە. ئەگەرچی پارفنۆویچ پرسیاری لێکردن، بەڵام هەردووکیان وەڵامەکانیان بە میخاییل ماکارۆویچ دایەوە، کە لە سووچێک ڕاوەستابوو. لەبەر نەزانی ئەویان وەک کەسایەتییەکی مەزن و گرینگ هاتە بەرچاو و لەگەڵ هەر وشەیەک «پانیە سەرهەنگ» یان پێدەگوت. دوای چەند جار نارەزایەتی لە لایەن میخاییل ماکرۆویچەوە تێگەیشتن کە دەبێ کاتی وەڵام دانەوە ڕوو بکەنە نیکۆلای پارفنۆویچ. دەرکەوت کە زمانی ڕووسی زۆر بە چاکی و بێهەڵە دەزانن و تەنیا تۆزێ زاراوەکەیان جیاوازە. پانموسایالۆویچ وەها بە گەرموگوڕی و لەخوباییانە باسی پێوەندیی خۆی و گرووشنکای کرد کە میتیا خۆی پێڕانەگیرا و هەستا سەرپێ و گوتی ئیجازە نادا ئەو «هیچوپووچە» لە حوزووری ئەودا ئاوا قسە بکا! پانمووسایالۆویچ سەرنجی حازریانی بۆ وشەی «هیچوپووچ» ڕاکێشا و داوای لێکردن لە شایەدنامەکەدا تۆمار کرێ. میتیا بە تووڕەیی گوتی:

ـ ئەوە هیچوپووچە! هیچوپووچ! ئەوە بنووسن. هەروەها بنووسن کە سەرەڕای بوونی شایەدنامەش هێشتا دەڵێم خوێڕی و هیچوپووچە!

نیکۆلای پارفنۆویچ ئەگەرچی ئەو وتەیەی لە شایەدیٔنامەکەدا نووسی بەوپەڕی شارەزاییەوە بەڕێوەبەرایەتیی خۆی نیشاندا. دوای سەرکۆنە کردنی میتیا، ئەو بەشەی لێپرسینەوەکەی هەڵبڕی کە پێوەندی بە لایەنی ئاشقانەی پەروەندەکەوە بوو و بەپەلە چووە سەر لایەنە بنەڕەتییەکانی. یەکێ لە شایەدییەکانی پیاوانی لەهێستانی سەیر سەرنجی بازپرسەکانی ڕاکێشا:ئەویش ئەوە بوو کە هەر لەم ژوورەدا، میتیا هەوڵیداوە پان‌مووسایالۆویچ بکڕێ و سێ هەزار ڕوبڵی پێ‌پێشنیار کردبوو کە دەست لە گرووشنکا هەڵگرێ. حەوت‌سەد ڕۆبڵی بێحانە دەداتێ و «ڕۆژی دواییش» دوو هەزار و سێ سەد ڕۆبڵی دیکەی دەداتێ. میتیا سوێندی خواربوو کە ئەو پارەیەی لە ماکرۆیە پێ‌نییە، بەڵام لە شار هەیەتی. میتیا هەڵیدایە نەمگوتووە حەتمەن لە شار پاشماوەی پارەکەی دەدەمێ. بەڵام پان وێرۆبلێفسکی شایەدیی دۆستەکەی پشت ڕاست کردەوە و میتیا دوای تاوێ بیرکردنەوە، بە مرومۆچی دانی پیانا کە شایەدیی ئەو لەهێستانییانە ڕەنگە ڕاست بێ و ئەو لەو کاتەدا تووشی شڵەژان بووبێ و لەوانەیە ئەو قسەیەی کردبێ. دادوەر وەک چەققە بەو شایەدییەوە نووسا. وا دیاربوو ئەم بابەتەی بۆ محاکەمەکە داناوە. (ئەوان لە ڕاستیدا بەو ئاکامە گەیشتن) کە نیوەی یان بەشێک لەو سێ هەزار ڕۆبڵەی وەدەست میتیا کەوتووە، لەوانەیە لە ڕاستیدا لە شوێنێک لە شاری، یان تەنانەت، ڕەنگە لێرە لە ماکرۆیە شاردرابێتەوە. ئەم خاڵەش ئەو ڕاستییەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە بۆ تەنیا هەشت سەد ڕۆبڵیان بە دەست میتیاوە دیوە، ڕاستییەکە بۆ دادوەر بۆتە هۆی سەرەگێژە. ئەم ڕاستییەش تەنیا شایەدییەک بوو کە سەرەڕای بێبایەخ بوونەکەی، تا ئێستا بە قازانجی میتیا دەبوو. بەڵام ئەم شایەدییە کە بە قازانجی ئەو بوو، خراپ بووبوو. لە وەڵامی لێ‌پرسینەوەی دادوەردا کە ئەو دووهەزار و سێ‌سەد ڕۆبڵە لەکوێ پەیدا دەکا، چونکە گوتبووی لە هەزار و پێنج‌سەد ڕۆبڵی زیاتر نییە، میتیا بە

دڵنیایییەوە وەڵامی دایەوە کە قەستی پێشنیاری پارە بە «لەهێستانیی وردیلە» نەبووە. بەڵکو قەباڵەی فەرمیی گوندی چێرماشنیا بووە، هەر ئەو ماف و هەقەی بە سامسانۆف و مادام خۆخلاکۆفی پێشنیار کردبوو. دادوەر بەو «تەفرەدانە ساویلکانەیە» بزەی هاتێ.

- یانی پێتوابوو مووسایالۆویچ ئەو قەباڵەیە بەجێی دوو هەزار و سێ سەد ڕۆبڵ پارەی نەغد قەبووڵدەکا؟

میتیا بە تینوگوڕێکەوە گوتی: «جا دیارە قەبوولیدەکرد، دڵنیام. ئاخر لەوانەبوو نەک دوو هەزار، بەڵکو چوار یان شەش هەزار ڕۆبڵی وەگیر کەوێ. دەیتوانی وەکیلی شارەزا و تەماحکار و لەهێستانی و جوولەکەی پووڵەکیی بۆ بگرێ و جگە لە سێ هەزار ڕۆبڵ تەواوی ملکەکە لە چنگ پیرە پیاو دەرهێنێ.»

شایەدیی پانمووسایالۆویچ، هەڵبەت زۆر بە وردی لە شایەدی نامەکەدا تۆمار کرا. دوای ئەوەش لەهێستانییەکان مەرەخەس کران. بەلام باسێک لە گزە کردن لە قومارکەیاندا نەهاتە گۆڕێ. نیکۆلای پارفنۆویچ تەواو لێیان ڕازی بوو و نەیدەویست بە قسەی بێسەروبەرە نارەحەتیان بکا، سەرەڕای ئەوەش، کێشەکەیان تەنیا لە سەر گزەیەکی گەوجانە بوو، لە کاتی مەستی و قوماردا ئەو گزیوفزییانە هەر دەبن. ئەو شەوە بە ئەندازەی کافی عەیشونۆشیان کردبوو... هەر بۆیە دووسەد ڕۆبڵ لە گیرفانی لەهێستانییەکاندا مابوو کە بە فێڵ و گزە بردبوویانەوە.

پاشان ماکسیمۆفی پیر بانگکرا. بە ترس و لەرزەوە هاتە ژووری و بە هێواشی هاتە پێشێ. زۆریش پەرۆش و ئاڵۆز دیاربوو. تا ئێستا لە قاتی خوارێ لەگەڵ گرووشنکا کڕ کەوتبوو و وەک کەڕ و لاڵ لە سووچێک هەڵکورمابوو، هەر وەک دواتر میخاییل ماکارۆویچ گوتی: «جاروبار دەستی دەکرد بە پرووکە پرووک و بە دەسرەیەکی شین فرمێسکەکانی دەسڕی.» تا وایلێدێ گرووشنکا دەستدەکات بە ئارامکردنەوە و دڵدانەوەی. پیرەپیاو خێرا دانیپیانا کە تووشی هەڵە بووە. «بە هۆی دەستەنگی و هەژاری» دە ڕۆبڵی لە

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ قەرز کردووە و ئامادەیە بیداتەوە. لە وەڵامی پرسیاری نیکۆلای پارفنۆویچدا کە لێی پرسی چەندەت پارە بە دەست دیمیتری فیۆدۆرۆویچەوە دیوە، چونکە کاتی وەرگرتنی ئەو دە ڕۆبڵە لە هەموو کەسێک باشتر توانیویە پارەکانی ببینێ. زۆر بە دڵنیایی و لێبڕاوانە گوتی «بیست هەزار ڕۆبڵ.»

نیکۆلای پارفنۆویچ، بە بزەیەکەوە پرسیی: «قەتت بیست هەزار ڕۆبڵ دیوە و دەزانی چەکەی بیست هەزار ڕۆبڵی چەندە دەبێ؟»

ـ ئەی چۆنم نەدیوە، قوربان، بەڵام نەک بیست هەزار، بەڵکو حەوت هەزار، ئەویش ئەو کاتە بوو کە ژنەکەم ملکەکەمی لە گرەو نا. تەنیا ئیزنی دەدا لە دوورەوە تەماشایکەم و بە بۆنەی ئەوەوە قۆڕەدەماخانە فیزی بەسەردا لێدەدام. چەکەیەکی گەورە بوو، هەمووشی گەڵای گوڵ بەپشت بوو. گەڵاکانی دیمیتری فیۆدۆرۆویچیش گوڵ بەپشت بوون.

ئەویان زۆر ماتڵ نەکرد. ئاخری نۆرەی گرووشنکا هات. نیکۆلای پارفنۆویچ تەواو نیگەرانی ئەوە بوو هاتنی گرووشنکا شوێن لە سەر میتیا دانێ، بۆیە وەک ئامۆژگاری چەند وشەیەکی درکاند بە گوێی میتیادا، بەڵام ئەو سەری داخست و تێیگەیاند کە «کێشە و هەرا ساز ناکەم.» میخاییل ماکارۆویچ، خۆی لەگەڵ گرووشنکا هاتە ژوورێ و ڕێنوێنیی کرد. گرووشنکا بە ناوچاوانێکی گرژ و خەمبارەوە، کە تا ڕادەیەک ئارامی دەنواند، هاتە ژوورێ و بە ئارامی لە سەر کورسیلەیەک دانیشت کە نیکۆلای پارفنۆویچ خولکی کرد لەسەری دانیشێ. بەجارێ ڕەنگی هەڵبزڕکابوو، دەتگوت سەرمایەتی. شاڵە ڕەش و گرانبابییەکەی لە ملی پێچابوو. تاویاوێکی ئارام دایگرتبوو ـ یەکەمین دیاردەی نەخۆشییێکی درێژخایەن کە دوای ئەو شەوە تووشی بوو. ئارام و لەسەرەخۆ، بە ڕوانینێکی جیددی و هەڵسووکەوتێکی نەرموونیان، شوێنێکی قووڵی لە سەر دادوەرەکان دانا و تەنانەت نیکۆلای پارفنۆویچ هەتا ڕادیەک دڵی بۆی دەکورکاند. خۆی دواتر کاتێک باسیکرد، دانی پیانا کە تا ئەو کاتە نەیزانیوە «ئەو ژنە چەندە جوانە،» چونکە پێشتریش چەند جار دیتبووی، هەمیشەش بە

چاوی سەڵیتەیەکی لادێیی چاوی لێکردبوو. تەنانەت دواتر لە کۆڕێکی ژنانیشدا کە باسی ئەو خاتوونە هاتبووە گۆڕێ، شەیدایانە گوتبووی: «ئەو ژنە خاوەنی هەڵسوکەوت و کەسایەتییەکە کە تەنیا لە ژنانی نەجیمزادە و خانەدان دەوەشێتەوە» بەڵام ژنان بەو وتەیە تێکچوون و لەڕێوە پێیانگوت «شەیتانی دڵتەڕ». گرووشنکا، هەرکە پێی نایە ژوورەکەوە، تەنیا چرکەیەک چاوی لە میتیا کرد میتیاش شڵەژاوانە چاوی تێبڕی. بەڵام ڕوخساری ئارامی گرووشنکا خێرا دڵنیای کرد. دوای لێپرسینەوە و وریایی پێدان کە ناتوانێ حاشا لە هیچ شتێک بکا، نیکۆلای پارفنۆویچ تۆزێ بە گومانەوە، بەڵام بەوپەڕی ڕێز و ئەدەبەوە، پرسیی لەگەڵ سەروانی واز لە ئەرتەش هێناو، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ کارامازۆف ، چ دۆستایەتییەکیان هەیە. گرووشنکاش بە لەبزێکی ئارام و خاترجەمەوە وەڵامیدایەوە:

ـ ئاشنامان بوو. لە ماوەی مانگی ڕابردوودا وەک ئاشنا دەهات بۆ دیدەنیم.

لە وەڵامی پرسیارەکانی دیکەیاندا بە ڕوونی و ڕاشکاوییەکی تەواو گوتی هەرچەند «جاروبار» کەوتبووە بەر دڵی، بەڵام ئاشقی نەبووبوو، «زیاتر بۆ ئەوەی داخی خۆمیان پێ‌بڕێژم و پێیانڕابوێرم، دڵی ئەویش و دڵی باوکیشیم ڕفاندبوو.» بۆشی دەرکەوتبوو کە میتیا بەخیلی بە فیۆدۆرپاولۆویچ و هەموو کەسێکی دیکە دەبا، بەڵام مەبەستی تەنیا ئەوە بووە پێیانڕابوێرێ. قەت قەستی ئەوەی نەبووە بچێ بۆلای فیۆدۆرپاولۆویچ تەنیا ویستوویە سەر بخاتە سەری و پێیپێبکەنێ. «لە ماوەی مانگی ڕابردوودا بیرم لە هیچکامیان نەکردۆتەوە و تەنیا چاوەڕوانی پیاوێکیتر بووم کە زۆری خراپە دەرهەقم کردووە.» لە کۆتایشدا گوتی: «بەڵام پێموایە هیچ پێویستییەک ناکا لەوبارەوە هەڵمپێچن، یان من وەڵامتان بدەمەوە، چونکە ئەو شتانە پێوەندیی بە خۆمەوە هەیە.»

نیکۆلای پارفنۆویچ لەڕێوە تێگەیشت و ئیتر لە سەر ئەو باسە نەڕۆیشت، لایەنی «ئەویندارانەی» پەروەندەکەی بەردا و هاتە سەر پرسیارە گرینگەکان، یانی سەبارەت بە سێ هەزار ڕۆبڵەکە. گرووشنکا بە دڵنیاییەوە گوتی: «لە یەکەمین عەیشونۆشماندا، واتە مانگی ڕابردوو لە ماکرۆیە، بە خاترجەمی سێ

هەزار ڕۆبڵ خەرجکرا، ئەگەرچی خۆم پارەکەیم نەبژاردووە، لە زمانی دیمیتری فیۆدۆرۆویچم بیستووە کە سێ هەزار ڕۆبڵی خەرجکردووە.»

دادوەر بەپەلە پرسیی: «ئەوەی تەنیا بە تۆ گوت، یان لەلای کەسێکیتر، یان بۆ کەسانێکیتری باسکرد و تۆ بە هەڵکەوت گوێت لێبوو؟»

گرووشنکا لە وەڵامی ئەو پرسیارەشدا گوتی کە هەم لەلای ئەموئەو، هەم کاتێک بە تەنیاش بوون ئەوەی لێبیستووە.

دادوەر پرسیی: «ئەوەی تەنیا جارێک یان چەند جار بە ئێوە گوت؟» بۆشی دەرکەوت کە میتیا چەن جاری ئەوە بە گرووشنکا گوتووە.

ئیپۆلیت کیریلۆویچ ئەم شایەدییەی زۆر بە دڵ بوو. کاتێک زیاتر درێژەیان بە لێپرسینەوەکەدا، ڕوون بۆوە کە گرووشنکا دەزانێ ئەو پارەیەی لە کوێ وەدستکەوتووە، یانی دەیزانی کە «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ سێ هەزار ڕۆبڵی لە کاترینا ئیوانا وەرگرتووە.»

- وەک لەبیرت بێ تاقە جارێکیش لێت نەبیست کە سێ هەزار ڕۆبڵی کەمتر خەرجکردبێ، یان نیوەی ئەو پارەیەی پاشەکەوت کردبێ؟

گرووشنکا وەڵامی دایەوە: «نا، قەتم لێنەبیستووە.»

جگە لەوەش گوتی کە میتیا لە ماوەی مانگی ڕابردوودا زۆرجار گوتوویە تاقە کۆپکێکیشی نییە. لە کوتاییشدا گوتی: «هەمیشە چاوەڕوانی هەلێک بوو برێک پارە لە باوکی بستێنێ.»

نیکۆلای پارفنۆویچ گوتی: «قەت لەلای تۆو... بە هەڵکەوت، یان لە کاتی تووڕەییدا، نەیگوتووە باوکی دەکوژێ؟

گرووشنکا هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «با، گوتوویە.»

- جارێک یان چەند جار؟

- چەندین جار، ئەوەندەی ڕقی هەڵدەستا ئەوەی دەگوت.

- تۆ قەت باوەڕت دەکرد کارێکی وا بکا؟

گرووشنکا بە خاترجەمی وەڵامی دایەوە: «بە هیچ شێوەیەک. ئیمانم بە دڵە گەورەکەی بوو.»

میتیا لە ناکاو گوڕاندی: «ئاغایان ئیجازە بفەرموون، ئیجازە بفەرمون با لە حزووری ئێوەدا شتێک بە ئاگرافنا ئەلکساندرفنا بڵێم.»

نیکۆلای پارفنۆویچ گوتی: «فەرموو.»

میتیا لە سەر کورسییەکە هەستا: «ئاگرافنا ئەلکساندرفنا! ئیمانت بە خودا و بە من بێ کە دەستم لە کوشتنی باوکمدا نییە!»

میتیا دوای ئەو قسانە لە سەر جێگاکەی خۆی دانیشتەوە. گرووشنکا هەستا سەرپێ و بە ئەدەبانە لە هەمبەر پەیکەرەی پیرۆزدا خاجی خۆی کێشا و بە دەنگێکی بوغز گرتووەوە گوتی: «خودایە گیان، زۆر شوکر.» پاشان ڕووی لە نیکۆلای پارفنۆویچ کرد و درێژەی بە قسەکانی دا: «ئەو قسەی ئێستا کردی، ڕاستە، باوەڕی پێبکەن، من چاکی دەناسم. زۆرجار بە گاڵتە یان لە کاتی ڕقهەستان و خیشە سەریدا قسە دەکا، بەڵام لە هەمبەر ویژدانیدا سەرەڕۆ نییە، پێ لە ویژدانی خۆی نانێ. بەڕاستییەتی، بڕوای پێبکەن.»

میتیا بە دەنگێکی بوغز لێنیشتووەوە گوتی: «ئاگرافنا ئەلکساندرفنا، سپاست دەکەم، ورەیەکی تازەت وەبەر نامەوە.»

بێمە سەر باسی ئەو پارەیەی شەوی ڕابردوو خەرجکراوە، گرووشنکا گوتی نازانێ چەندە بوو، بەڵام بیستبووی میتیا بە چەند کەسی گوتووە سێ هەزار ڕۆبڵی پێیە. لە وەڵامی ئەو پرسیارەشدا کە ئەو پارەیەی لەکوێ وەدەست کەوتووە، گرووشنکا گوتی لە میتیای بیستووە کە ئەو پارەیەی لە کاترینا ئیوانا «دزیوە» ئەویش لە وەڵامی میتیادا گوتوویە نا نەتدزیوە و دەبێ بەیانی بچی بیدەیەوە. لە وەڵامی پرسیاری دادوەردا کە ئەو پارەیەی میتیا گوتبووی لە کاترینا ئیوانای دزیوە، هەر ئەو بڕە پارەیە بوو کە دوێنێ خەرجیکردبوو، یان مانگی پێشوو هەمووی لە ئاو کردبوو، گرووشنکا گوتی مەبەستی ئەو پارەیە بوو کە مانگی ڕابردوو خەرجی کردووە، یانی وا لە قسەکانی تێگەیشتن.

ئاخری دەستیان لەکۆڵ گرووشنکا کردەوە و مەرەخەسیان کرد. نیکۆلای پارفنۆویچیش لە ڕووی دڵسۆزییەوە پێیڕاگەیاند کە دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ

شاری، ئەگەر خزمەتێکیشی لە دەست دێ، بۆ وێنە بەکرێ گرتنی عارەبانە، یان ئەگەر پێویستی بێ پارێزەری لەگەڵ بنێرێ....

گرووشنکا دەستی بە سینگییەوە گرت و وێڕای کڕنۆش گوتی: «پڕ بە دڵ سپاست دەکەم، من لەگەڵ ئەو کابرا پیرە دەڕۆمەوە، ئەویش لەگەڵ خۆم دەبەمەوە بۆ شاری، ئەگەر ئیجازەش بفەرموون، جارێ لە خوارەوە چاوەڕێ دەبم با بزانم ئاکامی دادگایی کردنەکەی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ دەبێ بەچی.»

گرووشنکا چووە دەرێ. میتیا ئارام و شادی دەنواند، بەڵام تەنیا چەند چرکەی خایاند. بەهۆی بێهێزی و خەمێکی ئاوێتەی دڵەخورپەوە هەستی بە ئازار و خەفەت دەکرد. لەبەر شەکەتی چاوی هەڵنەدەهات. ئاخری لێپرسینەوەی شایەدەکانیش تەواو بوو. بازپرسەکان دەستیانکرد بە پێداچوونەوەی پەروەندەکە. میتیا هەستا سەرپێ، لە کورسییەکەی دوور کەوتەوە و چووە سووچێکی لای پەردەکە، لە سەر سندووقێکی گەورەی فەڕشکراو ڕاکشا و لەڕێوە خەوی لێکەوت.

خەونێکی سەیری دی، خەونەکەی بە تۆزیش پێوەندیی بەو کات و شوێنەوە نەبوو. لە شوێنێک بوو بە ناوی ئیستەپ کە لەمێژ بوو لەوێ دامەزرابوو، بە سواری دەچوو، لادێییەک بە سواری عارەبانەیەکی دوو ئەسپ بە نێو بەفر و قوڕ و زێلاقەدا دەیبرد. سەرمای بوو، سەرەتای مانگی نوامبر بوو. شڵێوەی دەکرد و عەرزی بووبووە یەکپارچە قوڕ و لیتە و بەفر و زڵچەی دەهات. کابرای عارەبانەچی بە پڕتاو لێی دەخوڕی و خەرەزەنگی هەڵدەسووڕاند. ڕیشێکی بۆز و درێژی هەبوو. پیر نەبوو، پەنجا ساڵی تەمەن بوو و کەپەنکی لەبەردا بوو. لە دوورەوە گوندێک دیاربوو. میتیا لە دوورەوە تاپۆی ماڵەکانی دەدی ڕەش دەچوونەوە. نیوەی ماڵەکان سووتابوون و دەستەک و کاریتەی سەربانەکانی بە نیوە سووتاوی و ڕەش داگەڕاوی وەدەرکەوتبوون. کاتێک گەیشتنە نێو دێ، ژنانی گوندنشین لە سەر ڕێگاکە ڕیزیان بەستبوو، ڕیزێکی دوور و درێژ، ژنەکان زۆر بوون و هەموویان لەڕ و وردیلە بوون، دەمووچاویان قاوەیی بوو، بەتایبەت ئەو ژنە درێژ و ڕەقەڵەی لە قەراغەوە

ڕاوەستا بوو و چل ساڵانی دەنواند، بەڵام بەو ڕوخسارە درێژۆکە و لەجەرەوە لەوە دەچوو لە بیست ساڵ زیاتر نەبێ. کۆرپەیەکی ساوای بە باوەشەوە بوو. مەمکی ئەو ژنە دەبێ وشکی کردبێت و تنۆکێ شیری تێدا نەبێ. زارۆکەش زووقە زووق دەگریا و باسکی ڕووت و چکوولە و مشتە وردیلەکانی دەجووڵاندەوە کە سەرما ڕەش و شینی هەڵگێڕابوون.

میتیا، کە هەروا بە پێکەنینەوە بەلایاندا تێدەپەڕی، پرسیی: «بۆ دەگرین؟ بۆ دەگرین؟»

عارەبانەچی وەڵامی دایەوە: «ئەو منداڵە بەستەزمانە دەگری.»

بەجارێ شوێنی لە سەر میتیا دانا کە بە شێوەیەکی لادێییانە گوتی ئەو «منداڵە بەستەزمانە» لە لایەکی ترەوە ئەو وشەیەشی پێ‌جوان بوو. دەتگوت دڵسۆزییەکی زیاتری پێوەیە. میتیا گەوجانە دووپاتی کردەوە: «ئاخەر بۆ دەگری؟ بۆ بازۆڵە چکۆڵەکانی ڕووتە؟ بۆ دایناپۆشن؟»

- بەستەزمانە سەرمایەتی، جلوبەرگەکانی چکۆڵەن و گەرمی داناهێنن.

میتیا گەوجانە پێداگریی کرد: «ئاخر بۆ؟ بۆ؟»

- خەڵکێکی هەژارن ماڵەکانیان سووتاوە. نانیان نییە. خەریکی سواڵن. چونکە ماڵوحاڵەکەیان سووتاوە و ئاوارە بوون.

میتیا وەک ئەوەی دیسان تێگەیشتبێ گوتی: «نا، نا. پێمبڵێ ئەو دایکە هەژارانە بۆ لەوێ ڕاوەستاون؟ بۆ فەقیرن؟ ئەو منداڵە بەستەزمانە بۆ فەقیرە؟ ئێستەپ بۆ ئاوا بێ داهاتە؟ ئەوانە بۆ یەکتر لە باوەش ناگرن و یەکتر ماچ ناکەن؟ بۆ بە شادی تێ‌هەڵناکەن لە گۆرانیی شادی؟ بۆ چارەڕەشی و لێقەوماوی بەو دەردەی بردوون و ڕەنگیان ڕەش داگەڕاوە؟ بۆ خۆراک بەو منداڵە بەستەزمانە نادەن؟»

هەستیشی دەکرد کە پرسیارەکانی بێمانا و ناماقووڵانەن، بەڵام پێی‌خۆشبوو بپرسێ و دەبوو ئەو پرسیارانەش بکا. هەروەها هەستیدەکرد، هەستی دڵسۆزی خەریکە لە ناخەوە هەڵی دەچۆقێنێ، ئەگەرچی بە عومراتی ئەو هەستەی نەئەزموو بوو. گریانی دەهات، دەیویست کارێکیان بۆ بکا، بۆ ئەوەی ئەو

زارۆکە بەستەزمانە ئیتر نەگری. بۆ ئەوەی ئیتر ئەو دایکە ڕەشتاڵەی مەمکی وشکی کردووە ئیتر نەگری. بۆ ئەوەی لەو کاتەوە ئیتر کەس فرمێسک هەڵنەوەرێنێ. دەیویست لەڕێوە و بێ لەبەرچاو گرتنی کۆسپ و تەگەرە، بە تەواوی ئەو توانا و بێباکییانەوە کە لە ماڵباتی کارامازۆف‌دایە، ئەو کارە بکا.

گوێی لە دەنگی ناسک و پڕ هەستی گرووشنکا بوو لە پەنایدا گوتی: «منیش لەگەڵت دێم. ئیتر تا ئاخری تەمەنم دەستت لێ‌هەڵناگرم، منیش لەگەڵت دێم.»

پڕشنگێک دڵی ڕوونکردەوە، هەوڵیدا بەرەو تیشکەکە بڕواتە پێشێ و بە ئاواتەوە بوو بژی، زیندوو بێ و بڕواتە پێشێ، بەرەو ئەو تیشکە تازە بڕواتە پێشێ کە بانگی دەکا، پەلە بکا و هەر ئێستا بە لەز و خێرا وەڕێکەوێ و بڕواتە پێشێ.

کە چاوی هەڵێنا و لە سەر سندوقەکە دانیشت، بە سەرسووڕمانەوە گوتی: «چی! کوێ؟» وەک ئەوەی وەهۆش هاتبێتەوە، بزەیەکی پڕ لە شادی کەوتە سەر لێوی. نیکۆلای پارفنۆویچ لە ژوورسەری ڕاوەستابوو، پێشنیاری پێدەکرد گوێ لە شایەدنامەکە بگرێ کە بە دەنگی بەرز دەخوێندرێتەوە. واژۆی بکا. میتیا پێیوابوو سەعاتێک یان زیاتر خەوتووە. بەڵام گوێی لە دەنگی نیکۆلای پارفنۆویچ نەبوو. لە ناکاو ئەم ڕاستییە سەرنجی ڕاکێشا کە باڵنجێکی لە ژێر سەر دایە. چونکە ئەو کاتەی شەکەت و ماندوو لە سەر سندووقەکە پاڵکەوت ئەم باڵنجەی لە ژێر سەردا نەبوو.

بە دەنگێکی بوغز گرتوو و سپاس و پێزانینەوە، وەک ئەوەی زۆری دڵسۆزی بۆ کرابێ، هاواریکرد: «کێ ئەو باڵنجەی نایە بن سەرم؟ کێ ئەو چاکەیەی لەگەڵ کردم؟» نەیزانی ئەو کەسە دڵۆڤانە کێ بووە، ڕەنگە یەکێک لە شایەدە گوندنشینەکان، یان میرزا وردیلەکەی نیکۆلای پارفنۆویچ لە ڕووی دڵسۆزییەوە ئەو باڵنجەی نابێتە ژێر سەری، کوڵی گریان سەرتاپای وەلەرزین خستبوو، ڕۆیی بۆلای مێزەکە و گوتی هەرچی بڵێن واژۆی دەکەم.

بە دەنگێکی غەریب و ڕوخسارێکی گەشاوەوە کە وێدەچوو بە هۆی شادییەوە بێ، گوتی: «ئاغایان، خەونێکی چاکم دی.»

(٩)

## میتیا دەبەن و دەڕۆن

دوای ئیمزا کردنی شایەدنامەکە، نیکۆلای پارفنۆویچ بە فیز و قورساخییەکەوە ڕووی لە تۆمەتبار کرد و بڕیارنامەکەی بۆ خوێندەوە. لەوێدا هاتبوو کە فلاّن ساڵ و فلاّن ڕۆژ لە فلاّن شوێن، بازپرسی فلاّن دادگا، دوای لێپرسینەوە لە تۆمەتبار فلاّنی کوڕی فلاّن (یانی میتیا) بەو تۆمەتانە (کە تەواوی موو بە موو نووسرابوو) و دوای چاوخشاندنەوە بەو خاڵەدا کە تۆمەتبار حاشا لە هەموو ئەو تۆمەتانە دەکا وا دراونەتە پاڵی، بۆ خۆپەڕاندنەوە و بەرگریکردن لە خۆی هیچ شتێکی نەدرکاندووە. بەڵام شاهیدان فلاّن و فلاّنی کوڕی فلاّن، بەم شێوەی خوارەوە بە دژی ئەو شایەدیان داوە، بەپێی فلاّن مادە و بڕیاری یاسا و... هتد بڕیاردرا کە فلاّنی کوڕی فلاّن (میتیا) بە مەبەستی لە ئەماندابوون لە هەر چەشنە پەیدۆزی و سزایەکی بێبنەما، لە فلاّن بەندیخانە ڕادەگیرێ. بەم چەشنە تۆمەتبار ئاگادار دەکەینەوە و بەرگێک لەم بڕیارنامەیە ئاراستەی جێگری دادوەر دەکرێ و هتد... وەلحاسڵ بە میتیایان ڕاگەیاند کە لەو کاتەوە زیندانییە و لە زووترین کاتدا دەیبەن بۆ شار و لەوێ لە شوێنێکی زۆر ناخۆش دەستبەسەر دەکرێ. میتیا بە وردی گوێی ڕاگرت و لە کۆتاییدا تەنیا شانی هەڵتەکاند.

ـ زۆر چاکە ئاغایان، لێتان ناگرم. من ئامادەم.... دەزانم جگە لەوە هیچ کارێکی دیکەتان لە دەست نایە.

نیکۆلای پارفنۆویچ دڵسۆزانە پێی ڕاگەیاند، سەرۆکی ئاسایش ماوریکی ماوریکییەویچ کە بە هەڵکەوت لەوێ بووە، هاوڕێیی دەکا...

میتیا لەپڕ قسەکەی پێبڕی «سەبرکە» بە هەستێکی گەرمەوە خۆی پێڕانەگیرا و ڕوویکردە حازریان و گوتی: «ئاغایان، هەموو زاڵمین، هەموومان دڵڕەقین و چارەڕەشین، دەبینە هۆی ئەوەی هەموو پیاوان و ژنان و منداڵان فرمێسک هەڵوەرێنین، ئازاریان دەدەین و دەیانگریێنین. بەڵام لە نێوان هەموویاندا، لێمگەڕێن لێرە و هەر ئێستا ڕوون بێتەوە، لە نێوان ئەوانەدا من لە هەمووان سووکوچرووکترم. خوێڕیترین دەعبام! لە ژیانمدا هەموو ڕۆژێک لە سینگی خۆمم داوە و سوێندمخواردووە کە خۆم پاک ڕاگرم و سەرەڕۆیی نەکەم، بەڵام هەموو ڕۆژێک خۆم تووشی ئەو زەلکاوی تاوانە کردووە. ئێستا تێدەگەم کە مرۆڤی وەک من پێویستە تەمبێ کرێ و قامچی بخوا، قامچیی چارەنووس، قەڵادەیەکیان لە مل کرێ. بە وزەیەکی دەرەکی بیانبەستنەوە. ئەگەر بەڕەڵڵا بوایەم و سەمەندۆکیان لە ملم نەکردایە، هیچکات، هیچکات خۆم لەو زەلکاوە پێدەرباز نەدەکرا و نەشم دەویست دەرباز بم! بەڵام ئەوە دەستی بەڵا ئەوکی گرتم. ئازاری تۆمەت و تیروتوانجی خەڵکم قەبووڵە. هەقیانە تف و نەحلەتم کەن. دەمهەوێ ئازار بکێشم، بەڵکو پاکببمەوە. ڕەنگە پاکیشببمەوە، وانییە؟ ئاغایان بۆ دوایینجار گوێم لێبگرن و بڕوام پێبکەن، خوێنی باوکم لە ئەستۆی من نییە و من نەمکوشتووە. ئامادەم سزا بدرێم، نەک بۆ ئەوەی کوشتوومە، بەڵکو بۆ ئەوەی دەمویست بیکوژم. ڕەنگە بشمکوشتایە. سەرەڕای ئەوەش بڕیارمداوە بەربەرەکانێتان لەگەڵ بکەم و ئاگادارتان دەکەمەوە. هەتا ئاخر لەگەڵتان لە کێشەدا دەبم و ئەو کاتە خودا خۆی بڕیاردەدا. خوداحافیز ئاغایان، لەوەی کە کاتی لێپرسینەوە گوڕاندم بەسەرتاندا داوای لێبووردن دەکەم. دڵتان لێم نەهێشێ. ئاخ، ئەو کاتە هێشتا گەوج بووم... دوای تاوێکیتر بەند دەکرێم، بەڵام ئێستا بۆ دوایینجار، دیمیتری کارامازۆف وەک کەسێکی ئازاد لێتان دەپاڕێمەوە و خوداحافیزیتان لێدەکەم. خوداحافیزی لە هەموو مرۆڤەکان دەکەم.»

دەنگی دەلەرزی و بۆ تەوقەکردن دەستی هێنابووە پێشێ. بەڵام نیکۆلای پارفنۆویچ کە لە نزیکییەوە ڕاوەستابوو، توورە و بەپەلە دەستی بردە پشتەوە و نەیویست تەوقەی لەگەڵ بکا، میتیا ڕەنگی تێکچوو و دەستی بەردایەوە.

نیکۆلای پارفنۆویچ، بە حەپەساوی دەستیکرد بە منجەمنج: «لێپرسینەوەی سەرەتایی هێشتا تەواو نەبووە. لە شاری درێژەی پێدەدەین و من، هەڵبەت ئامادەم بۆ پارێزەریتان... هیوادارم سەرکەوتوو بی... دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، ڕاستت دەوێ من بەردەوام وەک کەسێکی بەدیەغباڵ چاوم لێکردووی نەک تاوانبار. ئێمە هەموومان، ئەگەر بتوانم بە وەکیلایەتی ئەوانیشەوە قسە بکەم، هەموومان ئامادەین قەبووڵیبکەین کە تۆ لە دڵەوە لاوێکی بەشەرەفی بەڵام بەداخەوە ئەم لاوە بەشەرەفە ئیحساسات تووشی سەرەڕۆیی کردووە...»

قەڵافەتی وردیلەی نیکۆلای پارفنۆویچ، دوای قسەکانی شاهانەی دەنواند. میتیا پێیوابوو دوای تاوێکی دیکە ئەم «کورە» قۆڵی دەگرێ و دەیباتە پەسیوێک و دیسان سەبارەت بە «کچان» قسەی لەگەڵ دەکاتەوە. بەڵام کۆڵێک فکر و خەیاڵی بێجێ جاری وایە بە زەینی زیندانییەک دەگا کە دەیبەنە پای سێدارە.

میتیا پرسیی: «ئاغایان، ئێوە پیاوی چاکن. زۆر ئینسانن، ئیجازەم پێدەدەن بۆ دوایینجار چاوم پێیبکەوێ و خوداحافیزیی لێبکەم؟»

ـ حەتمەن، بەڵام بارودۆخەکە... لە ڕاستیدا نابێ، مەگین بە حزووری....

ـ ئەگەر پێتان خوشە با لە حزووری ئێوە بێ!

گرووشنکایان هێنا، بەڵام خوداحافیزییەکی کورت و موختەسەر بوو، نیکۆلای پارفنۆویچ بە هیچ شێوەیەک بە دڵی نەبوو، گرووشنکا بە ڕێزێکی زۆرەوە کرنۆشی بۆ میتیا برد.

ـ پێمگوتی نەمرم هی تۆم و بۆ تۆ دەبم. تا هەتایە پشتت بەرنادەم، جا بۆ هەرشوێنێکیشت بنێرن لەگەڵتم. خوداحافیز، ئەگەرچی خۆت بە دەستی خۆت ئەو قوڕەت گرتۆتەوە، بەڵام دەزانم بێتاوانی.

لێوی دەلەرزی و فرمێسک بە چاویدا دەهاتە خوارێ.

- گرووشا، بمبووره، لەبەر خاتری ئەشقەکەم و لەبەر خاتری ئەوەی تۆ و ئەشقەکەمم پێکەوە فەوتاندووە.

میتیا زۆری قسە لە دڵدا بوو، بەڵام زمانی لەگۆ کەوت و قسەی بۆ نەهات. ڕۆیشتە دەرێ و ئەو کەسانەی چاویان لە سەر هەڵنەدەگرت خێرا تێیهاڵانەوە. لەبەر ئەو پلیکانانەی کە شەوی ڕابردوو میتیا لە عارەبانە سێ ئەسپەکەی ئاندرێ دابەزیبوو، دوو عارەبانە ئامادە کرابوون. ماوریکی ماوریکیەویچ، پیاوێکی چوارشانەی تێکسمڕاو و دەموچاو چرچ بوو. دەتگوت لە شتێک دڵمەندە، پێموا بەهۆی ئەو بێنەزمییە کوتوپڕەوە بوو. بە تووڕەیی دەیگوڕاند. بە ناوچاوانێکی زۆر گرژەوە لە میتیا ڕاخوڕی کە سواری عارەبانەکە بێ. میتیا، بە دەم سواربوونەوە بە خۆی گوت: «لە مەیخانە کاتێ بۆ شەڕاب خوڵکم دەکرد، پیاوێکی دیکە بوو.» لە دەم درگاکەدا خەڵکێکی زۆر ئاپۆرەیان دابوو، پیاوانی لادێیی و ژنان و عارەبانەچی. تریفۆن بۆریسیچیش لە قاڵدرمەکان هاتە خوارێ. هەموو چاویان لە میتیا بڕیبوو.

میتیا لە ناکاو لە سەر فایتوونەکەوە هاواریکرد: «خەڵکانی دڵۆڤان، ئێستا کە لێک هەڵدەبڕێین، بمبوورن!»

گوێی لە دەنگی دوو سێ کەس بوو: «تۆش ئێمە ببوورە!»

- تریفۆن بۆریسیچ خودا ئاگاداری تۆش بێ!

بەڵام تریفۆن بۆریسیچ هەر سەریشی هەڵنەبڕی. لەوە دەچوو سەری زۆر قاڵ بێ. ئەویش هاواریدەکرد و سەبارەت بە شتێک هەڵڵا و بگری ساز کردبوو. مەعلووم بوو کە عارەبانەی دووهەم کە بڕیار وابوو دوو پاسەوان هاوڕێی ماوریکی ماوریکیەویچ وەڕێکەون، ئامادە نییە. عارەبانەچییەکی لادێیی کە بڕیار وابوو عارەبانەی دووهەم لێخوڕێ، بە تووڕەیی خەریکی لەبەرکردنی کۆتەکەی بوو و دەیبۆڵاند کە نۆرەی ئەو نییە و نۆرەی ئاکیمی عارەبانەچییە. بەڵام ئاکیم لە هیچ کوێ دیار نەبوو. بەپەلە پەل بە دوایدا دەگەڕان. کابرای لادێیی پێداگریی دەکرد و داوای لێدەکردن پەلە نەکەن.

تریفۆن بۆریسیچ گوتی: «ماوریکی ماوریکیەویچ دیوتە ئەم لادێییانە چەندە بێچاوڕوون! ڕێزەیەکیان شەرم و حەیا نییە! ئاکیم پێری بیست و پێنج کۆپکی پێدای. هەموویت یەکجێ دا بە شەڕاب و ئێستا شیرە شیڕ دەکەی. ماوریکی ماوریکیەویچ، من لەو دڵسۆزی و ڕۆحسووکییەی ئێوە دەرهەق بەو لادێییانە سەرم سوڕماوە. ئیتر نازانم بڵێمچی.»

میتیا هەڵیدایە: «ئاخر دوو عارەبانەتان بۆچییە؟ ماوریکی ماوریکیەویچ واچاکە بە عارەبانەیەک وەڕێ کەوین، دڵنیابە سەرەڕۆیی ناکەم، هەڵنایەم، هاوڕێ گیان. ئیتر پاسەوانت بۆچییە؟»

ماوریکی ماوریکیەویچ، زۆر بە قەڵسی و وەک ئەوەی بە دامرکانی تووڕەییەکەی خۆی گەشابێتەوە، هاواریکرد: «حەزرەتی ئاغا ئاگات لە دەمت بێ. من «هاوڕێ گیان»ی تۆ نیم. ئەو ئامۆژگارییەت هەڵگرە بۆ وەختێکی دیکە!»

میتیا سەری داخست و سوور هەڵگەڕا. دوای تاوێک لە ناکاو هەستی بە سەرمایەکی بە تەوژم کرد. باران خۆشی کردبۆوە. بەڵام ئاسمانی مات و خەمبار هەورێکی ڕەش دایگرتبوو، کزە بایەکیش ڕاست دەموچاوی دەرزی ئاژن دەکرد. خۆی کوشمەڵە کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی: «سەرمام بووە.» ئاخری ماوریکی ماوریکیەویچ سواری عارەبانەکە بوو و ناشارەزایانە دانیشت. وەک ئەوەی میتیا بە هیچ دانەنێ، لە سووچێکی هیلینگەکەی پەستاوت. لە ڕاستیدا زۆری ڕق هەستابوو، چونکە ئەو ئەرکەی زۆر پێناخۆش بوو کە پێیان سپاردبوو.

میتیا دیسان گوڕاندی: «خوداحافیز، تێرڕی فۆن بۆرپیسیچ،» خۆشی ئەمجارە هەستیکرد کە لەبەر دڵپاکی نەبووە بەڵکو بە ڕق و بێزارییەوە هەرای لێکردووە.

بەڵام تریفۆن بۆریسیچ، کە دەستی لە پشتەوە هەڵپێکابوو، بە گرژی و تووڕەیی چاوی لە میتیا بڕیبوو، بە پۆز و هەوایەکەوە ڕاوەستابوو و وەڵامی نەدایەوە.

میتیا لە ناکاو گوێی لە دەنگی گالگانۆف بوو، کە کتوپڕ دەرپەڕیبووە دەرێ و گوتی: «خوداحافیز، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، خوداحافیز!» گالگانۆف، هەڵات بۆلای عارەبانەکە، دەستی بۆلای میتیا درێژ کرد. کڵاوی لەسەردا نەبوو. میتیا بەپەلە دەستیگرت و گوشیی. بە گەرموگوڕی هاواریکرد: «خوداحافیز، دۆستی بەڕێز! قەتم گەورەییت لەبیر ناچێ.» بەڵام عارەبانەکە وەڕێ کەوت و دەستیان لێک بەربوو. زەنگوڵە کەوتە زڕە زڕ و میتیایان برد.

گالگانۆف بە هەڵاتن گەڕایەوە، لە قوژبنێک دانیشت، سەری داخست و هەردوو دەستی بەبەر دەموچاوییەوە گرت و دای لە پڕمەی گریان. ماوەیەکی زۆر هەروا دانیشت. وا دەگریا دەتگوت ئەو لاوە بیست ساڵانەیە منداڵێکی کەم تەمەنە. ئاخ، بێ ئەوەی ڕێزەیەک گومانی هەبێ میتیای بە تاوانبار دەزانی. بەوپەڕی هیوابڕاوییەوە، منجاندی: «ئەوانە کێن؟ بڵێی مرۆڤ دوای ئەمە چیی لێبێ؟» لەو کاتەدا لە ژیانی خۆی بێزار بوو. گالگانۆفی لاو بە دڵێکی خەمبارەوە گوتی: «بایەخی ئەوەی هەیە؟ یانی بایەخی ئەوەی هەیە بۆیی بگریم و خەمی بۆ بخۆم.»

# (١)

## کوولیا کراسووتکین

سەرەتای مانگی نوامبر بوو. وڵات بەستەڵەک و وشکە سەرمایەک بوو تفت هەڵاویشتبایە دەیبەست. دە پلە لە ژێر سفردا بوو. بەڵام سەر لە ئێوارێ بەفرەلووکەیەک بە سەر زەویی بەستەڵەکدا باریبوو، بایەکی «پڕ تەزوو» هەڵیکردبوو، بەرەو کەناری شەقامی مات و چۆڵی شارەکەمان ڕایدەدا و باڕووشکی بە دەوروبەری بازاڕدا دەپرژاند. بەیانییەکی دڵتەنگ بوو، کرێوە خۆشی کردبۆوە.

لە نزیک بازاڕ و لای فرۆشگەی پلاتینکۆف،ماڵێکی چکۆلە هەڵکەوتبوو کە دەر و ژوورەوەی خاوێن و ڕازاوە بوو. ئەویش ماڵی خاتوو کراسووتکین، ژنی میرزایەک بوو کە چاردە ساڵ لەمەوبەر مردبوو. ئەو بێوەژنە، شۆخە ژنێکی لەبار و دڵڕفێن بوو، لەو ماڵە چکۆڵە و خاوێنەدا لە ڕێی «داهاتی تایبەتیی خۆیەوە» بژێوی ڕۆژانەی دابیندەکرد. لە تەنیاییەکی پڕ لە حورمەتدا ڕۆژگاری تێپەڕ دەکرد و خاوەنی دڵ و دەروونێکی ئارام و بە نەشە بوو. ئەو کاتەی مێردەکەی مرد هەژدە ساڵی تەمەن بوو؛ ساڵێک بوو شووی پێکردبوو.کوڕێکی لێی هەبوو. لە دوای مەرگی مێردەکەی، هەموو گیان و ژیانی خۆی بۆ پەروەردە کردن و عاملاندنی ئەو ڕۆڵە خۆشەویستەی، یانی کوولیای کوڕی، دانا. ئەگەرچی لەو چاردە ساڵەدا بە گیان و دڵ خۆشی ویستبوو، بەڵام بەجێی شادی لێی بووبووە بەردە عازەبە و ژیانی پێ تاڵ کردبوو. دایمە ڕۆح و گیانی لەگەڵ ئەو کوڕەی بوو، دنیای لە خۆی کردبووە چەرمە چۆلەکە و دەترسا نەخۆش کەوێ، سەرمای بێ، هاروهاجی بکا و لە

سەر کورسییەک یان شوێنێکی بەرزەوە بکەوێتە خوارێ و.... کاتێک کوولیا چووە قوتابخانە، دایکیشی هەموو کاتی خۆی بۆ متاڵای زانستی گشتی تەرخانکرد، بۆ ئەوەی لە خوێندنەکەیدا یارمەتیی بدات و کتێبەکانی لەگەڵ متاڵا بکا. لەگەڵ هەموو مامۆستا و ژنەکانیان سەری ئاشنایەتیی کردەوە و تەنانەت لەگەڵ هاوپۆلەکانیشی خۆی ڕێکخست و مەرایییشی لەبەر دەکردن بۆ ئەوەی کوولیا ئازار نەدەن و شەڕی لەگەڵ نەکەن. لەو بارەوە ئەوەندەی زێدەڕەوی کرد کە منداڵەورکە دەستیان کرد بە گاڵتە پێکردن و ناونیتکە لێهەڵدانی کوولیا و پێیان دەگوت «نازداری دایە».

بەڵام کوڕە گوێی بەو قسانە نەدەبزووت و شلوێ نەدەبوو. چونکە کوڕێکی خاوەن ورە و هەروەک لە قوتابخانە بووبووە دەمگۆ، «زۆر بەهێز» بوو و ئەوەش زۆر زوو بۆ هەمووان دەرکەوت. کوولیا گورجوگۆڵ و بە غیرەت بوو، زۆر نەترس و جەسوورانە هەڵسووکەوتی دەکرد. دەرسەکانی زۆر باش بوون و لە قوتابخانە بووبووە دەمگۆ کە دەتوانێ مامۆستا داردانلۆف لەبیر کاری و مێژووی گشتیدا بۆڕدا. سەرەڕای ئەوەی بە چاوی سووک لە هەمووانی دەڕوانی، هاوڕێیەکی باش بوو و خۆی دوورەپەرێز ڕانەدەگرت. پێیوابوو هاوپۆلەکانی وەزیفەیانە ڕێزی بۆ دانێن، بەڵام زۆر دۆستانە هەڵسووکەوتی لەگەڵ دەکردن. لە هەمووشی گرینگتر دەیزانی لەکوێ دەبێ پێی زیادی دانەکێشێ. لە کاتی خۆیدا دانی بە خۆیدا دەگرت و کاتی هەڵسوکەوت لەگەڵ مامۆستایان لەو هێڵە سوورەی تێنەدەپەڕاند کە دەبووە هاروهاجی و بێنەزمی و یاخی بوون و لە یاسا لادان. بەڵام بەقەد کەم تەمەنترین منداڵی قوتابی هاروهاجیی پێخۆش بوو. ئەو کارانەشی بە هۆی عەجوولی و بزۆزی نەبوو بەڵکو زیاتر بۆ ئەوە بوو خۆی بنوێنێ و سەرنجی هەمووان بۆلای خۆی ڕاکێشێ. زۆر کوڕێکی خۆبەزلزان بوو. تەنانەت دەشیزانی چۆن دایکی تەسلیمی خۆی بکا و زۆر دڵڕەقانە بە سەر دایکیدا زاڵ بوو. دایکی لە قسەی دەرنەدەچوو، لەمێژ بوو دایکی تەسلیم و سەر لە پێناوی بوو. تەنیا خەمێک کە تەنگی پێهەڵچنیبوو ئەوە بوو کە

کوولیا زۆر سارد و سڕ بوو لەگەڵیدا. پێیوابوو کوولیا «خۆشی ناوێ» و جاروبار هۆن هۆن دەگریا و سەرکۆنەی دەکرد کە ئاوا بێهەست و سارد و سڕە. کوڕە ئەوەی پێخۆش نەبوو، هەرچی لەو بارەوە قسەی بۆ دەکرا و بە سەریدا دەهاتن، زیاتر لە سەر کاری خۆی سوور دەبوو، گوێی بەو سکاڵا و گریانەی دایکی نەدەبزووت. سەرەڕای ئەوەش، ئەو بە قەستی ئەو کارانەی نەدەکرد، شتێکی غەریزی بوو ـ خووخدەی وابوو. دایکی نەیدەزانی، کوڕە یەکجار زۆری دایکی خۆش دەویست. بەڵام خۆی گوتەنی «خۆشیرین کردنی» پێخۆشنەبوو.

لەماڵیدا دۆلابێک کتێبیان هەبوو، کوڕە بە تەنیا چەند دانە لەو کتێبانەی خوێندبۆوە. ئەو کتێبانە زۆربەیان کاتی خۆی هی باوکی بوون. کوولیا زۆری هۆگری بە متاڵا بوو. دایکیشی بەرگریی لێنەدەکرد. بەڵام هێندێک جار کە دەیدی کوڕەکەی چەند سەعات لای دۆلابی کتێبەکان ڕادەوەستێ و بەجێی یاریکردن، چاو لە کتێبێک دەکا و ئەوقی دەبێ، سەری سووڕ دەما. کوولیا کتێبی وای دەخوێندەوە کە بۆ تەمەنی ئەو نەدەبوو.

کوڕە بەپێی عادەت دەیزانی چۆن و کەنگێ هاروهاجی بکا، لەم دواییانەدا عەجوولی و هاروهاجییەکەی بەجێیەک گەیاندبوو کە ترسی خستبووە دڵی دایکییەوە. لە ڕاستیدا کاری بێئەخلاقی و ناحەزی نەدەکرد، بەڵکو جۆرێک ڕووهەڵماڵدراوی و دەلووکاری بە ئاکارییەوە دیار بوو.

خوداوڕاستان مانگی مەی ئەو ساڵە، لە کاتی پشووی هاوینەدا، دایک و کوڕ چوون بۆ ناوچەیەکی دیکە، کە چل و پێنج کیلۆمەتر دوور بوو، تاکو حەوتوویەک لە ماڵی خزمێکیان ڕایبوێرن کە مێردەکەی کارمەندی هێلاسن بوو، (هەر لەو وێستگەیەش کاری دەکرد کە مانگێک دواتر، ئیوان فیۆدۆرۆویچ کارامازۆف لەوێوە بەرەو مۆسکۆ وەڕێ کەوت.) کوولیا دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە سەبارەت بە هەموو ئەو تایبەتمەندییانەی پێوەندیی بە هێلاسن و شەمەندەفەرەوە هەیە. دەیزانی کاتی گەڕانەوە، بەو زانیارییە تازانەوە، هاوپۆلەکانی تووشی سەرسوڕمان دەکا. بەڵام بە هەڵکەوت لەو

شوێنە چەند منداڵی دیکەی لێبوو کە زۆر زوو لەگەڵیان بوو بە برادەر. هێندێکیان لە وێستگەکە دەژیان. بڕێکیشیان هەر لەو دەوروبەرانە. شەش حەوت کەس بوون هەموویان لە نێوان دوازدە تا پازدە ساڵان بوون. دوو کەسیان خەڵکی شارەکەی ئێمە بوون. کوڕەکان پێکەوە یارییان دەکرد. ڕۆژی چوارەم یان پێنجەمی کوولیا بوو لەوێ، ئەو کوڕە گەوجانە لە سەر شتێکی پڕ مەترسی گرێویان کرد. کوولیا کە لە هەموویان کەم تەمەنتر بوو و بۆیە هەموویان بە چاوی سووک تەماشایان دەکرد. هەر بۆیە لەبەر نەترسی یا غروور لە سەر دوو ڕۆبڵ گرێویان کرد کە کاتی هاتنی شەمەندەفەر سەعات یازدەی شەوێ لە بەینی هێڵەکاندا ڕاکشێ و جووڵە نەکا تاکو شەمەندەفەرەکە بە پڕتاو بە سەریدا تێپەڕێ. ڕاستە هەموو شتێکیان تاقیکردەوە و بۆیان دەرکەوت کە دەتوانن لەو نێوان هێڵەدا تەخت خۆیان ڕاکێشن کە شەمەندەفەرەکە وێیان نەکەوێ، بەڵام خۆڕاکێشان لەو شوێنە گاڵتە نەبوو! کوولیا نەترسانە ئامادەیی خۆی بۆ ئەو کارە دەربڕی. سەرەتا پێی پێکەنین، بە درۆزن و خۆهەڵکێشیان لە قەڵەمدا. شتێکیش کە بەجارێ هەست و غرووری دەرڕووشاند، ئەوە بوو کە ئەو کوڕە پازدە ساڵانە بە پۆز و قۆڕەدەماخییەوە ڕوویان لێوەرگێڕا و لە سەرەتادا وەک «کوڕیژگەیەک» کە بۆ هاوڕێیەتی نابێ هەڵسووکەوتیان لەگەڵ دەکرد و ئەوەش سووکایەتییەک بوو کە بۆی قەبووڵ نەدەکرا.

بڕیاریاندا شەوێ بچن بۆ نیو کیلۆمەتریی وێستگەکە. بۆ ئەوەی شەمەندەفەرەکە لە وێستگە دوور دەکەوێتەوە ڕۆیشتنەکەی توندتر دەکا. کوڕەکان کۆ بوونەوە. شەوێکی ئەنگوستە چاو، مانگەشەو نەبوو. لە کاتی دیاریکراودا کوولیا لە نێوان هێڵەکاندا ڕاکشا. پێنج کەسەکەیتریش کە مەرجیان بەستبوو، بەجارێ ترس و دڵەخورپەیان پێکەوتبوو لە بن دەوەن و کەندەڵانی نزیک هێڵاسنەکە خۆیان مەلاس کردبوو هەستیان بە مەترسی و پەشیمانی دەکرد. ئاخری دەنگی فیکە و تەقوهۆری شەمەندەفەر هەستا و

ویستگەی بەجێ هێشت. دوو چرای سوور لە دوورەوە دەرکەوت، ئەو دێوە هەر نزیک دەبۆوە و گرمە و هاڕەی زیاتر دەبوو.

کوڕەکان کەوتبوونە هەناسەبڕکێ و دڵەکوتە، لە نێو دەوەنەکانەوە هەرایان دەکرد: «کوولیا، هەڵێ، هەستە خێرا وەرە دەرێ.» بەڵام ئیتر دەرفەت نەمابوو. شەمەندەفەر وەک تێسکەی تفەنگ هات و تێپەڕی. منداڵەکان هەڵاتن بۆلای کوولیا. دیتیان جووڵەی لە خۆی بڕیوە و ڕاکشاوە. دەستیانکرد بە کێشان و ڕاتەکاندنی سەر و لاقی. لەپڕ هەستا سەرپێ و بێئەوەی زمانی بگەڕێ ملی ڕێیگرت و ڕۆیشت. دواتر گوتی بۆ ترساندنی ئەوان ئاوا جووڵەی لە خۆی بڕیوە بۆ ئەوەی پێیان وا بێ لە هۆش چووە، بەڵام هەروەک دواتر بۆ دایکی گێڕایەوە، هەر بەڕاستی بێهۆش بووبوو. لەو کاتەوە وەک «مرۆڤی نەترس و ئازا» ناوبانگی دەرکرد. کاتێک بەرەو ویستگە گەڕانەوە وەک چۆڕی شیر سپی هەڵگەڕابوو. ڕۆژی دوایی تاویاوێکی سووکی گرت، بەڵام خاوەن ورە بوو و شانازیی بە خۆیەوە دەکرد. ئەو ڕووداوە خێرا بڵاو نەبۆوە، بەڵام کاتێک گەڕانەوە بۆ شار لە قوتابخانە بە گوێی بەڕێوەبەر و مامۆستایانی گەیشتەوە. بۆیە دایکی کوولیا بەپەلە چوو بۆ قوتابخانە و لەلایەن کوڕەکەیەوە داوای لێبووردنی لێکردن و لە کۆتاییدا داردانلۆف کە مامۆستایەکی بەڕێز و قسە ڕۆیشتوو بوو، ناوبژیوانیی کرد و چاوپۆشییان لێکرد.

داردانلۆف، پیاوێکی چل ساڵانەی ڕەبەن و هێشتا بوخچەی نەکراوە بوو، چەن ساڵ بوو، دڵی بە خاتوو کراسووتکینەوە بوو و لەوانە بوو بۆی شێت بێ. جارێکیش، نزیکەی ساڵێک لەمەوبەر بە دڵەخورپە و ترس و لەرز و هەستێکی ناسک و بەوپەڕی ئەدەب و ڕێزەوە پێشنیاری پێکردبوو شووی پێبکا. بەڵام خاتوو کراسووتکین دەستی بە ڕوویەوە نابوو، چونکە هەستی دەکرد شووکردنەوەی کارێکی خەیانەتکارانە دەبێ دەرهەق بە کوڕەکەی. ئەگەرچی داردانلۆف هەستیدەکرد و لە سەر ئەو باوەڕەش بوو کە ئەو بێوەژنە شۆخوشەنگ و بە حەیا و دلۆڤانە تا ڕادەیەک پێی خۆشە شووی

پێبکا. شەیتانی و هاروهاجییەکانی کوولیا بووبووە هۆی ئەوەی زیاتر دڵی نەرم بێ. داردانلۆف لەبەر ئەو ناوبژیوانییەی، بە نوقڵانەی ئاماژە و چاوقرتاندنێکی خاتوو کراسووتکین گەشایەوە. ئەگەرچی ئیشارەکە بە ئەستەم بوو، بەڵام داردانلۆف هێندە خاوەنی دڵێکی پاک و ناسک بوو هەر ئەو کورتە ئیشارەیەی بەس بوو کە خۆ بە بەختەوەرترین پیاوی سەر عەرز بزانێ، هۆگرییەکی زۆری بە کوڕە هەبوو، ئەگەر وەدەستهێنانی دڵی ئەو و هەڵسووکەوت کردن لەگەڵی بە شیاو نەدەزانی، لە نێو پۆلەکەشدا بە تووڕەیی لەگەڵی دەجووڵایەوە و زۆری ڕوو نەدەدایە. کوولیاش زۆری ڕێز بۆ دادەنا. زۆر بە وردی سەرنجی دەدا. وانە کوتنەوەکەی و ئەوی پێی دەگوتن مووبەموو فێری دەبوو. لە پۆلەکەیاندا قوتابیی پلە دوو بوو، لە حوزووری داردانلۆفدا زمانی نەدەگەڕا و زۆر بە ئەدەبانە هەڵسوکەوتی دەکرد. هاوپۆلەکانیشی هەموو پێیان وابوو کوولیا لە هەموو کەس باشتر مێژووی گشتی دەزانێ و تەنانەت دەتوانێ داردانلۆفیش ببەزێنێ. لە ڕاستیدا کوولیا ئەم پرسیارەی لە داردانلۆف کردبوو: «بناغەدانەری تێروا کێ بوو؟» داردانلۆف ئاماژەی بە بزووتنەوە و کۆچی نەتەوەکان و لەمێژینە بوونی ڕابردووەکەی و گێڕانەوەی بەسەرهاتێکی ئەساتیری کردبوو و وەڵامێکی زۆر تەمومژاویی پێدابۆوە. بەڵام ئەم پرسیارەی «بناغەدانەری تێروا کێ بوو؟» یانی چ کەسانێک، نەیتوانیبوو وەڵامبداتەوە. ئەگەرچی ئەو پرسیارەشی زۆر ساکار و سەرپێی خوێندبۆوە. بەڵام کوڕانی هاوپۆلی لە سەر ئەو باوەڕە مانەوە کە داردانلۆف ناوی بناغەدانەری تێروا نازانێ. کوولیا ناوی بناغەدانەرانی تێروای لە کتێبی مێژووی ئیسماراگدۆفدا خوێندبۆوە. کە ئەو کتێبە لە دۆڵابی کتێبەکانی باوکیدا بوو. لە کۆتاییدا، تەواوی منداڵەکان تامەزرۆ بوون ئەو پرسیارە بزانن، بەڵام کوولیا ئەو ڕازەی نەدرکاند و ناوبانگی زانیارییەکەی هەروا بە سەر زارانەوە ما.

دوای ئەو ڕووداوەی هێلاسنەکە، کردەوەی کوولیا دەرهەق بە دایکی گۆڕانی بەسەردا هات. ئانافیۆدۆرفنا (خاتوو کراسووتکین) کاتێ لەو کردەوە

گەوجانەیەی کوڕەکەی ئاگادار بوو، لە حەیبەتا وەختەبوو شێت بێ. تووشی دڵەخورپە و هێرشێکی سەختی عەسەبی بوو و ماوەی چەند ڕۆژی خایاند. کوولیا کە خۆشی ئاراو قارای لێهەڵگیرابوو بەڵێنی بە دایکی دا کە ئیتر ئەو سەرەڕۆیی و هاروهاجییە دووپات نەکاتەوە. لە هەمبەر پەیکەری پیرۆزدا چۆکی دادا و هەروەها سوێندی بە ڕۆحی باوکی خوارد و وەها دڵی وەکوڵ هات، وەک منداڵێکی شەش ساڵان دەستیکرد بە گریان. ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارێ دایک و کوڕ بە دەم گریانەوە هەر تاوناتاوێک باوشیان بە یەکتردا دەکرد. ڕۆژی دوایی کوولیا هەروەکو جاران سارد و سڕ لە پێخەفەکەی هاتە دەرێ، بەڵام بێدەنگتر و خاکەڕاتر و مڕومۆچتر و خەیاڵاویتر بووبوو.

بەڵام شەش حەوتوو دواتر خۆی لە ماجەرایەکی دیکە هەڵقوتاند و ناوی بە گوێی سەرۆکی دادگا گەیشت. بەڵام ماجەرای ئەمجارەیان جۆرێکی دیکە بوو، بۆ ڕابواردن و سەرگەرمییەکی گەوجانە، وەک دەرکەوت ئەو نەیویستبوو ڕۆڵی سەرەکی وەئەستۆ بگرێ، بەڵکو لاسایی دیترانی کردبۆوە. دایکی هەروا دەگریا و دەلەرزی. بەڵام هەرچەندە بێئۆقرەتر دەبوو، داردانلۆف زیاتر دڵی تژی دەبوو لە هیوا. ئەوەشمان لەبیر نەچێ کوولیا لە بنجوبناوانی دڵی داردانلۆف دەگەیشت و دەیزانی بە هیوای چییە. هەر لەبەر ئەو ئیحساساتەش ڕقی دنیای لێبوو. پێشتر زۆری گوێ نەدەدایە و لەلای دایکی ئەو ڕق و تووڕەییەی دەردەبڕی و بە کینایە بە دایکی دەگوت کە دەزانێ داردانلۆف چیی لە ژێر سەردایە و خۆی بۆچی دەکوتێ. بەڵام لە کاتی ڕووداوەکەی هێڵاسنەوە، ئەو ئاکارەشی گۆڕانی بەسەردا هات. ئیزنی بە خۆی نەدەدا بە هیچ شێوەیەک باس لەو مەبەستە بکا و لەلای دایکی بەڕێز و حورمەتێکی زۆرەوە باسی داردانلۆفی دەکرد، کە دایکی دیاربوو زۆری پێخۆشە و گەزگەز باڵای پێدەکا. بەڵام کاتێک لەلای کوولیا ناوی داردانلۆفیان دێنا، خاتوو کراسووتکین لە شەرمانا سوور هەڵدەگەڕا. لەو جۆرە کاتانەدا کوولیا بە گرژ و مۆنی لە پەنجێرەکەوە چاوی لە دەرێ دەبڕی. یان خەریکی قەیتانی پۆستاڵەکەی دەبوو، یان بە تووڕەیی و دەنگی بەرز بانگی

«پێرزفۆن»ی دەکرد، کە سەگێکی قەپەگۆڵی توولەک کردوو بوو و مانگی ڕابردوو پەتی کردبوو و هێنابوویەوە بۆ ماڵێ. لەبەر هۆیەکیش لە ماڵێ نەیدەبردە دەرێ و پیشان هیچکام لە هاوپۆلەکانی نەدەدا. زۆری ئازار دەدا و هەموو چەشنە فێڵ و تەڵەکەیەکی فێردەکرد. وایلێهات کاتێک کوولیا لە قوتابخانە بوو، ئەو سەگە بەستەزمانە لە تاوی دەیلووراند. کاتێکیش دەهاتەوە بۆ ماڵێ، لە خۆشیانا حەپەحەپی دەکرد. وەک شێت و هار بەملاوئەولادا هەڵدەهات، کلکە سووتێی دەکرد و دەینووزاند، چوار پەلی لە حەوا دەکرد و خۆی دەتۆپاند... و هتد. لە ڕاستیدا تەواوی ئەو بەزم و ئاکارانە لە کوولیاوە فێر بووبوو. دیاربوو ئەو کارانەشی بە فەرمان پێدان نەدەکرد، بەڵکو لەبەر هەقناسی و خۆشیرین کردن بوو.

ئەوەشم لەبیر نەبوو باسیبکەم، کوولیا کراسووتکین هەر ئەو کوڕە بوو کە ئیلۆشای کوڕی سەروان ئیسنگیریف بە چەقۆ لە ڕانیدا و خوێنەران لەوە ئاگادارن. ئیلۆشا ویستبووی دیفاع لە باوکی بکا کە منداڵانی قوتابی ناونیتکەیان لێهەڵدەدا و بە دەنگی بەرز دەیانگوت گسکە کۆڵە. مەبەستیان ڕیشی باوکی بوو.

## (٢)
# منداڵان

لەو بەیانە سارد و سڕ و بەستەڵەکەی مانگی نوامبردا کە کڕێوە و بۆران و باڕن عەرزی داگرتبوو، کوولیا کراسووتکین لە ماڵێ دانیشتبوو. یەکشەممە بوو، قوتابخانە نەکرابۆوە. کاتژمێر زەنگی یازدەی لێدابوو و کوولیا دەیویست بۆ «کارێکی زۆر زەرووری» لە ماڵێ بڕواتە دەرێ، بەڵام بە تاقی تەنیا بەجێیان هێشتبوو و ماڵەکەیان پێسپاردبوو، چونکە گەورەکانی ماڵێ بۆ ڕووداوێکی کتوپڕ و نائاسایی ڕۆیشتبوونە دەرێ. خاتوو کراسووتکین دوو وەتاغی چکۆڵەی بەکرێ دابوو بە ژنی دوکتورێک و دوو منداڵەکەی، کە بەر هەیوانێک لە ژوورەکانی دیکەی جیا دەکردەوە. ئەو ژنە دوکتۆرە هاوتەمەنی ئانافیۆدۆرفنا و یەکێ لە دەستەخوشکە خۆشەویستەکانیشی بوو. میردەکەی، ئاغای دوکتۆر، ساڵێک لەمەوبەر ڕۆیشتبوو. سەرەتا ڕۆیشت بۆ ئۆربنۆرگ و لەوێوە چوو بۆ تاشکەند، شەش مانگ بوو هیچ هەواڵێکیان لێی نەبوو. ئەگەر لەبەر خاتوو کراسووتکینی دستەخوشکی نەبوایە کە، تەواوی دڵخۆشییەکەی ئەو بوو، حەتمەن گریان حەیاتی لێدەبڕی. ئێستاش چارەڕەشی دوای چارەڕەشی، کاترینای کلفەتی لە ناکاو عەسری ڕۆژی ڕابردوو بەوپەڕی سەرسامییەوە هەواڵی پێدابوو کە بۆ شەوێ منداڵی دەبێ. ئەوەش وەک مۆجزە دەچوو و هیچکەس چاوەڕوانیی ئەوەی نەدەکرد. ژنی ئاغای دوکتۆر بە سەرسامی بڕیاریدا هەتا دەرفەت هەیە، کاترینا بەرێ بۆ دامەزراوەیەکی تایبەتی لە نێو شار، کە مامانێک بەڕێوەبەری بوو. چونکە زۆری کاترینای کلفەتی خۆش دەویست، بەپەلە گەیاندییە ئەوێ و بۆ ئاگاداری کردنی ئەو شەوە لەلای مایەوە. کاتێ ڕۆژ بۆوە، هاودەردی و تواناییی دۆستانەی خاتوو

کراسووتکین زۆر پێویست بوو، چونکە ئەو لە کاتی پێویستدا، دەیتوانی یارمەتیی بدات یان بۆ یارمەتی وەرگرتن پەنا بۆ کەسێکی دیکە بەرێ.

هەر بۆیە ئەو دوو خاتوونە هیچکامیان لە ماڵێ نەبوون و ئاگاتای کڵفەتی بنەماڵەی کراسووتکینیش چووبوو بۆ بازاڕ، بۆیە کوولیا بە تەنیا لە ماڵێ بوو تاکو ئاگاداری لەو «منداڵان»ە یانی کچ و کوڕەکەی دوکتۆر بکا. کوولیا ترسی لەوە نەبوو کە ئاگادارییی ماڵەکە بکا. بەجێشی بهێشتایە گرینگ نەبوو، چونکە پیرۆفۆنی هەبوو، پێیگوتبوو لەبەر هەیوانەکە لە ژێر کورسییەکەدا خۆی مەڵاسدا. هەرکاتێک کوولیا بەملاوئەولادا هەڵدەسووڕا، لە وەتەغاکانەوە دەهاتە بەر هەیوان، سەگە سەری دەلەقاند و بە کلکی دووسێ زەبری لە عەرزەکە دەدا، بەڵام، مخابن! دەنگی فیکەیەک نەدەهات ئازادی بکا. کوولیا بە مڕومۆچی چاوی لەو سەگە بەستەزمان و چارەڕەشە کرد و سەگە دیسان فەرمانبەرانە دەستیدەکرد بە کلکە سووتێ. تەنیا شتێک کە کوولیای ئازار دەدا، ئەو «منداڵانە» بوون. هەڵبەت بە چاوی سووکیش لەو ڕووداوە چاوەڕوان نەکراوەی کاترینای دەڕوانی. بەڵام هۆگرییەکی زۆری بەو «منداڵە» بێبەشانە هەبوو و کتێبێکی پڕ لە وێنەی بۆ بردبوون. منداڵە گەورەکەیان کچێکی هەشت ساڵان و ناوی ناستیا بوو. دەیتوانی بخوێنێتەوە. منداڵەکەی دیکەشیان کوڕێکی حەوت ساڵانە و ناوی کاستیا بوو، زۆری پێخۆشبوو خوشکی کتێبی بۆ بخوێنێتەوە. هەڵبەت کوولیا دەیتوانی بە شتێکی دیکەوە سەرقاڵیان بکا. دەیتوانی شان بە شانی یەکتر دایاننێ و یاریی سەربازێن و قەرێقەرێیان لەگەڵ بکا. پێشتر زۆرجار ئەو یارییەی لەگەڵ کردبوون و پێشی عەیب نەبوو. تا وایلێهات لە قوتابخانە دەنگی دایەوە کە کوولیا کراسووتکین لە ماڵێ لەگەڵ منداڵانی کرێنشینەکەیان یاریی ئەسپ ئەسپێن دەکا، ملی هەڵدێنێ و بە گاگوڵکێ دەڕوا و هەڵبەزدابەز دەکا بۆ ئەوەی وەپێکەنینیان خا. بەڵام کوولیا کراسووتکین بە غرووورەوە حاشای لێدەکرد و دەیگوت ئەسپ ئەسپێن بۆ کوڕێکی سێزدە ساڵانەی وەک ئەو «لەم سەردەمەدا» شوورەییە. بەڵام ئەو ئەم کارەی بۆ ئەوە دەکرد،

منداڵەکان سەرگەرم کا، چونکە زۆری خۆشدەویستن، هیچکەس مافی ئەوەی نەبوو سەبارەت بە ئیحساساتی ئەو مشتومڕ بکات. «منداڵەکان» هەتا ڕادەی پەرستن خۆشیان دەویست. بەڵام ئەو ئەمجارەیان تاقەتی یاریی نەبوو. کارێکی زۆر گرینگ و تا ڕادەیەک پڕ لە ڕازی بە دەستەوە بوو. لەم حەیسوبەیسەدا کات تێدەپەڕی و ئاگاتاش نەدەهاتەوە کە منداڵەکان بە سەر ئەودا بەجێ بێڵێ. تا ئێستا چەندجار بە بەر هەیوانەکەدا تێپەڕی و سەری کرد بە وەتاغی کرێنشینەکەیاندا و بە نیگەرانییەوە چاوی لە منداڵەکان دەکرد، کە بە پێی فەرمانی ئەو خەریکی کتێب خوێندنەوە بوون. هەر کاتێک دەرگاکەی دەکردەوە، منداڵەکان بزەیان دەهاتێ، بەو هیوایەی بچێتە ژووریێ و بە یاری و هەڵبەزدابەزێکی شادانە سەرقاڵیان بکا. بەڵام کوولیا بیری لە جێیەکی دیکە بوو و نەدەچووە ژووریێ.

ئاخری زەنگی سەعات یازدە لێدرا و ئەو لەڕێوە بڕیاریدا ئەگەر ئاگاتای «نەحلەتی» هەتا دە دەقیقەی دیکە نەیەتەوە، ئیتر لەسەری مەحتەل نابێ و بەرەو دەرێ تێیدەتەقێنێ، هەڵبەت قەول لە «منداڵەکان» وەردەگرێ کاتێک ئەو دەڕوا نەترسن و بە غیرەت بن. هاروهاجی نەکەن و لە ترسانا نەگرین. بەم بیرۆکەیەوە باڵتە ملیوانە تیسکنەکەی لەبەر کرد.جانتاکەی کردە شانی و بێ ئەوەی گوێ بداتە قسەو تکای دایکی کە پێیگوتبوو لە ڕۆژێکی سارد و بەستەڵەکی وەک ئەمڕۆدا کەوشی گەرم لە پێ بکا. هەروا کە بەبەر هەیوانەکەدا تێدەپەڕی، چاوێکی قیزەونانەی لە کەوشە جیرەکانی کرد. پێرزفۆن کە دیتی کوولیا جلوبەرگی دەرەوەی لەبەر کردووە، دەستیکرد بە کلکە سووتێ و نووزاندن. بەڵام کوولیا کە دیتی سەگەکە ئاوا ئۆقرەی لێ هەڵگیراوە، ئەوەی بە لادان لە یاسا زانی، دەقیقەیەکی دیکە لە ژێر کورسییەکە ڕایگرت و تەنیا کاتی کردنەوەی دەرگای سەرسەرا فیتووی بۆ لێدا. سەگە وەک بوونەوەرێکی وەحشی دەرپەڕی و لەبەر دەمیدا دەستیکرد بە هەڵبەزدابەز و کلکە سووتێ.

کوولیا دەرگاکەی کردەوە بۆ ئەوەی چاوی بە «منداڵەکان» بکەوێ. هەردووکیان وەک پێشوو لە پشت مێزەکە دانیشتبوون و بەجێی خوێندنەوەی کتێب، سەبارەت بە شتێک شەڕە دەنووکەیان بوو. ئەم منداڵانە زیاتر مشتومڕەکانیان لە سەر مەسەلەی سەیر و سەمەرەی ژیان بوو. ناستیا گەورەتر بوو و قسەی وەبەر کاستیا نەدەخست. کاتێک گوێی بە قسەکانی نەدەدا و لەگەڵی هاوڕا نەدەبوو، زیاتر پەنای بۆ کوولیا کراسووتکین دەبرد. هیچ کامێکیشیان قسە و بیروڕای ئەویان بە هێند نەدەگرت. باسی ئەمجارەی منداڵەکان سەرنجی کوولیای ڕاکێشا و لە پێشخانەکە بێدەنگ ڕاوەستا و گوێی لێ گرتن. منداڵەکان زانییان خۆی لێگرتوونە و هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی گەرموگوڕتر قسە بکەن.

ناستیا دەیگوت: «من قەت باوەڕ ناکەم ئەو پیرێژنە مامانە لە نێو کەلەمی باخچەدا منداڵان بدۆزنەوە. ئێستا زستانە و کەلەم لە هیچ کوێ دەست ناکەوێ. کەوایە ئەو پیرێژنانە چۆن کچێک بۆ کاترینا دەدۆزنەوە و بۆی دەبەن؟»

کوولیا فیتوویەکی لێدا و بە خۆی گوت: «هیی‌یە!»

- ڕەنگە ئەوان کۆرپەی ساوا لە جێگایەکی دیکە بێنن، بەڵام بۆ کەسانێکی دەبەن کە زەماوەندیان کردبێ.

کاستیا، کڕ و کپ گوێی لە ناستیا گرتبوو و چاوی لێ نەدەترووکاند.

ئاخری ئارام و لێبڕاوانە گوتی: «ناستیا، تۆ زۆر گەوجی. خۆ کاترینا شووینەکردووە، چۆنی منداڵ وەگیر دەکەوێ؟»

ناستیا هەستا و بە توورەیی گوتی: «تۆ حاڵی نابی. ڕەنگە مێردیشی هەبێ، بەڵام مێردەکەی لە بەندیخانەیە، بۆیە تا ئێستا منداڵیان نەبووە.»

کاستیا بێ‌ئەوەی بیر لە هیچ بکاتەوە بە شێوەیەکی جیددی پرسیی: «بۆ یانی مێردەکەی لە بەندیخانەیە؟»

ناستیا، کە قسەکانی پێشووی ئەوی قەبووڵنەدەکرد و چاوپۆشیی لێدەکرد، قسەکەی پێبڕی و گوتی: «گوێبگرە با بە شێوەیەکی دیکە حاڵیت کەم. ئەو مێردی نییە، تا ئێرە هەق بە تۆیە، بەڵام دەیهەوێ شوو بکا، کەوایە لە بیری

شووکردندا بووه و تا ئێستا هێندەی بیرلێکردۆتەوە کە وەدەستی هێناوە، مێرد نالێم، مەبەستم منداڵە.»
کاستیا، کە قسەی پێنەمابوو، بە نیشانەی قەبووڵکردن گوتی: «ڕەنگە واشبێ. بەڵام پێشتر وات نەگوت. دەی خۆ من نەمدەزانی.»
کوولیا چووە ژووری بۆلای منداڵەکان و گوتی: «هۆی منداڵینە، وادیارە ئێوە زۆر ناجۆرن.»
کاستیا بزەیەکی هاتێ: «پێرزفۆنیش لەگەڵ تۆیە!» دەستیانکرد بە فیتوو لێدان و بانگ کردنی پێرزفۆن.
کوولیا کراسووتکین بە لەبزێکی پڕ سووکایەتی گوتی: «منداڵینە، گرفتێکم بۆ هاتۆتە پێشێ و دەبێ یارمەتیم بدەن. وادیارە ئاگاتا لاقی شکاوە، بۆیە تا ئێستا نەهاتۆتەوە. من دەبێ بڕۆمە دەرێ. دەهێڵن بڕۆم؟»
منداڵەکان بە نیگەرانییەوە چاویان لێکرد. ئەگەرچی پێدەکەنین بەڵام خەم و ناڕەحەتی بە ئەدگاریانەوە دیاربوو، بەڵام نەیاندەزانی چییان لە دەست دێ و کوولیا چاوەڕوانیی چیی لێیان هەیە.
ـ کاتێک لێرە نیم هاروهاجی مەکەن! بۆ بازبازوکێنە ناچنە سەر دۆڵابەکە! لە تەنیایی مەترسن و مەگرین!»
منداڵەکان ترسێکی قووڵ دایگرتن و ڕەنگیان تێکچوو.
ـ ئەگەر ئاقڵ بن شتێکتان پیشاندەدەم، تۆپێکی چکۆڵەی برنجی کە بە باڕووتی ڕاستی دەتەقێ.
منداڵەکان گەشانەوە. کاستیا بە دەم نەرمە بزەیەکەوە گوتی: «تۆپ! دەی کەوایە پیشانمانی بدە.»
کوولیا کراسووتکین دەستیکرد بە جانتاکەیدا و تۆپێکی زیوینی چکۆڵەی دەرهێنا و لە سەر مێزەکەی دانا. تۆپێکی لەیستۆکی بوو لە سەر میزەکە هەڵیخولاند و گوتی: «ئەو داوایە هەقی خۆتانە! چاوی لێکەن، لە سەر تایە دەگەڕێ. دەکرێ تەقەشەی پێبکەی. بۆ ئەوە دەبێ گوللەی تێخەی و بیتەقێنی.»
ـ خەڵکیش دەکووژێ؟

«بەڵێ، هەر لەڕێوە دەیکووژێ، بەڵام دەبێ سیرەی لێبگری،» پاشان کوولیا دەستیکرد بە تاریفکردنی تۆپەکە. زۆر تۆپی چاکە، لێرەوە باڕووتی تێدەکرێ، گوللەکەی ئالێرە دەخرێ، ئەوەش زارکی چکۆڵەی چاشنییە؛ کاتی تەقاندنیش دەکشێتەوە دواوە. منداڵەکان بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە گوێیان بۆ ڕاگرتبوو و چاویان لە دەستی دەکرد. ئەوەی کە زۆر سەرنجی ڕاکێشان و تووشی سەرسووڕمانی کردن. کشانە دواوەی تۆپەکە بوو.

ناستیا پرسیی: «باڕووتت پێیە؟»

- ئەرێ.

ناستیا بە بزەیەکی پڕ پاڕانەوە و نازەوە گوتی: «باڕووتەکەشمان پیشان‌دە.»

کوولیا دیسان دەستیکرد بە جانتاکەیدا و شووشەیەکی چکۆڵەی پڕ لە باڕووتی ڕاستەقینەی دەرهێنا. بڕێکیشی گوللە پێبوو لە کوتێ کاغەزی پێچابوو. تەنانەت زارکی شووشەکەشی کردەوە و تۆزێکی کردە سەر لەپی دەستی .

کوولیا بە شڵەژانەوە وریایی پێدان کە: «وریابن ئاور لەو دەوروبەرە نەبێ، دەنا دەتەقێتەوە و دەمانبا بە حەوادا.»

منداڵەکان بە ترس و دڵەخورپەیەکەوە کە ئەوەندەی دیکەی تووشی شادی و سەرسووڕمان کردن، چاویان لە باڕووتەکە بڕی. بەڵام کاستیا گوللەکەی پێ‌چاکتر بوو و پرسیی:

- گوللەکەشی ئاور دەگرێ؟

- نا.

کاستیا دەستیکرد بە پاڕانەوە: «تۆ خودا دووسێ دانەیان بدە بە من.»

- باشە، ها بیگرە، بەڵام هەتا دێمەوە پیشان دایکتی نەدەی، دەنا وادەزانێ باڕووتە و لە ترسانا لە دین دەردەچێ . لێتان دەدا.

ناستیا هەڵیدایە: «دایکم قەت لێمان نادا.»

ـ دەزانم، بەڵام با تووڕەش نەبێ. قەت فێڵ لە دایکتان مەکەن و هیچی لێمەشارنەوە، تەنیا ئەمجارە نەبێ، ئەویش هەتا دێمەوە. ئێستا دەهێڵن بڕۆم؟ خۆ ئەگەر من بڕۆم ناترسن؟ ناگرین؟!»

کاستیا دڵی پڕ بوو و گوتی: «ئێمە دە ـ دەگریین.»

ناستیاش وێڕای ئەو گوتی: «ڕاست دەکا، دەگریین، حەتمەن دەگریین.»

ـ ئاخ، لە دەست ئێوە منداڵەکان، بە کاری ئەوەش نایە بەجێتان بێڵم. جووجەڵەکانم، چارەم نییە، دەبێ لەلاتان بمێنمەوە، هەتا کەنگێش، نازانم. چبکەم. کاتیش تێدەپەڕێ، ئیتر فریا ناکەوم، چبکەم!»

کاستیا لەبەری پاڕایەوە: «بە پیرزفۆن بڵێ خۆی بمرێنێ!»

ـ چارەیەکی دیکەمان نییە، ناچارین پەنا بۆ پیرزفۆن بەرین. پیرزفۆن، ici. (وەرە بۆ ئێرە).

کوولیا دەستیکرد بە فەرمان پێدانی سەگەکە. ئەوەی فێری کردبوو سەگە بەڕێوەی برد. سەگێکی موو قرژ و دەستە بوو. جلێکی خۆڵەمێشێنی لەبەر کرابوو. چاوی ڕاستەی کوێر بوو. گوێچکەی چەپەشی هەڵقڵیشابوو. دەوەڕی و هەڵدەبەزی، خۆی هەڵدێنا و لە سەر پاشووی دەڕۆیشت. چوارپەلی لە حەوا دەکرد و لە سەر گازەرای پشت دەکەوت و خۆی وا لێدەکرد دەتگوت لە کارەبا دراوە و وشکبووە. هەر لەو کاتەدا کە خەریکی بەڕێوەبردنی ئەو شانۆیە بوو، ئاگاتای کڵفەتی خاتوو کراسووتکین، کە ژنێکی چل ساڵانەی قەڵەوە و گڕوێ بوو دەرگای کردەوە. لە بازاڕەوە هاتبۆوە و کیسەیەکی پڕ لە کەلوپەلی بە دەستەوە بوو. کیسەیەکی بە دەستی چەپەی هەڵگرتبوو، بێدەنگ ڕاوەستا و چاوی لە سەگەکە بڕی. ئەگەرچی کوولیا دڵەدوای هاتنەوەی ئاگاتا بوو، بەڵام شانۆکەی تێکنەدا و دوای ئەوەی ماوەیەک پیرزفۆنی بەوجۆرە ڕاگرت، ئاخری فیتووەکەی لێدا. سەگەش هەستا و لە خۆشی ئەوەی ئەرکی خۆی بەجێ هێناوە دەستیکرد بە هەڵبەزدابەز.

ئاگاتا بە لەبزێکی حەکیمانەوە گوتی: «ئەیەڕۆ سەگ و کاری ئاوا!»

کوولیا کراسووتکین بە مرومۆچی پرسیی: «زەعیفە، بۆ وا درەنگ هاتییەوە؟»

ـ دەمت لێکنێ، بەیتەشە.

ـ بەیتەشە؟

ئاگاتا کە بەلای وەجاخەکەوە خۆی خەریک کردبوو، بێئەوەی تووڕەیی و ناڕەحەتی بە دەنگییەوە دیاربێ، لە بن لێوەوە منجاندی: «ئەرێ، بە تۆ چی درەنگ هاتوومەوە. ئەگەر درەنگیش هاتبێتمەوە حەتمەن هۆیەکی بووە.» لە ڕاستیدا، وێدەچوو کەیف بکا کە ئاوا بە دەم ئەربابە مێر منداڵەکەیدا دێتەوە و سەر دەنێتە سەری.

کوولیا کراسووتکین لە سەر قەنەفەکە هەستا و گوتی: «گوێبگرە، ئەی پیرێژنی گەمژە، سوێندم بۆ بخۆ و بەڵێن بدە کە جوان ئاگاداری لەو منداڵانە دەکەی، من ئەوە دەڕۆم.»

ئاگاتا بە پێکەنینەوە گوتی: «سوێندت بۆچی بۆ بخۆم؟ بەبێ سوێندخواردنیش ئاگادارییان هەر لێدەکەم.»

ـ نا، دەبێ سوێندم بۆ بخۆی. دەنا ناڕۆم. بڵێ بە خودا.

ـ دەی مەڕۆ. بە من چی؟ دەرێ زۆر ساردە، هەر لە ماڵێ بی باشترە.

کوولیا ڕووی لە منداڵەکان کرد و گوتی: «منداڵینە، تا ئەو کاتەی من یان دایکتان دێینەوە، ئەم ژنە ئاگاداریتان لێدەکا، چونکە دەبوو زۆر لەوە زووتر بگەڕێتەوە. ئاگاتا، خۆ شتێکیشیان دەدەیەی، وانییە؟»

ـ حەتمەن.

کوولیا گوتی: «خوداحافیز، جووجەڵەکانم، ئێستا بێخەم دەڕۆم.» بەلای ئاگاتادا تێپەڕی و گوتی: «دایەگەورە، هیوادارم ئاگات لێیان بێ و تەمەنیان لەبەرچاو بگری، نەچی دەست بکەی بە قسەی پڕ و پیرێژنان سەبارەت بە کاترینا، حاڵی بووی؟ پێرزفۆن، ici!»

ئاگاتا، ئەمجارە بەڕاستی ڕقی هەستا و گوتی: «بڕۆ ملت بشکێنە، هەتێوە هیچوپووچە! لە سەر ئەو قسانە پێویستە تێهەڵدانێکی باش بخۆی!»

# (٣)

## كوڕی قوتابی

بەڵام کوولیا گوێی لەو قسانەی نەبوو. چونکە دەیتوانی بڕواتە دەرێ. هەروا کە دەڕۆیشتە دەرێ، لەبەر دەرگا چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد، شانی هەڵتەکاند و بە گوتنی «پیاو لە سەرمانا ڕەق دەبێ.» ڕاست بەرەو شەقام سەری پێوەنا و بەلای چەپدا بەرەو بازاڕ بایدایەوە. ماڵێکی مابوو بگاتە نێو بازاڕ ڕاوەستا، فیتفیتەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و وەک ئەوەی عەلامەتێک بدا، بە هەموو هێزی خۆی فووی پێداکرد. ناچار نەبوو لە خولەکێک زیاتر لەبەر دەمی کوڕێکی کوڵمە سووری یازدە ساڵانە، کە کۆتێکی گەرم و خاوێنی لەبەردا بوو و بۆ دیتنی ئەو بە پڕتاو هاتبووە دەرێ، مەحتەل بێ. کوڕە ناوی ئیسمۆرۆف بوو، کوڕە لە پۆلی ئامادەییدا دەرسی دەخوێند و ( دوو پۆل خوارتر بوو لە کوولیا کراسووتکین)، کوڕی کارمەندێکی دەوڵەمەند بوو. دایکی و باوکی نەیاندەهێشت تخوون کوولیا بکەوێ، چونکە بزۆزی و هاروهاجییەکەی ناوبانگی دەرکردبوو، بۆیە ئیسمۆرۆف بە دزییەوە دەهاتە دەرێ. ئەگەر خوێنەر لە بیری نەچووبێتەوە، ئەو یەکێک لەو کوڕانە بوو کە دوو مانگ لەمەوبەر بەردی لە ئیلۆشا هەڵکردبوو. ئیسمۆرۆف هەر ئەو کوڕە بوو کە نەقڵی ئیلۆشای بۆ ئالیووشا کارامازۆف گێڕایەوە.

ئیسمۆرۆف لە سەرەخۆ گوتی: «کوولیا، یەک سەعاتە چاوەڕێتم»، پاشان بە جووت بەرەو بازاڕ وەڕێکەوتن.

کوولیا کراسووتکین وەڵامی دایەوە: «وەدرەنگ کەوتم، کارم بۆ هاتەپێشێ. لێت نادەن بزانن لەگەڵ من هاتووی؟»

ـ گوێی مەدەیە. من تا ئێستا لێدانم نەخواردووە! پێرزفۆنیشت لەگەڵ خۆت هێناوە؟

ـ ئەرێ.

ـ لەگەڵ خۆت دەیهێنی بۆ ئەوێش؟

ـ ئەرێ.

ـ ئاخ، بریا ژووچکاشیان لەگەڵ بوایە!

ـ شتیوا هەر نابێ. ژووچکا هەر نەماوە، کەس نازانێ لەکوێیە، لەمێژە بێسەر و شوێنە.

ئیسمۆرۆف لە ناکاو لەجێی خۆی ڕاوەستا. «یانی ناکرێ ئەو کارە بکەین؟ ئیلۆشا دەیگوت ژووچکا سەگێکی خۆڵەمێشینی توولەک کردووی وەک پێرزفۆن بووە. ناکرێ بڵێی ئەوە ژووچکایە؟ ڕەنگە باوەڕیش بکا.»

ـ کوڕە واز لە درۆ بێنە، تەنانەت ئەگەر بە مەسڵەحەتیشی بزانی. هیوادارم سەبارەت بە هاتنی من هیچت پێنەگوتبێتن.

ئیسمۆرۆف گوتی: «نا، دڵنیابە! دەزانم چبکەم.» هەناسەیەکی هەڵکێشا و درێژەی بە قسەکانی دا: «بەڵام پێرزفۆن نابێتە هۆی دڵخۆشیی. جەنابسەروان باوکی ئیلۆشا «گسکە کوڵە» پێیگوتین دەیهەوێ ئەمڕۆ تووتکێکی لمبۆز ڕەشی بۆ بێنێ. پێیوایە ئیلۆشا دڵی پێیدەکرێتەوە، بەڵام من لەوە دڵنیا نیم.»

ـ ئێستا ئیلۆشا حاڵی چۆنە؟

ـ ئاخ، زۆر نەخۆشە! پێموایە دەردەباریکەی گرتووە، زۆر وریا و زیتە، بەڵام هەناسە کێشانی! زۆر بە دژواری هەناسە دەکێشێ. چەند ڕۆژ لەمەوبەر داوای پۆستاڵەکانی کرد، تاکو هێندێک بگەڕێ. تەنانەت هەوڵیدا بە نێو ژوورەکەدا پیاسە بکا، بەڵام نەیتوانی لە سەر پێ خۆ بگرێ. گوتی: «ئاخ، باوەگیان، پێشتر پێمگوتی ئەم پۆستاڵانە بەکار نایەن. ناتوانم پێیانەوە بڕۆم.»

پێی وابوو لاق تێکەڵهاتن و لاتراسکە بەستنەکەی خەتای ئەو پۆستاڵانەیە، بەڵام لەبەر بێهێزی بوو. لەوانەیە حەوتوویەکی دیکە نەژی. هێرتێزنێستیۆب دەوا و دەرمانی دەداتێ. ئێستا دەوڵەمەند بوون ـ کۆڵێکیان پارە هەیە.

ـ تاقمێکی خوێڕی و پارە پەرست؟

ـ مەبەستت کێیە؟

ـ مەبەستم دوکتۆرەکان و دارودەستە نۆژدارەکانیانە، هەموویان هەر وان و تێیناگەن. تەنیا دەزانن خەڵکی بڕووتێننەوە و پارە وەسەر یەک نێن. من زانستی دوکتۆریم قەبووڵ نییە. دامەزراوەیەکی هیچە. دەمهەوێ لە بنجوبناوانی مەسەلەکە بکۆڵمەوە و تێیبگەم. بەڵام ئەوە چ دڵسۆزییەکە لەوێ وەڕێتان خستووە؟ وادیارە هاوپۆلەکانی هەموو ڕۆژێ لەوێن؟

ـ هەموویان نا، تەنیا دە کەسمان هەموو ڕۆژێ دەچین بۆ دیدەنیی، قەستێکی تایبەتیشمان نییە.

ـ نازانم لەم نێوانەدا ئالکسی کارامازۆف چکارەیە. هەر ئەمڕۆ یان سبەینێ براکەی لە سەر جینایەت و پیاوکوژی دادگایی دەکەن، کەچی خۆی ئەوەندە بێکارە وەک گای نێو گوێلکان لەگەڵ مندالان کەوتووە و دڵسۆزی دەنوێنێ.

ـ دڵسۆزی لە ئارادا نییە. هەر ئێستا خۆشت دەبێ بچی لەگەڵ ئیلۆشا ئاشت بییەوە.

ـ لەگەڵی ئاشت بمەوە؟ قسەی قۆڕ دەکەی! من ئیجازە بە کەس نادەم خۆی لە کارم هەڵقوتێنێ.

ـ ئیلۆشا دەزانی بە دیتنت چەندە خۆشحاڵ دەبێ. نازانێ دەچی بۆلای. لەبەرچی تا ئێستا نەدەهاتی؟

ئیسمۆرۆف ئەم ڕستەی دواییی بە شێوەیەکی زۆر خەمبارانە دەربڕی.

ـ کوڕیچاک، ئەوە ئیتر پێوەندیی بە خۆمەوە هەیە. بە مەیلی خۆم دەمەوێ بچم، چونکە بە سەلاحی دەزانم، بەڵام ئێوە ئالکسی کارامازۆف دەتانبا. ئەم دوو شتەش جیاوازیی زۆرە و دیسان خۆ مەعلوومیش نییە! ڕەنگە نەیەم بۆ ئاشت بوونەوە. بەڕاستی قسەیەکی قۆڕە. ئاشت بوونەوە!

- کارامازۆف لەو نێوەدا هیچکارە نییە. کوڕەکان خۆیان بە مەیلی خۆیان بڕیاریاندا بچن. هەڵبەت جاری یەکەم لەگەڵ کارامازۆف چوون. بە کارێکی گەوجانەشی نازانم. هەموومان پێکەوە ناچینە ژووریَ، دانەدانە دەچین. باوکی بە دیتنی ئێمە زۆر خۆشحاڵ بوو. دەزانی بێتوو ئالیووشا بمریَ شێت دەبیَ. سورِ دەزانیَ ئیلۆشا دەمریَ. پێموایە زۆری پێخۆشە لەگەڵ کوڕەکەی ئاشت بووینەتەوە. ئیلۆشا پرسیاریکرد، هەر ئەوەندە، پرسیار دەکا و ئیتر هیچ ناڵیَ. باوکی یان شێت دەبیَ، یان خۆی دەخنکێنیَ. پێشتریش شێتبازاڕیی دەرهێناوە. دەزانی زۆر پیاوێکی باش و بەڕێزە. ئەو کاتە ئێمە بە هەڵە چووبووین. هەمووشی خەتای ئەو پیاوکوژە بوو، کە ڕیشی گرت و لێیدا.

- سەرەڕای ئەوانەش، سەرم لە کارامازۆف سووڕماوە. دەبوو زۆر لەوە زووتر لەگەڵی ئاشنا بم، بەڵام پێمخۆشە لە هێندێک بارەوە بە دڵی خۆم بکەم. لەگەڵ ئەوەشدا، شتێکم بۆ ئەو لە سەردایە و دەبیَ بیسەلمێنم.

کوولیا قوڕساخانە متەقی لە خۆی بڕی. ئیسمۆڕۆفیش بێدەنگ بوو. هەڵبەت ئیسمۆرۆف، کوولیای دەپەرەست و بە خەونیش نەیدەدی ببێتە هاوشان و هاوڕێی. ئێستاش زۆری ئەو قسەیەی بە دڵ بوو کە گوتی «بە مەیلی خۆی» دەچیَ بۆ دیدەنیی ئیلۆشا. پێی وابوو ئەو کارە ڕازێکی تێدایە کە ئاوا لەپڕ کوولیا لە سەری داوە بچیَ بۆ ملاقاتی ئیلۆشا. لە بازاڕ تێپەڕین. سەعاتێک دەبوو لادێیی عارەبانەی پڕ لە بار و مریشک و کەڵەشێریان ڕاگرتبوو و باریان بە عەرزدا دابوو. ژنانی کاسبکار لە نێو بۆتکەکانیاندا لۆکە و دەزوو و وردەواڵەیان دەفرۆشت. بەم یەکشەممە بازاڕانەیان دەگوت «بازاڕی مەکارە»، لە ماوەی ساڵدا ئەو چەشنە بازاڕەش بەردەوام هەبوو. پێرزفۆن بەملاوئەولادا هەڵدەهات و ملۆمۆی دەکرد. کاتێک تووشی سەگی دیکە دەبوون، بەپێی ئادابی سەگانە، بە تامەزرۆیی بۆنیان بە یەکترەوە دەکرد.

کوولیا گوتی: «ئیسمۆرۆف، پێمخۆشە ئەم دیمەنە ڕاستەقینە و سروشتیانە ببینم. سەرنجت داوە کاتێک ئەو سەگانە بە یەک دەگەن چۆن بۆن بە یەکترەوە دەکەن؟ پێموایە قانوونی زاتەکەیان وایە.»

ـ ئەرێ؛ عادەتێکی قۆڕ و پێکەنینیان هەیە.

ـ پێکەنینیش نییە، بە هەڵە چووی. سروشت هیچ شتێکی قۆڕ و پێکەنینیی تێدا نییە، ئەگەرچی لەبەر چاوی مرۆڤی دەمارگرژ قۆڕ و پێکەنینی دەنوێنێ. ئەگەر سەگەل بیانزانیبایە بیر کردنەوە و کردەوەی ئێمە هەڵسەنگێنن، دەیانزانی لە پێوەندیی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ و ئەربابەکانیاندا، زۆر شتی لەوە قۆڕتر و پێکەنینیتر هەیە ـ لە ڕاستیدا زۆر زیاتر. ئەوە دووپات دەکەمەوە، چونکە بە بڕوای من گەوجییەتیی ئێمە زۆر لەوان زیاترە. بیروڕای ڕاکیتینیش هەر وایە ـ بیروڕایەکی سەرنج ڕاکێشە. ئیسمۆرۆف، من سۆسیالیستم.

ئیسمۆرۆف پرسیی: «سۆسیالیست چییە؟»

ـ ئەوە کاتێکە کە هەموو کەس یەکسان بن و ماڵ و دارایی هەمووان بەقەد یەک بێ. ژنهێنان و شووکردن نەبێ و هەرکەس هەر یاسا و دین و ئاینێکی پێباشە پێڕەوەیی لێبکا... و هتد تۆ هێشتا تەمەنت بەو جێیە نەگەیشتووە لەوە بگەی. دەزانی هەواکەی زۆر ساردە! ئەرێ، هەشت پلە لە ژێر سفردایە، باوکم هەر ئێستا چاوی لە دەماسەنج کرد.

ـ ئیسمۆرۆف، تۆ سەرنجت داوە لە نیوەی زستاندا، ئەو کاتەی هەوا بە سفریش دەگا، وەک ئێستا کە سەرەتای زستانە و شەپۆلی سەرمای لە ناکاو لەکاردایە، بەتایبەت کاتێک بەفری زۆریش نەکەوتووە. زۆر هەست بە سەرما ناکەین؟ هۆیەکەشی ئەوەیە خەڵک عادەتیان پێنەگرتووە. مرۆڤ هەموو شتێکیان بەپێی عادەتە، هەموو شتێکیان تەنانەت پێوەندییە کومەڵایەتی و سیاسییەکانیشیان. عادەت پاڵنەرێکی گەورە و بەهێزە. ئەو لادێیە پێکەنینییەت دیوە!

کوولیا ئاماژەی بە لادێییەکی کەڵەگەتی، کەڵپۆس لەبەری بە نەشە کرد کە لە پەنا عارەبانەکەی ڕاوەستابوو و جووتێ دەستەوانەی چەرمیی کۆن و

دڕاوی لە دەستدا بوو و لیکی هەڵدەساوین. ڕیشە درێژ و بۆزەکەی کەڕەسیسەی گرتبوو و سپیی دەکردەوە.

کوولیا لەگەڵ ئەوەی بە پەنایدا تێپەڕی، بە دەنگێکی بەرز قیژاندی: «ڕیشی ئەو کابرا لادێییە بەستوویە.»

کابرای لادێییش بە لەبزێکی ئارام و حیکمەتئامیز وەڵامی دایەوە: «ڕیشی زۆر کەسان بەستوویە.»

ئیسمۆرۆف گوتی: «سەر مەخە سەری.»

- هیچ نییە. تووڕە نابێ. پیاوی چاکە. ماتۆوی. خوداحافیز.

- خوداحافیز.

- بۆ ناوت ماتۆوییە؟

- ئەرێ بۆ نەتدەزانی؟

- نا، نەمدەزانی. هەروا گوتم.

- درۆ مەکە! پێموایە خوێندکاری، ها؟

- ئەرێ.

- لەوە دەچێ قامچیش بخۆی؟

- زوریش نا - هێندێ جار.

- ئێشت پێدەگا؟

- ئەرێ، ئەیچۆن ئێشم پێناگا.

کابرای لادێیی لە دڵەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «ئاخ، لەو ژیانە!»

- خوداحافیز ماتووی.

- خوداحافیز، بە دینم کوڕێکی باش و ئاقڵی.

کوڕەکان بە ڕێی خۆیاندا ڕۆیشتن.

کوولیا بە ئیسمۆرۆفی گوت: «ئەو کابرا لادێییە زۆر پیاوی چاکە. من زۆرم پێخۆشە لەگەڵ لادێییەکان قسە بکەم، هەمیشەش پێمخۆشە چاکەیان لەگەڵ بکەم.»

ئیسمۆرۆف پرسیی: «بۆ درۆت کرد و گوتت قامچیمان لێدەدەن؟

ـ ناچار بووم وا بڵێم، بۆ ئەوەی خۆشحاڵی کەم.

ـ مەبەستت چییە؟

ـ دەزانی ئیسمۆرۆف، پێمخۆش نییە شتێکم دووجار لێبپرسن.

پێمخۆشە خەڵک لەگەڵ یەکەم قسە تێبگەن. هێندێ شت هەیە بەیان ناکرێ. لادێیی پێیان وایە کوڕە قوتابی قامچی دەخۆن و هەر دەبێ بیشیخۆن. ئەگەر کوڕە قوتابی قامچی نەخوا، بۆ ئەوە نابێ پێی بڵێی کوڕە قوتابی، ئەگەر پێمبگوتایە قامچی ناخۆین، دڵی ناخۆش دەبوو. بەڵام تۆ لەوە ناگەی. پیاو دەبێ بزانێ چۆن ڕێز بۆ لادێیی دانێ.

ـ تەنیا تکات لێدەکەم سەر مەخە سەریان، دەنا کێشەیەکی دیکەی وەک کێشەی قازەکەت تووش دەبێ.

ـ کەوایە تۆ دەترسی؟

ـ کوولیا پێمەکەنە. وایە دەترسم. باوکم لە دین دەرچووە. گەڕان و ڕەفیقایەتیم لەگەڵ تۆ لێ قەدەغە کراوە.

ـ دڵی خۆت نارەحەت مەکە. ئەمجار ڕووداوی وا ناقەومێ.

کوولیا ئەوەی گوت و ئاماژەی بە یەکێ لەو ژنە دەستفرۆشانەی نێو بۆتکەکان کرد و بە دەنگی بەرز هەرای لێکرد: «هۆی ناتاشا سڵاو!»

ژنێکی جحێڵ بوو بە تووڕەیی وەڵامی دایەوە: «بە من دەڵێی ناتاشا؟ وا مەڵێ، ناوی من مارییایە.»

ـ خۆشحاڵم کە ناوت مارییایە. خوداحافیز!

ـ ئەی هەتیوە پیسە، هێشتا سەری لە هێلکە نەجووقاوە گاڵتە بە خەڵک دەکا.

ـ من بەپەلەم. ئێستا ناتوانم ڕاوەستم. یەکشەممەی داهاتوو پێمبڵێ.

ئەوەی گوتو دەستی بۆلای ژنە ڕاتەکاند، وەک ئەوەی ژنە قسەی بە ئەو کوتبێ، نەک ئەو بە ژنە.

ماریا قیژاندی: «یەکشەممەی داهاتوو هیچ قسەیەکم لەگەڵ تۆ نییە. هەتیوە ڕووهەڵماڵدراوە بۆ لێت هەڵپێچاوم. خۆ من هیچم نەگوتووە. شیاوی ئەوەی لە سەر ئەو ناجسنییە قامچی بخۆی!

ئەو ژنە دەستفرۆشانەی لەو شوێنە بوون هەموویان دایان لە قاقای پێکەنین. لە ناکاو پیاوێک بە توورەیی و بە هەشتاو لە دالانی دووکانەکان دەرپەڕی. لاوێکی دەموچاو درێژۆکەی قژ لوول و ڕەنگ بزرکاو و هاوڵاوی، خەڵکی ئەم شارە نەبوو. باڵتەیەکی شینی لەبەردا بوو و کڵاوێکی شەپکەداری لە سەر نابوو. لە میرزای بازرگانان دەچوو. بە شێوەیەکی سەیر و گەوجانە مشتی قووچاند و هەڕەشەی لە کوولیا کرد. بە توورەیی گوڕاندی: «دەتناسم، دەتناسم!»

کوولیا چاوی تێبڕی. وەبیری نەدەهاتەوە کە لەگەڵ ئەو پیاوە تووشی کێشە و دەمەقاڵێ بووبێ. بەڵام لە نێو بازاڕ و سەر شەقام هێندەی لەگەڵ ئەموئەو شەڕە دەنوکە کردبوو، زۆر بە زەحمەت وەبیری دەهاتنەوە.

بە تەشەرەوە پرسیی: «بە ڕاستتە؟»

ئەو پیاوە بە شێوەیەکی حەپۆلانە دووپاتی کردەوە: «دەتناسم، دەتناسم!

- زۆر پیرۆزە. باشە، ئێستا دەبێ بڕۆم. خوداحافیز!

ئەو پیاوە گوڕاندی: «دیسان دەستتکردەوە بە کاری ناجسنانە؟ دیسان دەستت کردەوە بە کاری ناجسنانە؟ دەزانم دیسان کاری ناجسنانەت بە دەستەوە بووە!»

کوولیا کە بێدەنگ ڕاوەستابوو و چاوی لە سەرتاپای دەکرد، گوتی: «ئەوە پێوەندیی بە خۆمەوە هەیە، براکەم.»

- یانی پێوەندیی بە منەوە نییە؟

- نا پێوەندیی بە تۆوە نییە.

- ئەی پێوەندیی بە کێوە هەیە؟ ها؟ بە کێوە؟

- ئێستا پێوەندیی بە تریفۆن نیکیتیچەوە هەیە، نەک بە تۆوە.

کابرا بە سەرسوڕمانەوە چاوی لە کوولیا بڕی، دیاربوو زۆری ڕق هەستاوە، گوتی: «کام تریفۆن نیکیتیچ؟»

کوولیا، کتوپڕ بە توندی گوتی: «تا ئێستا چوویەتە کلێسەی عورووج؟

کابرا کە تا ڕادەیەک تووشی حەپەسان بووبوو، گوتی: «کام کلێسەی عورووج؟ بۆچی؟ نا، نەچووم.»

کوولیا پێداگرتر لە پێشوو گوتی: «سابانی‌یۆف دەناسی؟»

ـ کام سابانی‌یۆف؟ نا، نایناسم.

کوولیا قسەکەی پێبڕی و گوتی: «کەوایە بڕۆ بۆ جحەندەم،» لەگەڵ ئەوەی بە توندی بەرەولای ڕاست بایداوە، بەپەلە و هەڵەداوان ڕۆیشت. وەک ئەوەی پێی عەیب بێ لەگەڵ گەوجە پیاوێک قسە بکا کە سابانی‌یۆف ناناسێ.

کابرا دوای تاوێک عەبەسران وەخۆ هاتەوە و وەک پێشوو تووشی شڵەژان بوو. «هۆی دا ڕاوەستە بزانم! کام سابانی‌یۆف؟» بە چاوێکی گەوجانە لە ژنە دەستفرۆشەکانی ڕوانی: «گوتی چی؟»

ژنەکان دایان لە قاقای پێکەنین.

ژنێکیان گوتی: «کەس سەری لە کاری دەرناچێ.»

کابرا هەروا تووڕە و تۆسن، مشتی توند قووچاندبوو و ڕایدەتەکاند، دیسان دووپاتی کردەوە: «کام سابانی‌یۆف، مەبەستی کێیە؟»

یەکێ لە ژنەکان گوتی: «حەتمەن مەبەستی ئەو سابانی‌یۆفەیە کە کاسبکاری ماڵی کوزمیچۆفە.»

ژنێکی تر هەڵیدایە: کچێ ئەوەی ئێوە دەڵێن تریفۆنی ناوە، تریفۆن نیکیتیچ.

کابرا بە شێوەیەکی وەحشییانە چاوی تێبڕین و بە جارێ دۆش دامابوو.

ژنێکی دیکە گوتی: «کاسبکاری ماڵی کوزمیچۆف؟ بەڵام ناوی تریفۆن نەبوو. ناوی کوزما بوو، نەک تریفۆن. بەڵام کوڕە گوتی تریفۆن نیکیتیچ، کەوایە نابێ ئەو بێ.»

ژنێکی دیکەش، کە تا ئێستا بێدەنگ ڕاوەستابوو و متەقی نەدەکرد، هەڵیدایە: «ناوی نە تریفۆنە و نە سابانی‌یۆف، چیژۆفی ناوە. ئالکسی ئیوانیچ؛ چیژۆف ئالکسی ئیوانیچ.»

چوارەمین ژن کە وتەکەی ئەوی دەسەلماند گوتی: «لێم ڕوونە ناوی چیژۆفە.»

کابرا واق وڕماوانە چاوی لە ژنەکان دەکرد و هیوا بڕاوانە گوڕاندی:

ـ ئەی خەڵکینە، ئاخر نازانم بۆ ئەو پرسیارەی لێکردم؟ بۆچی گوتی: «سابانی‌یۆف دەناسی؟» ئاخر من چووزانم سابانی‌یۆف کێیە؟

ژنێکی دیکە بە زمانێکی ڕەق و ڕاشکاوانە گوتی: «تۆ بە ڕاستی پیاوێکی گەمژەی. من دەڵێم ناوی سابانی‌یۆف نییە، چیژۆفە، چیژۆف ئالکسی ئیوانیچ. هەر ئەوەیە، ڕاست خۆیەتی!»

ـ کام چیژۆف؟ کێیە؟ ئەگەر دەزانی پێم‌بڵێ.

ـ ئەو پیاوە حووجە بلّقنەی هاوینانە لە نێو بازاڕدا دەخولێتەوە.

ـ ئاخر ئەو چیژۆفە چ پێوەندییەکی بە منەوە هەیە، ها؟

ژنێکی دیکەیان هەڵیدایە: «من چووزانم؟ خۆت کە ئەو هەموو هاتوو هاوارەت وەڕێ خستووە، دەبێ بزانی چیت لێی دەوێ. ئەو، قسەی لەگەڵ تۆ کرد، نەک لەگەڵ ئێمە، گەوجەگیان. یانی هەر بە ڕاستی نایناسی؟»

ـ کێ ناناسم؟

ـ چیژۆف دەڵێم.

ـ هەردووک چاوی چیژۆف دەرێ. بە خزمەتی دەگەم ڕاوەستە، بە من ڕادەبوێرێ! هەتیوە بەڕەڵڵایە.

ـ بە خزمەت چیژۆف دەگەی! ئەویش بە خزمەتی تۆ دەگا. بە ڕاستی وادیارە پیاوێکی گەلحۆی.

ـ ژنەتیوە هیچوپووچە، خۆ من چیژۆف ناڵێم. بە خزمەت ئەو کوڕێژگە دەگەم. بیگرن، دابیگرن بۆم، من بە شێت دەزانێ و پێم ڕادەبوێرێ!

ژنەکان دایان لە قاقای پێکەنین. بەڵام کوولیا زۆر دوور کەوتبۆوە و قیت و قۆز ملی ڕێی گرتبوو. ئیسمۆرۆف شان بە شانی دەڕۆیشت و ئاوڕی لەو تاقمە دەم پڕ لە هەرایە دەدایەوە کە جێیان هێشتبوون. ئەویش لە خۆشیانا کەوتبووە قلەسەما. لە لایەکیشەوە دەترسا بەو هاوڕێیەتییە لەگەڵ کوولیا لە ماڵەوە تووشی کێشە و هەرا بێ .

لە کوولیای پرسی: «مەبەستت کام سابانی‌یۆف بوو؟» هەڵبەت دەیزانی چ وەڵامێکی دەداتەوە.

ـ چووزانم؟ ئێستا بڕۆ چاویان لێکە، هەتا ئێوارە هەر دەیڕێسن . شەڕە چەقە دەکەن. پێمخۆشە حەپۆل و گەوجان چێوەخزتێ دەم، جا لە هەر چینێکی کۆمەڵ بن، فەرقی پێناکەم. ئەوەش زڕتەبۆزێکی گەلحۆی دیکە، مەبەستم هۆو لادێییەیە. مەگین ئەو مەسەلەیەت نەبیستووە «گەوجتر لە فەڕەنسیی گەوج، مەگین خۆی بێ،» بەڵام ڕووسییەکی گەوجیش لە دوورەوە هاوار دەکا گەوجە، هەر بە ڕەنگیدا دیارە. تۆ چاوی لێکە.

ـ کوولیا، لە کۆڵی بەوە، وەرە با بڕۆین.

ـ تازە هەڵبووم و بە کەس ناکوژێمەوە. هۆی لادێیی سڵاو!

لادێییەکی تێکسمڕاو، بە دەموچاوی خڕ و سادەوە، ڕیشێکی بۆز و تەنکی هەبوو، سەری داخستبوو و دەڕۆیشت، سەری هەڵێنا و چاوێکی لە کوڕە کرد. لەوە دەچوو تەواو وریا نەبێ.

لە وەڵامیدا بە قەستی گوتی: «ئەگەر ناتەوێ پێم ڕابوێری، عەلەیکەسەلام.»

کوولیا بە پێکەنینەوە گوتی: «ئەگەر پێتڕابوێرم چی؟»

ـ دەی ئەوە گاڵتەیە گاڵتە. بۆخۆت هەر پێبکەنە قەیدێ ناکا. خۆ گاڵتە خراپ نییە.

ـ بمبەخشە براکەم. گاڵتەیەکم کرد.

ـ چاکە، خودا بتبەخشێ!

ـ تۆش من دەبەخشی؟

ـ زۆر چاکیش دەتبەخشم. ڕێگای خۆت بگرە و بڕۆ.

ـ دەڵێم پێموایە لادێییەکی زۆر وریا و بەهۆشی.

کابرای لادێیی هەر بەو شێوەیە جیددی و چاوەڕوان نەکراو وەڵامی دایەوە: «بەهۆشتر لە تۆ.»

کوولیا تۆزێ واقی وڕما و گوتی: «پێموا نییە.»

ـ بڕوا بکە بەڕاستمە.

ـ ڕەنگە واش بێ.

ـ بەڵێ وایە، براکەم.

ـ خوداحافیز لادێیی.

ـ خوداحافیز.

کوولیا، دوای تاوێک بێدەنگی بە ئیسمۆرۆفی گوت: «هەموو جۆرە لادێییەک هەیە. من چووزانم لەگەڵ لادێییەکی وریا تێدەکەوم؟ من هەمیشە بڕوام بە هۆش و زیرەکیی لادێییەکان بووە.»

لەو دوورانەوە سەعاتی کلێسەی گەورە زەنگی سەعاتی یازدە و نیوی لێدا. کوولیا و ئیسمۆرۆف هەنگاویان توند کرد و خۆیان گەیاندە نزیک ماڵەکەی ئیسنگیریف کە تا ڕادەیەک دووریش بوو. بیست هەنگاویان مابوو بگەنە ماڵەکە، کوولیا ڕاوەستا و داوای لە ئیسمۆرۆف کرد لە پێشەوە بچێ و کارامازۆفی بۆ بانگ بکاتە دەرێ.

ـ پیاو سەرەتا تۆزێ بوارەکە تاقیکاتەوە باشە.

ئیسمۆرۆف بە ناڕەزایەتییەوە گوتی: «بۆ داوای لێبکەم بێتە دەرێ؟ خۆت بچۆ ژووری؛ بە دیتنت خۆشحاڵ دەبێ. ئاخر لەم سەرما و سۆڵە و سەهۆڵبەندانەدا ئاشنا بوون چ مانایەکی هەیە؟»

کوولیا بە لەبزێکی فەرمانپێدەرانە کە پێیخۆشبوو لەگەڵ «منداڵان» بە کاری بێنێ، قسەکەی پێ بڕی: «ئەوە پێوەندیی بە خۆمەوە هەیە کە بۆ دەمهەوێ لەو سەرما و بەستەڵەکەدا چاوم پێی بکەوێ.» ئیسمۆرۆف بە هەڵاتن چوو فەرمانەکەی جێبەجێ بکا.

## (٤)

# سەگی بزر بوو

کوولیا قۆڕەدەماخانە پاڵی بە نەردەکانەوە دا و چاوەڕێ بوو ئالیووشا بێتە دەرێ. لەمێژ بوو دەیویست چاوی پێیبکەوێ. باسی ئالیووشای لە کوڕانی هاوپۆلی بیستبوو، بەڵام هەر کاتێ ناویان دەهێنا ڕقی هەڵدەستا و خۆی وا نیشاندەدا کە بە هیچی نازانێ و هەر شتێکی لە بارەیەوە دەبیست دەیدایە بەر پلاری «ڕەخنە». بەڵام لە ناخەوە زۆر تامەزرۆ بوو لەگەڵی ئاشنا بێ. لەسەریەک ئەوەی سەبارەت بە ئالیووشا دەیبیست، شتێکی هاودڵانە و سەرنجڕاکێشی پێوە نەبوو. کەوایە ئەم ساتەی ئاشنا بوونە زۆر گرینگ بوو: سەرەتا دەبوو خۆی نیشانبدا، یانی سەربەخۆیی خۆی بنوێنێ. «دەنا منیش وەک ئەوانی دیکە بە چاوی منداڵێکی سێزدە ساڵان دەبینێ. چونکە ئەو کوڕانە هەر بە هیچ نازانێ! هەر لە گەڵی ئاشنا بم لێی دەپرسم بە چ چاوێک لەو کوڕانە دەڕوانێ. بەڵام بە داخەوە کورتە باڵام. تۆزیکۆف لە من کەم تەمەنترە، بەڵام بەو حاڵەش هەتا گوێچکەی دێم. بەڵام من زیرەکی و هۆش لە ڕوخسارم دەبارێ. قەڵافەتێکی جوانم نییە، دەزانم زۆریش ناشیرینم، بەڵام وریایی و هۆش لە ڕوخسارم دەبارێ. نابێ لە قسە کردندا زێدەڕۆیی بکەم؛ ئەگەر یەکەوجار خۆم بدۆڕێنم و توندی نەگرم، ڕەنگە پێیوابێ... تف! ئەوە ئیتر هەر نابێ و بە جارێ ئابڕووم دەچێ ئەگەر پێیوابێ...!»

ئەو بیرۆکە مێشکی کوولیای داگرتبوو، لەگەڵ ئەوەی ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدا تاکو خۆی وەک کەسێکی زۆر سەربەخۆییخواز نیشانبدا و ئەو بیرۆکە بەردەوام دنەی دەدا. ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر ئازاری دەدا،

کورتە باڵاییەکەی بوو. ئەوەندەی بۆ قەڵافەتە وردیلەکەی خەمی دەخوارد، نیو ئەوەندە بۆ «ڕوخسارە ناشیرینەکەی» نارەحەت نەبوو. ساڵی ڕابردوو، لە سەر دیواری ماڵەکەیان بە قەڵەم باڵای خۆی دیاریکردبوو و هەر دوو مانگ جارێک خۆی پێدەگرت و باڵای خۆی تاقیدەکردەوە بۆ ئەوەی بزانێ چەندە گەورە بووە. بەڵام بە داخەوە! زۆر کەم باڵای دەکرد و هەر ئەوەش هێندێ جار هیوابڕاوی دەکرد. لە ڕاستیدا دەموچاویشی «زۆر ناحەز» نەبوو؛ بە پێچەوانە، تا ڕادەیەک جوان و لەبەردڵانیش بوو: پێستێکی نەرم بە دەنکە دەنکەیەک وردە خاڵ و لکەوە، چاوی شین و چکۆڵە و پڕ لە شادی بە ڕەنگی بزرکاوەوە. جۆرێک بێباکی و هەست لە چاویدا دەدرەوشایەوە. دەموچاوێکی ڕەقەڵە و لێوی قەیتانی و سوور. لووتێکی چکۆڵە و قەڵەنگی، هەر کاتێک لەبەر ئاوێنە چاوی لە خۆی دەکرد، لەبەرخۆیەوە دەیمنجاند: «لووتم دەڵێی لمبۆزی سەگە، لمبۆزی سەگێکی ئاسایی.» هەمیشەش بە تووڕەیی لەبەر ئاوێنەکە لادەچوو. هێندێ جار بە خۆی دەگوت: «ڕەنگە ڕوخساریشم هۆشی لێ نەبارێ.» بەڵام لەوەش بە گومان بوو. سەرەڕای ئەوەش ناکرێ وا بیر بکەینەوە کە دایمە لە بیری بەژن و باڵا و ڕوخساریدا بوو. بە پێچەوانە، ئەگەرچی ئەو کاتانەی لەبەر ئاوێنە ڕادەوەستا زۆر تاڵ بوو بۆی، بەڵام زوو لە بیری دەچۆوە، ئەویش لە درێژ خایەندا، هەروا کە چالاکییەکانی خۆی لێکدەدایەوە، «یەکسەر خۆی دەدایە دەست بیرۆکە و ژیانی ڕاستەقینە.»

ئالیووشا بەپەلە هاتە دەرێ و ڕۆیشت بۆ لای کوولیا. بەر لەوەی بگاتێ کوولیا هەستی بە خۆشحاڵییەکەی کرد. کوولیا ڕەزامەندانە لە خۆی پرسی: «یانی دەکرێ بۆ دیتنی من هەتا ئەو ڕادەیە دڵشاد بێ؟» وا چاکە هەر لێرەدا ئەوە وەبیر بێنینەوە کە قەڵافەتی ئالیووشا، لە چاو دوایین جار کە چاومان پێیکەوت، گۆڕانێکی تەواوی بە سەردا هاتبوو. عەباکەی وەلا نابوو و کۆتێکی جوانی لە بەردا بوو. کڵاوێکی نەرم و خڕیشی لە سەر نابوو. مووی سەریشی کورت کردبۆوە. زۆری لێ دەکاڵایەوە، جوانچاکیش بوو. ڕوخسارە دڵگرەکەی گەش و کراوە بوو؛ بەڵام لە ڕوخسارە گەشاوەکەیدا ئەدەب و

هێمنایەتی دیار بوو. کوولیا سەیر بوو کە ئالیووشا بەو قەڵافەتەوە، بە بێ عەبا هات بۆ لای. دیار بوو بەپەلە هاتووە. لەڕێوە دەستی بردە پێشێ و تۆقەی لەگەڵ کوولیا کرد.

ـ ئاخری هاتی! زۆر تامەزرۆی دیدارت بووم!

کوولیا، تۆزێ بە هەناسە بڕکێوە، لە ژێر لێویەوە گوتی: «هۆیەکی بوو کە دواتر دەزانی. زۆریش خۆشحاڵم لە ئاشنایەتیت. لەمێژ بوو لەو دەرفەتە دەگەڕام، زۆریان باسی تۆ بۆ کردووم.»

ـ هەر چۆنێکە چاومان بە یەکتر کەوت. منیش زۆرم نەقڵی تۆ بیستووە؛ بەڵام بۆ هاتنی ئێرە زۆر وەدرەنگ کەوتی. دەبوو زووتر بێی.

ـ ئەرێ ئێستا حاڵی چۆنە؟

ـ ئیلۆشا زۆر نەخۆشە، وەک ڕۆژ مەعلوومە نامێنێ.

کوولیا بە تینوتاوێکەوە گوتی: «هەی داد و بێداد! کارامازۆف دەبێ قەبووڵیکەی کە زانستی پزیشکی هەموو فێڵ و تەڵەکەیە.»

ـ ئیلۆشا هەمیشە باسی تۆی دەکرد، تەنانەت لە خەویشدا، بە دەم وڕێنەوە. پیاو بۆی دەردەکەوت یەکجار زۆری خۆش ویستووی... بەر لەو ڕووداوە... بە چەقۆ... پاشان، هۆیەکی تریش هەیە... پێمبڵێ بزانم، ئەو سەگە هی تۆیە؟

ـ بەڵێ، ناوی پێرزفۆنە.

ئالیووشا بە چاوانی پڕ لە دڵسۆزییەوە لە کوولیای ڕوانی: «کەوایە ئەوە ژووچکا نییە؟ یانی ئیتر شرتوگوم بووە؟»

کوولیا بە حاڵەتێکی ڕازاوی بزەی هاتێ: «دەزانم هەمووتان دەتانهەوێ ئەو سەگە ژووچکا بێ. نەقڵەکەییم بیستووە. گوێ بگرە کارامازۆف، هەموو بەسەرهاتەکەت بۆ دەگێڕمەوە. هەر بۆ ئەوەش هاتووم؛ هەر لەبەر ئەوەش ویستم بێیتە دەرێ. تاکو بەر لەوەی بچیتە ژووری، هەموو ڕووداوەکەت بۆ باسکەم. دەزانی چی کارامازۆف، ئیلۆشا بەهاری ڕابردوو هاتە پۆلی ئامادەییەوە. دەی خۆ دەزانی قوتابخانەی ئامادەیی چییە ـ تاقمێکی زۆر

منداڵن. خێرا دەستیانکرد بە ئازار دانی و سەریان دەخستە سەری. من دوو پۆل لە سەروو ئەوانەوە بووم و لە دوورەوە دەمخستە ژێر چاوەدێری. دیتم کورە لەڕ و لاواز و چکۆلەیە، بەڵام ڕووی پێ نەدەدان؛ شەڕی لەگەڵ دەکردن. دیتم زۆر لەخۆباییە و چاوی ئاوری لێدەبێتەوە. من ئەو جۆرە منداڵانەم خۆش دەوێ. بەڵام دیار بوو منداڵەکان گاڵتەی پێدەکەن و ناوونرکەی لێ هەڵدەدەن. لە هەمووشی خراپتر جلوبەرگە شڕ و کۆنەکانی بوو. پانتۆڵەکەی تەنگ و قوڵە بوو و پۆستاڵەکانی دڕاو و لووت هەڵپچڕاو. هەر لەبەر ئەوەش بوو گاڵتەیان پێدەکرد و سەریان دەخستە سەری. منیش شتی ئاوا ببینم تاقەت ناهێنم. بۆیە خێرا لێیان وەدەستهاتم و چیان خواردووە ترش و چەوەندەر....»

کوولیا بێئیختیار دەستی کردبوو بە شاتوشووت: «چاکم لێدان، بەڵام کارامازۆف، دەزانی هەموو تاریفم دەکەن؟ من هەمیشە هۆگری منداڵانم و خۆشمدەوێن. هەر ئێستا لە ماڵەوە دوو جووجەڵەم بەجێهێشتووە و دەبێ ئاگام لێیان بێ، بۆیەش وا وەدرەنگ کەوتم. کاتێک زانییان من لە سەر ئیلۆشا دەکەمەوە، ئیتر نەیاندەوێرا شەڕی لەگەڵ بکەن. دیتم کورە زۆر لەخۆباییە. با ئەوەم لە بیر نەچێ، بڕوا بکە ئیلۆشا زۆر کوڕێکی لەخۆباییە، بەڵام ئاخری بوو بە کۆیلە و گوێڕایەڵی خۆم. هەرچیم پێ بگوتایە دەستبەجێ دەیکرد. ئەوەندە ڕۆحسووکانە فەرمانەکانمی بەڕێوە دەبرد دەتگوت من خودام، هەوڵیشی دەدا لاساییم بکاتەوە و وەک من هەڵسوکەوت بکا. کاتێ لە قوتابخانە دەهاتە دەرێ بە هەڵاتن دەهات بۆ لام و لەگەڵی دەگەڕام. یەکشەممانەش پێکەوە دەچووین بۆ ئەملاو ئەولا. کاتێک کوڕێکی گەورە لەگەڵ کوڕێکی چکۆڵە دەبێتە هاوڕێ، زۆر جار خەڵک پێی پێدەکەنن، بەڵام ئەوە دەمارگرژییە و بەس. من گوێ بەو شتانە نادەم. من هۆگری ئەو کارانەم و دڵم پێیخۆشە. لە دەرس و دەورەکانیا یارمەتییدەدەم و فێریدەکەم، ڕایدێنم. ئەگەر خۆشم دەوێ، بۆ بە باشی نەیعاملێنم؟ ئێوەش جەنابی کارامازۆف، لەگەڵ ئەو جووجەڵانە کە تازە سەریان لە هێلکە جووقاوە

سەری ئاشنایەتیتان داخستووە، دەزانم دەتەوێ بەرەی نوێ بخەیە ژێر چاوەدێری، کاریان تێبکەی و بە باشی ڕایانبێنی، دڵسۆزانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەی و بڕوابەخۆ باریان بێنی. باوەڕم پێ بکە هەر ئەو کارانەت بە گوێم گەیشتەوە و بڕیارمدا لە نزیکەوە چاوم پێتبکەوێ. بێینەوە سەر باسەکەی خومان. دیتم کوڕە زۆر نەرم و هێدییە و هێندێ جار مەراییم لەبەر دەکا، منیش ڕقی دنیام لە ڕیابازی و تەشیڕێسییە، یانی لەوەتا لە دایک بووم هەر وام. سەرم لەو خووخدە دووپۆیەشی سوڕمابوو، دوو شتی زۆر لە یەک جیاواز، بەو هەموو لووتبەرزی و لەخۆباییبوونەوە، ئاوا بووبووە سەر لە پێناوی من و بە بێ من قامکی بە ئاودا نەدەکرد، لە سەر یەک حاڵاتەکەی کشمیشی بوو، جاری وا بوو لە خۆڕا تێکدەچوو، کتوپڕ ڕقی هەڵدەستا و لەگەڵم دەکەوتە کێشە و شەڕە دەندووکە. بە دژی قسەکانم هەڵوێستی دەگرت. هێندێ جار کە بیروڕای خۆم سەبارەت بە شتێک دەردەبڕی، قەتی دژایەتی نەدەکرد و قسەی لە قسەمدا نەدەکرد، بەڵکو دەیویست بە شێوەیەک لێم یاخی بێ، چونکە وەڵامی خۆشەویستییەکەییم بە سەرساردی دەدایەوە. هەر بۆیە بە مەبەستی جوان عاملاندنی، هەتا زیاتر نەرمیی دەنواند، من وشک و ساردتر لەگەڵی دەجووڵامەوە. بە قەستی وامدەکرد. دەمویست وەک کوڕێکی خاوەن کەسایەتی باری بێنم. دەمویست ڕاستە و پاستەی کەم و بیکەم بە پیاو... لەگەڵ ئەوەشدا... بێگومان لە مەبەستم دەگەی. لە ناکاو تێگەیشتم، سێ ڕۆژ لە سەر یەک دەمدی مات و مەلوولە، ئەویش لەبەر سارد و سڕیی من نەبوو، بەڵکو لەبەر شتێکی دیکە، شتێکی زۆر گرینگ. لە خۆم پرسی ئەم تراژیدیایە چییە. قسەم لێ داکێشا و بۆم دەرکەوت کە لەگەڵ ئیسمیر دیاکۆف، کە خزمەتکاری باوکی ڕەحمەتیتان بوو ـ ئەوەش بەر لە مردنی ـ دۆستایەتییەکەی تێکچووە و فێڵیشی لەم کوڕە گەوجیلە کردووە ـ یانی فێڵێکی گڵاو و وەحشییانە. پێیگوتبوو پەنچکێ نان هەڵگرێ و دەرزییەکی تێ هەڵچەقێنێ و بیدات بەو سەگە برسییانەی کە هەر شتێکیان دەستکەوێ بێئەوەی گازی لێبگرن قووتی دەدەن. پاشان چاوی لێبکا و بزانێ چی

دەقەومێ. هەر بۆیە پەنچکە نانێک دێنێ دەرزییەکی تێهەڵدەچەقێنێ و فڕێی دەداتە بەردەمی ژووچکا. هەر ئەو سەگە توولەک کردووەی ئەوەندەیان هەرا و قاڵمەقاڵم لە سەر ساز کرد. ئەو ماڵەی خاوەنی نان و خۆراکیان نەدەدایە و سەگی بەستەزمان بەو ڕۆژگارە لە برسانا دەوەڕی و قورووسکەی دەهات. (تۆ ئەو حەپە حەپە گەوجانەیەت پێخۆشە، کارامازۆف؟ من بەش بە حاڵی خۆم بۆم تامڵ ناکرێ.) سەگە هەڕا دەکاتە نانەکە و قووتی دەدا. دوای چەن چرکە دەستدەکا بە قورووسکاندن و نووزەنووز؛ بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە و پاشان هەڵدێ، هەر هەڵدێ و دەقورووسکێنێ هەتا ون دەبێ. ئیلۆشا خۆی ئاوای دەگێڕایەوە. لەگەڵ ئەوەی بۆی دەگێڕامەوە دەگریا و سەری بە هەنیسکەوە هەڵدەقەندرا. باوەشی پێداکردبووم و دەلەرزی. لەپەستا دەیگوت: «بە قورووسکە قورووسک هەڵات.» ئەو دیمەنە وای هەژاندبوو ئاراوقارای لێ هەڵگیرابوو. گڕی پەشیمانی هەڵیدەچۆقاند، ئەوەم لێ ڕوون بوو. مەسەلەکەم زۆر بەلاوە جیددی بوو. بڕیارمدا بۆ شتێکی دیکە دەرسی عیبرەتی دادەم. هەر بۆیە دەبێ دان بەوەدا بنێم کە زۆری لەگەڵ ڕووڕاست نەبووم و لە ڕادە بەدەر خوم قەڵس و تووڕە نیشاندا. گوتم: «کارێکی دزێوت کردووە. تۆ هیچوپووچی. هەڵبەت بە کەس ناڵێم، بەڵام هەتا ماوەیەک کارم بە کارت نییە. بیری لێ دەکەمەوە و بە ئیسمۆرۆفدا وەڵامت بۆ دەنێرمەوە. (ئیسمۆرۆف هەر ئەو کوڕەیە وا لەگەڵ من هاتووە؛ ئامادەیە بە گیان و بە دڵ هەموو کارێکم بۆ بکا.) «پاشان پێتڕادەگەیەنم کە لەمەولا ڕفێقایەتیت دەکەم یان هەمیشە وەک مرۆڤێکی هیچوپووچ چاوت لێدەکەم و ئیتر کارم بە کارت نابێ.» زۆری پێ ناخۆش بوو. دەبێ دان بەوەشدا بنێم کە لە قسە کردندا زۆر توند ڕۆیشتم، بەڵام چارم نەبوو. لەو کاتەدا وام بە چاک زانی. یەک دوو ڕۆژ دواتر، ئیسمۆرۆفم نارد بۆ لای کە پێی بڵێ لەگەڵی خاکم. ئەوەش ئیستلاحێکە کە دوو هاوپۆل کاتێ دەنگ دادەگۆڕن، دەیڵێن. لە دڵی خۆمدا دەمویست تەنیا چەند ڕۆژ دەنگی لەگەڵ داگۆڕم و پاشان ئەگەر دیتم تۆبەی کردووە، دیسان هاوڕێیەتی لەگەڵ دامەزرێنمەوە. قەستم ئەوە بوو. بەڵام

پێتوایه چی ڕووی دا؟ کاتێک ئیسمۆرۆف پەیامەکەی پێڕادەگەیێنێ، چاوی بریقەیەکی لێوە دێ و بە تووڕەیی دەڵێ: «لە زمانی منەوە بە کوولیا کراسووتکین بڵێ نان و دەرزی دەخەمە بەر هەموو سەگێک ـ هەموویان ـ هەرچی سەگە!»

«هەر بۆیە دەستیکرد بە پەلپ و بیانوو. دەبوو لە کەری شەیتانی دابەزێنین.» بە چاوی سووکایەتییەوە هەڵسوکەوتم لەگەڵ دەکرد و چاوم لێدەکرد؛ هەرکاتێک دەمدی ڕووم وەردەگێڕا یان بە تەشەرەوە دەگرژیمەوە. ڕاست لەو کاتەدا باوکی ئەو ڕووداوەی بۆ هاتە پێشێ. «گسکە کۆڵە» خۆ لەبیرتە؟ دەبێ ئەوەش بزانی کە بە هۆی ئەو ڕووداوەوە چۆن تووشی شڵەژان بوو. هاوپۆلەکانی کاتێک دیتیان من دەستم لێ‌داشتووە، کەوتنە سەروکاری « گسکە کۆڵە، گسکە کۆڵە» دەکەوتنە دوای و سەریان دەخستە سەری. ئەویش لەگەڵیان دەکەوتە کێشە و بۆ ئەوەش زۆر بە داخەوەم. پێموا لێدانێکی باشی خواردبوو. بە چەند کەس هەڵیان کوتابووە سەری. ڕۆژێک کە لە قوتابخانە دەهاتنە دەرێ هێرشی بۆ بردن، من چەند هەنگاو لەولاترەوە ڕاوەستابووم و تەماشام دەکرد. سوێندیشت بۆ دەخۆم کە وەبیرم نایە پێکەنیبێتم؛ بە پێچەوانە زۆر زۆریشی بۆ بەداخەوە بووم. بڕیارمدا زۆر زوو بچم و لایەنگریی لێبکەم. بەڵام لە ناکاو چاوی بە من کەوت. نەمزانی چ خەیاڵێکی لەسەردایە، بەڵام چەقۆکەی دەرهێنا، هێرشی بۆ هێنام و چەقۆیەکی لەڕانم دا. ئالێرەم لە لاقی ڕاستەم. لەجێی خۆم نەبزووتم. بە خراپی نازانم دان بەوەدا بنێم کە ورەم بەرزە جەنابی کارامازۆف. بە چاوی پڕ سووکایەتی تێمڕوانی، وەک ئەوەی بڵێم: ئەوەیە وەڵامی ئەو هەموو چاکە و دڵسۆزییەی من! ئەگەر پێتخوشە، دیسان لێمدە، لەبەردەستت دام.» بەڵام دەستی لە چەقۆکێشان هەڵگرت، ڕەنگی پەڕی، لەوەدەچوو ئەو کارەی زۆری ترساندبێ. چەقۆکەی فڕێدا، دەستیکرد بە گریان و تێیتەقاند. هەڵبەت شکایەتم لێنەکرد و بە هەمووانم گوت کە ئەو ڕووداوە پووشبەسەر بکەن، نەکا بە گوێی مامۆستایانی قوتابخانە بگاتەوە. تەنانەت بە دایکیشم نەگوت، هەتا ئەو کاتەی

برینەکەم چاک بۆوە. برینەکەش شتێکی وا نەبوو، تەنیا سەرچیغ بڕیبووی. پاشان بیستم کە هەر ئەو ڕۆژە بەردەفڕکێی کردووە و گازی لە قامکی ئێوەش گرتووە - بەڵام ئێستا دەزانی لە چ بارودۆخێکدا بووە! دەی خۆ چارەیەک نییە: لەبەر گەوجییەتیم بوو کاتێک نەخۆش کەوت، نەهاتم لێی خۆشبم ـ یانی، لەگەڵی ئاشت بمەوە. ئێستا لەو بارەوە زۆر بەداخەوەم. بەڵام هۆیەکی تایبەتی هەبوو. دەی ئەوەش سەرلەبەری ڕووداوەکە بوو بۆم باسکردی... بەڵام بەداخەوە گەوجییەتیم کرد.»

ئالیووشا بە ئیحساسەوە گوتی: «ئاخ، حەیفیٚ پێشتر نەمدەزانی پێوەندیی ئێوە چۆن بووە، دەنا زۆر زووتر دەهاتم و تکام لێدەکردی لەگەڵم بێی بچین بۆلای. باوەڕ دەکەی لە کاتی تاویاودا وڕێنەی بە تۆوە دەکرد. نەمدەزانی تا ئەو ڕادەیە بایەخت هەیە بۆی. ئەریٚ سەگەکەت هەر نەدۆزییەوە؟ باوکی و کوڕەکانی قوتابخانە تەواوی شاریان سەنگوسووژن دا بە دوایدا. لەوەتا نەخۆشکەوتووە، سیٚجار دەستیکردووە بە گریان و گوتوویە: «باوە ئاهی ژووچکایە ئاوا نەخۆش کەوتووم. خودا تۆڵەی ئەوە لێمی دەکاتەوە.» ناتوانیٚ لەبیری بەرێتەوە. ئەگەر سەگەکە بدۆزێتەوە و زیندووبیٚ، تا ڕادەیەک دەتوانین هیواداربین کە ئەو شادییە ببێتە هۆی چاک بوونەوەی. ئێمە هەمووومان هیوامان بەتۆیە.»

کوولیا بە کونچکاوییەکی زۆرەوە پرسیی: «پێمبڵیٚ بزانم چۆنبوو بیرتان لەوە کردەوە من دەتوانم ژووچکا ببینمەوە؟ بۆ هیواتان بە منە و پێتانوایە ئەو کارەم لەدەست دیٚ؟»

ـ بیستوومانە بە دوایدا دەگەڕێی، ئەگەر بشی دۆزییەوە، دەیهێنییەوە. ئیسمۆرۆف شتێکی وایگوت. ئێمە هەموو هەوڵمان داوە ئیلۆشا قانع کەین کە سەگەکە زیندووە و چەنکەس دیتوویانە. چەند ڕۆژ لەمەوبەر کوڕەکان کەروێشکێکیان بۆ هێنا، تەنیا بە بزەیەکی ساردەوە چاوی تێبڕی و داوای لێکردن بیبەن لە دەشت بەرەڵڵای کەن. ئەو کارەشمان کرد. باوکی تازە

هاتۆتەوە و تووتکێکی خرپنی بۆهێناوە. بەو هیوایەی تۆزێ دڵی خۆشبێ، بەڵام پێموایە خراپتریش دەبێ.

- کارامازۆف، پێمبڵێ بزانم باوکی چ جۆرە پیاوێکە؟ دەیناسم، بەڵام زیاتر وەچی دەچێ - لە فێڵەباز یان حەنەکچی؟

- ئاخ، نا. بنەماڵەیەکی زۆر خاوەن هەست و دڵناسکن بەڵام نێوچاوانەکەیان نەیهێناوە و تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشییە هاتوون. حەنەکچییەتی لای ئەوان چەشنێک تەنزی پڕ لە بێزارییە لە هەمبەر کەسانێکدا کە ناوێرن باسی هەقیقەت بکەن، لەبەر ئەوە ساڵانێکی زۆر تۆقێدراون و ژێرچەپۆکە بوون. بڕوا بکە کوولیا کراسووتکین، ئەو جۆرە حەنەکچییەتییە جاریوایە لەڕادەبەدەر دڵهەژێن و تاڵە. ئەو سەروانە هەژارە ئێستا ژیانی بە ئیلۆشاوە بەندە، بێتوو ئیلۆشا بمرێ، یان لە حەیبەتا شێتدەبێ، یان خۆی دەکوژێ. کاتێک چاوی لێدەکەم، تەواو لەوە دڵنیام.

کوولیا هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «کارامازۆف، دەزانم دەڵێی چی. وادیارە لە زاتی مرۆڤ دەگەی.»

- هەرکە چاوم پێت کەوت بەو سەگەوە هاتووی، پێموابوو ژووچکایە هێناوتەتەوە.

«تۆزێ ڕاوەستە، کارامازۆف، ڕەنگە بتوانین بیدۆزینەوە؛ بەڵام ئەمە پێرزفۆنە. ئێستا دەیبەین بۆلای ڕەنگە لەو تووتکە زیاتر ببێتە هۆی دڵخۆشیی. سەبرکە کارامازۆف تاوێکی دیکە تێدەگەی دەڵێم چی!» کوولیا لە ناکاو گوتی: «هە هە منیش کەس نازانێ چدەکەم، تۆم لێرە ڕاگرتووە! بەم سەرما و سەغڵەتە باڵتەشت لەبەردا نییە. دیوتە چەندە مرۆڤێکی خۆپەرستم. ئاخ، هەموومان هەر واین کارامازۆف!»

- خەمت نەبێ، هەواکەی سارده، بەڵام من بۆ سەرما ئازام. ئێستا واچەکە بچینە ژوورێ. ئەرێ هەر بە ڕاست ناوت چییە؟ دەزانم بە کوولیا بانگت دەکەن، بەڵام جگە لەوە؟

«نیکۆلای ـ نیکۆلای ئیوانۆویچ کراسووتکین، یان ئەو جۆرەی لە دایەرەی ناسنامە دەڵێن، «کوڕی کراسووتکین.» کوولیا لەبەر هۆیەک پێکەنی، بەڵام گوتیشی: «هەڵبەت زۆرم نیکۆلای پێناخۆشە.»

ـ جابۆ؟

ـ هەروا، لەخۆڕا.

ئالیووشا پرسیی: «تەمەنت سێزدە ساڵە؟»

ـ نا، چاردە ـ یانی بەمزووانە، هەتا دوو حەوتووی دیکە، دەبمە چاردە ساڵان. کارامازۆف، لەلای تۆ دانی پیادەنێم، تەنیا لای تۆ، من زەعفێکم هەیە، چونکە سەرەتای ئاشنایەتیمانە پێمخوشە تێبگەی چ خووخدەیەکم هەیە. پێمخۆش نییە هیچکەس لە تەمەنم بپرسێ، جگە لەوەش... لە ڕاستیدا... سەبارەت بە من چیرۆکێکی ساختە بۆتە بنێشتە خۆشەکەی سەرزاران. یانی دەڵێن حەوتووی ڕابردوو لەگەڵ کوڕەکانی پۆلی ئامادەیی یاریی دزدزێنەم ساز کردووە. یانی یاریم لەگەڵ کردوون، دەڵێن لەبەر ڕابواردنی خۆم یاریم لەگەڵ کردوون، کە وانییە و بۆیان ساز کردووم. ڕەنگە ئەو باسە بە گوێی تۆش گەیشتبێتەوە؛ بەڵام لەبەر ڕابواردڕنی خۆم یاریم نەکرد. لەبەر خاتری کوڕەکان بوو، چونکە نەیان دەزانی چبکەن. بەڵام هەمیشە نەقڵێکی گەوجانەیان لە سەر دەمە. ئەوەش بزانە ئەمشارە شاری دەنگۆ و قسە و قسەلۆکانە.

ـ دەی با بۆ ڕابواردنی خۆشت یاریت کردبێ، قەیچدەکا!

ـ لە کۆڵبەوە تۆش. لەبەر ڕابواردنی خۆم! بۆ تۆ ئەسپێن دەکەی؟

ئالیووشا زەردەیەکی گرت و گوتی: «بەڵام دەبێ ئاوا چاو لە مەسەلەکە بکەی، گەورەکان دەچن بۆ شانۆ و سینەما و لەوێ هەموو چەشنە پاڵەوانبازییەک دەبینن ـ جاریوایە دزی تێدایە، شەڕ و کوشتوبڕی تێدایە ـ دەی ئەو یارییەی ئێوەش شتێکی وایە، بەڵام بەشێوەیەکی دیکە؟ دزدزێن و سەرباز سەربازێن و ئەو چەشنە یارییانەش بۆ مێرمنداڵان ئاساییە و پێموایە قۆناغی سەرەتایی هونەرە. ئەوەش بزانە ئەو یارییانە غەریزەیەکی هونەرین

بۆ ئەو مێرمندالانەی کاتی گەشە کردنیانە، جاریوایە ئەو یارییانە زۆر لە شانۆی گەورەکان چاکترن، تەنیا جیاوازیش لەوەدایە خەڵک دەچن بۆ شانۆ و چاو لە کەسانێک دەکەن کە ڕۆڵی کەسانێکی دیکە دەگێڕن، لەم یارییانەشدا مێرمندالان خۆیان ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن و یاریدەکەن، زۆر باش و سروشتیشە.»

کوولیا بە وردی چاوی تێبڕی: «تۆ وا بیر دەکەیەوە؟ لە سەر ئەوباوەڕەی؟ دەزانی زۆر بیر و ڕایەکی باشە. بڕۆمەوە بۆ ماڵێ، بە وردی بیری لێدەکەمەوە. با دان بەوەشدا بنێم، دەمزانی شتێک لە تۆوە فێر دەبم.»
کوولیا بە دەنگێکی بەسۆزانەوە لە کۆتایی وتەکانیدا گوتی: «کارامازۆف، هاتووم شتت لێوە فێربم.»

ئالیووشا بە بزەیەکەوە دەستی کوولیای گوشی و گوتی: «منیش لە تۆوە.»

کوولیا ئەو هەڵسوکەوتەی ئالیووشای زۆر بەدڵ بوو. ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر سەرنجی ڕاکێشا ئەوە بوو کە ئالیووشای وەک هاوشانێکی خۆی چاوی لێدەکرد و وای قسە لەگەڵ دەکرد کە دەتگوت «پیاوێکی تەواوەوە.»

ـ واچاکە جارێ بچینە ژوورێ و چاومان بە بنەماڵەی ئیسینگیریف بکەوێ، دەرگای دەستی چەپە. هەموو کوڕەکان لەوێ باڵتەکەیان دادەکەنن، چونکە ژوورەکە چکۆلە و گەرمە.

ـ ئاخ، تەنیا بۆ دەقیقەیەک دێمە ژوورێ. باڵتەکەشم داناکەنم. پێرزفۆن هەلێرە لەوبەر هەیوانە وەردەکەوێ. پێرزفۆن، ici، وەرکەوە، لەجێی خۆت جووڵە نەکەی! دیوتە چۆن خۆی دەتۆپێنێ؟ جارێ دەچمە ژوورێ و بوارەکە تاقیدەکەمەوە، پاشان لە کاتی خۆیدا، فیتوویەکی بۆ لێدەدەم و جا دەبینی وەک هار خۆ دەکا بە ژووریدا. بەڵام ئیسمۆرۆف نابێ لەبیری بچێ کە لەو ساتەدا دەرگاکە بکاتەوە. خۆم دەزانم چبکەم و تۆش بەجارێ تووشی سەرسوڕمان دەبی.

# (٥)

# لەپاڵ جێوبانی ئیلۆشادا

ژووری دانیشتنی بنەماڵەی سەروان ئیسینگیریفی تەقاویت، بۆ خوێنەران ئاشنایە. لەو کاتەدا دەرگاکە پێوەدرابوو و چەند کەس بۆ ملاقات لە دەوری ئیلۆشا کۆ بووبوونەوە. ئەگەرچی ئالیووشا هێنابوونی بۆ ئەوەی لەگەڵ ئیلۆشا ئاشتیان کاتەوە، بەڵام هیچکام ئامادە نەبوون بچنە ژێربار. ئالیووشا دەیویست بە هەر شێوەیەکە ئاشتیان کاتەوە و دانە دانە و بێ «خۆبادان و ناز و نووز» بیانبات بۆلای ئیلۆشا و وایدەنواند کە بە هەڵکەوت بووە و هیچ پیلانێک لە گۆڕێدا نەبووە. ئەو کارەش بۆ ئیلۆشای دەردەدار زۆر خۆشبوو و پێیدەگەشایەوە. بە دیتنی هاوپۆلەکانی و دەربڕینی سۆز و هاودڵی لەلایەن ئەوانەوە کە پێشتر دوژمنی بوون و دەیان بوغزاند، زۆر خۆشحاڵ دەبوو. تەنیا جێی کراسووتکین خاڵی بوو، نەهاتنی ئەو لە سەر دڵی بووبووە گرێ. ڕەنگە لە هەموو شتێک تاڵتریش بیرکردنەوە لەو چەقۆیە بێ کە لە کوولیا کراسووتکینی ـ تاقە هاوڕێ و پشتیوانی ـ دابوو. ئیسمۆرۆفە چکۆلی وریا، کە لە پێش هەموویاندا لەگەڵی ئاشت بووبووە، وای بیردەکردەوە. بەڵام کاتێک ئیسمۆرۆف بە کراسووتکینی گوت کە ئالیووشا دەیهەوێ ببینێ و سەبارەت بە مەسەلەیەک قسەی لەگەڵ بکا، کراسووتکین قسەکەی بە ئیسمۆرۆف بڕی و فەرمانیپێدا بە کارامازۆف بڵێ کە خۆی سەلاحی کاری خۆی دەزانێ و نایهەوێ هیچکەس ئامۆژگاریی بکا، ئەگەر بچێ بۆ دیدەنیی ئیلۆشاش، خۆی کاتەکەی دیاری دەکا، چونکە «هۆیەکی تایبەتی» هەیە.

ئەم مەسەلەیە دووحەوتوو بەر لەم یەکشەممەیە بوو. هەر لەبەر ئەوەش بوو ئالیووشا، بەپێچەوانەی ویستی خۆی نەچووبوو بۆ دیدەنیی. بەڵام وادیار

بوو چاوەڕوانە، دیسان دووجاری ئیسمۆرۆف نارد بەدوایدا. هەر دووجارەکەش کراسووتکین بە تووڕەیی و لاساری و بە لەبزێکی زۆر بێئەدەبانە وەڵامی ڕەتی بۆ ناردەوە و گوتی بە ئالیووشا بڵێن ئیتر دەستم لە کۆڵ بکاتەوە، ئیتر ئەوەندەم لێ هەڵنەپێچێ. ئەگەر بێشم بۆ ئەوێ، بە هیچ شێوەیەک ناچم بۆلای ئیلۆشا. هەتا دوایین ڕۆژ ئیسمۆرۆف نەیدەزانی کراسووتکین بڕیاری داوە ئەو ڕۆژە سەر لەبەیانی بچێ بۆلای ئیلۆشا. عەسری ڕۆژی پێشوو کە لە ئیسمۆرۆف هەڵبڕا، پێیگوت بەیانیی ڕۆژی داهاتوو لە ماڵێ چاوەڕوانی بێ، چونکە دەیهەوێ لەگەڵی بچێ بۆماڵی ئیلۆشا. بەڵام وریایی پێدا کە لەوبارەوە زمانی نەگەڕێ و کەس لێی‌نەبیستێ، چونکە دەیهەوێ بەشێوەیەکی کتوپڕ بچێ و وابزانن بە هەڵکەوت چووە. ئەویش لە گوێی گرت. ئیسمۆرۆف بۆیە پێیوابوو کوولیا سەگە ونبووەکەی بۆ دەبینێتەوە، چونکە کوولیا لە دەمی دەرپەڕیبوو: «ئەگەر ئەو سەگە زیندوو بێ، دیارە زۆر کەرن بۆیە بۆیان نادۆزرێتەوە.» کاتێک ئیسمۆرۆف، کە لە هەل دەگەڕا قسە بکا، بە ترس و لەرزەوە ئاماژەی بە سەگەکە کرد. کراسووتکین ڕقی هەستا. «من خۆم سەگم هەیە، ئیتر خۆ کەر نیم کۆڵان بە کۆڵانی شار بسووڕێمەوە بەدوای سەگی خەڵکیدا! ئەوەش هیچ، سەگێک دەرزیی قووت دابێ کەریەتییە پێتوابێ ماوە! ئەوەش زۆر کارێکی قوڕ و منداڵانەیە.»

لە دوو حەوتووی ڕابردوودا، ئیلۆشا لە جێوبانە چکۆلەکەی ژێر پەیکەرەکان نەهاتبووە دەرێ. لەو ڕۆژەشەوە کە تووشی ئالیووشا بووبوو و گازی لە قامکی گرتبوو، نەچووبۆوە بۆ قوتابخانە. هەر ئەو ڕۆژە نەخۆش کەتبوو. دوای ئەوەش ماوەی مانگێک توانیی هەستێ و لە نێو ژوور و پێشخانەکەدا پیاسە بکا. بەڵام لەم دواییانەدا هێندە پێچووبوو، لووتت بگرتایە گیانی دەردەچوو، بە بێ یارمەتیی باوکی نەیدەتوانی لەجێی خۆی هەستێ. باوکی زۆری خەم بوو. تەنانەت دەستی لە ئارەقخواردنەوە هەڵگرت و لەتاوی کوڕەکەی لەوانەبوو شێت بێ. زۆرجار، بەتایبەت دوای گێڕانی بەنێو ژوورەکەدا و بردنەوەی بۆ سەر جێوبانەکەی، هەڵدەهات بۆ سۆوچێکی تاریک

و سەری بە دیوارەکەوە دەنا و هۆن هۆن دەگریا، قوڵپی گریانەکەی لەناخی خۆیدا دەشاردەوە و نەیدەهێشت دەنگی گریانەکەی بە گوێی ئیلۆشچکا بگا. کە دەگەڕایەوە بۆ وەتاغەکە، کارێکی دەکرد کوڕە تاقانەکەی دڵخۆش و سەرگەرم بێ. چیرۆکی بۆ دەگێڕایەوە، حەقایەتی پێکەنینی بۆ دەگوت، یان لاسایی کەسانێکی قەشمەر و پێکەنینیی دەکردەوە، کە دیتبوونی، تەنانەت دەنگ و لوورەی ئاژەلی دەردێنا. بەڵام ئیلۆشا تاقەتی نەبوو چاو لەو ڕشقنجاڕی و ئەداو ئەتوارەی باوکی بکا. ئەگەرچی کوڕە وەڕووی باوکی نەدەهێنا کە ئەو کارانەی پێخۆش نییە. بە دڵێکی خەمبارەوە دەیدی باوکی بۆتە حەنەکچییەکی قێزەون و بیرەوەریی تاڵی «گسکە کوڵە» و ئەو «ڕۆژە نەگبەتە» بەرۆکی بەرنەدەدا.

نینا، خوشکە دلۆڤان و گردەنیشنەکەی ئیلۆشاش ئەو بەزم و حەنەکچییەی باوکی پێناخۆش بوو. (باربارانیکالایفنا ماوەیەک بوو بۆ خوێندن چووبوو بۆ زانکۆی پترزبۆرگ.) بەڵام دایکە دلووکارەکەی کاتێک مێردەکەی ئەو ئەدا و ئەتوارەی دەنواند و شانۆی پێکەنینیشی وەڕێ دەخست، زۆری پێخۆش بوو و لە دڵەوە پێدەکەنی. تەنیا ڕێگایەک کە دەکرا ئەو ژنە شێتۆکەیەی پێ وەپێکەنین بخات؛ دەنا بەردەوام خەریکی پرتە و بۆڵە بوو و هەموو ئەندامانی ماڵێ لە بیریان بردبۆوە و ڕێزیان بۆ دانەدەنا و بە چاوی سووک تەماشایان دەکرد. بەڵام لەم چەند ڕۆژەی دواییدا بە تەواوی گۆڕانی بەسەردا هاتبوو. چاوی لە سەر جێوبانەکەی ئیلۆشا هەڵنەدەگرت، دەتگوت خەریکی بیرکردنەوەیە. بێدەنگ و هێدیتر بووبۆوە و ئەگەر دەشگریا بە ئارامی و لەبەرخۆیەوە دەگریا بۆ ئەوەی کەس گوێی لە دەنگی نەبێ. سەروان بە سەرسووڕمانێکی خەفەتبارانەوە لەوگۆڕانەی ژنەکەی گەیشتبوو. سەرەتا هاتنی ئەو کوڕانەی پێخۆشنەبوو، بەڵام هەرا و بەزم و چیرۆکە پڕ شادییەکانیان بووە هۆی شادی و سەرگەرمیی، ئاخری وای خوو پێگرتن ئەگەر ڕۆژێک نەهاتایەن، خەم دایدەگرت و هەستی بە دڵتەنگی دەکرد. کاتێک کوڕەکان قسەیەکیان دەگێڕایەوە یان کایەیەکیان دەکرد، دایکی ئیلۆشا قاقا پێدەکەنی و دەستی بە یەکدا دەدا.

هێندێ لە کوڕەکانی بانگدەکرد بۆلای خۆی و ماچیدەکردن. بەتایبەت هۆگرییەکی زۆری بە ئیسمۆرۆف هەبوو. بێمە سەرباسی سەروان. شادییەکی لە ڕادەبەدەر دڵی دادەگرت کە ئەو هاوڕێیانەی کوڕەکەی دەهاتنە ژوورەکە و بۆ شادکردنی ئیلۆشا گاڵوبوغوریان ساز دەکرد. تەنانەت هیواداربوو ئیلۆشا بە سەر خەمباری و نەخۆشییەکەیدا زاڵبێ و هاتنی ئەو کوڕانە ببێتە هۆی زوو چاکبوونەوەی. ئەگەرچی زۆر لە نەخۆشیی کوڕەکەی دەترسا، لەم دواییانەدا تەواو هیواداربوو کە چاک دەبێتەوە. زۆر بەڕێزەوە پێشوازیی لە میوانە چکۆلەکانی ئیلۆشا دەکرد. دەستە و نەزەر لە خزمەتیاندا ڕادەوەستا و ئامادە بوو ببێتە ئەسپیان، سواری کۆڵی بن و بەنێو ژوورەکەدا بیانگێڕێ. بەڵام ئیلۆشا ئەم کایەیەی پێخۆشنەبوو و لەو یارییەدا بەشداریی نەدەکرد. دەستیکرد بە کڕینی شتی چکۆڵە بۆیان، نانەناسکە و فندق و چایی و بابۆڵە و شیرینیشی بۆ دروستدەکردن. ئەوەشتان پێبڵێم لەو ماوەیەدا پارەیەکی زۆری بە دەستەوە بوو. دووسەد ڕۆبڵەکەی کاترینا ئیوانا، هەروەک ئالیووشا پێشبینی کردبوو، وەریگرت. دوای ئەوە کاترینا ئیوانا کە لە نەخۆشیی کوڕەکەیان و دەستەنگی و لێقەوماوییان ئاگادار بوو، خۆی چوو بۆماڵیان و لەگەڵ بنەماڵەکەیان ئاشنا بوو. توانیی دڵی ئەو ژنە دەلووکارەی دایکی ئیلۆشا شەیدای خۆی بکات. لەو کاتەوە ئیتر دەستودڵبازانە یارمەتیی دەدان و لە هیچ شتێک درێغیی نەدەکرد. سەروانیش لە خەمی نەخۆشی و مردنی کوڕەکەی، غروور و قۆڕەدەماخیی لەبیر چووبۆوە و بە خاکەڕاییەوە یارمەتییەکەی کاترینا ئیوانای قەبووڵکرد.

لە تەواوی ئەو ماوەیەدا، دوکتۆر هێرتێزنستیۆب، کە کاترینا ئیوانا ڕای سپاربوو، ڕۆژ نا ڕۆژێک دەهات و سەردانی ئیلۆشای دەکرد و دەوا و دەرمانی بۆ دەنووسی، بەڵام هیچ ئاکامێکی باشی نەبوو. ئەو ڕۆژە بەیانی سەروان چاوەڕوانی پزیشکێکی دیکە بوو لە مۆسکۆوە بێت، کە لەوێ ناوبانگی دەرکردبوو. کاترینا ئیوانا خەرجێکی زۆری کێشابوو و ئەو دوکتۆرەی لە مۆسکۆوە بانگهێشت کردبوو بۆ شارەکەمان، تەنیا لەبەر ئیلۆشاش بانگی نەکردبوو، بەڵکو بە مەبەستێکی تر کە دواتر لە جێی خۆیدا باسی دەکەین.

بەڵام ئێستا کە هاتبوو، کاترینا ئیوانا داوای لێکردبوو چاوی بە ئیلۆشاش بکەوێ. بە سەروانیشی ڕاگەیاندبوو چاوەڕوانی بێ، ڕۆحیشی لە هاتنی کوولیا کراسووتکین ئاگادار نەبوو، ئەگەرچی ماوەیەکی زۆر بوو بە ئاواتەوە بوو ئەو کوڕە بێ کە ئیلۆشا ئەوەندەی پێوە دڕاوێنێ.

لەوکاتەدا کە کراسووتکین درگاکەی کردەوە و هاتە ژووری سەروان و کوڕەکان هەموو لە دەوری ئیلۆشا کۆزیلکەیان بەستبوو و چاویان لە تووتکە سەگێکی چاونەپشکووتوو دەکرد کە هەردوێنێ دێڵەسەگێکی بەڕەڵڵا ترەکیبوو، سەروان بۆ دڵخۆشیدانەوەی کوڕەکەی هێنابووی. چونکە ئیلۆشچکا هەروا خەمی ژووچکای ون بوو یان تۆپیوی لە دڵدا بوو و حەوتوویەک بوو لە پەستا باسیدەکرد و لە دڵی دەرنەدەچوو. ئیلۆشا سێ ڕۆژ لەمەوبەر کە بیستبووی بڕیارە تووتکێکی بۆ بێنن، ئەویش نەک تووتکە سەگێکی ئاسایی، بەڵکو تووتکێکی گوێ پان (ئەوەش هەڵبەت مەسەلەیەکی زۆر گرینگ بوو،) چونکە کوڕێکی دڵناسکی بوو هەولێدا خۆی شاد نیشاندا. بەڵام باوکی و کوڕەکان زانییان یادی ئەو سەگە چارەڕەشە لە زەینیدا زیندوو دەکاتەوە کە دەرزی خواردی کردبوو. تووتکە وردیلەکە بە حاڵ دەیتوانی بجووڵێتەوە، لە پەنایدا ڕایان کێشابوو ئەویش بە بزەیەکی خەمبارانە و ساردەوە، دەستە وردیلە و زەردەڵەکەی بە پشتیدا دێنا. دیار بوو ئەو تووتکە وردیلەیەی خۆش دەوێ. بەڵام بە قەد ژووچکا نا؛ ئەگەر ژووچکا و ئەو تووتکەی پێکەوە هەبوایە. تەواو کەیفی ساز دەبوو.

یەکێ لە کوڕەکان هاواریکرد: «کراسووتکین!» ئەو بەر لە هەموویان چاوی لە هاتنە ژوورەوەی بوو. هاتنی کراسووتکین هەموویانی تووشی واقوڕمان کرد. کوڕەکان کشانە دواوە و لە دوو بەری چرپاکە ڕاوەستان تاکو بە جوانی ئیلۆشچکا ببینێ. سەروان بۆ بەخێرهێنانی کوولیا بە تامەزرۆیی هەڵاتە پێشێ و بە پەلە گوتی:

ـ تکایە فەرموون... بەخێربێن! ئیلۆشا ئاغای کراسووتکین هاتووە بۆ دیدەنیت!

بەڵام کراسووتکین بە پەلە دەستومشتاخی لەگەڵ کرد و لووتبەرزانە وەک کەسێکی خانەدان و ئەشرافی خۆی نواند. سەرەتا ڕووی کردە ژنی سەروان کە لە سەر کورسیلە تایەدارەکەی دانیشتبوو و لەو کاتەدا مڕومۆچ و تووڕە دیار بوو، چونکە ڕقی لەو کوڕانە هەستابوو کە دەوری قەرەوێڵەکەی ئیلۆشایان دابوو و نەیان دەهێشت ئەو تووتکە وردیلەیە بە جوانی ببینێ، بۆیە لەبەر خۆیەوە پرتە و بۆڵەی بوو. کراسووتکین بەوپەڕی ڕێزەوە کڕنۆشی بۆبرد. ئەو کردەوە بە ئەدەبانەیە شوێنێکی سەیری لە سەر ئەو ژنە دلووکارە دانا و دڵخۆشی کرد. لە کاتێکدا دەستی هەڵدێنا، بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ منداڵی ژێر بەوە دەڵێن. بەڵام میوان یەک لە سەر یەک دێنە ژوورێ.

سەروان بە ڕووخۆشی و بڕێک دڵتەنگییەوە کە دیاربوو خەمی ئەویشیەتی لە ژێر لێوەوە گوتی: «خاتوون مەبەستت لە "یەک لە سەر یەک چییە"؟»

ـ مەبەستم ئەوەیە بە سواری دێن. لە پێشخانەکە دەچنە کۆڵی یەکتر و هەر بەو شێوەیە دێنە نێو ژووری بنەماڵەیەکی بەرێزەوە. چ میوانگەلێکی سەیرن!

ـ کوا؟ کێ بەو شێوەیە هاتۆتە ژوورێ، خاتوون؟

ـ بۆ نەتان دی؟ ئەو کوڕە سواری کۆڵی ئەو کوڕەی دیکەیان بووبوو هاتە ژوورێ، ئەوی دیکەشیان لە کۆڵی ئەمیاندا بوو.

کوولیا لە پەنا تەخت و جێوبانەکەی ئیلۆشادا ڕاوەستابوو. کوڕەی نەخۆش و ڕەنگپەڕیو ئەوەندەی دیکە ڕەنگی هەڵبزڕکا. هێزی دا سەر هەنیشکی و خۆی هەڵێنا و بە وردی چاوی لە کوولیا بڕی. کوولیا دوو مانگ بوو ئەم هاوڕێ وردیلەی خۆی نەدیتبوو، بە دیتنی قەڵافەتە لەڕ و لاوازەکەی دڵی داخورپا. قەت چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد ئاوا زەردەڵ و نەخۆش و پەککەوتە بێ، لەبەر کزی چاوی زەق و زەرد هەڵگەڕابوو و قامکی دەستی هەر پێست و یەسقانەکەی بوو. لێوی وشک بووبوو، هەناسەسوار و بێهێز. کوولیا چووە پێشترەوە، بە تاڵووکە دەستی بردە پێشێ و گوتی: «دەی هاوڕێ... چۆنی؟» بەڵام دەنگی لە گەروویدا لەرزی و خۆی پێ ڕانەگیرا. لە ناکاو سوور هەڵگەڕا و لێوی کەوتە لەرزین و دڵی پڕبوو. ئیلۆشا بزەیەکی نەرم و نەخۆشانە نیشتە

سەرلێوی و هەروا ماق ماو قسەی بۆ نەهات. شتێک بووە هۆی ئەوەی کوولیا دەستی هەڵێنێ و بەسەری ئیلۆشایدا بێنێ.

بۆ دڵخۆشکردنی ئیلۆشا زۆر سارد و سڕانە گوتی: «هەی زۆرزان، ئەو تووتکە جوانەشت وەگیر خستووە؟»

ئیلۆشا بە هەناسەسواری و سیخە سیخ، وەڵامی داویەوە: «بە ـ لێ.»

کوولیا بە لەبزێکی وشک و جیددی گوتی: «لمبۆزی ڕەشە، ئەوەش یانی سەگێکی ماڵییە و زۆر جسنە، گەورەش بێ دەبێتە سەگێکی باش،» دەتگوت ئەوەی بە لایەوە گرینگە ئەو تووتکە و لمبۆزە ڕەشەکەیەتی. بەڵام لە ڕاستیدا هێشتا ناچار بوو دان بە خۆیدا بگرێ بۆ ئەوەی وەک «منداڵ» دەستنەکا بە گریان. بەڵام هەرچەندی هەوڵی دەدا خۆی پێ ڕانەدەگیرا و زوو زوو دڵی پڕ دەبوو. «گەورە بێ، دڵنیام دەبێتە سەگێکی باش.»

یەکێ لە منداڵەکان گوتی: «دەبێتە سەگێکی قەپەگۆڵ!»

هەرکام لە منداڵەکان شتێکی گوت: «بەڵێ دەبێ،» «سەگێکی گوێ پان،» «گەورە،» «ئا ئەوەندە،» «بە قەد گوێلکێک.»

سەروان دەنگی نایە پاڵ دەنگیان: «بە قەد گوێرەکە، بە قەد گوێرەکەیەکی گەورە. زۆر گەڕام، ئەم تووتکە لە وەحشیترین جسناتی سەگە. دایک و باوکی هەردووکیان زۆر زاڵ و وەحشی بوون، دایکی بە قەد ورچێک دەبوو... لێرە لە سەر چرپاکەی ئیلۆشا دانیشە، یان وەرە سەر ئەم کورسییە. بەخێربێی. زۆر لەمێژە چاوەڕێین، خودا خودامان بوو زوو بێی... گەورەییی خۆت بەجێهێنا. لەگەڵ ئالکسی فیۆدۆرۆویچ هاتی؟»

کراسووتکین لە سەر لێواری چرپاکە و لای لاقی ئیلۆشاوە دانیشت. لەوە دەچوو لە ڕێگا زۆری لێکدابێتەوە، چۆن قسە بکا و بڵێ چی، بەڵام ئێستا نەیدەزانی چۆن سەری قسە بکاتەوە.

«نا... لەگەڵ پێرزفۆن هاتم. ئێستا سەگێکم هەیە ناوی پێرزفۆنە[1]. ناوێکی ئیسلاوییە. لە دەرەوە وەرکەوتووە. فیتوویەکی بۆ لێدەم خۆ بە ژووریدا دەکا.»

---

1- پێرزفۆن یانی «زەنگلێدانی کەڵەزەنگی کلێسەکان.»

لە پڕ چاوی لە ئیلۆشا بڕی و گوتی: «سەگێکی چاکم هێناوە.» هەروەها ئەو پرسیارەشی تێهەڵکرد: «هاوڕێ ژووچکات لەبیرە؟»

ئیلۆشا لێوە بارگرتووەکانی لەرزین و چاوە خەمتێزاوەکانی لە کوولیا بڕی. ئالیووشا، کە لای دەرگاکەوە ڕاوەستابوو، نێوچاوانی تێکنا و بە ئاماژە کوولیای حاڵیکرد باسی ژووچکا نەکا، بەڵام کوولیا چاوی لە ئالیووشا نەبوو، ئەگەر چاویشی لێبوایە گوێی نەدەدایە.

ئیلۆشا بە دەنگێکی لەرزۆک کە لەگەڵ سیخەی سینگی ئاوێتە بووبوو پرسیی: «ژووچکا... ژووچکا لە کوێیە؟»

- ڕۆڵەگیان ژووچکات بۆچیە، ئەو تازە ون بووە و لە نێو چووە!

ئیلۆشا هیچی نەگوت، بەڵام دیسان چاوی لە کوولیا بڕی. ئالیووشا، هەرچۆنێک بوو نیگای کوولیای وەگیر خست و دیسان ئاماژەی بۆکرد، بەڵام کوولیا ڕووی وەرگێڕا و خۆی لە گێلیدا.

کوولیا، دەتگوت تا ڕادەیەک کەوتۆتە تەنگژەوە، بە تاڵووکە دەدوا، لە ناکاو زۆر بێبەزەییانە گوتی: «حەتمەن هەڵاتووە و لە جێیەک تۆپیوە.» دوای قووتدانی ئەو نان و دەرزییە حەتمەن تۆپیوە. بەڵام من سەگێکم هەیە، پێرزفۆن... ناوەکەی ئیسلاوییە... هێناومە نیشانتی دەم.»

ئیلۆشا کتوپڕ گوتی: «نامەوێ ببینم!»

«نا، نا، حەتمەن دەبێ ببینی... سەرگەرمت دەکا. هەر لەبەر ئەوەش هێناومە... وەک ژووچکا تووکەکەی زبرە.» لە ناکاو تووشی جۆرێک شڵەژان بوو لە قسەکانیدا کە لەوتن نایە، بە ژنەکەی سەروان ئیسنگیریفی گوت «مادام، ئیزن دەفەرمووی سەگەکەم بانگبکەمە ژووری؟»

ئیلۆشا بە دەنگێکی خەماوی و دڵتەزێن گوتی: «نامەوێ چاوم پێیبکەوێ، نا، نامەوێ...!» چاوی بریقەی هات و فرمێسکی تێزا.

سەروان لە سەر ئەو سندووقەی پاڵ دیوارەکە، کە تازە لەسەری دانیشتبوو هەستا و گوتی: «ڕەنگە قوربان، واچاکە، قوربان... جارێکیتر.» بەڵام کوولیا دەستبەردار نەبوو. بە توندی گوڕاندی بە سەر ئیسمۆرۆفدا: «دەرگاکە

بکەوە.» هەر لەگەڵ دەرگاکە کرایەوە، فیتوویەکی لێدا و پێرزفۆن بە پڕتاو خۆی بە ژووریدا کرد.

کوولیا لە سەر جێی خۆی هەستا و گوڕاندی: «هەستە سەر پاشوو پێرزفۆن، دەست بە سینگتەوە بگرە! دەست بە سینگتەوە بگرە!» پێرزفۆن لە پەنا چرپاکەی ئیلۆشادا لە سەر پاشوو ڕاوەستا و هەردوو دەستی لە پێشەوە بەبەر سینگیدا شۆڕ کردەوە. ئەوەی لە ڕادەبەدەر تووشی سەرسووڕمانی کردن ئەوە بوو: ئیلۆشا واقوڕمانە خۆی کێشا بۆ پێشەوە و لەگەڵ ئەوەی دڵە لەرزە و داخورپان ئەوەندەی دیکە هێزی لێبڕیبوو، لە سەر تەختەکەوە سەری دانەواند و چاوی لە پێرزفۆن بڕی، پاشان بە دەنگێکی لەرزۆک و شادییەکی ئاوێتەی ئازارەوە گوتی: «خۆ ئەوە... ژووچکایە!»

کراسووتکین بە دەنگێکی تیژ و شادەوە قیژاندی: «ئەی دەتویست ئەو نەبێ؟» هەر لەڕێوە دانەوی، سەگەکەی گرت و هەڵیهێنا و لەبەردەمی ئیلۆشا ڕایگرت.

«چاوی لێکە هاوڕێ، خۆ دیتووتە چاوێکی کوێرە و گوێچکەی چەپەشی بڕاوە؛ هەر ئەو نیشانانەی بۆت باسکردم. هەر بەو نیشانانەدا دۆزیمەوە. هەر لەڕێوە، دیمەوە.» لەگەڵ ئەوەی بە پەلە چاوی لە ئیلۆشا و سەروان و ژنەکەی و ئالیووشا و دیسان ئیلۆشا بڕی و گوتی: «هیچکەس ڕاینەگرتبوو! لە حەوشەی پشتەوەی ماڵی فیدۆتۆف دەژیا. لەوێ قوژبنێکی پەیدا کردبوو و تێیدا وەدەرکەوت. ئەو ماڵەش خۆراکیان نەدەدایە. ئەو سەگە بەستەزمانە لە برسانا بەڕەڵڵا و هەرەڵڵا دەخولایەوە... کاتێک دیمەوە. دیوتە هاوڕێ هیچی لێنەهاتووە. چونکە ئەوەی پێتدا قووتی نەدا. ئەگەر قووتی دایە حەتمەن دەتۆپی! حەتمەن لە زمانی هەڵچەقیوە و دەری داوەتەوە. تۆ نەتدیوە. بۆیەش قورووسکاندبووی و هەڵاتبوو، دەرزییەکە لە زمانی هەڵچەقیوە و تۆ پێت وابووە قووتیداوە.» کوولیا بە ڕوخسارێکی شاد و گەشاوەوە گوتی: «هەر دەبوو بقورووسکێنێ، چونکە پێستی ناودەمی سەگ زۆر ناسکە... لە هی مرۆڤ ناسکترە، زۆریش ناسکترا!»

ئیلۆشا زمانی لە گۆ چووبوو. ڕەنگی پەڕیبوو، چاوی زەق کردبۆوە و لە کوولیای دەڕوانی، دەمیشی بووبووە تەڵەی تەقیو. ئەگەر کراسووتکین ئەقڵی بەوە بشکایە کە ئەو کاتە هەستیارە چەندە شوێنێکی پڕ مەترسیی لە سەر ڕۆح و جەستەی ئەو منداڵە نەخۆشە دادەنێ، دونیا و عالەم سەری لێکدایە، فێڵێکی وای ساز نەدەکرد، پێموایە ئالیووشا تەنیا کەسێک بوو لەوە گەیشت. سەروانیش هەرباسی ناکرێ، وەک منداڵ لە خۆشیانا کەوتبووە قلەسەما و بە دەنگێکی پڕ لە شادی گوڕاندی: «ژووچکایە! ژووچکا! ئیلۆشا، ژووچکایە، ژووچکای خۆت! بابە، ژووچکایە!» دڵی پڕ بووبوو، هێندەی نەمابوو دەست بکا بە گریان.

ئیسمۆرۆف بە لەبزێکی داخاوییەوە گوتی: «وەڵڵا من هەر فکریشم بۆ ئەوە نەدەچوو! ئافەریم کراسووتکین، دەمگوت ئەو سەگەکە دەدۆزێتەوە، ئەوەتا دیویەتەوە!»

کوڕێکی دیکەیان گوتی: «کەس وەک کراسووتکینی پێناکری، بێوێنەیە!»

هەموویان وێکڕا گوتیان: «بە ڕاستی وایە، بێوێنەیە! بێوێنە.» پاشان چەپڵەیەکیان لێدا.

کراسووتکین هەوڵیدەدا لە هەموویان زیاتر دەنگ هەڵێنێ: «سەبرکەن، سەبرکەن، با پێتان بڵێم ڕووداوەکە چۆن بوو. گوێبگرن. دۆزیمەوە. بردمەوە بۆ ماڵێ و شاردمەوە. لە ماڵێ دەرگام لە سەر داخست و هەتا ئەمڕۆ پیشانی هیچکەسم نەدا. تەنیا ئیسمۆرۆف لە دووحەوتوو لەمەوبەرەوە ئاگادار بووبوو، بەڵام دڵنیامکرد کە ئەم سەگە پێرزفۆنە و ژووچکا نییە، بۆیە باوەڕیکرد. لەو ماوەیەدا هەموو چەشنە فێڵ و گاڵتەیەکم پێ فێرکرد. کاری وا دەکا سەرتان سوڕ دەمێنێ. وام حەمایەت کردووە بە دیتنی کەیف دەکەن. منیش دەبێ بڵێم: هاوڕێی خۆشەویست دیوتە ئێستا ژووچکا چەندە سەگی چاکە!» ئەگەر جنچکێک گۆشتم بۆ بێنن، فێڵێکی واتان بۆ دەنوێنێ لەبەر پێکەنین ناوسکتان دەپچڕێ. جنچکێکی چکۆڵەم بۆ بێنن، هەتانە؟»

سەروان بە پەلە ڕۆیی بۆلای خاوەنماڵەکەیان، خۆی کرد بە چێشتخانەکەیاندا. کوولیا کە نەیدەویست ئەو دەرفەتە بە نرخە لەدەست بدا، نەڕاندی بە سەر سەگەکەدا «خۆت بتۆپێنە!» سەگە لەڕێوە، خولێکی خوارد و لە سەر پشت کەوت و چوارپەلی لە حەوا کرد. کوڕەکان دەستیانکرد بە پێکەنین. ئیلۆشا هەر بەو بزە سارد و خەماوییەوە دەیڕوانی، بەڵام تەنیا کەسێک کە شانۆی سەگەکە خۆشحاڵی کرد، «یایە» بوو. قاقا پێدەکەنی و دەستیکرد بە چەقەنەلێدان و بانگکردنی سەگەکە «پێرزفۆن، پێرزفۆن!»

کوولیا کە زانیی کارەکەی سەرکەوتووانە بووە، لەخۆباییانە هاواریکرد: «دنیا و عالەم سەرلێکدا هەڵناستێ! تەواوی خەڵکی دنیا هەرای لێبکەن، جووڵە ناکا. بەڵام ئەگەر من بانگی بکەم لەڕێوە هەڵدەستێتە سەرپێ. پێرزفۆن İci!».

سەگە هەڵبەزییەوە و لەگەڵ ئەوەی شادانە دەوەڕی، دەستیکرد بە هەڵبەزدابەز. سەروان بە کوتێ گۆشتی برژاوەوە هاتەوە.

کوولیا گۆشتەکەی لێوەرگرت و بە لەبزێکی ڕشۆکییانە و دەمتەڕ پرسیی: «گەرمە! سەگ خواردەمەنیی گەرمی پێخۆش نییە. نا، باشە زۆر گەرم نییە. چاو لێکەن، چاو لێکە ئیلۆشچکا، چاو لێکە هاوڕێ؛ بۆ تەماشا ناکەی؟ ئێستا کە سەگەکەیم بۆ هێناوەتەوە چاوی لێناکا.»

فێڵی تازەش ئەوە بوو، سەگەکەی هاندەدا ڕاوەستێ و لمبۆزی هەڵێنێ، تاکو لەتکە گۆشتە ئیشتیا بزوێنەکە لە سەر لمبۆزی دانێ. سەگی بەستەزمان ناچاربوو بێجووڵە ڕاوەستێ، هەتا هەرکاتێک ئەربابەکەی فەرمانی پێدەدا، جا ئەگەر نیو سەعاتیش بوایە، جووڵەی نەدەکرد و گۆشتەکە هەروا لە سەر لمبۆزی بوو. بەڵام ئەمجارەیان پێرزفۆنی تەنیا ماوەیەکی کورت بەوچەشنە ڕاگرت و گوڕاندی: «پاداشەکەی وەرگرە!» هەر لەڕێوە و لە چاوترووکانێکدا گۆشتەکە لە سەر لمبۆزییەوە کەوتە نێودەمی. تەماشاچییانیش هەموو سەریان لەوکارەی پێرزفۆن سوڕمابوو.

ئالیووشا بەجۆرێک سەرکۆنەوە کە بێئیختیارانە لەدەمی هاتە دەرێ گوتی: یانی بۆیە تا ئێستا نەدەهاتی، دەتویست ئەو سەگە حەمایەت کەی؟»

کوولیا بەوپەڕی سادەییەوە وەڵامی دایەوە: «بەڵێ لەبەر ئەوە بوو! دەمویست تەواو حەمایەتی کەم و بەوپەڕی گەورەییەوە نیشانیدەم.»

ئیلۆشا کە قامکە باریکەکانی لێکدەساوی ئاماژەی بە سەگەکە کرد و لە ناکاو بانگیکرد: «پێرزفۆن! پێرزفۆن.»

«چییە! واچاکە بازداتە سەر چرپاکەی ئیلۆشا! پێرزفۆن، ici!» کوولیا دەستی لە چرپاکە دا و پێرزفۆن خۆی فڕێدا سەر چرپاکە. کوڕە سەری سەگەکەی لە باوەشی گرت و پێرزفۆنیش ڕوومەتی ئەوی لستەوە. ئیلۆشا زیاتر هاتە پێشێ و لە سەر زگ ڕاکشا و دەم و چاوی لە تووکە زبرەکەی پێرزفۆن دەخشاند.

سەروان لەپەستا دەیگوت: «خودایەگیان، خودایەگیان!» کوولیا دیسان لە سەر لێواری قەرەوێڵەکە دانیشتەوە.

- ئیلۆشا، فێڵێکی دیکەشت نیشاندەم. تۆپێکی چکۆڵەم بۆ هێناوی. لەبیرتە؟ پێشتر باسم بۆ کردبووی، تۆش گوتت زۆرت پێخۆشە بیبینی. دەی ئەوە ئێستا بۆم هێناوی.

پاشان کوولیا بە پەلە تۆپە برنجییەکەی لە جانتاکەی دەرهێنا. زۆر بە تاڵووکە بوو، چونکە خۆی شاد بوو. ئەگەر لەم بارودۆخەی ئێستادا نەبوایە، هێندەی سەبر دەکرد هەتا ئەو دڵەخورپە و هەیەجانەی کە بە هۆی پێرزفۆنەوە دڵی داگرتبوو، تێپەڕێ. بەڵام ئێستا بێئەوەی گوێ بەوشتانە بدا پەلەی دەکرد. هەستەکەی ئاوا بوو: «ئێستاکە هەمووتان شادن، ئەوەش شتێکی دیکە بۆ ئەوەی شادتربن!» بۆ خۆی هێندە شاد بوو پێی وەعەرز نەدەکەوت.

- زۆر لەمێژە بە ئاواتەوە بووم شتێکی ئاوات هەبێ. هانێ براکەم، بۆ خۆت، هی مۆرۆزۆف بوو، کەڵکی لێوەر نەدەگرت، ئەویش براکەی پێیدابوو. کتێبخانەکەی باوکم کتێبێکی سەدساڵ لەمەوبەری تێدابوو بەناوی «عێلی محەممەد»، ئەو کتێبە هی سەردەمی بەر لە سانسۆر بوو. لە مۆسکۆ چاپ کرابوو. مۆرۆزۆفیش دڵی ئەو کتێبەی گرتبوو، بۆیە لەگەڵم گۆڕییەوە. زۆریشم لێ مەمنوون بوو گۆڕینەوەم لەگەڵ کرد...

کوولیا تۆپەکەی بە دەستەوە گرت و نیشان هەمووانی دا بۆ ئەوەی پەسەندیبکەن. ئیلۆشا خۆی بەرز کردەوە و هەروا کە دەستی لە ملی سەگەکەدا بوو، وەک ئەوەی جادوو کرابێ چاوی لە سەر تۆپە لەیستۆکەکە گیرسایەوە. سەرسوڕمانەکەیان کاتێک بەوپەڕی خۆی گەیشت کە کوولیا گوتی باڕووتیشی پێیە و «ئەگەر خانمەکان نەترسن»، هەر ئێستا دەتوانێ بیتەقێنێ. «بابە» خێرا داوایکرد لە نزیکەوە لەیستۆکەکە ببینێ و کوولیا بردی و دایە دەستی. بە دیتنی ئەو تۆپە برنجییە تایەدارە زۆر خۆشحاڵ بوو و لە سەر کۆشی بۆ پاش و پێشەوەی ڕادەدا. هەر لەڕێوە ئیزنیدا بیتەقێنن، بێئەوەی بزانێ چ داوایەکی لێکراوە. کوولیا باڕووت و گوللەی دەرهێنا. سەروان، چونکە لە ئەرتەشدا بووە و خاوەن ئەزموون بوو، پڕکردنی تۆپەی گرتە ئەستۆ و بە ئەندازەی پێویست باڕووتی تێکرد. داوایکرد گوللەکە بۆ هەلێکی تر هەڵگرن. تۆپەکەی لە سەر عەرزی دانا و ڕووی لە شوێنێکی چۆڵی ماڵە کرد، تۆزێ باڕووتی کردە نێو خانەکەیەوە و شقاریەکی پێوەنا. تەقەیەکی گەورەی لێوەهات. بابە داچڵەکی، بەڵام هەر لەڕێوە لەخۆشیانا دەستیکرد بە پێکەنین. کوڕەکان هەموو بە سەرسووڕمانێکی زۆرەوە چاویان تێبڕی. بەڵام سەروان لەگەڵ ئەوەی چاوی لە ئیلووشا کرد، لە هەموویان زیاتر وەنەشە کەوتبوو. کوولیا تۆپەکەی هەڵگرت و بە باڕووت و گوللەکانییەوە پێشکەشی ئیلۆشای کرد. دیسان بە شادی و نەشەوە دووپاتیکردەوە.

ـ ئەوەم بۆ تۆ هێناوە، بۆ تۆ! لەمێژە بۆم هەڵگرتووی.

دایکی ئیلۆشا وەک منداڵێکی چکۆڵە دەستیکرد بە پاڕانەوە: «دا تۆخودا بیدە بە من! ئەو تۆپە بدە بە من!» ڕوخساری ترسێکی تێکەڵ بە بەزەییی پێوە دیاربوو، لەوە دەترسا تۆپەکەی نەدەنێ. کوولیا مات بوو. سەروان بە ناڕەحەتی خول هەڵبوو، هەڵات بۆلای و گوتی:

ـ خاتوون، خاتوون، تۆپەکە هەر هی تۆیە. بەڵام لێیگەڕێ با ئالیووشا هەڵیبگرێ. چونکە پێشکەشی ئەو کراوە. بەڵام وەک ئەوە وایە هی تۆ بێ. ئیلۆشا دیڵێ یاریی پێبکەی، بۆ هەردووکتان یاریی پێبکەن.

یایە بە دڵپڕی و ئیسەرەمەوە گوتی: «نا، نامەوێ هی هەردووکمان بێ، من پێمخۆشە هەر هی من بێ، ئیلۆشا بۆ چییەتی.»

ئیلۆشا هاواریکرد: «دایەگیان، هانێ بیگرە، بۆ خۆت، من نامەوێ!» ڕووی کردە کراسووتکین و بە ڕوخسارێکی فەقیرۆکە و جۆرێک سکاڵاوە، وەک ئەوەی بترسێ کە پێشکەشیەکەی ئەوی بە کەسێکی دیکە بەخشیوە، پرسیی: «کراسووتکین ئیزن دەفەرمووی بیدەم بە دایکم؟»

کراسووتکین بە گیان و دڵ قەبووڵیکرد: «ئەی بۆ ناتوانی.» پاشان تۆپەکەی لە دەستی ئیلۆشا وەرگرت و لەگەڵ کڕنۆشێکی بە ئەدەبانە دای بە دایکی ئیلۆشا. ژنەش هەروا کەوتبووە ژێر کاریگەری و کوڵی گریانی هەستابوو، بۆیە بە لەبزێکی دڵۆڤانانە گوتی: «ئیلۆشچکای خۆشەویستم تەنیا کەسێکە کە دایکی خۆی خۆشدەوێ!» دیسان دەستیکردەوە بە لیخوڕینی تۆپەکە لە سەر کۆشی بۆ پێشەوە و بۆ دواوە.

خاتوون، لێمگەڕێ با دەستت ماچکەم. سەروان وەک تێسکەی تفەنگ ڕۆیی بۆلای و دەستی ماچکرد.

خاتوونی هەقناس، ئاماژەی بە کراسووتکین کرد و گوتی: «لەوەتا لەو سەر دنیایە دەژیم مرۆڤێکی وەک ئەو کوڕە ژیر و وریام نەدیوە.»

ـ چەندەت دەوێ باڕووتت بۆ دێنم ئیلۆشا. ئێستا ئیتر خۆمان باڕووت دروستدەکەین. بۆرۆویکۆف شێوەی دروستکردنەکەی دیوەتەوە و فێری کردووم بیست و چوار بەش شوورە، دە بەش گۆگرد، شەش بەش خەڵووزی داری بی، هەموویان پێکەوە دەکوتنەوە و وردی دەکەن، پاشان ئاوی بەسەردا دەکەن و وەک هەویر هەلیدەگوڵۆفن. دوای ئەوە هەویرەشلەکە بە هێڵەگدا دەکەن ـ شێوەی دروستکردنەکەی ئاوایە.

ئیلۆشا وەڵامی دایەوە: «ئیسمۆرۆف باسی باڕووتەکەتی بۆ کردم، بەڵام باوکم دەڵێ باڕووتی ڕاستەقینە نییە.»

کوولیا سوورهەڵگەڕا: «ڕاستەقینە نییە؟ ئاگر دەگرێ. بەڵام ئێوە باشتر دەزانن.»

سەروان بە ڕەنگ و ڕوویەکی تاوانبارانەوە گوتی: «نا، قوربان، مەبەستم ئەوە نەبوو. هەر ئەوەندە گوتم بارووتی ڕاستەقینە وا دروستناکرێ، بەڵام گرینگ نییە، بەو شێوەیەش دەکرێ دروستیبکەی.»

«من نازانم، ئێوە باشتر دەزانن. ئێمە برێکمان لەو بارووتە کردە نێو گۆزەڵەیەکی جەنگییەوە، زۆر چاک ئاوری گرت، هەمووی سووتا و تەنیا ڕێزەیەک سووتووی لێمایەوە. ئەویش خەتای هەویرەکەی بوو، ئەگەر جوانمان لە هێڵەگ دایە... بەڵام ئێوە باشتر دەزانن، من نازانم...» کوولیا ڕووی کردە ئیلۆشا: «ئەرێ بیستت بوولکینی هاوڕێمان باوکی تێروپڕی لێداوە لە سەر ئەو بارووتە؟»

ئیلۆشا وەڵامی داویەوە: «ئەرێ.» بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە گوێی لە کوولیا کراسووتکین گرتبوو.

«یەک بتریی پڕمان دروستکردبوو، ئەویش لە ژێر قەرەوێڵەکەیدا شاردبوویەوە. باوکی دیتی و گوتی ئاخەر نالێی دەتەقێتەوە؟ دەستی دا قامچی و چیت خواردووە ترش و چەوەندەر! دەیویست بێتە قوتابخانە و لای مامۆستاکان شکایەت لە منیش بکا. ئێستا ئیتر ناهێڵن لەگەڵ من بگەڕێ، هیچکام لە کوڕەکان ئیزنیان نییە لەگەڵ من بگەڕێن. ئیسمۆرۆفیش ئیزنی پێنادەن، ناوم بە خراپە زڕاوە.» بزەیەکی سەرکۆنەکارانەی هاتێ: «دەڵێن من "لە گیانم بێزارم". هەمووشی لە دوای ڕووداوی سەر هێڵاسنەکەوە ئاوا لەبەر چاویان ڕەش بووم.»

سەروان بە دەنگێکی بەرز گوتی: «ئەرێ، ئێمەش نەقڵی ئەو کارە پڕ مەترسییەتمان بیستووە. ئاخر چۆن لە سەر ئەو هێڵاسنە ڕاکشای؟ کاتێک قەتارەکە بەسەرتدا تێپەڕی، نەترسای؟ تەنانەت ڕێزەیەکیش ترست لێنەنیشت؟»

دیار بوو سەروان دەیهەوێ کوولیا بلاوێنێتەوە.

کوولیا بە سارد و سڕی وەڵامی دایەوە: «زۆریش نا.» دیسان ڕوویکردە ئیلۆشا و گوتی: «ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر بەدناوی کردووم، ماجەرای

ئەو قازە نەگبەتییەیە.» بەڵام دەتگوت کوولیا جار لەگەڵ جار خۆی زیاتر سارد و سڕتر نیشاندەدا، بەڵام نەیدەتوانی بە سەر خویدا زاڵبێ و لە پەستا قسەی دەپەڕاند، جاری وابوو خۆشی نەیدەزانی دەڵێ چی.

پێکەنینێک ڕوخساری ئیلۆشای ڕوونکردەوە و گوتی: «ئەرێ، نەقڵی ئەو قازەشم بیستووە! بۆیان گێڕامەوە، بەڵام تێنەگەیشتم. یانی هەر بە ڕاستی بردیانی بۆ دادگا؟»

کوولیا بەبێ مەیلی گوتی: «مەسەلەیەکی زۆر قۆڕ و گەوجانە بوو. ئاساییە ئەمجارەش خەڵکی زۆریان گەورە کردەوە. ڕۆژێکیان بەنێو بازاڕدا دەگەڕام. هەر لەو کاتەدا ڕەویەک قازیان هێنابوو. ڕاوەستام سەیرم دەکردن. لەپڕ لاوێک کە ئێستا لە فرۆشگەی پلاتینکۆف شاگردە، چاوی لێکردم و گوتی: «بۆ تەماشای ئەو قازانە دەکەی؟» چاوم لە چاوی بڕی، لاوێکی بیستساڵانەی گەوج و دەموچاو خڕ بوو. خۆ دەزانی من هەمیشە لایەنگری گوندنشینەکانم. زۆرم پێخۆشە قسەیان لەگەڵ بکەم... ئێمە لادێییەکی دواکەوتووین - ئەوە پەندێکی قەدیمییە. کارامازۆف، پێموایە پێکەنینت دێ؟»

ئالیووشا بە ڕووخۆشی و زەردەخەنەوە گوتی: «خودا نەکا، گوێم لەئێوە گرتووە،» کوولیای هەستیار هەر لەڕێوە دڵنیا بوو. لەگەڵ ئەوەی دڵخۆش دیاربوو، دیسان درێژەی بە قسەکانی دا:

- کارامازۆف، بیر و بڕوای من ڕوون و سادەیە. ئیمانم بە خەڵک هەیە و هەمیشە پێمخۆشە ڕێزیان بۆ دانێم، بەڵام زۆریشیان ڕوو نادەمێ، ئەوەش "sine qua non" پێشنیارێکی بنەڕەتییە... خەریکبووم نەقڵی قازەکانم دەگێڕایەوە. ڕووم لێ‌گرژ کرد و گوتم: «خەریک بووم لە خۆم دەپرسی بڵێی قاز بیر لەچی بکاتەوە.» زۆر گەوجانە چاوێکی لێکردم و گوتی: «دەی، قاز بیر لەچی دەکاتەوە؟» گوتم: «ئەو عارەبانەیەت دیوە پڕە جۆ؟ جۆ لە کونی گۆنییەکەوە دادەڕژێ و قازەکەش لە ژێر تایەکانەوە ملی دەباتە ژووری و ئەو دەنکە جۆیانە کۆدەکاتەوە و دەیخوا - دیتووتە؟» گوتی: «ئەرێ دیتوومە.» گوتم: «دەی ئەگەر ئارەبانەکە تۆزێک بڕواتە پێشێ ملی ئەو قازە دەقرتێنێ یان

نا؟» ئەویش وەک ئەوەی ڕۆن قازت لێدابێ، هێندە شادبوو پێکەنی و ددانە گرەکانی وەدەرکەوتن، گوتی: «دڵنیام ملی دەپەڕێ.» گوتم: «کەوایە وەرە با تاقییکەینەوە.» گوتی: «باشە.» هەر زوو دەستبەکار بووین. ئەو بێئەوەی دیاربێ لای هەوسارەکەوە ڕاوەستا، منیش لەودیوی عارەبانەکەوە قازەکەم بەرەولای عارەبانەکە ڕادا. خاوەنەکەی چاوی لێنەبوو، خەریکبوو لەگەڵ کابرایەک قسەیدەکرد. هەر بۆیە کارەکەم بە ئاسانی بە دەستەوە هات. قازەکە خۆی سەری کرد بەژێر عارەبانەکەدا، ڕاست سەری بردە ژێر تایەکەوە. چاوێکم لە لاوی گەمژە قرتاند و هەوسارەکەی کێشا، قرچەی هات و ملی قازەکە قرتا. بۆ بەدبەختی لەو ساتەدا هەموو لادییەکان چاویان لێبوو و قرموقاڵیان وەڕێخست. «بە ئانقەست ئەو کارەت کرد!» گوڕاندیان: «بیبەن بۆلای سەرۆکی دادگا!» منیشیان گرت. گوتیان: «تۆش لەوێ بووی، وادیارە تۆش دەستت لەو کارەدایە. لە نێو بازاڕ هەموو دەتناسن!» کوولیا بە غرووڕەوە درێژەی بە گێڕانەوەکەی دا: «هەر بە ڕاستیش تەواوی خەڵکی نێو بازاڕ دەمناسن!» بردیانین بۆ دادگا. قازەکەشیان هێنابوو. کوڕە لە ترسانا زەرد هەڵگەڕابوو، لەبەر خۆیەوە پرتەی دەهات و دەگریا. خاوەنی قازەکەش دەینەڕاند دەتویست ئاوا هەموو قازەکانم لە نێو بەری. چاکە شایەدیش هەیە. سەرۆکی دادگا هەر لەڕێوە سەروبەری مەسەلەکەی وێکهێنایەوە: «دەبێ ڕۆبڵێک بدەی بە خاوەنی قازەکە.» یانی لاوی گەمژە ڕۆبڵێک بدا بە کابرای خاوەنی قازەکە و قازە ملقرتاوەکەش بۆخۆی. هەروەها وریاییان پێدا کە ئیتر ئەو کارە دووپات نەکاتەوە. کوڕەش وەک ژن دەگریا و دەی پرتاند کە: «من نەبووم، ئەوە فێریکردم،» ئاماژەی بە من کرد. منیش زۆر خوێنساردانە وڵامدایەوە، من فێرمنەکرد. تەنیا بیر و بڕوای خۆم دەربڕی و پیلانێکم بە دەستەوە بوو. سەرۆکی دادگا بسکەی سمێڵی هات و لەوەی کە پێکەنیبوو ڕقی لەخۆی هەستا: «هەر ئێستا نامەیەک دەنووسم بۆ مامۆستایانی قوتابخانەکەت با ئیتر لەمە بەدواوە ئیزنت نەدەن بەجێی دەرس و دەور، وەدوای ئەو پیلان و بەزمانە بکەوی.» ئەوەشی بە گاڵتە بوو، لای مامۆستایان شکایەتی لێنەکردم،

بەڵام ناوچاوەکەم نەیهێنا و مەسەلەکە بە گوێی مامۆستایانی قوتابخانە گەیشتەوە. خۆ دەزانی گوێچکەیان زۆر درێژە! مامۆستای ئەدەب و تۆی دێرین، کولبانسیکۆف، زۆر تووڕە بوو، بەڵام دیسان داردانلۆف گەیشتە فریام. بەڵام کولبانسیکۆف ئێستا وەک گوێدرێژێکی دێز و جووتەوەشێن، لەگەڵ هەمووان هەروا دێزەیە. ئیلۆشا زانیووتە لەم بەینانەدا ژنی هێناوە. هەزار ڕۆبڵی جیازی وەرگرتووە و بووکەخانیش مانگی چاردەیەکە هەر وەرە سەیری! کوڕەکانی قوتابخانە شیعرێکیان بۆ داناوە.

هەواڵێکی سەیرمان پێگەیشتووە

دەڵێن ئاغای کولبانسیکۆف کەر بووە

ئەو شیعرە زۆر پێکەنینیە. لە وەختێکا بۆت دێنم. بە خراپە باسی داردانلۆف ناکەم، پیاوێکی زانا و بیرمەندە و شکی تێدا نییە. ڕێزم بۆ ئەو جۆرە مرۆڤانە هەیە و هویەکەشی ئەوەیە لایەنگریم لێدەکەن.

ئیسمۆرۆف کە لەو کاتەدا بێگومان شانازیی بە کراسووتکینەوە دەکرد، هەڵیدایە: «بەڵام سەبارەت بە بناغەدانەرانی تێروا ڕووشکێنت کرد!» ئەو بەتایبەت نەقڵی قازەکەی زۆر پێخۆشبوو.

سەروان بە شێوەیەکی مەراییکارانەوە و بە زمانێکی لووسەوە پرسیی: «یانی بە ڕاستی ڕووشکێنت کرد؟ نەقڵی ئەو پرسیارەی "بناغەدانەری تێروا کێ بوو" هەر ئەو وەختە ئیلۆشا بۆی گێڕاینەوە.»

ئیلۆشا هەڵیدایە: «باوەگیان، ئەو هەموو شتێک دەزانێ، لە هەموومان شارەزاترە. خۆی لە نەزانی دەدا، بەڵام لە هەموو وانەکاندا یەکەمە.

ئیلۆشا بە شادییەکی لەڕادەبەدەرەوە چاوی لە کوولیا کرد.

کوولیا بە خاکەڕاییەکی ئاوێتەی غروورەوە گوتی: «مەسەلەی تێروا شتێکی زۆر بێبایەخ و ئاساییە. بە بڕوای من پرسیارێکی هیچە.» ئێستا ئیتر تەواو کەوتبووە سەربازی لەخۆبایی بوون، ئەگەرچی تا ڕادەیەک هەر نائارام دیاربوو، دەتگوت کێچ کەوتۆتە کەوڵی، بەری لە قسە بەرەڵڵا کردبوو و چۆنی پێخۆش بوایە درێژدادڕیی دەکرد. بۆ وێنە کاتێک هاتە سەرباسی قازەکە،

بێئەوەی مێشێکی میوان بێ لە بنی کوولەکەکەی دا. ئالیووشاش زۆر جیددیی دەنواند و لەو ماوەیەدا زمانی نەگەڕا. بەڵام کوولیا کراسووتکین وردە وردە ترسی لێنیشت کە: نەکا ئالیووشا ڕقی لێیبێ، پێیوابێ لە هەمبەر ئەودا خۆی دەنوێنێ و چاوەڕێی تاریفی ئەوە ئەگەر وێرابای ئاوا بیر بکاتەوە...

کوولیا لووتبەرزانە دیسان گوتی: «بە بڕوای من پرسیارێکی زۆر بێهەمیەت و هیچە.»

کوڕێک کە هەتا ئەو کاتە زمانی نەگەڕابوو، هەمووانی تووشی سەرسووڕمان کرد و گوتی: «من دەزانم بناغەدانەری تێروا کێ بوو.» کوڕێکی بێدەنگ و ئارام بوو. لەوە دەچوو شەرمەون بێ. کوڕێکی جوان بوو، یازدەساڵان و ناوی کارتاشۆف بوو. لەلای دەرگاکەوە دانیشتبوو. کوولیا بە غروور و سەرسووڕمانەوە چاوی لێکرد. لە ڕاستیدا پێناسەی بناغەدانەرانی تێروا بۆ هەموو منداڵەکانی قوتابخانە بووبووە ڕازێک. گرێپووچکەیەک کە تەنیا بە خوێندنەوەی کتێبەکەی ئیسماراگدۆف دەکرایەوە. و هیچ کەسیش ئەو کتێبەی نەبوو و جگە لە کوولیا. ڕۆژێکیان کوولیا پشتی تێکرد، بۆیە زۆر بە پەلە کارتاشۆف کتێبەکەی لە بەینی ئەو کتێبانەی نێو جانتاکەی دەرکێشا. کتێبەکەی لێککردەوە و لەڕێوە چووە سەر ئەو بەشەی تایبەت بوو بە دامەزرێنەرانی تێروا. ئەوە قسەی زۆر لەمەوبەرە، بەڵام هەستی بە نارەحەتی دەکرد و نەیدەوێرا لە هەنتەشی مامۆستا و هاوپۆلەکانیدا بڵێ منیش ناوی دامەزرێنەری تێروا دەزانم. لەوە دەترسا کراسووتکین وەدرۆی خاتەوە و ئابڕووی بەرێ. بەڵام ئێستا نەیتوانی خۆ لەوتنی ببوێرێ. چەند حەوتوو بوو لە سەر دڵی بووبووە گرێ و دەیویست بیدرکێنێ.

کوولیا زۆر لەخۆباییانە ڕووی تێکرد و پرسیی: «دەی بیڵێ، بناغەدانەری تێروا کێ بوو؟ بە ڕەنگیدا تێگەیشت کە دەیزانێ و هەر لەڕێوە بڕیاری دا چۆنی بەدەمدا بێتەوە. چونکە زۆری پێناخۆشبوو، ڕووهەڵماڵدراوانە چاوی لە کارتاشۆف کرد و گوتی: «زۆر چاکە، بیڵێ بزانم کێ بناغەدانەری شاری تێروایە؟

کارتاشۆف گوتی: «تۆسر و داردانۆس و ئیلیووس و ترووس دایان مەزراند.» هەر لەو کاتەدا سوورهەڵگەڕا. وا سوور بووبۆوە پیاو بەزەیی پێیدا دەهات، بەڵام کوڕەکان هەموو چاویان تێبڕی، خولەکێکی تەواو چاویان تێبڕی. پاشان تەواویان سەریان بۆلای کوولیا وەرسووڕاند، کە هەروا بە قەڵافەتێکی تووڕە و جاڕزەوە لە کوڕەی دەڕوانی.

کوولیا ئاخری بە کەرەمەوە لێی پرسی: «بۆچی بناغەی ئەوشارەیان داڕشت؟ دروستکردنی شار یانی چی؟ چییان کرد ـ پێتوایە هەرکامیان هەستان و کەرپووچێکیان دانا؟»

هەموو دەستیانکرد بە فیشقوهۆڕ. کوڕەی بەستەزمان بەخۆدا شکایەوە و ڕەنگێکی هێنا و برد. زمانی لەگۆ کەوت و خەریکبوو دەستبکا بە گریان. کوولیا ماوەیەک هەروا ڕایگرت و پاشان بە لەبزێکی تاڵەوە وریایی پێدا: «بەرلەوەی باسی مێژوویەک یان دروستبوونی نەتەوەیەک بکەی، دەبێ بزانی باسی چی دەکەی.» دواتریش ڕووی کردە کۆڕەکە و بە لووتەلاییەوە گوتی: «بەڵام من زۆر گوێ نادەمە ئەم قسە و قسەلۆکی پڕوپیرێژنانە و زۆر بیر لە مێژووی گشتی ناکەمەوە.»

سەروان تا ڕادەیەک تووشی شڵەژان بووبوو، پرسیی: «مێژووی گشتی قوربان؟»

کوولیا گوتی: «بەڵێ، مێژووی گشتی! کە پێداچوونەوەی گەوجییەتیی پەیتاپەیتای مرۆڤایەتییە[2]. من لە نێو وانەکانما تەنیا هۆگریم بە بیرکاری و زانستی سروشتی هەیە.» ئەو خۆی شیرین دەکرد و بە دزییەوە چاوی لە ئالیووشا دەکرد. لەوێ تەنیا قسە و بیروڕایەک کە لێی دەترسا، قسە و بیروڕای ئالیووشابوو. بەڵام ئالیووشا هەروا بێدەنگ بوو، هەروەک پێشووش جیددی. هەرئەوەندە ئالیووشا زمانی بگەڕایە، کوولیا بێدەنگ دەبوو، بەڵام ئالیووشا بێدەنگبوو و «ڕەنگە بێدەنگییەکەشی سووکایەتیی پێوەبێ.» هەرئەوەش ئاخری ڕقی کوولیای هەستاند.

---

2- ناوی ویلتێر و کتێبێکی لە بەشی دواییدا دێ. ئەمەش وتەی ئەوە.

ـ زمانە دێرینەکانیش... هەموو قۆڕیات و قسەی شێتانەیە. کارامازۆف وادیارە دیسان لەگەڵ من هاوڕا نیت؟

ئالیووشا بە بزەیەکی ساردەوە گوتی: «هاوڕا نیم.»

ئەگەر لە بیروڕای من دەپرسی، خوێندنەوەی بەرهەمی کلاسیک و زمانەکۆنەکان تەنیا جۆرێک تەمبێ کردنی قوتابیانە و هەربۆ ئەوەش بۆتە بەشێکی وانەی قوتابخانە.» کوولیا وردە وردە خەریک بوو هەناسەی سوار دەبوو. «زمانی لاتینی و یۆنانی هاتنە نێو وانەکانەوە و قوتابییان تووشی شەکەتی و سەرلێشێواوی کرد. پێشتریش هەروا بوون، بۆیە بیریان کردەوە چبکەن کە لەوەش ناخۆشتربێ و قوتابی تووشی بێزاری و گیان داگیران بکا؟ پێشتریش زۆر ڕەقوتەق و بێمانا بوو، کەوایە چۆن دەکرا لەوەش بێمانتری بکەن؟ بۆیە کەوتنە بیری ئەوەی لاتینی و یۆنانی بکەنە بەشێک لە وانەکان.» کوولیا بەم وتەیە دوایی بە قسەکانی هێنا: «بیروڕای من سەبارەت بەو زمانانە ئەوەیە، هیوادارم قەت ئەو بیروڕایەم گۆڕانی بەسەردا نەیە.» ڕوخساری سوورهەڵگەڕا بوو.

ئیسمۆرۆف بە لەبزێکەوە کە دیاربوو باوەڕی تەواوی بە قسەکانی کوولیا هەیە، گوتی: «ڕاست وایە.»

یەکێ لە کوڕەکان بە دەنگێکی بەرز گوتی: «لەگەڵ ئەوەشدا کوولیا خۆی هەمیشە لە وانەی لاتیندا یەکەمە.»

ئیلیوشا قسەکەی پشتڕاست کردەوە: «ڕاستدەکا باوەگیان، وە دەڵێ بەڵام لەوانەی لاتیندا هەمیشە یەکەمە.»

کوولیا، لەوە دەچوو ئەو تاریفانەی پێخۆشبێ. وای بە باش‌زانی بەرەڤانی لەخۆی بکا: «دەی وایە! هەوڵێکی زۆر بۆ وانەی لاتین دەدەم، چونکە ناچارم، بەڵێنم بە دایکم داوە کە لە تاقیکاریدا سەرکەوم. من پێموایە پیاو هەر کارێک دەکا، دەبێ بەشێوەیەکی باش و شیاو ئەنجامیبدا. بەڵام لە ناخەوە ڕقم لە بەرهەمە کۆنەکان و ئەو شتە هیچوپووچانەیە... تۆچی کارامازۆف! لەگەڵم هاوڕای یان نا؟»

«بۆ هیچوپووچ؟» ئالیووشا دیسان بسکەی سمێڵی هات.

ـ دەی چونکە بەرهەمی تەواوی نووسەرانی کلاسیک بە هەموو زمانەکان وەرگێڕدراوە، بۆیە لەبەر خاتری متالای بەرهەمەکلاسیکەکان نەبوو کە لاتین هاتە قوتابخانەوە، بەڵکو وەک هەولێکی پۆلیسی و لە تەنگژە خستنی قوتابی و وەڕەز کردنیان کەڵکی لێوەرگیرا، کەوایە هەردەبێ ئەوناوەی لێبنێین و بە هیچوپووچی بزانین.

ئالیووشا ئاخری بە سەرسووڕمانەوە گوتی: «نازانم کێ ئەو شتانەی فێری تۆ کردووە؟»

ـ من بێئەوەی کەسێک فێرمبکا، خۆم توانایی ئەوەم هەیە بیر بکەمەوە. سەرەڕای ئەوەش ئەوەی هەر ئێستا سەبارەت بە وەرگێڕانی بەرهەمە کلاسیکەکان گوتم، مامۆستاکەمان کولباسنیکۆف بۆ هەموو قوتابیانی پۆلی سێهەمی باسکردووە.

نینا کە هەتا ئەو کاتە بێدەنگ بوو بە دەنگی بەرز گوتی: «دوکتۆر هاتووە!»

عارەبانەکەی مادام خۆخلاکۆف بەرەولای دەروازەکە ڕادرا. سەروان کە لە بەیانییەوە تا ئێستا چاوەڕوانی دوکتۆر بوو، بە پەلە هەڵات بەرەوپیری. دایکی ئیلۆشاش خۆی کۆ کردەوە و قیت و قۆز و لووتبەرزانە دانیشت. ئالیووشا ڕۆیی بۆلای ئیلۆشا و دەستیکرد بە ڕێکوپێک کردنی باڵنجەکانی. نینا لە سەر کورسیلە تایەدارەکەیەوە تامەزرۆیانە چاوی تێبڕیبوو کە جێوبانەکەی بۆ ڕاستە و پاستە دەکرد. کوڕەکان بە پەلە ئیزنی ڕۆیشتنیان وەرگرت. هێندێکیان بەڵێنیان دا عەسر بێنەوە. کوولیا بانگی پێرزفۆنی کرد و سەگەش لە سەر قەرەوێکەکەوە بازیدا خوارێ.

کوولیا بە پەلە بە ئیلۆشای گوت: «من ناڕۆم. لەبەر هەیوانەکە ڕادەوەستم و هەرکاتێک دوکتۆر ڕۆیشت دێمەوە ژوورێ. پێرزفۆنیش دێنمەوە.»

بەڵام دۆکتۆر هاتبووە ژوورێ، پیاوێکی حیسابی بوو بە ڕیشێکی چەکمەیی و چەناگەیەکی شەش تیغە کراوەوە، باڵتەیەکی کەوڵە ورچی لەبەردا بوو.

کاتێک لە کەرکەرۆکی دەرگاکەوە پێی نایە ژووری، ڕاوەستا و واقما: وێدەچوو پێیوابێ بە هەڵە هاتووە. بێئەوەی باڵتەکەی داکەنێ، یان کڵاوە پێستەکەی داگرێ، لە بن لێوەوە بە خۆی گوت: «یانی چی؟ هاتووم بۆ کوێ؟» خێزانی زۆر، ماڵێکی هەژارانە و جلوبەرگی شۆڕاو و هەڵخراو لە سووچێکی وەتاغەکەدا، تووشی سەرسوڕمانی کرد. سەروان دەستی بە سینگییەوە گرت و کڕنۆشی بۆ برد، بەوپەڕی خاکەڕاییەوە، لەبەر خۆیەوە گوتی:

ـ ئێرەیە قوربان، ئێرەیە قوربان، دروست هاتووی قوربان، ئێمە چاوەڕێت بووین، بەخێربێی...

دوکتۆر بە دەنگێکی بەرز و پڕغروورەوە گوتی: «ئیسین ـ گی ـ ڕیف؟ ئاغای ئیسینگیریف ـ ئێوەن؟»

ـ بەڵێ خۆمم قوربان!

ـ ئەها!

دوکتۆر بەشێوەیەکی زویرانە دیسان چاوی بەنێو ژوورەکەدا گێڕا، باڵتەکەی داکەند و ئەو نیشانە بریقەدارەی سەرسینگی سەرنجی هەمووانی ڕاکێشا. سەروان باڵتە پێستەکەی لە حەوا قۆستەوە و دای بە سەر دەستیدا. دوکتۆر کڵاوەکەی لەسەری داگرت و بە لەبزێکی قایم پرسیی:

ـ کوا نەخۆشەکەتان؟

# (٦)

## گەورەبوونی کتوپڕ

کوولیا بە پەلە پرسیی: «پێتوایە دوکتۆر چیی پێدەڵێ؟ ڕوخسارێکی زۆر قێزەونی هەیە، خوێنتاڵە وا نییە؟ من زانستی پزیشکیم بۆ تامڵ ناکرێ!»

ئالیووشا هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «ئیلۆشا دەمرێ. پێموایە مردنەکەی یەکجارییە.»

ـ ئەوانە خوێنمژن! پزیشکی یانی دەستبڕی و گوێ بڕی. لەگەڵ ئەوەشدا خۆشحاڵم لەگەڵ تۆ ئاشنا بووم، ئاغای کارامازۆف. لەمێژبوو دەمویست لەگەڵت ئاشنابم. بەڵام بەداخم کە لەم بارودۆخە ناخۆش و داخاوییەدا پێک گەیشتین.

کوولیا دەیویست بەشێوەیەکی گەرموگوڕتر قسە بکا و دەرگای دڵی بە ڕووی ئالیووشادا بکاتەوە. بەڵام هەستی بە حەپەسان کرد. ئالیووشا تێگەیشت، زەردەیەکی گرت و دەستی بە گەرمی گوشی.

کوولیا بە دڕدۆنگییەوە دیسان گوتی: «زۆر لەمێژە بۆ ئێوەی هەڵکەوتە و کەموێنە ڕێز دادەنێم. بیستوومە لە کلێسە عارفێکی تەواو بووی. دەزانم عارفی بەڵام... ئەم مەسەلەیە دڵساردی نەکردوومەوە. پێوەندی گرتن لەگەڵ ژیانی ڕاستەقینە چارت دەکا... بۆ مرۆڤگەلێکی وەک ئێوە هەمیشە هەروایە.»

«مەبەستت لە عارف چییە؟ چی چارەسەرم دەکا؟» ئالیووشا تا ڕادەیەک سەرسام بووبوو.

ـ لەخودا و لە زۆر شتی دیکە.

ـ چی! بۆ ئیمانت بەخودا نییە؟

«نانا، دژایەتییەکم لەگەڵ خودا نییە. هەڵبەت خودا تەنیا بۆچوونێکی زەینییە، بەڵام... دانی پیادەنێم کە بوونی خودا پێویستە... بۆ نەزمی جیهان و... هتد.» کوولیا خەریک بوو سوورهەڵدەگەڕا، گوتی: «ئەگەر خودا نەشبێ، دەبێ دایهێنن.» لە ناکاو بیریکردەوە، نەکا ئالیووشا پێیوابێ دەیهەوێ زانیاری خۆی بە ڕوویدا دا و بیسەلمێنێ کە «گەورە بووە». بە ڕقهەستاوی بەخۆی گوت: «بە هیچ شێوەیەک نامەوێ زانیاریی خۆم بنوێنم.» کتوپڕیش هەستی بە زویرییەکی زۆر کرد و گوتی: «بە ڕاشکاوی دەیڵێم کە تاقەتی ئەو مشتومڕەم نییە. لەوانەیە کەسێک ئیمانی بە خوداش نەبێ، بەڵام خەڵکی خۆش بوێ، بیروڕای تۆ لەو بارەوە چییە؟ بۆ وێنە ویلتێر ئیمانی بە خودا نەبوو، بەڵام خەڵک خۆشەویست بوو، وا نییە؟ (لەبەر خۆیەوە گوتی: «دیسان دەستم پێکرد.»

ئالیووشا، دلۆڤان و لەسەرەخۆ، زۆریش ئاسایی وەک ئەوەی لەگەڵ هاوتەمەنێکی خۆی یان کەسێکی لەخۆی گەورەتر بدەی، گوتی: «ویلتێر ئیمانی بە خودا هەبوو، ئەگەرچی زۆر کەمیش، بەڵام پێموایە هێندەش خەڵکخۆشەویست نەبوو.» ئەوەی بەتایبەت سەرنجی کوولیای ڕاکێشا، بێمتمانەیی ئاشکرای ئالیووشا بوو سەبارەت بە ویلتێر. دەتگوت هەڵێنانی ئەو نەزیلەیەی خستۆتە عۆدەی کوولیای گچکە. ئالیووشا پرسیی: «بەرهەمەکانی ویلتێرت خوێندۆتەوە؟»

- خوێندنەوە چیت عەرزکەم... بەڵام وەرگێڕاوە ڕووسییەکەی «کاندید»م خوێندۆتەوە... وەرگێرانێکی پڕ لە هەڵیت و پڵیت و کۆن و پێکەنینی... (دیسان دەستمپێکردەوە!)

- دەی تێیگەیشتی؟

«ئەرێ، وشە بە وشەی... یانی... تۆ پێتوایە تێی نەگەیشتووم؟ هەڵبەت کۆمەڵێک وتەی زۆر ناحەز و ڕەقی تێدایە... دەزانم ڕۆمانێکی فەلسەفیشە و بۆ لایەنگری لە بیر و باوەڕێک نووسراوە...» کوولیا خەریک بوو ڕقی هەڵدەستا.

بێئەوەی هیچ پێوەندییەکی بە باسەکەوە هەبێ، گوتی: «من سۆسیالیستم کارامازۆف، سۆسیالیستێک کە ئاو ناپاڵێوم.»

ئالیووشا بە بزەیەکەوە گوتی: «سۆسیالیست؟ ئاخەر تۆ چۆنت ئەو دەرفەتە بووە ببیتە سۆسیالیست؟ خۆ تۆ تەنیا سێزدە ساڵت تەمەنە.»

کوولیا نێوچاوانی تێکنا، لە ڕقا سوورهەڵگەڕا و گوتی:

«جارێ سێزدە ساڵم تەمەن نییە و چاردە ساڵم، هەتا دووحەوتووی دیکە دەبمە چاردە ساڵان. جگە لەوەش، تێناگەم تەمەنم چ پێوەندییەکی بەوەوە هەیە. ئێمە باس لەوە دەکەین کە بیروباوەڕم چییە، نەک ئەوەی تەمەنم چەندە، وا نییە؟

ئالیووشا بە لەبزێکی ئارام و خاکەڕایانە وەڵامی دایەوە: «گەورتر بی تێدەگەی کە تەمەن چ کاردانەوەیەکی لە سەر بیروباوەڕ هەیە. من پێموایە تۆ ئەوەی دەیڵێی بیروباوەڕی خۆت نییە.»

بەڵام کوولیا بە تووڕەیی قسەکەی پێبڕی و گوتی:

ـ دەست هەڵگرە، تۆ باوەڕت بە عیرفان و تەسلیم و ملکەچی هەیە. دەبێ دانیپیا بنێی کە دینی مەسیح تەنیا قازانجی بۆ دەوڵەمەندان و دەسەڵاتداران بووە، بۆ ئەوەی چینی هەژار و لێقەوماو بچەوسێننەوە. وانییە؟

ئالیووشا دەنگی هەڵێنا: «ئەها! دەزانم ئەوەت لە کوێدا خوێندۆتەوە، دڵنیاشم کەسێک ئەوەی پێگوتووی!»

ـ ببوورە، بۆ پێتوایە ئەوەم لە جێگایەکدا خوێندۆتەوە؟ هیچ کەسیش فێری نەکردووم. من دەتوانم خۆم بیربکەمەوە، خۆم ئەقڵ و شعوورم هەیە. ئەگەر ڕاستت دەوێ دژی مەسیحیش نیم. ئەو پیاوێکی مەزن بوو، دڵیشی دەریای شادی و خەڵکخۆشەویستی بوو، ئەگەر ئەمڕۆ زیندوو بوایە، دڵنیام دەچووە ڕیزی شۆڕشگێڕانەوە و ڕۆڵێکی زۆر گرینگیشی دەبوو.

ئالیووشا بە سەرسوڕمانەوە پرسیی: «تۆ ئەوە لە کوێ فێربووی؟ لەگەڵ چ گەوجێک هەڵسووکەوتت کردووە؟»

ـ دەست هەڵگرە، هەقیقەت خۆی ئاشکرا دەبێ. هەڵبەت زۆرجار لەگەڵ ئاغای ڕاکیتین دەمەتەقێم کردووە، بەڵام... دەڵێن بلینسکی پیر و بەغیرەتیش[3] ئەوەی گوتووە.

ـ بلینسکی؟ نەمزانیوە ئەوەی لە جێیەکدا نووسیبێ.

ئەگەر نەشی نووسیبێ، دەڵێن گوتوویە. ئەوەم لە... بیستووە... بەڵام گرینگ نییە، بەتوون لە هەرکەسم بیستووە.

ـ نووسراوەکانی بلینسکیت خوێندۆتەوە؟

ـ نا... هەموو نووسراوەکانم نەخوێندۆتەوە، بەڵام... بەشێکی نووسراوەکانیم سەبارەت بە تاتیانا خوێندۆتەوە، بۆچی لەگەڵ ئوونەگین[4] نەچوو؟

ـ لەگەڵ ئوونەگین نەچوو؟ دڵنیای کە... سەرت لێی ناردەچێ؟

کوولیا بە چزەبزەیەکی ڕقاوییەوە گوتی: «پێتوایە منیش ئیسمۆرۆفە چکوولم. بەڵام تکات لێدەکەم پێتوانەبێ لەو شۆڕشگێڕانەم. من هەمیشە لەگەڵ ڕاکیتین دژایەتیم هەیە و دانوومان پێکەوە ناکوڵێ. ئەگەر ناوی تاتیاناش دێنم، بە هیچ شێوەیەک لایەنگری ئازادیی ژنان نیم. دەزانم ژنان بوونەوەرێکی گوێڕایەڵن و دەبێ هەمیشە فەرمانبەر بن. ناپیلئۆن گوتەنی: «Les femmes tricottent»[5] کوولیا لەبەر هۆیەک بزەی هاتێ. «لانیکەم لەوبارەوە لەگەڵ ئەو پیاوە بە ڕواڵەت مەزنە هاوبڕوام. من پێموایە بەجێهێشتنی وڵات و هەڵاتن بۆ ئەمریکا کارێکی خوێڕییانەیە. نەک هەر خوێڕییانە، زۆریش گەوجانەیە. ئەگەر پیاو دەتوانێ لێرە خزمەتێکی گەورە بە مرۆڤایەتی بکا، بۆ بچێ بۆ ئەمریکا؟ بەتایبەت لەم سەردەمەدا. دەرکی هەموو چالاکییەکی پڕداهات بەڕووماندا کراوەتەوە. وڵامەکەم ئەوە بوو.»

ـ مەبەستت چییە؟ وڵامت بە کێ دایەوە؟ بۆ کەسێک پێشنیاری ڕۆیشتن بۆ ئەمریکای پێکردووی؟

---

3- وی. جی بلینسکی، ڕەخنەگری بەناوبانگی ڕووس (١٨٤٨ـ ١٨١١ ).

4- ناوی ئەم کەسایەتییانە لە ڕۆمانی "یۆجین ئوونەگین" بەرهەمی پووشکیندا هاتوون کە لە نۆهەمین وتاری بلینسکیدا سەبارەت بە بەرهەمی پووشکین باسکراوە.

5- "ژنان کاریان چنینە."

ـ لێیان هەڵپێچابووم بڕۆم، بەڵام من بە قسەم نەکردن. هەڵبەت لە بەینی خۆماندا بێ کارامازۆف؛ بە گوێی کەس نەگاتەوە، جگە لە تۆ هیچکەس لێی نەبیستووم. دەنا لە پۆلیس تەمبێکران و پردی زنجیریش ناترسم:

دێتە بیرت ئەو سەردەمەی

ئەوماڵەی پاڵ پردی زنجیر[٦]

لەبیرتە؟ زۆر شیعری چاکە. بۆ پێدەکەنی؟ تۆ پێت وانییە درۆ دەکەم، ها؟ (کوولیا بە لەرزە لەرز گوتی: «ئەگەر بزانی تەنیا ئەو ژومارەیەی ڕۆژنامەی «ناقووس» لە کتێبخانەکەی باوکمدایە و لەوە زیاترم نەخوێندۆتەوە چی؟»)

ـ نانا، پێناکەنم، هەر بە خەیاڵیشمدا نەهاتووە درۆ بکەی. ڕاستت دەوێ ناتوانم وابیر بکەمەوە، چونکە بەداخەوە ئەو مەسەلەیە ڕاستە. بەڵام پێمبڵێ بزانم ئەو بەرهەمەی پووشکین ـ بڵێ ئوونەگین ـ ت خوێندۆتەوە؟... هەر ئێستا باسی تاتیانات کرد.

ـ نا هێشتا نەمخوێندۆتەوە، بەڵام دەمهەوێ بیخوێنمەوە، دەمارگرژ نیم کارامازۆف؛ دەمهەوێ گوێ لە قسەی هەردوولا بگرم. چی هانت دەدا پرسیار بکەی؟

ـ هیچ، هیچ.

کوولیا لە ناکاو هەڵیدایە: «پێمبڵێ بزانم کارامازۆف، زۆرت ڕق لە منە؟» لە هەمبەر ئالیووشادا سینگی دەرپەڕاند و خۆی قیتکردەوە، وەک ئەوەی مەشقی نیزامی بکا. «تکایە لەوە زیاتر قەراغی لێمەکێشە و ڕاستییەکەیم پێبڵێ.»

ئالیووشا بە سەرسووڕمانەوە چاوی لێکرد: «ڕقم لێتبێ؟ بۆچی؟ تەنیا بەوە نارەحەتم تۆ لەو سەرەتای ژیانەدا، کە خاوەنی هەستێکی ناسک و زاتێکی پاکی منداڵانەی کێ ئاوا لە خشتەی بردووی؟»

---

٦- کوولیا باسی شیعرێکی دی.وی مینائۆف دەکا کە سەبارەت بە بارودۆخی خوێندنی کرێکارانە. بنکەی پۆلیسی نهێنی لە نزیک ئەو پردە هەڵکەوتبوو.

٧- ڕۆژنامەی ئەلکساندر هێرتزن، کە لە بریتانیا بڵاو دەکرایەوە و بەشێوەی قاچاغی دەهات بۆ ڕووسیا. شیعرە برگەییەکەی مینائۆف یەکەم جار لەو ڕۆژنامەیەدا چاپ بوو.

کوولیا بە خاترجەمی قسەکەی پێبڕی: «خەمی منت نەبێ. ڕاستە خاوەنی زاتێکی زۆر هەستیارم، بەڵام بەشی خۆم تێدەگەم. هەر ئێستا بزەت هاتێ و پێموابوو...»

ـ براکەم بزەکەم بۆ شتێکی دیکە بوو. پێشت دەڵێم بۆ پێکەنیم. ماوەیەک لەمەوبەر ڕەخنەی کابرایەکی ئاڵمانیم خوێندەوە کە سەبارەت بە قوتابییان و لاوانی ئەمڕۆ نووسیبووی، ئەو کابرا ئاڵمانییە دانیشتووی ڕووسیا بوو: «ئەگەر خەریتەی ئاسمان و ئەستێرەکان بدەی بە قوتابییەکی ڕووسی تاکو لەو کاتەدا بیروڕای خۆی دەربڕێ، دیارە هیچی تێناگا و سەری لێی دەرناچێ. سەرەڕای ئەوەش ڕۆژی دوایی خەریتەکە ئیسلاح دەکا و دەیهێنێتەوە.» زانیاری سفر، شاتوشووت لەڕادەبەدەر ـ ئەمەیە ئەوەی ئەو کابرا ئاڵمانییە ویستوویە سەبارەت بە قوتابیانی ڕووسی باسی بکا.

کوولیا لە ناکاو پێکەنی: «بەڵێ ڕاست وایە. بژی ئەو ئاڵمانییە. بەڵام سەرنجی لایەنە باشەکەی نەداوە، بیروڕای تۆ چییە؟ ڕەنگە فڕوفڕیشاڵی پێوەبێ، بەڵام بەهۆی منداڵییەوەیە و ئەگەر پێویست بێ، دەکرێ ئیسلاحی بکەی، بەڵام لەلایەکیترەوە، لەوانەیە هەر لە منداڵییەوە، ڕۆحێکی سەربەخۆی بووبێ. ئازادیی ئەندێشە و بیروباوەڕ، کە لەگەڵ ئەم سۆسیس دروستکەرانەی کە لە بەردەم کاربەدەستاندا ناوچاوانیان لە زەوی دەسوون، ئەرز و ئاسمانی فەرقە... لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو کابرا ئاڵمانییە ڕاست دەکا. هەر بژین ئاڵمانییەکان! سەرەڕای ئەوەش ئاڵمانییەکان بۆ ئەوە باشن بیان خنکێنی. ئەگەرچی لە زانست و فێربووندا زۆر وریان، بەڵام دەبێ بخنکێندرێن.»

ئالیووشا بە بزەیەکەوە پرسیی: «ئاخر بۆ؟»

ـ دەی، ڕەنگە قسەکانم هەمووی هەڵیتوپڵیت بێ، ئەوەش دەزانم، بەڵام هێندێ جار کردەوەم زۆر منداڵانەیە، کاتێک بەهۆی شتێکەوە شاد دەبم، خۆم پێڕاناگیرێ و دەستدەکەم بە قسەی قۆڕ و هەڵیتوپڵیت. من و تۆش کەس نازانێ چدەکەین، دەستمانکردووە بە قسەی هیچوپووچ و ئەو دوکتۆرەش لەمێژە چۆتە ژووری. ڕەنگە دایکی ئیلۆشا و ئەو نینا کلۆڵە معاینە بکا. دەزانی زۆرم

ئەو نینایە خۆش دەوێ. کاتێک دەهاتمە دەرەوە سرتاندی بە گوێما: «بۆ تا ئێستا نەدەهاتیێ؟» ئەویش بەشێوەیەکی گلەئامێز و سەرکۆنەوە! پێموایە کچێکی زۆر نازەنین و دلۆڤانە و پیاو بەزەیی پێیدا دێ.

ئالیووشا بە گەرمی گوتی: «ئەرێ، ڕاست دەکەی! ئەی زوو زوو وەرە با بۆت دەرکەوێ چۆن کچێکە. خێری تۆش زیاتر لەوەدایە ئەو جۆرە مرۆڤانە بناسی و بە ناسینی ئەوان قەدری مرخ و بایەخەکان دەزانی و فێری دەبێ. ئەم ئەرکەی تۆش لە هەموو شتێک زیاتری کاردانەوە دەبێ.»

کوولیا بە هەستێکی تاڵەوە گوتی: «ئاخ، نازانی چەندە بە داخەوەم کە زووتر نەهاتووم بۆ ئێرە، بە ڕاستی خۆم لۆمە دەکەم!»

ـ ئەرێ، بەڕاستی جێی داخە. دیتت ئەو کوڕە بەستەزمانە چۆن بە دیتنت گەشایەوە و چۆنت لەبەر دەپاڕایەوە کە سەردانی بکەی؟

ـ ئیتر باسی مەکە! با خراپتر نەبێ! خەتابارم. غورووری و قۆڕەدەماخی نەیدەهێشت بێم. لووتبەرزی و خۆپەرستییەکی گەوجانە بەسەرمدا زاڵبووە و ناتوانم لە دەستی دەرباز بم، ئەگەرچی لە ماوەی تەمەنمدا لەگەڵیدا بە کێشە هاتووم. کارامازۆف من لە زۆر لایەنەوە مرۆڤێکی هیچوپووچم!

ـ نا، تۆ کوڕێکی زۆر خاوەن شعووری، ڕۆحێکی بەرزت هەیە، بەڵام هێندێ سەرەڕۆ و هەتلە بووی. ئێستا دەزانم بۆ ئاوا شوێنت لە سەر ئەو کوڕە دڵپاک و هەست ناسکە داناوە.

کوولیا گوتی: «ئەوە بە من دەڵێی؟ باوەڕ دەکەی، پێموابوو ـ لەوەتا لێرەم وا بیر دەکەمەوە ـ ڕقت لێمە! خۆزگە دەتزانی چەندە ڕێز بۆ بیروڕای تۆ دادەنێم و بە لامەوە گرینگە!»

ـ یانی هەتا ئەو ڕادەیە دڵناسکی؟ ئەویش بەو تەمەنەوە! باوەڕم پێبکە هەر ئێستاکە نەقڵەکەت بۆ دەگێڕمەوە، چاوم لێدەکردی و لە دڵی خۆمدا دەمگوت تۆ دەبێ زۆر بەدگومان و هەست ناسک بی!

ـ وات بیر دەکردەوە؟ دیارە زۆر وردبینی! دڵنیام ئەو کاتە بوو کە باسی قازەکەم دەگێڕاوە. ڕاست ئەو کاتە بوو کە پێموابوو بەهۆی پەلەکردن لە

خۆنواندن و خۆ هەڵکێشان ڕقت لێمهەستاوە، بۆ ساتێک زۆرم لەبەرچاو تاڵ بووی و لەداخا دەستمکرد بە قسەی گەوجانە و بێسەروبەرە. پاشان پێموابوو ـ هەر ئێستا، لێرە کاتێک گوتم ئەگەر خودا نەبوایە، دەبوو دایهێنن، کە زۆر بە تاڵووکە بووم و دەمویست بەو زانستەوە خۆم بنوێنم، بە تایبەت کاتێک ئەو نەقڵەم لە کتێبێک دەرکێشابوو و گێڕامەوە. بەڵام سوێندت بۆ دەخۆم بەهۆی لەخۆباییبوونەوە نەمدەویست خۆم بنوێنم. ڕاستت دەوێ نەشمدەزانی بۆ، چونکە زۆر دڵخۆش بووم، بەڵێ، هۆی ئەوەبوو لە ڕادەبەدەر خۆشحاڵ بووم... ئەگەرچی دەشزانم بۆ مرۆڤ زۆر شوورەییە کاتی خۆشحاڵی دەستبکا بە چەنەوەری و زمان لووسی. بەڵام ئێستا بەو ئاکامە گەیشتووم کە ڕقت لێم نییە؛ بەڵکو هەمووی هەڵقوڵاوی زەینی خۆمە. ئاخ، کارامازۆف من زۆر خەمبارم. هێندێ جار پیاو هەموو چەشنە خەیاڵێکی بە مێشکدا دێ. من وام، زۆرجار پێموایە هەموو خەڵک پێمپێدەکەنن، هەموو خەڵکی دنیا، لەوکاتەشدا ئامادەم بۆ لەبەریەک هەڵوەشاندنی هەموو نەزم و نیزامی عالەم.

ئالیووشا بە بزەیەکەوە گوتی: «بە بۆنەی خۆتەوە هەموو عالەم ئازار دەدەی.»

ـ ئەدی، سەبارەت بە خۆم هەموو عالەم ئازار دەدەم. بە تایبەت دایکم. کارامازۆف پێمبڵێ بزانم، ئێستا زۆر کوڕێکی هیچوپووچم؟

ئالیووشا گوتی: «بیریشی لێمەکەوە، هەر گوێی مەدەرێ! دەی هیچوپووچ یانی چی؟ مەگین هەمووان بەردەوام گاڵتەیان پێناکرێ و یان نابنە گاڵتەجاڕ؟ سەرەڕای ئەوەش دەتوانم بڵێم تەواوی مرۆڤە بە هۆشەکان زۆر لەوە دەترسن ببنە گاڵتەجاڕ و هەر ئەوەش زۆریان دڵتەنگ دەکا. سەرم لەوە سوورماوە کە تۆش ئاوا زوو هەستت بەوە کرد، ئەگەرچی ماوەیەکی زۆرە لەوە گەیشتووم و تەنیا پێوەندیی بە تۆوە نییە. لەم ڕۆژانەدا تەنانەت منداڵانیش لەدەست ئەوە وەزاڵە هاتوون. ئەوەش خۆی لە خۆیا چەشنێک شێتییە. شەیتان خۆی کردووە بە غروور و سەری کردووە بە ناخی هەموو ئەم بەرەیەدا.» ئالیووشا مات و مڕومۆچ ڕاوەستابوو، کوولیا چاوی تێبڕیبوو و چاوەڕوانی ئەو تێکچوونەی

ئەوی دەکرد، گوتی: «شەیتانە شەیتان،» لە کۆتاییشدا گوتی: «تۆش وەک هەمووان وای، یانی وەکو زۆرکەسی دیکە. بەڵام تۆ نابێ وەک خەڵکی دیکە وابی.»
ـ تەنانەت کاتێک کە خەڵکیش ئاوابن؟
ـ بەڵێ، تەنانەت کاتێک کە خەڵکیش ئاوابن. تۆ تەنیا کەسێک بە کە ئاوا نییە. ڕاستت دەوێ تۆ وەک خەڵکی، دیوتە کاتێک دان بە شتێکی خراپ و قۆڕیشدا دەنێی، سەرت بەرز ڕادەگری بێئەوەی تووشی شەرمەزاری بی. لەم سەردەمەشدا کێ هەیە ئاوا دان بە کردەوەی خۆیدا بنێ؟ هیچکەس. خەڵک تەنانەت خراپەکانی خۆیان نابینن و خۆیان لۆمە ناکەن. تۆ وەک خەڵک مەبە، تەنانەت ئەگەر تەنیا کەسێک بی کە وەک خەڵکی دیکە ناچێ.
ـ زۆرجوانە، سەبارەت بە تۆ لە هەڵەدابووم. دەزانی چۆن دڵخۆشیی پیاو بدەیەوە. خۆزگە دەتزانی چەندەم حەز بە ئاشنایەتیت دەکرد کارامازۆف. زۆر لەمێژ بوو تامەزرۆی دیدارت بووم. ئەرێ تۆش هەروا لەبیری مندا بووی؟ هەر ئێستا گوتت کە تۆش لەبیری مندا بووی!
ـ ئەرێ تاریفی تۆم بیستبوو و لەبیریشتدا بووم... ئەگەرچی هەتا ڕادەیەکیش غروور بۆتە هۆی ئەوەی ئەم پرسیارە بکەی، بەڵام قەیناکا.
کوولیا بەشێوەیەکی ئارام و شەرمن گوتی: «دەزانی کارامازۆف، ئەم دەمەتەقێیەی ئێمە وەک ڕاگەیاندنی سەرەتایی عەشق و خۆشەویستی دەچێ. کارێکی قۆڕ و هیچ نییە؟»
ئالیووشا بە پێکەنینەوە گوتی: «نانا قۆڕ نییە، ئەگەر قۆڕیش بێ، قەیناکا، چونکە خێر و سەلاحی تێدابووە.»
کوولیا لە ناخەوە گەشایەوە و بزەی هاتێ: «کارامازۆف، ڕاستییەکەی بڵێ خۆشت تا ڕادەیەک بە شەرما کەوتووی... بە چاوتدا دەزانم.»
ـ بۆ بە شەرما بکەوم؟
ـ ئەی بۆچی ئاوا سوور بوویەتەوە؟

ئالیووشا پێکەنی: «تۆ وام لێدەکەی سوور هەڵگەڕێم،» هەر بە ڕاستیش سوور بووبۆوە. بڕێکیش حەپەسابوو، لەبەر خۆیەوە گوتی: «وایە، تۆزێ بە شەرمدا کەوتووم، خوداش دەزانێ بۆ، خۆم نازانم...»

کوولیا بەوپەڕی نەشەوە دەنگی هەڵێنا: «ئەک لەم کاتەدا چەندەم خۆشدەوێی و مەتحتدەکەم. چونکە تۆزێ بە شەرما کەوتووی! ڕاست وەک من.» ڕوومەتی سوورهەڵگەڕابوو و چاوی بریقەی دەهات.

شتێک بووە هۆی ئەوەی ئالیووشا کتوپڕ بڵێ: «دەزانی کوولیا تۆ لە ژیاندا ناشاد دەبی.»

کوولیا خێرا قەبووڵی کرد: «دەزانم، دەزانم. وادیارە زۆر چاک هەموو شتێک پێشبینی دەکەی و تێدەگەی!»

ـ بەڵام سەرەڕای ئەوەش ژیان تەقدیس دەکەی.

ـ ئافەریم، هەروایە! تۆ پێغەمبەری. ئاخ کارامازۆف، ئێمە پێکەوە ڕێکدەکەوین. دەزانی ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر دڵخۆشمدەکا ئەوەیە وەک هاوشانێکی خۆت هەڵسووکەوتم لەگەڵ دەکەی. بەڵام ئێمە هاوشانی یەکتر نیین، نەک ئەوەی هاوشان نەبین، هەین، بەڵام تۆ باشتری! پێکەوە ڕێکدەکەوین. دەزانی لە ماوەی ئەم مانگەی ڕابردوودا: «یان لەڕێوە بۆ هەمیشە لەگەڵ یەکتر دەبینە هاوڕێ، یان وەک دوژمنی هەمیشەیی لێک هەڵدەبڕێین!»

ئالیووشا بە شادییەوە پێکەنی: «هەڵبەت ئەوەشت بە خۆت دەگوت کە خۆشت دەوێم.»

ـ ئەرێ، زۆریش. هەمیشە خۆشم ویستووی و خەونم پێوە دیتووی. چۆن هەموو شتێکت لە پێشدا بۆ دەرکەوتووە؟ ئاخ خودایەگیان، ئەوەش دوکتۆر! چیمان پێدەڵێ؟ تۆ چاو لە ڕوخساری کە!

# ()

## ئیلۆشا

دوکتۆر باڵتەی کەڵپۆس لەبەر و کڵاو لەسەر، دیسان لە ژوورەکە هاتە دەرێ. تاڕادەیەک تووڕە و ڕقهەستاو دیاربوو، دەتگوت لەوە دەترسێ گیانی پیس بێ. چاوێکی خێرای بە دەور و بەری سەرسەراکەدا گێڕا، لەگەڵ ئەوەشدا بە مڕومۆچی چاوی لە ئالیووشا و کوولیا کرد. ئالیووشا لە دەرگاکەوە دەستی بۆلای عارەبانەچییەکە ڕاداشت و ئەو فایتوونەی دوکتۆری هێنابوو، ڕۆیی بۆلای دەرگاکە. سەروان بە پەلە بەدوای دوکتۆردا هاتە دەرێ و دەستی بە سینگییەوە نا و تاڕادەیەک بە مەراییەوە دوکتۆری ڕاگرت تاکو سەبارەت بە نەخۆشییەکەی ئیلۆشا پرسیاری لێبکا و دڵنیا بێ. سەروانی چاڕەڕەش ئاراوقارای لێهەڵگیرابوو و ترس و خەم لە ناخەوە هەڵیدەچۆقاند. بە دڵپڕی و لێوە لەرزەوە گوتی: «بەڕێزگیان، دوکتۆری بەڕێز... ئەرێ دەکرێ هیواداربین؟» بەڵام لەوە زیاتر قسەی بۆ نەهات و هیوابڕاوانە دەستی لێکهەڵپێکا. لەگەڵ ئەوەشدا، چاوی کز و پڕپاڕانەوەی لە دوکتور بڕی، وەک ئەوەی بە قسەیەکی چارەنووسی کوڕەی بەستەزمان تووشی گۆڕان بکا.

دوکتۆریش بە لەبزێکی قایم و ڕاشکاوانە وەڵامی دایەوە: «من هیچم لەدەست نایە، خۆمن خودا نییم!»

- دوکتۆر... بەڕێزگیان... یانی ئاوا زوو دێتە پێشێ، ئاوا زوو؟

دوکتۆر بەشێوەیەکی جیددی و لێبڕاوانە گوتی: «دەبێ خۆتان بۆ هەموشتێک ئامادە بکەن،» سەری داخست و ڕۆیی سواری عارەبانەکە بێ.

سەروان خەمبار و ترس لێنیشتوو دیسان ڕایگرت: «بەڕێزگیان، بۆخاتری خودا. جەنابی دوکتۆر! یانی ئیتر کار لەکار ترازاوە؟»
دوکتۆر بێسەبرانە گوتی: «ئیتر من هیچم لەدەست نایە، بەڵام... ئەها...» لە ناکاو بێدەنگبوو. «ئەگەر بتوانن، بۆ وێنە نەخۆشەکەتان... بنێرن... خێرا و بە بێڕاوەستان» (وشەی "خێرا و بە بێڕاوەستان" ئەوەندە تووڕە و قیناوی بوو کە سەروانی تووشی عەبەسران کرد.) «بۆ سی ـ ڕا ـ کووز، بارودۆخی هەرێمی نوێ و سوود ـ مەند لەوانەیە شوێنی...»
سەروان وەک ئەوەی گوێی لە قسەی دوکتۆر نەبووبێ، هاواریکرد: «بۆسیراکووز؟»
کوولیا بۆ ڕوون کردنەوە گوتی: «سیراکووز لە سیسیلە.» دوکتۆر چاوی لێکرد.
سەروان منجاندی: «سیسیلیی بەڕێز گیان، بەڵام خۆ بۆت دەرکەوت» ـ دەستی ڕاداشت و شوێنیماڵەکەی نیشاندا. «دایکی ئیلۆشا و بنەماڵەکەم؟»
ـ نا ـ نا، سیسیل شوێنێکی باش نییە بۆ بنەماڵەکەتان، واچاکە سەر لە بەهارێ بنەماڵەکەتان بەرەو قەفقاز کۆچبکەن... کچەکەتان دەبێ بچێ بۆ قەفقاز و ژنەکەت دوای ماوەیەک ماریجە کردن بە ئاوی گڕاو لە قەفقاز لەبەر ئەو ڕۆماتیز و باداریییەی بچێ بۆ پاریس، بنێردرێ بۆلای لۆپلۆتیەر ـ وان ـ کاو؛ پسوولەیەکتان دەدەمێ و پاشان... لەوانەیە گۆڕانکارییەک پێکبێ...
سەروان دیسان دەستی ڕاداشت و هیوابڕاوانە دەستی بۆ لای دیوارە دارین و پۆکاوەکەی سەرسەرا ڕاداشت و نیشان دوکتۆری دا: «جەنابی دوکتۆر، بەڕێزگیان! سەرنجتداوە؟»
دوکتۆر بە بزەیەکەوە گوتی: «دەی ئەوە پێوەندیی بە منەوە نییە. من تەنیا وەڵامی زانستی پزشکی بە ئێوە دەدەمەوە، ئەویش تەنیا سەبارەت بە ماریجەی گریمانەیی. جگە لەوە بەداخەوە...»
کوولیا کە دیتی دوکتۆر بەشڵەژاوی چاوی لە پێرزفۆن بڕیوە و لەبەر دەرگاکە ڕاوەستاوە گوتی: «مەترسە حەکیمباشی، ئەم سەگەی من یانیگر

نییە.» دەنگی کوولیا تووڕەی دەنواند. وشەی حەکیمباشیی بە ئانقەست پێگوت، وەک دواتر خۆی گوتی: «بۆ سووکایەتی بەجێی دوکتۆر گوتم حەکیمباشی.»

دوکتۆر سەری هەڵێنا و بە سەرسووڕمانەوە چاوی لە کوولیا بڕی: «یانی چی؟» پاشان ڕوویکردە ئالیووشا ـ وەک ئەوەی بیهەوێ شتێکی بۆ ڕوون بێتەوە ـ گوتی: «ئەمە کێیە؟»

کوولیا دیسان هەڵیدایە: «ئەربابی پێرزفۆنە، حەکیمباشی، سەبارەت بە من دڵی خۆت نارەحەت مەکە.»

دوکتۆر دیسان سەرسامانە گوتی: «پێرزفۆن؟»

ـ فیتووی خۆی دەناسێ، بەڵام نازانێ لە کوێوەیە! خوداحافیز حەکیمباشی، ئیشەڵڵا لە سیراکووز دەتبینمەوە.

دوکتۆر زۆر بە تووڕەیی گوڕاندی: «ئەوە کێیە؟ ها، ئەوە کێیە؟»

ئالیووشا نێوچاوانی تێکنا و لەگەڵ ئەوەی توند و خێرا خێرا قسەیدەکرد گوتی: «دوکتۆر قوتابییە، کوڕێکی شەیتانە، گوێی مەدەرێ.» پاشان گوڕاندی بە سەر کراسووتکیندا: «کوولیا، دەمت لێکنێ!» تا ڕادەیەکیش بێسەبرانە دووپاتیکردەوە: «دوکتۆر گوێی مەدەرێ.»

دوکتۆر بە تووڕەیی لاقی بە عەرزەکەدا دا: «جێی خۆیەتی بە قامچی هەموو گیانی ڕەش و شین کرێتەوە!»

کوولیا کە ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو، بە دەنگێکی لەرزۆک و چاوی زیتەوە کە عەجوولیی لێدەباری، گوتی: حەکیمباشی، پێرزفۆن لەوانەیە گازیش بگرێ! پێرزفۆن ici !»

ئالیووشا بە تووڕەیی نەڕاندی بەسەریدا: «کوولیا، لەوە زیاتر زمانت بگەڕێ نێوانەکەمان تێکدەچێ.»

ـ حەکیمباشی، لە دنیادا تەنیا یەککەس هەیە دەتوانێ فەرمان بە نیکۆلای کراسووتیکن بدا ـ ئەو کەسەش ئەم پیاوەیە (کوولیا ئاماژەی بە ئالیووشا کرد) لە قسەی ئەو دەرناچم، خوداحافیز!

کوولیا هەنگاوی هەڵێنایەوە دەرگاکەی کردەوە و خۆی کرد بە ژووریدا. پێرزفۆنیش بە دوایدا چووە ژووریٚ. دوکتۆر چەن چرکە لە جێی خۆی وشک بوو و چاوی لە ئالیووشا بڕی. پاشان جنێوێکی دا و بە پەلە ڕۆیی بۆلای عارەبانەکە، هەرلەو کاتەدا بە دەنگێکی بەرز دووپاتی کردەوە: «ئەمە، ئەمە... نازانم چییە!» سەروان بە پەلە خۆی گەیاندیٚ تاکو یارمەتیی بدا بۆ سەرکەوتن لە عارەبانەکە. ئالیووشا بەدوای کوولیادا چووە ژووریٚ. کوولیا لەپەنا جێوبانەکەی ئیلۆشا ڕاوەستابوو. کوڕە دەستی کوولیای گرتبوو و هەرای لە باوکی دەکرد. دوای خولەکێک سەروان هاتەوە ژووریٚ.

ئیلۆشا بە شڵەژان و زمان تێکەڵهاتن گوتی: «با ـ باوە ـ وەرە ـ ئێمە...» بەڵام نەیتوانی درێژە بە قسەکانی بدا، باسکە کز و لاوازەکانی لە نێوقەدی باوکی و کوولیا وەرهێنا و ئەوەندەی هێزی لەبەردا بوو هەردووکیانی بە خۆیەوە گوشی. سەروان لە ناکاو دای لە پڕمەی گریان و کەوتە لەرزین، کوولیاش ڕەنگی هەڵبزڕکا و لێوی هەڵقرچا و دڵی پڕبوو.

ئیلۆشا زوورە زووڕ دەستیکرد بە گریان و گوتی: «باوە. باوە! زۆرم دڵ پێت دەسووتیٚ، باوەگیان!»

سەروان گوتی: «ئیلۆشچکا... کوڕە شیرینەکەم... چاک دەبیتەوە... شاد دەبین... دوکتۆر...»

ئیلۆشا گوتی: «ئاخ، باوەگیان! دەزانم دوکتۆر سەبارەت بەمن چیی پێگوتی... تێگەیشتم!ـ دیسان هەردووکیانی بە سینگی خۆیەوە گوشی و ناوچاوانی نایە سەرشانی باوکی.

ـ باوەگیان مەگری، کاتێک مردیشم کوڕێکی باش پەیدا کە، کوڕێکی دیکە... لە نێو ئەوانەدا یەکیان هەڵبژێرە، کوڕێکی باش. ناوی بنیٚ ئیلۆشا و بەجێی من خۆشتبویٚ...

کراسووتکین بە دەنگێکی توورە گوڕاندی: «دڵت چابیٚ، هاوڕیٚ گیان، تۆ چاک دەبییەوە.»

ئیلۆشا لەدرێژەی قسەکانیدا گوتی: «بەڵام قەت لەبیرم مەبەوە، باوەگیان، وەرە بۆسەر گۆڕەکەم... باوەگیان، لەلای بەردەگەورەکە، ئەو جێیەی پێکەوە دەچووین بۆ پیاسە، بە خاکم بسپێرە، عەسرانە لەگەڵ کوولیا کراسووتکین وەرن بۆلام... پێرزفۆنیش بێنن چاوەڕوانتان دەبم... باوە، باوەگیان!»

دەنگی گیرا، هەرسێکیان هەروا لە باوەشی یەکدا بێدەنگ بوون. نینا لە سەر کورسیلەکەی لەبەر خۆیەوە دەکولاَ و فرمێسکی هەڵدەوەراند. دایکی ئیلۆشاش کە دیتی هەموو دەگرین، ئەویش دای لە قوڵپەی گریان.

- ئیلۆشچکا، ئیلۆشچکا!

کراسووتکین بە پەلە خۆی لە باوەشی ئیلۆشا دەرهاویشت و گوتی:

- هاوڕێی دڵسۆز خوداحافیز، دایکم بۆ نیوەڕۆ چاوەڕوانم دەبێ. حەیفێ پێم نەگوت! نەچمەوە ناڕەحەت دەبێ... بەڵام دوای نانخواردنی نیوەڕۆ دێمەوە بۆلات و هەتا عەسر لێرە دەبم، هەتا ئێوارێ لەلات دەبم و قسەت بۆ دەکەم. پێرزفۆنیش دێنم، بەڵام ئێستا لەگەڵ خۆم دەیبەمەوە، ئاخر ئەگەر خۆم لەلای نەبم، دەستدەکا بە لوورەلوور و ئازارتانددا، خوداحافیز!

لە وەتاغەکە دەرپەڕی و پێی نایە سەرسەرا. نەیدەویست بگری، بەڵام لە پێشخانەکە دەستیکرد بە گریان. ئالیووشا کە دیتی خەریکە دەگری بە لەبزێکی قایم و فەرمان پێدەرانە گوتی: «کوولیا، دەبێ حەتمەن بەڵێنی خۆت بەریتە سەرێ و بێی، دەنا ئیلۆشا دڵی ناڕەحەت دەبێ.»

کوولیا بەدەم گریانەوە و بێئەوەی ئیتر هەست بە شەرمەزاری بکا، لەبەر خۆیەوە گوتی: «حەتمەن دێم! نازانی چەندە پەشیمانم و ڕقم لە خۆم هەستاوە کە پێشتر نەهاتووم بۆلای.» هەرلەوکاتەدا، سەروان لە وەتاغەکە دەرپەڕی و خێرا دەرگاکەی پێوەدا. وەک شێتی لێهاتبوو، کوڵی گریانی هەستابوو و لێوی دەلەرزی. بەرەو ڕووی ئەو دوو کوڕە ڕاوەستا و دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە، ددانی بە سەر یەکدا نا و بە سرتەیەکی مەیلەو تووڕە گوتی:

- کوڕی چاکم ناویَ! کوڕێکی ترم ناویَ! ئەی ئۆرشەلیم، ئەگەر لەبیرت بەرمەوە، خودا بکا زمانم...

دای لە پڕمەی گریان و لەبەر کورسیلە دارینەکەدا بە چۆکدا هات. دەستی بە سەرییەوە گرت و دەستیکرد بە گریان و ناڵین، هەر لەو کاتەدا هەوڵیشی دەدا دەنگی گریانەکەی نەگاتە وەتاغەکە. کوولیا بەرەو شەقام پێی پێوەنا، بە دەنگێکی بەرز و تووڕەوە گوتی:

- خوداحافیز کارامازۆف. تۆش دێی؟

- حەتمەن بۆ عەسر دێم.

(ئەوە چی بوو سەبارەت بە ئۆرشەلیم گوتی؟... مەبەستی لەوە چبوو؟

- لە کتێبی پیرۆزدایە. «ئەی ئۆرشەلیم، ئەگەر لەبیرت بەرمەوە،» یانی ئەگەر ئەوەی زۆرم بەلاوە خۆشەویستە لەبیری بەرمەوە، ئەگەر بهێڵم شتێک جێگاکەی بگرێتەوە، ئەو کاتە خودا بکا...

کوولیا گوتی: «تێدەگەم، ئیتر بەسە! حەتمەن بێی! بە تووڕەیی گوڕاندی بە سەر سەگەکەدا: «پێیرزفۆن، ici !» بە هەڵەداوان بەرەو ماڵیَ پێی پێوەنا.

# (١)

## لە ماڵی گرووشنکا

ئالیووشا بەلای چەپی گۆڕەپانی کەنیسەی گەورەدا ڕۆیی بۆ ماڵی ژنەکەی مارازۆفی ڕەحمەتی تاکو چاوی بە گرووشنکا بکەوێ. چونکە سەرلەبەیانی فینیای ناردبوو کە پەیامێکی خێرای پێڕاگەیێنێ و داوای لێکردبوو بچێ بۆلای. بەو پرسیارانەی لە فینیای کرد، ئالیووشا بۆی دەرکەوت کە گرووشنکا لە دوێنێوە پەرۆشە و تووشی دڵەڕاوکێ بووە. لە ماوەی ئەو دوو مانگەدا کە میتیا قۆڵبەستکرابوو، ئالیووشا بەردەوام سەردانی ماڵی مارازۆفی دەکرد. هەم بەویستی خۆی دەچوو و هەم بۆ ئەوەی هەواڵ بۆ میتیا بەرێ. سێ ڕۆژ دوای قۆڵبەستکرانی میتیا، گرووشنکا نەخۆشییەکی قورسی گرت و نزیکەی پێنج حەوتووی خایاند. حەوتوویەکی تەواو بێسەروزمان کەوت. زۆر گۆڕابوو ـ کز بووبوو و بڕێکیش زەردەڵ. ئەگەرچی دوو حەوتوو بوو چاک بووبۆوە و دەیتوانی بێتە دەرێ. بەڵام لەبەرچاوی ئالیووشا جوان و دڵڕفێنتر بووبوو، پێیخۆشبوو هەرکاتێک دەچێ بۆلای پڕ بەدڵ چاوی لێبکا. حاڵەتێکی لێبڕاوانە و ویستێکی بەهۆشانەی لە ڕوخساریدا بەدیدەکرد. ئاڵوگۆڕێکی ڕۆحیی پێوە دیار بوو، بڕیارێکی قووڵ و پتەو و خاکەڕایانە لە ناخیدا سەری هەڵدابوو، هیچ شتێک نەیدەتوانی پاشگەزی کاتەوە و هیوابڕاوی بکا. لۆچێکی ئەستوونی لەنێوان هەردوو برۆیدا بوو و ڕوخسارە سەرنجڕاکێشەکەی دەتگوت ئەدگاری چلەکێش و پارێزگارانە. ئەو هەڵەشەیی و هەرزەییەی پێشووی ئاسەواری نەمابوو. هەروەها ئالیووشا پێی سەیربوو کە سەرەڕای ئەم هەموو بەڵایەی بە سەر ئەو ئافرەتە چارەڕەشە هاتووە، هەر لە

سەرەتای دەزگیرانەتییانەوە میتیا بەو تۆمەتە قورسە قۆڵبەست دەکرێ و ئەو سزا گرانەی بۆ دەبڕنەوە، هەروەها بەو نەخۆشییە درێژخایەنەشەوە، جوانی و شۆخوشەنگییەکەی هەر مابوو. ترووسکەیەکی هێمن و نەرم لەو چاوە جوانانەدا شەپۆلی دەدا کە سەردەمێک دەریای فیز و غروور بوون، بەڵام... بەڵام جاروبار بە هۆی ڕقێکی ئەستوورەوە ئاوریان لێدەبۆوە، ئەویش ئەو کاتە بوو کە ئەو خەیاڵ و بیرۆکە دڵهەژێنە ـ ئەو تاقە بیرۆکەیەی بەردەوام لە دڵیدا بڵێسەی دەساند ـ گیانی دادەگرت. چونکە هۆی ئەو خەم و پەرۆشییەی هەمیشە یەکشت بوو ـ ئەویش کاترینا ئیوانا بوو، گرووشنکا تەنانەت لە کاتی وڕێنە و ڕەواندنیشدا ناوی دەهێنا. ئالیووشا دەیزانی کە ئێرەیی بە کاترینا ئیوانا دەبا. لەگەڵ ئەوەشدا کاترینا ئیوانا بۆ تاقە جارێکیش لە بەندیخانە لە میتیای نەپرسیبوو. ئەگەرچی دەیتوانی هەرکاتێک پێیخۆشبێ بچێتە ملاقاتی. هەر ئەوەش ئالیووشای تووشی تەنگژە کردبوو، کە گرووشنکا تەنیا ئەوی بە مەحرەمی ڕازی خۆی دەزانی و دەردەدڵی لەلا دەکرد و داوای چارەسەریی لێدەکرد. زۆرجاریش دادەما چی بە گرووشنکا بڵێ و چ وڵامێکی بۆ بدۆزێتەوە.

ئالیووشا بە دڵەخورپەوە گەیشتە ماڵی گرووشنکا. گرووشنکا لە ماڵێ بوو. نیوسەعات لەمەوبەر لە ملاقاتی میتیا گەڕابۆوە و بەشێوەی هەستان و بێئۆقرەییەکەیدا کە زۆر بێسەبرانە چاوەڕوانی بووە. دەستێک گەنجەفە بۆ یاریی فاڵگرتنەوە لە سەر مێزەکە ڕیزکرابوو. لەو لایەیتری مێزەکەشەوە لە سەر قەنەفەیەکی چەرمین جێوبانێک ڕاخرابوو و ماکسیمۆف لەسەری خەوتبوو. لە سەر لاتەنیشت خۆی کوشمەڵە کردبوو، بەرگی خەوی لەبەردا بوو، کڵاوێکی کەتانیی لەسەرنا بوو و دیار بوو بێهێز و نەخۆشە. بزەیەکیشی لە سەر لێو بوو دەتگوت لە بەهەشتە. لە دوومانگ لەمەوبەرەوە ئەم پیرە پیاوە نەخۆش و بێماڵوحاڵە لەگەڵ گرووشنکا لە ماکرۆیەوە هاتەوە بۆ ئێرە و ئیتر لەوێ جێی خۆشکرد. باران و قوڕ و چڵپاو بوو گەیشتنەوە ماڵێ، بە گیانی خووساو و دڵی بێئۆقرەوە لە سەر قەنەفەکە دانیشت و بە بزەیەکی

شەرمنانە و مەرایی‌ئامێزەوە چاوی لە گرووشنکا بڕی. گرووشنکا زۆر خەمبار و پەرۆش و سەرەتای چەقوچۆکەی بوو. تا نیوسەعاتێک کە سەرقاڵی کاروباری زەرووری بوو، ماکسیمۆفی بە تەواوی لەبیر چووبۆوە. لە ناکاو چاوی پێیکەوت: ئەویش بە بزەیەکی هیوابڕاوانەوە خۆی فەقیر کرد بۆ ئەوەی بەزەییبیان پێیدا بێ. گرووشنکا فینیای بانگ کرد و گوتی شتێکی بۆ بێنێ بیخوا. ماکسیمۆف ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارێ لەوێ دانیشت و جووڵەی نەکرد. کاتێک هەوا تاریک بوو پەردەکانیان دادایەوە، فینیا لە خاتوونەکەی پرسی:

- خانم گیان ئەم ئاغایە شەوێ لێرە دەبێ؟

گرووشنکا وەڵامی دایەوە: «ئەرێ لە سەر ئەو قەنەفەیە جێوبانەکەی بۆ ڕاخە با بخەوێ.»

گرووشنکا دوای پرسیاری زیاتر بۆی دەرکەوت ماکسیمۆف هیچ شوێنێکی نییە بچێ، لە وەڵامی پرسیارەکانیشیدا ماکسیمۆف گوتی: «ئاغای گالگانۆف ڕاست و ڕەوان پێیگوتم ئیتر ڕێم نادا بچمە ماڵەکەی و پێنج ڕۆبڵی پێدام.» گرووشنکا بۆ دڵدانەوەی زەردەیەکی گرت و ئەگەرچی خەمێکی زۆر لەدڵی باربوو، گوتی: «دەی قەیناکە، دەتوانی لێرە بمێنییەوە.» بزەکەی گرووشنکا تووشی دڵگوشرانی کرد و لێوی لەرزی و کوڵی گریانی هەستا. بەم جۆرە ئەم پیرە پیاوە بێ‌ماڵ‌وحاڵە لە ماڵی گرووشنکا دایکوتا. تەنانەت ئەو کاتەی گرووشنکاش نەخۆشبوو، لە ماڵێ نەدەچووە دەرێ. فینیا و دایەگەورەشی دەریاننەکرد، هەموو ژەمەکان نانیان بۆ دەبرد و جێوبانەکەیان لە سەر ئەو قەنەفەیە بۆ دادەخست. گرووشنکا خووی پێگرتبوو، دوای گەڕانەوە لە ملاقاتی میتیا (کە دوای چاکبوونەوەی نەخۆشییەکەی بڕیاریدا بچێتە بەندیخانە بۆ ملاقاتی) دادەنیشت و سەبارەت بە کاروباری ئاسایی لەگەڵ ماکسیمۆف دەکەوتە قسە و ڕاوێژ بۆ ئەوەی خەمەکانی وەبیر نەیەتەوە. پیرەپیاو لە هێندێ بارەوە حەقایەتوێژێکی باشی لێدەرچوو، بوونیشی بۆ گرووشنکا زۆر پێویست بوو. جگە لە ئالیووشا کە هەموو

ڕۆژێک نەدەهات، کاتێک دەشهات زۆر نەدەمایەوە، گرووشنکا هیچکەسی دیکەی نەدەدی. بازرگانە پیرەکەی نەخۆش و کەلەلا کەوتبوو، خەڵکی شاری دەیانگوت «مەحاڵە تازە چاکبێتەوە» لە ڕاستیدا، حەوتوویەک دوای دادگایی کردنی میتیا مرد. سێ حەوتوو بەر لە مردنی، کە هەستیدەکرد مەرگ بەرۆکی پێدەگرێ و نزیک بۆتەوە، کوڕەکانی لەگەڵ ژن و منداڵەکانی بانگکرد بۆ نهۆمی سەرێ و داوای لێکردن ئیتر بەجێی نەهێڵن. هەر ئەو کاتە فەرمانی بە خزمەتکارەکانی دا کە گرووشنکا ڕێنەدەن بچێتە ژوورێ و ئەگەر هاتیش پێی بڵێن: «ئەرباب ئارەزووی بەختەوەری و تەمەندرێژیت بۆ دەکا و دەڵێ لەبیری بەرەوە.» بەڵام گرووشنکا هەموو ڕۆژێک کەسێکی بۆ هەواڵپرسی دەنارد.

گرووشنکا، گەنجەفەکانی فڕێدا سەر مێزەکە و بە گەرمی وەڵامی سڵاوەکەی ئالیووشای دایەوە و گوتی: «شوکور هاتی! ماکسیمۆف دڵی خستوومە قرتوفرت و پێموابوو نایەی. نازانی چەندەم نیاز پێتە! لەو پشت مێزە دانیشە. چی دەخۆی ـ قاوە؟»

ئالیووشا لە پشت مێزەکە دانیشت و گوتی: «ئەگەر زەحمەت نەبێ، زۆرم برسییە.»

گرووشنکا گوتی: «بەسەر چاو. زەحمەتی چی! فینیا. فینیا، قاوە. لەمێژە بۆمان ئامادە کردووی. بڕێکیش ناوساجی بێنە، وریابە زۆری نەبرژێنی بسووتێ. هەر بە گەرمی بیهێنە. دەزانی لە سەر ئەو ناوساجییە ئەمڕۆ شەڕە دەندووکەیەکمان کرد. ناوساجیم بۆ برد بۆ بەندیخانە، هەتا دەستی گرتی فڕێیدا: هەر دەمی لێنەدان. تەنانەت دانەیەکیانی فڕێدا بەر پێی و وەبەر پێلاقەی دا، پێمگوت: «لەلای دێرەوانەکە بۆت بەجێدێڵم. ئەگەر هەتا ئێوارە نەیخۆی، دیارە زۆر ڕقئەستوور و خۆپەرستی!» لەدوای ئەو قسەیە هاتمە دەرێ. دیسان کێشەمان لێپەیدا بوو، باوەڕ دەکەی؟ هەرکاتێک دەچم کێشە و دەمقرە دەستپێدەکا.»

گرووشنکا ئەم وشانەی یەکپشوو بە دڵەخورپەوە دەربڕی. ماکسیمۆف کە هەستیکرد تووڕە بووە، خێرا زەردەیەکی گرت و چاوی لە زەوی بڕی.

ئالیووشا پرسیی: «ئەمجارە بۆ دەمقرەتان لێپەیدا بوو؟»

ـ چاوەڕوانیی ئەوەم هەر نەدەکرد. بیری لێبکەوە، ئێرەیی بەو کابرا لەهێستانییە دەبا. گوتی: «بۆ ڕایدەگری؟ کەوایە جێت بۆ خۆشکردووە.»ئەو بەخیلە، هەمیشە، بەردەوام دڵپیسیم لێدەکا! خانە گومانە. تەنانەت حەوتووی پێشوو دڵپیسی لە کوزما دەکرد.

ـ بەڵام پێشتریش سەبارەت بەو کابرا لەهێستانییە ئاگادار بوو؟

«بەڵێ، بەڵام خاڵی گرینگ ئەوەیە، هەر لە سەرەتاوە لەوە ئاگادار بوو، بەڵام ئەمڕۆ لە ناکاو دەستیکرد بە جنێو پێدانی. لەڕووم هەڵنایە وتەکانی دووپات کەمەوە. هەر دەڵێی لەونی لێگۆڕاوە. هەر ئەو کاتە هاتمە دەرێ، ڕاکیتین چوو بۆ ملاقاتی. ڕەنگە ڕاکیتین تیژی کردبێ، پێموایە فیتی ئەوە.»

گرووشنکا بە ڕاشکاوی گوتی: «تۆ دەڵێی چی؟»

ـ هۆی ئەوەیە خۆشی دەوێ، لەڕادەبەدەر خۆشی دەوێ. ئێستاش دەزانم دڵەدوایە.

ـ دەزانم ڕقی هەستاوە، سبەینێ دادگایی دەکەن، من چووبووم تاکو سەبارەت بە سبەینێ قسەی لەگەڵ بکەم. چونکە زۆر لە سبەینێ دەترسام. تۆ دەفەرمووی دڵەدوایە، بەڵام من لەو دڵەدواترم! ئەو هەڵدەستێ سەبارەت بە لەهێستانی قسە دەکا! گەوجییەتی نییە؟ بەڵام دیسان دەبێ شوکری خودا بکەم کە دڵپیسی لە ماکیسمۆف نەکردووە. ماکسیمۆف هەڵیدایە: «خاتوون، ژنەکەشم زۆری دڵپیسی لێدەکردم.»

گرووشنکا بەپێچەوانەی ویستی خۆی پێکەنی: «دڵپیسی لەتۆ؟ سەبارەت بە کێ؟»

ـ کچە کڵفەتەکان.

«لەسەری مەڕۆ ماکسیمۆف، ئێستا تاقەتی پێکەنینم نییە، زۆرم ڕقهەستاوە. بە چاوت قەپاڵ لەو ناوساجاییانە مەگرە. چونکە دەمت وێی

ناکەویّ. بۆ تۆش باش نییە، ودکاشت نادەمیّ.» پاشـان بـە پێکـەنینـەوە گـوتی: «دەبیّ ئاگاداری لەوەش بکەم، هەر دەڵێی هەتیوخانەم داناوە.»

ماکسیمۆف بە دەنگێکی بوغز گرتـووەوە گـوتی: «شیاوی دڵسۆزیی ئێوە نـیم، خـاتوون. مـن بوونـەوەرێکـی هیچوپـووچم. چـاکتر وایـە دەرهـەق بـە کەسانێک دڵسۆزی بکەی کە شیاوی بن.»

ـ ئاخ، هەموو کەس بەشی خۆی بەکەڵک و شیاوە ماکسیمۆف، چۆن بزانم کـیّ شـیاوتر و بـەکـەڵکتـرە. ئالیووشـا، خۆزگـە ئـەو کـابرا لـەهێستانییە هـەر نەبوایە. لەسەری داوە کە ئەمڕۆ ئەویش نەخۆش دەکەویّ. چوومەتە دیدەنیی ئەویش. بە ئانقەست بڕێک ناوساجی بۆ ئەویش دەنێرم. تا ئێستا بـۆم نـەنارد بوو، بـەڵام میتیا تۆمـەتـی ئـەوەی لێدەدام، بویە ئێستا بڕێکی بۆ دەنێرم! ئا، ئـەوەش فینیا بە نامـەیەکـەوە هـات! ئـەریّ نامـەی لـەهێستانییەکانـە ـ دیسان داخوازی دۆعای بەخێریان هەیە!

پان مووسایالۆویچ لەمەوبەر نامەیەکی زۆر بەتامووخـویّ و گـەرموگـوڕی بۆ ناردبووم و لەودا داوایکردبوو کـە گرووشـنکا سـی ڕۆبڵـی بـەقـەرز بداتیّ. ڕەسیدی ئەو بڕە پارەیەشی لەگەڵدا بوو، بەڵێنی ئەوەشی دابوو کە لە مـاوەی سیّ مانگدا بیداتـەوە، پـان و ویرۆبلیێفسکیش ئیمزای کردبـوو. گرووشـنکا لـە مـاوەی چاکبوونـەوەکـەیـدا لـەوجـۆرە نامـە و ڕەسـیدانەی لـەلایـەن ئاشـقە پێشینەکەیەوە زۆر پێگەیشتبوو. بەڵام دەیزانی لە ماوەی نەخۆشییەکـەیدا ئـەو دوو لـەهێستانییە هـاتوون بـۆ هـەواڵپرسیی. یـەکـەم نامـەیان کـە بـە دەسـتی گرووشـنکا گـەیـشت، نامـەیـەک بـوو زۆر بـە وردی و دوور و درێـژی لـە کاغەزێکی گەورەدا نووسرابوو، مۆرەکەشی وێنەی تاجی بنەماڵەکـەیانی پێوە بوو. نامەکـەش ئـەوەنـدە لێڵ و پڕپێچ و پـەنـا نووسـرا بـوو گرووشـنکا دوای ئەوەی نیوەی خوێندەوە داینا و تاقەتی نەبوو خۆی پێوە سەرقاڵ بکا، چونکـە سەرەندەری لێنەدەکرد. گرووشنکا لـەو کاتـەدا تاقـەتی نامـەنووسـینی نـەبـوو. ڕۆژی دوایـی نامـەیـەکـی دیکـە هـات کـە لـەودا پـان مووسـایا لـوویچ داوای قـەرزێکی دووهـەزار ڕۆبڵیی کردبوو و بـەڵێنی دابـوو لـە مـاوەیـەکـی کـورتـدا

دەیداتەوە. گرووشنکا وەڵامی ئەو نامەشی نەدایەوە. لە دوای ئەوە نامە لە دوای نامە هاتبوو ـ هەموو ڕۆژێک ـ هەمووشی وەک یەک تەمومژاوی بوون، بەڵام ئەو برە پارەی داوایان دەکرد جار لەگەڵ جار کەم دەبۆوە، تا وای لێهات گەیشتە سەد ڕۆبڵ، پاشان بیستوپێنج و دە ڕۆبڵ. لە ئاکامدا لە لایەن هەردوو لەهێستانییەکەوە نامەیەک گەیشتە دەستی گرووشنکا و داوای یەک ڕۆبڵیان کردبوو. ڕەسیدێکیشیان بە ئیمزای هەردووکیانەوە ڕەگەڵ خستبوو. ئەو کاتە گرووشنکا دڵی پێیان سووتا و ئێوارەیەک چوو بۆ ژووری نیشتەجێ بوونیان کە وەتاغێکی چکۆلە بوو. بۆی دەرکەوت هەردووکیان بەجارێ لێیان قەوماوە و برسی و بێماڵوحاڵ و جگەرە لێبڕاو و قەرزدار بوون و تەنانەت نەیانتوانی بوو کرێی ژوورەکەیان بدەن. ئەو دووسەد ڕۆبڵەی لە کاروانسەراکەی ماکرۆیە لە میتیایان بردبۆوە، هەر زوو لەدەستیان بووبۆوە. بەڵام گرووشنکا لەو هەڵسوکەوتە لەخۆباییانە و وردبینی و قسە دەمتەڕانەیان تووشی سەرسووڕمان بووبوو. بە پێکەنینەوە دە ڕۆبڵی دا بە ئاشقەکەی پێشووی. پاشان بەدەم قاقای پێکەنینەوە بەسەرهاتەکەی بۆ میتیا گێڕایەوە، ئەویش بە هیچ شێوەیەک ئێرەیی پێنەبرد. بەڵام لەو کاتەوە لەهێستانییەکان خۆیان بە گرووشنکادا هەڵیواسیبوو و هەموو ڕۆژێک بۆ داخوازیی پارە نامەبارانیان دەکرد، ئەویش هەموو جارێک برێکی پارە بۆ دەناردن. هەر بۆیە ئەو ڕۆژە میتیا تووشی ئێرەیی و دڵپیسی بووبوو.

گرووشنکا تووڕە و بە پەلە گوتی: «کاتێک چووم بۆ ملاقاتی میتیا، خۆم گەوج کرد و دەقیقەیەک چووم بۆلای، چونکە ئەویش نەخۆشە، مەبەستم هەر ئەو لەهێستانییەیە وا پێشتر دڵی پێمەوە بوو. بەسەرهاتەکەم بە پێکەنینەوە بۆ میتیا دەگێڕایەوە، گوتم: «کابرای لەهێستانی دڵی خۆی خۆشکردووە کە دەتوانێ هەوا کۆنەکانیم بە گیتارەوە بۆ بڵێ. پێیوابوو بەوە دڵم نەرم دەبێ و شووی پێدەکەم!» میتیا دەمی هەڵماڵی و هەستا سەرپێ... چاکە ئێستا ناوساجییەکان دەنێرم بۆ ئەو لەهێستانییانە! فینیا، ئەمە هەر ئەو کچە

چکۆلەیە کە ناردوویانە؟ ها، ئەم سێ ڕۆبڵەیان بدەیە، دە دوازدە ناوساجیشیان بۆ لە کاغەزێک بپێچە و پێی بڵێ بۆیان بەرێ. ئالیووشا تۆش حەتمەن بە میتیا بڵێ ناوساجییەکانم بۆ ئەوان نارد.»

ئالیووشا بە بزەیەکەوە گوتی: «بە هیچ شێوەیەک لە دەمم دەرنایە.»

گرووشنکا بە لەبزێکی تاڵ گوتی: «ئاخ! پێتوایە بە هۆی ئەوەوە زویر بووە. بەڵام بە ئانقەست دڵپیسی دەکا. دەنا بۆی گرینگ نییە.»

ئالیووشا پرسیی: «بە ئانقەست؟»

ـ ئالیووشا، با پێتبڵێم تۆ تێناگەی. لەگەڵ ئەو هەموو بیر و هۆشەشدا، سەرت لەوە دەرناچێ. نیگەرانی ئەوە نیم دڵپیسی لە ئافرەتێکی وەک من دەکا. ئەگەر دڵپیسی نەکردایە نارەحەت دەبووم. من ئاوام. لە دڵپیسی نیگەران نابم. زۆریش دڵرەقم. دڵپیسی و ئێرەیی لە زاتی منیشدایە. بەڵام شتێک کە دەمتەزێنێ ئەوەیە میتیا خۆشی ناوێم. با پێت بڵێم ئەو ئێستا بە ئانقەست دڵپیسیم لێدەکا. بۆ کوێرم؟ چاوم نابینێ؟ هەر ماوەیەک لەمەوبەر کە لەلای بووم دەستیکردبوو بە باسکردنی ئەو ژنە، کاتیا، کە شاخی وایە و باڵی وایە و دوکتۆری لە مۆسکۆوە هێناوە بۆ ئەوەی چارەسەری نەخۆشییەکەی من بکا. باشترین و زاناترین پارێزەری بۆ گرتووم. کەوایە دەزانم ئەوی خۆش دەوێ، شەرمیش ناکا و لەلای خۆم تاریفی ئەو چەتیوە دەکا! خۆی زۆر خراپ لەگەڵ من جووڵاوەتەوە، بویە دەمی لە من هەڵماڵی و هەموو خەتاکانی خستە ئەستۆی من، بۆ ئەوەی بەرخەتای سەرەکی من بم و قامک لە چاوم ڕاکا. شەکرم بۆ دەشکێنێ و دەڵێ: «تۆ بەر لە من لەگەڵ ئاشقە لەهێستانییەکەت بووی، کەوایە سەبارەت بە کاتیا هەقی قسەت نییە و ناتوانی سەرکۆنەم بکەی.» دەیهەوێ هەموو تاوانەکان بخاتە ئەستۆی من. بە ئانقەست ئانگژای من دەبێ، با پێتبڵێم بە ئانقەست، بەڵام من...

گرووشنکا نەیتوانی قسەکانی تەواو کا و پێیبڵێ چبکا. دەسرەیەکی بە بەر چاوییەوە گرت و دای لە پرمەی گریان.

ئالیوشا بە خاترجەمی گوتی: «کاترینا ئیوانای خۆشناوێ.»

گرووشنکا دەسرەکەی لە چاوی کردەوە و بە لەبزێکی هەڕەشەئامێزەوە گوتی: «هەڵبەت بەمزووانە لە بنجونباوانی دەگەم.» ڕەنگی گوڕا بوو. ئالیووشا بە دڵێکی پەرۆشەوە تێگەیشت کە ئەو شادی و بزەیەی پێشوو بە ئەدگارییەوە نەماوە و ڕقهەستاو و مڕومۆچە.

گرووشنکا هەڵیدایە: «ئەمە گەوجییەتییە. لەبەر ئەوە نەمنارد بە دواتا. ئالیووشای خۆشەویست، سبەینێ ـ سبەینێ چی دەقەومێ؟ ئەوەی ئاراوقارای لێ‌هەڵگرتووم ئەوەیە! تەنیا هەر منیش دڵ لەدوام و خەمی بۆ دەخۆم. هەرچی دەڕوانم هیچکەس نابینم خەمی بۆ بخوا. هیچکەس گوێی ناداتێ. تەنانەت تۆش بە بای خەیاڵتا نایە! دەزانی سبەینێ دادگایی دەکەن. پێمبڵێ بزانم، چۆنی دادگایی دەکەن؟ دەزانی ئەو خوێڕیی هیچوپووچە، ئەو خوێڕییە باوکتانی کوشت؟ خودایەگیان، یانی دەتوانن ئەو بەجێی ئەو خوێڕییە مەحکوومبکەن و هیچکەسیش هەڵنەستێ پارێزگاریی لێبکا؟ ئەو دادوەرانە باسی ئەو خوێڕییەیان هەر نەکردووە، کوا لێیان پرسیوە؟»

ئالیووشا مات و مەلوول گوتی: «چەن جار لە سەر یەک محاکەمەیان کردووە، بەڵام هەموویان بەو ئاکامە گەیشتوون کە کاری ئەو نەبووە. ئێستا ئەو نەخۆش و کەلەلا کەوتووە. لە کاتی ئەو نەخۆشی سەر و دڵەوە هەروا لە جێدا کەوتووە. دیارە هەر بە ڕاستی نەخۆشە.»

ـ ئاخ خودایە، ناکرێ خۆت بچی بۆلای ئەو وەکیلە و هەموو شتێکی بۆ باسبکەی؟ دەڵێن سێ‌هەزار ڕۆبڵیان پێداوە و لە پترزبۆرگەوە هێناویانە.

ـ ئەم سێ هەزار ڕۆبڵە بە هەر سێکمان داومانە ـ ئیوانی برام و من و کاترینا ئیوانا ـ بەڵام هەقی دوکتۆری مۆسکۆیی کاترینا ئیوانا هەر خۆی داویەتی. فێتی یۆکۆویچ وەکیلێکی بەناوبانگە و زۆر لەوە زیاتر وەردەگرێ، بەڵام هەواڵی پەروەندەکە لە تەواوی ڕووسیادا دەنگی دایەوە و هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارەکان باسیانکرد. بۆیە فێتی یۆکۆویچ قەبووڵی کرد ئەو پارێزەرییە وەئەستۆ بگرێ، چونکە مەسەلەکەی بەلاوە گرینگ بوو و پەروەندەکەش وادیارە زۆری دەنگ داوەتەوە. دوێنێ چاوم پێیکەوت.

گرووشنکا بە تامەزرۆیی پرسیی: «دەی، قسەت لەگەڵ کرد؟»
ـ گوێی بۆ ڕاگرتم، بەڵام هیچی نەگوت. پێیگوتم کە خۆی هێندێ شتی بۆ دەرکەوتووە و بڕیاری لە سەر داوە. بەڵام قەولی داوە وتەکانی منیش لەبەرچاو بگرێ.
ـ لەبەرچاو بگرێ! ئاخ، ئەوانە زۆر دڵڕەق و هیچوپووچن! لەنێوی دەبەن! ئەی ئەو دوکتۆرەیان بۆ لە مۆسکۆوە هێناوە؟
«وەک کارناسێکی شارەزا هێناویانە بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە میتیا شێتە و کاتێک ئەو قەتڵەی کردووە ئاگای لەخۆی نەبووە.» ئالیووشا بزەیەکی نەرم نیشتە سەرلێوی: «بەڵام میتیا ملی پیا ناکا.»
گرووشنکا گوتی: «ئەرێ، بەڵام ئەم قسەیە بۆ کاتێک دەبێ کە کوشتبێتی! ئەوکات شێت بوو، شێت و وێت، هەمووشی خەتای منی دڵڕەش بوو! بەڵام ئەو نەیکوشتووە، دڵنیام کاری ئەو نییە. هەمووان هەموو خەڵکی شار لەویان هەڵپێچاوە. تەنانەت شایەدیی فینیاش سەلماندی کە کاری ئەو بووە. ئەو دووکاندارانە، ئەو کارمەندەش، پێشتریش لە مەیخانە خەڵکی گوێیان لە شاتووشووتەکەی بووە! هەموویان لەگەڵ ئەو تێکەوتوون و بە زەرەدی ئەو شایەدی دەدەن.»
ئالیووشا بە لەبزێکی خەمبارانەوە گوتی: «ئەرێ، داروبەرد و عالەم بە دژی ئەو شایەدی دەدەن.»
ـ ئەم گریگۆری واسیلیەویچەش وەک کەری کەندەڵان پێی چەقاندووە و لە سەر قسەی خۆی سوورە و دەڵێ دەرگاکە ئاواڵە بووە، بە چاوی خۆی دیویەتی دەرگاکە کراوەتەوە ـ دەست هەڵگیر نییە. خۆم چووم قسەم لەگەڵ کرد. بە هیچ کلۆجێ ملزەم نابێ، دەمی هەڵماڵی و ئەوی قسەی ناحەزە پێی گوتم.
ئالیووشا گوتی: «ئەری، ئەوەش شایەدییەکی زۆر بەهێزە بەدژی میتیا.»
گرووشنکا خەمبارانە و مانادار گوتی: «نازانم بۆ شێت بوونەکەی بڵێم چی، هەر بەڕاستی ئێستا لە شێت دەچێ. ماوەیەکی زۆرە دەمویست

سەبارەت بەو مەسەلەیە قسەت لەگەڵدا بکەم. هەرجارێ دەچم بۆلای سەرم لێی سوورِ دەمێنێ. تۆ پێتوایە هەمیشە سەبارەت بە چی قسە دەکا؟ هەروا قسە دەکا و دەیرِێسێ و دەیرِێسێ، منیش تێیناگەم. پێموابوو سەبارەت بە مەسەلەیەکی رِۆشنبیرانە دەدوێ و من لەبەر گەوجییەتیی خۆم تێیناگەم. هەروا دەستی کرد بە باسکردنی منداڵێکی بێتاوان. گوتی: «ئەو منداڵە بێتاوانە بۆ هەژارە؟ لەبەر خاتری ئەو منداڵە بەستەزمانەیە ئێستا دەچم بۆ سیبیریا. قاتڵ نیم، بەڵام دەبێ برِۆم بۆ سیبیریا!» مەبەستی لەو قسەیە چی بوو؟ کام منداڵی بێتاوان؟ من بەشبەحاڵی خۆم تێینەگەیشتم. کاتێک ئەو قسانەی دەکرد هۆن هۆن دەگریا. لە ناکاو ماچی کردم و خاچی کێشام. ئالیووشا، پێتوایە مەبەستی چی بووە؟ «منداڵی بێتاوان، کێیە؟»

ئالیووشا بە بزەیەکەوە گوتی: «رِەنگە مەبەستی رِاکیتین بێ، جاروبار دەچێ بۆ ملاقاتی. رِەنگە مەبەستی ئەوە بێ... کاری رِاکیتین نییە. دوێنێ میتیام نەدی. ئەمرِۆ دەچم بۆلای.»

گرووشنکا گوتی: «نا، رِاکیتین نییە. ئیوان فیدۆرۆویچی برای تووشی پەرِۆشیی کردووە. رِەنگە بەو هۆیەوە بێ، چونکە چووە بۆ ملاقاتی میتیا، ئەرێ رِەنگە هەر ئەوە بێ،» لە ناکاو بێدەنگبوو. ئالیووشا بەسەرسامی چاوی تێبرِی.

ـ ملاقاتی میتیا؟ بۆ چووە بۆ ملاقاتی؟ میتیا خۆی پێیگوتم کە ئیوان تاقە جارێکیش نەچووە بۆلای.

گرووشنکا سوورهەڵگەرِا بوو، بە پەرِۆشییەوە گوتی: «فەرموو... فەرموو! کچێکی گەوجم! ئاگام لە زمانی خۆم نییە! رِاوەستە ئالیووشا، بێدەنگبە! ئێستا کە سەری قسە کراوەتەوە، با هەموو هەقیقەتەکەت پێبڵێم ـ ئیوان دووجار چووە بۆ ملاقاتی، جاری هەوەڵ وەک ئەجەل گەیشتێ. هەڵبەت بە هەڵەداوان لە مۆسکۆوە هات، بەر لە نەخۆشییەکەی من. جاری دووهەمیش حەوتووی پێشوو بوو. بە میتیای گوت بە هیچ شێوەیەک بە تۆ نەڵێ، لە رِاستیدا بە هیچکەس نەڵێ، بە دزییەوە هاتبوو.»

ئالیووشا چووە فکرەوە. دیاربوو ئەو هەواڵە شوێنی لە سەر داناوە. پاشان لەسەرەخۆ گوتی: «ئیوان سەبارەت بە پەروەندەکەی میتیا هیچ بە من ناڵێ، لەم دوومانگەی ڕابردوودا زۆرکەم پێکەوە دواوین. هەروەختیش دەچم بۆلای تێکدەچێ، بۆیە سێ حەوتووە نەچووم بۆلای. ئەها!... ئەگەر حەوتووی پێشوو لەوێ بووبێ... دڵنیام ئەم حەوتووە میتیا گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە.»

گرووشنکا وەک ئەوەی قەبووڵیبێ گوتی: «گۆڕاوە، وایە. ئەوان ڕازێکیان لەنێواندایە! میتیا خۆی پێیگوتم ڕازێک هەیە، ئەویش ڕازێکی وا کە ئاراوقارای لێهەڵگرتووە. پێشتر شاد و لێو بەبزە بوو ـ لە ڕاستیدا ئێستاش هەروایە بەڵام کاتێک ئاوا سەری ڕادەوەشێنێ و بەنێو ژوورەکەدا پیاسە دەکا، بە دەستی ڕاستەی لەپەستا مووی لاجانگی خۆی دەکێشێ و هەڵیدەکەنێ... بۆی دەرکەوتووە کە ڕاست دەکا، ڕازێکیان لەنێوان دایە! ئەو پێشتر شاد بوو، ئەگەرچی ئەمڕۆش هەروا شاد و لێو بە بزە بوو.»

ـ بەڵام گوتت دڵەدوا بوو.

ـ ئەری دڵەدوا بوو بەڵام شادی دەنواند. لەپڕ ئاڵەتی دەبێ و پاشان دەست دەکا بە پێکەنین و هەر خێراش هەڵدەچێتەوە. دەڵێی هەوری بەهارە. ئالیووشا دەزانی بەجارێ تووشی سەرسووڕمانی کردووم ـ ئەگەرچی ئەو بەڵا گەورە هەڵیکوتاوەتە سەری، جاری وایە واپێدەکەنێ دەڵێی منداڵی ساوایە.

ـ ڕاستی بە تۆی گوت باسی ئیوان نەکەی؟ گوتی «بەو مەڵێ؟»

«ئەرێ، گوتی «بەو مەڵێ.» میتیا لە هەمووکەس زیاتر لە تۆ دەترسێ. چونکە ڕازێک لە گوڕێدایە، خۆی گوتی ڕازێکیان لەنێواندایە.» گرووشنکا بە تامەزرۆییەکی کتوپڕەوە داوایلێکرد: «ئالیووشای بەڕێز، بچۆ بۆلای و بزانە ئەو ڕازە چییە، پاشان وەرە پێمبڵێ، با دڵم بحەسێتەوە و بزانم ئەو چارەڕەشە چارەنووسی چۆن دەبێ و بە کوێ دەگا. هەر بۆ ئەوەش ناردم بەدواتدا.»

ـ پێتوایە مەسەلەکە پێوەندیی بە تۆوە هەیە؟ ئەگەر وا بوایە بە تۆی نەدەگوت ڕازێک لە گوڕێدایە.

ـ نازانم. ڕەنگە بیهەوێ پێمبڵێ، بەڵام ناوێرێ. وریاییم پێدەدا. دەڵێ ڕازێک هەیە، بەڵام پێمناڵێ چییە.

ـ بیروڕای چییە؟

ـ بیروڕای خۆم؟ پێموایە کاری من تەواو بووە. ئەو پیلانەش لە ژێر سەری هەرسێکیان دایە و دایان ڕشتووە. دەزانم کاتیاش دەستی تێیدایە. فیتی ئەوە دەزانم. کاتیا ئەو پیلانەی داڕشتووە و ئیتر من وەک ئەوم پێناکرێ. میتیا لەپێشدا ئاگادارم دەکاتەوە ـ وریاییم پێدەدا. خەریکە پیلانێک دادەڕێژێ بۆ ئەوەی لامبا لە سەر ڕێی خۆی. ڕازەکەش دەبێ ئەوە بێ. پێکەوە ئەو پیلانەیان داڕشتووە، بە هەرسێکیان، میتیا و کاتیا و ئیوان. ئالیووشا زۆر لەمێژە دەمویست لێتبپرسم. حەوتووی پێشوو لە ناکاو پێیگوتم ئیوان حەز لە کاتیا دەکا. چونکە زوو زوو دەچێ بۆ دیدەنیی. ئەو ڕاستییەی لای من درکاند. تۆ ویژدانی خۆت پێمبڵێ، میتیا بڵێی ڕاست بکا؟ ڕاستییەکەم پێبڵێ خەمت نەبێ دڵم نایەشێ.

ـ ڕاستت دەوێ، من پێم وانییە ئیوان ئاشقی کاترینا بووبێ.

ـ ڕاستت دەوێ خۆشم هەر وا بیر دەکەمەوە! کە وایە دەردەکەوێ ئەو هەتیوە بێچاووڕووە درۆی لەگەڵ کردووم! هەر لە ئێستاشەوە ئیرەیی بە من دەبا و دەیهەوێ هەموو دارەکان لەسەری مندا بشکێنێ. ئەو گەوجە، ئەو کارەی دەیکا نازانێ دیزە بە دەرخۆنەی پێبکا؛ خۆ دەزانی پێچوپەنای نییە و هیچ شتێک ناشارێتەوە... بەڵام بە خزمەتی دەگەم و پێیدەڵێم پووتێک چەن سیەسە! گوتی: «بڕوام پێبکە ئەو کارەم کرد.» ئەوەی بە من گوت، بە من. بەو وتەیە لۆمەی کردم! خودا لە تاوانی خۆشبێ! سەبرکە جا دەبینی لە کاتی دادگایی کردندا چدەکەم، دەبێ چێشتێک بۆ کاتیا لێنێم بستێکی ڕۆن لە سەر بێ! ئەو کاتە، تەنیا قسەیەک دەکەم... ئەو کاتە هەموو شتێک دەڵێم!

دیسانیش دەستیکردەوە بە گریان.

ئالیووشا، لەجێی خۆی هەستا و گوتی: «گرووشنکا دەتوانم ئەوەت بە دڵنیایی پێ بڵێم، سەرەتا دەتوانم بڵێم زۆری خۆشدەوێی، لە هەمووکەسی

زیاتر خۆش دەویێ. بڕوا بکە تەنیا هەر تۆ. دەزانم. لەوە خاترجەمم. هەروەها پێمخۆش نییە بە فێڵ و تەڵەکە قسەی لێداکێشم و ڕازەکەیم بۆ وەدەرکەوێ. بەڵام ئەگەر ئەمڕۆ بە مەیلی خۆی ڕازەکەیم پێبڵێ، ڕاست و ڕەوان پێیدەڵێم کە قەولم داوە بە تۆی بڵێم. لەڕێوە دێم بۆلات پێتدەڵێم بەڵام پێموایە... پێوەندیی بە کاترینا ئیواناوە نییە و ڕازەکە شتێکی دیکەیە. ئەمەش وەک ڕۆژ ڕوونە. پێموایە سەبارەت بە کاترینا ئیوانا هەر نییە. جارێ خوداحافیز.»

ئالیووشا تۆقەی لەگەڵ کرد. گرووشنکا هەروا دەگریا. ئالیووشا تێگەیشت کە گرووشنکا گوێی نەداوەتە دڵدانەوەکەی، بەڵام لەوەی کە کوڵوکۆی خۆی هەڵڕشت بوو و باسی ئەو مەسەلەی کردبوو، تا ڕادەیەک سووکنایی هات. ئالیووشا بەداخەوە بوو کە لە کاتێکی ئاوادا بەجێی دەهێڵێ، بەڵام بە پەلە بوو. هێشتا زۆری کار مابوو جێبەجێی بکا.

# (٢)

## لاق ئێشە

کاری سەرەکیی لە ماڵی مادام خۆخلاکۆف بوو، ئالیووشا بە پەلە ڕۆیشت بۆ ئەوێ تاکو بە زووترین کات کارەکەی جێبەجی بکا و دیدارەکەی لەگەڵ میتیا وەدرەنگ نەکەوێ. لە ماوەی سێ حەوتووی ڕابردوودا مادام خۆخلاکۆف تووشی لاقیەشە بووبوو: لاقی لەبەر هۆیەک ماسیبوو، ئەگەرچی لە جێدا نەکەوتبوو، لە بەیانییەوە تا ئێوارێ بە کراسێکی تەنک و گرانبایی و بە خشڵ و زەمبەرەوە لە ژوورەکەی خۆیدا لە سەر قەنەفەیەک پاڵیدەدایەوە. جارێک ئالیووشا بە چاوێکی پاک و منداڵانەوە تێگەیشتبوو کە مادام خۆخلاکۆف سەرەڕای نەخۆشییەکەی دەستیکردەوە بە تەڕپۆشی و خۆ ڕازاندنەوە ـ شاڵ و کەمەرە و عەبای فشوفۆڵی لەخۆی دەپێچا و ئالیووشا لەو بیرۆکە تەمومژاوییە نەدەگەیشت، ئەگەرچی ئەو بیرۆکەیەی وەک بیرۆکەیەکی حەپۆلانە دەزانی و زۆری گوێ نەدەدایە. لە ماوەی دوو مانگی ڕابردوودا پێرخۆتین بەردەوام هاموشۆی ماڵی مادام خۆخلاکۆفی دەکرد. ئالیووشا چوار ڕۆژ بوو نەچووبوو بۆ ئەوێ. پەلەی ئەوەی بوو ڕاست بچێ بۆلای لیزا، چونکە دەبوو قسەی لەگەڵ بکا. لیزاش ڕۆژی پێشوو کڵفەتێکی ناردبوو بۆلای ئالیووشا و داوای لێکردبوو «سەبارەت بە مەسەلەیەکی زۆر گرینگ» دەیهەوێ چاوی پێیبکەوێ. داخوازییەک کە لەبەر چەن هۆیەک بە قازانجی ئالیووشا بوو. بەڵام کاتێک کڵفەتەکەی چوو هەواڵی هاتنی ئالیووشا بە لیزا ڕاگەیێنێ، مادام خۆخلاکۆف هەواڵی هاتنەکەی لە کەسێک بیست و ناردی تاکو داوا لە ئالیووشا بکا بچێ بۆلای. ئالیووشا لە دڵی خۆیدا

بیریکـردەوە واچاکـە داخوازییـەکـەی مـادام خۆخلاکـۆف بـەجێبێنـێ. دەنـا دەمودەست کەسێک دەنێرێ بۆ وەتاغەکەی لیزا. مادام خۆخلاکۆف لە سەر قەنەفەکە پاڵیدابۆوە. جلوبەرگی جوان و ڕازاوەی لەبەر کردبوو و دیاربوو تووڕە و شڵەژاوە. بە دەنگێکی بەرز و پڕ نەشە بەخێرهاتنی ئالیووشای کرد.

«لـەوکاتـەوە تـۆم دیتـووە، سـەدەیـەک، سـەدەیـەکـی تـەواو تێپـەڕیـوە! حەوتوویەکی ڕەبەقە چاوم پێت نەکەوتووە ـ تەنیا بیری لێبکەوە! ئاخ، بەڵام چوار ڕۆژ لەمەوبەر، ڕۆژی چوارشەممە، لێرە بووی، هاتبووی بۆ دەیدەنیی لیزا. دڵنیام دەتویست بە پێدزکە بچیتە ژوورەکەی، وابچی هیچکەس گوێی لە ترپەی پێت نـەبێ، ئالکسی گیان، خۆزگـە دەتزانـی چـەندەی بۆ بـە پـەرۆشـم! بـەڵام ئـەوە هـەڵدەگرم بۆ دوایی. ئـەگـەرچی گرینگترین مـەسـەلـەیـە، بـەڵام هەڵیدەگرم بۆ دوایی. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ گیان، لە بابەت لیزاوە ئیمانێکی تەواوم بە تۆ هـەیە. لـە کاتی مـەرگی باوە زووسیماوە ـ خودا لێیخۆشبێ و ڕۆحی شاد!» (مادام خۆخلاکۆف خاچی خۆی کێشا) «وەک ڕاهیبێک چاو لە تۆ دەکەم، ئەگەرچی بەو جلوبەرگە تازەوە زۆرجوانی و لێت دەکاڵێتەوە. ئەو بەرگ درووەت لە کوێ پەیدا کرد؟ نا، نا، مەبەستی سەرەکی ئەمە نییە ـ ئـەوەش دادەنـێم بـۆ دوایـی. بمبـوورە ئـەگـەر هێنـدێ جـار بـە ئالیووشـا بانگتدەکەم.» نەرمە بزەیەکی هاتێ و گوتی: «پیرێژنێکی وەک من دەتوانێ ئـەو ئیزنـە بەخـۆی بدا. بەڵام ئـەوەش هـەڵدەگرم بۆ دوایی. گرینگ ئـەوەیە لەبیرم نەچێ چ شتێک گرینگە. تکات لێدەکەم خۆت وەبیرم بێنەوە. هـەر بۆت دەرکەوت خەریکم درێژەدادڕی دەکەم و قسە دەپەڕێنم، خێرا بڵێ «مەسەلەی گرینگ؟» ئاخ، ئێستا چۆن بزانم چی لە هەموو شتێک گرینگترە؟ لەو کاتەوە لیزا لە قەولەکەی خۆی پاشگەز بۆوە ـ قەولە مناڵانەکەی ـ کە شوو بکا بە تۆ ئالکسی فیۆدۆرۆویچ. هـەڵبـەت دەشزانی کە تـەنیا بۆچوونێکی عـەجوولانـەی مناڵێکی نەخۆشبوو کە ماوەیەکی درێژخایەن نەیتوانیوە بەڕێدا بڕوا لەسایی خـوداوە ئێـستا دەتـوانێ هـەسـتێ!... ئـەو دوکتـۆرە تـازەی کاتیـا بـۆ بـرا چارەڕەشەکەتی هێناوە، هەر ئەوەی کە سبەینێ... بەڵام بۆ باسی سبەینێ

دەکەم؟ لەوانەیە فکر و خەیاڵی سبەینێ دیقم پێبکا. خەریکە کونچکاوی بمکوژێ... وەلحاسڵ ئەو دوکتۆرە دوێنێ لەلامان بوو لیزای معایەنە کرد... پەنجا ڕۆبڵی بۆ ئەو معایەنەیە لێساندین. بەڵام خاڵی گرینگ ئەمە نییە، دیسان دەیڵێمەوە خاڵی گرینگ ئەمە نییە. دیوتە، خەریکم هەموو شتەکان تێکەڵدەکەم. هێندە بە پەلە و هەڵەشەم، خۆشم نازانم چدەکەم، بۆچی ئاوا بە پەلەشم؟ نازانم. خەریکم وام لێدێ وردە وردە توانایی تێگەیشتنم نەمێنێ. دەڵێی هەموو شتەکانم لێبۆتە گرێکوێرە و بۆم ناکرێتەوە. دەترسم لە حەیبەت ئەو خەفەت و داخە تێیتەقێنی و ئێتر بەم هەرد و مەکانەدا نەیەیتەوە. خودایە گیان! بۆ لێرە دانیشتووین و پیاڵەیەک قاوە نییە بیخۆینەوە؟ یۆلیا، گلافیرا، قاوە!»

ئالیووشا بە پەلە سپاسی لێکرد و گوتی هەر ئێستا قاوەی خواردۆتەوە.

- لە کوێ؟

- لە ماڵی ئاگرافنا ئەلکساندرفنا.

- لە... ماڵی ئەو ژنە؟ ئاخ، هەر ئەوە عالەمی تووشی کێشە و نەگبەتی کردووە. ڕەنگە لەوە بچێ سەبارەت بەوە هیچ نەزانم. دەڵێن بۆتە قەدیس، ئەگەر تاڕادەیەکیش کاتی بەسەرچووە و بۆ ئەو کارە درەنگە. واچاک بوو پێشتر ئەو کارە بکا. ئێستا ئیتر چ کەڵکێکی هەیە؟ وست بە وست ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، چونکە هێندەم قسە بۆ گوتن پێیە لەگەڵ تۆدا، دەترسم فریای نیوەشی نەکەوم. ئەم دادگاییە پڕشوورەییە... حەتمەن دەچم بۆ ئەو داداگاییە، خەریکم خۆمی بۆ حازر دەکەم. چەند کڵفەت لەگەڵ خۆم دێنم. خۆ زانیوتە منیش یەکێک لە شاهیدەکانم. دەمەوێ بڵێم چی، دەبێ چۆن قسە بکەم؟ خوشم نازانم دەبێ چ بڵێم. چونکە پیاو دەبێ سوێند بخوا، وانییە؟

- بەڵێ، بەڵام پێموانییە بتوانی بچی.

- دەتوانم تا دەرنگانێ بەخەبەر بم و نەخەوم. ئاخ، وادیارە وەڕەزم کردی؛ پەکو! دادگایی کردن، ئەوە کاری جڕوجانەوەرانە و ئەم حەزەراتەش کە دەیانهەوێ بچن بۆ سیبیریا و تاقمێکیش دەیانهەوێ زەماوەند بکەن، ئەویش

ئەوەندە خێرا، ئەوەندە خێرا کە هەموو شتێک ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێ و ئاخری ـ هیچ. هەموو پیر دەبن و لە چاوەڕوانیی مەرگدا دادەنیشن. دەی با وابێ! ماندوو بووم. ئەم کاتیایە، Gette charmante Personne هەموو ئارەزووەکانی بەبا دام و تووشی هیوابڕوایی کردم. ئێستا دەیهەوێ بەدوای دیمیتری فیۆدۆرۆویچی براتدا بچێ بۆ سیبیریا، براکەی دیکەشت دەیهەوێ بەدوایدا بڕوا و لە نزیکترین شار نیشتەجێ بێ و هەموویان یەکتر ئازار بدەن. ئەو مەسەلەیە بەڕاستی شێتمدەکا. لە هەمووشی خراپتر ـ تەوەزەلی و خوێڕییەتییە. ئەو بەسەرهاتە یەکملوێن جار زیاتر لە مۆسکۆ و پترزبۆرگ لە ڕۆژنامەکاندا باسیکراوە. ئاخ! ئەرێ باوەڕ دەکەی، لە شوێنێکدا هاتووە کە من «دۆستی خۆشەویست» نازانم چی... براکەت، نامەوێ ئەو نەقڵە ترسناکە دووپاتکەمەوە. تەنیا بیری لێبکەوە و بیهێنە بەرچاوی خۆت، هەر ئەوەندە بیهێنە بەر زەینی خۆت!

ـ مەحاڵە! لە کوێدا هاتووە؟ چییان نووسیبوو؟

ـ هەر ئێستا پیشانتی دەدەم. دوێنێ ڕۆژنامەکەم بەدەست گەیشت و خوێندمەوە. ئەوەتا، لە ڕۆژنامەی «دەنگۆ»ی پترزبۆرگدا چاپبووە. ئەم ڕۆژنامەیە هەر ئەمساڵ ئیزنی چاپ و بڵاوکردنەوەی وەرگرتووە. من هۆگرییەکی زۆرم بە دەنگۆ هەیە و خۆم ئابوونە کردووە، ئێستاش ئاکامی دەنگۆ ئەمەیە! بەهۆی ناوچاوە ڕەشەکەی خۆمەوەیە. ئەوەتا، لەم بەشەیدایە. بیخوێنەوە.

پەڕەی ڕۆژنامەیەکی لە ژێر باڵنجەکەی دەرهێنا و دای بە ئالیووشا.

مەسەلەکە ڕاست و ڕەوان ئەمە نەبوو کە مادام خۆخلاکۆف ئاوا پێی شڵەژا بوو، ئەو داماوی دەنواند، ڕەنگە بە ڕاستیش هەموو شتێک لە زەینیدا وەک ماشەرێکی ئاڵۆزاوی لێهاتبێ. نووسراوەکە وەک دەنگۆیەکی گەورە وابوو، وێدەچوو زەبرێکی قورسی لێدا، بەڵام ڕەنگە بەختەوەرانە لەو کاتەدا

---

١- ئەو شۆخە دڵڕفێنە.

نەتوانێ شەشدانگی هۆشی لە سەر ئەو مەسەلەیە کۆکاتەوە، بویە وێدەچوو زەینی بۆلایەکی دیکە کێشرابێ و ڕۆژنامەکەی بەجارێ لەبیر چووبێتەوە.

ئالیووشا بە باشی دەیزانی کە داستانی ئەو پەروەندەیە لە سەرتاسەری ڕووسیادا دەنگی داوەتەوە هەرا و هەنگامەی ساز کردووە. خودایە گیان لە ماوەی ئەو دوو مانگەدا چەندەی ڕاپۆڕت و هەواڵی درۆ و پڕ شاتوشووت لەبارەی براکەیەوە، لەبارەی تەواوی بنەماڵەی کارامازۆفەوە و تەنانەت لەبارەی خۆشییەوە خوێند بۆوە. تەنانەت لە ڕۆژنامەیەکیاندا هاتبوو کە ئەو بەهۆی ئەو جینایەتە سامناکەی براکەیەوە پەنای بردووە بۆ کەنیسە و بۆتە ڕاهیب. لە ڕۆژنامەیەکی دیکەدا ئەو مەسەلەیە بە درۆ خرابۆوە و نووسرابوو کە ئەو و پیرەکەی، واتە باوە زووسیما، زێڕ و جەواهێراتی کەنیسەیان بە تاڵان بردووە و «هەڵاتوون و کلێسەیان بەجێهێشتووە.» ئەم نووسراوەیەی لەو لاپەڕەی ڕۆژنامەی "دەنگۆ"دا هاتبوو ئەمە بوو: «پەروەندەی کارامازۆف لە ئیسکۆتۆپریگۆنی یۆفسیک»دا. (مخابن! ئەمە ناوی شارە چکۆلەکەی ئێمە بوو. تا ئێستا ئاشکرام نەکردبوو.) بابەتێکی کورت بوو، ڕاستەوخۆ ناوی مادام خۆخلاکۆف لەو نووسراوەدا هاتبوو. لە ڕاستیدا ناوی کەسی تێدا نەهاتبوو. تەنیا نووسرابوو کە جینایەتکار، دادگاییەکەی خەڵکی تووشی شڵەژان کردووە سەروانی لە سەر کار دەرکراوی تەرتەش، خۆپەرستێکی بەرەڵڵا و خوێڕی و دواکەوتوو ـ بەردەوام بەدوای پیلان و دەهۆی ئەشق و دڵدارییەوە بووە و بە تایبەت لە دڵی تاقمێک خاتووندا «کە لە گۆشەی بێکەسیدا دەسووتێن» جێی خۆی کردۆتەوە. یەکێ لەو خاتوونانە بێوەژنێکی دڵسووتاوە ئەگەرچی کچێکی عازەبی هەیە، هەوڵ دەدا خۆی جوان و جحێڵ نیشاندا. وا ئاشق و شەیدای ئەو دەبێ کە ڕاست دوو سەعات بەر لە جینایەتەکە، پێشنیاری سێ هەزار ڕۆبڵی پێدەکا، بەو شەرتەی پێکەوە هەڵێن و وەدوای کانگای زێڕ کەون. بەڵام جینایەتکار کە ئاکامی سزای ئەو هەڵاتنەی لێکدابۆوە، بەجێی ئەوەی لەگەڵ ئەو خاتوونە گەڕاوە و دڵسۆوتاوە

---

٢- ئەم ناوە بە مانای "مۆڵگەی ئاژەڵان"ە.

بەرەو سیبیریا ڕاکا، بڕیار دەدا باوکی بکووژێ و ببێتە خاوەنی سێهەزار ڕۆبڵ. ئەو بابەتە قۆشمە و هەرزانەیە ڕق و کولۆکوی سەبارەت بەو ناپاکی و باوککوژییە و دامەزراوەی لێکهەڵوەشاوەی بەردەدارییی لێهەڵدەقولا. ئالیووشا ئەو نووسراوەی بە کونچکاوییەکی زۆرەوە خوێندەوە، پاشان دووقەدی کرد و دایەوە دەست مادام خۆخلاکۆف.

مادام خۆخلاکۆف دیسان بە پەلە گوتی: «دەی وێدەچێ ئەو خاتوونە من بم. مەعلوومیشە کە مەبەستی منە. سەعاتێکی تەواویش لەلام نەبوو کە ئەو پێشنیارەی کانگای زێڕم پێکرد. کەچی هەستاون باسی «گەڕاوەی دڵسووتاو» دەکەن. وەک ئەوەی فکر و زیکرم هەر ئەوە بووبێ! ئەوەیان بە ڕقەوە نووسیوە. خودای گەورە لەبەر خاتری «گەڕاوەیەکی دڵسووتاو» بیبەخشێ، هەروەک خۆشم لێیخۆش دەبم! خۆ دەزانی ئەو، دەزانی کێیە؟ ڕاکیتینی هاوڕێتە.»

ئالیووشا گوتی: «ڕەنگە وابێ، بەڵام هیچم لەوبارەوە نەبیستووە.»

ـ ئەوە ئەو، «ڕەنگەی» ناوێ. خۆ دەزانی لە ماڵێ وەدەرم نا. سەرلەبەری داستانەکەش دەزانی، وانییە؟

ـ دەزانم داوات لێکرد ئیتر پێی بە ماڵەکەتدا نەیە، بەڵام نەمبیستووە بۆ... لانیکەم لە ئێوەم نەبیستووە.

ـ ئاخ، کەوایە لەوت بیستووە! پێموایە زۆری جنێو پێداوم و بەجارێ تەپوتۆزی لێهەستاندووم.

ـ بەڵێ جنێوت پێدەدا، بەڵام جنێو بە هەمووکەس هەر دەدا. بەڵام ئەوەی بۆ دەستت لێداشتووە، لە خۆشیم نەبیستووە، ڕاستت دەوێ، هەر چاوم پێی ناکەوێ. ئیتر پێکەوە هاوڕێ نیین.

ـ ئێستا کەوایە، تەواوی بەسەرهاتەکەت بۆ دەگێڕمەوە. لە تۆبەش زیاتر چارەیەکی دیکەمان نییە، چونکە شتێک هەیە لەو مەسەلەیەدا ڕەنگە خەتاکەی لە ئەستۆی من بێ. تەنیا خەتایەکی چکۆلە، ئەوەندە چکۆلە و بێبایەخ کە ڕەنگە پیاو هەر هەمیەتێکی پێنەدا. بڕوانە کوڕە خۆشەویستەکەم ـ (مادام

خۆخلاکۆف کتوپڕ زەردەیەکی دڵڕفێن و زیرەکانە و مانادار نیشتە سەرلێوی)
- بڕوانە، پێموایە... نا، نا؛ تەواو بە پێچەوانە. ئێستا جۆرێک لەگەڵتا دەدوێم
وەک ئەوەی باوکم بی - چونکە دایک لێرەدا هیچ ڕۆڵێکی نییە. وەک ئەوە وایە
لەبەردەم باوە زووسیمادا ڕاوەستابێتم و خەریکی دانپیانان و تۆبەکردن بم،
ئەریٚ ڕاست وایە. هەر ئێستا پێمگوتی ڕاهیب. لە لایەکیشەوە ئەو لاوە داماوە،
ڕاکیتینی برادەرت (خودایە بمانبوورە! ناتوانم ڕقم لێیبیٚ و لەدەستی قەڵس بم،
تووڕەش هەم، بەڵام نەک زۆر)، ئەو لاوە سەرەڕۆیە، بڕوا دەکەی هەوا لە
کەللەی داوە و دڵی بە منەوەیە. لەم دواییانەدا تێگەیشتم. سەرەتا مانگیٚ
لەمەوبەر- لەپەستا دەهات بۆ دیدەنیم، ڕۆژیٚ جارێک هەر دەهات؛ هەڵبەت
پێشتریش ئاشنایەتیمان بوو. من ئاگام لەو مەسەلەیە نەبوو... لە ناکاو بۆم
دەرکەوت، بە شێوەیەکی سەیر تێگەیشتم. دوومانگ لەمەوبەر ئەو لاوە
خاکەڕا و جوانچاک و بیٚوێنەیە، پیووتێرتیلیچ پێرخۆتین کە لەم شارەی ئێمە
کارمەندە، پێی بۆ ماڵی ئێمە کراوە و دەستیکرد بە هاموشۆ. خۆت زۆر جارت
لێرە دیوە. لاوێکی بێوێنە و دروستکارە، وانییە؟ هەموو ڕۆژیٚ نایە. سیٚ ڕۆژ
جارێک دیٚ (ئەگەرچی پێمخۆشە هەموو ڕۆژێک بیٚ) هەمیشە بە جلوبەرگی
خاوێن و ڕێکوپێکەوە دیٚ. لەسەریەک، من لاوانی خاکەڕا و بەمرخی وەک
ئێوەم خۆشدەویٚ. پێرخۆتین زەینێکی ڕوونی هەیە و وەک پیاوێکی سیاسی
زیرەک و لێزانە، قسەکانی زۆر سەرنجڕاکێشە و لە دڵدەنیشیٚ. من بە ڕاستی
پێمخۆشە پشتگیریی لێبکەم و پلە و پایەی بچێتە سەریٚ، چونکە دڵنیام یەکێک
لە پیاوانی سیاسی داهاتوومانە. ئەو شەوە هات و لەوکاتە سامناکەدا لە
مەرگ ڕزگاریکردم. ڕاکیتینی برادەریشت هەر بەو پۆستاڵە پیسانەیەوە،
دەپەڕێتە ژووریٚ و بە سەر فەڕش و ڕاخەرەکاندا دەڕوا... وەلحاسڵ
دەستیکرد بە ئیشارەکردن و خۆشیرین کردن. ڕۆژێکیان کاتی ڕۆیشتن توند
دەستیگوشیم. ڕاست دوای ئەوەی ئاوا دەستیگوشیم، لاقم کەوتە ژان و
ماسی. پێشتر لێرە پیوتێر ئیلیچی دیبوو، بڕوا بکە بەردەوام دەیویست
بیٚبوغزێنیٚ و قسەی ناخۆشی بە گورچوودا دەدا.منیش چاوم لە

هەڵسووکەوتیان دەکرد و لە دڵی خۆمدا پێیان پێدەکەنیم. جارێک ئالێرە دانیشتبووم، تەنیا بووم ـ نا، ڕاکشابووم، ئەریٚ ئالێرە بە تەنیا ڕاکشابووم، لە ناکاو ڕاکیتین خۆی کرد بە ژووریدا، جا بیهێنە بەر زەینی خۆت! شیعرێکی بۆ لاقئێشەکەم دانابوو ـ شیعرێکی کورت بوو: شیعرەکەی بەلاقی مندا هەڵگوتبوو.

ڕاوەستە بزانم لەبیرم ماوە چۆن دەستپێدەکرد؟

لاقێکی سپی و دلْڕفێن و جوان

داخی داخانم بۆ وا کەوتە ژان

شیعرەکە ئاوای دەستپێدەکرد. بەڵام من شیعرم بۆ لەبەر ناکریٚ. دەستنووسەکەم لایە، پاشان پیشانتیدەدەم. شیعرێکی جوانە زۆر جوانە تەنیا سەبارەت بە لاق نییە، ئاکامێکی ئەخلاقیشی تێدایە جێی سەرنجە، بەڵام لەبیرم نییە. لە ڕاستیدا بابەتی ئەوەیە لە دەفتەری بیرەوەریدا بینووسی. سپاسم لێکرد و دیاربوو ئەویش زۆر خۆشحاڵ بوو. هێشتا سپاس و دستخۆش پێگوتنەکەم تەواو نەبوو بوو، پیووتێر ئیلیچ پێرخۆتین وەژوور کەوت، لەپڕ میخاییل ئیوانۆویچ ڕاکیتین وەک خەڵووز ڕەش داگەڕا. بۆی دەرکەوت پیووتێر ئیلیچ بە ڕەقیبی خۆی دەزانی و هەلەکەی لێتێکداوە. چونکە دەمزانی میخاییل ئیوانۆویچ دەیویست دوای خوێندنەوەی شیعرەکە شتێکم پێبڵیٚ. لەخۆڕا لە دلْمی دابوو قسەیەکی بەدەستەوەیە. بەڵام پیووتێر ئیلیچ هات و لێی تێکدا. شیعرەکەم نیشانی پیووتێر ئیلیچ دا بەڵام نەمکوت هۆنەرەکەی کێیە. دڵنیاشم، دڵنیام کە هەستیکرد هی کێیە، ئەگەرچی هەتا ئەمڕۆ ڕاستیی ئەو شتەی نەگوتووە و دەڵیٚ نەمزانیوە هی کێیە. بەڵام بە قەستی وا دەڵیٚ. دوای بیستنی شیعرەکە پیووتێر ئیلیچ دای لە قاقای پێکەنین و دەستیکرد بە ڕەخنە و عەیب و ئیرادگرتن لە شیعرەکە. بە پێکەنینەوە گوتی: «ئەوە شیعر لەکویٚ بوو، تەنیا چەن وشەی قۆڕ و بێناوەڕۆکە ڕیزکراوە، ڕەنگە هۆنراوەی خوێندکارێکی ئاییني بیٚ.» ئەوەشی هێندە توند و ڕووشکێنانە گوت هەر باسی مەکە! پاشان ڕاکیتینی برادەرت بەجێی پێکەنین، تووڕە بوو. لە دڵی

خۆمدا گوتم: «خودایە گیان، ئێستا ئانگژای یەک دەبن.» گوتی: «ئەو شیعرە من دامناوە. وەک گاڵتەوگەپێک هۆنیومەتەوە. چونکە هونینەوەی شیعر بە کەسری شانی خۆم دەزانم... بەڵام ئەمە شیعری چاکە. پووشکین لەبەر ئەوەی شیعری بۆ پەلوپووزی ناسکی ژنان نووسیوە، دەیانهەوێ کۆتەڵی بۆ سازکەن، منیش لەو شیعرەدا ویستوومە ئاوڕ لە ئامانجێکی ئەخلاقی بدەمەوە، ئێوەش دیارە لایەنگری بەردەدارین. بیرۆکەی مرۆڤدۆستانەتان نییە. خاوەنی هەستێکی نوێ و بیرێکی ڕووناکیش نیت. دیارە ژیار و شارستانییەت هیچ شوێنێکی لە سەر تۆ دانەناوە. کارمەندیکی سادەی و خەریکی بەرتیل وەرگرتنی.»

پاشان من دەستمکرد بە قیژاندن و پاڕانەوە لێیان. دەشزانی پیوتێر ئیلیچ هەرشتێک بێ، ترسەنۆک نییە. کتوپڕ بە لەبزێکی ئاغایانە و ڕوانینێکی تەوساوی، گوێی ڕاگرت و داوای لێبوردنی کرد. گوتی: «نەمدەزانی. ئەگەر بشمزانیبایە نەمدەگوت. تاریفم لێدەکرد. شاعیران هەموو تووڕەن.» ولحاسڵ لە توێی قسەکانیدا بەشێوەیەکی لووتبەرزانە پێیپێکەنی. خۆی دواتر پێیگوتم کە قسەکانی تەوس و توانجی پێوە بووە. بەڵام من پێموابوو لە قسەکانیدا سادقە. هەروا کە لێرەدا ڕاکشابووم، وەک ئێستا کە بەرەوڕووی تۆ پاڵم داوەتەوە، بە خۆمم گوت: «ئەرێ بڵێی کارێکی دروستبێ میخاییل ئیوانۆویچ دەرکەم، لە سەر ئەوەی لە ماڵەکەی مندا بەشێوەیەکی ناحەز بە سەر میوانەکەمدا دەنەڕێنێ؟» بڕوا بکە هەر لەم جێیەی ئێستامدا کە پاڵمداوەتەوە، چاوم قووچاند و لە خۆمم پرسی: «بڵێی کارێکی دروستبێ یان نا. هەر خۆم خواردەوە دانم بەخۆما گرت لەوانەبوو دڵم شەقبەرێ. دڵەکوتەم پێکەتبوو و نەمدەتوانی بڕیار بدەم کە هاوار بکەم یان نا. دەتگوت دەنگێک پێیگوتم: «قسە بکە»، دەنگێکی دیکە گوتی: «نا قسە مەکە.» بەڵام هەر دوابەدوای دەنگی دووهەم قیژاندم و لە هۆش خۆم چووم. هەڵبەت قڕە و هەرا سازبوو. لە ناکاو هەستام و بە میخاییل ئیوانۆویچم گوت: «وتنی ئەو قسە بۆ من زۆر تاڵ و دژوارە، بەڵام ئیتر نامەوێ سەر بە ماڵمدا بکەیتەوە.» بەو شێوەیە

دەرم کرد. ئاخ! ئالکسی فیدۆرۆویچ، خۆم دەزانم کارێکی خراپم کرد. سەرم خستە سەری. ڕاستت دەوێ لە دەستی جاڕز نەبوو بووم. بەڵام لە ناکاو ترسام هەرا و بەزمێک لە ماڵەکەمدا ساز کەن و ئابڕووچوونی لێبکەوێتەوە... لەگەڵ ئەوانەشدا بڕوا بکە، هۆشم لەسەرخۆ بوو. چونکە دوای ئەوە چەند ڕۆژ گریام و فرمێسکم هەڵوەراند. بەڵام لە ناکاو، دوانیوەڕۆیەک هەموو ماجەراکەم لەبیر بردەوە. دوو حەوتوو بە سەر ئەو کاتەدا تێپەڕیوە و لە پەستا لە خۆم دەپرسم بڵێی دیسان بێتەوە یان نا؟ تەنانەت دوێنێش ئەو پرسیارەم لە خۆم کردەوە. کە دوێشەو کتوپڕ ئەم ڕۆژنامەیەم بەدەست گەیشت. کاتێک خوێندمەوە کەوتمە هەناسەبڕکێ، بڵێی کێ نووسیبێتی؟ حەتمەن ئەو نووسیویەتی. چۆتەوە ماڵێ، دانیشتووە و دەسبەجێ نووسیویەتی و ناردوویە، ئەوانیش چاپیان کردووە. خۆ دەزانی دوو حەوتوو لەمەوبەر بوو. بەڵام، ئالیووشا، زۆر خراپە هەروا لە سەری دەڕۆم و دەیرێسم و ئەوەی دەمەوێ بیڵێم هەر نایڵێم. ئاخ، ئەم وشانە هەر لەخۆڕا لە دەمم دەردەپەڕن!

ئالیووشا منجاندی: «بەلامەوە زۆر گرینگە کە ئەمڕۆکە لە کاتی خۆیدا بچم بۆ ملاقاتی کاکم.»

ـ حەتمەن، حەتمەن! وەرەوە و هەموو شتێکم بۆ بگێڕەوە. ئەرێ دەزانی ماخولیا چییە؟

ـ ئالیووشا بە سەرسووڕمانەوە پرسیی: «چی؟ ماخولیا؟»

ـ یاسایەکی دادگاکانە، من تازەم بیستووە، واتا کەسێک کە تووشی نەخۆشیی ماخولیا بێ هەر تاوانێک بکا لێی خۆشدەبن.

ـ مەبەستت چییە؟

ـ پێتدەڵێم. ئەم کاتیایە... پەکوو! چەندە مرۆڤێکی دڵڕفێن و شۆخوشەنگە، بەڵام هەر نەمزانی بە ڕاستی ئاشقی کێیە. ماوەیەک لەمەوبەر لەلام بوو ئەختوچارم کرد نەمتوانی قسەی لێداکێشم و لە بن زمانی دەرهێنم. بە تایبەتی ئێستا سەبارەت بە شتی زۆر ئاسایی و بەبایەخ قسەم لەگەڵ دەکا.

وەلحاسڵ هەمیشە سەبارەت بە سڵامەتیی من قسە دەکا. هەر لەو قسانە و هیچی تر، ئەویش بە چ زمانێک. بە خۆمم گوت: «قەیناکا، گوێی نادەمێ.»... ئاخ، خۆ من خەریک بووم باسی ماخولیام دەکرد. ئەو کابرا دوکتۆرە هاتووە. دەزانی دوکتۆرێک هاتووە؟ حەتمەن بیستووتە هەر ئەو شێتەکان دەدۆزێتەوە. تۆ نامەت بۆ نووسی؟ نا، تۆ نەبووی، کاتیا بۆی نووسی. هەموو کاری کاتیایە. خۆ دەزانی جاری وایە پیاو ئاقڵ و سەلار دانیشتووە و کتوپڕ تێکدەچێ و شێت و ماخولیا دەبێ. لەوانەیە هۆشیشی لەسەرخۆ بێ و بزانی چ دەکا، بەڵام هەر لەو کاتەدا ئاڵۆز و شێواو بێ. شکی تێدا نییە دیمیتری فیۆدۆرۆویچیش تووشی ئەو پەڕۆشی و ماخولیایە بووە. ئەو مەسەلەیەش لە دوای باش بوونی بارودۆخی دادگاکان دۆزرایەوە. هەمووی بە هۆی یاسا و ڕێسا بەڕێوجێکانی دادگاوەیە. دوکتۆر هات بۆ ئێرە و سەبارەت بەو ڕۆژە و سەبارەت بە کانگای ئاڵتوون پرسیاری لێکردم. پرسیی: «دیمیتری ئەو ڕۆژە لە چ حاڵێکدا بوو؟» حەتمەن تووشی ماخولیا بووە. بە هەرا و نەڕەنەڕ هاتە ژووریێ: «پارە، پارە، سێهەزار ڕوبڵ، سێهەزار ڕۆبڵم بدەیە!» پاشان ڕۆیشت و ئەو قەتڵەی کرد. گوتی: «نامەوێ بیکوژم،» پاشان چوو کوشتی. هەر لەبەر ئەوەش لێی خۆش دەبن، چونکە لەگەڵ ئەوەدا کە بەربەرەکانێی کرد لەگەڵ خۆیدا، خۆی پێڕاگیر نەکرا و کوشتی.

ئالیووشا تا ڕادەیەک بە توندی قسەکەی پێبڕی: «بەڵام نەیکوشت.» دڵەخورپە و بێتاقەتی جار لەگەڵ جار پەرۆش و بێئۆقرەتری دەکرد.

- ئەرێ، دەزانم ئەو کابرایە، گریگۆریی پیر کوشتی.

ئالیووشا گوتی: «گریگۆری؟»

ـ ئەرێ، ئەرێ؛ گریگۆری کوشتی. کاتێک دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لێیدا، کەوت بە عەرزیدا، پاشان هەستایەوە، دیتی دەرگاکە کراوەتەوە، ڕۆیشتە ژووریێ و فیۆدۆرپاولۆویچی کوشت.

- ئاخر بۆ، بۆچی؟

ـ شێتبووە. کاتێک دیمیتری فیۆدۆرۆویچ ئەو زەبرەی لە سەری داوە، دوای ماوەیەک کە وەهۆش دێتەوە، مێشکی تێک چووە: بۆیە چوو ئەو قەتڵەی کرد. بەڵام کە دەڵێ کاری ئەو نییە، زۆر وێدەچێ وەبیری نەیەتەوە. بەڵام دەزانی ئەگەر دیمیتری فیۆدۆرۆویچ کوشتبێتی، باشترە، زۆریش باشترە. دەبێ هەرواش بووبێ، ئەگەرچی دەڵێم کاری گریگۆری بووە. حەتمەن کاری دیمیتری بووە، ئەمەش باشترە، زۆریش باشترە! ئاخ! نەکئەوەی چاکییەکەی لەوە دابێ کە کوڕێک باوکی خۆی کوشتووە، لایەنگری لەو کارە ناکەم. منداڵ دەبێ ڕێز لە دایک و باوکی بگرێ، سەرەڕای ئەوەش ئەگەر کاری ئەو بووبێ، چاکترە، چونکە ئەو کاتە گریان و ڕۆڕۆی بۆ ناکا، دیارە ئەو کارەشی کاتێک کردووە هۆشی لە سەر خۆی نەبووە، یان هۆشی لە سەر خۆی بووە بەڵام نەیزانیوە چ دەکا. با لێی خۆشبن ـ ئەوەش کارێکی مرۆڤانەیە و دەردەکەوێ قانوونی دادگاکان زۆر باش و عادلانەیە. من ئاگام لەوە نەبوو، بەڵام دەڵێن ماوەیەکی زۆرە ئەو یاسایە بەڕێوە دەچێ. دوێنێ کە لەو شتە ئاگادار بووم یەکجار زۆرم پێخۆشبوو، ویستم هەر لەڕێوە بنێرم بە دواتا. ئەگەر ئازادیان کرد، پێیبڵێ بۆ نانی نیوەڕۆ لە دادگاوە ڕاست بێ بۆ ئێرە، منیش هەموو دۆست و ئاشنایان کۆ دەکەمەوە و جێژنێکی باشی بۆ دەگرم و بە سەلامەتیی ئەو قانوونەی دادگا مەی فڕدەکەین. پێموانییە جێی مەترسی بێ. لەگەڵ ئەوەشدا کەسانێکی زۆر بانگهێشت دەکەم، ئەگەر زانیمان دەیهەوێ پەل ببزێوی، بیگرن و وەدەری نێن. پاشان دەکرێ لە شارێکی دیکە لێپرسینەوەی شتێک بکرێ، چونکە ئەو کەسانەی کە گرفتارییان بۆ پێش هاتووە، چاکترین قازی و دادوەریان لێدەردەچێ. لەگەڵ ئەوەشدا، لەم سەردەمەدا کەم کەس هەیە تووشی ماخولیا نەبێ! ـ تۆ، من، هەموومان بە شێوەیەک ئەو شێتی و ماخولیاییەمان لەگەڵدایە. نموونەی زۆریشمان لەدەستدایە: پیاوێک دانیشتووە و گۆرانی دەڵێ، لە ناکاو هەست بە ئازار دەکا، دەمانچەکەی دەردێنێ یەکەم کەس کە تووشی دەبێ حەیاتی لێدەبڕێ، لە سەر ئەو کارەی هیچ کەسیش لۆمەی ناکا. لەم بەینانەدا ئەوەم خوێندەوە،

هەموو دوکتۆرەکانیش سەلماندوویانە. دوکتۆرەکان بەردەوام خەریکی سەلماندنی ئەو شتانەن؛ هەموو شتێک دەسەلمێنن. هەر ئەم لیزایەی کچم ماخولیایە. دوێنی دیسان وەگریانی خستم. پێریش هەروەتر. ئەمڕۆ لە ناکاو تێگەیشتم هەموو ئەوانە پێوەندیی بەو ماخولیا بوونەوە هەیە. ئاخ، لیزا ئاخری دیقم پێدەکا! پێموایە شێتێکە ئاو ناپاڵێوێ. بۆ ناردی بەدواتا؟ ناردی بەدواتدا، یان بە مەیلی خۆت هاتی؟

ئالیووشا قورس و قایم هەستا سەرپێ: «ئەرێ، ناردی بەدوامدا و هەر ئێستا دەچم بۆلای.»

مادام خۆخلاکۆف لە ناکاو دای لە پرمەی گریان و گوتی: «ئاخ، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ گیان، ڕەنگە ئەوەی زۆر گرینگە هەر ئەمە بێ. خۆ دەزانی لە چاوم زیاتر متمانەم پێتە و گرینگ نییە لیزا بە دزییی دایکییەوە ناردوویە بەدواتا. بەڵام بمبوورە، ناتوانم هەروا بە ئاسانی متمانە بە ئیوانی برات بکەم و ئیزنی بدەم بێ بۆ لای کچەکەم. ئەگەرچی هێشتاش بە لاوێکی جوامێر و خاوەن کەسایەتیی دەزانم. بەڵام بیری لێبکەوە هاتووە بۆ دیدەنیی لیزا و من ئاگام لێنەبووە!»

ئالیووشا لەڕادە بەدەر سەری سووڕما: «چۆن؟ چی؟ کەنگێ؟» ئەو ئیتر دانەنیشتبوو، بە پێوە گوێی ڕاگرتبوو.

- پێتدەڵێم، ڕەنگە هەر لەبەر ئەمەبێ کە داوام لێکردی بێی بۆ ئێرە، چونکە ئێستا نازانم بۆ بە پێویستم زانی بێی. ئیوان فیۆدۆرۆویچیش لەوەتا لە مۆسکۆ هاتۆتەوە، تەنیا دوو جار سەردانی کردووم. یەکەم جار وەک دۆستێک هات بۆ لام، دووهەم جاریش لەو دواییانەدا، کاتیاش لێرە بوو کە هات، پێموا بیستبووی کاتیا لێرەیە. هەڵبەت سەرەڕای گرفتارییەکی زۆر، چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد ئەوەندە بێت بۆ ئێرە.

Vous compernez, cette affair ret la mort terrible de votre papa

---

٣- خۆ تێدەگەی، هەر ئەو مەسەلە سامناکەی مەرگی باوکت.

بەڵام لە ناکاو بیستم دیسان هاتووە بۆ ئێرە، ئەویش نەک بۆ دیدەنیی من، بەڵکو بۆ دیدەنیی لیزا. شەش ڕۆژ لەمەوبەر بوو. هاتبوو پێنج دەقیقە دانیشتبوو. دواتر لە گلافیرام بیست کە هاتووە و خێرا ڕۆیشتووە. کاتێ ئەوەم بیست وەک بە کوتک بەسەرمادەن وابوو. لەڕێوە ناردم بەدوای لیزادا. بە پێکەنینەوە گوتی: «پێیوابوو خەوتووی، هات بۆ لای من تاکو هەواڵت بپرسێ.» هەڵبەت ڕووداوەکە ڕاست ئەوە بووە. بەڵام هاوار لە دەست لیزا، نازانی چەندەم ئازار دەدا! باوەڕ دەکەی شەوێک، چوار ڕۆژ لەمەوبەر، ڕاست دوای ئەوەی ئاخرین جار چاوت پێی کەوت و ڕۆیشتی، لە ناکاو تووشی هێرشی عەسەبی بوو و دەستیکرد بە قاووقیژ! کەوایە بۆ من قەد تووشی هێرشی عەسەبی نابم؟ ڕۆژی دواییشی هێرشێکی دیکە و ڕۆژی سێیەمیش هەر بەو شێوەیە. هەروەها دوێنێ دیسان دەستیپێکرد. لە دوێنێوە تا ئێستاش ئەوە شێت و ماخولیا دەقیژێنێ: «ڕقم لە ئیوان فیۆدۆرۆویچە. تکات لێدەکەم ئیتر ڕێی نەدەی بێت بۆ ئێرە.» لەو قسە سەرسووڕهێنەرانەی دەکرد و بە جارێ شڵەژاندمی، وەڵامم دایەوە: «ئاخەر چۆن دەکرێ ئەو لاوە جوامێر و زانایە ڕێنەدەم؟ زۆر کوڕێکی فامیدەیە بەڵام ناوچاوانەکەی نەیهێناوە.» چونکە ئەو ماجرایە تەنیا چارەڕەشییەکە و بەس» وانییە؟ لە ناکاو پێکەنینی بە قسەکانم هات، ئەویش زۆر ڕووهەڵماڵدراوانە. لەلایەکەوە خۆشحاڵیش بووم چونکە پێموابوو سەرگەرمی دەکەم و دەبمە هۆی ئارام بوونەوەی. بەتایبەت دەمویست لەبەر ئەو دیدارە لە ناکاوانەی ئیوان فیۆدۆرۆویچ، کە گومانی لەلا دروستکردبووم لێیبپرسمەوە و ئیتر ئیزنی هاتن بەو برایەت نەدەم. بەڵام ئەمڕۆ بەیانی زوو لیزا لە خەو هەستا و ڕقی لە یوولیا هەستا و شەقەزللەیەکی لە بناگوێی ڕاکێشا. ئەو کارە زۆر بێڕەحمانە بوو، من لەگەڵ کڵفەتەکانم هەمیشە بە نەرمی و دڵۆڤانی دەجووڵێمەوە. سەعاتێک دواتر باوەشی بە لاقی یوولیادا کردبوو و ماچیدەکرد. پەیامێکی بۆ ناردبووم کە ئیتر قەت نایە بۆ سەردانم، کاتێک هەڵتە هەڵتەک خۆم گەیاندە وەتاغەکەی، بە گریانەوە هات بۆلام و دەستیکرد بە ماچکردنم. بێئەوەی زمانی بگەڕێ،

هەروا ماچی دەکردم. پاڵپێوەنام لە وەتاغەکەی کردمیە دەرێ، هەربۆیە نەمتوانی تێبگەم مەسەلە چییە. ئێستا ئالکسی فیۆدۆرۆویچ گیان، هیوای گەورە و گرانم بە تۆیە، هەڵبەت تەواوی ژیانم لە دەستی تۆدایە. تکات لێدەکەم بچی بۆ لای لیزا و بنجووبناوانی مەسەلەکەم بۆ ڕوون کەیەوە. چونکە ئەو کارە تەنیا لە دەستی تۆ دێ. پاشان بگەڕێوە و پێمبڵێ ـ ئەو هەواڵە بە من، بە دایکی بدەوە چونکە بێتو ئەمکارە لەوە زیاتر بخایێنێ دڵم دەتۆقێ، دەنا لێدەدەم و دەڕۆم. ئیتر لەوە زیاتر تاقەت ناهێنم. ڕەنگە بتوانم ماوەیەک تاملێبکەم، بەڵام خۆ دار و بەرد نیم تاقەتم لێدەبڕێ و پاشان... پاشان ڕووداوێکی ناخۆش دەقەومێ.» مادام خۆخلاکۆف کە دیتی پێرخۆتین هاتۆتە ژوورێ، گەشایەوە و گوتی: «ئەیەڕۆ، خودایە گیان! ئەوە شوکور پیووتێرئیلیچ هات. درەنگ هاتی؟ بۆ وا درەنگ کەوتی؟ وەرە دانیشە، پێمبڵێ بۆ درەنگ هاتی، بەخێربێی لەو چاوەڕوانییە ڕزگارتکردین. دەی کابرای پارێزەر دەڵێ چی؟ ئالکسی فیۆدۆرۆویچ بۆ کوێ دەچی؟»

ـ دەچم بۆ لای لیزا.

ـ ئاخ، ئەرێ! خۆ لەبیرت ناچێ. داواکارییەکەمت خۆ لەبیر ناچێ؟ مەسەلەی مەرگ و ژیان لە گۆڕێدایە!

ئالیووشا بە پەلە پاشەوپاش دەکشایەوە، لە ژێر لێوەوە گوتی: «دڵنیابە لەبیرم ناچێ، ئەگەر بتوانم... بەڵام زۆر درەنگ بووە.»

مادام خۆخلاکۆف لە پشتسەریەوە هەرایکرد: «نا، حەتمەن حەتمەن بگەڕێوە، ئەگەر نەیەیتەوە دڵم دەتۆقێ،» بەڵام ئالیووشا ڕۆیشتبوو.

# (٣)
# کچی هاروهاج

ئالیووشا کە چوو بۆ لای لیزا، دیتی لە سەر کورسیلەتایە دارەکەی خۆی مەلاسکردووە، کاتێک نەیدەتوانی بە ڕیدا بڕوا، بەو کورسییە دەیانگێڕا. لە جێی خۆی جووڵەی نەکرد و بەخێرهاتنیشی پێنەگوت. بەڵام چاوەتیژ و زیتەکانی لە چاوی ئالیووشا بڕی. چاوی سوور و ڕەنگی هەڵبزڕکابوو، ئالیووشا سەری سوڕما کە لیزا لە ماوەی ئەو سێ‌ڕۆژەدا ئاوا تێکچووە و زەرد هەڵگەڕاوە. بەڕاستی کز بووبوو. لەگەڵ ئالیووشا تۆقەی نەکرد، ئالیووشا دەستی بە قامکە شووش و باریکەکانیدا هێنا کە بێ‌جووڵە لە سەر کۆشی دانابوون، پاشان بێدەنگ بەرەوڕووی دانیشت.

لیزا بێ‌ئەدەب و ڕووهەڵماڵدراوانە گوتی: «دەزانم پەلەتە خۆت بگەیەنییە بەندیخانە، دایکیشم چەن سەعاتە لە قسەی گرتووی، دەزانم هەر ئێستاش باسی من و یوولیای بۆ دەکردی.»

ئالیووشا پرسیی: «چووزانی؟»

ـ گوێم ڕاگرتبوو. بۆ چاوت تێبڕیوم؟ پێمخۆشە خۆ بگرم و بە کارێکی خراپیشی نازانم. داوای لێبوردنیشت لێناکەم.

ـ بۆ نارەحەتی؟

ـ بەپێچەوانە، زۆریش خۆشحاڵم. هەر ئێستا بۆ سێهەمین جار بە خۆمم دەگوت چەن کارێکی باشم کرد جوابم کردی و گوتم شووت پێناکەم. تۆ کوا بە کاری ژن و مێردایەتی دێی. ئەگەر بمویستایە شووت پێبکەم یادداشتێکم پێدەدای تاکو بیبەی بۆ پیاوێک کە دوای تۆ حەزی لێدەکەم. دەزانم بۆت

دەبرد و وڵامەکەشیت دەهێناوە. ئەگەر تەمەنت بگاتە چل ساڵیش دەزانم نامەکانم هەر بۆ دەبەی و دەیدەیە دەست ئەویندارەکانم.

لیزا لە ناکاو قاقای کێشا.

ئالیووشاش پێپێکەنی: «ئەگەرچی جینگزی و تووڕەی و زوو هەڵدەچی بەڵام کچێکی ڕاست و پاکی.»

ـ ڕاست و پاکیم هی ئەوەیە شەرم لە تۆ ناکەم. ئیتر نامەوێ هەر بە پیاویشت حیساب کەم. ئالیووشا دەزانی بۆ ڕێزت بۆ دانانێم؟ خۆشمدەوێی، بەڵام ڕێزت بۆ دانانێم. ئەگەر ڕێزم بۆ دابنایەی ئاوام قسە لەگەڵ نەدەکردی، وانییە؟

ـ نا.

ـ بەڵام بڕوام پێدەکەی ڕێزەیەکت شەرم لێناکەم!

ـ نا، باوەڕ ناکەم.

لیزا دیسان بە تووڕەیی قاقای کێشا، بە توندی گوتی:

ـ هێندێکم شیرینی بۆ دیمیتری فیۆدۆرۆویچی برات نارد بۆ بەندیخانە. ئالیووشا، دەزانی بەژن و باڵایەکی جوانت هەیە؟ ئێستا کە ئاوا خێرا ئیزنت دا خۆشمنەوێی، خۆشمدەوێی.

ـ لیزا، بۆ ئەمڕۆ ناردت بەدوامدا؟

ـ دەمویست ئارەزوویەکم هەیە پێتیبڵێم. پێمخۆشە کەسێک ئازارم بدا، شوو بکەم بە کەسێک کە ئازارمبدا، فریومدا و بەجێمبێڵی. نامەوێ بەختەوەربم.

ـ تۆ ئاشقی کێشە و ئاژاوەی؟

ـ ئەرێ، قڕە و هەرام پێخۆشە. دەمەوێ ئەم ماڵە ئاور تێبەردەم. هەمیشە پێموایە بەو پلیکانانەدا دەخوشێمە سەرێ و بە دزییەوە ماڵەکە ئاور تێبەردەدەم، دەبێ بە دزییەوە بێ. هەوڵدەدەن بیکووژێننەوە بەڵام ئاورەکە بڵێسە دەستێنێ. منیش دەزانم و هیچ ناڵێم. ئاخ، لەو گەوجییەتییەی من! نازانی چۆن وەزاڵە هاتووم!

لیزا بێزارانە دەستی هەڵتەکاند.

ئالیووشا بە نەرمی گوتی: «هی ئەوەیە ژیانێکی خۆش و پڕ لە ناز و نیعمەتت هەیە.»

ـ کەوایە پیاو فەقیر بێ چاکترە؟

ـ جا دیارە چاکترە.

«ئەوە قسەی پیری ڕەحمەتیتە. وانییە. قەیناکا با من دەوڵەمەند بم و خەڵکیش هەژار، شیرینی و نقیشک دەخۆم و ڕێزەیەک بەشی کەس نادەم.» ئەگەرچی ئالیووشا زمانی نەگەڕابوو، لیزا وستێکی لێکرد و گوتی: «نانا، قسە نەکەی، هیچ مەڵێ. پێشتر هەموو شتێکت پێگوتووم، هەمووم لەبیرە. گیانم بەو قسانە دادەگیرێ. ئەگەر فەقیر بم، کەسێک دەکوژم، تەنانەت ئەگەر دەوڵەمەندیش بم لەوانەیە کەسێک بکووژم، ڕەنگە ـ کەوایە بۆ کارێک نەکەم! دەزانی زۆرم حەز لە دروێنەیە؟ دروێنەی جۆ. تۆش دەبیتە لادێیی، لادێییەکی ڕاستەقینە، جوانووە ئەسپ ڕادەگرین، وانییە؟ گالگانۆف دەناسی؟»

ـ ئەرێ.

ـ هەمیشە ڕاوێچکە دەکا و خەون دەبینێ. بەردەوام دەگەڕێ و خەریکی خەیاڵپلاوە. دەڵێ بۆ دەبێ پیاو لە ژیانی ڕاستەقینەدا بژی، واچاکە پیاو لە خەیاڵدا بژی. پیاو دەتوانێ لە خەوندا خۆشترین شتەکان ببینێ. بەڵام ژیانی ڕاستەقینە زۆر ناخۆش و تاقەتپڕووکێنە. لەگەڵ ئەوەشدا بەمزووانە ژن دێنێ، پێشنیاریشی پێداوم کە شووی پێبکەم. تۆ دەتوانی شێلاق هەڵسووڕێنی؟

ـ ئەرێ.

ـ کەوایە ئەو وەک شێلاق وایە: پێیخۆشە هەڵیسووڕێنن و بە قامچی لێیدەن. ئەگەر ببمە ژنی، هەتا ئاخری تەمەن هەڵیدەسووڕێنم. هەست بە شەرمەزاری ناکەی لەگەڵ من؟

ـ نا.

- دیاره زۆر تووڕەی، چونکە سەبارەت بە شتی باش و پیرۆز قسە ناکەم. من نامەوێ پاک و پیرۆز بم. بە تاوانی گوناحی کەبیرە لەو دونیا چیم لێدەکەن؟ حەتمەن لەوە شارەزای.

- خودا سەرکۆنەت دەکا.

- ئالیووشا چاوی لێنەدەترووکاند.

- هەر ئەوەم پێخۆشە. دەچمە سەرێ، ئەوان سەرکۆنەم دەکەن و منیش قاقا پێدەکەنم. ئالیووشا، زۆرم پێخۆشە ماڵەکە ئاگر تێبەردەم، ماڵەکەی خۆمان؛ هێشتاش باوەڕ ناکەی؟

- با باوەڕ دەکەم. منداڵانی دە دوازدەساڵە هەن بە ئاواتەوەن ئاور لە شتێک بەردەن و ئەو کارەش دەکەن. ئەوەش جۆرێک نەخۆشییە.

- ئەمە دروستنییە، نا وا نییە. ڕەنگە منداڵی وا هەبێ بەڵام من مەبەستم ئەوە نەبوو.

- تۆ خراپەش بە چاکە دەبینی؛ ئەوەش کێشەیەکی زووتێپەڕە و ڕەنگە بەهۆی نەخۆشییەکەتەوە بێ.

- بەو حاڵەشەوە منت ناخۆش دەوێ! مەسەلەکە ئەوەیە من نامەوێ چاکە بکەم، دەمەوێ خراپە بکەم و هیچ پێوەندییەکیشی بە نەخۆشینەکەمەوە نییە.

- بۆ دەتەوێ خراپە بکەی؟

- بۆ ئەوەی هەموو شتێک لە نێو بچێ. پەکو چەندە خۆشە هەموو شتێک لە نێو بچێ! ئالیووشا دەزانی، جاریوایە دێمە سەر ئەوەی هەموو چەشنە کارێکی خراپ بکەم، ماوەیەک بە دزییەوە، پاشان هەموو تێبگەن. هەموو لە دوورەوە ڕادەوەستن و بە قامک ئاماژەم بۆ دەکەن، منیش چاویان لێدەکەم. زۆر خۆشە. ئالیووشا دەزانی چەندە خۆشە؟

- نازانم. ویستێکی ئاگرینە بۆ لە نێوبردنی شتەچاکەکان، وەک دەڵێی ئەو حەزە بۆ ئاور تێبەردانی شتێک هێندێ جار پێش دێ.

- هەر قسە نییە ئالیووشا، بەڕاستی دەمەوێ ئەو کارە بکەم.

- باوەڕت پێدەکەم.

ـ ئاخ، لەبەر ئەو قسەیەت کە دەڵێی باوەڕم پێدەکەی، چەندەم خۆشدەوێی. دەزانم درۆ ناکەی. بەڵام ڕەنگە پێتوابێ تەواوی ئەو قسانەم بۆ ئەوەیە ئازارت بدەم.

ـ نا، وابیر ناکەمەوە... تەنانەت ئەگەر حەز بە ئازاریشم بکەی.

لیزا چاوی دەتگوت ئاوری لێدەبێتەوە، گوتی: «هەروایە. قەت ناتوانم درۆ لەگەڵ تۆ بکەم.»

ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر سەرنجی ئالیووشای ڕاکێشا، سەداقەتی لیزا بوو. تەوس و گاڵتە بە ڕووخسار و وتەیەوە دیار نەبوو، ئەگەرچی پێشتر تەنانەت لە «سادقانەترین» کاتدا، لە گاڵتە و شادی نەدەکەوت.

ئالیووشا بە پەرۆشەوە گوتی: «هێندێ کات هەیە خەڵکی تامەزرۆی جینایەت دەبن.»

ـ ئەرێ، ئەرێ! دەڵێی لە دڵی منداڵی، ئەوان تامەرزۆی جینایەتن. هەموو ئاشقی تاوانن. هەمیشە حەزی پێدەکەن، نەک هێندێ «جار». دەزانی خەڵکی هەموو دەستیان داوەتە دەستی یەک بۆ ئەوەی سەبارەت بەو ویستە دەروونییە درۆ بکەن. هەر لەوکاتەشدا سەبارەت بەوە درۆدەکەن. هەموو دەڵێن لە خراپە بێزارن، بەڵام لە ناخەوە ئاشقی خراپەن.

ـ هێشتاش لەو کتێبە ناجۆرانە دەخوێنییەوە؟

ـ ئەرێ. دایکم دەیخوێنێتەوە و لە ژێر باڵنجەکەیدا دەیشارێتەوە. منیش لێی دەدزم و دەیخوێنمەوە.

ـ حەیا ناکەی دەتەوێ خۆت لە نێو بەری؟

ـ دەمەوێ خۆم لە نێو بەرم. کوڕێک لەم شارەیە کاتێک شەمەندەفەر تێدەپەڕێ لەنێوان هێڵاسنەکەدا ڕادەکشێ. چ مرۆڤێکی بە بەختە! گوێ بگرە، براکەت لە سەر کوشتنی باوکت دادگایی دەکەن، کەچی هەمووشیان پێیان خۆشە باوکت کوژراوە.

ـ بۆ کوژرانی باوکم پێیان خۆشە؟

ـ ئەریَ، پێیان خۆشە! هەموو دەڵێن چەند سامناکە، بەڵام لە ناخەوە حەزی پێدەکەن. من بەشبەحاڵی خۆم پێمخۆشە.

ئالیووشا بە هێوری گوتی: «ئەوەی سەبارەت بە هەمووان دەیڵێی ڕاستە.»

لیزا لە خۆشیانا قیژاندی: «ئاخ، چ بیرۆکەیەکت هەیە! ئەویش تۆی ڕاهیب! ئالیووشا باوەڕ دەکەی لەبەر ئەو درۆ نەکردنەت چەندەت ڕێز بۆ دادەنێم. ئاخ، دەبیَ یەکیَ لە خەون و خەیاڵەکانمت پێبڵێم. هێندیَ جار خەون بە دێو و درنجانەوە دەبینم. شەوە، لە نێو ژوورەکەمدا مۆمێکم بەدەستەوەیە، پاشان لە ناکاو دیوەکەم پڕ دەبیَ لە دێو و درنج، سووچ و قوژبنی وەتاغەکە و بن مێزەکە پڕ دەبیَ، ئەوان درگاکە دەکەنەوە، ڕەوەیەک لەو ڕمووزنانە لە پشت درگاکەن، دەیانەویَ بێنە ژووریَ و بمگرن. خۆ بە ژووریدا دەکەن و دەمگرن. لە ناکاو خاچی خۆم دەکێشم و هەموویان دەکشێنەوە، ئەگەرچی زۆر دوور ناکەونەوە، لەپەنا دەرگاکە و قوژبنەکان خۆ مات دەکەن و چاوم تێدەبڕن. پاشان لە ناکاو حەزێکی بەهێز بۆ کفرکردن گیانم دادەگریَ و دەستدەکەم بە کفرکردن، ئەوانیش بە شادی و تریلیلان دێنەوە بۆلام و دەمگرن. دیسان خاچی خۆم دەکێشم و هەموویان دەکشێنەوە. ڕابواردنێکی زۆر خۆشە، پیاو لەوانەیە هەناسەی ڕاوەستیَ.»

ـ ئالیووشا گوتی: «منیش ڕاست ئەو خەونەم دیوە.»

لیزا بە سەرسووڕمانەوە گوتی: «بەڕاستتە؟ گوێبگرە ئالیووشا پێمەکەنە، مەسەلەیەکی زۆر گرینگە، یانی دەکریَ دووکەس خەونێکی وەک یەک ببینن؟»

ـ من پێموایە دەکریَ.

لیزا بە سەرسووڕمانێکەوە دیسان گوتی: «ئالیووشا گویَ بگرە ئەمە زۆر گرینگە خەونەکە خۆی گرینگ نییە، گرینگە ئەوەیە تۆش ڕاست ئەو خەونەی من دەبینی. هیچ کاتێک درۆم لەگەڵ ناکەی، ئێستاش درۆ مەکە، قسەکەت ڕاستە؟ خۆ تۆ پێناکەنی؟»

- ڕاستە، بڕوا بکە.

دەتگوت لیزا زۆر کەوتۆتە ژێر کاریگەری و نیو خولەک بێدەنگ بوو. پاشان بە پاڕانەوە گوتی: «ئالیووشا وەرە بۆ سەردانم، لەوە زیاتر وەرە بۆلام.»

ئالیووشا خاترجەمانە وەڵامی دایەوە: «هەمیشە دێم بۆ دیدەنیت، یانی هەتا ئاخری تەمەنم.»

لیزا دەستیکردەوە بە قسەکردن: «دەزانی تۆ تەنیا کەسێکی کە دەتوانم قسەی لەگەڵ بکەم. لەگەڵ هیچکەس جگە لە تۆ و خۆم قسە ناکەم. لە تەواوی دنیادا تەنیا لەگەڵ تۆ. لەگەڵ تۆش ساناتر قسەدەکەم تا لەگەڵ خۆم. تەنانەت ڕێزەیەکت شەرم لێناکەم. ئالیووشا بۆ شەرمت لێناکەم؟ ئالیووشا ڕاستە لە جەژنی پاکدا جوولەکەکان منداڵێک دەدزن و دەیکوژن؟

- نازانم.

- کتێبێک لێرە سەبارەت بە دادگایی کردنی جوولەکەیەک نووسراوە، لەودا ئەوەم خوێندەوە. منداڵێکی چوارساڵان دەگرێ و قامکی هەردوو دەستی دەقرتێنێ و پاشان بە دیوارێکەوە لە خاچی دەدا و بە بزمار دەست و لاقی بە دیوارەکەوە دادەکوتێ. دواتر کە دادگاییدەکەن دەڵێ منداڵەکە زۆر زوو، لە ماوەی چوار سەعاتدا مردووە. ئەوە دەڵێ «زۆر زوو»! دەڵێ منداڵەکە ناڵاندوویە، هەتا گیانی دەرچووە، هەر ناڵاندوویە، ئەویش بە لایەوە ڕاوەستاوە و زۆری حەز بەو دیمەنە کردووە. زۆر خۆشە!

- خۆشە؟

– زۆر خۆش، هێندێ جار پێموایە من لە خاچمداوە. بەرەوڕووم بە دیوارێکەوە هەڵواسراوە و دەناڵێنێ، منیش دانیشتووم و کومپووتی ئاناناس دەخۆم. زۆرم کومپووتی ئاناناس پێخۆشە. کەیفت کرد بەم قسانە؟

ئالیووشا بە بێدەنگی چاوی تێبڕی. ڕەنگی هەڵبزڕکاو و زەرد هەڵگەڕاو، لە ناکاو سوورهەڵگەڕا و چاوی کزایەوە.

ـ دەزانی کاتێک نەقڵی ئەو جوولەکەیەم خوێندەوە، شەوێ هەتا بەیانی گریام و کڕووزامەوە. هەر لەبیری گریان و کڕووزانەوەی ئەو منداڵە بچووکەدا بووم. (دەزانی ئەو منداڵە چوارساڵانە تێدەگا) بەردەوامیش لەبیری کومپیووتی ئانانا سدا بووم. کە ڕۆژ بۆوە، نامەیەکم بۆ کەسێکی ناسیاو نووسی و تکام لێکرد کە بەشێوەیەکی تایبەت بێت بۆ دیدەنیم. ئەو هات و خێرا مەسەلەی منداڵەکە و کومپیووتی ئاناناسم بۆ باسکرد. بە وردی و موو بە موو. گوتیشم کە زۆر خۆشبووە. پێکەنی و گوتی بەڕاستی خۆشبووە. پاشان هەستا و ڕۆیشت. تەنیا پێنج دەقیقە لێرە بوو. بڵێی ڕقی لێم هەستابێ؟ ڕقی لێم هەستاوە؟ پێمبڵێ ئالیووشا، پێمبڵێ بزانم ڕقی لێم هەستاوە یان نا؟

لیزا، لەکاتێکدا چاوی ئاوری لێدەبۆوە، هەستا و لە سەر قەنەفەیەک دانیشت.

ـ ئالیووشا بە دڵەخورپەوە گوتی: «پێمبڵی بزانم، ناردت بەدوای ئەو کەسەدا؟»

ـ ئەرێ.

ـ نامەت بۆ نارد؟

ـ ئەرێ.

ـ کە سەبارەت بەوە، سەبارەت بەو منداڵە پرسیاری لێبکەی؟

ـ نا، بۆ ئەوەنا، بەڵام کاتێک هات، خێرا سەبارەت بەوە پرسیارم لێکرد. وەڵامی دایەوە، پێکەنی و هەستا ڕۆیشت.

ئالیووشا سرتاندی: «ئەو کەسە شەرافەتمەندانە هەڵسوکەوتی کرد؟»

ـ ڕقی لێمهەستا؟ پێم پێکەنی؟

ـ نا، ڕەنگە خۆشی حەزی لە کومپیووتی ئاناناس بووبێ. لیزا، ئەو ئێستا زۆر نەخۆشە.

لیزا بە چاوی گڕتێزاوەوە گوتی: «ئەرێ، بەڕاستی حەزی لێیەتی.»

ئالیووشا لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «ئەو ڕقی لە کەس نییە. بەڵام ئیمانی بە هیچکەس نییە. هەڵبەت ئەگەر ئیمانی بە کەس نەبێ، ڕقی لە هەمووان دەبێ.»

- کەوایە ڕقی لەمنە، کەوایە ڕقی...

- لە تۆش.

«زۆر خۆشە.» دەتگوت لیزا کەوتۆتە ددانەچیرە. «بە پێکەنینەوە کە ڕۆیشتە دەرێ، هەستیکرد پیاو ڕقیان لێی بێ زۆر خۆشە. منداڵی قامک پەڕیو زۆر شتی چاکە، کەوتنە بەر ڕق و بێزاریش هەروا...»

چاوی لە چاوی ئالیووشا بڕی و پێکەنی، پێکەنینێکی گەرم و شەڕاشۆیانە.

«دەزانی ئالیووشا، دەزانی پێمخۆشە...» لە ناکاو لە سەر قەنەفەکە هەستا، هەڵات بۆ لای ئالیووشا و بە هەردوو دەستی گرتی. «ئالیووشا ڕزگارم کە!» بە دەنگێکی گریاناوی: ڕزگارم کە! بڵێی لە دنیادا کەسێک هەبێ کە بتوانم وەک تۆ دەردەدڵی لەلا بکەم؟ هەقیقەتم بە تۆ گوتووە، هەقیقەت. خۆم دەکوژم، چونکە لە هەموو شتێک بێزارم، لە هەموو شتێک.» بەشێوەیەکی شێتانە وتەکەی کۆتایی پێهێنا: «ئالیووشا بۆ تاقە تۆزقاڵانێک خۆشتناوێم؟»

ئالیووشا بە گەرموگوڕی وەڵامی دایەوە: «ئەزقەزا زۆرم خۆشدەوێی.»

- لە ژوور سەرم دەگریی، ها؟

- ئەرێ.

- نەک بۆ ئەوەی شووت پێناکەم، بەڵکو هەروا لەبەر خاتری من دەگریی؟

- ئەرێ.

- مەمنوونم! تەنیا فرمێسکەکانی تۆم دەوێ. خەڵکی ڕەنگە سزام بدەن و پێشێلم کەن، هەمووان، هەمووان بە بێجیاوازی. چونکە هیچکەسم خۆش ناوێ. گوێت لێیە، هیچکەس! بەپێچەوانە، ڕقم لە هەموو کەسێکە! بڕۆ ئالیووشا، کاتی ئەوەیە بچی بۆ لای براکەت.

لەگەڵ دەربڕینی ئەو قسەیە لە ناکاو دەستی لە قۆڵی ئالیووشا بەردا و کشایە دواوە.

ئالیووشا تا ڕادەیەک بە ترسەوە گوتی: «بەوحاڵەوە چۆن دڵم دێ بەجێت بێڵم؟»

ـ بڕۆ بۆ لای براکەت، دەرگای زیندان دادەخرێ. بڕۆ، هانێ ئەوەش کڵاوەکەت. سڵاوی منیش بە میتیا بگەیەنە، بڕۆ دەی بڕۆ!

لیزا تا ڕادەیەک بە زۆر، پاڵی بە ئالیووشاوە نا و لە دەرگاکەی کردە دەرێ.

ئالیووشا، کاتێک تێگەیشت نامەیەکی چکۆلەی مۆرکراو لە دەستی ڕاستی دایە، بە سەرسووڕمان و پەرۆشییەوە چاوی لێکرد. چاوێکی لە نامەکە کرد و خێرا سەر پاکەتەکەی خوێندەوە «بۆ ئیوان فیۆدۆرۆویچ کارامازۆف» چاوێکی لە لیزا کرد. تا ڕادەیەک نێوچاوانی گرژی و تووڕەیی پێوە دیار بوو.

ـ لیزا شڵەژاو و پەرۆش فەرمانی پێدا: «ئەو نامەیەی پێبدە، حەتمەن دەبێ ئەو نامەیەی بدەیەی! هەر ئەمڕۆش، دەنا خۆم دەرمانخوارد دەکەم، هەربۆیە ناردم بەدواتا.»

بەپەلەش دەرگاکەی پێوەدا و کپیکرد، پاشان پشتی دەرگاکەشی خست. ئالیووشا نامەکەی نایە گیرفانی و لە پلیکانەکان چووە خوارێ، بێئەوەی بچێتەوە بۆ لای مادام خۆخلاکۆف، لەڕاستیدا هەر لەبیریشی نەبوو. دوای ڕۆیشتنی ئالیووشا، لیزا دەرگاکەی هەڵگرت و کەلێنێکی پێدا، قامکی بە لێواری چوارچێوەکە گرت و بەهێز و قەوەتی خۆی پێوەیدا و قامکی بوو بە کفتە. دوای دە چرکە قامکی دەرکێشا، هێور هێور ڕۆیشتەوە بۆ لای کورسییەکەی، لە سەری دانیشت و بە وردی چاوی لە قامکە ڕەش و شینهەڵگەڕاوەکەی و ئەو خوێنە کرد کە لە ژێر نینۆخی دەرپەڕیبوو. لێوی دەلەرزی و خێرا خێرا و بەسرتە لەبەر خۆیەوە گوتی:

ـ من بەدزاتم، بەدزات، بەدزات، بەدزات!

## (٤)

# ڕاز و گۆرانی

ئالیووشا قامکی نا بە زەنگی دەرگای بەندیخانەدا، درەنگوەخت بوو (لە مانگی نوامبردا ڕۆژگار کورت دەبێ). ڕۆژ بەرەو ڕۆژئاوا دەڕۆیشت. بەڵام ئالیووشا دەیزانی بە ئاسانی ڕێی دەدەن بچێتە ژووری. لەم شارە چکۆڵەی ئێمە، وەکو هەموو جێیەکی دیکەی جێهان کاروبارەکان بەڕێوە دەچن. هەڵبەت لەسەرەتادا، دوای تەواوبوونی لێپرسینەوەی سەرەتایی، خزم و کەسەکانی میتیا و چەندکەسی دیکە، لە دۆستانی تەنیا دەیانتوانی بە پێی تەشریفاتێکی تایبەتی بچن بۆسەردانی. دواتر ئەم تەشریفاتە هەروا درێژەی کێشا و بۆ هێندێ کەس جیاوازییان دادەنا، یانی بێئەوەی کەسێک لە کاربەدەستانی بەندیخانەکەیان لەگەڵ بێ ئیزنیان دەدا بچنە ژووری لە نزیکەوە سەردانی بکەن، ئەو کەسانەی ئاوا دەیانتوانی ملاقاتی بکەن، تەنیا گرووشنکا و ئالیووشا و ڕاکیتین بوون.

سەرۆکی پۆلیس میخاییل ماکارۆویچ دەرهەق بە گرووشنکا زۆر نەرم و نیان بوو و بە ڕێزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد، چونکە لە ناخەوە هەستی بە پەشیمانی دەکرد کە لە ماکرۆویە قسەی ناحەزی پێگوتبوو، دەیویست قەرەبووی بکاتەوە. کاتێک لە هەموو بەسەرهاتەکەی ئاگادار بوو، بە تەواوی بیروڕای خۆی سەبارەت بە گرووشنکا گۆڕی. سەیرە ئەگەرچی لە سەر سزا دانی میتیا سوور بوو، لەگەڵ کەوتنە زیندانی بیروڕای دەرهەق بە ئەویش گۆڕا و بە نەرمی لەگەڵی دەجووڵایەوە. بە خۆی گوت: «ڕەنگە لە ناخەوە مرۆڤێکی زۆرباش و بێزەڕ بێ و هەڵەخەرجی و خواردنەوەی زۆر وەک سویدییەکان تووشی ئەو ڕۆژەڕەشەی کردبێ.» ئەو دڵە ڕەقەی پێشووی ئێستا لێوڕێژ بوو لە سۆز و بەزەیی. بەڵام بێینە سەرباسی ئالیووشا.

سەرۆکی ئاسایش هۆگرییەکی زۆری پێی هەبوو. لەمێژیش بوو دەیناسی. ڕاکیتینیش کە لەو ماوەیەدا زۆر دەچوو بۆ ملاقاتی یەکێ لە دۆستانی ـ بە قەولی خۆی کچەکانی سەرۆکی ئاسایش بوو و بەردەوام لە دەوری ماڵەکەیان دەسووڕایەوە هەروەها دەرسی بە منداڵەکانی بەرپرسی بەندیخانەش دەگوت. جەنابی بەرپرس سەرەڕای وەسواسی زۆر لە ئەرکەکانیدا، پیرەپیاوێکی دڵنەرم بوو. ئالیووشا ئاشنایەتییەکی گەرموگوڕیشی لەگەڵ ئەو هەبوو. بەرپرسی بەندیخانە زۆری پێخۆشبوو سەبارەت بە «بابەتە پیرۆزەکان» لەگەڵ میتیا قسە بکا. بەڵام ڕێزی بۆ ئیوان فیۆدۆرۆویچ دانەدەنا و سەری لە بیر و باوەڕەکانی سووڕمابوو، چونکە ئیوان خۆی بە فەیلەسووفێکی گەورە دەزانی: هەڵبەت «خۆ فێرکردوو» بوو. واتە هەر خۆی هەوڵیدابوو، بە خوێندنەوەی کتێب و سەرچاوەگەلی فەلسەفی هێندێ زانیاریی کۆکردبۆوە. بەڵام زۆری ئالیووشا خۆشدەویست و هۆگری بووبوو. ئەم پیرەپیاوە لە ماوەی ساڵی ڕابردوودا زۆری ئەسفاری ساختە خوێندبۆوە و بەردەوام سەبارەت بە بۆچوونەکانی خۆی لەگەڵ ئالیووشا دەکەوتنە دەمەتەقێ. لە کلێسە دەچوو بۆ لای و چەند سەعات لەگەڵ ئەو و ڕاهیبەکانی دیکە لەو بارەوە مشتومڕیان دەکرد. بۆیە ئالیووشا ئەگەر درەنگ و ناوەختیش بچوایە بۆ بەندیخانە، هەر ئەوەندە چاوی بە جەنابی بەرپرس بکەوتایە، ئیزنی ملاقاتی پێدەدرا. جگە لەوەش هەموو کاربەدەستانی بەندیخانەکە ئالیووشایان خۆش دەویست، دێروانیش ئەگەر بیزانیبایە بەرپرسانی بەندیخانە ڕەزایەتیان لەسەرە، کاری بەسەریەوە نەبوو.

میتیایان لە بەندەکەی بانگدەکردە دەرێ و دەیانهێنا بۆ نهۆمی خوارێ، کە شوێنێک بوو بۆ ملاقاتی حوزووری تەرخانکرابوو. ئالیووشا هەرکە پێی نایە ژوورەکەوە، دیتی ڕاکیتین خەریکە خوداحافیزی لە میتیا دەکا. هەردووکیان بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد. میتیا، لەگەڵ ئەوەی بەڕێیدەکرد، لەناخی دڵەوە پێدەکەنی و ڕاکیتین لەوە دەچوو بۆڵەبۆڵ بکا. ڕاکیتین لەم دواییانەدا زۆری پێخۆشنەبوو چاوی بە ئالیووشا بکەوێ. قسەی لەگەڵ نەدەکرد و

بەشێوەیەکی سارد و سڕ تەعزیمی بۆ دەکرد. کاتێک چاوی بە ئالیووشا کەوت، ناوچاوی تێکنا و ڕووی وەرگێڕا، خۆی بە داخستنی دوگمەی باڵتە گەرم و گەورە و یەخە تیسکنەکەیەوە خەریککرد. پاشان خێرا کەوتە گەڕان بەدوای چەترەکەیدا.

لەبەر ئەوەی شتێکی گوتبێ، لە ژێر لێوەوە گوتی: «دەبێ وریابم کەلوپەلەکانم لەبیر نەچی.»

میتیا بە گاڵتە گوتی: «وریابە کولەپەلی ئەموئەویشت لەبیر نەچێ.» پێکەنینی بەو گاڵتەی خۆشی هات. ڕاکیتین لەڕێوە هەڵچوو، وای ڕقهەستا ئازای ئەندامی کەوتە لەرزین، بە توندی گوتی: «واچاکە ئەو ئامۆژگارییە بۆ بنەماڵەکەی خۆت هەڵگری، کە هەمیشە بەردەدار بوون، نەک ڕاکیتین.»

میتیا نەڕاندی: «مەسەلە چییە؟ من گاڵتەم کرد. تۆش شۆخی هەڵناگری!» لەگەڵ ئەوەی بە سەر ئاماژەی بە ڕاکیتین دەکرد کە دەگەڕایەوە، ڕووی لە ئالیووشا کرد. «هەموویان قوڕی کۆڵانێکن. شاد و لێوبەخەندە لێرە دانیشتبوو لەپڕ ئاوا هەڵچوو. تەنانەت چاویشی لە تۆ نەکرد. یانی ئاوا بە حیسابی لێکهەڵبڕاون؟ بۆ ئەوەندە درەنگ هاتی؟ ناکرێ بڵێم چاوەڕوانت بووم، بەڵکو لە بەیانییەوە تامەرزۆی دیدارت بووم. بەڵام گوێی مەدەرێ. ئێستا قەرەبووی دەکەینەوە.»

ئالیووشا پرسیی: «بۆ ئەوەندە دێ بۆ ئێرە؟ دڵنیام دۆستایەتییەکی گەرموگوڕتان پێکەوە نییە.» ئەویش بە سەری ئاماژەی بە دەرگایەک کرد کە ڕاکیتین لێوەی چووبووە دەرێ.

ـ دۆستایەتیی گەرموگوڕ لەگەڵ ڕاکیتین؟ نا، ئەوەندەش نێوانمان خۆش نییە. یانی وێدەچێ ـ بەرازێکی وەک ئەو؟ پێیوایە من... زمان شڕم. شۆخیش هەڵناگرن. عەیبی ئەو جۆرە کەسانەش ئەوەیە. هێندە ساردوسڕن، گاڵتە و گەپ تێناگەن، وشک و بێکەڵک. وەبیر دیواری بەندیخانەم دەخەنەوە، ئەو کاتەی تازە هاتبووم بۆ ئێرە. بەڵام زیرەکیشە، زۆریش زیرەک و وریا. چاکە ئالکسی، ئێستا ئیتر کارم تەواوە.

لەسەر کورسییەک دانیشت و ئالیووشای لەپەنای خۆی دانا.

ئالیووشا بە پەرۆشییەوە گوتی: «ئەرێ، سبەینێ ڕۆژی دادگاییە یانی هیچ هیوایەکت نییە کاکە؟»

میتیا بە حاڵەتێکی بێمتمانەیییەوە چاوی لێکرد و گوتی: «باسی چی دەکەی؟ ئاخ، مەبەستت دادگاییە؟ سەڵا لە ئەقڵت! تا ئێستا سەبارەت بە شتێک قسەمان کردووە کە هیچ بایەخ و گرنگییەکی نییە. دادگایی چییە باسیدەکەین. بەڵام سەبارەت بە ئەسڵی مەسەلەکە یەک وشەشم پێنەگوتووی. ئەرێ، سبەینێ ڕۆژی دادگاییمە. بەڵام کاتێک گوتم ئیتر لە دەست چووم، مەبەستم دادگایی نەبوو. بۆ ئەوەندە بە تەوەسەوە چاوم لێدەکەی؟ مەبەستم تافی لاوی بوو.

ـ میتیا مەبەستت چییە؟

ـ ئەندێشەکانم، ئەندێشە. هەر ئەوە و بەس! ئەخلاقیش، میتیا ئەرێ ئەخلاق چییە؟

ئالیووشا بە سەرسووڕمانەوە پرسیی: «ئەخلاق؟»

ـ ئەرێ ئەویش بەشێک لە زانستە؟

ـ ئەرێ، زانستێکی واش هەیە... بەڵام ڕاستت دەوێ ناتوانم بۆت شێکەمەوە و پێتبڵێم چ جۆرە زانستێکە.

ـ ڕاکیتین دەزانێ. ئەو ڕاکیتینە نەگبەتە زۆرشت دەزانێ! نایەوێ ببێتە ڕاهیب. دەیەوێ بچێ بۆ پترزبۆرگ. دەیەوێ لەوێ دەستبکا بە کاری ڕەخنەگرانەی گەورە، چونکە دەزانێ لەوانەیە خزمەتێک بکا و پلە و پایەیەک وەدەستبێنێ. پەککو، ئەو جۆرە مرۆڤانە بۆ وەدەستهێنانی پلە و پایە دەستی هەمووان لەپشتەوە دەبەستن. ئەخلاق بە قەرەقەمەر. ئالکسی، ئەی پیاوی خودا، کارم تەواو بوو؟ تۆم لە هەموو کەس خۆشتر دەوێ. دەزانی کاتێک چاوت لێدەکەم، لەوانەیە دڵم بتۆقێ. کارێل بێرنارد کێ بوو؟

ئالیووشا دیسان سەری سوڕما: «کارێل بێرنارد؟»

ـ نا، کارێل نا، سەبرکە، بە هەڵەچووم. کلوود بێرنارد[٤]. ئەمە چیتە؟ کیمیایە یان شتێکی دیکە؟»

ئالیووشا وەڵامی دایەوە: «حەتمەن دانیشمەندە. بەڵام دەبێ پێتبڵێم کە سەبارەت بەو ناتوانم زۆرت بۆ باسبکەم. هەر ئەوەندەم بیستووە دانیشمەندە، بەڵام نازانم زانای چ بوارێکە.»

ـ کەوایە بە گۆڕی بابییەوە! منیش نازانم. وێدەچێ زۆر هیچوپووچ بێ. هەموویان هەروا هیچوپووچن. ڕاکیتینیش ڕێی خۆی دەدۆزێتەوە. ڕاکیتین هەر جێیەکی پێیخۆشبێ پێیدەگا. ئەویش خۆی «بێرنارد»ێکی دیکەیە. هاوار لە دەست ئەم بێرناردانە! لە هەموو جێیەک قوت دەبنەوە.

ئالیووشا پێداگرنە پرسیی: «ئاخر پێمبڵێ مەسەلە چییە؟»

ـ دەیهەوێ سەبارەت بە من وتارێک بنووسێ، سەبارەت بە پەروەندەکەم، بەمشێوەیە دەستدەکا بەکاری ئەدەبی. هەر لەبەر ئەوەش دێ بۆ ئێرە، خۆی وایگوت. دەیهەوێ تیۆرییەک بسەلمێنێ. دەیهەوێ بڵێ: «نەیتوانیوە لە کوشتنی باوکی خۆببوێرێ و کۆمەڵگا تووشی ئەو بەڵایەی کردووە و... هتد هەمووی بۆ باس کردم. دەڵێ دەیهەوێ نووسراوەکەی ڕەنگدانەوەی سۆسیالیستی پێوە دیاربێ. بە گۆڕی بابی خۆی و مەقالە سۆسیالیستییەکەیەوە. بۆ من فەرق ناکا. ئەو ئیوانی خۆشناوێ و لەگەڵی هەڵناکا. دانی خێر بە تۆشدا نانێ. نامەوێ وەدەرێ نێم و لە خۆمی بتارێنم چونکە کوڕێکی زیرەک و بەهۆشە و ئەگەرچی زۆر لووت بەرز و

---

٤- کلوود بێرنارد، فیزیۆلۆژیستی فەڕەنسی (١٨٧٨ـ ١٨١٣) کتێبە بەناوبانگەکەی، پێشەکییەک لە سەر پزیشکیی تەجروبی، ساڵی (١٨٦٦ بە زمانی ڕووسی وەرگێڕدرایەوە. شیاوی باسە ئەمیل زۆلا، نووسەری ناتۆڕالیستی فەڕەنسی و سەردەمداری ناتۆڕالیستی ئەدەبی، لە سەر ئەو کتێبەی کلوود بێرنارد وتارێکی تێروتەسەلی نووسی بەناوی «ڕۆمانی تەجروبی» ئەمیل زۆلا لەو نووسینەدا هەوڵی داوە، وتاری زانستی وەک دیتن و ئەزموون و تاقیکاری بێنێتە پانتای ڕۆمانەوە. بەم شێوەیە نووسەری ناتۆڕالیست، وەک دانشمەندێک کە نموونەی تاقیگاکەی دەخاتە ژێر میکرۆسکۆبەوە، ئەویش بۆ کەسایەتیی چیرۆکەکەی بە پێی ڕەنگدانەوەی شوێن و ژینگە، خوێندنەوە و ڕاڤە و لێکدانەوەی دەبێ.

قۆڕەدەماخە. هەر ئێستا پێمگوت: «بنەماڵەی کارامازۆف دەمپیس نین. بەڵکو فەیلەسووفن؛ چونکە هەموو ڕووسییە ڕەسەنەکان فەیلەسووفن. تۆش ئەگەرچی خوێندەواری بەڵام فەیلەسووف نیی بەڵکو مرۆڤێکی سووکوچرووکی.» پێکەنی، ئەویش چ پێکەنینێکی تەوساوی. پێمگوت: «disputandum de ideabus non est»[٥] هەقم نەبوو، منیش هێندێ جار لەخۆڕازی دەبم. (میتیا کتوپڕ دەستیکرد بە پێکەنین.) دیوتە لانیکەم فێری لاتینەکە بووم.ئالیووشا پەڕییە نێو قسەکانی: «بۆ گوتت لە دەست چووی؟ هەر ئێستا ئەو قسەیەت کرد؟»

ـ بۆ لە دەست چووم؟ ئەها... ڕاستت دەوێ... ئەگەر بەشێوەی گشتی هەڵوێستەی لە سەر بکەی، بۆ لە کیسچوونی خودا بەداخەوەم ـ بۆ چییەکەی ئەوەیە.

ـ مەبەستت لە «بۆ لە کیس‌چوونی خودا بەداخەوەم» چییە؟

ـ تۆ بیهێنە بەرچاوی خۆت: لەناخدا، لە نێو دەمارەکانی لەشدا، لە مێشکدا ـ یانی ئەو دەمارانەی لە مێشکدان... (لامەسەبانە!) هێندێ دەزوولە هەن، دەزوولەی ئەو دەمارانە، کاتێک دەستدەکەن بە لەرزین... یانی، بڕوانە، بەچاوم لە شتێک دەڕوانم و پاشان ئەوان دەستدەکەن بە لەرزین. کاتێک ئەو دەزوولانە وەلەرزین دەکەون، وێنەیەک وەدیار دەکەوێ... هەر لەڕێوە وەدەر دەکەوێ، لە چرکەیەکدا، چاوترووکانێک... پاشانیش شتێک وەک چرکەیەک وەدیار دەکەوێ، یانی نەک ساتێک یان چرکەیەک ـ بەزیاد نەبن چ ساتێکن! ـ بەڵکو وێنەیەک؛ یانی شتێک یان کردەوەیەکی لاپرەسەنانە! بۆ ئەوەیە من دەبینم و ئەویش، بیری لێبکەوە، بەهوی ئەو دەزوولانەوە، نەک بەو هۆیەوە کە من ڕۆحلەبەرم و بەجۆرێک لە سەر شێوەی خودا خولقاوم.[٦] ئەوانە هەمووی قسەی هەڵیتوپڵیتە! براکەم، دوێنی میخاییل ئەوەی بۆ باسکردم و

---

٥- سەلیقەی چۆن و بۆچیم نییە.

٦- ئاماژە بە کتێبی پیرۆز، سیفری ئافراندن، بەشی یەکەم: «خوداش مرۆڤی لە وێنەی خۆی خولقاند.»

بە جارێ شڵەژاندمی و تووشی گۆڕانی کردم. ئالیووشا، ئەم زانستە پیاو تووشی سەرسووڕمان دەکا! مرۆڤێکی نوێ خەریکە سەرهەڵدەدا ـ ئەوە دەزانم... سەرەڕای ئەوانەش بۆ لەدەستچوونی خودا بەداخەوەم!

ئالیووشا گوتی: «بەڵام هەرچۆنێک بێ، ئەمە شتێکی باشە.»

ـ لەبەر ئەوەی بۆ لەدەستدانی خودا بەداخەوەم؟ براکەم ئەمە کیمیایە، کیمیایە! جەنابی ڕاهیب، چارەیەکی‌ترمان نییە؛ دەبێ بۆ کیمیا ڕێگە خۆشکەین. ڕاکیتینیش خودای خۆشناوێ. پەککو! هەر ئەویش نییە خۆشی ناوێ، ئەوە دەردی هەموومانە! بەڵام دەیشارینەوە. درۆ دەکەن، خۆی پێوە ڕادەنێن. لێم پرسیی: «ئەو لە نووسراوەکانتدا دەگونجێنی؟» گوتی: «چاکە، ئەگەر ئەو کارە بکەم، ناهێڵن بڵاو بێتەوە.» پێکەنی. پرسیم: «ئەی مرۆڤەکان چییان بە سەر دێ؟ بەبێ خودا و ژیانی تاهەتایی چدەکەن؟ ئەو کاتە ئیتر هەموو شتێک ئازاد دەبێ، هەرکارێک پێیان خۆشبێ دەتوانن بیکەن؟» بە پێکەنینەوە گوتی: «بۆ نەتدەزانی؟ مرۆڤی وریا دەتوانێ هەرکارێکی پێی خۆشە بیکا. مرۆڤی وریا دەزانێ چبکا، بەڵام تۆ بەو تاوانی پیاوکوژییە ڕێگایەکت گرتۆتە بەر کە ئاکامەکەی باش نییە و دەبێ لە نێو بەندیخانەدا برزێی.» بەرەوڕوو ئەوەی پێگوتم! دەڵێی بەرازە! ئەو جۆرە مرۆڤانە هەر بە شەق وەدەر دەنێم، بەڵام ئێستا گوێیان لێدەگرم. زۆریشی قسەی ماقووڵانە لەدڵدا بوو. باش دەنووسێ. حەوتووی پێشوو یەکێ لە وتارەکانی خۆی بۆ خوێندمەوە. سێ دێڕم لێ یادداشت کرد. سەبرکە، ئێستا بۆت دەخوێنمەوە، ئەوەتا.

ـ میتیا گوتێ کاغەزی بە پەلە لە گیرفانی دەرهێنا و خوێندییەوە: «بۆ حەل کردنی ئەو مەسەلەیە بەر لە هەموو شتێک پێویستە، کەسایەتیی خۆت بەپێچەوانەی چالاکییەکانی خۆت وەکار خەی. تۆ سەرت لەوە دەردەچێ؟»

ئالیووشا گوتی: «نا.» چاوی لە میتیا بڕی و بەوردی گوێی لە قسەکانی ڕاگرت.

ـ منیش سەرم لێی دەرناچێ. قسەکانی لێڵ و تەمومژاوییە، بەڵام زۆر ژیرانەیە. دەڵێ: «ئێستا هەمووان وا دەنووسن. لە ژێر کاریگەریی ژینگەدان.»

ئەوان لە ژینگەی خۆیان دەترسن. ئەو هیچوپووچە شیعریش دەنووسێ. شێعرێکی لە پەسنی پەلەپووزی مادام خۆخلاکۆفدا هۆنیوەتەوە. هە، هە، هە!

ئالیووشا گوتی: «نەقڵەکەیم بیستووە.»

- بەڕاستتە؟ گوێت لە شیعرەکەش بووە؟

- نا.

- لەلای منە. ئەوەتا. بۆتی دەخوێنمەوە. خەبەرت نییە - پێمنەگوتی - ئەم شیعرە نەقلێکی هەیە. ڕاکیتین مرۆڤێکی هیچوپووچە! سێ حەوتوو لەمەوبەر دەستی کرد بە بوغزاندن و سەرخستنە سەرم. «تۆ وەک مرۆڤێکی گەمژە، بۆ سێ‌هەزار ڕۆبڵ خۆت تووشی ژانەسەر کردووە، بەڵام من دەمەوێ هەزار و پێنجسەد ڕۆبڵ وەگیر خەم و لەگەڵ بێوەژنێک زەماوەند بکەم و خانووبەرەیەک لە پترزبۆرگ بکڕم.» پێیگوتم دەیەوێ مادام خۆخلاکۆف ساز کا. ئەم خاتوونە بە جحێڵی زۆر پڕئەقڵ نەبووە. ئێستاش کە چڵ‌ساڵی تەمەنە لەوەش بووە. ڕاکیتین گوتی: «بەڵام ئەو ژنێکی دڵتەڕ و ڕووبازاڕییە. هەربۆیە لێم‌ڕوونە سازیدەکەم. کاتێک زەماوەندم لەگەڵ کرد، دەیبەم بۆ پترزبۆرگ و لەوێ ڕۆژنامەیەک وەڕێدەخەم.» ئەو هەتیوە تۆڵازە وەک حەیوانێکی دزێو و هەوسباز دەمی ئاوی دەکرد. نەک بۆ ئەو بێوەژنە، بەڵکو بۆ هەزار و پێنجسەد ڕۆبڵەکە. کارێکیشی کرد بڕوا بە قسەکانی بکەم. هەموو ڕۆژێ دێ بۆ سەردانم. دەیگوت: «ژنە خەریکە دێتە سەرڕێ.» گوێزی بە کلکی دەشکاند. پاشانیش، لەپڕ لە ماڵەکە وەدەریان نا، ئافەرین بۆ پێرخۆتین، کە دەستپێشخەریی کردووە! ئەگەر بۆم بلوایە ئەو پیرێژنە خەرەفاوەم لەبەر ئەو کارەی ماچدەکرد. ئەویش ئەم شیعرە قۆڕەی هۆنیبۆوە. دەیگوت: «یەکەم جارە دەستم بە نووسینی شیعر کردووە. هەر لەبەر ئەوەشە دڵی لێدەستێنم، کەوایە ئەو شێعرەم بەقەستی خێر و چاکەکاری نووسیوە. هەرکاتێ دەستم بە ماڵ و سامانی ئەو پیرێژنە خەرەفاوە ڕاگەیشت، دەتوانم خزمەتێکی باش بە کۆمەڵگا بکەم.» ئەوانە هەرکارێکی قۆڕیان لە دەستبێ، دەیکەن و دەڵێن خزمەت بە کۆمەڵگا دەکەین.

دەیگوت: «هەرچۆنێک بێ لە شیعری پووشکین هەر چاکترە، چونکە تەنانەت لەو شیعرەشدا پارێزگاریم لە پەژارەی کۆمەڵایەتی کردووە.» مەبەستی سەبارەت بە پووشکین ڕوونە و بە تەواوی تێیدەگەم. ئەگەرچی ئەو بەڕاستی مرۆڤێکی هەستناسک و ڕەوانبێژە بەڵام تەنیا سەبارەت بە لاق و بەلەکی ژنان دەینووسی. بەڵام ڕاکیتین ئەوەندەی پۆز بەو شیعرەوە لێدەدا و لووتی هەڵدێنا بە نۆ قەڵەنگ گوو بە لووتی نەدەگەیشت! ئەو ناوەی بۆ شیعرەکەی خۆی دانابوو، ئەمە بوو: «بۆ ماریجەی لاقی وردیلەی ئەوینەکەم» ئەمەش دەقی ئەو شیعرە قۆڕەی نووسیویەتی:

ئەو لاقە جوان و وردیلەی
نەرم و ناسکە و ماسیوە
دوکتۆرەکان پێچاویانە
سەد دەرمانیان تێساویوە
ئەی لاقی جوان وردیلە ئەمن خەمی ئێوەم نییە
چونکە پووشکین گەلێ شیعری لە وەسفتانا نووسیوە
تەنیا خەم بۆ مێشکی دەخۆم
چونکە زۆر وشک و بێهەستە و
قەت سووتاوی ئەوینی خۆی نەناسیوە

***

سەیرە بە ژان و ماسی لاقەوە
ئەقڵی ئیجازەی ئەشقی پێنادا
من دوعا دەکەم لە بۆ هەتوانێک
پێکەوە لاق و مێشکی شیفا دا!

ئەو بەرازە، بەرازێکی تەواوە، بەڵام بێشەرەفە، زۆریش نابارە! بیرۆکەیەکی پێشکەوتووشی لەو شیعرەدا هێناوە. حەتمەن کاتێک بە شەپ وەدەریناوە، ئیمان هەردە بووە! هێندەشی ڕقهەستاوە کەوتۆتە ددانە چیرە!

ئالیووشا گوتی: «تۆڵەی خۆشی کردۆتەوە. سەبارەت بە مادام خۆخلاکۆف شتێکی نووسیوە.»

پاشان بە کورتی ئەوبابەتەی نێو ڕۆژنامەی دەنگۆی بۆ باسکرد.

میتیا بە مڕومۆچی گوتی: «کاری ئەوە، کاری خۆیەتی! خۆیەتی! ئەوبابەتەش... دەزانم... شتێکی پڕ لە سووکایەتیش سەبارەت بە گرووشنکا نووسرابوو... هەروەها سەبارەت بە کاتیاش... ئەها!»

میتیا بێئۆقرە بەنێو ژوورەکەدا دەگەڕا.

ئالیووشا دوای چەن چرکە گوتی: «براکەم، ناتوانم زۆر لێرە بمێنمەوە. سبەینێ بۆ تۆ ڕۆژێکی سامناکە. چونکە خودا لە هەقتدا داوەری دەکا... تۆش دەستتکردووە بە ڕاویچکە کردن و کەس نازانێ باسی چی دەکەی...»

میتیا بە گەرمی هەڵیدایە: «تۆش ئیتر تێکتدا. یانی دەڵێی باسی ئەو سەگە بۆگەنە بکەم؟ باسی ئەو قاتڵە؟ زۆرمان باسکردووە. ئیتر نامەوێ لەوە زیاتر باسی ئەو کوڕە بۆگەنەی لیزاوتای بۆگەنیو بکەم! خودا تەفر و توونای دەکا، ئەوە ڕۆژەکەیە، دەبینی چۆن لە نێو دەچێ. وست!»

بە پەلە ڕۆیی بۆ لای ئالیووشا باوەشی پێدا کرد و ماچیکرد. خێراش فرمێسک لەچاویدا قەتیس ما.

لەگەڵ ئەوەی هەستی بە سەربەرزی دەکرد گوتی: «ڕاکیتین لەوە ناگا. بەڵام تۆ تێدەگەی. هەر لەبەر ئەوەش تامەزرۆی دیدارت بووم. زۆر قسەم پێیە کە دەمویست پێتیبڵێم، لێرە، لە چوارچێوەی ئەم دیوارە ڕەقوتەقانەدا، هێشتا سەبارەت بە شتێکی گرینگ نەدواوم؛ وادیارە ئەو ساتەش هیچکات نایە. ئێستا ئیتر ناتوانم سەبر بکەم. دەبێ کوڵوکوی دڵم هەڵڕێژم. براکەم، لەم دوومانگەی ڕابردوودا کەسێکی نوێم لەناخی خۆمدا دیتۆتەوە. مرۆڤێکی تازە لەناخمدا سەری هەڵداوە. لەناخمدا خۆی شاردبۆوە و ئەگەر بە هۆی ئەو بەڵا ئاسمانییەوە نەبوایە، قەت خۆی نەدەنواند. دەترسم! چش با بیستساڵ لە کانگاکاندا ڕایبوێرم و بە کوتک بەرد بشکێنم! ترسم لەوە هەر نییە ـ ئێستا لە شتێکی دیکە دەترسم: لەوە دەترسم ئەم مرۆڤە نوێیە بەجێم بێڵێ. تەنانەت

لەوێ، لەو کانگایە، لە ژێر عەرزدا، لەوانەیە لە نێو سینگی قاتڵێکی دیکەی هاوڕێمدا، دڵێکی پڕخورپە و کوتەکوت بدۆزمەوە و لەگەڵی ببمە برادەر، چونکە تەنانەت لەوێش پیاو دەتوانێ بژی و ئازار بکێشێ و دڵی پڕ لە خۆشەویستی بێ. پیاو دەتوانێ لە نێو سنگی ئەو تاوانبارەدا دڵێکی بەردین ڕاچڵەکێنێ و زیندووی کاتەوە، پیاو دەتوانێ ساڵانێکی زۆر خزمەتی پێبکا و لە کۆتاییشا لەو چاڵە تاریکەدا، ڕۆحێکی مەزن، بوونەوەرێکی خاوەن هەست و ئازارکێش، دەرهێنێ. پیاو لەوانەیە فریشتەیەک پەروەردە کا، قارەمانێک زیندوو کاتەوە و ڕۆحێکی نوێی بە بەردا کاتەوە! ئەو جۆرە مرۆڤانەش زۆروزەوەندن، سەدان کەسن، هەمووشمان بەرپرسی ئەوانین. ئەی لەو کاتەدا بۆ خەونم بەو «منداڵە بەستەزمانە»وە دی؟ ئەو منداڵە بەستەزمانە بۆ دەگریا؟» لەو ساتەدا ئەوە بۆ من نیشانەیەک بوو. من لەبەر خاتری ئەو منداڵە بەستەزمانە دەچم. چونکە هەموومان بەرپرسی یەکترین. بەرپرسی هەموو منداڵە بەستەزمانەکان، چونکە منداڵی گەورە و هەروەها منداڵی چکۆڵەش هەن. هەمووشیان بەستەزمانن. من لەبەر خاتری هەمووان دەڕۆم، چونکە دەبێ کەسێک لەبەر خاتری هەمووان بڕوا. من باوکمانم نەکوشتووە، بەڵام دەبێ بڕۆم بۆ سیبیریا. ئەو تاوانەش وەئەستۆ دەگرم. لێرە ئەوەم بۆ دەرکەوتووە، لێرە، لە نێو ئەم دیوارە ڕەقوتەقانەدا. زۆرکەس، سەدان کەسی کوتک بەدەست، لە ژێر زەویدا هەن، لە نێو ئەو کانگایەدا. ئاخ، ئەرێ، زەنجیر و سندم لە لاقمان دەخەن و ئازادی نابینین، بەڵام ئەو کاتە، لە نێو ئەو هەموو خەفەت و پەژاریەدا، دیسان شادانە هەڵدەستینەوە، چونکە مرۆڤ بەبێ شادی هەڵناکا، خوداش نابێ لەوێدا بوونی هەبێ، چونکە شادی و خۆشی خودا دەیدا: ئەوەش، ئیمتیازێکی گەورەیە و ئەو داوییەتی. ئاخ، مرۆڤ واچاکە نوقمی نوێژ و تاعەت بێ! پیاو لەو ژێر زەوییەدا بە بێخودا چۆن هەڵبکا؟ ڕاکیتین درۆ دەکا! ئەگەر ئەوان خودا لە سەر زەوی ڕاو نێن، ئێمە لەو ژێر زەوییەدا داڵدەی دەدەین. مرۆڤی ئازاد زیاتر پێویستی بەخودایە. ئەو کاتە

ئێمە مرۆڤگەلی ژێر زەوی گۆرانییەکی خەماوی بۆ خودا دەڵێین کە شادی لە دەستی ئەودایە. سڵاو لە خودا و شادییەکەی! ئێمە خودا خۆشەویستین!»

میتیا هەروا کە شێتانە دەدوا و یەک پشوو قسەیدەکرد، خەریک بوو هەناسەی سوار دەبوو. ڕەنگی سپی هەڵگەڕابوو، لێوی دەلەرزی و فرمێسک بە ڕوومەتیدا هاتە خوارێ.

دیسان دەستیپێکردەوە: «ئەرێ، ژیان بێعەیبە، تەنانەت ژیان لە ژێر زەویشدا هەیە. ئالکسی، باوەڕ ناکەی ئێستا چەندم ژیان بەلاوە شیرینە، لە نێو ئەو دیوارە ڕەقوتەقانەدا چ تامەزرۆییەک بۆ ژیان و تێگەیشتن لە ناخم هەڵدەقوڵێ. ڕاکیتین لەوە تێناگا؛ بە ئاواتەوەیەماڵێک دروستکا و ژوورەکانی بدا بە کرێ. بەڵام بۆ دیتنی تۆ عەجمانم نەبوو، خودا خودام بوو زوو بێی. بۆ پێتوایە ڕەنج چییە؟ من لێی ناترسم، تەنانەت ئەگەر بێکۆتاییش بێ، ئێستا ئیتر لێیناترسم. پێشتر لێیدەترسام. دەزانی لەوانەیە لە کاتی دادگایی و لێپرسینەوەدا وەڵام نەدەمەوە... ئێستاش دەڵێی ئەو توانایە لەخۆما شک دەبەم و پێموایە دەتوانم هەموو شتێک تاملبکەم، هەر ئازار و ڕەنجێک بێ، تەنیا بۆ ئەوەی بتوانم بە خۆمی بسەلمێنم و دووپاتی کەمەوە کە «زیندووم.» لە نێو هەزاران ئازاردا زیندووم! خۆر دەبینم، ئەگەر نەشیبینم، دەزانم هەیە. هەر ئەو تێگەیشتنەش ناخم لێوڕێژ دەکا لە ژیان. ئالیووشا، فریشتەکەم، تەواوی ئەو فەلسەفانە دەبنە هۆی مەرگم. بەزیاد نەبن! ئیوانی برام...»

ئالیووشا قسەکەی پێبڕی: «سەبارەت بە ئیوانی برام چی دەزانی؟» بەڵام میتیا گوێی نەدایە.

- بڕوانە، من پێشتر ڕێزەیەکم گومان و دڕدۆنگی نەبوو، بەڵام هەمووی لەناخمدا خۆی حەشار دابوو. ڕەنگە بەهۆی بێئاگایی لە هەڵچوونی ئەو بیرۆکانەی ناخم بووبێ، کە شەڕابم دەخواردەوە و ڕقم هەڵدەستا و شەڕم دەکرد. بۆ ئەوە بوو کە ئەم بیرۆکانە لەناخمدا بخنکێنم، بیدەنگی بکەم و نەهێڵم سەرهەڵدا. ئیوان وەک ڕاکیتین نییە، خاوەن ئەندێشەیە. ئەوەی ئازارم

دەدا خودایە. ئەوە تەنیا شتێکە کە ئازارم دەدا. ئەگەر ئەو بوونی نەبێ چی؟ ئەگەر قسەکەی ڕاکیتین ڕاست بێ چی ـ کە خودا داتاشراوی زەینی مرۆڤە؟ کەوایە ئەگەر بوونی نەبێ، مرۆڤ دەبێتە سەرداری زەوی. سەرداری عەرز و ئاسمانان. مەحشەرە بەڕاستی. بەڵام مرۆڤ بێ بوونی خودا چۆن دەتوانێ باشبێ؟ باسەکەمان لە سەر ئەوەیە. هەمیشە دەگەڕێمەوە سەر ئەو پرسیارە. چونکە ئەو کاتە مرۆڤ دەبێ کێی خۆشبوێ؟ شوکرانە بژێری کێ بێ. گۆرانیی خۆی بۆ کێ بڵێ؟ ڕاکیتین پێدەکەنێ. ڕاکیتین دەڵێ مرۆڤ دەتوانێ ئەگەر خوداش نەبێ، مرۆڤی خۆش بوێ. گەمژەیەکی بلقنە دەتوانێ بیروباوەڕیکی ئاوای هەبێ. سەرم لێی دەرناچێ. ژیان بەلای ڕاکیتینەوە زۆر سانایە. «وا چاکە سەبارەت بە پەرە پێدانی مافی کۆمەڵایەتی و مەدەنی، یان هەرزان ڕاگرتنی نرخی گۆشت، بیربکەیەوە. بەو کارە دەتوانی عەشقی خۆت دەرهەق بە مرۆڤایەتی سادە و ساکارتر لە فەلسەفە دەبڕی.» لە وڵامیدا گوتم: «بەڵام تۆ، بەبێ خودا، ئەگەر باشی بزانی، زۆر وێدەچێ نرخی گۆشت بەرییە سەرێ و بە هەر کوپکێک ڕۆبڵێک پەیدا کەی.» ڕقی هەستا. بەڵام ئالکسی دەزانی چاکی و گەورەیی چییە؟ وەڵامی ئەوەم پێبدەوە. چاکە بۆ من شتێکە و بۆ کەسێکی چینی شتێکیترە. کەوایە چاکە بۆ هەرکەس پێوەندیی بەخۆیەوە هەیە. وایە یان نا؟ پرسیارێکی مەترسیدارە! پێکەنینت پێم نەیە گەر بڵێم ئەو پرسیارە دوو شەو نەیهێشتووە خەو بچێتە چاوم. ئێستا تەنیا لە خۆم دەپرسم چۆن خەڵکی دەتوانن بژین و فکریشی لێنەکەنەوە؟ قۆڕەدەماخی! ئیوان ئیمانی بەخودا نییە، بەڵام خاوەن بیر و ئەندێشەیە. من لەوە ناگەم. بەڵام زمانی ناگەڕێ. پێموایە فەرماسۆنە. لێم پرسی، بەڵام وەڵامی نەدامەوە. دەمویست لە سەرچاوەکانی ڕۆحی تێراو بم ـ لە ئەلفەوە نەهاتە بێ. بەڵام جارێک وشەیەکی درکاند.

ئالیووشا بە پەلە قسەکەی وەرگرت: «گوتی چی؟»

ـ پێمگوت: «کەوایە ئەگەر ئاوابێ، بۆ هیچ شتێک بەرگێڕەوە نییە و ئازادە؟» ناوچاوی تێکنا و گوتی: «باوە گیانمان، فیۆدۆرپاولۆویچ، دەتگوت

بەرازە، بەڵام ئەندێشەکانی ڕاستە.» هەر ئەوەی گوت. لەوە زیاتر هیچی نەگوت. قسەی ئەو پلەیەک لە قسەی ڕاکیتین چاکتر بوو.

ئالیووشا بە لەبزێکی تاڵەوە گوتی: «ڕاست دەکەی، کەنگێ هات بۆ سەردانت؟»

- باشە بۆ دوایی، ئێستا دەبێ شتێکی دیکە بکەین. سەبارەت بە ئیوان پێشتر هیچم پێنەگوتووی.هەڵیدەگرم بۆ دوایی. کاتێک کارم لێرە تەواو بوو و دادگایی کردنم کۆتاییی هات، ئەو کاتە بۆت باسدەکەم. هەموو شتێکت مووبەموو بۆ باسدەکەم. کارێکی گەورەمان بەدەستەوەیە... تۆش دەبیتە داوەری من، بەڵام ئێستا قسەی لێمەکە؛ بێدەنگ بە. تۆ باسی سبەینێ دەکەی، باسی دادگایی کردن. بەڵام بڕوا دەکەی لەو بارەوە هیچ نازانم.

- لەگەڵ پارێزەرەکەت قسەت کردووە؟

پارێزەر بەکاری چی دێ؟ مووبەموو هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوە. ئەو پیاوێکی زیرەک و لەسەرەخۆ و بەئەدەبە - خۆی بێرناردێکە! بەڵام باوەڕ بە قسەکانم ناکا - باوەڕ بە یەک قسەشم ناکا، بیری لێبکەوە، پێیوایە ئەو کارە کاری من بووە. لێم ڕوونە. لێم پرسی: «بۆ هاتووی بەرەڤانیم لێدەکەی؟» لەشیان داڕزێ! دوکتۆرێکیشیان هێناوە، دەیانهەوێ بیسەلمێنن کە من شێتم. ئەمە ئیتر لە من ناوەشێتەوە! کاترینا ئیوانا، بە هەر کلۆجێک بێ دەیهەوێ «ئەرک»ی خۆی هەتا ئاخر بەجێ بێنێ! میتیا بە تووڕەیی بزەی هاتێ. «پشیلە! بوونەوەرێکی گیان سەختە! دەزانێ لە ماکرۆیە تاریفم کردووە و گوتوومە ژنێکی «ڕۆئەستوور»ە. ئەوەیان دووپاتکردەوە. ئەرێ، وەک خیز و خۆڵ ڕاستەقینە دەرکەوتووە و هەمووشی بە زەرەدی منە. گریگۆری ئەوە لە سەر قسەی خۆی سوورە و بە ئامان و زامان پاشگەز نابێتەوە. پیاوێکی خراپ نییە، بەڵام گەوجە. زۆر مرۆڤی باش هەن، بەڵام گەوجن: ڕاکیتین بیروڕای وایە. گریگۆری دوژمنی منە. هێندێ مرۆڤیش هەن دوژمنی پیاو بن زۆر باشترە. مەبەستم کاترینا ئیوانایە. دەترسم، زۆر دەترسم بڵێ دوای وەرگرتنی ئەو چوارهەزار و پێنجسەد ڕۆبڵە خۆی خستووە بە سەر

کەوشەکانمدا. لەخۆبردووییی ئەوم ناویّ؛ ئەوان لە کاتی دادگایی کردندا ئابڕووم دەبەن. نازانم چۆن دەتوانم تاقەت بێنم. ئالیووشا بچۆ بۆ لای و پێی بڵێ لە دادگا باسی ئەو مەسەلەیە نەکا، ناتوانی بچی؟ قەیناکە لێی گەڕێ، گرینگ نییە! بەجۆرێک لەکۆڵ خۆمی دەکەمەوە. دڵسۆزیی بۆ ناکەم. کاری خۆیەتی هەرچی بەسەری بێ هەقی خۆیەتی. ئالکسی، منیش دانامێنم و بەسەرهاتی خۆم دەگێڕمەوە.» دیسان بزەیەکی تاڵی هاتێ. لەپڕ بە دەنگێکی گریاناوی گوتی: «بەڵام، بەڵام گرووشنکا، گرووشنکا! خودایە گیان! بۆ دەبێ ئەو ئازارە تامڵکەم؟ گرووشنکا دەمکوژێ، خەم و خەیاڵی ئەو دەمکوژێ، دەمکوژێ، تاوێک لەمەوبەر لێرە بوو...»

- بۆی گێڕامەوە، وا دیارە ئەمڕۆ زۆرت دیق کردۆتە دڵییەوە.

ــ دەزانم، نەحلەت لەو ئەخلاقەی من! دڵپیسی وای لێکردم. زۆر بەداخەوەم. کاتێک ڕۆیشت ماچمکرد، بەڵام داوای لێبوردنم لێنەکرد.

ئالیووشا پرسیی: «بۆ؟»

میتیا بە حاڵەتێکی شادانەوە قاقای کێشا.

- کوڕی چاک، یاخودا قەت بەهۆی هەڵەیەکەوە داوای لێبوردن لەو ژنە نەکەی کە خۆشتدەوێ. بەتایبەت لە کەسێک کە خۆشتدەوێ، جا هەرچەندە هەڵەکە گەورەش بێ. چونکە ژن تەنیا شەیتان سەری لە مەکری ژن دەردەچێ: بەوحاڵەشەوە سەبارەت بە ئەوان هیچ نازانم. جا وەرە بە ژنێک بیسەلمێنە کە هەڵەی کردووە، بڵێ «زۆر بەداخەوەم، بمبوورە،» جا ئەو کاتە بزانە چۆن دەکەوییە بەر ڕەهێڵەی تەشەر و تانووت! ئیتر ئەگەر خوداش بێتە تکا لێتنابووری و وات لێدەکا بە عەرزدا بچییە خواری. شتیوا دێنێتە گۆڕێ هێشتا ڕووی نەداوە، تەواوی هەڵسوکەوت و ئاکاری ڕابردووت وەبیر دێنێتەوە. هیچ شتێکی لەبیر ناچێ، بە کەیفی خۆی شاخ و باڵی پێدەدا، کاتێکیش لێت خۆش دەبێ کە تەواوی داخ و کوڵوکۆی خۆی هەڵڕشتبێ. تەنانەت کامە ژن پێتوایە لە هەمووان چاکترە و بێوێنەیە، هەروایە. ئەوی خەتایە دەیخاتە ئەستۆت و دەستەچەورەکەی خۆیت پێدەسرێ. باوەڕ بکە

هـەرکامیـان دەسـتیان بـڕوا هـەر بـە زینـدوویی پێـستی سـەرت دادەمـاڵن. هەمووشیان وان ئەو فریشتانەی کەوا بێ ئەوان ناتوانین بژیین! کوڕی چاک با بۆت لە بنی کوولەکەکە بدەم، هەموو پیاوێکی ئابڕوومەند دەبێ ژێرچەپۆکە و گوێڕایەڵی ژنێک بێ. من لە سەر ئەو باوەڕم ـ باوەڕیش نا، هـەست و دڵـم وام پێدەڵـێن. پیاو دەبێ جوامێر بێ، ئـەوەش بـۆ پیاو زۆر عـەیب نییـە تـا ئەوڕادەیە مردووی ژن بێ! بەڵکو زۆر کارێکی باشیشە. بۆ قارەمانێکیش، تەنانەت بۆ پیاوێکی وەک قەیسەریش عەیب نییە! بەڵام ئەوەشت لەبیر نـەچێ قـەت لـەبـەر خـاتری شـتێکی هـیچ داوای لێبـوردن لـە ژن مـەکـە، ئـەو ئامۆژگارییـەش وەک دیارییـەک لـە بـرای خـۆت وەرگـرە، چونکـە مـن مـار پێوەیداوم و ژنـان تووشـی ڕۆژەڕەشییان کـردووم. ئـەوە لـە گوێ بگـرە و لەبیرت نـەچێ. نـا، دەبێ، بـەشێوەیەک دڵخۆشیی گرووشنکا دەمـەوە، بـەڵام داوای لێبـوردنی لێنـەکـەم. دەیپـەرسـتم ئالکسی، دەیپـەرسـتم. بـەڵام تێناگـا. ئێستاش پێیوایە بە تەواوی خۆشم ناوێ. ئازارم دەدا، بە ئەشقی خۆی ئازارم دەدا. پێشتر وانـەبـوو! لـە ڕابـردوودا تـەنیـا بـە دۆزەخـی لـەشـی نـەرمونۆڵـی ئازاری دەدام، بـەڵام ئێستا ڕۆحـی تێکـەڵ ڕۆحـم کـردووە و بـەهـۆی ئـەوەوە خۆم بە پیاو دەزانم. پێتوایە من و ئەو ببینە ژن و مێرد؟ ئـەگـەر بـەو ئاواتـەم نەگەم و شوو بە کـەسێکی دیکە بکا، دڵنیام داخ و ئێرەیی دەمکووژێ. هـەر ڕۆژەی خـەیاڵێک هەڵمدەچۆقێنێ... سەبارەت بە من دەڵێی چی؟

ئالیووشـا قسـەکـانی گرووشـنکای مووبـەمـوو بـۆ گێڕایـەوە. میتیـا گـوێی ڕاگرتبوو، داوای لێکرد قسەکانی دووپات کاتەوە، خۆشحاڵیشی دەنواند.

ـ کەوایە لە دەست ئەو دڵپیسی و ئێرەییەی من قـەڵس نییە؟ ئـەوەیە ژن! «خـۆم دڵێکـی بـوغزاویم هـەیـە، بـوغز لـە زگـم!» ئـاخ، ئاشـقی ئـەو دڵـەڕەق و بوغزاوییانەم، وادیارە بۆم تامڵناکرێ کەسێک ئێرەییم پێبەرێ. نـاتوانم تـامڵی بکـەم. ئێمـە بـە کێشـە دێین. بـەڵام خۆشـم دەوێ، لـە ڕادە بـەدەریش خۆشـم دەوێ. بڵێی ئێزنمان بدەن ببینـە ژن و مێرد؟ بڵێی بێڵن تاوانباران ژن بێنن؟ پرسیارەکەم ئەمەیە. ئاخر بێ ئەو ناتوانم بژیم...

میتیا بە مرومۆچی بەنێو ژوورەکەدا دەگەڕا. هەوا تاریک داهاتبوو. لە ناکاو خەم دایگرت.

ـ کەوایە دەڵێ ڕازێک لە گۆڕێ دایە؟ پێیوایە پیلانێکم بۆ داڕشتووە و کاتیاش دەستی تێیدایە. نا گرووشنکا خوشەویستەکەم، وانییە. تۆ بەو ئاکارە ژنانە و گەوجانەیەتەوە تووشی هەڵە بووی. دەی ئالیووشا گیان بەسەرهاتی ئێمە ئاوایە! قیروسیا، ڕازی خۆمانت بۆ بەیاندەکەم.

میتیا چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد، بە پەلە ڕۆیی بۆ لای ئالیووشا کە بەرەوڕووی ڕاوەستابوو. بەشێوەیەکی ڕازاوی دەستیکرد بە سرتەسرت. ئەگەرچی لەڕاستیدا هیچکەس گوێی لە دەنگیان نەبوو: دێرەوان لە سووچێک وەنەوزی دەدا و دەنگیان بە گوێی هیچ ئێشکچی و دێرەوانێک نەدەگەیشت.

ـ ڕازەکەی خۆمانت بۆ دەدرکێنم. دەمویست دواتر پێتبڵێم، چونکە ناتوانم بە بێ تۆ سەبارەت بە شتێک بڕیاربدەم. تۆ دین و دنیای منی. ئەگەرچی دەڵێم ئیوان لە ئێمە زیاترە، بەڵام تۆ فریشتەی منی. بڕیاری تۆ بۆ من زۆر گرینگە. بۆ من تۆ زۆر لە ئیوان زیاتری. مەسەلەی ویژدان لەگۆڕێدایە، مەسەلەی ویژدان، دەنا ئەم ڕازە ئەوەندە گرینگە کە خۆم ناتوانم حەلوفەسڵی کەم: بۆیەش وەدوام خستووە بۆ ئەوەی بتوانم لەگەڵ تۆ قسە بکەم. بەڵام ئێستا زووە بۆ بڕیاردان، چونکە دەبێ چاوەڕوانی حوکمی دادگا بین. هەرکاتێک حوکمەکەیان دەرکرد، سەبارەت بە چارەنووسم بڕیار بدە. ئێستا بڕیار مەدە. ئێستا ڕازەکەمت بۆ دەدرکێنم. تەنیا کاکڵی بابەتەکەت بۆ باس دەکەم و تۆش لە ئەلفەوە نایە بێ. بێئەوەی پرسیارێک بکەی و لە جێی خۆت بجووڵێی. باشە؟ بەڵام خودایە گیان، لەگەڵ ئەو چاوانەت بڵێم چی؟ قسەش نەکەی، دەترسم چاوانت بڕیارەکەتم بۆ بدرکێنن، پەککو چەند دەترسم! ئالیووشا گوێ بگرە! ئیوان پێشنیاری پێکردم لە بەندیخانە ڕاکەم. ئیتر وردەکارییەکانیت بۆ باسناکەم: بیرمان لە هەموو بارێکی کردۆتەوە: دەتوانین هەمووی بە باشی بەڕێوە بەرین. جارێ وست بە، بڕیار مەدە، دەمهەوێ لەگەڵ گرووشنکا بڕۆم بۆ ئەمریکا. دەزانی من بەبێ گرووشنکا

ناتوانم بژیم! ئەگەر ئیزنی پێنەدەن بەدوامدا بێ بۆ سیبیریا چبکەم؟ بڵێی بێڵن تاوانباران ژن بێنن؟ ئیوان پێیوایە ناهێڵن. لەوێ بەبێ گرووشنکا لەو ژێرعەرزەدا بە کوتکێکەوە چبکەم؟ لەوانەیە بەو کوتکە سەری خۆم پانکەمەوە! لە لایەکی دیکەوە ویژدانم؟ لەبەر ئازار دەمویست لە زیندان هەڵێم. نیشانەیەک هاتووە، من ئەو نیشانەیە ڕەتدەکەمەوە. ڕێگایەکم بۆ دەربازبوون لەبەردەم دایە، بەڵام پشتی تێدەکەم. ئیوان دەڵێ لە ئەمریکا «ویستە باشەکان» زیاتر گرینگیی پێدەدرێ تاکو مانەوە لەو ژێر زەوییەدا. بەڵام گۆرانییە بن عەرزیلەکەمان چیی بەسەردێ؟ ئەمریکا چییە؟ ئەمریکا دیسان لەخۆبایی بوون و لووتبەرزییە! پێموایە ئەمریکا پڕیشە لە فڕوفێڵ. من لە چنگی دژواری هەڵدەهاتم! با پێت بڵێم، تۆ دەزانی ئالکسی، چونکە تۆ تەنیا کەسێکی لەوە دەگەی. هیچکەسی دیکە نازانێ. ئەوەی سەبارەت بەو گۆرانییە بۆ تۆم باسکردووە، بۆ هەرکەسی دیکەی باسکەم بە شێت و گەوجم دەزانی. لەوانەیە بڵێ لەونم لێگۆڕاوە و سەفی بووم. بەڵام نە گەوجم و نە لەونم لێگۆڕاوە. ئیوانیش ڕازی ئەو گۆرانییە دەزانێ، دەزانێ بەڵام وەڵام ناداتەوە ـ بێدەنگە. ئیمانی بەو گۆرانییە هەیە. قسە مەکە، زمانت نەگەڕێ، تێدەگەم چۆنم چاو لێدەکەی! تو بڕیارتداوە. بڕیار مەدە، واز لە من بێنە! بەبێ گرووشنکا ناتوانم بژیم. هەتا دوای دادگایی کردنەکەم سەبر کە.

میتیا بێئەوەی پاش و پێشی قسەکانی خۆی بزانێ، کۆتایی پێهێنا. بە هەردوودەستی شانی ئالیووشای گرت و چاوە سوور و بێئۆقرەکانی لە براکەی بڕی. بە دەنگێکی پڕ پاڕانەوە بۆ جاری سێهەم دووپاتیکردەوە: «ئیزنی ژن هێنان بە تاوانباران نادەن، دەیدەن؟»

ئالیووشا بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە گوێی ڕاگرت و بە جارێ کەوتە ژێر کاریگەری و گوتی:

ـ پێمبڵێ بزانم ئەوە بیروڕای کێ بوو؟ یانی ئیوان ئاوا لە سەر ئەوە سوورە؟

ـ بیروڕای ئەو بوو، بیروڕای ئەو بوو سووریش بوو لەسەری. سەرەتا نەدەهات بۆ سەردانم، بەڵام حەوتووی ڕابردوو لە ناکاو هات و خێرا بیروڕای خۆی دەربڕی، چەندەش لە سەری سوورە. پرسیارم لێناکا، بەڵکو فەرمانم پێدەدا. گومانی تێدا نییە کە فەرمانەکەی بەڕێوە دەبەم، ئەگەرچی سفرەی دڵم وەک بۆ تۆم کردەوە بۆ ئەویشم کردەوە، سەبارەت بەو گۆرانییەش لەگەڵی دوام. گوتی جێبەجێی دەکا و لە بنج‌وبناوانی دەکۆڵێتەوە. بەڵام ئەوە هەڵدەگرین بۆ دوایی. وەک چنگنە پێوەی نووساوە. هەمووشی لە سەر پارەیە: دەهەزار ڕۆبڵ بۆ هەڵاتن و بیست‌هەزاریش بۆ خەرجی ڕێی ئەمریکا. دەڵێ دەتوانین بە دە هەزار ڕۆبڵ پیلانی هەڵاتنێکی سەرکەوتووانە داڕێژین.

ئالیووشا دیسان پرسیی: «پێشی گوتی بە هیچ شێوەیەک لای من باسی ئەو پیلانە نەکەی؟»

ـ بە هیچکەس نەڵێم، تەنانەت بە تۆش. بێگومان دەترسێ تۆ وەک هەیکەلی ویژدانم لەهەمبەرمدا ڕاوەستی. پێیمەڵێ بۆم باس کردووی. بە هیچ لەونێک پێینەڵێی.

ئالیووشا گوتی: «هەق بە تۆیە. دوای کۆتایی هاتنی دادگاییەکە بڕیاردان مەحاڵە. دوای دادگایی کردنەکە خۆت بڕیار دەدەی. ئەو کاتە ئەو مرۆڤە تازەیە لە دەروونی خۆتا دەدۆزییەوە و ئەو بڕیارەکە دەردەکا.»

میتیا بە چزەبزەیەکەوە گوتی: «مرۆڤی تازە، لەگەڵ بێرناردێک کە بێرناردییانە بڕیار دەردەکا، چونکە پێموایە خۆشم بێرناردێکی قێزەونم.»

ـ ئاخر براکەم، یانی هیچ هیوادارییەکت نییە لێت خۆشبن؟

میتیا بە تووڕەیی شانی هەڵتەکاند و لەگەڵ ئەوەی سوور بووبۆوە سەری هەڵێنا و بە پەلە گوتی:

ـ ئالیووشای خۆشەویست، کاتی ئەوەیە بڕۆی. بەرپرسی بەندیخانە خەریکە لە حەوشەوە دەگوڕێنێ. هەر ئێستا دێ بۆ ئێرە. کاتمان درەنگ کرد،

جوان نییە لە کاتی خۆمان تێپەڕێ. زووکە باوەشم پێدا کە و ماچم کە. براگیان خاچم بکێشە، لەبەر خاتری ئەو خاچەی سبەینێ بە کۆڵیدا دەدەم.

یەکتریان لە ئامێز گرت و دەستیانکرد بە ماچومووچ.

میتیا لە ناکاو گوتی: «ئیوان پێشنیاری هەڵاتنم پێدەکا، بەڵام بڕوای وایە ئەو کارە کاری منە و من باوکمانم کوشتووە.»

ئالیووشا پرسیی: «لێت پرسیوە بیروڕای چییە؟»

ـ نا، لێم نەپرسیوە. دەمویست لێیبپرسم، بەڵام نەمتوانی. زاتم نەکرد. بەڵام ئەوەم لە چاوانیدا خوێندەوە. چاکە جارێ خودا حافیز!

جارێکی دیکەش بە پەلە یەکتریان ڕامووسی و ئالیووشا دەیویست بڕواتە دەرێ، میتیا دیسان قاوی لێکرد: «بەرەوڕووم ڕاوەستە! ئاوا!»

دیسانیش بە هەردوو دەست شانی ئالیووشای گرت. لە ناکاو ڕەنگی پەڕی و سپی هەڵگەڕا، بەجۆرێک کە لەو تاریکاییەی دیوەکەشدا بە جوانی دیار بوو. لێوی دەلەرزی و چاوی لە ئالیووشا بڕی. هیوابڕاوانە گوتی:

ـ ئالیووشا، ئەوەی هەقیقەتە، وەک لە هەمبەر خودادا بی، پێمبڵێ. با بزانم تۆش پێتوایە من ئەو جینایەتەم کردووە؟ یانی تا ئێستا وات بیرکردۆتەوە؟ ڕاستیم پێبڵێ و درۆ مەکە!

دەتگوت هەموو شتێک لە هەمبەر ئالیووشادا قوت بوونەتەوە و خەنجەر لە جەرگی ڕادەکەن.

بە داماوی منجاندی: «وست! مەبەستت چییە؟»

میتیا دووپاتی کردەوە: «ڕاستییەکەیم پێبڵێ، درۆ مەکە!»

دەنگێکی لەرزۆک لە گەرووی ئالیووشاوە هاتە دەرێ: «قەتم بیر لێنەکردۆتەوە و تۆ بە قاتڵ نازانم!» دەستی ڕاستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە وەک ئەوەی خودا بە شایەد بگرێ.

میتیا زەردەیەکی گرت و بە نەرمی، وەک ئەوەی دوای بێهۆشی هەناسەیەک هەڵکێشێ، گوتی: «سپاست دەکەم! ئێستا ژیانی نوێت پێدامەوە. بڕوا دەکەی، تا ئەم کاتە نەمدەوێرا لێت بپرسم، لە تۆ دەترسام، تەنانەت لە

تۆش. چاکە، برۆ ئیتر! تین و گورێکی تازەت پێدام بۆ سبەینێ. خودا خێرت وەرێ بێنێ! چاکە، برۆ!» دواپین قسەشی ئەمە بوو: «ئیوانت خۆشبوێ!»

ئالیووشا بە گریانەوە ڕۆیی بۆ دەرێ. ئەو بێمتمانەییەی میتیا ئەو شک و گومانەی لەوی هەبوو، خەم و هیوابڕاویی ڕۆحە ناشادەکەی میتیای بۆ دەرخست. هەر خێراش خۆشەویستی و بەزەییەکی بێپایان سەرتاپای داگرت. ژانێکی جەرگبڕیش لەناخیدا ڕەگی داکوتا. «ئیوانت خۆشبوێ.» ـ لە ناکاو قسەکانی میتیای وەبیر هاتەوە. ئەویش خەریکبوو دەچوو بۆ لای ئیوان. ئەو ڕۆژە بە ئاواتەوە بوو چاوی پێی بکەوێ. چەندە دڵەدوای میتیا بوو، بەوڕادەیەش دڵەدوای ئیوان. ئێستاش زۆر لەپێشوو زیاتر خەمبار و تامەزرۆی دیتنی ئیوان بوو.

(٥)

# کاری تۆ نەبوو، کاری تۆ نەبوو!

ئالیووشـا، کاتێـک بـەرەولای ئیـوان وەڕێکـەوت، ناچـار بـوو بـەلای مـاڵی کاترینا ئیوانادا تێپەڕێ. پەنجێرەکان ڕووناک بوون. لە ناکاو لە جێی خۆی ڕاوەستا و بڕیاریدا بچێتە ژوورێ. حەوتوویەک زیاتر بوو چاوی بە کاترینا ئیوانا نەکەوتبوو. بەڵام ئێستا لەخۆڕا لەدڵیدا کە دەبێ ئیوان لەلای ئەوبێ، بەتایبەت شەوی ئەو ڕۆژە سامناکە. لەدەرگای دا و تاهات لە پلیکانەکان وەسەرکەوێ، کە شۆقی کزی لەنتەرێک ڕووناکی کردبۆوە و پیاوێک خەریک بوو پێیدا دەهاتە خوارێ. کە نزیکبۆوە ناسییەوە، ئیوانی برای بوو. دیار بوو لەلای کاترینا ئیوانا بوو.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ بەشێوەیەکی ساردوسڕ گوتی: «ئەتۆی، گوتم بلێی کێ بێ؟ دەی من دەڕۆم، خوداحافیز! دەچی بۆ لای ئەو؟»

- ئەرێ.

- بە قسەی من دەکەی مەچۆ. زۆر ناڕەحەتە تۆش بچی زیاتر تێکدەچێ، مەچۆ.

لەسەرەوە دەرگاکە لە سەر ڕەقی پشت کرایەوە و دەنگێک هات:

- نا، نا! ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، لەلای ئەو بووی؟

- ئەرێ، لەلای بووم.

- پەیامی بۆ نەناردووم؟ ئالیووشا وەرە سەرێ. ئیوان فیۆدۆرۆویچ تۆش دەبێ بگەڕێیەوە. حاڵی بووی؟

قسەکەی ئەوەندە قورس و فەرمانپێدەرانە بوو، ئیوان فیۆدۆرۆویچ دوای تاوێک دوودڵی، بڕیاریدا لەگەڵ ئالیووشا بڕواتەوە سەرێ.

لەبەر خۆیەوە بە تووڕەیی گوتی: «لەپشت دەرگاکە گوێی گرتبوو،» بەڵام ئالیووشا دەنگی ئیوانی نەبیست.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ، ڕۆیی بۆ ژووری میوانداری و گوتی: «بمبوورە کە باڵتەکەم داناکەنم. نامەوێ دانیشم. تەنیا خولەکێک دەمێنمەوە.

کاترینا ئیوانا گوتی: «ئالکسی فیۆدۆرۆویچ دانیشە،» بەڵام خۆی هەر بە پێوە بوو. لەو ماوەیەدا گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتبوو، بەڵام چاوە ڕەشەکانی نەخسییەکی تێدا دەدرەوشایەوە. ئالیووشا دواتر وەبیری هاتەوە کە لەو کاتەدا زۆری پێ‌جوان بووە.

ـ داوای لێکردی چیم پێبڵێی؟

ئالیووشا ڕاست چاوی لە چاوی بڕی و گوتی: «تەنیا شتێک، ئەویش ئەوەیە چاوپۆشیی لێبکەی، لەوەی (شڵەژا و زمانی کەوتە تەتەڵە) «... لەنێوانتان دایە... یانی ئەو ڕازەی کاتی ئاشنایەتیتان... لەو شارە... لە دادگا باسی نەکەی.»

کاترینا ئیوانا بە پێکەنینێکی تاڵەوە گوتی: «ئەها، ئەوەی کە لەبەر خاتری پارە خۆمدا بە سەر کەوشەکانیدا! بۆ، لەبەر من دەترسێ یان لەبەر خۆی؟ داوام لێدەکا چاوپۆشی بکەم  ـ لە کێ؟ لە ئەو یان لە خۆم؟ ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، پێمبڵێ بزانم!»

ئالیووشا، کە هەوڵی دەدا لە وتەکەی تێبگا، بە وردی چاوی تێبڕی و بە ئارامی وەڵامی دایەوە: «لە تۆش و لە خۆشی.»

کاترینا ئیوانا بەشێوەیەکی تۆسنانە دەنگی هەڵێنا: «خۆشحاڵم ئەوە دەبیستم،» لە ناکاویش سوورهەڵگەڕا. پاشان وەک ئەوەی هەڕەشە بکا، گوتی: «ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، هێشتا من ناناسی. تەنانەت خۆشم هێشتا خۆم ناناسم. ڕەنگە سبەینێ دوای لێپرسینەوە بە پەڕۆیەکی پیس کلکم بگرن و فڕێمدەن.»

ئالیووشا گوتی: «سادقانە شایەدی بدەی باشە، لەوەش زیاتر هیچ چاوەڕوانییەکی دیکەمان نییە.»

کاترینا ئیوانا بە ددانە چیڕەوە گوتی: «ژنان زۆر جار سادق نین. هەر سەعاتێک لەمەوبەر بیرم دەکردەوە کە ناوێرم دەست لەو ڕمووزنە بدەم... هەر دەڵێی دەعبایە... بەڵام نا، هێشتا بە مرۆڤی دەزانم!» هەر لەو کاتەدا کە بەرەو ئیوان فیۆدۆرۆویچ ڕووی وەردەگێڕا، وەک شێت و هار لە ناکاو قیژاندی: «یانی کاری ئەو بووە! یا ئەو باوکتانی کوشتووە؟» ئالیووشا هەر خێرا تێگەیشت کە ئەویش ئەو پرسیارەی لە ئیوان کردووە، ڕەنگە تاوێک بەر لە هاتنە ژووریێ. ئەویش نەک جارێک، بەڵکو سەد جار، هەموو جارێکیش لە سەر ئەو پرسیارە بە کێشە هاتبوون.

کاترینا ئیوانا هەروا کە ڕووی لە ئیوان فیۆدۆرۆویچ بوو، لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «دەمویست بچم بۆ سەردانی ئیسمیردیاکۆف... تۆ قەناعەتت پێهێنام کە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، فیۆدۆرپاولۆویچی کوشتووە. من بڕوام بە قسەکەی تۆ کرد!» ئیوان زەردەیەکی خەماوی نیشتە سەرلێوی. ئالیووشا بەو قسەیە هەڵبەزییەوە. پێیوانەبوو تا ئەوڕادەیە لێک نزیکن و موو بە بەینیاندا ناچێ.

ئیوان باسەکەی گۆڕی: «باشە، ئیتر بەسیکەن. من دەڕۆم. سبەینێ دێم.» خێرا وەرسووڕا، لە ژوورەکە چووە دەرێ و بە پلیکانەکاندا داگەڕا.

کاترینا ئیوانا، بە هەردوو دەستی شانی ئالیووشای گرت و وەک ئەوەی فەرمانی پێبدا بەسرتەیەکی عەجوولانە گوتی:

- بڕۆ بە دوایدا! پێیبگەوە! چاوی لێخافڵ مەکە! شێت بووە! بۆ نازانی وەک شێت و هاری لێهاتووە؟ تووشی تاویاو بووە: یاوی مێشک.

دوکتۆر گوتی: «بڕۆ. هەڵێ بەدوایدا...

ئالیووشا هەستا سەرپێ و بەدوای ئیوان فیۆدۆرۆویچدا هەڵات، کە پەنجا هەنگاوێک دوور کەوتبۆوە.

ئیوان تێگەیشت کە ئالیووشا بەدوایدا ڕادەکا. خێرا ئاوڕی دایەوە: «چت دەوێ؟ پێیگوتی خۆتم پێبگەیەنی، چونکە شێت بووم.» بە تووڕەییش گوتی: «هەموو ئەوانەم لەبەرە.»

ئالیووشا گوتی: «ڕەنگە بە هەڵە چووبێ؛ بەڵام ئەوەی ڕاستە کە دەڵێ نەخۆشی. هەر ئێستا چاوم لە ڕوخسارت کرد. ئیوان زۆر تێکچووی، ڕەنگی مردووت لێنیشتووە.»

ئیوان بێئەوەی ڕاوەستێ ملی ڕێی گرت. ئالیووشاش وەدوای کەوت.

ئیوان بە نەرمی و بێتووڕە بوون، ڕووڕاست و کونچکاوانە پرسیی: «ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، دەزانی مرۆڤ چۆن شێت دەبێ؟»

- نا، نازانم. پێموایە شێتی چەندین جۆری هەیە؟

- بڵێی پیاو خۆی بزانێ خەریکە شێت دەبێ؟

ئالیووشا بە سەرسووڕمانەوە وەڵامی دایەوە: «پێموایە پیاو ناتوانێ لەو حاڵەدا بە جوانی خۆی ببینێ.»

ئیوان تۆزێ مات بوو و لە ناکاو گوتی: «ئەگەر دەتەوێ لەگەڵ من بەڕێدا بڕۆی، تکایە باسەکە بگۆڕە.»

ئالیووشا شەرمنانە گوتی: «ئاخ، لەبیرم نەبوو، نامەیەکم بۆ هێناوی،» نامەکەی لیزای لە گیرفانی دەرهێنا و دایە دەستی ئیوان. لە ژێر دارتێلێک ڕاوەستابوون کە گولۆپێکی پێوە هەڵکرابوو. ئیوان خێرا دەستنووسەکەی ناسییەوە. بە بزەیەکی زیرەکانەوە گوتی: «پەککو، لە دەست ئەو شەیتانە!» بێئەوەی پاکەتەکەش هەڵپچڕێ، لەتوکوتی کرد و بڵاوی کردەوە. وردەکاغەزەکان با بردی.

ئیوان بە لەبزێکی پڕسووکایەتی گوتی: «پێموایە هێشتا نەبۆتە شازدە ساڵان دەیەوێ خۆیمان بەسەردا ببڕێ،» دیسان بە گوێ شەقامەکەدا کەوتەڕێ.

ئالیووشا بەسەرسووڕمانەوە پرسیی: «مەبەستت چییە لە "خۆیمان بەسەردا دەبڕێ؟"»

ـ دەتەوێ بزانی، ڕاست ئەو کارەی ژنانی بەستۆکە دەیکەن.
ئالیووشا، خەمبارانە و تاڕادەیەک تووڕە دەنگی هەڵێنا: «چۆن دڵت دێ قسەی وادەکەی، ئیوان ئەوە بەڕاستتە؟ ئەو کچە منداڵە، چۆن تۆمەت لەو منداڵە دەدەی؟ نەخۆشە؛ زۆریش نەخۆشە. ئەویش خەریکە شێت دەبێ... ناچار بووم نامەکەی بێنم بۆت... خودا خودام بوو شتێکت لێبیستم... بەهیوابووم نەجاتی بدەی.»
ـ بەهیوای من مەبە. ئەگەر ئەو منداڵە، خۆ من پەرەستاری نیم. ئالکسی بێدەنگ بە. واز لەو قسانە بێنە. من هەر بیریشی لێناکەمەوە.
دیسان بێدەنگ بوونەوە.
ئیوان دیسان بە تووڕەیی گوڕاندی: «ئەو ئێستا هەتا بەیانی لەبەر دایکی دوو عالەم دەپاڕێتەوە کە نیشانیدا سبەینێ لە دادگا چۆن هەڵسوکەوت دەکا.»
ـ مەبەستت... مەبەستت کاترینا ئیوانایە؟
ـ ئەرێ. کە میتنکا نەجاتدا، یان لەنێوی بەرێ. دوعا دەکا تیشکی هیوا و ڕێنوێنی دڵی ڕووناک بکاتەوە. خۆی ناتوانێ بڕیار بۆ خۆی بدا. هێشتا دەرفەتی نەبووە بڕیار بدا. ئەویش من بە پەرستاری خۆی دەزانێ. دەیەوێ لایەلایەی بۆ بکەم و بیلاوێنم.
ئالیووشا بە لەبزێکی خەمناکانە گوتی: «براکەم، کاترینا ئیوانا خۆشی دەوێی.»
ـ ڕەنگە؛ بەڵام من دڵم پێوەی نییە.
ئالیووشا بەشێوەیەکی شەرمنانە و سەرکۆنەکەرانە لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «ئەو ئازار دەکێشێ. بۆ... هێندێ قسەی وای بۆ دەکەی تەواو هیوادار دەبێ. دەزانم هیوادارت کردووە.» گوتیشی: «بمبوورە کە ئاوات قسە لەگەڵ دەکەم.»
ئیوان بە تووڕەیی گوتی: «ئەو جۆرەی کە پێویستە ناتوانم هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەم ـ کتوپڕ وازی لێناهێنم و بەبێ شەرم کردن ناڵێم وازم لێهێناوە. دەبێ سەبرکەم تاکو حوکوم بۆ قاتڵەکە دەبڕنەوە. ئەگەر ئێستا لێی هەڵبڕێم،

سبەینێ لە دادگا بە لە نێو بردنی ئەو هیچوپووچە تۆڵە لە من دەکاتەوە. چونکە ڕقی لەوە و دەشزانێ ڕقی لێیەتی. هەمووی درۆیە، درۆ لە سەر درۆ! هەتا کاتێک لێی هەڵنەبڕێم هیوابڕاو نابێ و ئەو ڕمووزنە لە نێو نابا، چونکە دەزانێ من دەمەوێ لەو گرفتارییە ڕزگاریکەم. خۆزگە ئەو حوکمە نەگبەتییە دەربکرایە!»

وشەی «قاتڵ» و «ڕمووزن» لە دڵی ئالیووشادا بوو بە زایەڵەیەکی بە ژان. تۆزێ بیری لە وتەکانی ئیوان کردەوە و پرسیی:

- ئاخەر چۆن دەتوانێ میتیا لە نێو بەرێ؟ دەتوانێ چ شایەدییەک بدا کە دەبێتە هۆی لە نێو چوونی میتیا؟

ــ هێشتا ئەوە نازانی. بەڵگەیەکی لە لایە و دەستنووسی میتنکایە. بەخاترجەمی ئەو بەڵگەیە دەیسەلمێنێ کە ئەو باوکمانی کوشتووە.

ئالیووشا گوڕاندی: «مەحاڵە!»

- بۆ مەحاڵە؟ خۆم خوێندوومەتەوە.

ئالیووشا بە گەرمی دووپاتیکردەوە: «بەڵگەی وا هەر نییە! چونکە ئەو پیاوکوژ نییە. ئەو قاتڵی باوکم نییە، کاری ئەو نییە، نا. کاری ئەو نییە!»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە ناکاو ڕاوەستا و بە خوێنساردییەکی ئاشکراوە پرسیی: «ئەی قاتڵ کێیە؟ بە بڕوای تۆ دەبێ کێ بێ؟» بە دەنگێکی گڕ و لەخۆباییانە ئەوەی گوت.

ئالیووشا بە دەنگێکی ئارام و کارتێکەرانە گوتی: «خۆت دەزانی کێیە.»

- کێ، مەبەستت ئەو قسە هەڵیتوپڵیتانەیە وا سەبارەت بە ئیسمیر دیاکۆفی شێت و فێدار کەوتۆتە سەر زاران؟

ئالیووشا لە ناکاو هەستیکرد سەرتاپای دەلەرزێ، وشەگەلی «خۆت دەزانی کێیە»ی بێئیختیار بە زاردا هاتبوو. هەناسەی سوار بووبوو.

ئیوان بەشێوەیەکی وەحشییانە هاواریکرد: «کێ؟ کێ؟» لەپڕ ئارا و قارای لێهەڵگیرا.

ئالیووشا، دیسان بە دەنگێکی نزیک بەسرتەوە درێژەی بە قسەکانی دا: «تەنیا شتێک دەزانم، ئەوەی باوکمانی کوشت تۆ نەبووی.»

ئیوان بە جارێ تووشی سەرسووڕمان بوو.

ـ تۆ نەبووی! مەبەستت لە «تۆ نەبووی!» چییە،

ئالیووشا بە دڵنیایی دووپاتی کردەوە: «ئەو کەسەی باوکمانی کوشت، تۆنەبووی، کاری تۆ نییە!»

نیو دەقیقەیەک بێدەنگ بوون.

ئیوان، بە بزەیەکی سارد و سڕەوە گوتی: «ئەوە خۆشم دەزانم. خەریکی وڕێنە دەکەی؟» چاوی لە ئالیووشا بڕیبوو. دیسان لە ژێر کۆڵەکەی کارەباکە ڕاوەستان.

ـ نا، ئیوان. خۆت چەند جار گوتووتە کوشتوومە.

ئیوان، داماوانە منجاندی: :کەنگێ شتی وام گوتووە؟ من لە مۆسکۆ بووم... کەنگێ شتیوام گوتووە؟»

ئالیووشا لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «لە ماوەی ئەم دوومانگەدا واوەیلا، زۆر تەنیا و بێکەس بووی، زۆر جار ئەوەت بەخۆت گوتووە.» وەک پێشوو بە نەرمی و ڕاشکاوی قسەی دەکرد، هەر لەوکاتەشدا دەتگوت بێئیختیار دەدوێ و پێڕەوی لە فەرمانێکی ڕوون و ئاشکرا دەکا. «خۆت تۆمەتبار کردووە و بە خۆتت سەلماندووە کە قاتڵ جگە لە تۆ هیچکەسی دیکە نییە. بەڵام ئەو کارەت نەکردووە: بە هەڵەچووی: قاتڵ تۆ نییت. حاڵی بووی؟ کاری تۆ نییە! خودا ناردوومی ئەوەت پێبڵێم.»

هەردووکیان بێدەنگ بوون. خولەکێکی تەواو متەقیان نەکرد. هەردووکیان هەروا ڕاوەستابوون و چاویان لە چاوی یەکتر بڕیبوو. ڕەنگیان هەڵبزڕکابوو. لە ناکاو سەرتاپای ئیوان وەلەرزین کەوت، شانی ئالیووشای گرت و بە لەبزێکی تووڕە گوتی:

ـ تۆ لە ژوورەکەی من بووی! شەوێ لەوێ بووی، ئەو کە هات... دانی پیانێ... دیتووتە، ئاگات لێبووە!

ئالیووشا بە سەرسامی گوتی: «مەبەستت کێیە ـ میتیا؟»
ئیوان شێتانە گوڕاندی: «ئەو نا، بەنەحلەت بێ ئەو ڕموورنە! بۆ زانیوتە ئەو دێ بۆ دیدەنیم؟ چۆنت زانیوە؟ پێم بڵێ!»
ئالیووشا کە ترسی لێنیشتبوو، منجاندی: «ئەو کێیە، نازانم باسی کێ دەکەی.»
ـ ئەرێ، حەتمەن دەزانی... دەنا بۆ لەوە ئاگاداری... مەحاڵە نەزانی.
ئیوان وەک ئەوەی دان بە خۆیدا بگرێ. لەسەرەخۆ ڕاوەستا و واینواند کە بیر دەکاتەوە. چزەبزەیەکی سەیر دەمی پێ پان کردەوە.
ئالیووشا بە دەنگێکی لەرزۆک دیسان وەقسە هات: «براکەم، ئەوە هەر بە تۆ دەڵێم، چونکە بڕوام پێدەکەی، ئیتر لە هیچی دیکە ئاگادار نیم. ئێستا بۆ دوایین جار! خودا لە دڵی ناوم کە ئەوەت پێبڵێم. ئەگەر ببێتە هۆی ئەوەی لەم ساتەوە لەبەرچاوت تاڵبم.ـ
بەڵام تا ئێستا ئیوان فیۆدۆرۆویچ وادیار بوو تەواو دانی بەخۆیا گرتووە. بزەیەکی ساردوسڕ کەوتە سەرلێوی و گوتی:
ـ ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، تاقەتی پێغەمبەران و فێدارانم نییە ـ بەتایبەت ڕەوانەکراوانی خودا ـ تۆش ئەوە زۆر چاک دەزانی. لەم ساتەوە ڕەنگە بۆ هەتاهەتا پێوەندیم لەگەڵ تۆ نەمێنێ و لێکهەڵبڕێین. تکات لێدەکەم لە سەر ئەم دووڕێیانە لێم جیا بەوە. مەزڵەکەی تۆش لەولاوەیە. واچاکە ئاگات لەخۆت بێ و بەتایبەتی ئەمڕۆ تخوونم نەکەوی! حاڵی بووی؟
ڕووی وەرگێڕا، بێئەوەی ئاوڕ بداتەوە، بە هەنگاوی قورس و قایم کەوتە ڕێ.
ئالیووشا لە دواوە هەرای لێکرد: «براکەم، ئەگەر لە ئەمڕۆ بەدواوە تووشی ڕووداوێک بووی، بەرلە هەمووکەس وەرە بۆ لای خۆم!»
بەڵام ئیوان وەڵامی نەدایەوە. ئالیووشا لە سەر دووڕێیانەکە چووە ژێر کۆڵەکەی کارەبایەک و ڕاوەستا، هەتا ئیوان لە تاریکیدا بزر بوو. پاشان وەرسووڕا و بەرەو ماڵێ وەڕێکەوت. ئالیووشا و ئیوان هەردووکیان لە

ژووری خزمەتکاراندا دەژیان؛ هیچکامیان پێیان خۆش نەبوو لەو ماڵە چۆڵەی باوکیاندا نیشتەجێ بن. ئالیووشا لە ماڵی بازرگانێک، ژوورێکی بە کرێ گرتبوو. ئیوانیش هەر لەو گەڕەکە وەتاغێکی پێشخزمەتییانەی گەورە و بەرفەرێحی بەکرێ گرتبوو، کە دیوار بە دیواری ماڵی بێوەژنێکی جوان و خۆشگوزەران بوو. ئەو بێوەژنە مێردە کارمەندەکەی نەمابوو. تەنیا کڵفەتێکی بوو، ئەویش ژنێکی ئەرخەنناس و کەڕ و بادار بوو. هەموو ڕۆژێ سەعات شەشی عەسر دەخزایە پێخەفەکەیەوە و سەعات شەشی بەیانی هەڵدەستا. ئیوان فیۆدۆرۆویچ لەم دواییانەدا ڕووی لە شادی و ژیانی خۆش وەرگێڕابوو و خووی بە تەنیایی گرتبوو. لە ژوورێکدا دەژیا و هەموو کاروبارەکانی خۆی جێبەجێی دەکرد و سەری بە هیچکام لە وەتاغەکانی دیکەدا نەدەکرد. گەیشتە بەر دەرگای ماڵێ، هات دەستبەرێ بۆ ئاڵقەی دەرگاکە و لەپڕ ڕاوەستا. هەستی کرد ئازای ئەندامی لە داخ و ڕقان دەلەرزێ. زوو دەستی لە ئاڵقەی دەرگاکە بەردا و لەگەڵ جنێوێک وەرسووڕا و بە پەلە گەڕایەوە. کیلۆمەتر و نیوێک بەڕێدا ڕۆیشت تا گەیشتە ماڵە دارینەیەکی چکۆڵە و داروبار ڕزیو کە زیاتر لە کۆخێک دەچوو، ماریا کیندراتیفنا لەوێ دەژیا، هەر ئەو جیرانەی بۆ وەرگرتنی شۆربا دەهات بۆ چێشخانەکەی فیۆدۆرپاولۆویچ و جارێک ئیسمیر دیاکۆف گیتاری بۆ لێدابوو و گۆرانیی بۆ گوتبوو، ماڵە چکۆلانەکەی خۆیان فرۆشتبوو و ئێستا لەگەڵ دایکی لەو خانووە دارینەدا دەژیان. ئیسمیر دیاکۆف نەخۆش بوو - هیچکەس پێی وانەبوو دەمێنێ - لەدوای مردنی فیۆدۆرپاولۆویچ چووبوو بۆ لای ئەوان. ئیوان فیۆدۆرۆویچیش کە هێزێکی کتوپڕ بەدوای خۆیدا ڕایدەکێشا - هەر ئێستا دەیویست بچێ بۆ لای ئەو.

## (٦)

## یەکەمین چاوپێکەوتن لەگەڵ نیسمیر دیاکۆف

ئەمە سێهەمین جار بوو ئیوان لەدوای گەڕانەوە لە مۆسکۆ دەچوو بۆ لای ئیسمیر دیاکۆف. یەکەم جار دوای ڕووداوەکە چوو بۆ لای و قسەی لەگەڵ کرد، ئەو ڕۆژە بوو کە هاتبۆوە، پاش ئەوە دووحەوتوو دواتر، دیسان چوو بۆ سەردانی. بەڵام لێرەدا کۆتاییی بە دیدارەکانی نەهێنابوو. بۆیە مانگێک زیاتر بوو چاوی پێی نەکەوتبوو، هەواڵیشی لێی نەبوو. ئیوان پێنج ڕۆژ دوای مردنی باوکی گەڕابۆوە، بۆیە لە ڕێوڕەسمی ناشتنی باوکیدا بەشدارییەکرد کە ڕۆژێک بەر لە گەڕانەوەی بەڕێوە چوو. هۆی وەدەرنگ کەوتنەکەشی ئەوە بوو ئالیووشا ناونیشانی نەدەزانی و ناچار بوو بچێ بۆ لای کاترینا ئیوانا تاکو برووسکەی بۆ بنێرێ. لەلایەکیشەوە ئیوان فیۆدۆرۆویچ لەگەڵ گەیشتنە مۆسکۆ چوو بۆ دیدەنی خوشکی و پووری و برووسکەی بۆ لێدان، بەڵام ئیوان هەتا چوار ڕۆژ دوای گەیشتن نەچوو بۆ لایان. پێویست بە گوتن ناکا، لەگەڵ ئەوەی برووسکەی پێگەیشت بە چوارناڵ گەڕایەوە بۆ شارەکەمان. یەکەم کەس کە چوو بۆ دیدەنیی ئالیووشا بوو. ئیوانیش بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە بۆی دەرکەوت کە بە پێچەوانەی گومانی خەڵک، میتیا بە تۆمەتبار نازانێ و بە ڕاشکاوی دەڵێ ئیسمیر دیاکۆف قاتڵە. دواتر، پاش چاوپێکەوتنی لەگەڵ سەرۆکی پۆلیس و دادوەر و بیستنی چۆنیەتیی ڕووداوەکە و تۆمەتبار و قوڵبەست کردنی میتیا، سەری لە ئالیووشا سووڕما و هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئالیووشا بەهۆی هەستی هاودڵی و برایانە

میتیا بە بێتاوان دەزانێ. چونکە ئیوان دەیزانی ئالیووشا هۆگرییەکی زۆری بە میتیا هەیە.

وا باشە یەک دوو وشەش سەبارەت بە هەستی ئیوان دەرهەق بە دیمیتری فیۆدۆرۆویچی برای بدرکێنم. ناخۆشی نەدەویست، تەنیا هێندێ جار دەرهەق بە ئەو دڵسۆزیی دەنواند، کە ئەویش هاوڕێ بوو لەگەڵ ڕق و بێزاری. قێزی لە هەڵسوکەوت و تەنانەت قەڵافەتی دزێوی میتیا هەڵدەستا. ئیوان زۆری پێناخۆشبوو کە دەیدی کاترینا ئیوانا حەز لە میتیا دەکا. لەگەڵ ئەوانەشدا هەر ئەو ڕۆژەی گەیشتەوە ماڵێ خێرا چوو بۆ سەردانی میتیا. ئەو ملاقاتەش گومانی ئەو تاوانەی لە مێشکی ئیواندا نەک کەم نەکردەوە، بەڵکو قایمتریشی کرد. دیتی میتیا زۆر شڵەژاوە و وەک شێتی لێهاتووە. میتیا چەنەدرێژی و چەقەسرۆیی کردبوو. بەڵام قسەکانی ئاڵۆز و بێسەرەوبەرە بوون. قسەی زلی دەکرد، ئیسمیر دیاکۆفی بە تاوانبار دەزانی و بە جارێ تێکەڵی کردبوو. سەری زمان و بنی زمانی سێ هەزار ڕوبڵ بوو، کە دەیگوت باوکی لێی «دزیوە». لە پەستا دووپاتی دەکردەوە: «ئەو پارەیە هی خۆم بوو. پارەی خۆم بوو. تەنانەت ئەگەر دزیباشم، هەقم بوو.» سەبارەت بەو شایەدییانەی، بە زەرەدی ئەو دابوویان، نارەزایەتیی دەرنەدەبڕی، تەنانەت ئەگەر دەیویست ڕاستییەکیش بەقازانجی خۆی بگۆڕێ، نەیدەتوانی بیسەلمێنێ و قسەکەی بە هیچ دەردەچوو. وادیار بوو نەیدەویست لە هەمبەر ئیوان یان کەسانی دیکەدا بەرگری لە خۆی بکا. بەپێچەوانە ئەو تۆمەتانەی زۆر پێناخۆشبوو و پێی تووڕە و ئاڵەتی دەبوو؛ زووزوو هەڵدەچوو جنێوی بە هەمووان دەدا. کاتێک باسی شایەدییەکەی گریگۆری دەکرا کە دەرگاکە ئاوەڵا بووە، بەشێوەیەکی پڕسووکایەتی دەیدا لە قاقای پێکەنین و دەیگوت: «ئەوەی ئەو دەرگایەی کردەوە شەیتان بوو.» بەڵام نەیدەتوانی بەڕوونی سەبارەت بەو ڕاستییە بدوێ. تەنانەت توانیی لە ماوەی دیدارەکەیاندا قسەی ناخۆش بە ئیوان بڵێ و نەڕاندی بەسەریدا کە ئەو کەسانەی لە من بەگومانن «هەقی هەموو شتێکیان هەیە» بەڵام هەقیان نییە شکیان لەو بێ و دادگاییی بکەن. لە

سەر یەک ئەو دیدارەی لەگەڵ ئیوان زۆر تاڵ و ناخۆش بوو و بە هیچ شێوەیەک ناتوانین ناوی دیدارێکی دۆستانەی لێبنێین. دوای ئەو دیدارە ئیوان فیۆدۆرۆویچ لەڕێوە چوو بۆ لای ئیسمیر دیاکۆف.

کاتێک لە مۆسکۆوە بە سواری شەمەندەفەر دەگەڕایەوە، بیری لە دوایین وتوویژی خۆی و ئیسمیر دیاکۆف دەکردەوە کە ئەو ئێوارەیە بەر لە سەفەرەکەی لەلای بووبوو. زۆربەی شتەکان بە بڕوای ئیوان جێی شک و گومان بوون. بەڵام کاتێک وەڵامی دادوەری دەدایەوە، ئەو کاتە هیچی نەگوت، دەستی ڕاگرت چونکە ئەو کاتە ئیسمیر دیاکۆف لە نەخۆشخانە بوو. دوکتۆر هێرتێزنستیۆب و دۆکتۆرێکی دیکە کە ناوی وارویۆنسکی بوو، کاتێک لە نەخۆشخانە چاویان پێیکەوت، لە وەڵامی پرسیارە پێداگرانەکانیدا بە دڵنیاییەوە گوتیان کە بێگومان سەرودڵ لێهاتنی ئیسمیر دیاکۆف ڕاست بووە، کاتێک پرسیی ئیسمیر دیاکۆف ڕۆژی ڕووداوەکە خۆی نەخوش خستووە یان نا، بەڕاستی تووشی سەرسووڕمان بوون. پاشان تێیانگەیاند کە فێلێهاتنی ئەو شەوەی بە هەڵکەوت بووە و گەشکەکەی زۆری خایاندووە و چەند جار لە سەر یەک سەرودڵی لێهاتووە. بەجۆرێک کە نەخۆشەکە سەتاسەت ژیانی لە مەترسیدا بووە. دوای دەوا و دەرمانێکی زۆر توانییان دڵنیا بن کە نامرێ. دوکتۆر هێرتێزنستیۆب لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «بەڵام لەوانەیە هەتا ماوەیەک، بۆ هەتا هەتا نا، ئەقڵی بگۆڕدرێ.» لە وەڵامی بێسەبرانەی ئیوان فیۆدۆرۆویچدا کە گوتی ئێستا شێتە یان نا، گوتی کە شێتییەکەی زۆر گرینگ نییە و ناتوانین بڵێین تەواو شێتە، بەڵام تووشی شڵەژان و پەرۆشیی ڕۆحی بووە. ئیوان فیۆدۆرۆویچ بڕیاریدا هۆی ئەو ئاڵۆزی و شڵەژانە ڕۆحییە بدۆزێتەوە.

لە نەخۆشخانە ئیزنیاندا لەڕێوە چاوی بە نەخۆشەکە بکەوێ. ئیسمیر دیاکۆف لە بەشێکی تایبەتی نەخۆشخانەکە لە سەر چرپایەکی باریک ڕاکشابوو. چرپایەکی دیکەش لە ژوورەکەدابوو، بازرگانێکی خەڵکی شارەکەمان لە سەری ڕەهێڵ بووبوو، کە بەهۆی نەخۆشیی دڵەوە لەشی

پەنەمیبوو و دیار بوو لە حاڵی گیانکەنشت دایە و بێئەوەی گوێی بدەنێ دەستیان کرد بە قسە کردن. ئیسمیر دیاکۆف هەرکە چاوی بە ئیوان فیۆدۆرۆویچ کەوت، بە سەرسووڕماوانەوە بزەی هاتێ و لەو ساتەدا ئارام و لەسەرەخۆ دیار بوو. لانیکەم ئیوان وای هاتە بەرچاو. جگە لەوەش، قەڵافەتی ئیسمیر دیاکۆف زۆر سەرنجی ڕاکێشا. هەر لەگەڵ چاوی پێیکەوت، شکی لا نەما کە نەخۆشە. زۆر لاواز و بێتاقەت بوو، هێواش دەدوا و وێدەچوو بە زۆر زمانی بگێڕێ و قسە بکا. زەرد هەڵگەڕابوو. لە ماوەی ئەو بیست دەقیقەی پێکەوە قسەیانکرد، لە پەستا هاواری سەری و ماسوولکەکانی لەشی دەکرد و دیار بوو ئازار دەکێشێ. دەموچاوە وردیلە و کۆستەکەی وردیلەتر دیار بوو و سەر و قژی ئاڵۆزا بوو، بەجێی فۆکلەش تۆپەڵێ قژی لوول و شێواو کەوتبووە سەر تەوێڵی. بەڵام چاوی چەپەی خێل بووبوو و دەتگوت ئاماژە بە شتێک دەکا، واشی بەخۆی دەسەلماند کە فەرقی نەکردووە. «قسە کردن لەگەڵ مرۆڤی زانا و زیرەک هەمیشە پڕبایەخە.» ئیوان لەڕێوە ئەو قسەی وەبیر هاتەوە. لەپەنای لاقیدا لە سەر کورسیلەیەک دانیشت. ئیسمیر دیاکۆف زۆر بە زەحمەت لە سەر چرپاکە خۆی ئەمبارەوبار کرد، بەڵام یەکەم کەس نەبوو کە دەستیکرد بە قسە کردن.

ئیوان لێیپرسی: «دەتوانی قسەم لەگەڵ بکەی؟ زۆرت ماندوو ناکەم؟»

ئیسمیر دیاکۆف بە دەنگێکی کز و نەخۆشانە منجاندی: «بەڵێ دەتوانم» وەک ئەوەی دڵخۆشیی میوانێکی تووڕە بداتەوە، بە لەبزێکی نەرم درێژەی پێدا: «گەورەم لەمێژە هاتوویەوە؟»

- ئەمڕۆ گەیشتمەوە... هاتم بۆ ئەوەی بزانم کەوتوویە چ زەلکاوێکەوە.

ئیسمیر دیاکۆف هەناسەیەکی هەڵکێشا.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە زمانی هەڵخلیسکا: «بۆ هەناسە هەڵدەکێشی، خۆ تۆ ئاگات لە هەموو شتێک بوو!»

ئیسمیر دیاکۆف مات و مڕومۆچ ماوەیەک بێدەنگ ما.

ـ قوربان چۆن ئاگادار نەبووم؟ پێشتر هەموو شتێک مەعلووم بوو. بەڵام من چووزانم کار بەو جێیە دەگا؟

ـ چی مەعلووم بوو؟ خۆت لە گێلی مەدە! یانی پێشبینیت کردبوو کە سەرودڵت لێدێ، کاتێک دەچووی بۆ ئەمبارەکە؟ ناوی ئەو شوێنەت هێنا؟

ئیسمیر دیاکۆف بە لەسەرەخۆیی گوتی: «خۆ لە کاتی پرسینەوەدا ئەوەت نەگوتووە؟»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە ناکاو هەستی بە ڕق و تووڕەیی کرد.

ـ نا، هێشتا نەمگوتووە، بەڵام حەتمەن دەیڵێم. حەزرەتی بەڕێزت دەبێ زۆر چاکمان بۆ باسبکەی، جوان لە گوێشی بگرە، ئیجازەت پێنادەم گاڵتەم پێبکەی و پێتوابێ دەتوانی کڵاویش لە سەر من نێی!

ئیسمیر دیاکۆف هەروا لەسەرەخۆ، بەڵام بۆ تاوێک چاوی قووچاند، گوتی: «قوربان، من ئەوەندەم هیوا بە ئێوەیە، بەقەد خودا، بۆ دەبێ گاڵتەتان پێبکەم؟»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ هەڵیدایە: «جارێ دەزانم کات و ساتی فێلێهاتن پێشبینی ناکرێ، زۆرم پرسیار کردووە؛ پێتوانەبێ دەتوانی بە منی بسەلمێنی. دەی چۆن بوو پێشتر کات و ساتەکەیت پێگوتم و هەروەها سەبارەت بە ئەمبارەکەش؟ ئەگەر بە درۆ خۆت وا لێنەکردووە چۆن دەتزانی سەرودڵت لێدێ و لە پلیکانی ئەمبارەکەوە دەکەوییە خوارێ؟»

ئیسمیر دیاکۆف، بە قەستی دەنگی درێژ کردەوە و گوتی: «قوربان، هەرچۆنێک بێ ناچارم ڕۆژێ چەند جار بچمە ئەمبارەکەوە. قوربان ساڵی پێشووش بەوشێوەیە لە وەتاغی ژێر هەورەبانەکە کەوتمە خوارێ. ئەوە ڕاستە کە ڕۆژ و کاتی فێلێهاتنەکە پێشبینی ناکرێ، بەڵام پیاو جاری وایە لە دڵی دەدا.»

ـ بەڵام تۆ ڕۆژ و کاتەکەیت پێشبینی کرد!

ـ قوربان، سەبارەت بە سەرودڵ لێهاتنەکەی من وا چاکبوو پرسیار لە پزیشکەکانی ئێرە بکەی. دەتوانی لێیان بپرسی بە فێڵ بووە یان بەڕاستی؛ هیچ کەڵکێکی نییە ئەوەندەی لە سەر بڕۆین.

ـ ئەی ئەمبارەکە؟ چۆن ئاگاداری ئەمبارەکە بووی و دەتزانی دەکەویتە ناوی؟

ـ وادیارە ناتوانی مەسەلەی ئەمبارەکە لە زەینتدا حەلکەی! هەر لەو کاتەدا کە کەوتمە نێو ئەمبارەکەوە، ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆرم هەبوو. ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر ئاراوقارای لێهەڵگرتم، لەدەستدانی ئێوە و بێپشتیوان مانەوەم بوو. بۆیە کاتێک چوومە نێو ئەمبارەکەوە لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەگەر بکەوم، لەڕێوە فێم لێدێ؟» قوربان هەر لەبەر ئەو ترسە بوو لە ناکاو تووشی ئەو حاڵەتە بووم کە بەسەرمدا دێ... هەربۆیە بەسەرەوە لە پلیکانەکان کەوتمە خوارێ. هەموو ئەمانە و تەواوی ئەو قسانەی پێشووی من کە ئەو ڕۆژە عەسر لەبەر دەرگاکە بۆم گێڕایەوە و گوتم چەندە دەترسم و باسی ئەمبارەکەم کرد، هەموویم بۆ دوکتۆر هێرتێزنستیۆب و نیکۆلاپارفنۆویچ گێڕاوەتەوە و هەمووشی لە شایەدی نامەکەدا نووسراوە. دوکتۆری نەخوشخانەکەش، ئاغای وارویێنسکی قەبووڵیکرد کە ئەو فکرە، یانی ترسی کەوتنەخوارەوە، بوتە هۆی ئەو سەرودڵ لێهاتنە. ڕاست ئەو کاتەش بوو سەرودڵم لێهات. نووسیویشیانە، یانی حەتمەن ئەو ترسە بۆتە هۆی ئەو فێ‌لێهاتن، قوربان.

ئیسمیر دیاکۆف کاتێک قسەکەی تەواو کرد هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، کە دەتگوت بە جارێ هێزی لێبڕاوە.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ، کە تاڕادەیەک شڵەژا بوو گوتی: «کەوایە لە وتەکانتدا ئەوەت گوتووە؟» دەیویست بە دووپاتکردنەوەی مشتومڕەکەیان بیترسێنێ، بەڵام بۆی دەرکەوت کە ئیسمیر دیاکۆف خۆی ڕاستیی هەموو شتێکی گوتووە.

ئیسمیر دیاکۆف لێبڕاوانە گوتی: «ترسی چیم بوو؟ لێگەڕێ با هەموو ڕاستییەکان بنووسن.»

- وشە بە وشە قسەکانی بەر دەرگات بۆ گێڕانەوە؟

- نا، یانی وشە بە وشە پێمنەگوتوون، قوربان.

- پێتگوتن کە دەتوانی فێ لەخۆت بێنی، هەروەک ئەو کاتە خۆت پێوە ڕادەنا؟

- نا، ئەوەشم پێنەگوتن، قوربان.

- ئێستا پێمبڵێ، بۆ منت نارد بۆ چێرماشنیا؟

- دەترسام بچی بۆ مۆسکۆ، چونکە چێرماشنیا نزیکترە قوربان.

- درۆ دەکەی، خۆت پێشنیارت پێکردم بڕۆم؛ پێتگوتم خۆم لەڕێی چارەڕەشی لادەم.

- تەنیا لەبەر خۆشەویستی و فیداکاریی دۆستانەم بووە، چونکە کێشە و ئاڵۆزیی بنەماڵەکەم پێشبینی کردبوو و دەمویست ئێوە لەو کێشەیە بەدوور بن، قوربان. لەبەر ئەوە بوو پێمگوتی لەڕێی چارەڕەشی لادە و دەمویست تێبگەی کە کێشە و ئاژاوە لە ماڵەکەدا هەڵدەگیرسێ و بۆ ئاگاداری لە گیانی باوکت لە ماڵیدا دەمێنییەوە.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە ناکاو توورە بوو، گوڕاندی بەسەریدا: «کەللەکەر، دەبوو ڕاشکاوانەتر پێمبڵێی!»

- قوربان، لەو کاتەدا چۆن دەکرا ڕاشکاوانەتر پێتیبڵێم. لەوە دەترسام وەقسە بێم و ئێوەش لەوانە بوو توورە بن. دیسان لەوەش دەترسام دیمیتری فیۆدۆرۆویچ کێشە و هەرایەکی دیکە وەڕێ بخا و ئەو پارەیە هەڵگرێ و بڕوا، چونکە ئەو پارەیەی بە پارەی خۆی دەزانی، بەڵام کێ دەیزانی کارەکە بەو جێیە دەگا و پیاوی تێدا دەکوژرێ؟ پێموابوو تەنیا ئەو سێ هەزار ڕۆبڵە دەبا کە لە ژێر باڵنجەکەی باوکتدا بوو. قوربان، لە پاکەتێکدا بوو. قوربان، بەڵام دیمان ئاوا کوشتی. قوربان، ئێوە خۆشتان بیرتان لە شتیوا دەکردەوە؟

ئیوان تۆزێ مات بوو و گوتی: «بەڵام ئەگەر دەڵێی نەدەکرا بیری لێبکەیتەوە، چۆن دەمتوانی بیرم بۆ ئەوە بچێ و لە ماڵێ بمێنمەوە؟ قسەی بێسەرەوبەر دەکەی!»

- دەبوو بەوە بزانی کە دەمویست بتنێرم بۆ چێرماشنیا، نەک مۆسکۆ.

- چۆن دەمتوانی بەوەدا بزانم؟

ئیسمیر دیاکۆف زۆر بێهێزی دەنواند، دیسانیش خولەکێک بێدەنگبوو.

- قوربان، دەبوو بەوەدا بزانی کە داوام لێکردی نەچی بۆ مۆسکۆ، بەڵکوو بچی بۆ چێرماشنیا. یانی دەمویست لە شوێنێکی نزیکتر بی قوربان. چونکە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بیزانیبایە زۆر دوور نەکەوتوویەوە دەستی بۆ کارێکی ئاوا نەدەبرد. ئەگەر ڕووداوێکیش بقەومایە، دەهاتییەوە و پارێزگاریت لە منیش دەکرد، چونکە پێمگوتی گریگۆری نەخۆشە و منیش دەترسم تووشی ئەو سەرودڵە دوابڕاوە بم. پاشان ئەو نیشانانەم بۆ باسکردی کە چەنجار لە پەنجێرەکە بدەی، باوکت دەرگاکە دەکاتەوە، ئەوەم بە دیمیتری فیۆدۆرۆویچیش گوت. پێموابوو بۆخۆتان بیرتان بۆ ئەوە دەچێ کە میتیا کارێکی ئاوای لە دەستدێ و لەوانەیە ئێوەش لێرە بمێننەوە و تەنانەت نەشچن بۆ چێرماشنیا.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ بەخۆی گوت: «وادیارە زۆر بەڕوونی قسە دەکا، تەنیا تۆزێ منجە منج دەکا؛ کەوایە ئەو تێکچوونەی مێشکی کە هێرتێزنستیۆب باسی دەکا، چییە؟» بە دەنگێکی بەرزیش کە تووڕە بوونی پێوە دیار بوو: «نەگبەتی، لەگەڵ منیش بە فێڵ و دەهۆوە هەڵسوکەوت دەکا.»

ئیسمیر دیاکۆف بەشێوەیەکی مات و بەستەزمانانە قسەکەی خۆی خواردەوە: «بەڵام ئەو کاتە پێموابوو بە تەواوی بۆی چووی.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ دیسان قەڵس بوو و گوڕاندی: «ئەگەر بمزانیبایە، دەمامەوە.»

- ئاخەر قوربان، پێموابوو بەهۆی تێگەیشتن لە مەبەستەکەم ئاوا بە پەلە ڕۆیشتی بۆ ئەوەی لەڕێی چارەڕەشی لادەی، قوربان بۆ ئەوەی لە ترسانا ڕاکەی و خۆت دەربازکەی.

- پێتوایە هەموو وەک تۆ ترسەنۆکن؟

- ببوورە قوربان، پێموابوو تۆش لە من دەچی.

ئیوان بە نارەحەتییەوە گوتی: «هەڵبەت دەبوو بزانم، دەشمزانی شتێکت لەژێرسەردایە...» لە ناکاویش مەسەلەیەکی وەبیرهاتەوە و گوڕاندی: «بەڵام درۆ دەکەی و درۆکەشت بە پێی خۆی دەڕوا. لەبیرتە لە عارەبانەکەوە سەرکەوتی و پێتگوتم: «قسە کردن لەگەڵ مرۆڤی زیرەک و زانا زۆر بەنرخە؟» بۆیە بە ڕۆیشتنی من خۆشحاڵ بووی، چونکە مەتحتدەکردم!

ئیسمیر دیاکۆف لە پەستا هەناسەی هەڵدەکێشا. ڕەنگی هەڵبزڕکا و بە هەناسەبڕکێوە گوتی:

- لەبەر ئەوە خۆشحاڵ بووم، ڕازی بووی بەجێی مۆسکۆ بچی بۆ چێرماشنیا، چونکە ئەوی نزیکترە. بەڵام کە ئەو قسانەم کرد، نەمدەویست مەتح و تاریفت بکەم، بەڵکو دەمویست سەرکۆنەت بکەم. خۆت سەرنجت نەدایە.

- سەرکۆنەی چی؟

- کە ئەو کارەساتەت پێشبینی کرد و باوکیشت بەجێهێشت و پارێزگاریت لێنەکردین. چونکە لەوانە بوو بەهۆی دزینی هەزار ڕۆبڵەوە قۆڵبەستم کەن قوربان.

ئیوان دیسان دەمی هەڵماڵی: «ئەی نەگبەتی! پێمبڵێ بزانم، نەقڵی ئەو لە پەنجێرە دانەت بە دادوەرەکان گوت؟»

- هەموو شتێکم بە بێپێچوپەنا پێگوتن قوربان.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ دیسان لەناخەوە تووشی سەرسووڕمان بوو و درێژەی بە قسەکانی دا:

ـ ئەگەر ئەو کاتە بیرم لە شتێک بکردایەتەوە، حەتمەن ئەوەی بیرم لێدەکردەوە دەغەڵیی تۆ بوو. دیمیتری ڕەنگ بوو بیکوژێ، بەڵام قەت باوەڕ ناکەم دیمیتری دزیبکا... بەڵام تۆ هەموو دەغەڵییەکت لە دەستدێ، خۆت بە منت گوت کە دەتوانی خۆت بێهۆش کەی. دەبڵێ نەتگوت!

ـ لەبەر ساویلکەیی بوو، بە عومراتم بە درۆ فێم لە خۆم نەهێناوە. ئەو کاتە ڕەنگە ویستبێتم شاتوشووت بکەم، ئەویش بەهۆی گەوجییەتییەوە. ئەو کاتە زۆرم خاتری ئێوە دەویست. نەمدەویست بیشارمەوە.

ـ دیمیتریی برام بە ڕاشکاوی تۆمەتبارت دەکا کە قەتڵ و دزیتکردووە.

ئیسمیر دیاکۆف دیسان بە بزەیەکی تاڵەوە گوتی: «ئیتر چیی لە دەست دێ؟ بەڵگە و شایەد هەموو بە زەرەدی ئەون، کێ باوەڕ بە قسەکانی دەکا؟ گریگۆری واسیلیەویچ دیتوویەتی دەرگاکە کراوەتەوە، قوربان. کەوایە دەتوانێ بڵێ چی؟ گوێی مەدەنێ! هەوڵدەدا خۆی نەجات دا.»

بەهێواشی لە قسە کەوت و لە ناکاو، وەک ئەوەی بیر بکاتەوە درێژەی پێدا: «قوربان، گوێت بەوانە نەبزوێ. دەیەوێ هەمووی بە سەر مندا بێنێ و بیسەلمێنێ کاری من بووە ـ ئەوەم بیستووە قوربان. ئەگەر زیرەک بوایەم و بمتوانیبایە بە درۆ فێ لە خۆم بێنم و پیلانم بۆ باوکت دارڕشتایە، پێشتر چۆن بە تۆم دەگوت دەتوانم فێ لە خۆم بێنم؟ ئەگەر پیلانی ئەو قەتڵەم دارڕشتایە، پێتوایە ئەوەندە گەوجم بە زەرەدی خۆم شایەدییەکی ئاوا بدەم؟ ئەویش لای کوڕەکەی! بەڕاستی کەس شتی وای نەبیستووە! جا شتی وا چۆن دەبێ؟ ئەگەر واش بوایە، قەت ئەو ڕووداوە نەدەقەوما. ئێستا هیچکەس گوێی لە قسەکانمان نییە، خودا نەبێ، قوربان. ئەگەر بڕیار بێ ئەوە بە دادوەر و نیکۆلای پارفنۆویچ بڵێی، بەو کارەت پارێزگارییەکی باش لە من دەکەی، چونکە کەسێک کە بێپەردە قسە دەکا و نایشارێتەوە، چۆن جینایەتی ئاوا دەکا. هەموو کەس ئەوە دەزانێ.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ کە ئەو دەلیل و بەڵگانەی ئیسمیر دیاکۆف شوێنێ لە سەر دانابوو، گوتی: «چاکە،» بۆ بڕینەوەی مشتومڕەکەیان هەستا سەرپێ.

«من شکم لە تۆ هەر نییە و پێموایە زۆر کارێکی قۆڕە پیاو لە تۆ بە گومان بێ. بەپێچەوانە، زۆریشت سپاسدەکەم دڵنیاتکردم. ئێستا دەڕۆم، بەڵام دیسان دێمەوە بۆسەردانت. جارێ خوداحافیز. هیوادارم خوا شیفات بدا. هیچت پێویست نییە؟»

ـ لەبەر هەموو شتێک سپاستدەکەم قوربان. مارتا ئیگناتیفنا زۆری ئاگا لێمە و هەرشتێکم پێویستبێ بۆم دێنێ. کەسانێکی دڵۆڤان هەن هەموو ڕۆژێک دێن بۆ دیدەنیم.

شتێک ئیوانی هاندا لە ناکاو بڵێ: «خوداحافیز، بەڵام سەبارەت بەوەی کە دەتوانی فێ لە خۆت بێنی، لای هیچکەس دەنگێ ناکەم و داوا لەتۆش دەکەم لای هیچکەس باسی نەکەی.»

ـ تێدەگەم قوربان. ئەگەر تۆ باسی ئەوە نەکەی، منیش قسەکانی بەر دەرگا پووشبەسەر دەکەم.

هەر ئەو کاتە بوو ئیوان فیۆدۆرۆویچ ڕۆیشتە دەرێ و هێشتا چەند هەنگاو لە سەرسەراکە دوور نەکەوتبۆوە هەستیکرد ئەم وشانەی دواییی ئیسمیر دیاکۆف بە توێکڵ بوون. هێندەی نەمابوو بگەڕێتەوە، بەڵام پاڵنەرێکی ئاسایی بوو، بە بوڵەبوڵ «قسەی هەڵیتوپڵیت!» لە نەخۆشخانە چووە دەرێ. هەستی سەرەکیی ئیوان هەستکردن بە دڵنیایی بوو، ئەویش بەهۆی ئەو ڕاستییەوە بوو کە ئیسمیر دیاکۆف دەستی لەو کارەدا نەبووە، بەڵکو میتیا بووە، ئەگەرچی قەت ئەو چاوەڕوانییە لەو نەدەکرا ئاوا بیر بکاتەوە. نەیدەویست هەگەری ئەو هەستە لە ناخی خۆیدا لێکداتەوە و تەنانەت بێزی هەڵدەستا سەر بە ماڵی دڵی خۆیدا بکا و بیپشکنێ. هەستێکی وای بوو کە دەتگوت بۆ لە بیر بردنەوەی شتێک کەوتۆتە هەڵەپڕووکێ.

لە ڕۆژانی دواییدا کە ئاگادار بوو ئەوشایەدانەی بە زەرەری میتیا قسە دەکەن زۆرن و گومانی نامێنێ کە ئەو جینایەتە کاری میتیایە. شایەدی دانی کەسانێکی وەک فینیا و دایکی لە گۆڕێدا بوو، کە خۆیان لەلای خەڵک بەقەد چڵەپووشێک بایەخیان بوو. کەچی شایەدییەکەیان کاردانەوەی قورسی لە

سەر پەروەندەکە هەبوو. پێرخۆتین و ئەو کەسانەی نێو مەیخانەکە و فرۆشگای پلاتینکۆف و هەروەها شایەدەکانی ماکروویە، هەر باسناکرێ چونکە شایەدیی هەموویان ئەوەندە لەڕاستی نزیکە، گومانی بۆ کەس نەهێشتۆتەوە. جارێ ئەوانە کە زۆریش گرینگ نەبوون تا ئەو ڕادەیە تاڵ و ئازاراوی بوون. بەڵام ڕازی «لێدانی پەنجەرەکە» بەقەد شایەدییەکەی گریگۆری سەبارەت بە ئاوەڵا بوونی دەرگاکە شوێنی لە سەر دادوەرەکان دانا. ژنەکەی گرێگۆری،مارتا لە وەڵامی پرسیارەکانی ئیوان فیۆدۆرۆویچدا گوتی: ئیسمیر دیاکۆف ئەو شەوە هەتا بەیانی لەو ژوورەی تەنیشتمان کە تیغەیەکی باریکیان لەنێواندایە بێسەروزمان کەوتووە. «سێ هەنگاو لە ئێمە دوور نییە» ئەگەرچی زۆر خەویشم قورسە، بەڵام ئەو شەوە چەند جار بە دەنگی نکە وناڵەی ئەو قوڕ بەسەرە لەخەو ڕاچەنیوم. «ئەو شەوە لە پەستا ناڵەی دەهات.»

ئیوان، قسەی لەگەڵ هێرتێزنستیۆب کرد و پێیگوت کە ئیسمیر دیاکۆف شێت نییە، بەڵکو تاڕادەیەک کز و بێهێز بووە، بۆیە هێرتێزنستیۆب زەردەیەکی گرت و گوتی: «دەزانی ئێستا چۆن کاتی خۆی تێپەڕ دەکا؟ خەریکی لەبەرکردنی وشەی فەڕەنسییە. کتێبێکی ناوەتە ژێر باڵنجەکەی کە پڕە لە وشەی فەڕەنسی و دیارە کەسێک ئەوانەی بە ڕێنووسی ڕووسی بۆ نووسیوە. هی هی هی!»

ئیوان ئاخری وایلێهات هەموو شک و گومانێکی وەلانێ. نەیدەتوانی بیر لە میتیای برای بکاتەوە و بێزی لێی هەڵنەستێ. بەڵام شتێک زۆر سەیر بوو. ئالیووشا سوور بوو لە سەر ئەوەی کە میتیا قاتڵ نییە، بەڵکو «زۆر وێدەچێ» کاری ئیسمیر دیاکۆف بێ. ئیوان هەستیکرد ئەو قسەیەی ئالیووشا زۆر گرینگە بۆیە تەواو تووشی سەرسووڕمان بووبوو. شتێکیتریش کە جێی سەرسووڕمان بوو ئەوە بوو کە ئالیووشا بە هیچ شێوەیەک هەوڵی نەدەدا سەبارەت بە میتیا لەگەڵ ئیوان بدوێ و قەتیش ئەوباسەی نەدەهێنا

گۆڕێ، تەنیا وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە. ئەوەش بەتایبەتی زۆری سەرنجی ئیوان ڕاکێشابوو.
بەڵام ئیوان ئەو کاتە دڵی لە جێیەکی دیکە بوو، زۆر سەرقاڵی مەسەلەیەکی دیکە بوو. کاتێ لە مۆسکۆ هاتەوە، ئەشقی کاترینا ئیوانا بە جارێ شێتیکرد و ئاوری لە هەناوی بەردا و هۆش و ئیختیاری لا نەما. لێرەدا جێی نییە باسی ئەو ئەشقە تازەی ئیوان بکەین کە تەواوی عومری بەو داخەوە جینگڵی دا: ئەوە باسێکە بۆ وەختێکیتر و ڕۆمانێکی تر، کە لەوانەیە قەت نەینووسم. بەڵام لێرەدا ناتوانم چاپۆشی لەو خاڵە بکەم کە ئیوان کاتی ڕۆیشتن لە ماڵی کاترینا ئیوانا بە ئالیووشای گوتبوو «دڵم پێوەی نییە» ـ کە نەقڵەکەیم گێڕاوەتەوە ـ بەڵام ئەوە درۆیەک بوو بەپێی خۆی دەڕۆیشت: چونکە شێت و شەیدای کاترینا ئیوانا بوو و زۆریشی خۆشدەویست. ئەگەرچی جارناجارێک لە دەستی وەڕەز دەبوو و ڕقی لێی هەڵدەستا و ئەگەر دەستی پێی بگەیشتایە دەیکوشت. ئەو هەستەش بە زۆر هۆوە خۆی لە مێشک و ڕۆحی وەردەپێچا. کاترینا ئیوانا بەهۆی تێکچوونی نێوانی لەگەڵ میتیا بە جارێ تێکشکابوو، کاتێک ئیوان گەڕایەوە بە هەڵەداوان ڕۆیی بۆ پێشوازیی و دیار بوو ئەوی بە تەنیا پشتیوانی خۆی دەزانی. هەستی ڕووشا بوو و کەوتبووە بەر سووکایەتیی. دیار بوو بەوەش زۆر تێکشکاوە. ئێستاش ئەو پیاوە گەڕابۆوە بۆلای، ئەو پیاوەی کە سەردەمێک زۆری خۆشدەویست و بە گڕی ئەشقی دەسووتا. (ئەوەی باش دەزانی)، دڵ و ئەقڵی ئەویشی زۆر لەدڵ و ئەقڵی خۆی بە باشتر دەزانی. بەڵام ئەو کچە جوان و داوێنپاکە، ئەگەرچی دەیزانی ئەو پیاوە خاوەنی هەوا و هەوەسێکی کارامازۆفیانەیە، زۆری خۆشدەویست و شەیدای بووبوو، بەڵام بە تەواوی خۆی نەنایە ئیختیاری. هەر لەوکاتەشدا، بەهۆی پەیمان شکاندنی میتیاوە، بەردەوام ئازاری دەکێشا و کاتی ڕقهەستان و تووڕە بوون (کە زۆر جار پێش دەهات) ئەوەی لە ئیوان دەشاردەوە. ئەوە بوو ئەو قسەیەی ئیوان، کاتی مشتومڕ لەگەڵ ئالیووشا گوتبووی «درۆ لە سەر درۆ»یە. زۆری لایەنی

ناڕاست بوو و هەر ئەوەش ڕقی ئیوان فیۆدۆرۆویچی بە جاری هەستاندبوو... بەڵام نەقڵی ئەوە هەڵدەگرین بۆ دوایی.
ئیوان لەڕاستیدا ماوەیەک بوو ئیسمیر دیاکۆفی لەبیر بیربۆوە، بەڵام دوو حەوتوو دوای یەکەم سەردانی لە نەخۆشخانە دیسان ئەو بیرۆکە سەیر و سەمەرەی پێشوو مێشکی داگرت. هەر ئەوەندە بەسە بڵێم ئیوان لە پەستا لە خۆی دەپرسی بۆ ئەو شەوەی ئاخر لە ماڵی باوکی لە ژوورەکە هاتە دەرێ، وەک دز چۆتە سەر پلیکانەکان خۆی گرتووە، بۆ ئەوەی بزانێ باوکی لە خوارەوە چدەکا. بۆ دواتر بە جاڕزی ئەوەی وەبیر هاتەوە، بۆچی بەیانیی ڕۆژی دوایی، کاتێک دەیویست بڕوا بۆ سەفەر ئەوەندە تووشی دڵەوڕێزە بوو؟ بۆچی کاتێک گەیشتە مۆسکۆ بەخۆی گوتبوو «من هیچوپووچم»؟ ئێستاش تاڕادەیەک بەزەیندا هات کە ئەو بیرۆکە پڕ ئازارەی کە سەرتاپای داگرتووە لەوانەیە تەنانەت کاترینا ئیواناشی لەبیر بەرێتەوە. ڕاست دوای ئەوە بوو لە سەر شەقام چاوی بە ئالیووشا کەوت. لەڕێوە ڕایگرتبوو و لێی پرسی بوو:
ـ لەبیرتە دیمیتری دوای شێو وەک ئەجەل گەیشتە سەرمان و لە باوکمیدا و دوای ئەوە لە حەوشە پێمگوتی ئەو هەقەم هەیە ئاواتەخواز بم... پێمبڵێ بزانم ئەو کاتە پێتوابوو ئاواتەخوازی مردنی باوکم بووم یان نا؟
ئالیووشا بە نەرمی وەڵامی دایەوە: «ئەرێ، پێموابوو ئاواتەکەت ئەوەیە.»
ـ هەرواش بوو. مەسەلەکە تەنیا خەیاڵ و بیرکردنەوە نەبوو. بەڵام ئەو کاتە پێتوانەبوو ئاوات و ئارەزووم ئەوە بوو کە «هەژدیهایەک هەژدیهایەکی دیکە هەڵلووشێ»؛ یانی دیمیتری باوکم بکوژێ، هەتا زووتریش ئەو کارە بکا چاکترە... تەنانەت خۆشم ئامادە بووم پیلان داڕێژی ئەو کارە بم.
ئالیووشا ڕەنگی هەڵبزڕکا، چاوی لە چاوی ئیوان بڕی و زمانی لە گۆ چوو.

ئیوان گوڕاندی: «قسه بکه دەی، پێمبڵێ بزانم ئەو کاته چۆنت بیر کردەوە. ڕاستییەکەیم پێبڵێ، پێمخۆشه ئەو ڕاستییه بزانم!» هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بەر لەوەی ئالیووشا وەڵامی بداتەوە، به تووڕەیی چاوی تێبڕی.

ئالیووشا به سرته گوتی: «بمبووره، ئەو کاته بیرم لەوەش کردەوە،» هەر بەبێ پێچانەوەش قسەکەی دەربڕی.

ئیوان گوتی: «سپاست دەکەم»، دوای خوداحافیزیش به پەله ملی ڕێی گرت. لەو کاتەوە ئالیووشا بۆی دەرکەوت که ئیوان دەیهەوێ دوورەپەرێزیی لێبکا و وێدەچێ ڕقی لێی بێ، ئەویش تاڕادەیەک که ئالیووشا دەستی له چاوپێکەوتنی هەڵگرت. دوای ئەو دیدارەش هەر لەڕێوە ئیوان ڕۆیشت بۆ لای ئیسمیر دیاکۆف و نەڕۆیشتەوە بۆ ماڵێ.

(٧)

## دووهەمین چاوپێکەوتن لەگەڵ ئیسمیر دیاکۆف

چەند ڕۆژ بوو، ئیسمیر دیاکۆف لە نەخوشخانە مەرەخەس کرابوو. ئیوان فیۆدۆرۆویچ دەیزانی ماڵە تازەکەی کامەیە، ماڵێکی دارینی چکۆلە و کۆن بوو، پێشخانەیەکی باریک کردبووی بە دوو بەشەوە، لایەکی ماریا کنیدراتیفنا و دایکی تێیدا دەژیان و بەرێکیشی ئیسمیر دیاکۆف. هیچکەس نەیدەزانی ئیسمیر دیاکۆف بۆ لەگەڵ ئەوان دەژی و لەبەر چی ـ وەک دۆست و ئاشنا، یان کرێنشین. دواتر دەیانگوت دەزگیرانی ماریا کیندراتیفنایە، چۆتە لایان و هەتا ماوەیەک بەبێ کرێ لەگەڵیان دەبێ. دایک و کچ هەردووکیان ڕێزێکی زۆریان بۆ دادەنا و بەچاوی مرۆڤێکی خاوەن کەسایەتی تێیان دەڕوانی.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ لەدەرگای دا و هەرکە دەرگاکە کرایەوە ڕۆیشتە پێشخانەکە. ماریا کیندراتیفنا ڕاست ڕۆیی بۆ وەتاغەکەی دەستە چەپ کە لەوی دیکەیان باشتر بوو، ئیسمیر دیاکۆف لەوێدا دەژیا. کوورەیەکی چینکۆ لە ژوورەکەدا دایسا و هەوای ژوورەکە زۆر گەرم بوو. دیوارەکانی بە کاغەزدیواریی شین داپۆشرابوو، کە لە زۆر جێوە کاغەزەکان دڕابوون و قالۆنچە بەرسورکە لە کەلێنی دیوار و کاغەزە دڕاوەکاندا دەهاتن و دەچوون و بەردەوام خشەخشیان دەهات. کەلوپەلێکی ئەوتۆ لە ژوورەکەدا نەبوو: دوو کورسی لەمبەر و ئەوبەری دیوارەکە و دوو کورسیلەش لە پەنا مێزێک. پەڕۆیەکی گوڵپەمەیی بە سەر مێزەکەدا درابوو. لە سەر لێواری هەردوو پەنجێرەکە یەکی گوڵدانێکی شەمدانیی لێدانرابوو. لە سووچی ژوورەکەش وێنەیەکی مەسیح لە قەتحە گیرابوو. سەماوەرێکی مسینی چکۆلەش لە سەر

مێزەکە بوو، لەچەند جێوە قوپابوو. کەشەفێکیش دوو پەرداخی لە سەر بوو. ئیسمیر دیاکۆف چایەکەی خواردبۆوە و سەماوەرەکە کوژابۆوە. لەپشت مێزەکە لە سەر کورسیلەیەک دانیشتبوو. چاوی لە کتێبێک دەکرد و بە ئەسپایی بە قەڵەمزەل دەینووسی، لەوە دەچوو خەریکی نووسینی مەشق بێ. لەبەر دەستیدا شووشەیەک جەوهەر و شەمدانێکی تەنەکە داندرابوو و شەمێکی مۆمی لە سەر بوو. ئیوان فیۆدۆرۆویچ هەرکە چاوی بە ئیسمیر دیاکۆف کەوت لەڕێوە زانیی نەخۆشییەکەی تەواو چاک بۆتەوە. ڕوخساری گەشابۆوە و قژەسەری بەشێوەیەکی جلفانە بۆ پێشەوە داهێنابوو و چەوری کردبوو. بەرگی خەوێکی پڕ ڕەنگی ملیوانە تووکنی کۆن و چڵکەسووی لەبەردا بوو. چاویلکەیەکی لە سەر لووتی دانابوو، کە ئیوان فیۆدۆرۆویچ تا ئێستا نەیدیبوو چاویلکە لە چاو بکا. ئەو ئەدا قۆڕەشی ئەوەندەی دیکە ڕقی ئیوانی هەستاند: «چاو لێکە شتی چۆنیش چاویلکە لە چاو دەکا!» ئیسمیر دیاکۆف بە ئارامی سەری هەڵێنا و لە پشت چاویلکەکەیەوە چاوی لە میوانەکەی بڕی؛ پاشان بە ئەسپایی چاویلکەکەی داگرت و لە سەر کورسیلەکە هەستا، ئەویش نەک بۆ ڕێزگرتن، بەڵکو تاڕادەیەک لەبەر تەوەزەلی و بەبێ ڕێزەیەک ئەدەب و ماریفەت. ئەو هەڵسوکەوتەی لەڕێوە سەرنجی ئیوانی ڕاکێشا و تێگەیشت کە دەیهەوێ خۆی بنوێنێ. هەر بە چاویشیدا بۆی دەرکەوت کە فێڵوتەڵەکە و دەهۆی لێدەباری. وەک ئەوەی بەو چاوە پڕ دولاب و دەهۆیانەی بڵێ: «بۆ لێم بوویە ملۆزم؟ ئەو کاتە هەموو شتێکمان یەکلایی کردەوە، ئیتر بۆ دیسان سەرودڵت گرتووم؟» ئیوان بە زحمەت توانیی دان بەخۆیدا بگرێ و هەروا کە لە جێی خۆی ڕاوەستابوو گوتی:«ئێرە زۆر گەرمە،» پاشان دوگمەی باڵتەکەی هەڵگرت.

ئیسمیر دیاکۆف گوتی: «باڵتەکەت داکەنە، قوربان.»

ئیوان باڵتەکەی داکەند و لە سەر کورسییەک داینا. بەدەستی لەرزۆک شانی کورسییەکی گرت و بە پەلە کێشای بۆ پاڵ مێزەکە و دانیشت. ئیسمیر دیاکۆفیش هەرچۆنێک بوو لە سەر کورسییەک بەرەوڕووی ئیوان دانیشت.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ گرژ و تووڕە و بێئیختیار پرسیی: «بەرلە هەموو شتێک پێمبڵێ بە تەنیاین؟ کەس گوێی لە دەنگمان نابێ؟

- هیچکەس دەنگمان نابیستێ. خۆتان دیتان قوربان، ماڵەکە پێشخانەی هەیە و بە سەر یەکەوە نییە.

- کوڕی چاک، گوێبگرە، کاتێک لە نەخۆشخانە ڕۆیشتم ئەو فڵتەفڵتەت لەچی بوو، ئەگەر باسی ئەو توانابییەی فێ لە خۆ هێنانت نەکەم، تۆش هەموو ئەو قسانەی بەر دەرگا پووشبەسەر دەکەی و بە دادوەر ناڵێی؟ مەبەستت لە «هەموو» چییە؟ چیت لە ژێر سەردایە؟ هەڕەشەم لێدەکەی؟ بۆ چ پەیمان و بەڵێنێکم لەگەڵ تۆ بەستووە؟ نەکا پێتوابێ لێت دەترسم؟

ئیوان فیۆدۆرۆویچ ئەوەی زۆر بە تووڕەیی و ڕاشکاوی پێگوت و تێیگەیاند کە ڕقی لە قسەی زیادی و کینایە وێژییە و ئەو ڕازەی پێ وەدەر دەخا.

ئیسمیر دیاکۆف چاوی گڕی ڕقی لێدەبۆوە، چاوی چەپەی قرتاند و دوای ساتێک بیر کردنەوە و دان بەخوداگرتن وەڵامیدایەوە، وەک ئەوەی بڵێ: «دەتەوێ بۆت لە بنی کوولەکەکە بدەم، زۆر چاکە فەرموو.»

- ئەو کاتە مەبەستم ئەوە بوو پێتانبڵێم، ئێوە دەتانزانی باوکتان دەکوژرێ، بەڵام گوێتان نەدایە و ڕۆیشتن، نەکا پاشان خەڵکی سەبارەت بە ئیحساسات و ڕەنگە شتێکی دیکەش خراپ بیربکەنەوە - ئەمە بوو ئەوەی بەڵێنم دابوو بە دادوەرەکانی بڵێم.

ئەگەرچی ئیسمیر دیاکۆف زۆر لەسەرەخۆ قسەی دەکرد و دیار بوو دانی بەخۆیدا دەگرت، بەڵام ڕق و تووڕەیی و شەڕاشۆیی بەدەنگییەوە دیار بوو. ڕووهەڵماڵدراوانە چاوی لە ئیوان بڕی، کە خەریک بوو چاوی لە ڕەشەوە دەهات.

- ئەوە دەڵێی چی؟ ها؟ خول بووی؟

- نا قوربان، خۆ لەونم لێنەگۆڕاوە.

ئیـوان فیـۆدۆرۆویچ ئـاخری نـەڕانـدی: «تـۆ پێتوایـە مـن دەمزانـی بـاوکم دەکوژرێ؟» مشتێکیشی لە مێزەکە ڕاکێشا. «مەبەستت لە "شتێکی دیکە" چییە؟ زووکە پێمبڵێ هیچوپووچ!»

ئیسمیر دیاکۆف بێدەنگ بوو و هـەروا ڕووهـەڵماڵدراوانـە چـاوی لـە ئیوان فیۆدۆرۆویچ دەکرد.

- زووکە پێمبڵێ بەرەڵڵای بۆگەنیو، ئەو «شتەی دیکە» چییە؟

- مەبەستم لەو «شتەی دیکە» ئەوە بوو ئێوەش زۆرتان پێخۆشبوو باوکتـان بمرێ.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ هەستا سەرپێ و بەهێزو قەوەتی خۆی مشتە کۆڵـەیـەکی لـە شـانی دا و پشتی دا بـە دیـوارەکـەدا. هـەر لـەڕێوە، فرمێسک بـەچاویدا هاتـە خوارێ و گوتی: «قوربان، لێدانی نەخۆش زۆر شوورەیییـە،» چـاوی بـە دەسـرە دەستێکی شین و چڵکن گرت و دەستیکرد بە گریان و هـەنسیک دان. خولـەکێک تێپەڕی.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ بە تووڕەیی پێیگوت: «بەسە ئیترا مەتولێوە!» دانیشتەوە. «لەوە زیاتر ڕقم هەڵمەستێنە، با لە دین دەهری نەبم.»

ئیسمیر دیاکۆف پەڕۆکەی لـە چـاوی کردەوە. تـەواوی چرچولۆچـەکانی دەم وچاوی نیشانەی سووکایەتییەکی پێوە دیار بوو کە پێیکراوە.

- کەوایە تۆ بۆرە پیاوی خـوێڕی پێتوایـە بـۆ کوشـتنی بـاوکم لـەگـەڵ دیمیتـری دەستبەیەکیمان کردووە؟

ئیسمیر دیاکۆف بە بێزارییەوە گوتی: «ئـەو کاتـە نـەمدەزانی چیتـان لـە ژێـر سـەردایە، قوربـان. بویـە لـەبـەر دەرگـا ڕامگـرتن بـۆ ئـەوەی سـەبـارەت بـەو خاڵـە بیروڕاتان بزانم.»

- سەبارەت بەچی پرسیارم لێبکەی؟

- دەی، سەبارەت بەوەی کە پێتخۆشە باوکت بکوژرێ یان نا؟

ئەوەی بە جارێ خوێنی ئیوان فیۆدۆرۆویچی وەکوڵ هێنـا، لـەبزە جینگزی و ناحەزەکەی بوو کە ڕووهەڵماڵدراوانە لە سەری سوور بوو.

ئیوان لە ناکاو گوڕاندی: «ڕاست تۆ کوشتووتە دەزانم!»
ئیسمیر دیاکۆف بەجاڕزی بزەی هاتێ.
ـ خۆتان، سوڕ دەزانن من نەمکوشتووە. پێموابوو گوتنی سەرلەنوێی ئەو قسانە بۆ مرۆڤێکی وریا و تێگەیشتوو پێویست نییە.
ـ ئەی بۆ، بۆ ئەو کاتە لە من بە گومان بووی؟
ـ هەروەک دەزانی، لە ترسانا بوو قوربان. چونکە لە ترسی گیانم وام لێهاتبوو گومان لە هەموو کەس بکەم. بڕیارمدا بیروڕای ئێوەش بپرسم، چونکە پێموابوو ئەگەر ئێوەش وەک براکەتان خوازیاری ئەوە بن، مەسەلەکە کۆتایی پێدێ و منیش وەک قالۆنچە لەو نێوانەدا دەفلیقێمەوە و دەبێ بڵێم ئەم لام تات و ئەو لام تات...
ـ ئەوەم بە گوێدا ناچێ، دوو حەوتوو لەمەوبەر وات نەگوت.
ـ کاتێک لە نەخۆشخانە قسەم لەگەڵ کردن، مەبەستم هەر ئەوە بوو. بەڵام پێموابوو تێدەگەی و پێویست بە قسەی زیادی ناکا، چونکە مرۆڤێکی بەهۆشی و پێویست نەبوو بە ڕاشکاوی باسیبکەم.
ـ دەی چی، زووکە وڵامدەوە دەی، چی بووە... چی بووە هۆی ئەوەی گومانێکی وا بکەوێتە ئەو سەرە حیزەتەوە؟
ـ بۆ پیاو کوشتن دەزانم لە دەستت نەدەهات قوربان، یانی نەتدەتوانی، توانیباشت نەتدەویست ئەو کارە بکەی، کەوایە دەتویست کەسێکی دیکە ئەو کارە بکا.
ـ چاوچاو چۆنیش قسە دەکا، هەر دەڵێی لە گیرفانی دەردێنێ! ئاخەر بۆ دەبێ خوازیاری ئەوە بم، بۆچی، بە چ هۆیەک؟
ئیسمیر دیاکۆف بە تەشەرەوە، وەک ئەوەی بیهەوێ داخی دڵی پێبڕێژێ، گوتی: «بە چ هۆیەک؟ دەی دوای مردنی باوکتان لانیکەم یەکی چل هەزار ڕۆبڵتان پێدەبڕا، ڕەنگە زێتریش. بەڵام ئەگەر فیۆدۆرپاولۆویچ لەگەڵ ئاگرافنا ئەلکساندرفنا زەماوەندی بکردایە، ئەو خاتوونە تەواوی ماڵ و سامانەکەی دەکرد بە ناوی خۆیەوە. چونکە مێشکی زۆر چاک کار دەکا، قوربان. بەو شێوەیە

باوکت دوو ڕۆبڵی لە پاش بەجێ نەدەما بۆ ئێوە. دەی خۆ ئەوەندەشی نەمابوو بیهێنێ، بەقەد موویەکی مابوو. هەر ئەوەندەی دەویست خانمە قامکی هەڵێنێ، باوکت بە سەرەوە دەچوو بۆ کلێسە.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ کە هەوڵی دەدا دان بەخۆیدا بگرێ، ئاخری گوتی:

ـ زۆر چاکە، خۆ دیتووتە لە جێی خۆم هەڵنەستاوم، دەستبکەم بە لێدانت، نەشمکوشتووی. پێمبڵێ بزانم، کەوایە بە بڕوای تۆ، لەگەڵ دیمیتری برام دەستبەیەکیمان کردووە بۆ ئەوەی ئەو کارە بکا و پشتم بەو بەستووە؟

ـ مەگین چارەیەکیترتان بوو، قوربان؟ ئەگەر ئەوی بکوشتایە، تەواوی ماف و میرات و پلە و پایە و ملکی خۆی لە کیسدەچوو و بۆ تاراوگە بەڕێ دەکرا، قوربان، ئەوەش دەبووە هۆی ئەوەی میراتەکەی بە سەر تۆ و ئالکسی فیۆدۆرۆویچدا بەش دەکرا و بەجێی چل هەزار، یەکی شەست هەزار ڕۆبڵتان پێدەبڕا. بۆیە شک لەوەدا نییە زۆرت هیوا بە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بووە بۆ ئەو کارە و لەوانەیە هانیشتدابێ.

ـ نازانم چۆن تاقەت دێنم گوێ لەو قسە هەڵیتوپڵیتانەت بگرم؟ هەی خوێڕی ئەگەر ئەو کاتە بڕیارمبدایە پشت بە کەسێک ببەستم، بە تۆم دەبەست، نەک دیمیتری. دەتوانم سوێندیش بخۆم کە چاوەڕوانیی ئەو کارە خویگەرییانەم لە تۆ هەبوو... لەو کاتەدا... لە بیرمە بۆچوونم چۆن بوو!

ئیسمیر دیاکۆف بە چزەبزەیەکەوە گوتی: «منیش ئەو کاتە بۆ چەند ساتێک پێمۆابوو پشت بە من دەبەستی. زیاتر لە هەموو شتێکیش بەوەدا بۆم دەرکەوت کە چ خەیاڵێکت لە سەردایە. چونکە ئەگەر لە من بەگومان بوایەی و دڵت لێم نەحەسایەتەوە، لێتدەدا و دەڕۆیشتی، وەک ئەوە وابوو پێمبڵێی: «دەتوانی باوکم بکوژی و منیش بەرگریت لێناکەم!»

ـ ئەی خوێڕی! کەوایە ئاوا بوو بۆچوونت!

ـ هەمووی بەهۆی ئەو ڕۆیشتنەوە بوو بۆ چێرماشنیا. ویستت بچی بۆ مۆسکۆ و داوا و تکای باوکت خستە پشتگوێ و بە قسەت نەکرد بچی بۆ چێرماشنیا. بە قسەیەکی گەوجانەی منیش خێرا پێمڵ بووی و بەرەو چێرماشنیا

وەڕێکەوتی! لەبەر چ هۆیەک ڕازیبووی بچی بۆ چێرماشنیا قوربان! بەوەدا کە بەبێ هۆ و تەنیا، لەبەر قسەکەی من ڕۆیشتی بۆ چێرماشنیا، بۆم دەرکەوت کە دەبێ چاوەڕوانییەکت لە من هەبێ.

ئیوان کەوتە ددانە چیرە و نەڕاندی: «نا، سوێند دەخۆم کە هیچ چاوەڕوانییەکم لە تۆ نەبووە!»

- چۆن نەتبوو قوربان! کەوایە وەکو کوڕی ئەرباب ئەرکی خۆت بەجێ دێنا کە بە گرتنمدەی و لەڕێوە دەستبکەن بە قامچی لێدانم... یان لانیکەم شەقەزللەیەکت لێدەدام، بەڵام تووڕە نەبووی و لەڕێوە بەشێوەیەکی دۆستانە بە قسەی منی گەمژەت کرد و ڕۆیشتی، قوربان، کارەکەشت زۆر قۆڕ و هەڵە بوو، چونکە دەبوو بە ئەرکی خۆتی بزانی و لەبەر نەجاتی گیانی باوکت، ئەو سەفەرە نەکەی. جگە لەوەش هیچ چارەیەکمان نەبوو.

ئیوان کە مڕومۆچ دانیشتبوو هەردوو دەستی کردبووە مست و بە تووڕەیی دەیگوشی بە چۆکییەوە، بزەیەکی تاڵی نیشتە سەرلێو و گوتی:

- ئەرێ، بە داخەوەم کە شەپلاخەیەکم نەخیواندە بناگوێت. چونکە لەو کاتەدا نەمدەتوانی بتبەم بۆ بەندیخانە. کێ بڕوای بە قسەکانم دەکرد و دەمتوانی چ تۆمەتێکت لێبدەم؟ بەڵام شەپلاخەکە... ئاخ، بەداخم کە بیرم لەوە نەکردەوە. ئەگەرچی شەقەزللە قەدەغەیە، دەبوو ئەو ڕوخسارە دزێوەتم بە مشت تێک بشکاندنایە.

ئیسمیر دیاکۆف وەک ئەوەی کەیفی سازبێ چاوی لە ئیوان دەکرد.هەر بەو لەبزە خۆهەڵکێشانەیە و پڕ ئامۆژگارییەوە کە لە سەر سفرەکەی فیۆدۆرپاولۆویچ باسی مەزهەبی هێنابووە گوڕێ و گریگۆریی ئیمان هەردە کردبوو، گوتی: «لەم سەردەمەدا، یاسا زللەی یاساغکردووە و خەڵکیش دەستیان لێهەڵگرتووە، بەڵام هێندی جار لە کۆمەڵگادا هەڵدەکەوێ خەڵکی بە زللە لە یەکتر دەدەن، نەک هەر لە وڵاتی ئێمە، بەڵکو لە سەرانسەری جیهان. تەنانەت لە کۆماری فەڕەنساش، ڕاست وەک سەردەمی ئادەم و حەوا کە بە زللە لە یەکیان

دەدا، قوربان. هیچ کاتێکیش دەستی لیٚ‌هەڵناگرن، بەڵام جەنابت تەنانەت لەو هەلە لەبارەشدا کە بۆت هەڵکەوتبوو نەتویرا زللەیەکەم لیٚدەی قوربان.»

ئیوان ئاماژەی بەو کتێبە مەشقە کرد کە لە سەر مێزەکە بوو پرسیی: «بۆ دەتەویٚ فیٚری زمانی فەڕەنسی بی؟»

- بۆ فیٚری نەبم، دەمهەویٚ زانیاریم زیاتر بیٚ. چونکە گریمان ڕۆژیٚک ڕیٚم کەوتە ئەو بەشە خوداپیٚداوەی دنیا.

ئیوان چاوی بریقەی هات و ئازای ئەندامی کەوتە لەرزین:

«گوێبگرە ڕمووزن، من گوێم لە تۆمەتەکانت نییە و وادەزانم بای دیٚ، سەبارەت بە من هەرچیت پیٚخۆشە بیلیٚ، ئەگەر بە قەستی کوشتیش لیٚت نادەم تەنیا لەبەر ئەوەیە بۆ ئەو جینایەتە شکم لیٚتە و ڕاکیٚشت دەکەم بۆ دادگا و پیٚت وەدەردەخەم.

- بە بڕوای من واچاکە بیٚدەنگبی و لە سەری نەڕۆی قوربان، چونکە من هیچ تاوانیٚکم نییە و لەخۆڕا چۆنم تۆمەتبار دەکەی؟ ئەوەش هیچ، کیٚ باوڕتان پیٚدەکا؟ بەڵام بیٚتو زمانت بگەڕیٚ هەموو شتیٚک دەڵیٚم، چونکە دەبیٚ پاریٚزگاری لە خۆم بکەم.

- پیٚتوایە ئیٚستا دەترسم؟

- ئەگەر ئەوەی ئیٚستا پیٚمگوتی لە دادگا باوەڕی پیٚنەکەن، خەڵکی باوەڕی پیٚدەکەن و ئیٚوەش تەریق دەبنەوە.

ئیوان ددانی لە چیڕەوە برد و گوتی: «وەک ئەوەوایە بلیٚی: "ئاخافتن لەگەڵ مرۆڤی زیرەک و وریا زۆر پڕ بایەخە" ها؟»

- چاکی بۆچووی. کەوایە پیاو ژیرانە هەڵسوکەوت بکا باشە، قوربان.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ، کە سەرتاپای لە داخانا دەلەرزی، هەستا سەرپیٚ، باڵتەکەی لەبەر کرد و بیٚ‌ئەوەی وڵامیٚکی دیکەی ئیسمیر دیاکۆف بداتەوە، یان تەنانەت چاویشی لیٚبکا، بە پەلە ڕۆیشتە دەریٚ. هەوای فیٚنکی شەو بووژاندییەوە. مانگەشەو ئاسمان و زەویی تریفەباران دەکرد. مۆتەکەی ئەندیٚشە و دڵەخورپە سواری شانی بووبوو. لە خۆی دەپرسی: «هەر ئیٚستا بچم و ڕاپۆرت لە ئیسمیر

دیاکۆف بدەم؟ بەڵام چۆنی ڕاپۆرت لێبدەم؟ چونکە تۆمەتبار نییە. بە پێچەوانە من تۆمەتبار دەکا. هەر بەڕاستیش بۆ ئەو کاتە چووم بۆ چێرماشنیا؟ بۆچی؟ ئەریٚ ڕەنگە چاوەڕوانی شتێک بووبێتم، هەق بەوە...» بۆ سەدەمین جاریش وەبیری هاتەوە کە ئەو شەوە لە سەر پلیکانەکانی ماڵی باوکی خۆی ڕاگرتبوو. بەڵام ئێستا بە دڵەخۆرپەیەکی لە ڕادە بەدەرەوە هاتەوە بیری و قرچەپیٚ هەستا، وەک ئەوەی بە چەقۆ لێیاندابیٚ. «ئەریٚ، ئەو کاتە پێمخۆشبوو، وایە! چاوەڕوانی ئەو قەتڵە بووم، ئەریٚ پێمخۆشبوو! بڵێی وابیٚ، پێمخۆشبوو؟ بڵێی ئەو جۆرە کوژرانەی باوکم پێخۆشبووبیٚ؟ یانی ئاوام دەویست؟ دەبیٚ ئیسمیر دیاکۆف بکوژم! ئەگەر ئێستا ئیسمیر دیاکۆف بکووژم، ئیتر شیاوی ئەوە نیم بژیم و زیندوو بم!» ئیوان فیۆدۆرۆویچ نەڕۆیشتەوە بۆ ماڵیٚ، بەڵکو ڕاست ڕۆیشت بۆ لای کاترینا ئیوانا و بەو قەڵافەت و ئەدگارە شێتانەیەی خووداری کرد و زۆر ترسا. تەواوی قسەکانی ئیسمیر دیاکۆفی مووبەموو بۆ گێڕایەوە. هەرچەندی کاترینا ئیوانا دەیویست ئارامی بکاتەوە، فایدەی نەبوو، ڕقەکەی دانەدەمرکا: بەنێو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو و پچڕپچڕ قسەی دەکرد. ئاخری دانیشت. هەنیشکی نایە سەر مێزەکە، بە هەردوو دەستی سەری خۆی گرت و ئەم ڕستەیەی بە دەمدا هات:

ـ ئەگەر دیمیتری قاتڵەکە بیٚ و ئیسمیر دیاکۆف نەبیٚ، من لە تاوانەکەیدا شەریکم. چونکە ئەو کارەم پێکردووە. هێشتا نازانم من پێمکرد، یان نا. بەڵام ئەگەر ئەو قاتڵ بیٚ و کاری دیمیتری نەبیٚ، کەوایە حەتمەن من قاتڵم.

کاترینا ئیوانا کە ئەوەی بیست، بیٚئەوەی زمانی بگەڕیٚ هەستایە سەرپیٚ. ڕۆیی بۆ لای مێزی نووسینەکە، قوتوویەکی لە سەر بوو، سەرەکەی لابرد، کاغەزێکی دەرهێنا و لە بەردەمی ئیوان داینا. ئەمە هەر ئەو بەڵگەیە بوو کە دواتر ئیوان کاتی ئاخافتن لەگەڵ ئالیووشا بە «ڕاسترین بەڵگە»ی کوژرانی باوکی بە دەستی دیمیتریی زانیبوو. ئەوەش نامەیەک بوو کە میتیا کاتی مەستی بۆ کاترینا ئیواناى نووسیبوو، یانی هەر ئەو ئێوارەیە، دوای شەڕەدەندووکەکەی کاترینا ئیوانا و گرووشنکا، لە ماڵی کاترینا و سووکایەتی پێکردنی گرووشنکا،

کە لە سەر دووڕیانەکەی کلێسە ئالیووشای دی. ئەو کاتە میتیا دوای خوداحافیزی کردن لە ئالیووشا، بە هەڵەداوان ڕۆیشتبوو بۆ لای گرووشنکا. نازانم چاوی پێیکەوت یان نا، بەڵام ئێوارەکەی لە مەیخانەی میترۆپۆلیس بە تەواوی مەستی کردبوو. پاشان داوای قەڵەم و کاغەز دەکا و بەڵگەیەک دەنووسێ کە دواتر زۆر بە زەرەدی تەواو بوو. نامەیەکی بێسەرەوبەرە و شێتانە بوو، لە ڕاستیدا نامەیەکی مەستانە. وەک ئەوەی کابرایەکی مەست بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی و بە گەرموگوڕی بۆ ماڵوخێزانەکەی بگێڕێتەوە کە هەر ئێستا سووکایەتیی پێکراوە، ئەویش کەسێکی هیچوپووچ سووکایەتیی پێکردووە، لەلایەکیتریشەوە خۆی مرۆڤێکی باش و خاوەن کەسایەتییە و توڵەی خۆشی لەو کابرا هیچوپووچە دەکاتەوە. هەمووشی بە وردی و دڵەخورپە و بەشێوەیەکی پسپس و فرمێسک هەڵوەراندن نووسیبوو لە پەستا لە مێزەکەی ڕاکێشابوو. نامەکەی لە سەر کاغەزێکی چڵکنی ئاسایی زۆر پنجڵانە نووسیبوو. ئەو کوتەکاغەزەیان لە مەیخانەکە بۆ پەیدا کردبوو، پشتەکەشی چەن نووسراوە و ژومارەی پێوە بوو کە بە خەتێکی ناخۆش و شەڕەپشیلە نووسرابوو. دیار بوو کاغەزەکە چکۆڵە بووە و جێی قسە هەڵیتوپلیتەکانی میتیای تێدا نەبۆتەوە، بۆیە جگە لە پڕکردنەوەی هەمووپەراوێزی کاغەزەکە، دوایین خەتیشی بە سەر خەتەکانی دیکەدا نووسیبوو. ئەمەش دەقی نامەکە بوو:

کاتیای دڵڕەق!

سبەینێ پارەکەم وەردەگرم و سێهەزار ڕۆبڵەکەت دەدەمەوە. ئەو کاتە ئەی ژنی ڕقئەستوور ماڵئاوا، بەڵام هەروەها ماڵئاوا ئەی ئەوینەکەم! وەرە با تەواوی کەین! سبەینێ بە هەرشێوەیەک بێ وەدەستی دەخەم و ئەگەر نەتوانم وام وەرگرم، بەشەڕەفم دەچم بۆ گیان باوکم و کاسەسەری ورد و خاش دەکەم و پارەی ژێرسەرینەکەی دەردێنم. هەڵبەت ئەگەر ئیوان ڕۆیشتبێ. ئەگەر ناچار بم لەبەر ئەوە بچم بۆ سیبیریاش، ئەو سێهەزار ڕۆبڵەت هەر بۆ پەیدا دەکەم. ئەو کاتە ماڵئاوا. لەبەر پێتدا سەر دەنێمە زەوی چونکە زۆرم ناپیاوی لەگەڵ کردی. بمبوورە! نا، چاکتر وایە لێمخۆشنەبی، تۆش بەختەوەرتر دەبی و منیش! ڕۆیشتن

بۆ سیبیریام لە ئەشقی تۆ پێ‌چاکترە، چونکە ژنێکی دیکەم خۆشدەوێ و ئەمڕۆ دەبێ بە باشی بیناسی، کەوایە چۆن دەتوانی بمبووری؟ ئەو پیاوەی تالانی کردووم هەرچۆنێک بێ حەیاتی لێدەبرم! هەمووتان بەجێ دێلم و دەچم بۆ ڕۆژهەلات بۆ ئەوەی ئیتر چاوم بە هیچکەس نەکەوێ. تەنانەت ئەویش، چونکە تەنیا تۆ نییت ئازارم دەدەی، ئەویشە. مالئاوا!

لە کۆتاییدا ـ جنێوەکانم دەنووسم، بەلام تاریفت دەکەم! ئەوە لە دلمدا گوێم لێیە، تارێکی تێدا بەجێ ماوە و دەنگی ئاوازەکەی دێ. واچاکە دلم شەقکەم! خۆم دەکوژم. بەلام بەر لەهەمووان ئەو سەگە گلاوە. سێ هەزار ڕۆبلی لە گەروو دەردەکێشم و بۆت فڕێدەدەم. ئەگەرچی زۆرم ناپیاوی لە هەقدا کردووی، دز نیم! دەتوانی چاوەڕێی سێ‌هەزار ڕۆبل بی. ئەو سەگە گلاوە سێ‌هەزار ڕۆبلی ناوەتە ژێرسەرینەکەی و بە تەنزیلێکی پەمەیی بەستوویەتی. من دز نیم، بەلام دزەکەم دەکوژم. کاتیا ڕقت لێم هەلنەستێ، دیمتیری دز نییە. قاتلە! باوکی خۆی کوشتووە و خۆی لە نێو بردووە، تاکو بەجێی قۆڕەدەماخیی تۆ، لە سەر قسەی خۆی ڕاوەستێ. ئەوە بزانە خۆشیشی ناوێ.

بەلام لاقت ماچدەکەم، مالئاوا! هەروەها. کاتیا داوا لەخودا بکە کەسێک ئەو پارەیەم بداتێ، با دەستم بە خوێن ڕمووده نەبێ، ئەگەر کەسێکیش ئەو پارەیەم نەداتێ ـ دەستم بەخوێن ڕمووده دەبێ! بمکووژە کاتیا!

بەندە و دوژمنی تۆ

د. کارامازۆف

ئیوان ئەو «بەلگە»یەی خوێندەوە و دلنیا بوو کاری براکەیەتی. نەک ئیسمیر دیاکۆف. ئەگەر کاری ئیسمیر دیاکۆفیش نەبێ، کەوایە خۆ کاری ئیوانیش نەبوو. ئەو نامەیە لە زەینیدا لەڕێوە وەک بورهانی بیرکاریی نواند. ئیتر خاترجەم بوو کە میتیا باوکی کوشتووە. لە لایەکیشەوە ئەم گومانە قەت بە زەینی ئیوان نەگەیشت کە میتیا بە هاودەستی لەگەل ئیسمیر دیاکۆف ئەو قەتلەی کردبێ، لە ڕاستیدا پیاو نەیدەتوانی بیری لێبکاتەوە و لە ڕاستییەوە دوور بوو. ئیوان

خاترجەم بوو. بەیانی ڕۆژی دوایی بیری لە ئیسمیر دیاکۆف و قسە بە توێکڵەکانی دەکردەوە. چەند ڕۆژ دواتر لە خۆی پرسی دیوتە بەهۆی شک و گومانەوە چۆن خۆم تووشی ئازار و تەنگژە کردبوو. بڕیاری دا ئیتر دەست لە ئیسمیر دیاکۆف هەڵگرێ و لەبیری بباتەوە. مانگێک بەوشێوەیە تێپەڕی. هەر لێشی نەپرسییەوە، بەڵام دووجار بە هەڵکەوت بیستی کە زۆر نەخۆشە و ئەقڵی گۆڕاوە. پزیشکی لاو، وارۆوینسکی گوتبووی: «شێت دەبێ،» ئیوانیش ئەوەی هەر لەبیر بوو.

لە ماوەی دوایین حەوتووی ئەو مانگەدا ئیوان هەستیکرد خۆشی زۆر نەخۆشە. چوو بۆ لای ئەو پزیشکە مۆسکۆییە، کە بەر لە دادگایی کردنی میتیا، لە سەر داوای کاترینا ئیوانا هاتبوو، سەبارەت بە نەخۆشینەکەی ڕاوێژی لەگەڵ بکا. هەر لەو کاتەشەوە لەگەڵ کاترینا ئیوانا نێوانەکەی تێکچوو. ئەوان لە ئەشقەکەیاندا وەک دوو دوژمن وابوون کە دڵیان بە یەکترەوەیە. چونکە کاترینا ئیوانا چەند جار پەشیمانی میتیا بووبۆوە، یانی زیاتر دڵی بۆ ئەوی دەکورکاند، هەرئەوەش ئیوانی وا لێکردبوو وەک ماخولیا ئاراوقارای لێهەڵگیرێ. سەیرەکەی لەوە دایە هەتا ئەم دواییانە، کە لە سەرەوە، باسمان کرد واتە تا ئەو کاتەی ئالیووشا لە سەردانی میتیا گەڕایەوە و چوو بۆ لای کاترینا ئیوانا، ئیوان لە ماوەی ئەومانگەدا تاقە جارێکیش نەیبیستبوو کاترینا سەبارەت بە تاوانی میتیا تووشی شک و گومان بێ، سەرەڕای ئەوەی زۆری دڵ پێوەی بوو. ئەوەش شیاوی باسە ئیوان ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتری ڕق لە میتیا هەڵدەگرت و دڵی لێی ڕەش دەبوو. هەستیدەکرد ئەو ڕق لێبوونەشی بەهۆی ئەوەوە نییە کە کاترینا جاروبار دڵی بۆی دەکورکێنێ و ئێرەییی پێبەرێ، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە قاتڵی باوکیەتی! چونکە ئەوەی بۆ ڕوون بووبۆوە و بە تەواویش بڕوای کردبوو کە کاری میتیایە. لەگەڵ ئەوەشدا دە ڕۆژ بەرلە دادگایی کردنی چوو بۆ ملاقاتی و پێشنیاری پیلانێکی پێکرد کە لە بەندیخانە هەڵێ ـ پیلانەکەشی ئاشکرا بوو چونکە لە مێژ بوو بیری لێدەکردەوە. داخێکیش کە قسەکانی ئیسمیر دیاکۆف نابووی بە دڵیا ـ کە بە قازانجی ئیوانە کە براکەی مەحکووم بکرێ، چونکە ئەو حوکم پێدانە

میراتی ئەو و میتیا لە چلهەزار ڕۆبڵەوە دەکاتە شەست هەزار ـ هانی دا ئەو کارە بکا. بڕیاریدا براکەی لە بەندیخانە دەرباز بێ و ئامادە بوو چاوپۆشی لەو بیستهەزار ڕۆبڵە بکا. بەڵام کاتێک لە ملاقاتی میتیا گەڕایەوە، زۆر خەمبار و بێتاقەت بوو، لە ناکاو هەستیکرد ئەو تامەزرۆییە بۆ هەڵاتنی براکەی لە بەندیخانە تەنیا ئەوە نییە چاوپۆشی لەو بیستهەزار ڕۆبڵە بکا و لەخێر و بێری بچێتە دەرێ، بەڵکو هۆیەکی دیکەشی هەبوو. لە خۆی پرسی: «نەکا لەبەر ئەوەبێ منیش لە دڵەوە بەقەد ئەو قاتڵم؟ یانی لە دڵەوە پێمخۆشبووە پیرەی باوکمانی کوشتووە.» دەتگوت شتێک لە ناخەوە هەڵدەقرچێنێ و تووشی دڵەخورپەیەکی سەختی کردووە. لە هەمووشی گرینگتر، لە ماوەی ئەو مانگەدا، بە جارێ هەستی ڕووشا بوو. بەڵام ئەو باسە هەڵدەگرین بۆ دوایی...

کاتێک ئیوان فیۆدۆرۆویچ، دوای مشتومڕ لەگەڵ ئالیووشا، گەیشتەوە بەر دەرگایماڵێ و لە ناکاو هاتە سەر ئەوەی بچێ بۆ لای ئیسمیر دیاکۆف، بە هۆی پاڵنەرێکی سەیر و کتوپڕەوە بوو، ئەویش ڕق و تووڕەیی بوو هانیدا. لە ناکاو وەبیری هاتەوە کە کاترینا ئیوانا لەبەرچاوی ئالیووشا گوڕاندوویە بە سەریدا: «تۆ بووی پێت سەلماندم کە ئەو (یانی دیمیتری) قاتڵە! ئیوان کاتێ ئەوەی وەبیر هاتەوە بە جارێ تووشی سەرسووڕمان بوو. چونکە تەنیا جارێکیش هەوڵی نەدابوو بە کاترینا ئیوانا بسەلمێنێ کە میتیا قاتڵە، بەپێچەوانە، ئەو کاتەی لەلای ئیسمیر دیاکۆف گەڕایەوە، لە هەنتەشی کاترینا ئیوانادا دەرهەق بەخۆی تووشی گومان بووبوو. لە ڕاستیدا ئەو خۆی ئەو «بەڵگە»یەی دەرهێنابوو و سەلماندبووی کە میتیا تاوانبارە. ئێستاش لە ناکاو هەڵیدابوویە: «خۆم چوومەتە مەزڵەکەی ئیسمیر دیاکۆف!» کەنگێ چووە؟ ئیوان لەوە ئاگادار نەبوو. کەوایە کاترینا ئیوانا زۆریش دڵنیا نەبوو کە ئەو تاوانە میتیا کردبێتی. بڵێی ئیسمیر دیاکۆف چیی پێگوتبێ؟ ڕقێکی ئەستوور لە ناخەوە هەڵیدەچۆقاند. نەیدەزانی بۆ نیو سەعات لەمەوبەر کە ئەو قسانەی بیستووە، گوێی نەداوەتێ و دەستی نەکردووە بە گوڕەگوڕ؟ دەستی لە سەر ئەڵقەی دەرگاکە لابرد و بە هەڵەداوان ڕۆیی بۆ لای ئیسمیر دیاکۆف لە ڕێگا بیری کردەوە: «ڕەنگە ئەمجارە بیکوژم.»

()

## سیهەمین و دوایین چاوپێکەوتن لەگەڵ ئیسمیر دیاکۆف

کاتێک ئیوان گەیشتبووە نیوەی ڕێ و دەیویست بچێ بۆ مەزڵەکەی ئیسمیر دیاکۆف، کزەبایەکی وشک کە ئەو بەیانییە هەڵیکردبوو، دیسان هەڵیکردەوە و کڕێوەیەکی وشک و پاک دایدا، کولووی بەفر نەدەگەیشتنە زەوی، بەدەم باوە دەخولانەوە، کتوپڕ بوو بە باڕووشک و بادەوە. لەو گەڕەکەی شار کە مەزڵەکەی ئیسمیر دیاکۆفی لێبوو، کۆڵەکەی کارەبا وەبەر چاو نەدەکەوت. ئیوان بێئەوەی گوێ بداتە بەفر و بادەوە، بە تەنیا ملی ڕێی گرتبوو. ئەگەرچی چاو چاوی نەدەدی بەڵام هەر بە هەست ڕێگای دەپێوا. سەری ژانی دەکرد و کزەی وشکە سەرما ڕوومەتی دەرزی ئاژەن دەکرد. هەستیدەکرد دەستی تەزیوە و مێروولە دەکا. زۆری نەمابوو بگاتە ماڵە چکۆڵەکەی ماریا کیندراتیفنا، تووشی کابرایەکی لادێیی کورتەباڵا و سەرخۆش بوو. کابرا باڵتەیەکی زبر و پینەپینەی لەبەردا بوو، بە لارە لارەوە دەڕۆیشت و لەبەر خۆیەوە پرتە و بۆڵەی دەهات و جنێوی دەدا. پاشان بە دەنگێکی ناخۆش تێی هەڵکرد لە گۆرانی:

وانکا چوو بۆ پترزبۆرگ

چاوەڕێ نیم بێتەوە.

بەڵام خێرا دەستی لە گۆرانی گوتن هەڵگرت و دەستیکردەوە بە جنێودان؛ دیسان دەستیکردەوە بەو گۆرانییە و هەر ئەو کۆپلەشی دووپات دەکردەوە. ئیوان بەرلەوەی بیری لێبکاتەوە، هەستیکرد زۆری ڕق لێی هەستاوە. لە ناکاو لێک نزیک بوونەوە و ئیوان لە ناخەوە حەزیکرد بیدا بە زەویدا. هەر لەو

کاتەدا گەیشتنە یەکتر و خۆیان بە یەکدا دا و کابرای لادێیی بە پڕتاو بۆ دواوە فڕێدرا، کابرا پاشەوپاش لاتراسکەی بەست و وەک کۆتە دارێکی وشکەڵ کەوت بە سەر زەویی بەستەڵەکدا. ناڵەیەکی لێهات و پاشان بێدەنگ بوو. ئیوان چووە ژوور سەری. بێ جووڵە کەوتبوو بەپشتدا و لەوە دەچوو بێهۆش بووبێ. ئیوان لە دڵی خۆیدا گوتی: «ڕەق دەبێ لە سەرمانا.» بەرەو ماڵەکەی ئیسمیر دیاکۆف سەری پێوەنا.

لە دالانەکە، ماریا کیندراتیفنا کە مۆمێکی بەدەستەوە بوو، هاتبوو دەرگاکە بکاتەوە، لە بن لێوەوە گوتی: پاول فیۆدۆرۆویچ (یانی ئیسمیر دیاکۆف) زۆر نەخۆشە. «ڕاشنەکشاوە قوربان، بەڵام هۆش و ئیختیاری نییە، چاییشمان بۆ برد نەیخواردەوە، دەیگوت ئیشتیام نابا.»

ئیوان بە تووڕەیی پرسیی: «بۆ هات و هاواری وەڕێ خستووە؟

ماریا کیندراتیفنا وەڵامی دایەوە: «نا نا قوربان، بەپێچەوانە زۆریش بێدەنگە. تەنیا داواتان لێدەکەم، زۆری قسە لەگەڵ مەکەن.»

ئیوان دەرگاکەی کردەوە و چووە ژووریْ.

وەتاغەکە وەک پێشوو گەرم بوو. بەڵام ئاڵوگۆڕێکی بەسەردا هاتبوو. یەکێ لە چوارپایەکانی لابردبوو و قەنەفەیەکی چەرمینی گەورە و کۆنی لە جێگاکەی دانابوو، جێوبانی لە سەر ڕاخستبوو، باڵنجەکەی سپی و خاوێن بوو. لە سەر پێخەفەکەی دانیشتبوو و هەر ئەو بەرگە خەوەی پێشووی لەبەردا بوو. مێزەکەی هێنابووە بەر قەنەفەکە بەجۆرێک کە نەیدەتوانی لە جێی خۆی بجووڵێتەوە یان بەربێتەوە خوارێ. کتێبێکی ئەستووری بەرگ زەرد لە سەر مێزەکە داندرابوو. بەڵام خەریکی خوێندنەوەی نەبوو. دیار بوو بێکار دانیشتووە. بە چاو لێکردنێکی وشک و بێدەنگ پێشوازیی لە ئیوان کرد و دیار بوو هاتنی ڕێزەیەک تووشی سەرسووڕمانی نەکردووە. ڕەنگی ڕوخساری تەواو گۆڕابوو، زەردەڵ و ڕەنگ بزڕکاو، کزتر لە پێشووش دیار بوو. چاوی بە قووڵدا چووبوو و بەرچاوی شین هەڵگەڕابوو.

«ئەوە چییە، هەر بە ڕاستی نەخۆشی؟» ئیوان فیۆدۆرۆویچ ئەوەی گوت و ڕاوەستا. «نامەوێ زۆر وەختت بگرم، تەنانەت باڵتەکەشم داناکەنم. پیاو لە کوێ دانیشێ؟»

ئیوان چووە ئەوسەری مێزەکە، کورسیلەیەکی دەرکێشا و لە سەری دانیشت.

ـ بۆ چاوت تێبڕیوم و قسە ناکەی؟ من تەنیا هاتووم پرسیارێکت لێبکەم و دڵنیابە هەتا وڵامەکەی وەرنەگرمەوە ناڕۆم. پێمبڵێ بزانم ئەو خاتوونە، کاترینا ئیوانا هاتووە بۆلات؟

ئیسمیر دیاکۆف هەروا بێدەنگ بوو، وەک پێشووش بە هێمنی چاوی لێدەکرد. لە ناکاو دەستی هەڵتەکاند و ڕووی وەرگێڕا.

ئیوان گوڕاندی: «ئەوە بۆ وادەکەی؟»

ـ بۆ هیچ.

ـ مەبەستت لە "هیچ" چییە؟

ـ ئەرێ، هاتبوو. پێوەندیشی بە تۆوە نییە. لە کۆڵمبەوە.

ـ نا، ئاوات لە کۆڵ نابمەوە. پێمبڵێ بزانم، کەنگێ لێرە بوو؟

ئیسمیر دیاکۆف بە بزەیەکی مانادارەوە گوتی: «بە تەواوی لە بیرم بردبۆوە،» هەمیسان ڕووی لە ئیوان کردەوە، بە چاوێکی شێتانە و پڕ لە بێزارییەوە تێیڕاما، هەر ئەو جۆرە چاوی تێبڕی کە مانگێ لەمەوبەر دوای مشتومڕەکەیان تێیڕامابوو.

بە ئیوانی گوت: «تۆ خۆت دیارە زۆر نەخۆشی، ڕەنگت پەڕیوە؛ هەر دەڵێی ئەو ئیوانەی جاران نییت.»

ـ خەمی منت نەبێ. چیت لێدەپرسم ئەوەم جوابدەوە.

ـ ئاخر چاوت بۆوا زەرد هەڵگەڕاوە؟ سپێنەی چاوت زەرد زەرد بووە یانی ئەوەندە ئازار دەکێشی؟

زەردەیەکی پڕ سووکایەتیی گرت و لە ناکاو دای لە قاقای پێکەنین.

ئیوان کە زۆری ڕق هەستابوو هاواریکرد: «گوێ بگرە، پێمگوتی هەتا وڵامەکەم نەدەیەوە ناڕۆم!»

ئیسمیر دیاکۆف مات و فەقیرۆکە چاوی لێکرد و گوتی: «بۆ لە کۆڵم نابییە؟ بۆ ئازارم دەدەی؟»

ـ هەتیوە بەدگووزە خۆ من کارم پێتنییە. تەنیا وەڵامی پرسیارەکەم بدەوە با بڕۆم.

ئیسمیر دیاکۆف کە دیسان سەری داخستبوو، گوتی: «هیچ وەڵامێکم نییە بە تۆی بدەمەوە!»

ـ خاترجەم بە وات لێدەکەم وڵاممبدەیەوە!

«بۆ ئاوا حەجمانت لیٚهەڵگیراوە؟» پاشان چاوی لە ئیوان بڕی. ڕوانینێکی جاڕزانە و پڕسووکایەتی: «چونکە سبەینێ دادگایی دەستپێدەکا؟ هیچ ڕووداوێک ناقەومێ، یانی باوەڕ ناکەی؟ بڕۆوە بۆ ماڵێ و لێی بخەوە، خەمت نەبێ و ترسی هیچت نەبێ.»

ئیوان بە سەرسووڕمانەوە گوتی: «تێناگەم... بۆ دەبێ ترسم لە سبەینێ ببێ؟ لە ناکاویش تەزووی ساردی ترس لە گیانی گەڕا.

ئیسمیر دیاکۆف بە چاوانی هەڵیسەنگاند و بە دەنگێکی گڕ و بە تەشەرێکەوە گوتی: «تێناگەی؟ سەیرە مرۆڤی زیرەک و وریا بیهەوێ خۆی لە گێلی بدا!»

ئیوان مات و بێدەنگ چاوی تێبڕی. بزەی قۆڕەدەماخانە و سەرسوڕهێنەری ئەو پیاوە، کە سەردەمێک بەردەستی بوو، بە جارێ تووشی واقوڕمانی کردبوو. تەنانەت لە دوایین مشتومڕەکەشیاندا بەو لەبزە لەگەڵی نەدوابوو.

ـ پێتدەڵێم لەخۆڕا ترس مەخە دڵی خۆتەوە. سەبارەت بە تۆ هیچ ناڵێم. هەر باست ناکەم. هیچ بەڵگەیەکیش نییە بە زەرەدی تۆ بێ. ئەوە دەستت بۆوا دەلەرزێ؟ ئەو قامکانەت بۆوا دەلەرزن؟ بڕۆوە بۆ ماڵێ تۆ نەتکوشتووە.

ئیوان داچڵەکی. ئالیووشای وەبیر هاتەوە، منجاندی: «دەزانی من نەبووم.ـ
ئیسمیر دیاکۆف دیسان خافڵگیری کردەوە: «بە ڕاستیتە؟»
ئیوان هەستا سەرپێ و شانی گرت.
ـ ئەی هەژدیها، زوو کە ڕاستم پێبڵێ! لەگەڵ تۆمە زوو کە دەی!»
ئیسمیر دیاکۆف شلوێ نەبوو. تەنیا بە ڕقێکی شێتانەوە لە ئیوان ڕاما و بە تووڕەیی ورتاندی:
ـ باشە هەرگا وایلێهات، قاتڵ تۆی!
ئیوان کە دەتگوت بیر لە شتێک دەکاتەوە، لە سەر کورسیلەکەی دانیشتەوە و جینگزییانە دای لە قاقای پێکەنین.
ـ مەبەستت ئەوەیە من بڕۆم. جاری دواییش هەر ئەوەت گوت!
ـ جاری دوایی بەرەوڕووم ڕاوەستای و لە هەموو شتێک گەیشتی، ئێستاش تێدەگەی قوربان.
ـ لەوە زیاتر تێناگەم کە تۆ شێتی.
ـ لێی بێتاقەت نەبووی؟ لێرە بەرەوڕووی یەکتر چەقیوین! چ کەڵکێکی هەیە ئاوا یەکتر بە شێت بزانین و خۆمان لە گێلی بدەین؟ تۆ کوشتت، قاتڵی ڕاستەقینە تۆی، من تەنیا هۆکارێک بووم، نۆکەری وەفاداری تۆ لیچارد لە قسەت دەرناچێ، لەدوای وتەکانت بوو کە ئەو کارەم کرد.
ـ ئەو کارەت کرد؟ یانی تۆ کوشتت؟
ئیوان لەرزی لێهات. وەک بە کوتک بەسەریدا بدەن کاس بوو و ئارەقەیەکی سارد تەواوی لەشی داگرت. پاشان ئیسمیر دیاکۆف بە سەرسوڕمانەوە چاوی لێکرد؛ وا دیار بوو ئەو ترسە قورسەی ئیوان سەرنجی ڕاکێشاوە.
ئیسمیر دیاکۆف، زەردەیەکی بە زۆریی گرت و چاوی لە چاوی ئیوان بڕی، بە دڕدۆنگییەوە منجاندی: «خۆ ناتەوێ بڵێی بەڕاستی نەتدەزانی؟»
ئیوان هەروا چاوی لێنەدەتروکاند و دەتگوت زمانی لە گۆ چووە. گۆرانیی

ئەو کابرا لادێیە ـ ئاخ، وانکا چۆتە پترزبۆرگ چاوەڕێ نیم بێتەوە ـ لە ناکاو لە زەینیدا بوو بە زایەڵە. لە ژێر لێوییەوە گوتی:

ـ دەزانی چی، تۆ کە ئێستا بەرەوڕووم دانیشتووی، وەک خەون وای، تاپۆیەکی و هیچی تر.

ـ ئێرە تاپۆی لێ نییە، تەنیا من و تۆ لێرەین و کەسێکیتر. بێگومان ئەو، ئەو کەسەی سێهەم، لێرە لە نێوان من و تۆدایە.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ، کە چاوی بە دەوروبەری خۆیدا دەگێڕا و بە چاوانی سووچ و قوژبنی ژوورەکەی دەپشکنی، بە ترسەوە هاواریکرد: «مەبەستت کێیە؟ کێ لێرەیە؟ کام کەسی سێهەم؟»

ـ ئەو کەسی سێهەمە خودایە قوربان، خودای مەزن قوربان. ئێستا جگە لە ئێمە سێهەمین کەس ئەوە. بەڵام بەدوایدا مەگەڕێ نایدۆزییەوە.

ئیوان بەشێوەیەکی شێتانە نەڕاندی: «درۆیە تۆ نەتکوشتووە! تۆ شێتی، یان دیسان دەتەوێ بە گەوجم بزانی!»

ئیسمیر دیاکۆف، وەک پێشوو، بە کونجکاوی بە بێترس چاوی لێدەکرد. ئەویش هێشتا نەیدەتوانی بە سەر ناباوەڕیی خۆیدا زاڵبێ؛ هێشتاش پێیوابوو ئیوان "هەموو شتێک دەزانێ" و هەوڵدەدا "بەرەوڕوو هەموو شتێک بخاتە ئەستۆی ئەو.»

ئاخری بە دەنگێکی نووساوەوە گوتی: «سەبرکە قوربان،» لە ناکاو لاقی چەپەی لە ژێر مێزەکەوە هەڵێنا و دەرەلینگی پانتۆڵەکەی هەڵکرد. گۆرەویی سپی و سەرپایی لە پێدابوو. بە ئەسپایی ملی گۆرەوییەکەی داکێشا و دەستیکرد بەنێو گۆرەوییەکەیدا، ئیوان چاوی تێبڕیبوو، لە ناکاویش لەترسانا گیانی وەلەرزین کەوت. نەڕاندی: «ئەی شێتوشوورا!» بە پەلە هەستا سەرپێ، کشا دواوە و پشتی بە دیوارەکەوە دا درا و قیت و ڕەپ ڕاوەستا. بە ترسێکی شێتانەوە چاوی لە ئیسمیر دیاکۆف بڕی، کە بێئەوەی گوێ بداتە ترسەکەی ئیوان هەروا خەریکی پشکنینی گۆرەوییەکەی بوو. دەتگوت دەیهەوێ شتێک بە قامکی بگرێ و دەریهێنێ. ئاخری دۆزییەوە و دەستیکرد

بە دەرهێنانی. ئیوان فیۆدۆرۆویچ تێگەیشت کوتێک کاغەز، یان لوولەیەک کاغەزە. ئیسمیر دیاکۆف دەریهێنا و لە سەر مێزەکە داینا. بە ئارامی گوتی:
ـ فەرموو.
ئیوان بە ترس و لەرزەوە پرسیی: «چییە؟»
ئیسمیر دیاکۆف هەروا بە دەنگ نووساوی وەڵامی دایەوە: «تکایە چاوی لێکە قوربان.»
ئیوان ڕۆیی بۆ لای مێزەکە، کاغەزە لوولەکراوەکەی هەڵگرت و دەستیکرد بە کردنەوەی. بەڵام لەپڕ، وەک ئەوەی دەستی لە دەعبایەکی قێزەون بدرێ، دەستی کێشایە دواوە.
ئیسمیر دیاکۆف گوتی: «دەستت بۆئاوا دەلەرزێ قوربان؟» بۆیە هەر خۆی کاغەزەکەی هەڵپچڕی. سێ هەزار گەڵای سەد ڕۆبڵی تێدا بوو. «هەمووی لێرەدایە قوربان، سێهەزار ڕۆبڵەکە هەمووی. بژاردنی ناوێ.» بە سەری ئاماژەی بە پارەکان کرد و بە ئیوانی گوت: «هانێ هەڵیگرە.»
ـ ترست خستە دڵمەوە... بەو گۆڕەوییانەت.
ئیسمیر دیاکۆف جارێکیتر پرسیی: «یانی هەر بە ڕاستی تا ئێستا نەتدەزانی؟»
ئیوان گوتی: «نا، نەمدەزانی. من شکم هەر لە دیمیتری بوو. براکەم! ئاخ براکەم! پەککوو!» لە ناکاو بە هەردوو دەستی سەری خۆی گرت. «گوێبگرە، هەر بە تەنیا کوشتت؟ بە هاودەستی میتیا کوشتت یان هەر بە تەنیا؟»
ـ تەنیا لە گەڵ ئێوە، بە هاودەستیی ئێوە بوو قوربان، ئەو پیرەپیاوەم کوشت. دیمیتری فیۆدۆرۆویچ هیچ تاوانێکی نییە.
ـ زۆر چاکە، زۆر. پاشان باسی منیش دەکەین، ئەوە بۆ ئاوا دەلەرزم؟ دەڵێی زمانم لە گۆ چووە قسەم بۆ نایە.
ئیسمیر دیاکۆف بە سەرسووڕمانەوە منجاندی: «لەو کاتەدا خاوەن دڵ و غیرەت بوون، قوربان. گوتتان «هەموو شتێک ئازادە»، ئێستاش چەندە

دەترسی، شەربەتی لیمۆ دەخۆیەوە؟ هەر ئێستا دەڵێم بۆتان بێنن. بەڵام قوربان دەبێ سەرەتا ئەمە قایمکەم.»

دیسانیش ئاماژەی بە پارەکان کرد. دەیویست هەستێ و لەبەر دەرگاکەوە بانگی ماریا کیندراتیفنا بکا شەربەتی لیمۆیان بۆ ساز کا و بۆیان بێنێ، بەڵام، کاتی هەستان ویستی بە شتێک چەکەی پارەکە داپۆشێ، دەسرەکەی لە گیرفانی دەرهێنا، دیار بوو زۆر چڵکن و پیسە، کتێبە زەردەکەی کە کاتی هاتنە ژوورەوە سەرنجی ئیوانی ڕاکێشابوو لە سەر مێزەکە بوو، هەڵیگرت و لە سەر پارەکانی دانا. ناوی کتێبەکە "وتەکانی باوکی پیرۆز، ئیسحاق سووری" بوو. ئیوان ناوی کتێبەکەی بە پەلە خوێندەوە و گوتی:

- شەربەتی لیمۆ ناخۆمەوە. دواتر سەبارەت بە من قسە بکە. جارێ دانیشە پێم بڵێ چۆنت ئەو کارە کرد. هەمووم بۆ وەگێڕە.

- وا چاکە باڵتەکەت داکەنی قوربان. با گەرما نارەحەتت نەکا.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ، وەک ئەوەی تازە وەبیری هاتبێتەوە، باڵتەکەی داکەند و بێئەوەی لە سەر کورسییەکە هەستێ، لە سەر مێزەکە داینا.

- قسە بکە دەی، پێمبڵێ، دەی زووکە.

ـ لەسەرەخۆتری دەنواند، چاوەڕێ ما و دڵنیابوو ئیسمیر دیاکۆف «هەمووی» بۆ دەگێڕێتەوە.

ئیسمیر دیاکۆف هەناسەیەکی هەڵکێشا: «چۆنم ئەو کارە کرد؟ زۆر سروشتی، لە دوای قسەکەی خۆتان قوربان.»

ئیوان زۆر لەسەرەخۆ، بەشێوەیەکی قورس و قایم وشەکانی دەردەبڕی، بێئەوەی وەک پێشوو بنەڕێنێ دیسان گوتی: «قسەکەی من هەڵگرە بۆ دوایی. تەنیا بە وردی بۆم باسکە چۆنت ئەو کارە کرد. هەموو شتێکم وەک خۆی بۆ بگێڕەوە. مووبەموو. تکات لێدەکەم بەوردی بۆم بگێڕەوە.»

- ئێوە ڕۆیشتبوون، دوای تۆ کەوتمە نێو ئەمبارەکەوە قوربان.

- سەرودڵت لێهات یان بەقەستی خۆت بەرداوە.

- تەبعەن بەقەستی قوربان. وامنواند کەوتوومەتە خوارێ. بەهێواشی لە پلیکانەکان چوومە خوارێ و بە ئارامی ڕاکشام، دوای ئەوەی خۆم تخێڵکرد، هاوارمکرد و بەملاولادا خۆم گەوزاند. زۆر زوو هاتن و بردیانمە دەرێ.
- ڕاوەستە، دوای ئەوە، هەمووی هەر بەقەستی بوو، لە نەخۆشخانەش؟
- نا، قوربان، بەیانیی ڕۆژی داهاتوو بەرلەوەی بمبەن بۆ نەخۆشخانە، بەڕاستی فێم لێهات، ئەویش زۆر بە توندی، قەتم ئاوا بە توندی سەرودڵ لێنەهاتووە. دوو ڕۆژ لە سەریەک بێهۆش بووم.
- زۆر چاکە، دەی بۆم بگێڕەوە.
- لە سەر قەرەوێڵەیەک خەواندیانم. دەمزانی لەو دیوی دیوارەکە جێم بۆ چادەکەن، چونکە هەرکاتێک نەخۆشدەکەوتم، مارتا ئیگناتیفنا لەوێ جێی بۆ چادەکردم، لە نزیک خویان. لە کاتی لەدایکبوونمەوە زۆری دڵسۆزی بۆ کردووم قوربان. ئەو شەوە هەر نالاندم قوربان، بەڵام زۆر بە هێواشی. سات بە ساتیش چاوەڕێی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بووم.
- چاوەڕی بووی بێ بۆ گیان تۆ؟
- بۆ گیان من نا. چاوەڕی بووم بێتە نێو ماڵەکەوە، چونکە دڵنیا بووم ئەو شەوە هەر دێ، چونکە من لەوێ نەبووم تاکو هەواڵی پێڕاگەیێنم، حەتمەن دەهات. بە پێی عادەتیش بە نەردەکاندا هەڵدەگەڕا و کارێکی دەکرد.
- ئەی ئەگەر نەهاتبایە؟
- ئەو کاتە هیچ ڕوودایک نەدەقەوما قوربان، بەبێ ئەو خۆم لە قەرەی ئەو کارە نەدەدا.
- زۆر چاکە، دەی ڕوونتر بۆم باسکە، زوو کە دەی، بە وردی، هیچت لە بیر نەچێ!
- چاوەڕێ بووم فیۆدۆر پاولۆویچ بکوژێ، قوربان. پێموابوو حەتمەن ئەو کارە دەکا، چونکە ڕێوشوێنەکەم بۆ کێشابوو... ئەو چەند ڕۆژەی ئاخر... لەو عەلامەتە ئاگادار بوو، دەیزانی چۆن لە پەنجێرەکە بدا، ئەوەش ئەسڵی کارەکە بوو. لەو چەند ڕۆژەدا ڕق و دڕدۆنگییەکی زۆر لە ناخیدا پەنگی خواردبۆوە،

بە هۆی ئەو عەلامەتەوە حەتمەن دەچووە ژووریٚ، فیۆدۆر پاولۆویچ ئەو تەقەتەقەی ببیستایە دەرگاکەی دەکردەوە. بۆیە وەک ڕۆژ لێم ڕوون بوو دیٚ و سات بە سات چاوەڕوانی بووم، قوربان.

ئیوان قسەکەی پێبڕی: «سەبرکە، ئەگەر بیکوشتایە پارەکەشی دەبرد، دەبوو ئەوە بزانی. دوای ئەوە تۆ چیت وەدەستدەکەوت؟ تێناگەم؟»

ـ بەڵام قەتی پارەکە بۆ نەدەدۆزرایەوە قوربان. من پێمگوتبوو پارەکە لە ژێر باڵنجەکەی دایە. بەڵام وا نەبوو. پارەکە لە نێو مجرییەکدا بوو. پێشنیارم بە باوکت کرد ـ چونکە تەنیا کەسێک بووم متمانەی پێدەکردم ـ پاکەتی پارەکە لە سووچی وەتاغەکە و لە ژێر پەیکەرە و وێنەکاندا بشارێتەوە، چونکە هیچ کەس شکی بۆ ئەویٚ ناچیٚ، بەتایبەت ئەگەر بەپەلەش بیٚ. کەوایە شوێنی پاکەتە پڕ لە پارەکە ئەویٚ بوو. دانانی پارە لە ژێر باڵنجدا کارێکی قۆڕە. مجرییەکە دەکریٚ قوفڵێکی لێدەی. بەڵام هەموو پێیان وایە لە ژێر باڵنجەکەیدا بووە. ئەوەش فکرێکی گەوجانەیە قوربان. لە لایەکیشەوە ئەگەر دیمیتری بیکوشتایە، هیچی دەستنەدەکەوت و نەیدەتوانی پارەکە بدۆزێتەوە، بۆیە یان بە پەلە و لە ترسانا هەڵدەهات، هەر وەک هەمیشە بۆ پیاوکوژەکان دێتە پێشیٚ، یان دەگیرا قوربان. بۆیە دڵنیا بووم دەتوانم بەیانیی ڕۆژی دوایی یان هەر ئەو شەوە خۆم بگەیەنمە پارەکان و هەڵیگرم، هەمووشی دەکەوتە ئەستۆی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ. بۆیە دڵم بەوە خۆشبوو.

ـ ئەی ئەگەر نەیکوشتایە، تەنیا بیدایە بە زەویدا؟

ـ ئەگەر نەیکوشتایە، قەت نەمدەوێرا دەست بۆ پارەکان بەرم و هیچ ڕووداوێکیش نەدەقەوما. بەڵام دەمزانی ئەوەندەی لێدەدا بێهۆشی دەخا و ئەو کاتە دەرفەتم دەبوو پارەکە هەڵگرم و پاشان بە فیۆدۆرپاولۆویچم دەگوت کە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ دوای لێدان و بێهۆش‌خستنی پارەکەی دزیوە.

ـ سەبرکە... خەریکم گێژ دەبم. کەوایە دیمیتری کوشتی و تۆ تەنیا پارەکانت هەڵگرت.

ـ نا، نەیکوشت. دەی خۆ دەکرا ئێستا بڵێم قاتڵ ئەو بوو... بەڵام نامەوێ درۆت لەگەڵ بکەم قوربان، چونکە ئەگەر تا ئێستا تێنەگەیشتووی هەر وەک لێم ڕوونە و ناتەوێ بەرەوڕوو تاوانی خۆشت بخەیە ئەستۆی من. چونکە تاوانباری سەرەکی ئێوەن، قوربان. لە ڕووداوەکە ئاگادار بووی و کارەکەت بە من سپارد قوربان. ئاگاداری هەموو شتێک بووی، بەڵام لێتدا و ڕۆیشتی. بویە ئەمشەو دەمەوێ بەرەوڕوو پێت بسەلمێنم کە قاتڵی ڕاستەقینە تۆی قوربان. من قاتڵی ڕاستەقینە نیم، ئەگەرچی لە ڕاستیدا من کوشتوومە. بەڵام جەنابت قاتڵی ڕاستەقینەی.

ئیوان ئیتر خۆی پێڕانەگیرا. لە بیریشی نەبوو کە باسی خۆی خستۆتە دوای مشتومڕەکە، نەڕاندی: «بۆ، بۆ قاتڵ منم؟ خودایە! هێشتاش مەبەستت چێرماشنیایە؟ سەبرکە، پێمبڵێ بزانم، ئەگەر بە ڕاستی چێرماشنیا بە نیشانەی ڕەزایەتی من بێ، بۆ ڕەزایەتی منت دەویست؟ لەو بارەوە دەڵێی چی؟»

ـ دڵنیا بووم لە ڕەزایەتی ئێوە، دەمزانی بۆ ئەو سێ‌هەزار ڕۆبڵە هات‌وهاوار وەڕێناخەی، تەنانەت ئەگەر بەجێی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، یان وەک هاودەستی ئەو تۆمەتباریان بکردایەم، پارێزگاریت لێدەکردم و نەتدەهێشت تووشی گێڕە و کێشە بم... میراتی خۆت وەردەگرت و لە ماوەی ژیانتدا هەرکات پێویستبوایە پاداشتەکەت دەدامەوە. چونکە بەهۆی منەوە ئەو میراتەت وەردەگرت قوربان. ئەوەشمان لە بیر نەچێ ئەگەر لەگەڵ ئاگرافنا ئەلکساندرفنا زەماوەندی بکردایە، ئێوە پارەیەکی چرووکیشتان پێ‌نەدەبڕا.

ئیوان ددانی لە چیرەوە برد و گوتی: «»ئاخ! کەوایە دەتویست دوای ئەوە ژیانم لێ‌تاڵ بکەی. ئەی ئەگەر ئەو کاتە نەڕۆیشتبایەم بۆ سەفەر و ڕاپۆرتم لێ‌بدایەی چی؟»

ـ ڕاپۆرتی چیت لێدەدام؟ هی ئەوەی هانمداوی بچی بۆ چێرماشنیا؟ ئەوە قسەی قۆڕە قوربان. سەرەڕای ئەوەش، دوای مشتومڕەکەمان یان دەڕۆیشتی یان دەمایەوە. ئەگەر نەڕۆشتبایەی هیچ ڕووداوێک نەدەقەوما. دەمزانی ناتەوێ ئەو کارە بەڕێوە بچێ و منیش خۆم لەو دارەتە نەدەدا. کە ڕۆیشتی،

مانای ئەوە بوو دڵنیا بم لە دادگا بە زەرەدی من قسە ناکەی و چاوپۆشی لەو سیٚهەزار ڕۆبڵەش دەکەی. لە ڕاستیدا نەشتدەتوانی دوای ئەوە بمدەیە بەر لێپرسینەوەی یاسایی، چونکە ئەو کاتە لە دادگا هەموو شتێکم دەگوت؛ یانی نەک ئەوەی پارەکەم دزیوە یان کوشتوومە ـ باسی ئەوەم هەر نەدەکرد ـ بەڵکو دەمگوت ئێوە هانتان داوم قەتڵ و دزی بکەم، بەڵام من بە قسەم نەکرد. هەر لە بەر ئەوە ڕەزایەتی ئێوەم دەویست، بۆ ئەوەی دواتر نەتوانی بە گرتنم دەی قوربان. چونکە هیچ بەڵگەیەکت بە دەستەوە نەدەبوو. منیش دەمتوانی هەمیشە وەگیرتان بێنم و ئاشکرایکەم کە تامەزرۆی مەرگی باوکت بووی. ئەوەش بزانە هەمووان بڕوایان دەکرد و تۆش لە ماوەی ژیانتدا تووشی شەرمەزاری دەبووی.

ئیوان دیسان ددانی لە چیرەوە برد: «کەوایە من ئەوەندە تامەزرۆ بووم، ها؟»

«بەڵێ بەڵێ، لێم ڕوونە، بەو ڕەزایەتەتان بە زمانی بێزمانی فتوای بەڕێوەبردنی ئەو کارەت دا.» ئیسمیر دیاکۆف بە شێوەیەکی لەخۆڕازییانە چاوی لە ئیوان بڕی. زۆر بێهێزبوو، ئارام و لەسەرەخۆ قسەیدەکرد، بەڵام وزەیەک لە ناخەوە دنەی دەدا بدوێ. دیار بوو پیلانێکی بە دەستەوەیە. ئیوان هەستی بەوە کرد.

ئیوان گوتی: «دەی پێمبڵێ، ئەو شەوە ڕووداوەکە چۆن قەوما؟

ـ ئیتر بڵێم چی قوربان! لە سەر جێگاکەم ڕاکشابووم، پێموا گوێم لە دەنگی ئەرباب بوو هاواریکرد. بەر لەوەش گریگۆری لە ناکاو لە خەو ڕاپەڕی و هاتە دەرێ، کتوپڕ هاواریکرد و پاشان بێدەنگی و تاریکی باڵی بە سەر ماڵ و باخەکەدا کێشا. لە سەر هەست و چاوەڕێ لە سەر پێخەفەکەم ڕاکشابووم و دڵم کوتەکوتی بوو؛ ئۆقرەم لێبڕابوو. ئاخری هەستام و چوومە دەرێ قوربان. دیتم ئەو پەنجەرەی دەستی چەپ وا بەرەوڕووی باخەکەیە کراوەتەوە، ڕۆیشتمە پێشێ و گوێم ڕاگرت بۆ ئەوەی بزانم ئەرباب زیندووە یان نا، دیتم کەوتۆتە هەناسەبڕکێ و بە نێو ژوورەکەدا هەڵدەسووڕێ، بۆم دەرکەوت کە

زیندووە قوربان، بە خۆمم گوت: واچاکە بڕۆم بۆ بەر پەنجێرەکە. چوومە بەر پەنجێرەکە و بە دەنگی بەرز هەرامکرد و گوتم: "ئەرباب منم"ئەو بە دەنگی بەرز وەڵامیدایەوە: «لێرەبوو، لێرەبوو، هەڵات.» مەبەستی ئەوە بوو دیمیتری لەوێ بووە. : «گریگۆریی کوشتووە!» لە بەر خۆمەوە گوتم: «لە کوێ؟»ئاماژەیکرد: «هۆ لەوێ، لەو سووچەی باخەکە.» ئەویش لە بەر خۆیەوە قسەیدەکرد. گوتم: «تۆزێ سەبرکە.» چوومە سووچی باخەکە و تەماشامکرد، دیتم گریگۆری لە پەنا مستباکەدا کەوتووە و هەموو گیانی شەڵاڵی خوێنە. بۆم دەرکەوت ڕاستە دیمیتری لێرە بووە، هەربۆیە بڕیارمدا کارەکە یەکلایی کەمەوە. لە دڵی خۆمدا گوتم گریگۆری زیندووش بوایە بەوکارەی نەدەزانی، دەی ئەوە بێهۆش کەوتووە و هەلێکی لەبارم بۆ ڕەخساوە. تەنیا مەترسیم ئەوە بوو مارتا ئیگناتیفنا خەبەری بێتەوە. لەو کاتەدا هەستم بەوە کرد، بەڵام هێندە تامەزرۆی یەکلایی کردنەوەی ئەو کارە بووم، بەحاڵە حاڵ هەناسەم دەردەهات. چوومەوە بەر پەنجێرەکە و بە ئەربابم گوت: «لێرەیە هاتووە؛ ئاگرافنا ئەلکساندرفنا هاتووە و دەیهەوێ بێتە ژووری.» باوکت وەک منداڵ گەشایەوە. بە هەناسەبڕکێوە گوتی: «لە کوێیە؟» بەڵام بڕوای نەدەکرد. گوتم: «هۆلەوێ ڕاوەستاوە. دەرگاکە بکەوە.» لە پەنجێرەکەوە چاوی لێکردم، لەوە دەچوو باوەڕ نەکا. دڕدۆنگ بوو، دەشترسا دەرگاکە بکاتەوە. لە دڵی خۆمدا گوتم: «بۆ ئێستا لە من دەترسی؟» پێم سەیر بوو. بە بیرمدا هات بە حزووری خۆی و لە بەر چاوی خۆی ئەو عەلامەتە بەکار بێنم و تەقەتەق لە پەنجێرەکە بدەم بە نیشانەی ئەوەی گرووشنکا هاتووە. ئەو ڕازەش لە نێوان هەردووکماندا بوو و خۆشی پێی ڕازی بوو. بە ڕەزایەتی هەردووکمان هەڵمان بژاردبوو. لەوە دەچوو بڕوای بە قسەکانم نەبێ، بەڵام هەرکە گوێی لە عەلامەتەکە بوو بە هەڵاتن چوو دەرگاکە بکاتەوە. کردییەوە. دەمویست بچمە ژووری بەڵام پێشی گرتم، سەرتاپای دەلەرزی، چاوی تێبڕیم: «لەکوێیە؟» لە دڵی خۆمدا گوتم: دەی ئەگەر تا ئەو ڕادەیە لە من بترسی، بارودۆخەکە زۆر خراپ دەکەوێ!

مەترسی ئەوەی نەکا نەهێڵێ بچمە ژووریٚ یان قاو لە کەسێک بکا یان مارتا ئیگناتیفنا بە هەڵەداوان بگاتیٚ، یان شتێکی دیکە بقەومیٚ ئەژنۆم دەلەرزی. بە سرتە گوتم: «دەی هۆلەوێیە، هۆلەویٚ، لە بەر پەنجێرە گەورەکەیە. چۆن نەتدیوە؟» «کەوایە بیهێنە، بیهێنە.» گوتم: «دەترسیٚ، ئەوهەرا و دەنگە دەنگە ترسی خستۆتە دڵییەوە. لە بن بنچکەکاندا خۆی شاردۆتەوە؛ بڕۆ لە ژووری متالاوە خۆت هەرای لێکە.» هەلات بۆ بەر پەنجێرەکە و مۆمەکەی لە بەر پەنجێرەکە دانا. هەرایکرد: «گرووشنکا، گرووشنکا، لێرەی؟» سەرەڕای ئەوەش نەیدەویست خۆی دانەوێنیٚ و لەپەنجێرەکەوە تەماشا بکات. نەیدەوێرا لێم دوورکەوێتەوە. زۆر ترسابوو. بەڕادەیەک ترسی لێنیشتبوو نەیدەوێرا پشتم تێکا. گوتم: «چاو لێکە، ئەوەتا.» چووم بۆ بەر پەنجێرەکە و سەرم بردە دریٚ. «ئەوەتانیٚ، لە بن دەوەنەکان خۆی شاردۆتەوە و پێت پێدەکەنیٚ، یانی نایبینی؟» لە پڕ باوەڕیکرد؛ ئازای ئەندامی وەک مێوژۆکە دەلەرزی ـ ئەشقی ئەو ژنە شێت و شەیدای کردبوو ـ دانەوی و لە پەنجێرەکەوە سەری بردە دەریٚ. تەپلەکێکی بلوورین لە سەر مێزەکە بوو هەڵمگرت؛ خۆ لە بیرتە، نزیک کیلۆیەک قورس بوو. هەڵمهێنایەوە و هەتا هێزم تێدابوو لە کەڕاکەی سەریم ڕاکێشا. تەنانەت هاوارێکیشی نەکرد. هەروا بەلادا هات. منیش وەریگەڕامیٚ و بۆ جاری دووهەم و سێهەم تەپلەکەکەم کێشا بە سەریدا. لەگەڵ زەبری سێهەم کاسەسەری لە بەریەک چوو. چاوی زەق بوونەوە و خوێن لە چاو و گوێچکەی دەرپەڕی و بەپشتدا کەوت. چاوێکم لە دەوروبەر کرد. هیچ کوێم پەڵە خوێنی پێوە نەبوو. تەپلە بلوورینەکەم جوان سڕی و لە جێی خۆیم دانایەوە. چووم بۆ لای پەیکەرەکان، پارەکەم لە پاکەتە دەرهێنا و پاکەتە بەتاڵەکەم لە پەنا چرپایەکە فڕێدا و تیلماسە پەمەییەکەشی کە پێی بەسترابووم فڕێمدا چەقی وەتاغەکە، سەرتاپام دەلەرزی، هاتمە دەریٚ و ڕۆیشتم بۆ نێو باخەکە، ڕاست ڕۆیشتم بۆ لای ئەو دارسێوەی نێوقەدەکەی کولۆر بووە، خۆ دەزانی کامە دار دەڵێم؟ لەمێژ بوو ئەو دارەم دیاریکردبوو. لەتیٚ کاغەز و پەڕۆکۆنم لە کونی دارەکە ئاخنیبوو، پارەکانم لە پەڕۆکە پێچا

و خنیمە نێو کونەکەوە. دوو حەوتوو زیاتر هەر لەوێدا بوو، کەس شکی بۆ ئەوە نەدەچوو. کاتێک لە نەخۆشخانە هاتمەوە چووم دەرمهێنا. دوای ئەوەی پارەکەم دابینکرد گەڕامەوە سەر پێخەفەکەم و تخێڵ بووم، لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەگەر گریگۆری واسیلیەویچ کوژرابێ، کارەکەم چەپ دەکەوێ. بەڵام ئەگەر زیندوو بێ زۆرم بەقازانجە. چونکە شایەدی دەدا کە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لەوێ بووە. ئیتر دەردەکەوێ قاتڵ ئەوە و پارەکەشی بردووە.» پاشان دەستمکرد بە ناڵە ناڵ و وڕێنە کردن، بۆ ئەوەی مارتائیگناتیفنا خەبەری بێتەوە. ئاخری لەخەو هەستا و بە هەڵەداوان هات بۆلام، بەڵام کاتێک چرای هەڵکرد و زانیی گریگۆری دیار نییە، هەڵات بۆ دەرێ و گوێم لێبوو لە نێو باخەکەوە قیژاندی.

ئیسمیر دیاکۆف بێدەنگبوو. لەو ماوەیەدا کە قسەیدەکرد، ئیوان کڕوکپ گوێی شلکردبوو، بێئەوەی جووڵە بکا یان چاوی لە سەر هەڵگرێ. ئیسمیر دیاکۆف لەگەڵ گێڕانەوەی چیرۆکەکە جارناجارێک چاوی لە ئیوان دەکرد. بەڵام زیاتر چاوی لە شوێنێکی نادیار دەبڕی و نیگای دەدزییەوە. چیرۆکەکەی تەواو بوو، لەرزی لێهاتبوو و کەوتبووە هەناسەبڕکێ. ڕوخساری وەسەر ئارەقە گەڕابوو. بەڵام مەعلووم نەبوو لە بەر پەشیمانی تووشی ئەو حاڵەتە بووە یان لە بەر شتێکی دیکە.

ئیوان لە ناکاو نەڕاندی: «ڕاوەستە، ئەی سەبارەت بە دەرگاکە دەڵێی چی؟ ئەو ئەگەر دەرگاکەی لە تۆ کردبێتەوە، چۆن گریگۆری پێشتر دیتوویەتی کراوەتەوە؟ چونکە گریگۆری لە پێش تۆدا چووە دەرێ و چاوی پێیکەوت.»

سەیرە ئیوان بە لەبزێکی دۆستانە قسەیدەکرد و وەک پێشوو تووڕە نەبوو، ئەگەر لەو کاتەدا کەسێک دەرگاکەی بکردایەتەوە و سەری بکێشایەتە ژوورێ دەیزانی سەبارەت بە شتێکی ئاسایی قسە دەکەن.

ئیسمیر دیاکۆف، بە پێکەنینێکی مانادارەوە گوتی: «بۆ گریگۆری و کرانەوەی دەرگاکە نازانم بڵێم چی، ڕەنگە چاوی ڕێشکە و پێشکەی کردبێ. دڵنیابە ئەوە بەشەر نییە، بەڵکو یەسترێکی دێز و چەمووشە. نەیدیوە، لەخۆڕا

پێیوایە دیتوویە و لە سەر قسەکەشی سوورە و دەست هەڵناگریَ. لەلایەکەوە بەقازانجیشمانە ئاوا بیر دەکاتەوە و شایەدی دەدا، چونکە دوای ئەوەی بێگومان دیمیتری مەحکووم دەبیَ و حوکمی بۆ دەردەکەن.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ، کە بە جاریَ تووشی سەرسامی بووبوو و هەوڵی دەدا زیاتری بۆ ڕوونبێتەوە، گوتی: «گویَ بگرە... گوێبگرە، پرسیارم زۆرە و دەمەویَ لێت بپرسم، بەڵام لە بیرم دەچنەوە... مێشکم خەریکە دەتەقیَ، تێکەڵم کردووە. ئەها! لانیکەم ئەوەم پێبڵیَ، بۆ پاکەتەکەت هەڵپچڕی و فڕێت دایە چەقی ژوورەکە؟ بۆ پاکەتەکەت لەگەڵ خۆت نەبرد؟... کە باستکرد پێموابوو بەجۆرێک باسی ئەوە دەکەی و بە کارێکی دروستی دەزانی... بەڵام بۆ تێناگەم...»

ـ بۆ ئەوەش دەلیلێکی باشم هەبوو قوربان. ئەگەر کەسێک ئاگاداری هەموو ڕووداوەکە بووایە، هەر وەک من ئاگادار بووم، ئەگەر ئەو پارەیەی پێشتر دیبیَ، یان خۆی ئەو پارەیەی نابێتە پاکەتەکەوە و بە چاوی خۆی دیبێتی پاکەتەکە لاکومۆر کراوە و ناوی وەرگرەکەشی لێنووسراوە، ئەگەر کەسێکی وا ئەو قەتڵەی کردبیَ، لەبەرچی دەبیَ پاکەتەکە هەڵپچڕیَ؟ ئەویش بەو پەلەپەلە. چونکە لێیڕوونبوو پارەکەی تیدایە. وانییە؟ بەڵام ئەگەر دزەکە کەسێکی وەک من بوایە هەروا پاکەتەکەی دەنایە باخەڵی وەک تێسکەی تفەنگ بۆی دەردەچوو قوربان. بەڵام لەمەڕ دیمیتری فیۆدۆرۆویچەوە مەسەلەکە تەواو جیاوازە. سەبارەت بە پاکەتەکە تەنیا هێندیَ شتی بیستبوو؛ قەتیش چاوی پێینەکەوتبوو؛ بۆ وێنە ئەگەر لە ژێر باڵنجەکەشیدا بووایە، بە پەلە هەر هەڵیدەپچڕی بۆ ئەوەی دڵنیا بیَ پارەیە. پاشان پاکەتەکە فڕێدەدا، بیَئەوەی بیر بکاتەوە کە بەڵگەیەک بە زەرەدی خوی بەجیَ دەهێڵیَ. چونکە ئەو دزێکی ئاسایی نەبوو قوربان، دیارە قەتیشی دزی نەکردووە، چونکە چاوتێر و خانەدانە، قوربان. ئەگەر دزییش بکا، دزێکی ئاسایی نییە، بەڵکو تەنیا پارەیەکی هەڵگرتووە کە هی خۆیەتی، چونکە پێشتر بە تەواوی خەڵکی شارەکەی گوتبوو کە دەیهەویَ ئەو کارە بکا. تەنانەت شاتوشووتی کردبوو

کە دەچێ هەقەکەی خوی لە باوکی دەستێنێ. کاتێک دادگاییان کردم ئەوەم بە ئاشکرا بۆ دادوەر باسنەکرد؛ بەڵکو بەپێچەوانە، بە ئاماژە هێنامە سەر بابەتەکە، وەک ئەوەی من تێمنەگەیاندبێ، بەڵکو خۆی بیری لێکردۆتەوە و من پێمنەگوتووە؛ کاکی دادوەریش بەو ئاماژەی من زۆر کەیفی ساز بوو و گوێزی بە کلکی دەشکاند قوربان.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ وا تووشی سەرسومان بووبوو نەڕاندی: «یانی دەکرێ تۆ بەو دەمودەستە ئەو هەموو فکرەت کردبێتەوە و پیلانت داڕشتبێ؟» دیسانیش بە ترسەوە چاوی لە ئیسمیر دیاکۆف بڕی.

ـ جا ئەوە فرمایشتە قوربان؟! پیاو چۆن دەتوانێ بەو پەلەپەلە ئەو پیلانە داڕێژێ؟ پێشتر بیرم لێکردبۆوە.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ دیسان گوڕاندی: «دەی کەوایە شەیتان یارمەتیی داوی...! نا، وادیارە گەمژە نیت، زۆریش لەوە زیرەکتری کە من بیرم لێدەکردەوە...»

ئیوان هەستا سەرپێ و دیار بوو دەیهەوێ لە نێو ژوورەکەدا پیاسە بکات. زۆر پەرۆش بوو. بەڵام چونکە مێزەکە ڕێی لێگرتبوو، نەیدەتوانی لە نێوان مێز و دیوارەکەدا هەنگاو هەڵێنێتەوە، هەر بە پێوە ڕاوەستابوو، خولێکی خوارد و دانیشتەوە. ڕەنگە لە بەر ئەوەی نەیدەتوانی لە جێی خۆی بجووڵێ قەڵس بوو، چونکە دیسان وەک پێشوو لە ناکاو بە تووڕەیی گوڕاندی: «ئەی دەعبای داماوی قێزەوەن، گوێبگرە! ئەگەر تا ئێستا نەمکوشتووی، لە بەر ئەوەیە سبەینێ لە دادگا وەڵام بدەیەوە.» ئیوان دەستی هەڵێنا: «خودا دەزانێ، ڕەنگە منیش تاوانبارىم؛ ڕەنگە حەزێکی شاراوەشم هەبووبێ کە باوکم... بمرێ. بەڵام سوێند دەخۆم بەوڕادەیە کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە تاوانبار نیم. ڕەنگە توشم هەر تیژ نەکردبێ بۆ ئەو کارە، نا، نا، من هانمنەداوی! بەڵام ناترسم، سبەینێ لە دادگا بە زەرەدی خۆشم شایەدی دەدەم. بڕیارەو داومە! هەموو شتێک دەڵێم، هەموو شتێک. هەردووکیشمان لە دادگا ئامادە دەبین. هەرچی دەیلێی بە زەرەدی من بیڵێ، هەر شایەدییەک دەدەی، بیدە. خۆمی لە

بەردا دەگرم و ناترسم. خۆم دان بە هەموو شتێکدا دەنێم! بەڵام تۆش دەبێ دانی پیا بێنی! دەبێ هەر بە یەکەوە بچین، جا بزانە سبەینێ چۆنت دەبەم!»

ئیوان قورساخانە و پێداگرانە ئەوەی گوت و بە چاوە گڕبارینەکەیدا دیار بوو لە سەر قسەی خۆی سوورە و هەرچۆنێک بێ قسەی خۆی دەباتە سەر.

ئیسمیر دیاکۆف بێئەوەی مەبەستی تەوس و گاڵتەبێ، بە هەستی هاودەردییەکی ئاشکراوە گوتی: «وادیارە حاڵت باشنییە، قوربان، هیچ لەوە ناچێ حاڵت باشبێ قوربان. چاوت زەرد هەڵگەڕاوە.»

ئیوان دووپاتی کردەوە: «پێکەوە دەچین. تۆ نەشهاتی گرینگ نییە، خۆم بە تەنیایی دەچم.»

ئیسمیر دیاکۆف وەک ئەوەی خەریکی بیرکردنەوە بێ، ئاخری هەڵیدایە:

ـ شتیوا هەر نابێ، قوربان. تۆ ناچی قوربان.

ئیوان بە لەبزێکی تەشەراوییەوە گوتی: «لە قسەکانم تێناگەی..

ـ ئەگەر ڕاستیی هەموو شتێک بڵێی، تووشی شەرمەزارییەکی زۆر دەبی، قوربان، ئەو کاتەش هیچ کەڵکێکی نابێ. چونکە لەڕێوە دەڵێم من قسەی وام نەکردووە. ئێوەش لەوە ناچێ حاڵتان باشبێ، (واش دەنوێنێ)، یان ئەوەندەت خەمی براکەتە و بۆی بە داخەوەی دەتهەوێ خۆتی بۆ فیدا کەی، هەموو ئەوانەشت بە دژی من سازاندووە، چونکە هەمیشە منت وەک مێشێک چاو لێکردووە. ئەوەش هیچ، کێ بڕوا بە قسەکانتان دەکا، کوا بەڵگەت؟

ـ گوێبگرە هەر ئێستا بۆ ئەوەی دڵنیا بم ئەو پارەیەت نیشاندام.

ئیسمیر دیاکۆف کتێبەکەی لە سەر پارەکان لابرد و لەو لاوە داینا، لەگەڵ هەڵکێشانی هەناسەیەک گوتی:

ـ ئەو پارەیە لەگەڵ خۆت بەرە.

ئیوان بە سەرسووڕمانەوە چاوی تێبڕی: «هەڵبەت هەڵیدەگرم. بەڵام ئەگەر بۆ ئەو پارە پیاوت کوشتووە، بۆ دەیدەی بە من؟»

ئیسمیر دیاکۆف لەخۆباییانە شانی هەڵتەکاند و بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی: «نامەوێ قوربان، دەمویست بەو پارەیە ژیانێکی تازە لە مۆسکۆ، یان لەوەش

باشتر لە دەرەوەی وڵات دەست پێبکەم. ئەو خولیایەم لە سەردا بوو، هەر لە بەر ئەوەش کە «هەموو شتێک ئازادە.» ئەوەی فێرتکردم، زۆر دروست و حیسابییە، چونکە لەو بارەوە زۆرت قسە بۆ کردووم. ئەگەر خودای جاویدان بوونی نەبێ، شتگەلێکی وەک مەزنایەتی و کەسایەتیش هەر نابێ. پێویستیش نییە. هەق بە ئێوەبوو. من ئەو مەسەلەیەم بەو شێوەیەی دەدی.»

ئیوان بە بزەیەکی مانادارەوە پرسیی: «خۆت بەوە گەیشتی؟»

- بە ڕێنوێنیی ئێوە قوربان.

- ئێستاش پێموایە ئیمانت بەخودا هەیە. وا دەتەوێ ئەو پارەیە بدەیەوە.

- ئیسمیر دیاکۆف منجاندی: «نا، قوربان، ئیمانم پێی نییە.»

- ئەی بۆ دەتەوێ پارەکە بدەیەوە؟

ئیسمیر دیاکۆف دیسان دەستی هەڵتەکاند: «بەسیکە... ئیتر بەسیکە! خۆت دەتگوت هەموو شتێک ئازادە، کەوایە خۆت بۆ ئەوەندە پەرۆشی؟ تەنانەت دەتەوێ بچی بە زەرەدی خۆت شایەدی بدەی...» ئیسمیر دیاکۆف لە کۆتاییدا بە متمانەوە گوتی: «بەڵام دەزانم ئەو کارە ناکەی! تۆ ناچی ئەو شایەدییە بدەی.»

ئیوان گوتی: «دەیبینی.»

- شتیوا هەرنابێ. ئێوە زۆر زیرەکن قوربان. هۆگریی زۆرت بە پارە هەیە، ئەوە دەزانم قوربان. پێتخۆشە هەموو کەس ڕێزت بۆدانێ، چونکە زۆر لەخۆبایی و دەمارزلی. زۆریشت حەز لە کچی جوانە، لە هەموو شتێکیش زیاتر حەولی ئەوەتە ژیانێکی ئاسوودە و دوور لە کێشەت هەبێ، بێئەوەی پشت بە کەسێک ببەستی - زیاتر لە هەموو شتێک حەولی ئەوەتە. خۆ ناتەوێ ئەو شوورەییە وەئەستۆ بگری و هەتاهەتا ژیان لە خۆت تاڵکەی. تۆش وەک فیۆدۆرپاولۆویچی باوکت وای، قوربان، تۆ لەو کوڕانەی دیکە زیاتر شێوەی ئەو دەدەی قوربان. ڕۆح و خووخدەشت لەو دەچێ.

ئیوان، کە ویدەچوو سەرنجی ڕاکێشرابێ، گوتی: «تۆ گەوج نیت.» سوورهەڵگەڕا بوو. «پێموابوو گەوجی.» هەروا کە بە قەڵافەتێکی جیاوازەوە چاوی لە ئیسمیر دیاکۆف دەکرد گوتی: «ئێستا وادیارە زۆر جیددیی!»

- دەمار زلیت وایلێکردووی من بە گەوج بزانی. ئەو پارەیە هەڵگرە.

ئیوان سێ چەکەپارەکەی هەڵگرت و نایە گیرفانی، بێئەوەی لە هیچی بپێچێ.

- سبەینێ لە دادگا دەینوێنم.

- ئێستا کە خۆتان خاوەنی پارە و سامانێکی زۆرن، هیچکەس باوەڕتان پێناکا: ڕەنگە ئەوەت لە سندووقی پارەکانت دەرهێنابێ و هێنابێتت بۆ دادگا.

ئیوان هەستا سەرپێ و گوتی:

- دیسان دەیڵێمەوە، تەنیا لە بەر ئەوە هەتا ئێستا نەمکوشتووی، سبەینێ لە دادگا پێویستیم پێتە. ئەوەت لە بیر نەچێ!

ئیسمیر دیاکۆف کە کتوپڕ بە شێوەیەکی سەیر چاوی لە ئیوان بڕی و گوتی: «دەی بمکووژە. ئێستا بمکووژە قوربان.» بە بزەیەکی تاڵەوە درێژەی پێدا: «تەنانەت توانایيت نییە و ناوێری بیریشی لێبکەیەوە، ئێوە قوربان کە ئەو هەمووە نەترسن، غیرەتی هیچ کارێکتان نییە، چ بگا بە پیاوکوشتن!»

ئیوان گوڕاندی: «خوداحافیز،» وەڕێکەوت بڕواتە دەرێ.

- تاوێ ڕاوەستە... ئەوانەم دیسان پیشان بدەوە.

ئیوان پارەکانی لە گیرفانی دەرهێنا و پیشانیدا. ئیسمیر دیاکۆف ماوەی دەچرکە چاوی تێبڕین. پاشان دەستی هەڵتاکاند و گوتی:

«زۆر چاکە، دەتوانی بڕۆی.» چەند هەنگاوێکی هەڵێنابۆوە دیسان بانگی کرد: «ئیوان فیۆدۆرۆویچ!»

ئیوان بێئەوەی ڕاوەستێ ئاوڕی دایەوە: «چیت دەوێ؟»

- خوداحافیز، قوربان.

ئیوان دیسان گوڕاندی: «خوداحافیز!» پاشان لە ژوورەکە چووە دەرێ.

کرێوە و بادەوە هەروا گێژی دەدا. سێ هەنگاوی یەکەمی جەسوورانە هەڵێنایەوە، بەڵام لە ناکاو کەوتە لەتردان و لاتراسکە بەستن. موچڕکێکی پێدا هات و لەرز دایگرت، بە بزەیەکەوە گوتی: «پەتایەکی جەستەیە.» شتێکی وەک شادی لە ڕۆحی هەڵدەقولا. حەزێکی بەهێز لە باوەشی ڕۆحی وەرهێنا، دڵنیا بوون و ئۆخژنێک دوایی بەو دڕدۆنگییانە هێنا کە لەم دواییانەدا تەنگی بە ڕۆحی هەڵچنیبوو و ئازاری دەدا. بڕیاری خۆی دابوو، بە خاترجەمی و ڕۆحی ئاسوودەوە بیری کردەوە: «ئێستا ئیتر گۆڕانی بە سەردا نایە.» لەو کاتەدا لە شتێک هەڵکەوت و سەرسمێکی وای دا خەریک بوو بە دەمەوە بکەوێ. ڕاوەستا و دیتی ئەو کابرا لادێیە لە بەر لاقیدا تخێڵ بووە. وەبیری هاتەوە کە خۆی دابووی بە عەرزدا، کابراش هەروا بێهۆش و جووڵە کەوتبوو. بەفر خەریکبوو سەر و چاوی دادەپۆشی. ئیوان باوەشی پێدا کرد و هەڵیستاندەوە. چرایەکی دی لەماڵێکی چکۆڵەی دەستی ڕاست، ڕۆیشت و لە دەرگای دا، داوای لە پیاوی خاوەنماڵەکە کرد یارمەتییبدا و ئەوکابرا لادێیە ببەن بۆ پۆلیسخانە. سێ ڕۆبڵی دا بە کابرا، ئەویش هەر لەڕێوە ئامادە بوو یارمەتیی بدا و هاتە دەرێ. زۆر لە سەر ئەوە نارۆم کە ئیوان چۆنی کابرای لادێیی بردە پۆلیسخانە و توانیی پزیشکێک بێنێ معاینەی کات و زۆر بە دەستودڵبازی خەرجی کابرای لە ئەستۆ گرت. هەر ئەوەندە دەڵێم ئەو کارە سەعاتێکی تەواوی خایاند. بەڵام ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە دڵەوە شاد و ڕازی بوو، بەردەوام زەینی بۆ هەموو لایەک دەچوو و بیری لە زۆر شت دەکردەوە.

بە خەیاڵی تەختەوە بیریکردەوە: «ئەگەر بۆ سبەینێ ئاوا لێبڕاوانە بڕیارم نەدایە، سەعاتێکی تەواو ڕانەدەوەستام ئاگاداری لەو کابرا لادێییە بکەم، بەڵکوو بەلایدا تێدەپەڕیم، بێئەوەی گوێشم ببزوێ لە سەرمانا ڕەقهەڵدێ.» هەر لەو کاتەدا بە خاترجەمییەکی زیاتریشەوە بیریکردەوە: «بەڕاستی دەتوانم ئاگاداری لە خۆم بکەم، ئەگەرچی ئەوان دەڵێن خەریکم شێتدەبم.»

کاتێک گەیشتەوە مەنزڵەکەی خۆی، کتوپڕ ڕاوەستا و لە خۆی پرسی باشتر نییە هەر ئێستا بچم بۆ لای دادەور و هەموو شتێکی بۆ باسبکەم؟ لە بەر دەرگاکە وەرسووڕا و سەبارەت بە پرسیارەکەی خۆی بڕیاریدا. لە بەر خۆیەوە گوتی: «سبەینێ هەمووی بەسەریەکەوە!» سەیر ئەوەشە هەر لە ساتێکدا تەواوی ئەو شادی و خاترجەمیانەی لەنێو چوو.

کاتێک پێی‌نایە ژوورەکەیەوە، وەک سەهۆڵ بەدڵیدا بێنن وابوو. شتێکی هەستپێکرد، زیندوو بوونەوەی بیرەوەریەک، یان ڕوونتر بڵێم، وەبیرهاتنەوەی شتێکی دڵتەزێن و ناخۆش کە ئێستا، هەر لەو کاتەدا، لەو ژوورەدا بوو، پێشتریش هەر لەوێ بووبوو. بێهێز و شەکەت خۆیدا بە سەر قەنەفەکەدا. پیرێژنەکە سەماوەرێکی بۆ هێنا. ئیوان چاییی دەمکرد، بەڵام دەمی لێنەدا. ئەو شەوە پیرێژنەکەی مەرەخەس کرد بڕوا. لە سەر قەنەفەکە دانیشت هەستیکرد سەری لەگێژەوە دێ. هەستی بە نەخۆشی و کەساسی دەکرد. خەریک بوو خەوی لێبکەوێ، بەڵام هەستا سەر پێ و بەنێو ژوورەکەدا دەستیکرد بە پیاسەکردن، بۆ ئەوەی خەوەکەی بپەڕێ. هێندێ جار پێیوابوو خەون دەبینێ و وڕێنە دەکا، بەڵام ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر بیری لێدەکردەوە نەخۆشییەکەی نەبوو. دانیشتەوە و چاوی بە نێو ژوورەکەدا گێڕا، دەتگوت لە شتێک دەگەڕێ. چەند جار گڕی ڕقێک خۆی لە ڕوخساری وەرپێچا. هەردوو دەستی کردە کۆڵەکەی لەشی و ماوەیەکی زۆر بەوشێوەیە دانیشت، ئەگەرچی بە لاچاوێک هەروا چاوی لەو قەنەفەیە دەکرد کە لە سووچی دیوارەکەی ڕووبەڕوو داندرابوو.

دیار بوو شتێک لەوێیە کە تووڕە و ناڕەحەتی دەکات و ئازاری دەدا.

(٩)

## شەیتان، مۆتەکەی ئیوان فیۆدۆرۆویچ

من پزیشک نیم. بەڵام واهەستدەکەم ئێستا ئیتر کاتی ئەوەیە ناچار بم پوختەیەک لە چۆنیەتیی نەخۆشییەکەی ئیوان فیۆدۆرۆویچ بۆ خوێنەرانم باسبکەم. بە سەر ڕووداوەکاندا تێدەپەڕم و لێرەدا لانیکەم دەتوانم شتێک بڵێم: ئیوان لەو کاتەدا هێندەی نەمابوو تووشی یاوی مێشک بێ. ئەگەرچی ماوەیەکی زۆر بوو تووشی نەخۆشی بووبوو، بەڵام سەرسەختانە لە هەمبەر تاویاودا خۆڕاگریی دەکرد، ئاخریش هێزی لێبڕا و تاویاوێکی قورس دایگرت. ئەگەرچی سەرم لە پزیشکی دەرناچێ، بەڵام دەتوانم بڵێم ئەو لە ڕاستیدا زۆری هەوڵدابوو، توانیبووشی ماوەی تاویاوەکە وەدوا بخا، هەڵبەت بەو هیوایەی بە تەواوی بەرگری لەو نەخۆشینە بکا. دەیزانی حاڵی باش نییە. بەڵام بیر کردنەوە لە نەخۆشی لەو کاتە پڕ مسیبەتەدا زۆری جاڕز کردبوو. یانی لەو کاتە پڕ کێشە و ئاڵۆزەی ژیانیدا کە پێویستی بەوە بوو بە تەواوی بە سەر ئەقڵی خۆیدا زاڵبێ و ئەوەی دەیڵێ دەبێ بە شێوەیەکی پێداگرانە و ئازایانە بێ، «لەدڵی خۆیدا پاکانەی بۆ خۆی دەکرد.»

بەو حاڵەشەوە، ڕاوێژی لەگەڵ دوکتورە تازەکەی کردبوو، هەر ئەو دوکتۆرەی لە سەر داوای کاترینا ئیوانا لە مۆسکۆوە هێنابوویان و پێشتریش ئاماژەم پێکرد. دوکتۆر دوای گوێ گرتن لە قسەکانی و معاینە کردنی، بەو ئاکامە گەیشت کە ئیوان تووشی ناڕەحەتیی زەینی و ڕۆحی بووە، بۆیە کاتێک قسەکانی ئیوانی گوێ لێبوو کە حاشای لە نەخۆشییەکەی دەکرد، هیچ تووشی سەرسووڕمان نەبوو. دوکتۆر گوتی: «ئەو ناڕەحەتییە لەوانەیە

تووشی ورێنە بێژیشت بکا... دەبێ لەو بارەوە زیاتر لێکۆلینەوە بکرێ... لەسەریەک داواتان لێدەکەم زۆرتان ئاگا لە خۆتان بێ، نابێ چرکەیەک لە خۆت خافڵ بی و نەخۆشییەکەت پشتگوێ بخەی چونکە زۆر مەترسیدارە.»

بەڵام ئیوان فیۆدۆرۆویچ ئەو پەندە حەکیمانەیەی لەبەرچاو نەگرت و لە پێخەفدا نەکەوت پەرستاریی لێبکەن، لە دڵی خۆیدا گوتی: «بە ئیشتیا دەتوانم بەملاولادا برۆم، زۆریش لەش‌ساغم. ئەگەر لە جێدا بکەوتایەم، مەسەلەکە فەرقی دەکرد و هەرکەس پێیخۆشبوایە دەیتوانی پەرەستاریم لێبکا.» پاشان مەسەلەکەی خستە پشتگوێ.

بەم شێوەیە، کە خۆشی تارادەیەک ئاگای لەو وەهم و خەیاڵەی هەبوو، دانیشتبوو و هەروا کە گوتم، لە پەستا چاوی لەو شتەی سەر قەنەفەکەی سووچی دیواری ڕووبەڕووی دەکرد. دەرکەوت کە کەسێک لەوێ دانیشتووە، ئەگەرچی خودا دەزانێ چۆن چۆتە ژوورێ چونکە کاتێک ئیوان لەلای ئیسمیر دیاکۆف گەڕایەوە ئەو ئیتر جێی قوونی خۆشکردبوو. ئەو کەسێک بوو، یان ڕوونتر بڵێم، کابرایەکی شێوە ئەشرافیی ڕووسی بوو، نزیکەی پەنجا ساڵی تەمەن بوو، هەر وەک فەڕەنسییەکان دەڵێن، qui faisait la cinquantine هەروەها مووی سەری تۆزێ درێژ و پڕبوو لقەلقەی ڕەشی تێدا مابوو، ڕیشیشی قوڵە و نووک تیژ بوو. باڵتەیەکی مەلەوانیی مەیلەو قاوەییی و کۆنی لەبەردا بوو، کە لە دووساڵ لەمەوبەرەوە خەڵکی تەڕپۆش و دەوڵەمەند وەلایان نابوو. کراس و بۆینباخە درێژەکەی ڕواڵەتەن وەک جلوبەرگی دەوڵەمەند و تەڕپۆشان دەچوو، بەڵام لە نزیکەوە کراسەکەی کۆن و چڵکەسوو بوو، بۆینباخەکەشی هەموو دڵۆی هەڵدابوو و تاڵکێش بووبوو - پانتۆڵە دامەییەکەی زۆر ڕێک و پێک و جوان بوو بەڵام ڕەنگەکەی کاڵ بوو، بۆ ئەو مۆدەش زۆر تەنگ بوو. کڵاوە مەخمەری و سپییەکەی بۆ ئەو وەرزەی ساڵ نەدەبوو. وەلحاسڵ ڕواتێکی ئاسایی هەبوو و دیار بوو دەسکورت و هەژارە. لەوە دەچوو لە چینی ئەو مالیکە بیکارانە بێ، کە لە

---

٧- لە پەنجاساڵی نزیک کردبۆوە.

سەردەمی بەردەداریدا زۆر و بەرچاو بوون. بێگومان سەردەمێک خوشگوزەران و تەڕپۆش بووە و لەگەڵ مۆد گەڕاوە، ڕەنگە سەردەمێک خاوەن دەسەڵات بووبێ و لەوانەیە هەر ئێستاش وابێ، بەڵام دوای قیتەقیت و پۆز و هەوای تافی لاوی، هەژاری وردەوردە وایلێدەکا ملک وماڵی لە دەست بێتەوە و ئاتاجی بەردەماو و دەرکوبانی دەوڵەمەندان بێ. لەلای دۆستێکی باشەوە دەچوو بۆ لای دۆستێکیتر. لە بەر قسەخۆشی و مەجلیسخۆشی کەس دەستی بەڕوویەوە نەدەنا. لە بەر ئەوەش کە پیاوێکی ئەشرافی و نەجیمزادە بوو، دەیتوانی لەگەڵ هەموو کەس دانیشێ، ئەگەرچی لای سەرووشی کەمتر پێدەدرا. ئەو جۆرە مرۆڤە مەجلیسخۆش و غەریبانە کە سەریان لە گاڵتە و گەمە و گەنجەفە دەردەچێ و هەقایەتویژیشن، هەر ئەرکێکیان پێبسپێرن خۆی لێنادەن و بە ئاشکرا لە بەری دەردەچن، بێیار و پشتیوانیشن، جا لاو و ڕەبەن بن یان بێوەپیاو، هەر وان و فێری ئاوی بێلەغاو بوون. لەوانەیە تاقمێکیان منداڵیشیان هەبێ، بەڵام منداڵەکانیان لەلای پلک و پووران دادەنێن و ئەو کەسانە لە کۆڕ و دانیشتندا، باسی ئەو منداڵانە ناکەن، وەک ئەوەی پێیان شوورەیی بێ. وردە وردە منداڵەکانیان لە بیر دەچێتەوە، ئەگەرچی جاروبار کارتی جەژنی لەدایکبوون و کریسمەسیان بە دەست دەگا و جاری وایە وەڵامی نامە و کارتەکانیش دەنووسنەوە. ئەو میوانە کتوپڕ و نەخوازراوە زۆریش ڕەزاسووک و خوێنشیرین نەبوو، کە بتوانێ خۆشمەشرەف و مەجلیسخۆش بێ و لە کاتی پێویستدا خۆی شیرین بکا و دۆستانە خۆی بنوێنێ. سەعاتی نەبوو، بەڵام چاویلکەیەکی لە سەر لووتی دانابوو بەنێکی ڕەشی لە دەسکەکەی خستبوو، قامکی زەرەرنەقووتەی ئەنگوستیلەیەکی ئەستووری ئاڵتوونی تێکردبوو، کە نقیمێکی هێلکەیی هەرزانبایی تێدابوو. ئیوان فیۆدۆرۆویچ تووڕە و تۆسن دانیشتبوو قسەی نەدەکرد. میوانەکە بە ماتی وەک خزمێکی هەژار دانیشتبوو کە لە وەتاغەکەی هاتبێتە خوارێ تاکو لەگەڵ خانەخوێکەی چایی بخواتەوە، کاتێک دیتی خانەخوێکەی ناوچاوی تێکناوە و سەری لە بەر خۆیدایە، هیچی نەدەگوت.

بەڵام ئەگەر خانەخوێ زمانی بگەڕایە، ئیتر ڕانەدەوەستا و بە شێوەیەکی دۆستانە سەری قسەی دەکردەوە. کتوپڕ ڕەنگی گوڕا و ڕووی کردە ئیوان فیۆدۆرۆویچ و گوتی:

ـ دەمەوێ عەرزت بکەم، ببوورە، تەنیا باسەکە دێنمە گۆڕێ، بۆ ئەوەی وەبیرت بێنمەوە، چووی بۆ ماڵی ئیسمیر دیاکۆف تاکو سەبارەت بە کاترینا ئیوانا پرسیار بکەی، بەڵام بێئەوەی زانیارییەکت دەستکەوێ گەڕایەوە، وێدەچێ لە بیرت چووبێتەوە کە...

ئیوان گوتی: «ئاخ، بەڵێ،» لە بەر نارەحەتی ڕوخساری ڕەشداگەڕا. «بەڵێ لە بیرم چووبۆوە...» لە ژێر لێوەوە ورتاندی: «بەڵام ئێستا ئیتر گرینگ نییە، هەتا سبەینێ گوێی خۆتی لێبخەوێنە،» پاشان بە تووڕەیی ڕووی کردە میوانەکەی و گوتی: «تۆش، خۆشم تا خولەکێکی دیکە وەبیرم دەهاتەوە، چونکە ئەوە ڕاست ئەوشتە بوو کە ئازاری دەدام! بۆ خۆتی تێهەڵدەقوتێنی، ڕەنگە بۆ ئەوەبێ ئیمان بێنم کە تۆ هانتداوم و خۆم ئەوەم وەبیر نەهاتۆتەوە؟»

میوانەکە بە گەرموگوڕی و دڵۆڤانی زەردەیەکی گرت و گوتی: «کەوایە ئیمانی پێمەهێنە، چ کەڵکێکی هەیە بە پێچەوانەی ئیرادەی خۆت ئیمان بێنی؟ سەرەڕای ئەوەش بەڵگە هیچ یارمەتییەکت نادا بۆ ئیمان هێنان. بەتایبەت بەڵگەنامەی نووسراوە و ئاشکرا. تۆماس ئیمانی هێنا، نەک لە بەر ئەوەی مەسیح سەری هەڵداوە، بەڵکو لە بەر ئەوەی دەیویست بەرلەوەی بیبینێ ئیمانی پێبێنێ. بۆ وێنە چاو لەو کەسانە بکە کە ڕۆح بانگدەکەن... زۆرم هۆگری پێیان هەیە... بیری لێبکەوە، پێیان وایە خزمەت بە ئامانجی مەزهەب دەکەن، چونکە شەیتان لەو دنیاوە شاخی خۆیانی پیشاندەدەن. ئەمەش لە ڕاستیدا بەڵگەیەکە بۆ بوونی جیهانێکی دیکە. ئەو دنیا و بەڵگەنامەی ئاشکرا چی! کاتێ بەوەش گەیشتی، پێتوایە بتوانی بوونی شەیتان بسەلمێنی، هەر ئەو سەلماندنەش دەبێتە هۆی سەلماندنی بوونی خودا؟ دەمەوێ ببمە ئەندامی

کوڕی ئیدەئالیستەکان و ببمە سەردەستەی نارازی و دژوازان و دەڵێم من ڕاستیخوازم، بەڵام مادیخواز نیم، هی ـ هی!»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە ناکاو هەستایە سەرپێ و گوتی: «گوێبگرە، وادیارە تووشی ورێنە بووم و لە ڕاستیدا دەڕاوێنم، هەر قسەیەکی هەڵیتوپڵیت دەزانی بیکە، مێشێکیشم میوان نییە! تۆ هەر کارێک بکەی تووڕە نابم، هەر وەک جاری پێشوو کردت. بەڵام بە شێوەیەک هەست بە شەرمەزاری دەکەم... دەمەوێ بەنێو ژوورەکەدا بگەڕێم... هێندێ جار ناتبینم و تەنانەت گوێم لە دەنگیشت نابێ، هەر وەک جاری پێشوو، بەڵام هەمیشە وا هەست دەکەم چەقەچەق دەکەی، چونکە لە ڕاستیدا خۆمم قسە دەکەم، خۆمم نەک تۆ. بەڵام نازانم جاری پێشوو خەونم دی یان هەر بە ڕاستی چاوم پێت کەوت. ئێستا خاولییەک دەخووسێنم و دەینێمە سەرسەرم، ئەو کاتە ڕەنگە تۆ لە بەر چاوم غەیب بی.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ ڕۆیی بۆ قوژینی وەتاغەکە، خاولییەکی هێنا، تەڕی کرد، نایە سەر سەری خۆی و بەنێو ژوورەکەدا دەستیکرد بە پیاسە کردن.

میوانەکە هەڵیدایە: «زۆر خۆشحاڵم کە ئەوەندە خۆمانە قسەم لەگەڵ دەکەی.»

ئیوان پێکەنی: «گەمژە، ئەی پێتوایە ڕێزت لێدەگرم؟ ئێستا زۆر شاد و دڵخۆشم. چونکە سەرم ژاندەکا... لاجانگ و ناوچەوانیشم دێشێ... تەنیا تکات لێدەکەم وەک جاری پێشوو مەچۆ سەرباسی فەلسەفە. ئەگەر ناشتوانی بێدەنگ بی، شتێک بڵێ خۆشبێت و ماوەیەک پێوەی سەرگەرم بین. باسی دەنگۆ بکە، تۆ غەوارەی، وەک قڕنوو پێمەوە نووساوی، دەبێ باسی دەنگۆ و قسەی هەڵیتوپڵیتم بۆ بکەی. دەزانی چ مۆتەکەیەک سواری سینگم بووە! بەڵام لێت ناترسم. بەسەرتدا زاڵدەبم. نامبەن بۆ شێتخانە!»

ـ c'est charman {زۆرم پێخۆشە} قڕنووم. دیارە قڕنووم، ئەی دەتویست چی بم؟ ڕاستت دەوێ گوێت بۆ ڕادەدێرم و هەتا ڕادەیەک پێم سەیرە وردە

وردە خەریکی من بە شتێکی ڕاستەقینە دەزانی، نەک خەیاڵی، هەر وەک جاری پێشووش پێداگریت لە سەر دەکرد...

ئیوان بە تووڕەیی گوڕاندی: «تەنانەت بۆ چرکەیەکیش تۆم بە شتێکی ڕاستەقینە نەزانیوە. تۆ درۆینەی، نەخۆشی، تاپۆیەکی و هیچیتر. بەڵام نازانم چۆنت لە نێو بەرم، دەبێ ماوەیەکی زۆر ڕەنج بکێشم و هەوڵبدەم. تۆ خەیاڵی منی. تۆ تەرمی خۆمی، بەڵام بەشێک لە جەستەی خۆمی... دیاردەی بیرۆکە و هەستمی، بەڵام دیاردەی خراپترین و گەوجانەترین خەیاڵ. لەو لایەنەوە ڕەنگبوو بۆ من سەرنجڕاکێش بی، هەڵبەت ئەگەر دەرفەتم هەبوایە بۆ تۆی بە فیڕۆ بدەم...»

ـ ببوورە، ببوورە، مەچەکت دەگرم. ئەمڕۆ ئێوارە کە لە ژێر کۆڵەکەی کارەباکە ئانگژای ئالیووشا بووی و نەڕاندت بەسەریدا: «لەوت بیستووە. تۆ چووزانی ئەو دێ بۆ دیدەنیم؟» بیرت لە من دەکردەوە. کەوایە بۆ ساتێک بڕوات کرد کە من لە ڕاستیدا بوونم هەیە.

کابرای میوان دوای ئەو قسەیە بە ئارامی پێکەنی.

ـ بەڵێ ئەو ساتە ساتی بەزین و لاوازیی من بوو... بەڵام بڕوام بە بوونی تۆ نەکرد. نازانم جاری پێشوو خەوتبووم یان بەخەبەر. ڕەنگە ئەو کاتە تەنیا خەونم دیبێ و لە ڕاستیدا هەر نەمدیبێتی.

ــ بۆ لەگەڵ ئالیووشا ئاوا بە توندی جووڵایەوە؟ مرۆڤێکی زۆر خۆشەویستە؛ لە سەر باوە زووسیما وا دیارە زۆر توندی بە گژدا هاتووی!

ـ ناوی ئالیووشا مەهێنە! چۆن دەوێری، خوێڕیی بەرەڵڵا!

ئیوان دیسان پێکەنی.

ـ لۆمەم دەکەی، بەڵام پێدەکەنی ـ دیاردەیەکی باشە. بەڵام زۆر لە جاری پێشوو بە ئەدەبتری، دەشزانم بۆ: ئەو بڕیارە گەورەت...

ئیوان شێتانە نەڕاندی «کارت بە سەر بڕیاری منەوە نەبێ.»

ـ تێدەگەم، تیدەگەم، c'est noble, c'est charmant دەتەوێ پارێزگاری لە براکەت بکەی و خۆتی بۆ فیداکەی... c'est chevaleresque

ـ دەمت لێکنێ، با وەبەر شەپت نەدەم!

ـ ڕێزەیەکیش بە دڵییەوە ناگرم، چونکە ئەو کاتە بە ئامانجم دەگەم. ئەگەر بەشەپ لە من هەڵدەی، دەبێ ئیمان بە ڕاستیی بوونی منیش بێنی، چونکە مرۆڤ شەپ لە تاپۆ هەڵنادەن. گاڵتە وەلانێین باشە، بۆشم گرینگ نییە، ئەگەر پێتخۆشە وەبەر تیر و توانجیشم بدە، بەڵام واچاکە لەگەڵما بە ئەدەبانەتر هەڵسوکەوت بکەی. «گەوجی خوێڕی!» خەی خەی لەو وشانە!

ئیوان دیسان پێکەنی: «ئەگەر تانە لە تۆ بدەم، لە خۆمی دەدەم. تۆ هەر خۆمی، هەر منی، بەڵام قەڵافەتت جیاوازە. هەر بیرۆکەکانی خۆمە لە زمانی تۆوە دەیبیستم... جگە لەوانەش ناتوانی باسی هیچ شتێکی تازە بکەی!»

میوانەکە بە نەرمی و ویقارەوە گوتی: «ئەگەر بیر کردنەوەم وەک تۆ بێ، زۆر باشە و بە قازانجی خۆمە.»

ــ تۆ تەنیا خراپترین فکرەکانم هەڵدەبژێری و جگە لەوەش، گەوجانەترینەکەیان. تۆ گەوج و خوێڕی و هیچوپووچی. تەشریفی مەبارەکت زۆریش گەلحۆی. نا، ناتوانم لەگەڵ تۆ هەڵکەم! چبکەم لە دەست تۆ، دەبێ چبکەم؟

ئیوان دوایین ڕستەی بە ددانە چیڕەوە دەربڕی.

میوانەکە کتوپڕ هەڵچوو، بە هەستێکی ڕووشاو وساویلکانەوە کە تایبەتی ئەو جۆرە کەسانەیە، گوتی: «دۆستی بەڕێز، بەر لە هەموو شتێک پێمخۆشە وەک نەجیمزادان هەڵسوکەوت بکەم و بەو تایبەتمەندییەوە بناسرێم. من هەژارم، بەڵام.... ناڵێم زۆر دروستکارم، خەڵکی ڕەشۆکیش لە سەر ئەو باوەڕەن من فریشتەیەکی تاراوم. بە ڕاستیش پێم قەبووڵناکرێ کە زەمانێک من فریشتە بووبێتم. ئەگەر بووبێتیشم، ڕەنگە لە ڕابردوویەکی زۆر دووردا

---

٨- «زۆر باشە، هۆی دڵخۆشییە.»

٩- جوامێرانەیە.

بووبێ و لە بیر بردنەوەشی زەرەدی نییە. ئێستا تەنیا گرینگی بە ناوبانگی نەجیمزادە بوونی خۆم دەدەم و پێمخۆشە وەک ئاغا چاوم لێبکەن. پێمخۆشە ئەو جۆرەی لە دەستمدێ بیگوزەرێنم و هەوڵ دەدەم ڕەزاسووک و مەجلیسخۆش بم. لە دڵەوە خەڵکم خۆشدەوێ، ئاخ! گەیشتوومەتە لوتکەی مەزنایەتی! هەر ئەوەی کە جاروبار لای تۆ دەمێنمەوە، بە شێوەیەک ژیانم وەڕاست دەگەڕێ و هەر ئەوەش زۆرم شاد دەکا. بڕوانە، منیش وەک تۆ فکر و خەیاڵ ئازارم دەدا، هەر بۆیە ڕاستییەکانی سەر زەویم خۆشدەوێ. لێرە لەگەڵ تۆ، هەموو شتێک ئابلۆقە دراوە، بە پێی یاسای تایبەتی و هەندەسییە و حەد و سنووری هەیە. بەڵام ئێمە هیچمان نییە و پێوەر و سنوور بۆ هیچ شتێک دانەنراوە! لێرە پیاسە دەکەم و خەون دەبینم. خەو بینینم زۆر پێخۆشە. جگە لەوەش لە سەر زەوی دەکەومە ژێر کارتێکەریی خورافات. تکات لێدەکەم پێم پێمەکەنە، خورافاتی بوون هەر ئەوشتەیە کە من کەیفی پێدەکەم. لێرە هەموو خووخدەکانی ئێوە فێر دەبم: باوەڕ دەکەی هۆگری گەرماوە گشتییەکان بووم؟ دەچم لەوێ لەگەڵ قەشە و بازرگانەکان خۆم دەشۆم بۆ ئەوەی چڵک هەڵخەم. ئەوەی کە خەونی پێوەدەبینم ئەوەیە هەمیشە و بەردەوام خۆم بە شکڵی ژنە بازرگانێک دەرهێنم کە کێشی دووسەد و پەنجا پۆندە و ئیمانم بە تەواوی ئەو شتانە ببێ کە ئەو ئیمانی پێیەتی. ئامانج ئەوەیە بچمە کلێسە و بە بیروباوەڕێکی پاکەوە مۆمی نەزری داییسێنم، بە شەرەفم ئەوە ویست و تاسەی منە. کاتێک ڕەنج و ئازارەکانم کۆتاییی دێ کە بەو ئاواتانەم بگەم. پێمخۆشە لەلای ئێوە خۆم ماریجە بکەم؛ بەهارێ نەخۆشیی خولێرکە پەرەی ساند، چوومە نەخۆشخانەیەک و خۆم بە دژی ئەو نەخۆشییە کوتا، خۆزگە دەتزانی ئەو ڕۆژە چ کەیفێکم کرد. دە ڕۆبڵم یارمەتیدا بە ڕێکخراوەی برایانی ئیسلاوی خۆمان!... بەڵام تۆ گوێم بۆ شل ناکەی. دەزانی ئەمشەو هیچ حاڵت باشنییە؟ دەزانم دوێنێ چوویە لای ئەو پزیشکە... دەی ئێستا چۆنی؟ دوکتۆر گوتی چی؟»

ئیوان بە تووڕەیی نەڕاندی: «گەمژە!»

ـ بەڵام هەرچۆنێک بێ، تۆ مرۆڤێکی زیرەکی. دیسان خەریکی تانە و تەشەرم پێدادەدەی؟ خۆ لە بەر هاودڵی پرسیارم لێنەکردی. پێویستیش نەبوو وەڵام بدەیەوە. ئێستا دیسان ماسوولکەکانم وەژان کەوتنەوە...

ئیوان دووپاتی کردەوە: «گەمژە!»

ـ تۆش هەر ئەوەت لە سەر دەمە؛ بەڵام پارەکە ماسوولکەکانم وا وەژان کەوتن، ئێستاش هەر لە بیرم ماوە.

ـ شەیتان و ژانی ماسوولکە!

ـ ئەگەر هێندێ جار بێمە سەر شکڵ و شێوەی مرۆڤ، ئیتر بۆ تووشی ژانی ماسوولکە نەبم؟ دێمە سەر شکڵ و شێوەی مرۆڤ و ئاکامەکەشی دەبینم.

ـ چی، چی؟ Satan sum at hihil humanum a me alienum puto. Satan sum at hihil humanum. ئەوە بۆ شەیتان خراپ نییە!

ـ خۆشحاڵم کە ئاخری ڕازیم کردی.

ئیوان، کە وێدەچوو سەرنجی ڕاکێشرابێ، گوتی: «بەڵام تۆ ئەوەت لە من وەرگرت. ئەو قسەیەم هەر بە زەینیشدا نەهات، سەیرە.»

ـ c'est du nouveau, n'est ce pas. ئەمجارە سادقانە هەڵسوکەوت دەکەم و بۆشت باسدەکەم. گوێبگرە، لە دنیای خەوندا، بە تایبەت مۆتەکە، کە بە هۆی قورس بوونی گەدە و گرفتی هەرسەوەیە، مرۆڤ جاری وایە خەونی ئەوەندە هونەرمەندانە و ڕووداوی هێندە پێچەڵاوپووچ و سەرسوورهێنەر و تەنانەت دنیایەک ڕووداو و کارەسات، کە پێکەوە گرێدراون دەبینێ، کە سوێندت بۆ دەخۆم لیۆن تۆلستۆی ناتوانێ چیرۆکێکی ئاوا پڕ کارەسات و تراژێدی بخولقێنێ. سەرەڕای ئەوانەش کەم وایە نووسەران ئەو جۆرە خەونانە ببینن، بەڵکو خەڵکانی ئاسایی ـ کارمەندان و ڕۆژنامەنووسان و قەشەکان دەیبینن... ئەو مەسەلەیەش مەتەڵێکی زۆر پێچەڵاوپووچە. ڕۆژێک

---

١٠- «من شەیتانم و هیچ شتێکی مرۆڤم بەلاوە نامۆ نییە.»

١١- «ئەوە شتێکی تازەیە، ها؟»

سیاسەتڤانێک لای من دانیپیانا کە چاکترین بیرۆکەکانی لە خەونیدا بە زەینی دەگا. چاکە، ئێستاش هەروایە، ئەگەرچی من تەنیا خەیاڵێکم و بەس، بەڵام وەک ئەو کاتەی کە خەون دەبینی و مۆتەکە سواری سینگت دەبێ، خاڵگەلێکی ئەوەندە ورد و نوێت پێدەڵێم کە قەت بە زەینت نەگەیشتبێ. بە جۆرێک کە قەت فکر و بیرۆکەی خۆت دووپاتناکەمەوە. سەرەڕای ئەوانەش جگە لە کامووس و خەونی هاشە و پاشەی خۆت هیچیتر نیم.

ـ درۆ دەکەی، دەتهەوێ قەناعەتم پێبێنی کە بوونەوەرێکی جیاوازی مۆتەکەی من نیت، ئێستاش دەڵێی خەونێکی و بەس.

ـ هاوڕێ گیان، ئەمڕۆ ڕەوشتێکی تازەم گرتۆتە پێش، کە دواتر بۆتی باسدەکەم. سەبرکە، لە کوێدا بووم؟ ئەها بەڵێ! پاشان هەڵامەتم گرت، لێرەنا، لەوێ.

ئیوان هیوابڕاوانە پرسیی: «ئەوێ کوێیە؟ پێمبڵێ بزانم، زۆر لێرە دەمێنییەوە؟ ناتوانی بڕۆی؟» دەستی لە هاتوچۆ هەڵگرت و لە سەر قەنەفەکە دانیشت، دیسان هەنیشکی دایە سەر مێزەکە و بە هەردوو دەستی سەری خۆی گرت. خاولییە تەڕەکەی لە سەری کردەوە و بە تووڕەیی فڕێیدا. دیار بوو کەڵکی نییە.

میوانەکە بە ڕاشکاوی و لەبزێکی دۆستانەوە گوتی: «ئەعسابت خراپە. تەنانەت لە بەر ئەو سەرما بوون و هەڵامەتگرتنەی من پەرۆشی، ئەگەرچی بە شێوەیەکی زۆر سروشتی گرتوومە و دەزانم لە سەر ئەوە ڕقت لێم هەستاوە. من ئەو کاتە بە پەلە دەمویست بچم بۆ ماڵی خاتوونێکی پایەبەرز لە پترزبۆرگ، کە دەیویست ببێتە وەزیر لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەدا، خۆم گەیاندە ئەو میوانداریە. دەی جلوبەرگی شەوم لە بەردا بوو، بە بۆینباخی سپی و دەستەوانەوە، جا خودا دەزانێ لە کوێ بووم و ناچار بووم پانتایی ئاسمان ببڕم بۆ ئەوەی خۆم بگەیەنمە سەر زەوی... هەڵبەت زۆر کەمی خایاند. بەڵام خۆ دەزانی هەشت دەقیقە دەخایەنێ تا تیشکی خۆر دەگاتە زەوی، بیری لێبکەوە بە جلوبەرگی شەو و جلیسقەی سینەبازەوە بەو

ئاسمانە بەرینەدا بفڕی. ڕۆحەکان لە سەرمانا کەسیرە نابن، بەڵام کاتێک لە سەر شکڵ و شێوەی مرۆڤ بن، سەرمایان دەبێ. من بیرم لەوە نەکردبۆوە و وەڕێکەوتم. دەزانی لەو ئاسمانە خووساوەدا، ئەو ئاوەی بە ئاسمانەوەیە، سەهۆڵێکی تێدایە... سەهۆڵ! جا سەهۆڵ چییە، هەر بۆ ئەوە نابێ ناوی سەهۆڵی لێبنێی! دەتوانین بڵێین سەد و پەنجا پلە لە ژێر سفردایە! ئەو گەمەیەی کچانی لادێیت بیستووە؟ لە سەرمای سی پلە ژێر سفردا، داوا لە لاوێکی بێئەزموون دەکەن کە زمانی بە تەوردا بێنێ. زمانی هەر لەڕێوە دەیبەستێ پێوەی، ئەو گەلحۆیەش بە زۆر زمانی لێدەکاتەوە و پێستی زمانی بە تەورەکەوە بەجێ دەمێنێ و خوێنی لێدێ. بەڵام ئەوە لە سەرمای سی پلە ژێر سفردایە، لە سەرمای سەد و پەنجا پلەدا هەر ئەوەندە زمانت بگاتە بیورەکە دەبێ فاتیحای خۆت بخوێنی... هەڵبەت ئەگەر لەوێ تەور وەدەست بکەوێ.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ بە قەڵسی و بێزارییەوە قسەکەی پێبڕی: «بۆ ئەوێ تەوریشی لێیە؟» بە تەواوی هەوڵی خۆی دەدا باوەڕ بەو خەیاڵ و وڕێنەیەی خۆی نەکا و لە گێژاوی شێتیدا ئەوق نەبێ.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ، زۆر بە تووڕەیی و بە شێویەکی خیشەسەرانە، لە ناکاو نەڕاندی: «ئەرێ، لەوێ تەور چیی لێدێ؟»

«لە پانتایی ئاسماندا تەور چیی لێدێ؟! Quell idêe ئەگەر بڕیار بێ بکەوێتە خوارێ، پێموایە وەک هەسێرۆک دەستدەکا بە سووڕانەوە بە دەوری زەویدا. ئەستێرەناسانیش هەڵاتن و ئاوابوونی تەورەکە حیسێب دەکەن. «گاتزۆک»یش لە ڕۆژمێرەکەیدا دەیگونجێنێ.

ئیوان بە تووڕەیی گوتی: «تۆ گەوجی، گەوجێکی هەژدە عەیار. درۆیەک بکە ڕێی تێبچێ. دەنا گوێت لێناگرم. دەتەوێ بە زۆر پێم بسەلمێنی کە بوونت

---

١٢- «ئەو قسەیە!»

١٣- Gatsovk بڵاوکەرەوەی ڕۆژمێری گشتی.

هـەیـە، بـەڵام مـن نامـەوێ بڕوا بـە بوونـت بکـەم. نـا، بـاوەڕ ناکـەم و ئیمانت پێناهێنم!»

ـ بەڵام من درۆ ناکەم، هەمووی هەقیقەتە. بە داخەوە هەقیقەت نابێتە هۆی سـەرگـەرمـی. تـۆ چـاوەڕوانیـت لێمـە قسـەی کـەڵـەکـەڵـە و جوانـت بـۆ بکـەم و پێداگریی لە سەر دەکەی. مخابن ئەوەش لە توانای مندا نییە...

ـ کەرە گەمژە، فەلسەفەم بۆ دامەتاشە!

ـ فەلسەفە! ئەویش لە کاتێکا لای ڕاستەم لەسم بووە و لە بەر ژان هاوار و ناڵەمە! تەواوی زانکۆی پزیشکیم لێکداوە: لـەوێ هـەمـووان زانـا و پـسـپۆڕن و وەک ئاوخواردنـەوە نـەخۆشـییەکـەت مـەعلـووم دەکـەن، بـەڵام نـازانن دەرمانـەکـەی چییـە. خوێنـدکارێکی زانکـۆیی لێـرە بـوو، ئـەو لاوە وردیلـە و خـوێنگـەرمـە دەیگـوت: «لـەوانـەیـە بمـری، بـەڵام بـە تـەواوی تێدەگـەی بـە چ نەخۆشییێک دەمری.» بۆ ناردنی خەڵکیش بۆ لای پسپۆڕەکان شێوەیەکی تایبەتیان هەیە، دەڵێن: «ئێمە تـەنیا نـەخۆشییەکـەت مـەعلووم دەکـەین، بـەڵام بچۆ بۆ لای ئەو پزیشکە پسپۆڕە، ئەو دەرمانەکەت پێدەڵێ.»

کە هەموو چەشنە نەخۆشییەکی دەرمان دەکرد، بە تـەواوی بزر بووە و هەر نەماوە. لەو بابـەتـەوە دڵنیاتدەکـەم، ئێستا تـەنیا پسپۆڕەکان ماون و لـە ڕۆژنامەکاندا ئاگاداری بڵاودەکەنەوە. پڕوپاگەندە بۆ خویان دەکەن. ئەگەر لووتت عەیبێکی هەبێ، دەتنێرن بۆ پاریس؛ دەڵێن ئەوێ پسپۆڕی فەڕەنگیی لێیە کە کاری تەنیا ماریجە کردنی کەپۆیە. ئەگەر بچی بۆ پاریس، چاو لە لووتت دەکا و دەڵێ: من تەنیا دەتوانم کونە لووتی لای ڕاستت ماریجە بکەم، کونـە لـووتی چـەپـەت کاری من نییـە، بڕۆ بـۆ ڤیـەنـا پـسپۆڕێک لـەوێیە دڤنی چـەپـەت ماریجـە ئـەکـا. دەی چـارە چییـە؟ پـەنـام بـردە بـەر دەوا و دەرمـانی خۆماڵی، نۆشدارێکی ئاڵمانی گوتی لە نێو حەمامدا لەشم بە هەنگوین و خوێ داماڵم. چوومـە حـەمـام و مـاجوومی هـەنگوین و خـوێم لـە لـەشم هـەڵساوی. بەڵام هیچ فەرقێکی نەکرد. هیوابڕاو بووم و نامـەیـەکم نووسی بۆ «کێنت ماتیە» لە میلان. خێری بنووسێ، کتێبێک و قەترەیەکی لووتی بۆ ناردم. بڕوا

بکە شەربەتی «مالت هاف» چاکی کردمەوە! بە هەڵکەوت کرِیم، شووشە و نیوێکم لێخواردەوە وای پێچاک بوومەوە، هێندەی نەمابوو دەست بکەم بە سەما و هەڵپەڕکێ. بڕیارم دا بۆ سپاس و پێزانین بابەتێک بدەم بە ڕۆژنامەکان، هەستی هەقناسی هانیدام بۆ ئەو کارە، بەڵام تووشی چەرمەسەرییەکی وابووم کە هیچکام لە ڕۆژنامەکان ئەو بابەتەیان لێ وەرنەگرتم. دەیانگوت: «زۆر کۆنەپەرەستانەیە، هیچکەس بڕوا ناکا. Le diable n'existe point»[٤] و گوتیان: « واچاکە هەروا بێناو و نیشان بمینییەوە!» سپاسنامەیەک کە بێناو و نیشان بێ چ کەڵک و بایەخێکی هەیە؟ پێکەنینم بە کاربەدەستی ئەو ڕۆژنامانە هات و گوتم: «لە ڕۆژگاری ئێمەدا ئیمانت بەخودا ببێ بە کۆنەپەرەستت دەزانن، بەڵام من شەیتانم، کەچی لەوانەیە ئیمانیان بە من هەبێ.» گوتیان: «سەرمان لە قسەکانت دەرناچێ. کێ ئیمانی بە شەیتان نییە؟ سەرەڕای ئەوەش هەر بۆت چاپناکەین، چونکە دەبێتە هۆی بەدناویی ڕۆژنامەکەمان. وەک گاڵتە ڕەنگە بتوانین لە سووچی لاپەڕەیەکدا بڵاوی بکەینەوە.» بەڵام پێموابوو چاپ کردنی ئەو نامەیە وەکو گاڵتە جوان نییە. بۆیە چاپنەبوو. بڕوا بکە لەو کاتەوە تا ئەمڕۆ بەو هۆیەوە هەر پەڕۆشم. باشترین هەستم، بۆ وێنە هەستی ئەمەگناسیم، بە هۆی بارودۆخی کۆمەڵایەتییەوە زەوتکراوە و هەقی دەربڕینم نییە.

ئیوان زۆر بە تووڕەیی ددانی لە ڕیچەوە برد و گوتی: «دیسان بیرۆکەی فەلسەفی؟»

ـ خودا لەوەم بپارێزێ، بەڵام هێندێ جار پیاو سکاڵاش بکا باشە. من مرۆڤێکم زۆرم بوختان پێکراوە. تۆ سات بە سات پێمدەڵێی گەوج و گەمژە و سووکایەتیم پێدەکەی. دیارە هەرزەکاری. هاوڕێی بەڕێز، شعوور بە تەنیا بەس نییە! من زاتەن دڵێکی شاد و نەرم و بەنەشەم هەیە. «منیش هەموو چەشنە شیعرێکی وردیلە و ئاسایی دەهۆنمەوە.» ڕەنگە منت وەک خالستاکۆفی زورهان هاتبێتە بەرچاو، بەڵام چارەنووسی من چارەنووسێکی

---

١٤- «شەیتان هەر نییە.»

زۆر جیددیتره. هەر لە ڕۆژی بەڕێوە بە پێی ئەو حوکمەی کە هیچ کات سەرم لێی دەرنەچووە، ئەرکی من ئەوەیە «حاشا» بکەم، لەگەڵ ئەوەشدا زاتەن خاوەنی دڵێکی باش و بەسۆزم و بە هیچ شێوەیەک حەزم لە حاشاکردن نییە. «نا، دەبێ بڕۆی و حاشابکەی، بە بێحاشاکردن، ڕەخنەش نابێ، ڕۆژنامەش بە بێلاپەڕەی ڕەخنە بەکار نایە. بەبێ ڕەخنە و هەڵسەنگاندن هیچ شتێک نابێ، مەگین هووشیعانا. بەڵام هووشیعاناش بە تەنیایی بۆ ژیان بەس نییە، هووشیعاناش دەبێ لە نێو کوورەی دڕدۆنگیدا بخاریێ. بەڵام من نامەوێ خۆم لەو مەسەلە هەڵقوتێنم، چونکە من نەمخوڵقاندووە و هیچ بەرپرسایەتییەکیشم لە ئەستۆ نییە، بەڵام منیان کردۆتە قۆچی قوربانی و بەڵاگەردانی خۆیان. داوایان لێکردووم لاپەڕەی ڕەخنە و هەڵسەنگاندن بنووسم و بەمشێوەیە ژیان دەستییپێکرد. ئاگامان لەو مەڵحەکەیە هەیە. بۆ وێنە من زۆر بە ڕاشکاوی داوا دەکەم لە نێو بچم. بەڵام گوتراوە: نا، زیندوو بە، چونکە بەبێ تۆ هیچ شتێک نابێ. ئەگەر هەموو شتێک لە جیهاندا ماقووڵانە بوایە، هیچ ڕووداوێک نەدەقەوما. بەبێ تۆ هیچ ڕووداوێک نابێ و دنیاش بە بێڕووداو و کارەسات سەرناگرێ. بۆیە بە پێچەوانەی ویستی خۆم، خەریکی ساز کردنی ڕووداو و کارەساتم، ڕاسپاردەم و هیچم لە سەر نییە. مرۆڤ لە خشتە دەبەم و بەو هەموو ئەقڵ و فامەوە ئەو گەمەیە بە جیددی دەزانن. هەر ئەوەش بۆتە هۆی چارەڕەشیی ئەو خەڵکە هەڵبەت ئەوان ئازار دەکێشن... بەڵام دەژین. ژیانێکی ڕاستەقینە نەک خەیاڵی. چونکە ڕەنج و ئازار ژیانە. بەبێ ڕەنج ژیان تامی نییە! ژیان دەبێتە ڕێوڕەسمێکی بێپایان، ڕێوڕەسمێکی پیرۆز بەڵام خەماوی، بەڵام من چکارەم؟ من ڕەنج دەکێشم، کەوایە ناژیم. من لە معادڵەی مەجهوولیدا ژمارەی ئیکسم. جۆرێک تاپۆم لە ژیاندا کە نازانم لە کوێوە هاتووم و بۆ کوێ دەچم. ناوی خۆشم لە بیر چۆتەوە. پێدەکەنی ـ نا، پێناکەنی، هەروا تووڕەی، تەواوی فکر و پەرۆشی تۆ بۆ شعوورە. بەڵام دیسان دووپاتی دەکەمەوە، ئامادەم تەواوی ئەو ژیانە پەڕزەوینییەم و تەواوی پلە و پایە و

شانازییەکانم بدەم، بەو شەرتەی بێمە سەرشکڵی ژنە بازرگانێکی قەڵەو کە کێشی بگاتە دووسەد و پەنجا پۆند و لە پەرستگاکان مۆمی نەزری داییسێنم.
ئیوان بە بزەیەکی تاڵەوە گوتی: «کەوایە تۆ تەنانەت ئیمانت بە خوداش نییە؟»
- بڵێم چی - یانی ئەگەر گاڵتە ناکەی...
ئیوان هەروا توورە و تۆسن قسەکەی پێبڕی و نەڕاندی: «خودایەک هەیە یان نییە؟»
- ئەها، کەوایە گاڵتە دەکەی؟ هاوڕێ گیان، وەڵڵا نازانم. چاکە وەرە، ئێستا خۆ پێمگوتی!
- نازانی، بەڵام خودا دەبینی؟ نا، تۆ کەسێکی تر نییت، هەر خۆمی، ڕاست خۆمی نەک شتێکی دیکە! تۆی گەمار خەیاڵی خۆمی!
- دەی ئەگەر وات پێخۆشە منیش هەر ئەو فەلسەفەیەی تۆم هەیە. ئەمە ڕاستە Je pense, donc je suis[15] وەک ڕۆژ ئەوەم لێ ڕوونە، شتەکانی دیکە، تەواوی ئەم دونیایانە، خودا و تەنانەت شەیتانیش - هەموویان بە بڕوای من، هێشتا نەسەلمێندراوە. بێژی هەر لەخۆڕاوە خۆی خوڵقابێ، یان ئەوە تەنیا دیاردەیەک لە خۆمە. پانتای مەنتیقی زاتی خۆمە کە لە ڕۆژی بەرێوە هەر بووە: بەڵام بە پەلەم قسەکەم تەواو بکەم، چونکە پێموایە هەر ئێستا لێمدەڕاسێی و لە سەر و چاوم دەسرەوێنی.
ئیوان داماوانە گوتی: «وا چاکە هەقایەتێکم بۆ بگێڕییەوە!»
- ڕاست سەبارەت بە مەسەلەی باسەکان هەقایەتێک هەیە، یان واچاکە بەجێی هەقایەت بڵێم ئەوسانە. بەبێ ئیمانی سەرکۆنەم دەکەی، دەبینی، قسە دەکەی، کەچی ئیمان هەر ناهێنی. بەڵام هاوڕێ گیان، من تەنیا کەسێک نیم کە تووشی ئەو بارودۆخە ئاڵۆزە بووم. ئێستا هەموومان لەوێ پێمان لە قوڕ چەقیوە، هەمووشی بە هۆی زانستی ئێوەوە. سەردەمێک هەستی پێنجینە و گەردیلە و چوارماکی سەرەکی هەبوون، پاشان هەموویان بە شێوەیەک

---

١٥- وتە بەناوبانگەکەی دیکارت: «من بیر دەکەمەوە، کەوایە هەم.»

یەکیان گرت. تەنانەت لە دنیای قەدیمیشدا گەردیلە هەر بوون. بەڵام لەو کاتەوە ئاگادار بووین "مۆلۆکولی کیمیایی" و "پرۆتۆپلاسم"تان دۆزیوەتەوە و شەیتان دەزانێ چ شتێکی دیکەشتان دۆزیوەتەوە، ناچار بووین کلکمان لە گەڵۆز نێین و ئاوڕ نەدەینەوە. لەوێ دەمگۆ و خورافات و ئاژاوەیەک وەڕی خراوە ئەوسەری دیار نییە؛ ئەوە بزانە لە نێو ئێمەشدا بە ئەندازەی ئێوە دەمگۆ و خورافات هەیە، لە ڕاستیدا هێندێ زیاتریش. ڕاستت دەوێ بەدناوکردنی یەکتریش هەیە، چونکە مەزرینگەیەکمان هەیە «ئاسایش»ی تایبەت بەڕێوەی دەبا. ئەو چیڤانۆکە کۆنە هی سەدەکانی ناوەڕاستی ئێمەیە ـ نەک سەدەکانی ناوەڕاستی ئێوە، چونکە سەدەکانی ناوەڕاستی ئێمە ـ تەنانەت لە نێو ئێمەشدا هیچکەس باوەڕی پێناکا. مەگین پیرێژنانی دووسەد و پەنجا پۆندی، مەبەستم پیرێژنانی ئێوە نییە، پیرێژنانی خۆمان دەڵێم. ئەوەی ئێوە هەتانە، ئێمەش هەمانە، خەریکم بە هۆی دۆستایەتییەوە یەکێک لە ڕازەکانمانت بۆ خۆیا دەکەم؛ ئەگەرچی یاساغە. ئەم دیرۆکە سەبارەت بە بەهەشتە. دەڵێن لێرە لە سەر زەوی فەیلەسووفێکی بیریار هەبووە، کە حاشای لە هەموو شتێک کردووە: «ویژدان و ئیمان و ئایین[١٦]» لە هەمووشی گرینگتر، پەسڵان. کاتێک مرد چاوەڕێ بوو ڕاست بەرەو مەرگ و تاریکی بڕوا، بەڵام کاتێک ئەو دنیای بە چاوی خۆی دی سەری سوڕما و بە ڕقهەستاوی گوتی: «ئەمەش لەگەڵ یاسای بنەڕەتیی من جیاوازە!» هەر لە بەر ئەوەش تووشی سزا بوو... یانی، دەبێ بمبووری، ڕاست ئەو قسەیەت بۆ دەگێڕمەوە کە بیستوومە، ئەوسانە یەکە و بەس... کابرایان بەوە مەحکووم کرد کە لە تاریکیدا چوار میلیارد کیلۆمەتر ڕێ بپێوێ؟ دوای ئەوەی ئەو مەودایەی بڕی دەروازەکانی بەهەشت بەڕوویدا دەکرێتەوە و دەبەخشرێ...

ئیوان بە تامەزرۆییەکی سەیرەوە پرسیی: «لەو دنیا جگە لە چوار میلیارد کیلۆمەتر ڕێگا بڕین، چ جۆرە ئەشکەنجەیەکی دیکەش هەیە؟»

---

١٦- وتەی فامۆسۆف لە شانۆنامەی کۆمیدیی «داخ لە دەست ئاوەز»دا نووسینی گریبایدۆف.

- چ جۆرە ئەشکەنجەیەک؟ هەرباسی مەکە. لە ڕۆژگارانی زوودا هەموو چەشنە ئەشکەنجەیەکمان هەبوو، بەڵام ئێستا زیاتر سزای ئەخلاقی جیگای گرتوونەوە ـ «ئازاری ویژدان» قۆڕیاتێکی دیکەی لەو چەشنە. ئەوەشمان لە ئێوە وەرگرت، بە هۆی «نەرم و لەسەرەخۆ بوونی ئێوەوە.» دەی کێ مستەهەقترە؟ تەنیا ئەو کەسانەی ویژدانیان نییە، چونکە کاتێک ویژدانیان هەیە، چۆنیان ئازاری ویژدان دەبێ؟ بەڵام مرۆڤە نەجیمەکان، کە خاوەنی ویژدان و شەڕەفن، بەو هۆیەوە ئازار دەکێشن. چاکسازی، کاتێک بواری بۆ هەڵنەکەوتبێ و هەلی بۆ نەڕەخسابێ، بە تایبەت ئەگەر دامەزراوەگەلێکی لاساکەرەوەی بیانی بن، تەنیا وێرانییان لێدەکەوێتەوە! ئاوری قەدیم باشتر بوو، یانی هەر دۆزەخەکە لەوە باشتر بوو. چاکە، ئەو کابرایە کە مەحکووم بوو چوار میلیارد کیلۆمەتر ڕێ بپێوێ، هێواش ڕاوەستا، چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد و لە سەر ڕێگاکە ڕاکشا. «نارۆم، من سەرپێچی لەو یاسایە دەکەم!» ڕۆحی کافرێکی بیریاری ڕووسی بگرە و لەگەڵ ڕۆحی یۆنس پێغەمبەر، کە سێ شەو و ڕۆژ لە نێو زگی ماسیدا ژیا، پێکەوە ئاوێتەیان بکە، خووخدە و ڕەوەشتی ئەو بیریارەت دێتە دەست کە لە نێو ڕێدا ڕاکشا.

- لە سەر چی ڕاکشا؟

- دەی پێموایە شتێک نەبوو لە سەری ڕاکشێ. پێناکەنی؟

ئیوان دیسان بە تامەزرۆییە سەیرەی پێشووەوە هاواریکرد: «ئافەریم!» ئێستا بە کونجکاوییەکی چاوەڕوان نەکراوەوە گوێی ڕاگرتبوو. «چاکە، یانی ئێستاش هەرلەوێ ڕاکشاوە؟»

- گرینگ ئەوەیە کە ئەو ڕانەکشاوە، نزیکەی هەزارساڵ لەوێ ڕاکشا و پاشان هەستا وەڕێکەوت.

ئیوان کە بزەیەکی تاڵی نیشتبووە سەرلێو، وا دیار بوو لە بیری شتێکدایە، بە تووڕەیی گوڕاندی: «زۆر کەری تۆ! چ فەرقێکی هەیە تاهەتایە

لەوێ ڕاکشێ یان چوار میلیارد کیلۆمەترەکە ڕێ بپێوێ؟ بڕینی ئەم مەودایە یەک بیلیۆن ساڵ دەخایێنێ؟»

- لەوەش زیاتر، قەڵەم و کاغەزم پێ نییە دەنا حیسابم دەکرد. بەڵام ئەو زۆر زوو گەیشتە ئەوێ، هەر لەوێشەوە چیرۆکەکە دەستیپێکرد.

- چی، گەیشتە ئەوێ؟ ئاخر ئەو یەکبیلیۆن ساڵەی لە کوێ هێنا؟

- تۆش هەر لە بیری ئەم زەوییەی ئێستا دای! بەڵام لەوانەیە ئەم زەوییەی ئێستای ئێمە یەکبیلیۆن جار تێکچوو بێ و دروستبووبێتەوە. لە نێو چووبێ، بووبێتە یەکپارچە سەهۆڵ، قەڵەشتی بەستبێ، لەتوکوت بووبێ، ئەوماکە سەرەکییانەی لێ جیا بووبێتەوە کە لێی پێکهاتووە، دیسان "ئاوی سەر ئاسمان"، دوای ئەوە دیسان ئەستێرەی کلکدار، دیسان خۆر، هەمیسان لە خۆرەوە بۆتەوە بە زەوی، وەلحاسڵ زۆری گۆڕان بەسەردا هاتووە هەر ئەم بەردەوامبوونە بێپایانەی لەوانەیە بە شێوەیەکی ناخۆش و خەماوی لەسەریەک دووپاتبووبێتەوە...

- دەی باشە، دوای ئەوەی گەیشتێ چی ڕووی‌دا؟

- کاتێک کە دەروازەکانی بەهەشت کرایەوە و ئەو پێی‌نایە ژوورێ، بە سەعات هێشتا دووچرکە تێنەپەڕیبوو، (ئەگەرچی بە بڕوای من سەعاتەکەی حەتمەن لە ڕێگا لە بەر یەک هەڵوەشاوە و تواوەتەوە)، گوڕاندی کە نرخی ئەو دووچرکەیە بە ئەندازەی بڕینی چوار میلیارد کیلۆمەتر، بەڵکو چوار میلیارد میلیارد بە تەوانی چوار میلیارد بووە! لە ڕاستیدا، تێی‌هەڵکرد لە سروودی هووشیعانا و هێندەی گوت و گوتەوە بێتامی کرد و هێندێک لەو مرۆڤە بیریارانەی ئەوێ سەرەتا تەوقەیان لەگەڵ نەکرد - دەیانگوت، زۆر زوو گۆڕانی بەسەردا هاتووە. خوڵقوخوویەکی ڕووسییانەیە. دووپاتیدەکەمەوە ئەوسانەیەکی خەیاڵییە و بەس. لەمەش زیاتر بایەخی پێنادەم. ئەمەش ئەو چەشنە ئەندێشەیە کە تەنانەت ئێستاش سەبارەت بەو مەسەلەیە هەمانە.

ئیوان، وەک ئەوەی ئاخری توانیبێتی شتێک وەبیر خۆی بێنێتەوە، بە شادی و نەشەیەکی منداڵانەوە گوتی: «چاکم مێشکت وەگیر هێناوە! ئەو

هەقایەتەی سەبارەت بە چوار ملیارد ساڵ بوو خۆم سازاندم! ئەو کاتە حەڤدە ساڵم تەمەن بوو لە قوتابخانەی دواناوەندی دەمخوێند. ئەو هەقایەتەم سازاند و بۆ یەکێک لە هاوپۆلەکانم گێڕایەوە، ئەو هاوپۆلەم ناوی کرۆفکین بوو و ئەو کاتە لە مۆسکۆ بووین... زۆر هەقایەتی چاکە و ئیلهامم لە هیچکەس وەرنەگرتووە. پێموابوو لە بیرم چۆتەوە... ـ بەڵام لە ناکاو وەبیرم هاتەوە ـ تۆ نەبووی ئەوەت پێگوتم! هەزاران شتی ئاوا بێئیختیار وەبیر دێنەوە، تەنانەت کاتێک مرۆڤ دەبەنە پای سێدارە... ئەو هەقایەتە لە خەوندا وتراوە. ئەو خەونەش تۆی! تۆ خەونی، نەک بوونەوەرێکی زیندوو!»

میوانەکە دەستیکرد بە پێکەنین: «ئەوەندە قورس و قایم حاشام لێدەکەی، کە بەو قەناعەتە گەیشتووم ئیمانت پێمە.»

ـ تۆ بڵێی ڕێژەیەک! یەک لە سەدی ڕێژەیەکیشم ئیمان پێت نییە!

ـ بەڵام ئەگەر یەکهەزارەمی ڕێژەشت ئیمان ببێ هەرباشە. بارانی وردە ڕەحمەتە، دانی پیابنێ کە تەنانەت ئیمانت بە دەهەزارەمی ڕێژەش هەیە.

ئیوان بە تووڕەیی گوتی: «تۆ بڵێی چرکەیەک.» بە لەیزێکی غەریب گوتیشی: «بەڵام پێمخۆشە ئیمان بە تۆ بێنم.»

ـ ئەها! بەوە دەڵێن دانپیانان! بەڵام من ڕۆحسووکم. دیسان یارمەتیت دەدەم. گوێبگرە، ئەوە من بووم مێشکم وەگیر هێنای، نەک تۆ. هەقایەتەکەی خۆتت لە بیر چووبۆوە، بە قەستی بۆم گێڕایەوە، بۆ ئەوەی ئیمانت بە من نەمێنێ.

ـ درۆ دەکەی. ئامانجت لەو دیدارە ئەوەیە کە بوونی خۆتم پێبسەلمێنی!

ـ ڕاست وایە. بەڵام دڕدۆنگی و چاوەڕوانی، شەڕی نێوان ئیمان و بێئیمانی ـ جاری وایە بۆ مرۆڤێکی خاوەن ویژدانی وەک تۆ زۆر پڕ ئازارە و وا چاکە لەڕێوە خۆت هەڵواسی. دەمزانی حەزدەکەی ئیمانم پێبێنی، بویە بە گێڕانەوەی ئەو هەقایەتە بڕێکم بێئیمانی بۆ هەڵڕشتی. بە نۆرە بەرەو ئیمان و بێئیمانیت دەکێشم، بۆ ئەو کارەش ئامانجێکی تایبەتیم هەیە. ڕەوەشتێکی نوێیە قوربان. هەرکاتێ بە تەواوی ئیمانت پێم نەما، بەرەوڕوو هەوڵدەدەی دڵنیامکەی کە خەون نیم و بە ڕاستی هەم. دەتناسم. تەنیا تۆوێکی وردی ئیمان لە ناختدا دەچێنم و

دەبێتە دار بەڕوو - ئەویش داربەڕوویەکی وا، ئەگەر لە سەری دانیشی، ئاواتەخواز دەبی بچییە ڕیزی «ڕاهیبانی خەڵوەتنشین و ژنانی داوێنپاکەوە» چونکە زاتەن ئەو ئارەزووەت هەیە. خۆراکت دەبێتە کوللە و پەنا دەبەیتە بەر دەشت و بیابان بۆ ئەوەی ڕۆحی خۆت ڕزگار کەی!

- پیاو دەبێ هێندێ جار کاری خێریش بکا. تۆش چەندە خوڵک ناخۆشی!

- گەوجە، ئەو پیاوە پیرۆزانە حەڤدە ساڵ لە بیابان کوللەیان خوارد و عیبادەتیان کرد، هەتا وای لێهات قەوزە و خەنەتیلکە دایپۆشین، تۆ وەسوەسەت کردن؟

هاوڕێ گیان، کارێکیترم نەکردووە. پیاو تەواوی دنیا و هەموو دنیاکان لە بیر دەباتەوە و خۆ بەو چەشنە پیاوانەی خوداوە هەڵدەواسێ، چونکە ئەو ئەڵماسێکی زۆر بەنرخە. خۆ دەزانی پیاوێکی وا هێندێ جار تەواوی ئەدگارە ئاسمانییەکان دێنێ. ئێمە بیریاریی خۆمان هەیە. ئەو سەرکەوتنەش زۆر بەنرخە! هێندێ لەوانەش بەشەڕەفم، ژیار و شارستانییەتیان لە تۆ کەمتر نییە، ئەگەرچی باوەڕ ناکەی. ئەوان دەتوانن لە چاوترووکانێکدا قووڵاییی ئیمان و بێئیمانی ببینن و بیدەنە بەر تیشکی ئەندیشە، کە هێندێ جار وا دەردەکەوێ مەودای تاڵە موویەکیان ماوە گۆربۆنۆف گوتەنی- بەسەرەوە تێکەون.

- دەی دوای ملاقات و تاقیکارییەکە لووتیان کێشای و شکستت خوارد یان لووتت داژەند و ڕۆیشتی؟

میوانەکە بە لەبزێکی حەکیمانەوە گوتی: «هاوڕێ گیان، واچاکە پیاو هێندێ جار لووتی داژەنێت و شوێنێک بەجێ بێڵی، نەکا بە یەکجاری لووتی بە بڕین چێ، هەر وەک مارکییەک ماوەیەک لەمەوبەر (حەتمەن پزیشکێکی پسپۆڕ ماریجەی کردووە) کاتێک لە لای قەشەیەک توبەیکرد و دانی بە تاوانەکانیا نا، ئەو قەشەیە - یەسووعییەک - بوو. منیش لەوێ ئامادە بووم، زۆر شتێکی سەرنجڕاکێش بوو، گوتی: «لووتم پێبدەوە،» بە مست لە سینگی خۆشی دەدا.

---

١٧- دێڕە شیعرێکی پووشکین.

١٨- گۆربۆنۆف، ئەکتەری بەناوبانگی ڕووسی.

قەشە بۆ ئەوەی تەفرەی بدا گوتی: «کورِم هەموو شتێک بە پێی یاسای پڕ لە ڕازی خودا بەڕێوە دەچێ، شتێک کە ڕواڵەتەن وەک دەرد و چارەڕەشی دەچێ، مرۆڤ ڕەنگە ئازاری پێوە بکێشێ، بەڵام قازانجێکی شاراوەی لە پشتەوەیە و ڕەنگە زۆریشی بەختەوەری پێوەبێ. ئەگەر چارەنووس تۆی لە لووت بێبەشکردووە، بە قازانجتە چونکە ئیتر هیچکەس پێتناڵێ لووتت داژەنیوە.»
مارکی هیوابڕاوانە هاواریکرد: باوکی پیرۆز، کوا ئەوە بۆ من دەبێتە سوکنایی هاتن، ئاوام دڵخۆشی دەدەیەوە؟ بریا لووتم بمایە و هەموو ڕۆژێ پێیان بگوتایەم لووتت داژەنیوە و لووتیشیان بکێشایەم گوێم لێنەبوو.» قەشە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «کورِم، نابێ چاوەڕوان بی تەواوی نیعمەتەکانی خودات بە سەر یەکەوە بە نسیب بێ. ئەو قسەیەت سکاڵایە لە دەست خودا، ئەو خودایەی کە لە هەموو کاتێکدا تۆی لە بیرە و فەرامۆشت ناکا. نابێ ناسپاس بی، سپڵە مەبە و سکاڵاش مەکە، چونکە خودا کاری بێجی ناکا. دەبێ شوکرانەبژێر بی کە ئیتر هیچ کەس گاڵتە بە لووتت ناکا و لووتت ناکێشن ئەگەر ئارەزوو بکەی لە ماوەی تەمەنتدا خاوەنی لووتێکی شۆڕ و درێژ بی، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئارەزووەکەت دێتە دی، ئەوەشت لە بیر بێ ئەو کاتەی لووتت لەدەستدا، لووتیان گرتبووی و بەدوای خویاندا ڕایان دەکێشای.»
ئیوان گوڕاندی: «پێهە قسەی قۆڕ، ئەو گەوجییەتییە!»
- هاوڕێی بەڕێز، تەنیا دەمویست سەرگەرمت کەم. بەڵام سوێندت بۆ دەخۆم ئەوە سەفسەتەیەکی یەسووعییانەیە و وشە بە وشەی هەر بەو جۆرەیە کە بۆم باسکردی و هەموو ئەوانە ڕوویداوە. هەر لەم دواییانەشدا ڕوویدا و بە جارێ تووشی چەرمەسەرێی کردم. ئەو لاوە چارەڕەشە هەر ئەو شەوە دەچێتەوە ماڵێ بە تیر لە خۆی دەدا. هەتا دوایین سات لەلای بووم. ئەو شوێنی دانپیانان و تۆبە دادانەی یەسووعییەکان بۆ من زۆر خۆشە و زۆربەی کاتی دڵتەنگیی خۆم لەوێ ڕادەبوێرم. ئەمەش ڕووداوێکی دیکە کە چەند ڕۆژ لەمەوبەر ڕوویدا. کچێکی نۆرماندی بیست ساڵانەی وردیلە و قژخورمایی - نەرمونۆڵ و خڕوخۆڵ و کاڵوکرچ لە سەر چاوی کوێرت دانایە چاکی دەکردەوە - دەچێ بۆ لای

قەشەیەک. دادەنەویتەوە لە کەلێنی دەربیجەی تۆبەخانەکەوە ورتەی دێ. قەشە دەنگی بەرز دەکاتەوە: «کچم، دیسان خۆت تووشی تاوان کرد؟ ئەی سانکتاماریا چی دەبیستم! دیسانیش لەگەڵ ئەو پیاوە نزیکیت کرد؟ ئاخر تا کەنگێ دەست لەو داوێنتەڕییە هەڵناگری؟ شەرم ناتگرێ!؟» کچەی تاوانبار فرمێسک بەچاویدا دێتەخوارێ و وەڵام دەداتەوە: Ah, mon pére, ca lui fait de plaisier, et á moi si peu de peine! بیری لێبکەوە، ئەوەیە وەڵام! خۆم کێشایە دواوە ویستم بڕۆم. هاواری سروشت بوو، دەتوانم بڵێم زۆر لە پاکی و بێتاوانی باشتر بوو. لەڕێوە لە تاوانی خۆشبووم، خەریک بوو دەڕۆیشتم بەڵام ناچار بووم بگەڕێمەوە. گوێم لێبوو قەشە بەڵێنی لێوەرگرت بۆ عەسر بچێ بۆ لای - ئەگەرچی پیرەپیاو بوو، زۆریش خۆڕاگر، بەڵام لە ساتێکدا دڵی ئاوی کرد و ئاشقی بوو، لەوانە بوو گیانی بۆی دەرچێ! بەڵام غەریزەی کچە سروشتی بوو، لە ڕاستیدا سروشت بەرگریی لە خۆی کرد! ئەوە بۆ ئاوا نێوچاوانت تێکناوە؟ دیسان ڕووم لێوەردەگێڕی؟ دیسان تووڕە بووی؟ نازانم چۆنت ڕازیبکەم...

ئیوان، داماوانە لە هەمبەر تاپۆکەی خویدا، بە دەم گریان و فرمێسک هەڵوەراندنەوە گوتی: «دەستم لە کوڵکەوە، وەک مۆتەکەیەکی پڕ ئازار سواری سەرم بووی، مێشکم تەقی، ئیتر لە دەستت وەزاڵە هاتووم. حازرم تەواوی ماڵ و سامانەکەم بدەم و لە چنگ تۆ ڕزگارم بێ!»

میوانەکە بە لەبزێکی جیددی گوتی: «دووپاتیدەکەمەوە، چاوەڕوانیت ئەوەندە زۆر نەبێ باشە. «هەموو شتە گەورە و باڵا»کانت لە من نەوێ، جا ئەو کاتە دەزانی چۆن لەگەڵ یەک پێکدێین و هەڵدەکەین. وادیارە لێم تووڕەی، لە سەر ئەوە وەک شەبەقێکی سوور، بە هەورەتریشقە و باڵی سووتاوەوە خۆم پیشان نەداوی و ئاوا سادە و ئاسایی هاتووم بۆ لات. بەر لە هەموو شتێک هەستی هونەریت ڕووشاوە، دوای ئەویش غرووررت شکاوە. بۆ دەکرێ وەها شەیتانێکی سووکوچرووک لەگەڵ مرۆڤێکی گەورەی وەک ئێوە دیدار بکا؟ ئەرێ، ئەو هەستە ڕۆمانتیکەی کە تەنانەت بلینسکی گاڵتەی پێدەکرد، لەناخی تۆدا هەیە. ئەی

---

۱۹- «ئاخ، باوکی پیرۆز زۆرترین چێژی بۆ ئەو بوو، کەمترین ئازاریش بۆ من!»

پیاوی جحێڵ، بەدەست خۆم نییە، کاتێک کە خۆم ئامادە دەکرد بێم بۆلات، بیرمکردەوە چۆن و بە چ شێوەیەک بێم، خۆم بکەم بە ژینرالێکی خانەنشین کراو بە قوبەی شێر و خۆرنیشانەوە، کە لە قەفقاز خزمەتی کردبێ، بۆ ئەوەی سەر بخەمە سەرت. بەڵام زۆر لە ئاکامی ئەو کارە ترسام، چونکە بە هۆی ئەو سەرەڕۆییەوە کە قوبەی شێر و خۆرم لە چاکەتەکەم داوە و لانیکەم دەبوو ئەستێرەی ڕۆژێ یان ئەستێرەی کاروانکوژەی لێدەم، تەمبێت دەکردم و دەتدامە بەر زەبری قامچی. لە پەستاش پێمدەڵێی گەوج و خوێری و... بەڵام قەیناکە، چش! ئەوەندەش بەرزەفڕ نیم خۆم بە هاوشانی تۆ بزانم. مفیستۆفلیس بە فاوێستی گوت ئاواتەخوازی خراپەکاریم، بەڵام بەردەوام کاری باشی دەکرد. دەی ئەو دەتوانێ هەرچی پێیخۆشە بیڵێ، لەمەڕ منەوە مەسەلەکە فەرق دەکا. ڕەنگە لە تەواوی عەرز و ئاسماناندا من تەنیا کەسێک بم کە ئاشقی هەقیقەتم و پڕ بەدڵ ئاواتەخوازی خێر و چاکەم. من لەوێ بووم کە "وشە" بە سەر خاچەوە گیانیدا و بەرەو ئاسمانان باڵی گرت، گیانی دزی تۆبەکاری برد و ڕۆیی. زەنازەنای پڕ لە شادیی فریشتەکانم گوێ لێبوو کە سروودی هووشیعانایان دەخوێند، هەروەها چریکەی بەسامی گۆرانییەکانیان کە ئاسمان و زەویی خستبووە لەرزین. سوێندم بە تەواوی پاکییەکانی عالەم، لەو کاتەدا بەئاواتەوە بووم بچمە ڕیزی ئەو سروودوێژانەوە و تێهەڵکەم لە سروودی هووشیعانا. زۆری نەمابوو وشەکە لە زەینم بترازێ و لە زمانمەوە دەرپەڕێ... دەزانی چەندە هەستێکی ناسکم هەیە و جوانیناسی چەند زوو کارم لێدەکا؟ بەڵام ئەقڵی سەلیم کە یەکێ لە ناحەزترین تایبەتمەندییەکانی منە و خووم پێگرتووە ـ هەوساری کێشام و ئەو ساتەی لە کیس دام! چونکە ـ بیرم کردەوە ـ دوای خوێندنی هووشیعانا چی دەقەومێ؟ هەموو شتێک لە سەر زەوی کتوپڕ بێدەنگدەبێ و ئیتر هیچ ڕووداوێک ناقەومێ. هەربۆیە بە هۆی ئەرک و پلە و پایەی کۆمەڵایەتیم

---

٢٠- mephidtopheles ناوی ڕمووزنێکە لە دیرۆکێکی ئەڵمانیدا.

٢١- کاتی لە خاچدانی مەسیح، دوو دزیش لەگەڵیدا لە خاچ دران کە یەکیان کە بە سەر خاچی لای ڕاستەوە بوو بەر لە گیان دان ئیمانی پێ هێنابوو.

ناچار بووم چاوپۆشی لەو دەرفەتە هەڵکەوتەیە بکەم و درێژە بەو ژیانە خویڕیگەری و هیچوپووچەی خۆم بدەم. کێ تەواوی چاکەکانی بەخۆی تایبەت داوە و تەواوی ناحەزی و خراپەکارییەکانیشی بە سەر مندا بڕیوە! بەڵام من نامەوێ بە یارمەتیی خەڵک بژیم. من نە چاوچنۆکم نە ئاشقی پلە و پایە. بۆ دەبێ لە نێو تەواوی مەخلووقاتی عالەمدا تەنیا من بکەومە بەر ڕق و توورەیی تەواوی خەڵکانی بە شەڕەف، تف و نەحلەتم کەن و تەنانەت بە شەپیش تێمهەڵدەن؟ چونکە ئەگەر خۆم بێنمە سەرشکڵ و شێوەی مرۆڤ، ناچارم ئەو سووکایەتییانەش قەبووڵبکەم. خۆ دەشزانم ئەو مەسەلەیە ڕازێکی تێدایە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک پێمنالێن، چونکە دەزانن ئەگەر لەو ڕازە بگەم، لەوانەیە دەستبکەم بە وتنی سروودی هووشیعانا. دیارە ئەو کاتە نیشانەی حاشا و سەرپێچیی من کۆتایی دێ و ئەقڵی سەلیم دەبێتە دەسەڵاتداری هەموو دنیا. ئەوەش یانی کۆتاییهاتنی هەموو شتەکان، تەنانەت ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیش دادەخرێن، چونکە ئیتر هیچ شتێک نابێ بیانخوێننەوە، و هیچ ڕووداو و کارەساتێکیش نابێ بینووسن و خەڵکی پێوە سەرقاڵکەن. دەزانم منیش لە ئاخر زەماندا ڕزگار دەبم. منیش چوار میلیارد کیلۆمەتر ڕێ دەپێوم و لە ڕازەکە ئاگادار دەبم. بەڵام هەتا کاتی ڕووداوەکە زویر و زگار دادەنیشم و ناوچاوانەکەم چیی لێنووسرابێ ئەوە دەکەم، ئەگەرچی بە پێچەوانەی ویستی دەروونیشمە - یانی، لە نێو بردنی هەزاران کەس لە بەر نەجاتدانی یەک کەس. لە بەر خاتری ئەو تاقە مرۆڤە عادڵە، دەزانی لە سەر ئەیووب ئەو سەردەمە چ دەردێکیان پێدام و سەرتەڵەیان پەڕاندم، دەبوو چەندە مرۆڤ تەفروتونابن و چەندەش ئابڕوویان بچێ؟ ئەرێ، هەتا ئەو کاتەی ڕازەکە ئاشکرا دەبێ، دوو چەشنە هەقیقەت بۆ من هەیە - یەکیان هەقیقەتی ئەوانەی لەولا، کە تاکو ئێستا لێیان ئاگادار نیم، هەقیقەتەکەی دیکەش خۆمم. ڕوونیش نییە کامەیان بە باش دەردەچێ... هاوڕێ، ئەوە خەوت لێکەوتووە؟»

ئیوان بە تووڕەیی بۆڵاندی: «ڕەنگە خەوتبێتیشم. تەواوی ئەندیشە نەفامەکانی خۆم ـ کە زۆر لەمێژە لە باو کەوتووە و فڕێدراوەتە سەتڵی زباڵەوە ـ وەک شتێکی تازە دەرخواردی خۆم دەدەیەوە!»

ـ نازانم چۆنت ڕازیکەم! ئەو خەیاڵە خاوەی من، پێموابوو دەتوانم بەشێوازی ئەدەبی سەرنجت ڕاکێشم. ئەو هووشیعانایە لە ئاسمانەکان زۆریش خراپ نەبوو، ها؟ دواتر ئەو لەبزە تەوساوییەی هاینەئاسایی، ها؟

ـ نا، قەت ئەو ئەوەندە هیچوپووچ و خوێڕی نەبوو! ئیتر نازانم چۆن ڕۆحی من، خوێڕی و سووکوچرووکێکی وەک تۆی خستۆتەوە؟

ـ هاوڕێ گیان، لاوێکی نەجیمزادە و زۆر جوانچاکی ڕووسی دەناسم، بیریارێکی گەنجە و ئاشقی سەرلەپێناوی هونەر و ئەدەبە. شیعرێکی بەرز و باشیشی بە ناوی «پشکێنەری مەزن» هۆنیوەتەوە. خەریک بووم بیرم لەو دەکردەوە!

ئیوان لە شەرمانا سوور هەڵگەڕا و گوتی: «هەقت نییە باسی "پشکێنەری مەزن" بکەی.»

ـ هەروەها "گۆڕانکاریی کتوپڕی زەویناسی." لە بیرتە؟ ئەوەش شیعر بوو، ئیستا...

ـ دەمت لێکنێ، دەنا دەتکوژم!

ـ من دەکوژی؟ نا، دەبێ بمبووری قسەدەکەم. بۆیە هاتووم لەو قسە کردنە چێژ وەرگرم. ئاخ، من ئاشقی ئەو خەونانەم کە دۆستانی لاوم بە دڵێکی گەرموگوڕەوە، تامەزرۆی ژیانن و لە تاوانا دەلەرزن! پارەکە بەهاری کە دەتویست بێی بۆ ئێرە گوتت: «مرۆڤگەلێکی نوێ هەن کە دەیانهەوێ هەموو شتێک لە نێو بەرن. دەست لە مرۆڤخۆری هەڵگرن. ئەو گەوجانە، بیروڕای منیان هەر نەپرسی! من بڕوام وایە پێویست نییە هیچ شتێک لە نێو بچێ، ئەوەی پێویستمانە ئەوەیە کە بیرۆکەی خودا لەناخی مرۆڤدا لە نێو بەرین، شێوازی دەستبەکاربوونیشمان دەبێ بەم شێوەیە بێ. دەبێ بەوە دەست پێبکەین. ئەی

---

٢٢- هانریش هاینە، شاعیر و وتارنووسی ئاڵمانی (١٨٥٦ـ ١٧٩٧) کە بە هۆی تەنزەوە بەناوبانگە.

ڕەگەزی دڵکوێری مرۆڤ کە فام و شعوورتان نییە! بێتوو مرۆڤ هەموو حاشا لە خودا بکەن و ئیمانیان پێی نەبێ ـ پێموایە ئەو دەورەیە، ڕاست وەک دەورەی زەویناسی، وەڕاست دەگەڕێ ـ مانا کۆنەکەی جیهانی بێمرۆڤخۆری لە نێو دەچێ، هەروەها ئەخلاقی کۆنیش نامێنێ، ئەو کاتە ئیتر هەموو شتێک بە شێوەیەکی نوێ دەستپێدەکا. مرۆڤەکان یەکگرتوو دەبن و تەواوی ئەوشتانەی کە دەبێ لە ژیانی وەرگرن، وەری دەگرن، بەڵام بۆ چێژ و بەختەوەری لە دنیای نوێدا ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان دەدەن. مرۆڤ بە مەنەرێکی ئاسمانی ڕۆحی خۆی هەتا ڕێزی خودا بەرز دەکاتەوە. مرۆڤی خاوەن ئیرادە و لێبڕاو بە سەر سرووشتدا زاڵدەبێ و چێژێکی وا لەو سەرکەوتنە وەردەگرێ، کە ئەو چێژە وردە وردە جێی هیواداریيەکانی پێشووی دەگرێتەوە، کە هیوایەکی زۆری بەو چێژە زەوینییە بووە. ئەو کاتە هەموو کەس تێدەگەن کە ژیانیان تاهەتایی نییە و هیچ شتێک جارێکیتر ناخوڵقێتەوە و زۆر ئارام و خاکەڕایانە وەک خودایەک، مەرگ قەبووڵدەکەن. لووتبەرزی تێی دەگەیێنێ کە بە دژی کەموکووڕییەکانی ژیانی شکایەت بکا و بێئەوەی چاوەڕوانی پاداش بێ هاوڕەگەزەکانی خۆی خۆش بوێ. خۆشەویستیش لە ژیاندا بۆ ساتێک لێی سەروزیادە. بەڵام تێگەیشتن لە زوو تێپەڕینی ئەو خۆشەویستییە ئاگری دەروونی بڵێسەدارتر دەکا، ئاگرێک کە ئێستا لە نێو خەونەکانی ئەشقی هەتاهەتایی ئەوپەڕی گۆڕەکاندا پرژ و بڵاو بۆتەوە»... بەم شێوەیە بەردەوام لەو دەلیل و بەڵگانە دێننەوە، بە ڕاستی شتێکی سەرنجڕاکێشە!

ئیوان چاوی لە بەردەمی بڕیبوو هەردوو دەستی توند بە گوێچکەیەوە گرتبوو، دانیشتبوو، بەڵان ئازای ئەندامی وەک شەقشەقە دەلەرزی. دەنگەکە درێژەی بە قسەکانی دا:

ـ بیریاری لاو بیری کردەوە: ئێستا باس لە سەر ئەوەیە بڵێی ئەو دەورەیە بەسەردا بێ؟ ئەگەر بێ، هەموو شتێک دەچەسپێ و مرۆڤایەتی هەتاهەتایە مسۆگەر دەبێ. بەڵام بە هۆی گەوجییەتیی لەبڕاننەهاتووی مرۆڤ، دەزانین کە ئەودەورەیە هەتا هەزارساڵی دیکە نایە، کەسێک کە لە هەقیقەت دەگا، تەنانەت

ئێستاش دەتوانێ بەپێی یاسا ژیانی خۆی هەرچۆنێکی پێخۆشە لە سەر بنەمای نوێ دامەزرێنێ. بەو واتایە "هەموو شتێک بۆ ئەو ئازادە." سەرەڕای ئەوەش، تەنانەت ئەگەر ئەم دەورەیەش وەڕاست نەگەڕێ، چونکە بەهەرحاڵ خودا و بەقا لەگۆڕێدا نییە و مرۆڤی نوێ دەتوانێ ببێتە "مرۆڤ ـ خودا". تەنانەت ئەگەر لەسەرتاسەری دنیادا تاقە یەک مرۆڤ بێ و بە وەدەستهێنانی پلەوپایەی نوێ، دەتوانێ بەپێی پێویست سنووری ئەخلاقی کۆنی کۆیلە ـ مرۆڤ ببەزێنێ. یاسایەک بۆ خودا هەیە. لە هەر جێگایەک ڕاوەستێ ئەوجێگایە پیرۆزە، شوێنێک کە من لێی ڕادەوەستم، مەعلوومە لای سەروو دەبێ... «هەموو شتێک ئازادە»، هەر ئەوە و بڕایەوە! ئەمەش زۆر فریودەرە؛ بەڵام ئەگەر دەتەوێ لە دەرگای فێڵەوە وەژوور کەوی، بۆچی بۆ ئەو فریودانە تەقدیسی ئەخلاقیت دەوێ؟ ئەوە خووخدەی ڕووسیای نوێی ئێمەیە. بەبێ تەقدیسی ئەخلاقی ناتوانێ فێڵ و تەڵەکە وەکار بخا. چونکە ئەو شەیدا و لایەنگری هەقیقەتە...

میوانەکە، دیار بوو بە هۆی زمان پاراوییەوە گەرم داهاتووە، توند و خێرا قسەیدەکرد و بە چاوێکی تەوساوی لە خانەخوێکەی دەڕوانی. بەڵام نەیتوانی قسەکەی تەواو بکا. ئیوان لە ناکاو پەرداخێکی لە سەر مێزەکە هەڵگرت و تێیهەڵکرد.

کابرای میوان لە سەر قەنەفەکە دەرپەڕی و پڵتە و دڵۆپی چاییەکەی لە خۆی تەکاند و گوڕاندی: «Ah, mais c'est bést ehfin ئەو جەوهەردانەکەی لوتێری وەبیر هاتەوە[٢٤]! پێیوایە من خەونم، پەرداخە چایی لە خەون هەڵدەکا! ئەوە کارێکی ژنانەیە! پێموابوو لەخۆڕا دەستت بە گوێچکەتەوە گرتووە.»

لە ناکاو کەسێک بە توندی لە پەنجێرەکەی دا. ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە پڕ هەستا سەرپێ.

میوانەکە گوتی: «گوێت لێیە؟ واچاکە دەرگاکە بکەیەوە. ئالیووشای براتە. دڵنیام هەواڵێکی زۆر سەرنجڕاکێش و سەرسووڕهێنەری پێیە!»

---

[٢٣]- «ئەمە ئیتر شتێکی بێتامە.»

[٢٤]- لوتێر جەوهەردانەکەی لە شەیتان هەڵکرد کە هاتبوو وەسوەسەی بکا.

ئیوان بە تووڕەیی گوتی: «بێدەنگ بە، تەڵەکەباز، دەمزانی ئالیووشایە، هەستمکردبوو دێ، دیاریشە بێهۆ نەهاتووە، دیارە «هەواڵێکی پێیە.»
ـ زووکە درگاکەی لێبکەوە. دەرەوە سەرما و تۆف و بەندە، براتە دەرگاکەی لێبکەوە، سەرمای دەبێ.

Monsieur sait - il le temps quil falt? Cést á pas metter un chien dehors.[٢٥]

هەروا لە پەنجێرەکەی دەدا، ئیوان دەیویست هەڵێ بۆ بەرپەنجێرەکە، بەڵام دەتگوت دەست و لاقی لە کۆت و سندم دایە. بەهێز و قەوەتی خۆی دەیویست ئەو زنجیرە بپچڕێنێ، بەڵام مخابن. توندتر و توندتر لە پەنجێرەکەیان دا. ئاخری زەنجیرەکە پچڕا و ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە سەر قەنەفەکە هەستا. شێتانە چاوی لە دەوروبەری خۆی کرد. هەردوو مۆمەکە بە تەواوی سووتابوون. ئەو پەرداخەی لە میوانەکەی هەڵکردبوو، هەروا لە سەر مێزەکە داندرابوو. قەنەفەکەی ڕووبەڕووش هیچکەسی لە سەر نەبوو. هەروا لە پەنجەرەکەیان دەدا. بەڵام بەو توندییەش نەبوو کە لە خەونەکەیدا لێیاندەدا، بەپێچەوانە زۆریش لەسەرەخۆ بوو.
ئیوان فیۆدۆرۆویچ گوڕاندی: «خەون نەبوو! نا، سوێند دەخۆم خەون نەبوو، هەمووی هەر ئێستا ڕوویدا!» هەڵات بۆ بەرپەنجێرەکە و دەربیجەکەی کردەوە.
بە دەنگێکی گڕ نەڕاندی بە سەر براکەیدا: «ئالیووشا، پێمگوتی مەیە. چیت دەوێ؟ بە دوو وشە پێمبڵێ، گوێت لێیە؟ دوو وشە.»
ئالیووشا لە حەوشەوە وەڵامی دایەوە: «سەعاتێک لەمەوبەر ئیسمیر دیاکۆف خۆی هەڵواسی.»
ئیوان گوتی: «وەرە بۆ لای قاڵدەرمەکە، ئێستا دەرگاکەت بۆ دەکەمەوە.» ڕۆیشت و دەرگاکەی لە ئالیووشا کردەوە.

---

٢٥- حەزرەتی ئاغا دەزانی چ سەرمایەکە؟ لەو هەوایەدا سەگ لە دەرەرە ڕاناگرن.

## (١٠)

## «ئەوە قسەی ئەو بوو»

ئالیووشا لەگەڵ هاتە ژووریَ بە ئیوانی گوت کە نزیکەی سەعاتێک لەمەوبەر ماریا کیندراتیفنا بە هەڵاتن خۆی کردووە بە ژوورەکەیدا و هەواڵی پێداوە کە ئیسمیر دیاکۆف خۆی کوشتووە. «چوومە ژوورەکە سەماوەرەکە بێنم، دیتم گوڵمێخێک لە دیوارەکە دراوە و خۆی پێدا هەڵواسیوە.» لە وەڵامی ئالیووشادا کە پرسیبووی پۆلیست ئاگادار کردووە، ماریا کیندراتیفنا گوتی بە هیچکەسی ڕانەگەیاندووە. «بەڵام ڕاست هاتم بۆ لای ئێوە، هەر بە هەڵاتن هاتم.» ئالیووشا باسیکرد کە چۆن وەک شێت و هاری لێهاتووە و لەرزیوە. کاتێک ئالیووشا بە هەڵاتن لەگەڵی چوو بۆ ژوورەکەی، دیتی ئیسمیر دیاکۆف هەروا هەڵواسراوە. یادداشتێک لە سەر مێزەکە بوو: «بە ویست و ئیختیاری خۆم کۆتاییم بە ژیانم هێنا و خەتای هیچ کەس نییە.» ئالیووشا یادداشتەکەی لە سەر مێزەکە دانایەوە و بە پەلە چوو بۆ لای سەرۆکی شارەوانی و ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە. ئالیووشا کە بە وردی چاوی لە ئیوان دەکرد، لە کۆتاییدا گوتی: «لەلای ئەویشەوە ڕاست هاتم بۆ لای تۆ.» هەروا کە ڕووداوەکەی دەگێڕایەوە چاوی لە ئیوان نەدەترووکاند. دەتگوت شتێک بە ئەدگار و قەڵافەتییەوەیە و سەرنجی ڕاکێشاوە.

لە ناکاو دەنگی هەڵێنا: «کاکە، وا دیارە زۆر نەخۆشی. چاوم لێدەکەی و وا دیارە تێناگەی دەڵێم چی.»

ئیوان دەتگوت بیر دەکاتەوە و گوێی لە دەنگی سەرسووڕهێنەری ئالیووشا نەبووە. گوتی: «چاک بوو هاتی. دەمزانی خۆی هەڵواسیوە.»
- کێ پێیگوتی؟
- نازانم، بەڵام دەمزانی. ئەرێ دەمزانی؟ ئەرێ. ئەو پێیگوتم. هەر ئێستا گوتی. ئیوان لە نێوەڕاستی وەتاغەکەدا ڕاوەستابوو. هەروا بەو لەبزە خەماوییەوە قسەیدەکرد و چاوی لە عەرزەکە بڕیبوو.
ئالیووشا کە بێئیختیار چاوی لە دەوروبەری خۆی دەکرد. پرسیی: «ئەوە کێیە؟»
ئیوان سەری هەڵێنا و بە نەرمی زەردەیەکی گرت.
- لێت دەترسا، لە کۆترێکی وەک تۆ. تۆ "فریشتەیەکی پاکی" دیمیتری بە فریشە بانگت دەکا. فریشتە!... زایەڵەی سروودی پڕشکۆی ئاسمانیان ، ئاسمانیان چین؟ ڕەنگە کۆئەستێرە. بەڵام ڕەنگە ئەو کۆئەستێرەیە تەنیا کۆمەڵێ گەردیلەی کیمیایی بێ. دەزانی کۆئەستێرەی شێر و خۆریش هەیە؟
ئالیووشا بە ترسەوە گوتی: کاکە، دانیشە. بۆخاتری خودا لە سەر قەنەفەکە دانیشە، زۆر شێواوی؛ دەی پاڵبدەوە دەی، ڕاکشێ، سەرت بنێ سەر باڵنجەکە، خاولییەکی تەڕ بێنم بینێمە سەر نێوچاوانت؟ ڕەنگە تۆزێ تاویاوەکەت دامرکێنێ.
- خاولییەکە بدە بە خۆم؛ لە سەر ئەو کورسییەیە. سەعاتێ لەمەوبەر لەوێم دانا.
ئالیووشا گوتی: «لێرە نییە، ناڕەحەت مەبە، دەزانم لە کوێیە - ئەوەتا،» خاولییەکە خاوێن و جوان و قەدکراو لە سەر مێزئاڕایشتەکەی ئیوان، لەسووچی ژوورەکە بوو. ئیوان بە سەرسووڕمانەوە چاوی لە خاولییەکە کرد، دەتگوت خەریکە هێندێ شتی وەبیر دێتەوە.
«سەبرکە» - ئیوان لە سەر قەنەفەکە هەستا - «سەعاتێک لەمەوبەر ئەو خاولییە تازەیەم تەڕ کرد و لە سەرم پێچا، پاشان فڕێمدا هۆوێ... کەوایە بۆ وشکە، خۆمن هەر ئەو خاولییەم هەیە.»

ئالیووشا پرسیی: «ئەو خاولییە لە سەرت پێچا؟»

ـ ئەریٚ، سەعاتێک لەمەوبەر بە نێو ژوورەکەدا پیاسەمدەکرد... ئەو مۆمانە بۆ ئاوا تەواو بوون؟ سەعات چەندەیە؟

ـ نزیک دوازدەیە.

ئیوان لە ناکاو نەڕاندی: «نا، نا، نا! خەونم نەدیوە؛ ئەو لێرە بوو. هەر ئالێرە لە سەر ئەو قەنەفەیە دانیشتبوو. کە لە پەنجێرەکەت دا، پەرداخەچاییەکەم تێهەڵکرد... هەر ئەم پەرداخە. تۆزیٚ سەبرکە، پێشتریش خەونم دیوە، بەڵام ئەمە خەون نەبوو. زۆر جار وابووە خەونم دیوە. ئێستا خەون دەبینم ئالیووشا... ئەگەرچی خەون نین، ڕاستین، بەڕێدا دەڕۆم، دەگەڕێم، قسە دەکەم، دەبینم... ئەگەرچی خەوتووشم. بەڵام ئەو ئالێرە لە سەر ئەو قەنەفەیە دانیشتبوو... زۆر زۆر گەوجە ئالیووشا، گەوجی وا هەر نییە.» ئیوان دای لە قاقای پێکەنین و هەستا لە نێو ژوورەکەدا دەستیکرد بە پیاسە.

ئالیووشا دیسان بە نیگەرانییەوە پرسیی: «کیٚ گەوجە؟ کاکە، باسی کیٚ دەکەی؟ کیٚ گەوجە؟»

ـ باسی شەیتان! دیٚ بۆ دیدەنیم. دووجار، سیٚجار هاتووە بۆ لام. گاڵتەی پیٚکردم کاتێک تووڕە بووم و گوتم شەیتانێکی سادەیە و ئیبلیس نییە، ئیبلیس بە باڵی سووتاوەوە، لە نێو برووسکە و هەورەتریشقەدایە. بەڵام ئەو ئیبلیس نییە. ئەوە درۆیە. شەیتانێکی فێڵبازە ـ شەیتانێکی پنجڵ و هیچوپووچ. دەچیٚ بۆ گەرماوەکان. جلەکانی لە بەر داکەنی، کلکی وەدیار دەکەوێ، کلکێکی نەرم و درێژی هەیە، وەک کلکی سەگی ئاڵمانی وایە، مەترێک درێژە و ڕەنگی خەنەییە. ئالیووشا، سەرماتە؟ بەو بەفر و سەرمایە هاتووی. چایی دەخۆیەوە؟ چی؟ سارد بۆتەوە؟ بلێم چایت بۆ بێنن؟ Cést á pas metter un chien dehors.[٦]

---

٢٦- لەو هەوایەدا سەگ لە دەرەرە ڕاناگرن.

ئالیووشا هەڵات بۆ لای دەستشۆرییەکە، خاولییەکەی خووساند، ئیوانی دانیشاند و خاولییە تەڕەکەی لە سەری پێچا و خۆشی لە پاڵیدا دانیشت.

ئیوان دەستیکردەوە بە قسە کردن (خەریکبوو چەقاوەسوو دەبوو): «هەر ئێستا سەبارەت بە لیزا چیت پێگوتم؟ لیزام خۆش دەوێ. قسەی ناحەزم پێگوتووە. درۆ بوو. خۆشم دەوێ... سبەینێ لە کاتیا دەترسم. لە هەموو شتێک زیاتری لێدەترسم. لە بەر خاتری داهاتوو. سبەینێ دەمخاتە ژێر پێ و جیقوفیقم دەردێنێ. پێیوایە لە بەر ئێرەیی میتیام تووشی ئەو چارەڕەشییە کردووە! ئەرێ، حەتمەن وا بیردەکاتەوە! بەڵام وا نییە. سبەینێ خاچ بە دەستەوە دەگرم، هەڵبەت نەک بۆ ئەوەی خۆم لە دار دەم. ئەوەش بزانە ئالیووشا، قەت لە دەستم نایە خۆم بکوژم، بڵێی هۆی ئەوەبێ خوێڕیم؟ ترسەنۆک نیم. هی ئەوەیە ئاشقی ژیانم؟ من چوورزانم ئیسمیر دیاکۆف خۆی دەخنکێنێ؟ ئەرێ، ئەوە قسەی ئەو بوو.»

ئالیووشا پرسیی: «کەوایە دڵنیای کەسێک لێرەبووە؟»

«ئاخ، لە سەر ئەو قەنەفەیەی سووچەکە دانیشتبوو. ئەگەر تۆ لێرە بوایەی وەدەرت دەنا. وەدەریشت نا: هەرکە هاتی غەیب بوو. ئالیووشا من زۆرم دەموچاوت خۆشدەوێ. دەتزانی دەموچاوتم خۆشدەوێ؟ ئەو هەر خۆمە ئالیووشا. یانی سووکی و چرووکی و خوێڕییەتییەکانی ناخی منە. ئەرێ، من ڕۆمانتیکم. ئەو هەستی بەوە کرد... ئەگەرچی تۆمەتێکە و بەس. ئەو زۆر گەوجە، بەڵام تەواوی هێز و توانایی لەوەدایە. زۆر فێڵزانە، دەڵێی ڕێوییە دەیزانی چۆن ڕقم هەڵدەستێنێ. لە پەستا گاڵتەی پێدەکردم چونکە ئیمانم پێ‌هێنابوو، بەوشێوەیە هانیدام گوێی لێبگرم، لە ڕاستیدا لە داوی خستم سەرەڕای ئەوەش، زۆر شتی سەبارەت بە من گوت کە هەموویان ڕاست بوون و هیچ کات خۆم دانمپێدا نەدەنا.» پاشان بە لەبزێکی سادقانە و خۆمانە گوتی: «دەزانی ئالیووشا زۆر دڵشادم کە بیر دەکەمەوە ئەو بوو نەک من.»

ئالیووشــا، دڵــسۆزانه چــاوی لــه براکــەی کــرد و گــوتی: «شــەکــەت و ماندووی کردووی.»

- زۆری سەر خستە سەرم. زۆر زیرەک و فێڵزانیشە. "ویژدان! ویژدان چییه؟: خۆم له خۆمی گەورە دەکەمەوە. بۆ ویژدان ئازارم دەدا. بۆتە خدە. خدەیەکی گشتی که حەوتهەزار ساڵە بەرۆکی مرۆڤایەتیی گرتووە. کەوایە وەرە با دەستی لێهەڵگرین و ببینە خودا" ئەمە قسەی ئەو، ئەمە قسەی ئەو بوو!

ئالیووشا که ئیتر خۆی پێڕانەدەگیرا، چاوی له براکەی بڕی و دەنگی هەڵێنا: «تۆش نەبووی، تۆ نەبووی؟ هەر شتێکە گوێی مەدەیە. وەلای نێ و له بیری بەرەوە. لێیگەڕێ با تەواوی ئەو شتانەی ئێستا لێی بێزاری لەگەڵ خۆی ببیات و ئیتر نەگەڕێتەوە.»

ئیوان که له داخانا دەلەرزی، گوتی: «ئەرێ، ئەو زۆر ناجسن و بەدگووزە. پێمپێکەنی. زۆر ڕووهەڵماڵدراو بوو، ئالیووشا. زۆری سووکایەتی پێکردم. سەبارەت بە زۆرشت سووکایەتیی پێکردم. چاوی له چاوم دەبڕی و درۆی به دەممەوە دەکرد: "ئاخ، دیسان دەتەوێ خۆت بە چاکە بنوێنی: دانی پێدابنێی که باوکتت کوشتووە، ئەو خوێڕییەش تۆ هانت داوه ئەو قەتڵە بکا".»

ئالیووشا قسەکەی پێبڕی: «براکەم، دان بەخۆتا بگرە. تۆ ئەو کارەت نەکردووە، تۆ پیاوکوژ نییت. ئەم قسە ڕاست نییە!»

- ئەمە قسەی ئەوبوو، خۆشی باش دەزانێ. "دەتهەوێ تۆ کارێکی باش و مەزن ئەنجامبدەی، چونکە ئیمانت بە چاکە هەیە، هەر ئەوەش بۆتە هۆی بێزاری و تووڕەییت. بۆیەش ڕقت هەستاوە و دەتهەوێ تۆڵە بکەیتەوە." سەبارەت بە من ئەوەی گوت و دەشزانێ دەڵێ چی.

ئالیووشا بە لەبزێکی خەماوییەوە گوتی: «ئەوە تۆی شتی وا دەڵێی، نەک ئەو، بۆیەش ئەوە دەڵێی چونکە نەخۆشی و وڕێنە دەکەی و خۆت ئازار دەدەی.»

ـ نا، ئەو دەزانێ دەڵێ چی. دەڵێ: "لەبەر دەمارزلی دەچی. لە جێی خۆت هەڵدەستی و دەڵێی من بووم ئەوم کوشت، ئەی بۆ لە ترسانا خۆت هەڵدەگوشی؟ درۆ دەکەی! بێزم لە بیروڕات هەڵدەستێ!" سەبارەت بە من ئەوەی دەگوت. "خۆ دەشزانی دڵت بۆ مەتح کردنی ئەوان دەکورکێنێ ـ ئەو تاوانبارە، قاتڵ ئەوە، بەڵام چەندەش دەستودڵبازە؛ دەیویست براکەی نەجات بدا و ڕاستیی گوت." (ئیوان چاوی گڕی لێبۆوە و، لە ناکاو گوڕاندی) ئەوە درۆیە، ئالیووشا! من نامەوێ تاقمێک مرۆڤی هیچوپووچ تاریفم بکەن، وەڵڵا پێمخۆش نییە! ئەمە درۆیە، درۆ! هەربۆیە پەرداخە چاییەکەم تێهەڵکرد و دام بە سەروچاوە دزێوەکەیدا.

ئالیووشا دەستیکرد بە پاڕانەوە: «کاکە گیان، لەسەرەخۆ بە، بەسی کە!»

ئیوان بێئەوەی گوێ بە قسەی ئالیووشا بدا، دیسان گوتی: «ئەو دەزانێ چۆن پیاو ئازار بدا. زۆر مزیڕ و دڵڕەقە. هەر لە هەوەڵەوە دەمزانی بۆچی هاتووە. "بە قەبووڵکردنی ئەو مەسەلەیە کە بە هۆی دەمارزلییەوە دەچی، هێشتا بە هیوا بووی ئیسمیر دیاکۆف مەحکووم بێ و بڕەتێندرێ بۆ سیبیریا، میتیاش فحێل بێ و تەنیا تۆ بە مەحکووم بوونی ئەخلاقی سزای دەروونی بدرێی." (گوێت لێیە؟ ئەو کاتە پێکەنی) ـ "تاقمێکیش تاریفت دەکەن." بەڵام ئیسمیر دیاکۆف مردووە، خۆی هەڵواسیوە، "ئیتر کێ باوەڕ بە قسەکانت دەکا؟ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەچی، دەچی، لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەچی، بڕیارت داوە بچی. ئێستا بۆ دەچی؟" زۆر ترسناکە، ئالیووشا. تاقەتی ئەو پرسیارانەم نییە. کێ دەوێرێ ئەو جۆرە پرسیارانە لە من بکا؟»

ئالیووشا قسەکەی پێبڕی: «براکەم.» لە ترسانا دڵی داکەوت، بەڵام وێدەچوو هێشتا هیوابڕاو نەبووبێ. دەیویست هەرچۆنێکە ئیوان پاشگەز کاتەوە. «بەرلەوەی بێم بۆ ئێرە، لە کوێوە هەواڵی مەرگی ئیسمیر دیاکۆفت پێگەیشت؟ خۆ هیچکەس لەوە ئاگادار نەبوو، کات و دەرفەتی ئەوەش نەبوو کەسێک لەو ڕووداوە ئاگادار بێ.»

ئیوان بێئەوەی ڕێزەیەک دڕدۆنگ بێ لێبڕاوانە گوتی: «ئەو پێیگوتم. ڕاستت دەوێ لە پەستا سەبارەت بەوە قسەی دەکرد. گوتی: "ئەگەر ئیمانت بە مەزنایەتی هەبوایە زۆرباش دەبوو. باوەڕ بە قسەکانیشت نەکەن قەیناکا. تۆ لە بەر یاسای ئەخلاقی دەچی، بەڵام تۆش کوودەڵەیەکی وەک فیۆدۆرپاولۆویچ، ئیتر کارت بە مەزنایەتی و یاسای ئەخلاقی چییە؟ ئەگەر فیداکارییەکەت بەقازانجی کەس نییە، بۆ لەخۆڕا دەچی و خۆتی تێهەڵدەقورتێنی؟ چونکە خۆشت نازانی بۆ دەچی! ئەگەر گیانیشت لەو ڕێیە دانابێ هەر دەچی! بڕیاری خۆت داوە؟ بڕیارت نەداوە. شەوێ هەتا بەیانی بیری لێدەکەیتەوە کە بچی یان نەچی. بەڵام دەچی، دەشزانی هەر دەچی. دەزانی هەرچەشنە بڕیارێک بدەی، بەدەست خۆت نییە. دەچی چونکە ناوێری نەچی! بۆ ناوێری؟ ئەوە دەبێ خۆت بیزانی. فەرموو ئەوەش مەتەڵۆکەیەک!" پاشان هەستا و ڕۆیشت. کە تۆ هاتی ئەو ڕۆیشت. منی بە ترسەنۆک زانی، ئالیووشا! Le mot de l'enigme {وەڵامی مەتەڵۆکەکە} ئەوەیە کە من ترسەنۆکم. «لەو هەڵۆیانە ناوەشێتەوە بە سەر زەویدا باڵ لێدەن» ئەوەش هەر قسەی ئەوبوو ـ ئەو! ئیسمیر دیاکۆفیش ئەمەی گوت. ئەو دەبێ بکوژرێ! کاتیا ڕقی لێمە. سەرتاسەری مانگی پێشوو ئەوەی بۆ دەرکەوتبوو. تەنانەت لیزاش دەیهەوێ بمبوغزێنێ! "تۆ دەچی بۆ ئەوەی تاریفت بکەن» ئەوە درۆیەکی زاڵمانەیە! تۆش ڕقت لێمە ئالیووشا. ئێستاکە دەمهەوێ دیسان ڕقم لە تۆ بێ، ڕقم لەو ڕەموزنەشە! زۆرم ڕق لەو ڕەموزنەشە! نامەوێ ئەو ڕەموزنە ڕزگار بکەم. لێیگەڕێ با لە سیبیریا بڕزێ! دەستیکردووە بە سروود خوێندن! ئاخ سبەینێ دەچم، لەهەمبەریاندا ڕادەوەستم و تف لەڕوویان دەکەم!»

ئیوان شێتانە هەستا سەرپێ. خاولییەکەی فڕێدا و دیسان دەستیکرد بە پیاسەکردن بەنێو ژوورەکەدا. ئالیووشا قسەکەی چەن سات لەمەوبەری ئیوانی وەبیر هاتەوە. «دەڵێی لە خەو و بەخەبەریدام... بەدەم خەوەوە دەڕۆم، قسە دەکەم، دەبینم، بەڵام خەوتووم.» ئێستاش ڕاست ئەو جۆرە

بوو. ئالیووشا بەجێی نەهێشت. وای بەزەیندا هات بە هەڵاتن بچێ بۆ لای دوکتۆر، بەڵام دەترسا براکەی بە تەنیا بەجێ بێڵێ: هیچکەس نەبوو بەلایەوە بەجێ بێڵێ. ئاخری ئیوان وردەوردە بێهۆش بوو. هەروا قسەی دەکرد، دەمی شل نەدەبوو، خۆشی نەیدەزانی دەڵێ چی، تەنانەت وشەکانیشی بە دژواری دەردەبڕی، لە ناکاو لەتری‌دا و خەریکبوو بەسەرەوە بکەوێ بە عەرزدا؛ بەڵام ئالیووشا گرتییەوە و نەیهێشت بکەوێ. چووە بن پیلی و بردییە سەر پێخەفەکەی. ئالیووشا هەر چۆنێک بوو جلەکانی لە بەر داکەند و خەواندی. دووسەعات لەپشت سەری دانیشت. خێرا خەوی لێکەوت و جووڵەی لێبڕا، ئارام و ڕێکوپێک هەناسەی دەکێشا. ئالیووشا باڵنجێکی هێنا و بێئەوەی جلەکانی داکەنێ، لە سەر قەنەفەکە ڕاکشا. بەدەم خەوەوە دوعای بۆ میتیا و ئیوان دەکرد. خەریکبوو نەخۆشییەکەی ئیوانی بۆ دەردەکەوت. «دڵەخورپەی لەخۆباییانە. ویژدانێکی قووڵ!» خودا کە ئیوان ئیمانی پێی نەبوو. هەقیقەتەکەشی لە دڵیدا، ڕیشەی داکوتابوو، بەڵام دڵە منجڕەکەی بە هیچ شێوەیەک تەسلیم نەدەبوو. ئالیووشا سەری لە سەر باڵنجەکە دانا و بە گۆمی بیر و خەیاڵدا ڕۆچوو: «ئەرێ، ئەرێ ئێستا ئیسمیر دیاکۆف مردووە و هیچ کەس باوەڕ بە شایەدییەکەی ئیوان ناکا؛ بەڵام ئەو دەچێ و شایەدی دەدا.» ئالیووشا بە نەرمی بزەی هاتێ. بیریکردەوە: «سەرکەوتن بۆ خودایە! یان ئەو لە نووری هەقیقەتەوە هەڵدێ. یان...» ئالیووشا بە تووڕەیی گوتی: «لە قین و ڕقدا دەڕزێ و لە بەر خزمەتکردن بە ئامانجێک کە ئیمانی پێیەتی، تۆڵە لە خۆی و لە خەڵکانی‌تر دەکاتەوە،» دیسانیش دوعای بۆ ئیوانی برای کرد.

(١)

# ڕۆژی ڕووداوەکە

سەعات دەی سەرلەبەیانیی ڕۆژی دوای ئەو ڕووداوانەی کە باسمکرد، دادگایی کردنی دیمتیری فیۆدۆرۆویچ لە دادگای شارەکەمان دەستپێیکرد.

لەڕێوە لە سەر ئەو ڕاستییە پێداگریم کرد، کە خۆم بەشیاوی ئەوە نازانم کە ڕووداوەکانی دادگا لە هەوەڵەوە تا ئاخر مووبەموو، یان تەنانەت بە پێی ڕەوتی ڕووداوەکان، بنووسم. چونکە پێموایە باسکردنی هەموو شتێک و ڕوونکردنەوەی بە دروست و حیسابی خۆی کتێبێک دەبێ، ئەویش کتێبێکی زۆر قەبە. بۆیە هیوادارم بە هۆی خۆپاراستن لە کێشە ئاساییەکان سەرکۆنەم نەکەن، چونکە تەنیا ئەوشتانەم هێناوەتە سەر کاغەز کە سەرنجی ڕاکێشاوم. دەکرا وەک بابەتێکی زۆر سەرنجڕاکێش ئاوڕ لە شتە ورد و بەرچاو و بنەڕەتییەکان بدەمەوە. بۆیە بە پێویستی نازانم بەو هۆیەوە، داوای لێبوردن لە خوێنەرانم بکەم. ئەوپەڕی هەوڵی خۆم دەدەم و خوێنەریش بۆی دەردەکەوێ کە ئەوەی لە دەستم هاتووە درێغیم نەکردووە.

سەرەتا، بەر لەوەی بچینە نێو دادگا، شتێکتان وەبیر بێنمەوە کە ئەو ڕۆژە زۆری تووشی سەرسوڕمانکردم. ڕاستییەکەی هەر وەک دواتر دەرکەوت هەمووانی سەرسامکرد. هەموو دەمانزانی کە ئەو دادگاییە سەرنجی زۆر کەسانی ڕاکێشاوە و بۆ دەستپێکردنی ئارا و قارایان لێهەڵگیراوە؛ چونکە ئەو ماجەرایە لە ماوەی دوو مانگی ڕابردوودا ببووە بنێشتە خۆشەی سەرزاران

و زۆرکەسی تووشی گومان و سەرسووڕمان کردبوو. هەموو کەس دەیزانی کە هەواڵی ئەو پەروەندەیە لە سەرتاسەری ڕووسیا دەنگی داوەتەوە. بەڵام پێمان وانەبوو جگە لەخۆمان سەرنجی خەڵکانی دیکەی وڵاتەکەمان ڕاکێشێ، ئەویش ئاوا تامەزرۆیانە. ئەوەش هەر ڕۆژی یەکەمی دادگاییەکە دەرکەوت. خەڵک نەک هەر لە ناوەندی پارێزگا و شارەکانی دەوروبەرەوە، بەڵکو لە تەواوی شار و پاریزگاکانی ڕووسیا و هەروەها مۆسکۆ و پترزبۆرگەوە هاتبوون. لەنێویاندا پارێزەر و سەرەژن و تەنانەت چەند کەسایەتیی بەناوبانگیش وەبەرچاو دەکەوت. وایلێهات بلیتی ژوورەوە بە هیچ شێوەیەک وەدەست نەدەکەوت. شوێنێکی تایبەتیان لە پشت مێزێک بۆ سێ قازی تەرخانکردبوو. هەر لەپشت ئەوانیشەوە ڕیزێکیان کورسی دانابوو بۆ ئەو پیاوماقووڵ و کەسایەتییە گرینگانەی لە سەرانسەری ڕووسیاوە هاتبوون. دانانی ئەو ڕیزە کورسییەش لەو شوێنە شتێکی ناوازە بوو، تا ئێستاش لە هیچ دادگاییەکدا ئەو کارە نەکرابوو. نیوەی ڕاستی خەڵکەکەش لە ژنان پێکهاتبوو، کە زۆربەیان دانیشتووی ناوچەکە بوون. ژمارەی پارێزەرانیش کە لە هەموولایەکەوە هاتبوون، هێندە زۆربوو، نەیاندەزانی لە کوێ دایانبنیشێنن، چونکە تەواوی بلیتەکان پێشتر درابوون و شوێنی دانیشتن نەمابوو. لەولای هۆڵەکەوە سەکۆیەکی لێبوو، بە پەلە ئەو شوێنانەیان بۆ پارێزەرەکان تەرخانکرد، ئەوانیش زۆر شاد و ڕازی بوون کە لانیکەم جیگای ڕاوەستانیشیان هەیە. چونکە لە بەر زۆر بوونی خەڵکەکە کورسییەکانیان ڕاگوێستبوو، ئەوخەڵکەی لەپشت سەکۆکەش بوون، کەوتبوونە شانەچرکێ و شوژنت هەڵاویشتبایە نەدەکەوتە عەرزی.

هێندێ لە ژنان، بەتایبەت ئەوانەی لە ڕێی دوورەوە هاتبوون، جلوبەرگی ڕازاوە و جوانیان لەبەردابوو و خۆیان لە تەپڵی گوڵێ دابوو. بەڵام زۆربەشیان گوێیان بە جل وبەرگ و ئارایشت نەدابوو. چەشنێک توورەیی و کونجکاوی بە ڕووخساریانەوە دیار بوو، ڕاستییەکی سەیریش ـ کە دواتر دەرکەوت و سەرنجی هەموانی ڕاکێشا ـ ئەوە بوو کە هەموو ژنان، یان

لانیکەم زۆربەی زۆریان لایەنگری میتیا بوون و داخوازی فحێل بوونیان دەکرد. ئەوەش پێوەندیی بە جوانچاکی و دڵڕفێنی میتیاوە بوو، هەروەها ژنان ئەویان بە پیاوێکی خۆڕاگر و خاوەن ئیرادە دەزانی. هەمووشیان دەیانزانی کە ئەو دوو ژنە ڕەقیبە بڕیارە لەوێ بن. یەکیان کاترینا ئیوانا کە باسی دڵدارییەکەی لەگەڵ میتیا کەوتبووە سەرزاران و هەموو چەشنە داستان و هەقایەتێکی سەرسووڕهێنەریان بۆ ساز کردبوو. بەتایبەت لە سەر هەوا و قۆڕەدەماخی و "ئەشرافزادە" بوونی پێداگرییان دەکرد. (ئەو کەم وابوو هاتووچۆی کەس بکا و ئیزن بدا هەمووکەس بچێتەماڵی). خەڵکی دەیانگوت دەیهەوێ داوا لە دەوڵەت بکا، ودمی بدەن لەگەڵ میتیای تاوانبار بچێ بۆ سیبیریا و لەو کانگایانەی ئەوێ زەماوەندی لەگەڵ بکا. بۆ هاتنی گرووشنکاش هەروا تامەزرۆ بوون و چاوەڕێ بوون ئەو دوو ڕەقیبە کاترینای لووتبەرز و لەخۆبایی و گرووشنکای "عەیار وداوێن‌تەڕ" لە دادگا لووتیان بە لووتی یەکدا بتەقێ. ژنانی ناوەقەکە گرووشنکایان لە کاترینا ئیوانا باشتر دەناسی. ئەوان دەیانزانی هەوەسبازە «بۆتە هۆی لە نێو چوونی فیۆدۆرپاولۆویچ و کوڕە چارەڕەشەکەی» هەمووشیان لە خۆیان دەپرسی: «بۆ دەبێ باوک و کوڕ ئاشقی ژنێکی ئاوابن کە ژنە ڕووسییەکی ئاسایییە و تەنانەت جوانیش نییە؟»

وەلحاسڵ، هەر کەس لە هەوایەکی دەخوێند. لێم‌ڕوونە کە لە شارەکەمان زۆر کێشەی بنەماڵەیی لە سەر میتیا ساز بوو. زۆربەی ژنان لە سەر ئەو پەروەندەیە و دژایەتیی بیروڕا، لەگەڵ مێردەکانیان بە کێشە هاتن، سروشتییش بوو مێردی ئەو ژنانە بە هیچ شێوەیەک حەزیان لە چارەی میتیا نەدەکرد و زۆر دەغەزدارانە هاتبوونە دادگا. لە ڕاستیدا پیاو دەتوانێ بەدڵنیایی بڵێ، پیاوان بە تێکڕا ڕقیان لە دیمتری فیۆدۆرۆویچ بوو. تاقمێکی گرژ و ڕووتاڵ و تەنانەت ڕقلەزگ، کە زۆرینەی ئاپۆڕەکەیان پێکهێنابوو. ڕاستییەکەی میتیاش لەو ماوەیەدا کە نیشتەجێیی شارەکەمان بوو دڵی زۆر کەسی ئێشاندبوو. بڕێک لە حازریانیش هەڵبەت حەزیان بە چارەڕەش بوونی

میتیا نەدەکرد، یان زۆر کەمتەرخەم بوون. بەڵام هەموو تامەزرۆی ئاکامی دادگاییەکە بوون و زۆربەی پیاوان هیواداربوون میتیا مەحکووم بێ. بەڵام وەکیلەکان و دادوەرەکان بەجێی لایەنی ئەخلاقی زیاتر لایەنی یاسایی پەروەندەکەیان لەبەرچاو دەگرت.

هەموویان لە هەنتەشی دادوەری بەناوبانگ، "فیێتی یۆکۆویچ"دا کەوتبوونە دڵەخورپە. لێهاتوویی ئەو دادوەرە لە هەموو لایەک دەنگی دابۆوە. ئەمەش یەکەم جار نەبوو، کە لە پارێزگاکان دەبووە پارێزەری پەروەندەیەکی ئاوا پڕکێشە. پارێزەریی لە هەر پەروەندەیەک بکردایە، لە سەرانسەری ڕووسیا دەنگی دەدایەوە و تا ماوەیەکی زۆر لە بیر نەدەچۆوە. باسی دادوەری شارەکەمان و سەرۆکی دادگاش کەوتبووە سەر زاری خەڵک. دەیانگوت ئیپۆلیت کیریلۆویچ کاتێ لەگەڵ فیێتی یۆکۆویچ بەرەوەڕوو دەبێ لەرزی لێدێ و هەر لە سەرەتای کارەکەیانەوە لە پترزبۆرگ نەیاری یەکتر بوون. ئەگەرچی دادوەرەکەمان زۆر وریا بوو، بەڵام زۆر جار دانی پیادەنا کەسێک لە پترزبۆرگ ئازاری داوە. چونکە هێشتا لێهاتووییەکانی بۆ خەڵک دەرنەکەوتبوو، لە سەر پەروەندەکەی کارامازۆف بە چڕوپڕی هەوڵیدەدا و تەنانەت بە هیوابوو لەو ڕێگایەوە بەرهەڵێخێک بداتە بەر دیوارە درز بردووەکەی بەختی. دەیانگوت فیێتی یۆکۆویچ بە جارێ تووشی دڵەخورەپەی کردووە. بەڵام ئەو دەمگۆیانە تاڕادەیەک ناڕەوا بوون. دادوەری ئێمە دارێک نەبوو بەو بایانە بلەرزێ و لە هەمبەر مەترسیدا خۆی بدۆڕێنێ. بەپێچەوانە، لە کاتی مەترسیدا بڕوا بەخۆبوونی زیاتر دەبوو. ئەوەشمان لە بیر نەچێ دادوەرکەمان لەسەریەک زۆر مرۆڤێکی بە تاڵووکە بوو، زووش دەکەوتە ژێر کارتێکەری. دڵ و گیانی لە سەر پەروەندەکەی دادەنا و وای کار دەکرد لە سەری، دەتگوت تەواوی ژیان و چارەنووسی بە ئاکامی ئەو کارەوە گرێدراوە. هەر ئەوەش بووبووە هۆی ئەوەی گاڵتەی پێبکەن. چونکە دادەورەکەمان بە بۆنەی ئەو تایبەتمەندییەوە ناوبانگی لەڕادە بەدەر دەرکردبوو. لەو پلە و پایەی ئەودا تا ئەو ڕادەیە چاوەڕوانیی لێنەدەکرا.

خەڵکی پێکەنینیان بەو خولیا و بڕوا بەخۆبوونەی دەهات. بە بڕوای من ئەوان بە هەڵە چووبوون و دادوەری ئێمە پێموایە کەسایەتییەکی زۆر مەند و ماقووڵ بوو، زۆر ماقووڵتر لەوەی خەڵکی بیریان لێدەکردەوە. بەڵام لە بەر بێهێزی و لاوازیی جەستە نەیتوانیبوو لە سەرەتاوە کارێکی باش وەدەستبێنێ و دواتریش هەوڵێنەدا قەرەبووی بکاتەوە.

سەرۆکی دادگاش هەر ئەوەندە دەڵێم مرۆڤێکی دڵۆڤان و خاوەن فەرهەنگ بوو. زۆری ڕێز بۆ کارەکەی و بیروڕای پێشکەوتوو دەدانا. تا ڕادەیەک هەلخواز بوو بەڵام زۆریشی ماستاو لە بەر باڵادەستەکانی خۆی سارد نەدەکردەوە. چونکە چاوەڕوانی ئەوە نەبوو لە داهاتوودا پلەوپایەی بڕواتە سەرێ. گەورەترین ئامانجی ژیانی ئەوە بوو ببێتە خاوەنی ئەندێشەیەکی پێشڕەو. ئەو توانیبووی ملک و ماڵ و دۆست و ئاشنای خاوەن دەسەڵات پەیدا بکا. هەر وەک دواتر ئاگاداربووین، پەروەندەی کارامازۆف تەنیا لەو لایەنەوە سەرنجی ڕاکێشابوو، کە تا ڕادەیەک ڕەنگدانەوەی ڕێژیمی کۆمەڵایەتی و غیرەتی ڕووسیی پێوە دیارە. بەڵام سەبارەت بە چۆنیەتیی جینایەتی قارەمانانی چیرۆکەکەم و بەتایبەت تۆمەتبار و ماجەرا دڵتەزێنەکەی زۆر کەمتەرخەم بوو و سەرسارانە چاوی لە چارەنووسیان دەکرد. هەڵسوکەوتیشی ئەوەندە سەرسووڕهێنەر نەبوو، چونکە بەپێی بارودۆخەکە بوو.

زۆر بەرلەوەی قازییەکان ئامادە بن، دادگا هێندەی خەڵک تێرژابوو جمەی دەهات. دادگاکەشمان چاکترین و گەورە و جێدارترین هۆڵی شارەکەمانە و بۆ دەنگیش باشە و تۆزێ توند قسە بکەی دەبێتە زایەڵە. لەلای دەستە ڕاستی قازییەکانەوە، کە لە سەر سەکۆیەکی بەرین هەڵکەوتبوو، مێزێک و دووڕیز کورسی ئامادە کرابوو بۆ کۆڕی داوەران. تۆمەتبار و پارێزەرەکەشی لەلای چەپە جێگایان بۆ تەرخانکرابوو. لە نێوەڕاستی هۆڵەکەشدا، نزیک قازییەکان، مێزێکی لێبوو بەڵگەی تاوانەکەی لە سەر داندرابوو: کراسە سپی و هاورێشمینەکەی فیۆدۆر پاولۆویچ کە خوێنی پێوە وشک هەڵاتبوو.

دەسکاونگە سامناکەکەش کە پێیان وابوو قەتڵەکە بەو کراوە، کراسەکەی میتیا کە خوێن بە سەر قۆڵەکانیەوە ڕقیتەی بەستبوو؛ کۆتەکەی جیَجیَی گیرفانەکەی پەڵە خوێنی پێوە دیار بوو، ئەویش هی ئەوە بوو دەسرە خوێناوییەکەی تێخستبوو. دەسرەکەش گرمۆڵە و خوێناوی و ڕەقهەڵاتوو، ئێستا ئیتر زەردی دەنواند: دەمانچەیەک کە میتیا لە ماڵی پێرخۆتین پڕیکردبوو بۆ ئەوەی خۆی پیَبکووژیَ، لە ماکرۆیە تریفۆن بۆریسیچ بە دزییەوە هەڵیگرتبوو. پاکەتێک کە سیَهەزار ڕۆبڵی بۆ گرووشنکا تێدا هەڵگیرابوو، بزگوڕێکی باریکی پەمەیی کە پاکەتەکەی پیَبەسترابوو، زۆر شتی تریش کە لە بیرم نەماوە. ناوەندی هۆڵەکەش جێگای ئاپۆرەی خەڵک بوو. بەڵام لە بەر سەکۆکەدا چەند کورسییان بۆ شایەدەکان دانا بوو کە دوای شایەدی لە دادگاکە دەمانەوە.

سەعاتی دە سیَ قازی هاتن ـ سەرۆکی دادگا، دادوەرێکی بیَمز و یەکێکی دیکە. دادوەر، هەر لەڕێوە، دوای ئەوان هاتە ژووریَ. سەرۆکی دادگا پیاوێکی کورتەباڵای پەنجا ساڵان بوو، چوارشانە و تێکسمڕاو، بە قەڵافەت و ئەدگارێکی تووڕە و تووکەسەری کورتکراوەی ماشوبرنجییەوە. تەنزیلێکی سووریشی لە مل کردبوو و کە نازانم نیشانەی چی بوو. دادوەر بە بڕوای من و زۆربەی حازریان وا دیار بوو ڕەنگی پەڕیوە و زەرد هەڵگەڕابوو. دەتگوت لە ناکاو دەموچاوی چکۆلە بۆتەوە، ڕەنگە بە شەوێک وای لێهاتبیَ، چونکە دوو ڕۆژ لەمەوبەر دیتبووم و زۆر ئاساییی دەنواند. سەرۆکی دادگا بەو پرسیارە کە هەموو ئەندامانی لێژنەی داوەری حازرن، دەستیکرد بە قسە کردن.

بەڵام بەم شێوەیە ناتوانین بچینە پێشیَ، لە بەر ئەوەی هێندیَ لە شتەکانم نەبیستووە. بڕێکیان سەرنجم نەداوەتیَ و بڕێکی دیکەشم لە بیر چۆتەوە. بەڵام زیاتر لە هەمووی بەو هۆیەوە کە نە کاتم هەیە و نە شوێنەکەش هەڵگری تەواوی ئەوشتانەیە کە باسکرا. تەنیا ئەوەندە دەزانم کە هیچکامیان، یانی نە دادوەر و نە پارێزەر، سەبارەت بە قسەکانی لێژنەی داوەری

نارەزایەتییان دەرنەبڕی. لێژنەی داوەرانیش دەزانم کێن، چوار کەسیان فەرمانبەری مەزرینگەن، دوو کەسیان بازرگانن، شەش کەسیشیان لادێیی و پیشەسازن. لە بیرمە زۆر بەرلە دەستپێکردنی دادگاییەکە، لە پەستا پرسیاری سەیر و سەمەرەیان دەکرد، بەتایبەت ژنان: "چۆن ڕووداوێکی ئاوا دژوار و دڵتەزێن کە داوەری کردن لەبارەیەوە پێویستی بە زانیاریی تەواو و ڕەوانناسی هەیە، بە چەند کەس کارمەند و لادێیی و بازاڕی دەسپێرن؟" هەروەها، "کارمەندێک، یان کابرایەکی لادێیی کوا سەری لەو کارانە دەردەچێ؟" هەر چوار فەرمانبەرەکەی لێژنەی داوەران، لە ڕاستیدا پلەوپایەیان لەخوارێ بوو، جگە لە یەکیان کە تۆزێ جحێڵتر بوو، ئەو سێ کەسەی دیکە ڕیش سپی بوون و هیچکەس نەیدەناسین و مووچەیەکی زۆر کەمیان هەبوو. ژنەکانیشیان ڕەنگە پیر بن و نەیانتوانیبێ بێن بۆ دادگا، هەرکامیشیان بێگومان هۆردوویەکیان مندالّی ڕەش‌وڕووت هەیە. دیارە بە عومراتیان کتێبێکیان نەخوێندۆتەوە و کاتی ڕابواردنیان هەر بە پەڕێن و گەنجەفەکردن تێپەڕیوە. ئەو دوو کابرا بازرگانەش مڕومۆچ و بێدەنگ بوون و کەسانێکی ناوبەدەرەوەش نەبوون. یەکیان ڕیشی تاشیبوو و جلوبەرگی بە مۆدی فەرەنگی لە بەر کردبوو؛ ئەوی دیکەشیان ڕیشێکی کورت و بۆزی هەبوو و میدالّیایەکی بە نەوارێکی سوورەوە لەمل کردبوو. لادێیی و پیشەسازەکانیش پێویست ناکا باسی بکەین. پیشەسازانی لای ئێمەش زیاتر لە سەر زەوی و زار کار دەکەن و لەگەڵ لادێییەکان فەرقیان نییە. دووکەس لەوانیش بە مۆدی فەرەنگی لیباسیان لە بەر کردبوو، ڕەنگە هەر بەو هۆیەش بێ، پیس و نابووتەتر لەوانی دیکەیان دەنواند. لە ئاکامدا پیاو لە خۆی دەپرسی، هەر خۆم کاتێک چاوم پێیان کەوت لە خۆم پرسی: «ئەم جۆرە کەسانە دەیانهەوێ چی لەو پەروەندەیە هەڵکرێنن؟» لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان ڕووتاڵ و گرژ و مۆن دانیشتبوون و ڕوخساریان تا ڕادەیەک هەڕەشەئامێز بوو.

ئاخری سەرۆکی دادگا پەروەندەکەی فیۆدۆرپاولۆویچ کارامازۆفی لێک کردەوە، بەڵام بە جوانی لە بیرم نییە چۆنی دەستپێکرد و باسەکەی دامەزراند. میرزابنووس فەرمانی بە نیگابانەکە دا بەندی بێنێتە ژووریٚ، میتیایان هێنا. بێدەنگی باڵی بە سەر هۆڵەکەدا کێشا و ویزەی مێشوولەیەکیش نەدەبیسترا. خەڵکەکەی دیکە نازانم چۆن بوون، بەڵام میتیا شوێنێکی زۆر ناخۆشی لە سەر من دانا و بە جاریٚ دڵتەنگی کردم. جلوبەرگێکی زۆرجوان و نوێی لە بەر کردبوو، تەڕپۆش و ڕێکوپێک. دواتر بیستم خەبەری ناردووە بۆ خەیاتەکەی لە مۆسکۆ، بە زووترین کات ئەو دەستە جلەی بۆ ئامادە بکا، تاکو ڕۆژی دادگایی کردنەکە لەبەری بکا. پێشتریش ئەو بەرگدرووە کاری بۆ کردبوو، بۆیە ئەندازەی میتیای لەلا بوو. دەستکێشی چەرمیی لە دەست کردبوو، کراسێکی گرانباییشی لەبەردا بوو. بە هەنگاوی قورس و قایمەوە پێی‌نایە نێو هۆڵەکە و ڕاست چاوی لە پێش خۆی بڕیبوو. بیٚئەوەی ڕێزەیەک پەرۆش بیٚ و خۆی شلویٚ بکا ڕۆیی لە سەر جێگاکەی دانیشت. هەر لەو کاتەدا پارێزەر فێتی یۆکۆویچی بەناوبانگ هاتە ژووریٚ و بە بەردەمی خەڵکەکەدا ڕۆیی بۆ شوێنەکەی خۆی، خەڵکەکە دەستیان کرد بە سرت‌وخورت. پیاوێکی بەلەباریکە و کەڵەگەت بوو. لاقی درێژ و باریک، قامکی دەستیٚ شووش و درێژ و ڕەنگپەڕیو. ڕیشی تاشراو و تیفتیفە دراو، تووکە سەری کورت و شانە کراو، لێوی باریک و قەیتانی کە هێندیٚ جار بە زەردەخەنە و چزەبزە کێشی دەهات. چل‌ساڵان بوو. ئەگەر لە بەر چاوی نەبوایە، کە چکۆلە و شیشلۆق و زۆر لەیەک نزیکبوون و تەنیا لووتێکی باریک و درێژ لێکی جیا کردبوونەوە، ڕوخساری جوان و لەبەردڵان بوو. لە ڕاستیدا سەروچاوی درێژۆکە و باڵندەئاسایی بوو، بەرگی شەویٚ لەبەردا بوو بە بۆینباخی سپییەوە.

لەبیرم نەماوە یەکەم پرسیاری سەرۆکی دادگا لە میتیا چی بوو، کە پێوەندیی بەناو و کەسب و کار... بوو. میتیا بە توندی وەڵامیدایەوە، دەنگی وا بەرز کردەوە کە سەرۆکی دادگا داچڵەکی و بە سەرسوڕمانەوە چاوی لێکرد.

پاشان لیستەی ئەو کەسانەی بڕیار بوو لەو دادگاییەدا بەشداریبکەن ـ یانی لیستەی شایەد و شارەزایان، خوێندرایەوە. چوار کەس لە شایەدەکان نەهاتبوون ـ میۆسۆف؟ کە کاتی لێپرسینەوەی یەکەم شایەدیی دابوو، ئێستا لە پاریس بوو؛ مادام خۆخلاکۆف و ماکسیمۆفیش لەبەر نەخۆشی نەهاتبوون؛ ئیسمیر دیاکۆفیش ئەوە مەرگ بەرۆکی پێگرتبوو، ڕاپۆرتی فەرمیی شارەوانی لەو بارەوە ڕاگەیەندرا. هەواڵی مەرگی ئیسمیر دیاکۆف سرتوخورت و جموجۆڵی لە نێو خەڵکەکەدا وەڕێ خست. هەڵبەت زۆربەی حەزەرات هەواڵی ئەو خۆکوژییەیان نەبیستبوو. ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر سەرنجی خەڵکی ڕاکێشا، گوڕاندنی کتوپڕی میتیا بوو. لەگەڵ بیستنی هەواڵی ئیسمیر دیاکۆف، هەروا کە دانیشتبوو، نەڕاندی:

ـ ئەوە سەگ بوو، وەک سەگیش تۆپی.

لەبیرمە پارێزەر هەڵات بۆ لای و سەرۆکی دادگاش هەڕەشەی لێکرد، ئەگەر جارێکی دیکە ئەو گوڕەگوڕە دووپات بکاتەوە، بە توندی سزا دەدرێ.

ـ ئیتر دووپاتیناکەمەوە. لە دەمم دەرچوو. ئیتر دووپاتی ناکەمەوە.

هەڵبەت لە ڕوانگەی لێژنەی داوەران و حازریانەوە ئەو ڕووداوە کورتە بەقازانجی نەبوو. خووخدەشی بۆ هەمووان دەرکەوت و ئیتر پێویست بە گوتن ناکا. هەر ئەو ڕووداوەش بووە هۆی ئەوەی سزانامەکەی بخوێندرێتەوە.

سزانامەکە ئەگەرچی بە کورتی نووسرابوو، بەڵام داگری هەموو شتێک بوو. زیاتر گرنگیی بە چۆنیەتیی قۆڵبەست کرانی دابوو، بۆ دەبێ دادگایی بکرێ و... لەگەڵ ئەوشدا شوێنێکی قورسی لە سەر من دانا. میرزابنووس بە دەنگێکی بەرز و ڕەوان خوێندییەوە، بەو جۆرە پەردە لە سەر ڕووداوەکە هەڵدرایەوە و ئەو تراژیدیا دڵتەزێنە بۆ هەمووان ڕوون کرایەوە. لە بیرمە هەر دوای خوێندنەوەکە، سەرۆکی دادگا بە دەنگێکی بەرز لە میتیای پرسی:

ـ تۆمەتبار، ئایا دان بە تاوانەکەی خۆتدا دەنێی؟

میتیا لە ناکاو هەستا سەرپێ و دیسان بە دەنگێکی بەرز و شێتانەوە گوتی: «دان بە مەینۆشین و هەڵەخەرجی و سەرەڕۆیی و عەیاشیدا دەنێم و دەمویست بۆ هەمیشە ببمە مرۆڤێکی خاوەن ئابڕوو، بەڵام چارەنووس بەسەرەوە لەعەرزیدام. بەڵام لەمەڕ مردنی ئەو پیرەپیاوەوە، کە هەم باوکم بوو، هەم دوژمنم بوو، بێتاوانم. نا، نا، من دەستدرێژیم نەکردۆتە سەری و لەو بارەوە بێتاوانم! دیمیتری فیۆدۆرۆویچ هیچوپووچ و خوێڕییە، بەڵام دز نییە.»

دیسان دانیشتەوە. دیار بوو سەرتاپای دەلەرزی. سەرۆکی دادگا، دیسان بە کورتی و بە لەبزێکی توند و تووڕە وریاییی پێدا تەنیا وەڵامی ئەوە بداتەوە کە لێی دەپرسن. لاڕێ نەڕوا و لە بابەتی باسەکە دوور نەکەوێتەوە. پاشان فەرمانیدا بچنە سەر پەروەندەکە. تەواوی شایەدەکانیان بۆ سوێند خواردن بانگکردە سەر سەکۆکە. ئەو کاتە هەموویانم پێکەوە دی. ئیجازەیان بە براکانی دیمیتری دا بە بێسوێندخواردن شایەدی بدەن. دوای ئامۆژگاریی قەشە و سەرۆکی دادگا، شایەدەکانیان لە سەر سەکۆکە هێنایە خوارێ و دوور لە یەک دایان نیشاندن. پاشان دانەدانە دەستیان کرد بە بانگ کردنیان.

## (٢)

# شایەدانی پڕمەترسی

نازانم شایەدانی تۆمەتبار و شایەدانی دادگا، سەرۆکی دادگا وای ڕێکخستبوون کە بە شێوەیەکی تایبەت بانگیان بکەن یان نا. بێگومان کاری خۆی بوو. هەر ئەوەندە دەزانم سەرەتا شایەدەکانی دادگایان بانگکرد. دووپاتیدەکەمەوە. نامەوێ مووبەموو باسی پرسیارەکان بکەم. چونکە قسەکانم تاڕادەیەک زایە دەبوو، ئاخاوتنی دادوەر و پارێزگارییەکانی وەکیل قسەی شایەدەکانیان لەبەر یەک ڕانا و ڕواڵەتێکی ئاشکرا و ماناداریان پێدا. منیش بەشێکم لەو دوو وتارە سەرنجڕاکێشە بە وردی یادداشت کردووە، کە لە جێی خۆیدا بە چڕوپڕی باسیدەکەم، هەروەها ڕووداوێکی دەگمەن و چاوەڕوان نەکراو کە بەر لە کۆتایی هاتنی وتەکان ڕوویدا و بێگومان ئاکامێکی تاڵ و مەرگاویی بۆ محاکەمەکە بەدواوە بوو. هەر ئەوەندە دەڵێم لە ساتەکانی هەوەڵی محاکەمەکەوە شێوەی تایبەتی پەروەندەکە سەرنجڕاکێش بوو و هەموانیش ئەوەیان بۆ دەرکەوتبوو، یانی هێمی پاریزگارییەکە دەبوو لە سەر بنەمایەک دامەزرێ، کە بتوانێ بە سەر حوکمەکانی قازی و دادگادا زاڵ بێ. هەر لە سەرەتاشەوە هەموان تێگەیشتن کە ڕاستییەکان لە دەوری خاڵێکی بەرچاو کۆبوونەوە و هەموو جینایەتە پڕ مەترسی و خوێناوییەکە وردە وردە ئاشکرا بوو. ڕەنگە هەر لە سەرەتاوە هەموو بۆیان دەرکەوتبێ کە لێکۆڵینەوەی پەروەندە فرێ بە سەر باسەکەوە نییە و لەو بارەوە هیچ گومانێکیان نییە. یانی لە ڕاستیدا پێویست ناکا لە سەری بڕۆن، دیارە پارێزگارییەکەش هەروا شتێکی ڕواڵەتییە و تۆمەتباریش گومانی تێدا نییە

تاوانباره. پێموایه تەنانەت ژنەکانیش کە بە ئاواتەوە بوون تۆمەتباری دڵڕفێن فحێل بێ، تێکڕا بەو قەناعەتە گەیشتن کە ئەو قەتڵە کاری خۆیەتی. هەروەها پێموایە ئەگەر بناغەی سزاکەی ئاوا قایم و پتەو دانەڕێژرایە، ژنەکان دڵیان گەردی دەگرت. چونکە ئەگەر وا نەبوایە کاردانەوەی دوایین دیمەنی فحێل بوونی تاوانبار کەمڕەنگ دەبوو. سەیریش ئەوەیە تەواوی ژنەکان هەتا دوایین سات لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە فحێل دەبێ. «ئەو تاوانبارە، بەڵام فحێل دەبێ: بە هۆی ئەنگێزەی مرۆڤانە و بەپێی ئەندێشەی نوێ و هەست و سۆزی نوێ کە لەم سەردەمەدا بۆتە باو،» هەروەها ئێلە و بێلە. بۆ ئەوەش ئاوا تامەزرۆیانە بەرەو دادگا خێزەرەیان بەستبوو. پیاوەکان زیاتر سەرنجیان دابووە مشتومڕ و شەڕەدەندووکەی دادوەر و فێتی یۆکۆویچی بەناوبانگ. هەموویان بە سەرسووڕمانەوە لە خۆیان دەپرسی کەسێکی لێزانی وەک فێتی یۆکۆویچیش دەرەقەت ئەو پەروەندەیە نایە؛ هەربۆیە سەرکەوتنەکانی ئەویان هەنگاو بە هەنگاو و بە وردی پەیگیری دەکرد.

بەڵام فێتی یۆکۆویچ هەتا کۆتایی، یانی هەتا کاتی ئاخافتنەکەی، هیچکەس تێینەدەگەیشت و سەری لە کارەکانی دەرنەدەچوو. ئەوانەی لەو کارەدا خاوەن ئەزموون بوون پێیانوابوو پیلانێکی بە دەستەوەیە و بەرەو ئامانجێکی تایبەت دەڕواتە پێشێ، بەڵام مەحاڵ بوو پیاو تێیبگا. سەرەڕای ئەوەش متمانە و باوەڕبەخۆبوونی شکی تێدا نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەمووان بە خۆشحاڵییەوە ئەوەیان بۆ دەرکەوتبوو کە ئەو، دوای مانەوەیەکی کورت لە نێو ئێمەدا، کە ڕەنگە سێ ڕۆژ زیاتر نەخایەنێ، سەرکەوتنێکی بێوێنە لەو پەروەندەیەدا وەدەستدێنێ. «زۆر بە وردی خوێندوویەتەوە» و بە سەر هەموو بارێکی ڕووداوەکەدا زاڵە. خەڵک دواتر بە پێکەنینەوە دەیانگوت تەواوی شایەد و دادوەرەکانی «لە قولەمیچەی گرتبوو» و بە جارێ گێژ و وێژی کردبوون، وایلێکردبوون شایەدییەکانیان تووڕێکی تەڕی نەدەهێنا. بەڵام وێدەچوو ئەو کارەی بۆ ڕابواردن کردبێ و لە لایەکیشەوە ویستبێتی خۆی پێوە ڕانێ، هەروەها وا بنوێنێ کە ڕەوشتی باو و قەبووڵکراوی دادگایی

کردنەکە هیچی پێ کەم و زیاد نەکراوە. چونکە هەمووان بەو قەناعەتە گەیشتبوون کە ئابڕووی بە شایەدەکانەوە نەهێشتووە و لەوانەیە لە هەموو کەس زیاتر لەو بابەتە ئاگادار بێ. حەتمەن خەیاڵێکی لە سەردایە و خەنجەرێکی پارێزگاریی شاردۆتەوە و هەلی لەباری بۆ هەڵکەوێ، لە کالانی دەردەکێشێ. بەڵام جارێ زۆر باشی لە خۆی ڕادەدی و وێدەچوو بە ئانقەست خۆی لە گێلی بدا.

بەم شێوەیە، بۆ وێنە کاتێک گریگۆری، پیرە خزمەتکاری فیۆدۆرپاولۆویچ سەبارەت بە ئاوەڵا بوونی دەرگاکە شایەدیی دا، لێپرسینەوەی لەگەڵ کرا، کاتێک نۆبەی پارێزەر هات پرسیاری لێبکا ـ بە حیسابی خستییە تەنگژەوە. ئەوەشمان لە بیر نەچێ، کاتێک گریگۆری هاتە نێو هۆڵەکەوە، بە دەمار و لووتبەرزییەوە هەنگاوی هەڵدێنایەوە و لە هەمبەر شکۆی دادگاکە و ئاپۆرەی خەڵکەکەدا هەر مێشێکیشی میوان نەبوو. ئەو عالەمە گوێیان بۆ ڕاگرتبوو بەڵام ڕێزەیەک دەست و زمانی تێکەڵ نەدەهات. جۆرێک دەدوا دەتگوت لەگەڵ مارتای خێزانی قسە دەکا، بەڵام تۆزێک بەڕێزانەتر. مەحاڵ بوو کەسێک بتوانێ قسەی پێ ببڕێ. دادوەر سەرەتا سەبارەت بە ژیانی بنەماڵەی کارامازۆف بەوردی پرسیاری لێکرد. سەرلەبەری چۆنیەتی و بارودۆخی بنەماڵەکەی گێڕایەوە و سوور سوور دیار بوو شایەدەکە بێلایەن و بێدەغەڵەیە. ئەگەرچی ڕەحمەتی بۆ ڕۆحی ئەربابە خوالێخۆشبووەکەی نارد، بەڵام دانی پیانا کە دەرهەق بە میتیا زۆری درێغی کردووە و «منداڵەکانی ئەو جۆرەی پێویستە نەعاملاندووە.» هاتە سەرباسی منداڵیی میتیا و گوتی: «بە ساوایی ئەگەر من نەبوایەم ڕشک و ئەسپێ دەیانخوارد. باوکیشی نەدەبوو ئاوا زوڵمی لێبکا و دەست بە سەر بەشەماڵەکەی دایکیدا بگرێ کە بە پێی یاسا هی ئەو بوو.»

لە وەڵامی دادوەردا کە لێی پرسی بۆ ئەو مەسەلەیەت هێنا گۆڕێ، کە گوایە فیۆدۆرپاولۆویچ دەستی بە سەر بەشەماڵەکەی میتیادا گرتووە، گریگۆری هەمووانی تووشی سەرسوڕمان کرد و هیچ وڵامێکی نەبوو، بەڵام هەروا لە سەر ئەوە پێداگریی دەکرد کە کوڕە زوڵمی لێچووە و دەبوو چەندهەزار ڕۆبڵی

دیکەی پێبدایە. ئەوەشمان لە بیر نەچێ، دادوەر زۆری پێداگری لە سەر ئەوە دەکرد کە فیۆدۆرپاولۆویچ بە ڕاستی دەستی بە سەر بەشێک لە میراتەکەی میتیادا گرتووە یان نا، ئەوەشی لە هەموو شایەدەکان و هەروەها ئیوان و ئالیووشاش پرسی، بەڵام وەڵامێکی ڕاست و دروستی دەست نەکەوت. هەموو دەیانگوت وابووە، بەڵام نەیاندەتوانی بەڵگەیەکی ڕوون بە دەستەوە بدەن. کاتێک گریگۆری باسی ئەو شەوەی کرد کە کاتی شێو خواردن دیمیتری خۆی بە ژووریدا کردبوو، لە باوکی دابوو و هەڕەشەی لێکردبوو دەگەڕێتەوە و دەیکوژێ، شوێنێکی زۆر خراپی لە سەر دادگا و ڕەوتی پەروەندەکە دانا، بە تایبەت خزمەتکاری پیر بە شێوەیەکی زۆر جیددی باسی ڕووداوی ئەو شەوەی دەکرد. وتەکانیشی هێندە داناردانار و لەسەرەخۆ و ڕێکوپێک دەردەبڕی شانی لە شانی فەساحەت دەدا. گوتی لە سەر ئەوە ڕقی لە میتیا هەڵنەستاوە کە بە زللە لێیداوە و داویەتی بە عەرزیدا؛ ئەوەشی لە دڵدا نەماوە و لەمێژە لێی خۆش بووە. سەبارەت بە ئیسمیر دیاکۆفی ڕەحمەتیش، دوای ئەوە خاچی خۆی کێشا گوتی ئەو کوڕێکی وردبین و زیرەک بوو، بەڵان گەوج و نەخۆش بوو. لەوەش خراپتر زۆر سپڵە بوو، هەمووشی خەتای فیۆدۆرپاولۆویچ و کوڕە گەورەکەی بوو وایان فێر کردبوو. بەڵام تا ڕادەیەک باسی ڕاستوێژیی ئیسمیر دیاکۆفی کرد و گێڕایەوە کە جارێکیان پارەی ئەربابەکەی لە حەوشە دیوەتەوە و بەجێی ئەوەی بیشارێتەوە داویەتەوە بە ئەربابەکەی، ئەویش «دراوێکی ئاڵتوون»ی داوەتێ، دوای ئەوەش زیاتر کەوتۆتە بەردڵی فیۆدۆرپاولۆویچ و متمانەی سەروماڵی پێکردووە. گرێگوری دیسان پێداگریی لە سەر ئەوە کردەوە کە دەرگای بەرەوباخەکە کراوەتەوە. زۆرتری پرسیار لێکرا، بەڵام هەموویم لە بیر نەماوە.

ئەنجا پارێزەر دەستی کرد بە لێپرسینەوەی. یەکەم پرسیارێک کە لێیکرد سەبارەت بەو پاکەتە بوو کە پێیان وابوو فیۆدۆرپاولۆویچ گوژمەی سێ‌هەزار ڕۆبڵی بۆ «کەسێکی دیاریکراو» تێدا هەڵگرتووە.

«ئایا ئێوە ساڵانێکی زۆر لە نزیکەوە خزمەتتان بە کارامازۆفی گەورە کردووە ئەو پاکەتەتان دیوە؟» گریگۆری وەڵامی دایەوە کە نەیدیوە و لە کەسیشی نەبیستووە «هەتا ئەو کاتەی کە هەمووان سەبارەت بەو پاکەتە قسەیاندەکرد.» فیتی یۆکۆویچ ئەو پرسیارەی سەبارەت بە پاکەتەکەی، وەک ئەو پرسیارەی دادوەر پێداگرانە بوو کە سەبارەت بە میراتەکەی میتیا پرسیبووی، پرسیاریان لە تەواوی ئەو کەسانە کرد کە وێدەچوو هەواڵێکیان لەو بارەوە هەبێ. هەمووشیان هەر ئەوە بوو وڵامەکەیان: هیچکەس پاکەتەکەی نەدیوە، ئەگەرچی زۆربەیان نەقڵەکەیان بیستبوو. هەر لە سەرەتاوە، هەموو بۆیان دەرکەوت فیتی یۆکۆویچ پێداگری لە سەر ئەو مەسەلەیە دەکا.

فیتی یۆکۆویچ، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو گوتی: «ئێستا، ئەگەر ئیزنتان لە سەر بێ پرسیارێکتان لێدەکەم، ئەو دەرمانە، یان ڕوونترڕ بیڵێم ئەو دەمکراوە کە پێشتریش لە لێپرسینەوەکەدا باسکرا و ئەو شەوە لە پشت و کەلەکەت هەڵساویوە و بە دەرمانێکی شیفادەرتان زانیوە، لەچی دروستکراوە؟»

گریگۆری بە ماتی چاوی لە پارێزەر بڕی و دوای تاوێک بێدەنگی لە ژێر لێوەوە منجاندی: «زەعفەرانی تێدابوو.»

- تەنیا زەعفەران، هیچی دیکەت لە بیر نییە؟

- بێژانیشی لەگەڵ بوو.

- ڕەنگە بیباریشی تێدا بووبێ؟

- بەڵێ بیباریشی تێدابوو.

- هەموو ئەوانەش لەگەڵ ودکا کوڵێندرابوون؟

- لە ئالکۆلی خالیسدا.

پێکەنینێکی نەرم لە نێو هۆڵی دادگاکەدا دەنگیدایەوە.

- زۆر چاکە، لە ئالکۆلی خالیسدا. پێموایە دوای ئەوەی پشت و کەلەکەتان پێداماڵی، ئەوەی لە شووشەکەدا مابۆوە ناتان بە سەرتانەوە، ئەویش بەو دوعا و نووشتانەوە کە تەنیا ژنەکەت لێی ئاگادار بوو؟

- بەڵێ.
- زۆرتان لێخواردەوە؟ بفەرموون بەقەد پەرداخێک یان دوو پەرداخ شەڕاب دەبوو؟
- پەرداخێک دەبوو.
- پەرداخێک، ڕەنگە پەرداخ و نیوێکیش؟
گریگۆری وەڵامی نەدایەوە. وەک ئەوەی لە مەبەستەکە نەگەیشتبێ.
- پەرداخ و نیوێک ئالکۆلی خالیس. خراپنییە. پێتوانییە جگە لە دەرگای بەرەوڕووی باخ. دەرگاکانی ئاسمانیش ئاوەڵا بووە؟
گریگۆری بێدەنگبوو. دیسان پێکەنین دادگاکەی داگرتەوە. سەرۆکی دادگاکە تەکانێکی لە خۆی دا.
فێتی یۆکۆویچ بە پێداگرییەوە پرسیی: «لێتڕوونە ئەو کاتەی دەرگاکەت کردەوە، بەخەبەر بووی یان بەدەم خەوەوە دەرپەڕییت؟»
بەپێوە بووم.
ئەوە بەڵگە نییە بۆ ئەوەی بەخەبەر بووبێتی (دیسان دەنگی پێکەنین). ئەگەر کەسێک لەو ساتەدا پرسیاری لێبکردایەی - بۆ وێنە چ ساڵێکە - دەتتوانی وەڵامبدەیتەوە؟
- نازانم.
- دەی دەزانی چ ساڵێکە؟
گریگۆری مات و پەرێشان ڕاوەستابوو و چاوی لە ئەشکەنجەگەرەکەی دەکرد. سەیریش ئەوە بوو بە ڕاستی نەیدەزانی چ ساڵێکە.
- ئایا دەتوانی بڵێی دەستتان چەند قامکی هەیە؟
گریگۆری بە دەنگێکی بەرز و ئاشکرا گوتی: «من خزمەتکارم. ئەگەر گەورەکان بە باشی دەزانن من وەسەر تەڵە بپەڕم، ناچارم تاملێبکەم.»
فێتی یۆکۆویچ ماتبوو، سەرۆکی دادگا هەڵیدایە و داوایلێکردن پرسیاری باشتر بکەن. فێتی یۆکۆویچ دەستی بە سینگییەوە گرت و گوتی ئیتر پرسیارێکی نییە لەو شایەدەی بکا. هەڵبەت شایەدی دانی پیاوێک کە دەوایەکی

ئاوا تایبەتی خواردبێ لەوانەیە «دەروازەکانی ئاسمان»یشی دیتبێ. کەسێک کە نەزانێ لە چ ساڵێکدا دەژی، دیارە خەڵکەکە و لێژنەی داوەرانیش تارادەیەک تووشی دڕدۆنگی دەکا. بەڵام بەرلەوەی گریگۆری لە شوێنی شایەدی‌دان بێتە خوارێ، ڕووداوێکی‌تر قەوما. سەرۆکی دادگا ڕوویکردە میتیا و لێی پرسی بیروڕات سەبارەت بە قسەکانی ئەم شایەدەی دوایی چییە؟

میتیا بە دەنگی بەرز گوتی: «جگە لە دەرگاکە، ئەوەی گوتی ڕاستبوو. لە بەر خاتری دۆزینی سەرم سپاسیدەکەم؛ لە بەر خاتری ئەوەی لێم‌خۆش بووە زۆری لێ‌مەمنوونم. ئەم پیرەپیاوە لە تەواوی ماوەی ژیانیدا ڕاست و بێ‌دەغەڵە بووە و بەقەد حەوت سەگ دەرهەق بە باوکم وەفادار بووە.»

سەرۆکی دادگا وریایی پێدا کە: «ئاگات لە دەمت بێ، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ»

گریگۆری منجاندی: «من سەگ نیم.»

میتیا گوڕاندی: «زۆر چاکە من سەگم، ئەگەر پێتوایە ئەو قسەیە پڕسووکایەتییە، بە خۆمی دەڵێم و داوای لێبووردنت لێدەکەم. من دەرهەق بەو پیرەپیاوە زۆر دڵڕەق و زاڵمبووم. دەرهەق بە "ئۆزۆپ"یش زاڵم بووم.»

سەرۆکی دادگا دیسان بە مڕومۆچی پرسیی: «کام ئۆزۆپ؟»

ـ ئەها، پی‌یێرۆ... مەبەستم باوکمە، فیۆدۆرپاولۆویچ.

سەرۆکی دادگا دیسان بە لەبزێکی توند و تووڕە وریایی پێدا ئاگای لە زمانی بێ.

ـ خەریکە بیروڕای قازییەکان دەرهەق بەخۆت خراپدەکەی.

کاتێک ڕاکیتینیش شایەدی دا، پارێزەر وریایی و تێگەیشتوویی خۆی نواند. واچاکە ئەوەش بڵێم ڕاکیتین شایەدێک بوو، کە دادوەر گرنگایەتییەکی زۆری پێ دەدا. دیار بوو هەموو شتێک دەزانێ. زانیارییەکانیشی سەرسوڕهێنەر بوون، هەموو شوێنێک چووبوو، هەموو شتێکی دیتبوو و قسەی لەگەڵ هەموانیش کردبوو. مووبەموو ئاگاداریی لە سەر ژیاننامەی فیۆدۆرپاولۆویچ و

---

١- حەنەکچیی شانۆنامە سوونەتییەکان.

یەک یەکی بنەماڵەکەی هەبوو. ڕاستییەکەی نەقڵی پاکەتەکەی لە میتیا خۆی بیستبوو. بەڵام کارە جوانەکانی میتیا لە میترۆپۆلیس و تەواوی کردەوە و وتەکانی بەوردی باسکرد. هەروەها چیرۆکی گسکەکۆڵەی سەروان ئیسنگیریفی بە جوانی گێڕایەوە. بەڵام ڕاکیتینیش سەبارەت بە میراتەکەی میتیا قسەیەکی ئەوتۆی نەکرد و خۆی بەو قۆڕیات و قسەلۆکانەوە بەستەوە. « بە شێوەیەکی شێتانە و کارامازۆفیانە بۆ شێواندنی کارەکان، کە پیاو سەرەندەری لێناکا، کە کامیان بۆ ئەوە دەبێ سەرکۆنە بکرێ و کامیان هەقی ئەوی دیکەیانی پامال کردووە؟» ڕاکیتین ئەو کارەساتە دڵهەژێنانەی بە خووخدەیەک زانی کە بە هۆی سەدان ساڵ بەردەداری و بارودۆخی خەفەتباری ڕووسیاوە سەری هەڵداوە. چونکە یاسا و دامەزراوەیەکی بەڕێوجێ نەبووە. لە ڕاستیدا ئیجازەیان پێدابوو تاڕادەیەک ئازادانە قسە بکا. یەکەم جار بوو ڕاکیتین بۆی هەڵکەوتبوو ئاوا عالەمێک گوێی لێبگرن و دەیویست هەموو سەرەنجەکان بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. دادوەر دەیزانی ڕاکیتین خەریکی نووسینی وتارێکە لە سەر ئەم پەروەندەیە. دواتریش لە وتەکانیدا ئاماژەی بە هێندێ لایەنی وتارەکەی کرد و دیار بوو دیتوویەتی. پاشان دێینە سەر ئەوەش. وێنەیەک کە ئەو شایەدە بەدەستییەوە دا، وێنەیەکی نەخس و تاریکبوو، بنەمای سزاکەی بە جارێ قایم و پتەو کرد. لە سەریەک، وتەکانی ڕاکیتین بە هۆی سەربەخۆیی و بەرزیی ئەندێشەکانییەوە، دانیشتوانی هۆڵەکەی تووشی سەرسوڕمان کرد. تەنانەت کاتێک باسی سەردەمی بەردەداری و بارودۆخی تاڵ و نالەباری ڕووسیای کرد، دوو سێ کەس چەپڵەیان بۆ لێدا. بەڵام ڕاکیتین بە هۆی سەرەڕۆیی و خولیای لاوییەوە تووشی خەتایەک بوو کە پارێزەر لەڕێوە کەڵکی لێوەرگرت. ڕاکیتین کاتێک وەڵامی ئەو پرسیارانەی دەدایەوە کە سەبارەت بە گرووشنکا لێیان دەپرسی، بە هۆی شادی و هەستکردن بەوەی قسەکانی سەرنجی ئەوخەڵکەی ڕاکێشاوە، تەواو لە خۆی دەرچووبوو، ئەوەندەی لە قسەدا زێدەڕەوی و پڕکێشی کرد کە ناوی ئاگرافنا ئەلکساندرفنای وەک «گراوی سامسانۆف» هێنا. پاشان هەرچەندی هەوڵیدا نەیزانی چۆن ئەو قسەیەی

قووتداتەوە. چونکە فیتی یۆکۆویچ هەر لەڕێوە مەچەکی گرت. هەمووشی بەو هۆیەوە بوو، کە ڕاکیتین بیری لەو بابەتە نەکردبۆوە، کە پاریزەر لەو ماوە کورتەدا توانیبێتی ئاوا بە سەر بارودۆخ و پێچوپەنای پەروەندەکەدا زاڵبێ.

پاریزەر بە بزەیەکی میهرەبان و بەڕێزانەوە گوتی: «ئیجازە بفەرموون بپرسم کە ئێوە، هەر ئەو ئاغای ڕاکیتینەن کە نامیلکەیەکتان بەناوی «ژیانی پیری کۆچکردوو، باوەزووسیما» بڵاو کردۆتەوە کە پڕە لە بیرۆکەی مەزهەبی و پێشکەش بە ئۆسقۆفت کردووە؟ لەم دواییانەدا خوێندمەوە و زۆرم پێخۆشبوو و چێژم لێوەرگرت.»

ڕاکیتین کە دیار نەبوو بە چ هۆیەک ئاوا تێکچووە و تا ڕادەیەک هەستی بە شەرمەزاری دەکرد، لە ژێر لێوییەوە گوتی: «بۆ ئەوەم نەنووسی بڵاوی بکەمەوە... دواتر بڵاو بۆوە.»

ـ هەر زۆر نامیلکەی چاکە، زۆر باشت نووسیوە، بیریارێکی وەک ئێوە دەتوانێ و دەبێ بشتوانێ، لە باسێکی کۆمەڵایەتیدا گرینگترین و بەربڵاوترین بیروڕا دەربڕێ. ئەو نامیلکە جوان و پڕئامۆژگارییەتان کە لە سایەی ئۆسقۆفەوە بە شێوەیەکی باش چاپ و بڵاو بۆتەوە، خزمەتێکی گەورە و بەرچاوی کردووە... بەڵام مەبەستێکی گرینگ کە دەمەوێ لێتانی ببیستم ئەمەیە، هەر ئێستا گوتت لەگەڵ خاتوو ئیسۆتیلۆف ئاشنایەتییەکی نزیکتان بووە. (دەبێ ئەوەش بڵێم ئیسۆتیلۆف نازناوی گرووشنکا بوو. ئەوەشم ئەو ڕۆژە لە کاتی دادگاییەکەدا بۆ یەکەمجار بیست.) ڕاکیتین وەک چەوەندەر سوور بووبۆوە، گوڕاندی: «ناتوانم باسی هەموو پێوەندی و ئاشنایەتییەکانم بکەم... من پیاوێکی جحێڵم... کێ دەتوانێ وڵامدەری تەواوی ئەو دیدار و ئاشنایەتییانە بێ کە لە ژیانیدا بووە؟»

فیتی یۆکۆویچ، کە ئەویش تاڕادەیەک شێوابوو، پەلەی ئەوەی بوو کە داوای لێبوردن بکا، گوتی: «دەزانم، زۆرباش تێدەگەم. ئێوەش وەک هەموو کەس دەتوانن لەگەڵ ژنێکی شۆخوشەنگ و دڵڕفێن سەری ئاشنایەتی داخەن کە، تافی لاویش بەوشتانەوە خۆشە. بەڵام... تەنیا دەمویست بزانم... وەک زانیومە

خاتوو ئیسۆتیلۆف یەک دوو مانگ لەمەوبەر زۆر تامەزرۆ بووە لەگەڵ ئالکسی فیۆدۆرۆویچ ئاشنا بێ و ئەگەر بە جلوبەرگی ڕاهیبانەوە بیبەی بۆلای، قەولی داوە بیست و پێنج ڕۆبلت بداتێ، ئەوەش لە ڕاستیدا عەسری ئەو ڕۆژە پێش هات کە ئەو جینایەتە سامناکە ڕوویدا، کە ئێستا ئەم دادگاییيەمان بۆ گرتووە. تۆش ئالکسی کارامازۆفت برد بۆ لای خاتوو ئیسۆتیلۆف و بیست و پێنج ڕۆبلت پاداش لەو خاتوونە وەرگرت. ئەوەی دەمویست لێتان ببیستم ئەمە بوو.»

ـ گاڵتە بوو... ئاخر نازانم ئەوە چ قازانجێکی بۆ ئێوە تێدایە... ئەو پارەیەم وەک گاڵتە لێوەرگرت... خەیاڵم بوو لە پاشان بیدەمەوە...

ـ کەوایە وەرتگرت... بەڵام تا ئێستا نەتداوەتەوە... داوتەتەوە؟

ڕاکیتین منجاندی: «ئەوە شتێکی ئاساییە و هیچ هەمیەتێکی نییە. وەڵامی ئەو جۆرە پرسیارانەش نادەمەوە... چونکە پارەکەی دەدەمەوە.»

سەرۆکی دادگا پەڕییە نێو قسەکانیان، بەڵام فێتی یۆکۆویچ گوتی لێپرسینەوەی لە ئاغای ڕاکیتین تەواو بووە. ڕاکیتین کە هەستی بە شەرمەزاری دەکرد و پێیوابوو سووک بووە، لە سەر سەکۆی شایەدیدانەکە هاتەخوارێ. ئەو شوێنەی قسەکانی لە سەر ئاپۆرەی خەڵکەکەی دانابوو، بایەخی نەما، قەڵافەتی فێتی یۆکۆویچیش، هەروا کە چاوی لە ڕۆیشتنەکەی ڕاکیتین دەکرد، دەتگوت بە چاوی ئەوە بە خەڵکەکە دەسەلمێنێ: «ئەوەش نموونەی ئەو مرۆڤە ڕووناکبیرەی کە تۆمەتباری دەکەن» لە بیرمە ئەو قسانەش بەبێ هاتوهاواری میتیا کۆتاییی پێنەهات. قسەکانی ڕاکیتین سەبارەت بە گرووشنکا بە جارێ ئیمان هەردەی کردبوو، لە ناکاو گوڕاندی: «بێرنارد!» دوای وەقسەهێنانی ڕاکیتین و دوایی هاتنی ئاخافتنەکەی، سەرۆکی دادگا لە میتیای پرسی قسەیەکی بۆ گوتن هەیە، میتیا بە تووڕەیی گوتی:

ـ لەو کاتەوە قۆڵبەست کراوم، پارەی لێ‌قەرز کردووم و نایداتەوە! ئەوە بێرناردێکی هەڵخواز و هیچوپووچە، ئیمانی بە خوداش نییە؛ کڵاوی لە سەر ئۆسقۆفیش نا!

میتیا دیسان بە هۆی قسەڕەقی و زمان پیسی سەرکۆنە کرا، بەڵام ڕاکیتین ئیتر ئابرووی پێوە نەمابوو.

شایەدی‌دانی سەروان ئیسنگیریفیش بێفایدە بوو، بەڵام لە بەر هۆیەکی جیاواز. سەروان بە جلوبەرگێکی کۆن و چڵکن و پۆتینی قوڕاوییەوە هاتبوو، پاشان بە هۆی چاوەدێریی ئەفسەرانی پۆلیسەوە دەرکەوت کە تەواو بەدمەستە. سەبارەت بە سووکایەتی پێکردنی لەلایەن میتیاوە پرسیاری لێکرا، بەڵام خۆی بوارد لە وڵامدانەوە.

ـ خودا خێری وەڕێبێنێ. ئیلیۆشچکا پێیگوتم لەو بارەوە هیچ نەڵێم. خودا لەو دنیا تۆڵەم بۆ دەکاتەوە.

ـ کێ گوتی وەڵامیمەدەوە؟ مەبەستت کێیە؟

ــ کوڕەکەم، ئیلیۆشچکا. لەلای بەردەکە گوتی: «باوە، باوە، زۆری سووکایەتی پێکردی!» ئەو ئێستا خەریکە دەمرێ...

سەروان لە ناکاو دای لە پڕمەی گریان و لە هەمبەر سەرۆکی دادگادا بە چۆکدا هات. لەگەڵ پێکەنینی خەڵکەکە بە پرتاو بردیانە دەرێ... ئەو کاردانەوەیەی دادوەر لە بەر چاوی گرتبوو، هیچ ئاکامێکی لێنەکەوتەوە.

فێتی یۆکۆویچ هەر هەلێکی بۆ دەرەخسا، هەوڵی دەدا ئەوپەڕی کەڵکی لێوەرگرێ. بە زانیاریی وردیش لە سەر چۆنایەتیی پەروەندەکە خەڵکی زیاتر تووشی سەرسامی دەکرد. بەم شێوەیە، بۆ وێنە تریفۆن بۆریسیچ چاکیی خۆی نیشاندا و بیروڕای سەبارەت بە میتیا زۆر دەمارگرژانە بوو. بە قامک حیسابیکرد کە یەکەم جار میتیا لە ماکرۆیە، حەتمەن سێ‌هەزار ڕۆبڵی خەرج کردووە و گوتی بە تەواوی لەوە دڵنیایە. «یان بڕێک لەوە کەمتر. ئەگەر بزانن چۆن پارەی بۆ ئەو کچە قەرەجانە هەڵدەڕشت! لادێیە ئەسپێونەکانیش وەنەبێ یەکی نیوە ڕۆبڵێکیان بۆ فڕێداتە سەر شەقام، بەڵکو هەموویان یەکی بیست و پێنج ڕۆبڵی پێدان. نازانی چەندەشیان لێدزی! هەرکەسەی بەشی خۆی پارەی دەرفاند و شرتوون دەبوو. لە جێی واش دز بە کێ دەگیرێ، هەر لە سەرەتای بەزم و ڕەزمەکەوە وەک گەڵای دار پارەی هەڵدەڕشت، ئیتر چۆن دەتوانی

مەچەکی دز بگری؟ لادێیەکانی ئێمە هەموویان دزن؛ ئەو دنیایان هەر لە بیر نییە. ئەو کچە لادێیانەی ئێمە نەزمێکی ئاوا فێر بوون، لەوەتا فێری ئەو دزی و فزییە بوون، گورزی خۆیان گرتووە. پێشتر زۆر دەستەنگ و هەژار بوون.» لەڕاستیدا، تەواوی خەرجی و دەستبڵاوییەکانی وەبیر هاتەوە و شاخ و باڵیشی پێدەدا. لە ئاکامدا هیچکەس بڕوای نەدەکرد ئەو شەوە هەزار وپێنج سەد ڕۆبڵی خەرجکردبێ و پاشماوەکەی لە توورەکەیەک نابێ و لەملی کردبێ. تریفۆن بۆریسیچ حەولیدەدا هەرچۆنێکە دادوەرەکان قانع بکا و پێیان بسەلمێنێ میتیا ئەو هەڵەخەرجییەی کردووە، بۆیە گوڕاندی: «سێ هەزار ڕۆبڵم بە دەستییەوە دی، وەک ئەو ڕۆژە لێمڕوونە، بەچاوی خۆم دیم. پێموایە دەزانم پارە بژێرم.» کاتێک فێتی یۆکۆویچ ناچار بوو لێپرسینەوەی لەگەڵ بکا، نەیویست قسەکانی بەدرۆ بخاتەوە، بەڵام دەستیکرد بە پرسیارکردن سەبارەت بە یەکەم بەزموڕەزم لە ماکرۆیە. یانی مانگێک بەر لە قۆڵبەست کرانی میتیا، تیمووتی و کابرایەکی دیکەی لادیی بە ناوی ئاکیم، لە دالانەکە گەڵایەکی سەد ڕۆبڵییان دیبۆوە کە میتیا لێیکەوتبوو، هەڵیدەگرنەوە و دەیبەن بۆ تریفۆن بۆریسیچ. ئەویش لە بەر خاتری ئەو کارەیان یەکی ڕۆبڵێکیان دەداتێ. پارێزەر پرسیی: «دەی، کاکی کاروانسەراچی ئەو سەد ڕۆبڵەت دایەوە بە دیمیتری کارامازۆف؟» تریفۆن بۆریسیچ دەیویست لاڕێ بڕوا و ڕاستی نەڵێ... بەڵام دوای ئەوەی ئەو دووکابرا لادێییەیان هێنا بۆ لێپرسینەوە، ناچار بوو دانیپێدابنێ کە ئەو سەد ڕۆبڵەی وەرگرتووە، بەڵام گوتی تەواوی پارەکەم بێکەم و زیاد داوەتەوە بە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ. «بەڵام چونکە ئەو بەڕێزە لەو کاتەدا مەستبوو، ڕەنگە لە بیرینەبێ.» بەڵام چونکە سەرەتا حاشای لەو سەد ڕۆبڵە کردبوو، ناچار بوو ئاکیم و تیمووتی بۆ سەلماندنی مەسەلەکە بێنن، هەربۆیە هەموو قازی و دادوەر و خەڵکەکەی تووشی دڕدۆنگی کرد و بڕوایان نەدەکرد ئەو سەد ڕۆبڵەی دابێتەوە بە میتیا. هەربۆیە یەکێکیتر لە شایەدە پڕمەترسییەکانی دادیاری دیسان ئیحتوباری چوو.

نۆبەی دوو لەهێستانییەکە هات بۆ شایەدی دان. ئەوان زۆر بە لووتبەرزی و سەربەخۆییەوە، بە دەنگێکی بەرز گوتیان بە جووت لە خزمەت خاک و وڵاتدا بوون. و «پان میتیا» سێ هەزار ڕۆبڵی پێ پێشنیار کردوون کە «شەرەفیان لێبکڕێ،» بڕێکی زۆریشی پارە بە دەستەوە بووە. پان مووسا پاولۆویچ قسەکانی پڕ بوو لە وشە و ڕستەی لەهێستانی، کاتێک تێگەیشت ئەو کارە لە بەرچاوی سەرۆکی دادگا و دادوەر قەدری دەباتە سەرێ، زیاتر بای لە خۆی کرد و بە پۆز و دەمارەوە، یەکسەر چووە سەر زمانی لەهێستانی. بەڵام فێتی یۆکۆویچ ئەوانیشی بە دەندووک پێوە کرد. دیسان تریفۆن بۆریسیچیان بانگ کردەوە، دوای تۆزێ خۆ گنخاندن، ناچار بوو دانیپیابنێ کە پان ورۆبلێفسکی بەستەیەکی گەنجەفەی ساختە لە جێی گەنجەفەکەی میتیا داناوە، پان مووسا یالۆویچیش لە ماوەی یارییەکەدا گزەی کردووە.

بەو شێوەیە پرمەترسیترین شایەدەکان بۆ لێپرسینەوە ڕاکێشکران و فێتی یۆکۆویچی بەناوبانگ توانیی هەموویان بەدناو بکا و تووشی شەرمەزارییان بکات. لەگەڵ ئەوەشدا دادوەر و کارناسانی دادگا پەسنی لێهاتوویی و شارەزایی فێتی یۆکۆویچیان کرد و لە خۆیان پرسی ئەم کارە پڕهونەر و ئەزموونەی بە کەڵکی چی دێ؟ چونکە دیسان دووپاتیدەکەمەوە هەموو هەستیان بە قورس بوونی سزاکەی میتیا دەکرد و جار لەگەڵ جار قورستر و حاشاهەڵنەگرتر دەبوو. بەڵام کاتێک متمانە و زاڵبوونی ئەو «چادووبازە گەورە»یان بۆ دەرکەوت و زانییان ئارام و لەسەرەخۆیە، چاوەڕوان مانەوە و لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت: «کەسایەتییەکی ئاوا» بێهوودە لە پترزبۆرگەوە نەهاتووە و کەسێکی وا نییە سەرنەکەوتوو بگەڕێتەوە.

# (٣)

## پزیشکانی کارزان و نیو کیلۆ فستق

پشکنینی پزیشکانیش ئاکامێکی پڕ قازانجی بۆ تۆمەتبار لێنەکەوتەوە. دواتر دەرکەوت کە فێتی یۆکۆویچ زۆری دڵ بەو کارە خۆش نەکردبوو. لە سەر داوا و پێداگریی کاترینا ئیوانا ئەو پزیشکە بەناوبانگە لە مۆسکۆوە هاتبوو. هەڵبەت بۆ پارێزەر زەرەدێکی بەدواوە نەبوو، لەوانەیە ناوچاوەکەی هێنابێتی و زۆریش بەقازانجی تەواو بێ. سەرەڕای ئەوەش چونکە بیروڕای پزیشکەکان دژی یەک بوون و لە سەر پشکنینی میتیا کۆک نەبوون، کارەکە ئاکامێکی سەیر و پێکەنینی لێکەوتەوە. پزیشکەکان لەم کەسانە پێکهاتبوون، پزیشکی مۆسکۆیی، پزیشکەکەی خۆمان هێرتێزنستیۆب، هەروەها پزیشکی لاو وارۆینسکی. ئەو دوانەی دوایی وەک شایەدی دادیاریش هاتنە سەر سەکۆی شایەدی.

یەکەم کەس کە وەک کەسایەتییەکی لێزان بانگکرا بۆ شایەدی، دوکتۆر هێرتێزنستیۆب بوو. ئەو پیرەپیاوێکی سەر و ڕدێن سپی و نزیکەی حەفتا ساڵی تەمەن بوو، مووی پێشەسەری تەنک بووبوو. کەڵەگەت نەبوو، بەڵام خاوەنی لەشێکی تێکسمڕاو و پتەو بوو. تەواوی خەڵکی شار ڕێزیان بۆ دادەنا. دوکتۆرێکی بە ویژدان و مرۆڤێکی بێوێنە و خاوەن ئیمان بوو. هێرەن هووتێر یان یەکێ لە برایانی هۆزی «مۆراویا» بوو، ئەوەم لێ ڕوون نییە. ساڵانێکی زۆر بوو لە نێو ئێمەدا دەژیا و پیاوێکی لەسەرەخۆ و خاوەن کەسایەتی بوو. زۆر دڵسۆز و میهرەبان بوو. بەخۆڕایی نەخۆشە دەستکورت و هەژارەکانی ماریجە دەکرد. سەری بە ماڵ و کەوێلی هەمواندا دەکرد و

سەردانی نەخۆش و لیقەوماوانی دەکرد و پارەی دەدانێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر خیشەسەر بوو. هەر ئەوەندە پێی بچەقاندبایە و لە قسەیەک سوور بووایەتەوە، ئیتر بە ئامان و زامان دەستی هەڵنەدەگرت و پاشگەزبوونەوەی نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی خەڵکی شارەکەمان ئاگادار بوون کە ئەو دوکتۆرەی لە سەر داوای کاترینا ئیوانا هاتبوو، لە ماوەی ئەو دوو سێ ڕۆژ مانەوەیدا، سەبارەت بە زانستی دوکتۆر هێرتێزنستیۆب قسەی بە تویکڵی کردبوو، ئەو دوکتۆرە بیست و پێنج ڕۆبڵی هەقی فەحسکردنی نەخۆش وەردەگرت، لەگەڵ ئەوەشدا چەند کەس لە خەڵکی شارەکە بە هەلیان زانی و بێئەوەی گوێ بدەنە گرانییەکەی خۆیان پیشاندا. ئەو کەسانەش، پێشتر نەخوشی دوکتۆر هێرتێزنستیۆب بوون، دوکتۆری مۆسکۆییش ڕەخنەی لەشێوەی ماریجەکردنەکەی گرتبوو. ئاخری وایلێهاتبوو هەرکە چاوی بە نەخۆشەکان کەوتبوو، پرسیبووی: «دەی، ئەوە کێ ئەو دەوا و دەرمانەی لە ملتان کردووە؟ هێرتێزنستیۆب؟ ها، ها، ها!» هەڵبەت دوکتۆر هێرتێزنستیۆب هەموو ئەو قسانەی پێدەگەیشتەوە، ئێستا هەر سێ دوکتورەکە یەک لەدوای یەک هاتنە دادگا و لێپرسینەوەیان لەگەڵ کرا.

دوکتۆر هێرتێزنستیۆب بەبێهیچ پێچانەوەیەک گوتی ئاشکرا دیارە تۆمەتبار حاڵی لە سەرخۆ نییە و ناساغە. پاشان بەڵگەی بۆ قسەکانی خۆی هێنایەوە، کە نامەوێ لە قەڵەمی بخەم، گوتی ئاڵۆزیی ڕۆحی و پەرۆشیی تۆمەتبار و هەموو کردەوەکانی ڕابردووی، هەر ئێستا ئاشکرایە، کاتێک داوایان لێکرد ڕوونتر بدوێ کە ئەو پەرۆشی و ناساغییەی بەچیدا دیارە، دوکتۆرە پیرە بە ساویلکەیی و ڕاشکاوی گوتی کە تۆمەتبار کاتێ هاتە بەردەمی دادگا «حاڵ و هەوایەکی تایبەتی» هەبوو«کە لەم بارودۆخەدا ناکرێ شتێکی ئاسایی بێ.» هەروەها «وەک سەرباز ڕاست چاوی لە پێش خۆی بڕیبوو» کاتێک هاتە ژووری «دەبوو بە شێوەیەکی سروشتی چاو لەلای چەپەی بکا، شوێنێک کە ژنانی لێدانیشتبوو، چونکە ئەو یەکێک لەو

کەسانەیە کە تامەزرۆی بینینی جوانانە و مەتحیان دەکا. ئێستاش دەبێ زۆر چاک بیر لە قسەی ئەو ژنانە بکاتەوە کە سەبارەت بە ئەو دەدوێن.»

ئەوەش بڵێم دوکتۆر زۆر چاکی زمانی ڕووسی دەزانی و قسەی پێدەکرد، بەڵام زاراوەی ئاڵمانی بە جوانی بە قسەکانییەوە دیار بوو، گوێشی بەوە نەدەدا چونکە پێیوابوو تەنانەت ڕووسییەکانیش ناتوانن وەک ئەو بە زمانی ڕووسی قسە بکەن و زۆریشی پێخۆش بوو لە قسەکانیدا کەڵک لە پەندی ڕووسی وەرگرێ. هەمیشەش دەیگوت پەندە ڕووسییەکان چاکترین و خۆیاترین پەندی دنیان. واچاکە ئەوەش بڵێم زۆر جار بە هۆی فکر و خەیاڵی زۆرەوە کاتی ئاخافتن ئاسایی‌ترین وشەی لە بیر دەچۆوە. هێندێ جاریش هەر وەبیری نەدەهاتەوە، ئەگەرچی بە باشی فێری بووبوو. کاتێک بە زمانی ئاڵمانیش دەدوا، هەروابوو، لەو کاتانەشدا بەردەوام دەستی ڕادەوەشاند و دەتگوت هەوڵدەدا وشە ون بووەکە بدۆزێتەوە، هەتا وشەکەشی وەبیر نەهاتبایەتەوە هیچکەس نەیدەتوانی هانی بدا بۆ درێژە پێدانی قسەکانی. ئەو قسەیەشی کە گوتی کاتی هاتنە نێو دادگاکەوە دەبوو میتیا چاو لە ژنەکان بکا، سرتوخورتی لە نێو خەڵکەکەدا سازکرد. تەواوی ژنانی شارەکەم ئەو دوکتۆرە پیرەیان خۆشدەویست؛ هەروەها دەشیانزانی لە ماوەی تەمەنیدا ژنی نەهێناوە و هەر بوخچەی نەکراوەیە، ڕەوشت پاک و ئیماندار بوو، بە چاوی ڕێزەوە چاوی لە ژنان دەکرد و ئەوانی بە ئافرێنراوێکی بەرز و پیرۆز دەزانی. هەربۆیە ئەو وتە چاوەڕوان نەکراوەی هەمووانی تووشی سەرسوڕمان کرد.

دوکتۆری مۆسکۆیی، کە بە نۆبەی خۆی بانگکرایە سەر سەکۆی شایەدان، لێبڕاوانە و بە توندی دووپاتی کردەوە کە بە بڕوای ئەو بارودۆخی ڕۆحیی تۆمەتبار «لە ڕادە بەدەر»ئاڵۆز و شێواوە. بەوردی و عالمانە باسی «ئاڵۆزی» و «شەیدابوون»ی کرد و گوتیشی بەو ڕووداوانەدا بۆمان دەردەکەوێ کە تۆمەتبار چەند ڕۆژ بەرلە قۆڵبەستکرانی، بێگومان تووشی ئەو باردۆخە ئاڵۆزە بووە، ئەگەر جینایەتێکیش بە دەستی ئەو ئەنجامدرابێ،

ئەگەر تەنانەت بە وشیاریشەوە ئەو کارەی کردبێ، دڵنیام تاڕادەیەک بێئیختیار ئەنجامیداوە. چونکە توانایی نەبووە بە سەر ئەو هەستەدا زاڵبێ کە بە جارێ گیان و ڕۆحی داگرتووە. بەڵام جگە لەو ئاڵۆزییە زووتێپەڕەش، دوکتۆر دەستنیشانیکرد کە تووشی نەخۆشیی ماخولیا بووە، گوتیشی لە داهاتوودا دەبێتە هۆی شێتی. (دەبێ بڵێم ئەم قسەیە بەشێوەی خۆمم دەگێڕمەوە؛ چونکە دوکتۆر بە زمانێکی زۆر عالمانە و پسپۆڕانە دەدوا.) لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «ئەم کردەوانە بەپێچەوانەی ئەقڵی سەلیم و مەنتقە. بێئەوەی ئاماژە بەو شتە بکەم کە نەمدیوە، یانی دیمەنی جینایەتەکە و تەواوی کارەساتەکە، پێرێ کە لەگەڵ من قسەی دەکرد، چاوەزیتەکەی جۆرێک بوو کە هەر باسی ناکرێ. جاری وا بوو هەر لەخۆڕا دەیدا لە قاقای پێکەنین. بەردەوام خۆی تووڕە و تۆسن دەنواند و قسەی سەیر و سەمەرەی دەکرد: «بێرنارد!» «خووخدە!» و «هەروەها قسەی بێسەرەوبەرەی دیکە.» بەڵام دوکتۆر بەتایبەت ماخولیابوونەکەی لەوەدا دەدی کە میتیا تەنانەت نەیدەتوانی سەبارەت بەو سێهەزار ڕۆبڵەش قسە بکا، کە پێیوابوو بەوهۆیەوە کڵاوی لە سەر نراوە و نەیدەتوانی بێڕقهەستانیش قسە بکات. ئەگەرچی دەیتوانی هێمنانە باسی چارەڕەشی و خەمەکانی بکا. بەپێی تەواوی ئەو ئاگادارییانە، تەنانەت لە ڕابردووشدا هەرکاتێک باسی سێهەزار ڕۆبڵەکە دەهاتە گورێ وا تووڕە دەبوو لەوانەبوو شێتبێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەمووان بە مرۆڤێکی پاک و بێتەماحیان دەناسی.

دوکتۆری مۆسکۆیی لە کۆتایی قسەکانیدا بە لەبزێکی تەوساوییەوە گوتی: «بەڵام لەمەڕ بیروڕای هاوکاری بیرمەندەوە، کە دەفەرمێ، کاتێک تۆمەتبار پێی نایە نێو دادگاوە دەبوو چاو لە ژنەکان بکا، نەک وشک و قیت تێپەڕێ و چاو لەپێشی خۆی ببڕێ، تەنیا ئەوەندە دەڵێم، جگە لەوەی بیروڕایەکی پێکەنینییە، هەر لە بنەڕەتدا تێگەیشتنێکی نادروستە. چونکە لەگەڵ ئەوە بە تەواوی کۆکم کە تۆمەتبار کاتی هاتنە نێودادگاکەوە، شوێنێک کە چارەنووسی مەعلووم دەبێ، نەدەبوو ڕاست چاو لەپێشی خۆی ببڕێ، بەڵام

پێشموایە نەدەبوو چاو لە ژنەکانیش بکا کە لای چەپ دانیشتبوون، بەپێچەوانە دەبوو چاو لەلای ڕاست بکا بۆ ئەوەی پارێزەرەکەی بدۆزێتەوە، یانی کەسێک کە تەواوی هیوای داهاتووی بە پارێزەریی ئەوەوە بەندە.» دوکتۆر توند و ڕاشکاوانە بیروڕای خۆی دەربڕی.

بەڵام وتاری چاوەڕوان نەکراوی دوکتۆر وارۆوینسکی بە دژایەتیی بیروڕاوە دانیشتووانی خستە جموجۆڵ و سرتوخورت. گوتی: «دڵنیام تۆمەتبار بەرلە قۆڵبەستکران و هەر ئێستاش شێواوە و تووشی نارەحەتیی ڕۆحی بووە. ئەوەش چەند هۆی هەیە: ئێرەیی، ڕق، مەینۆشین و... بەڵام ئەم باردۆخە ڕۆحییە کە ئاغایان پێیانوایە بۆتە هۆی «پەرۆشی»ی تۆمەتبار و هەر ئێستا باستانکرد، دروستنییە. بەڵام سەبارەت بەو قسەیەی کە دەڵێن تۆمەتبار کاتی هاتنە ژووریٚ دەبوو چاو لە ڕاست بکا یان لە چەپ، بە بڕوای من دەبوو ڕاست چاو لە پێش خۆی بکا، کە وادیارە هەرواشی کردووە. چونکە بەرەوڕووی شوێنی دانیشتنی قازی و دادوەرەکانە و چارەنووسی لە دەستی ئەوان دایە. بەمشێوەیە بۆمان دەردەکەویٚ هەر ئەو چاو لە ڕووبەڕووبڕێنە تووشی ئەو بارودۆخە شێواوی و ئاڵۆزییەی ئێستای کرد.» دوکتۆری لاو شایەدییە خاکەڕایانەکەی خۆی ئاوا بە گەرموگوڕی دوایی پێهێنا.

میتیا هەر لەوشوێنەوە کە دانیشتبوو هاواریکرد: «ئافەرین حەکیمباشی! ڕاست وایە، چاکی بۆچووی!»

میتیایان بێدەنگکرد، بەڵام بیروڕای دوکتۆری لاو شوێنێکی تەواوی لە سەر قازییەکان و کۆمای خەڵکەکە دانا. هەر ئەو جۆرەی کە دواتر دەرکەوت، هەموویان لەگەڵ ئەو هاوڕا بوون. بەڵام کاتێک دوکتۆر هێرتێزنستیۆبیان بۆ شایەدی بانگکرد، زۆر چاوەڕوان نەکراوانە، بە قازانجی میتیا شایەدیی دا. وەک دانیشتوویەکی قەدیمیی شارەکە، کە ساڵانێکی زۆرە بنەماڵەی کارامازۆف دەناسیٚ، هێندیٚ ڕاستیی پڕ بایەخی بۆ دادگا بەدەستەوە دا. لە ناکاو وەک ئەوەی شتێکی وەبیر هاتبێتەوە گوتی:

ـ بەڵام ئەم لاوە چارەڕەشە دەبوو ژیانێکی جیاوازی ببوایە. چونکە لە سەردەمی منداڵی و تافی لاویشدا خاوەنی دڵێکی پڕسۆز و میهرەبان بووە و ئەوەم زۆر چاک بۆ دەرکەوتووە. بەڵام پەندێکی ڕووسی هەیە دەڵێ: "پیاو تەنیا شعووری هەبێ باشە، چونکە مرۆڤێکی زیرەکی دیکە بچێ بۆ دیدەنیی، ئیتر حەجی دووبارە حەجە، چونکە ئەو کاتە نەک تەنیا شعوورێک بەڵکو دوو شعووری دەبێ."

دادوەر بێسەبرانە گوتی: «شعوورێک باشە، بەڵام دوو شعوور باشترە.» دادوەر دەیزانی پیرەپیاو زۆر بە شێنەیی دەدوێ و گوێی لەوە نییە کات بە فیڕۆ دەچێ، یان چ شوێنێک لە سەر گوێگرانی دادەنێ و زۆر بایەخ دەدا بە قسەی نەستەق و بێتامی ئاڵمانی. پیرەپیاو فرۆلاتاوی پێخۆشبوو.

دوکتۆر هێرتێزنستیۆب خیشەسەرانە درێژەی بە قسەکانی دا: «بەڵێ، بەڵێ، دەمویست هەر ئەوەتان عەرز بکەم. شعوورێک باشە، بەڵام دوو شعوور باشترە، بەڵام ئەو لەگەڵ سەرێکی پڕشعووری دیکە بەرەوڕوو نەبوو بۆیە شعووری خۆشی لەدەستدا. چۆنی لەدەستدا؟ ئەو وشەیەی لە بیر چووبۆوە.» ئەوەی گوت و بە بەر دەموچاوییەوە دەستی ڕادەتەکاند. «ئەها، بەڵێ، Spazieren.»

ـ بۆ گەشت و گەڕان؟

ـ ئەها، بەڵێ، بۆ گەشت و گەڕان، دەمویست ئەوەتان عەرز بکەم، ئەقڵی چووە بۆ گەشت و گەڕان و کەوتۆتە چاڵێکی قووڵەوە و خۆی بزر کردووە. لەگەڵ ئەوانەشدا کوڕێکی دڵناسک و حەقناسە. هەمیشە هەروابوو. چاکم لە بیرە، کوڕێکی تیشکەڵە بوو، باوکی دەستی لێداشتبوو و لە نێو حەوشەکەی پشتەوەدا بە پێخاوسی بەملاولادا هەڵدەسووڕا. پانتۆڵی شڕی لە پێدابوو.

پیرەپیاوی ڕاستویژ لە ناکاو بەجۆرێ هەست و سۆزەوە ئۆناق گەرووی گرت. فێتی یۆکۆویچ قوتبۆوە، وەک ئەوەی هەستی بەشتێک کردبێ، هەر لەڕێوەش تێگەیشت.

«بەڵێ، بەڵێ، ئەو کاتە جحێڵ بووم... ئەو کاتە... چلوپێنج ساڵم تەمەن بوو، تازە هاتبووم بۆ ئەمشارە. ئەو کاتە زۆرم دڵ بەو کوڕە سووتا. لە خۆمم پرسی چ دەبێ نیوکیلۆ... هین بکڕم. ناوەکەیم لە بیر چۆتەوە. نیو کیلۆ لەو شتەی وا منداڵ حەزی پێدەکەن، ناوەکەی چییە؟» پیرەپیاو دیسان دەستی بە ڕاوەشاندنی دەستیکرد. «بە دارەوەیە، لێیدەکەنەوە، زۆریش خۆشە...»

- سێو.

- ئاخ نا، نا. پێوانەی ئێوە بۆ سێو دەدانەیە، نەک کیلۆ... زۆریشە، ورد و ڕەقە. دەیخەنە دەمیانەوەو دەیشکێنن.

- فستق؟

پیرەپیاو هەر گوێشی لێنەبوو بۆ ئەو وشەیە داماوە، بە شێوەیەکی زۆر لەسەرەخۆ گوتی: «وایە، دەمویست فستقتان عەرز بکەم. نیو کیلۆم فستقم بۆ کڕی. چونکە پێشتر هیچکەس نیو کیلۆ فستقی بۆ ئەو کوڕە نەکڕیبوو. قامکم هەڵێنا و گوتم: «ڕۆڵە گیان Gott der vater.» پێکەنی و گوتی: « Gott der vater Gott der sohn». دیسان پێکەنی و گوتی: «Gott der sohn». « Geist Gott der heilige». ئەو کاتە دیسان پێکەنی و هەتا ئەو جێیەی کە دەیتوانی گوتی: «Geist Gott der heilige». ملی ڕێم گرت و ڕۆیشتم. دوو ڕۆژ دواتر بەڕێکەوت لەوێوە تێپەڕیم، هەرایکرد: «مامە Gott der vater, Gott der sohn»، بەڵام «Gott der heilige Geist»ی لە بیر چووبۆوە. بەڵام وەبیرم هێنایەوە و دیسان زۆرم زگ پێیسووتا. بەڵام بردیان بۆ شوێنێکی دیکە و ئیتر چاوم پێینەکەوت. بیستوسێ ساڵی پێچوو. ڕۆژێک سەرلەبەیانی، سەرم زوقمی پیریی لێنیشتبوو، لە نێو ژوورەکەمدا خەریکی متاڵا بووم لاوێکی جوانچاک و قۆز هاتە ژووری. نەمناسییەوە، بەڵام قامکی هەڵێنا و بە پێکەنینەوە گوتی: « Gott der vater, Gott der sohn, Gott der heilige Geist. هەر ئێستا هاتمەوە بۆ ئێرە و هاتووم سپاست لێبکەم کە

---

٢- کو، کوڕی، ڕۆحەلقودووس.

نیو کیلۆ فستقەکەت بۆ کڕیم. چونکە هیچ کاتێک نیو کیلۆ فستقیان بۆ نەکڕیوم. ئێوە تەنیا کەسێک بوون ئەو کارەتان کرد.» ئەو کاتە کەوتمەوە یادی ڕۆژگاری خۆشی لاوی و ئەو منداڵە پێخاوسەم وەبیر هاتەوە و دڵم لەرزی، گوتم: «تۆ لاوێکی بەئەمەکی، چونکە لە بیرت نەچوتەوە بە منداڵی ئەو نیو کیلۆ فستقەم بۆ کڕیوی.» پاشان باوەشم پێداکرد و دوعام بۆکرد و فرمێسک بە چاومدا هاتە خوارێ. پێکەنی، بەڵام ئەویش فرمێسکی هەڵوەراند... چونکە ڕووسی کاتێک دەبێ بگرین، ناگرین. زۆر جار پێدەکەنن و کەم وایە گریانیان بێ. بەڵام ئەو گریا، بەچاوی خۆم دیم گریا. ئێستاش، مخابن...!»

میتیا هەر لە شوێنی خۆی کە دانیشتبوو دەنگی هەڵێنا: «ئێستاش دەگریم، ئاڵمانی، ئێستاش دەگریم، ئەی پیاوی خودا.»

وەلحاسڵ ئەم بەسەرهاتە شوێنێکی باشی لە سەر خەڵکەکە دانا. بەڵام ئەوەی هەمووانی تووشی سەرسووڕمان کرد و قازانجی بۆ میتیا هەبوو، شایەدی دانی کاترینا ئیوانا بوو، کە هەر ئێستا باسیدەکەم. لە ڕاستیدا کاتێک شایەدەکانی تۆمەتبار شایەدییان دەدا، وایدەنواند کە میتیا نێوچاوانەکەی هێناوییەتی، ئەوەی جێی سەرنجیش بوو ئەوە بوو کە پارێزەریشی تووشی سەرسووڕمان کردبوو. بەڵام بەرلەوەی کاترینا ئیوانا بانگبکرێ بۆ شایەدی، ئالیووشا بانگکرا بۆ لێپرسینەوە، ئەویش ڕاستییەکی وەبیر هێنایەوە کە خەریک بوو گرینگترین خاڵی تۆمەتەکە ڕەتکاتەوە و بە قازانجی میتیا تەواو بێ.

## (٤)

# میتیا نێوچاوانەکەی هێناویەتی

ئەم بابەتە تەنانەت ئالیووشاشی تووشی سەرسوڕمان کرد. ئەو پێویست نەبوو سوێند بخوا، لە بیریشمە هەردوولا زۆر بەئەدەبانە و هاودڵانە قسەیان لەگەڵ دەکرد و ڕێزیان بۆ دادەنا. دیار بوو ناوی بە چاکە دەرکردووە. ئالیووشا زۆر خاکەڕایانە و لەخۆبردوو هاتە قسە، بەڵام هاودڵی و گرتنی لایەنی برا ناشادەکەی حاشای لێنەدەکرا. لە وەڵامی پرسیارێکدا ئاوای باسی براکەی کرد: ئەو ڕەنگە مرۆڤێکی تووڕە و جینگزی و دڵناسک بێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشەرەف و دەمارزل و دەستودڵبازە و لە کاتی پێویستدا گیان لە سەر دەستە و بۆ هیچ فیداکارییەک دریغی ناکا. سەرەڕای ئەوەش گوتی کە براکەی شەیدای گرووشنکایە و لەم دواییانەدا لەگەڵ باوکم کەوتبوونە ڕقەبەرایەتی و لە تامیان دەرکردبوو. بەڵام ئەوەی کە دەڵێن میتیا بۆ پارە ئەو قەتڵەی کردووە، زۆر بە تووڕەیی ڕەتیکردەوە، ئەگەرچی دانی پیانا کە سێهەزار ڕۆبڵەکە وەک کێچ کەوتبووە کەوڵی میتیا؛ ئەو پارەیەشی بە میرات و بەشەماڵی خۆی دەزانی کە باوکی دەستی بەسەردا گرتووە. ئەگەرچی ئەو زۆری گوێ بە پارە و ماڵی دنیا نەدەدا، تەنانەت بۆ ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەش بە ڕقەوە باسیدەکرد و پارەکە بە لایەوە گرینگ نەبوو، بەڵکو مەبەستێکی‌تری هەبوو. بەڵام سەبارەت بە ڕقەبەرایەتیی ئەو جووتە هەر وەک دادوەر باسیکرد - یانی ڕقەی نیوان گرووشنکا و کاترینا - خۆی گنخاند و تەنانەت حاشای لە چەن پرسیاریش کرد و وەڵامی نەدایەوە.

داوەر پرسیی: «ئایا براکەتان پێیگوتن، بە هەرشێوەیەکی بێ، دەیهەوێ باوکتان بکوژێ؟» گوتیشی: «هەڵبەت ئەگەر پێتخۆشنەبێ، دەتوانی وەڵام نەدەیەوە.»

ئالیووشا لە وڵامدا گوتی: «بەشێوەی ڕاستەوخۆ ئەوەی بە من نەگوت.»

ـ چۆن؟ بەشێوەی ناڕاستەوخۆ گوتی؟

ـ جارێکیان باسی ڕق و بێزاریی خۆی دەرهەق بە باوکم کرد و گوتی دەترسێ ڕۆژێک ڕقی هەستێ و خوێن بەری چاوی بگرێ و بیکوژێ.

ـ تۆش باوەڕت بە قسەکانی کرد؟

ـ بە داخەوە باوەڕم کرد. بەڵام هەمیشە لە سەر ئەوباوەڕە بووم کە لەوکاتە نەخسەدا هەستێکی پیرۆز ڕزگاریدەکا، هەر وەک ڕزگاریشیکرد. چونکە ئەو باوکمی نەکوشتووە.

ئالیووشا ئەم ڕستەی دوایی "ئەو باوکمی نەکوشتووە" بە دەنگێکی ئەوەندە بەرز گوت کە هۆڵی دادگاکە دەنگیدایەوە و دادوەر وەک ئەسپی جەنگی کە بە دەنگی کەڕەنا دادەچڵەکێ، ئاوا داچڵەکی.

ـ دڵنیا بە باوەڕی تەواوم بە سەداقەت و ئیمانی ئێوە هەیە و دەزانم لە بەر هەستی برایەتی لایەنی میتیا ناگری. بیروڕای سەیری ئێوە سەبارەت بەو کارەساتە هەر لە ڕۆژی یەکەمی لێپرسینەوەوە بۆ هەمووان ڕوون بۆتەوە. لێتان ناشارمەوە کە بیروڕای ئێوە شتێکی تاکەکەسییە و لەگەڵ بەڵگەکانی دیکەیدا دیارە یەک ناگرێتەوە. بۆیە پێموایە پێویستە پێداگرانە داواتان لێبکەم، بڵێن چی بۆتە هۆی ئەوەی بڕوات بە بێتاوانیی براکەت بێ، هەروەها ئەو تاوانە تایبەتییەیتر کە لە یەکەم لێپرسینەوەدا بە زەرەدی براکەت شایەدیت لە سەر دا؟

ئالیووشا ئارام و لەسەرەخۆ وەڵامیدایەوە: «یەکەم لێپرسینەوە، من تەنیا وەڵامی پرسیارەکانم دانەوە. لەلایەن خۆمەوە هیچ تۆمەتێکم نەداوەتە پاڵ ئیسمیر دیاکۆف.»

ـ لەگەڵ ئەوەشدا بە زەرەدی ئەو شایەدیت دا؟

- وتەکانی دیمیتری برام وایلێکردم. پییان گوتم کاتی قۆڵبەستکرانی ئەو چی ڕوویداوە و لە پێش لێپرسینەوەی منیشدا ئاماژەی بە ئیسمیر دیاکۆف کردبوو. وەک ئەو ڕۆژە لێم ڕوونە براکەم بێتاوانە، ئەگەر ئەویش ئەو قەتڵەی نەکردووە، کەوایە...

ـ کەوایە ئیسمیر دیاکۆف؟ بۆ ئیسمیر دیاکۆف؟ بۆچی وا دڵنیای کە براکەت بێتاوانە؟

- هەر دەبێ دڵنیا بم. دەزانم درۆ لەگەڵ من ناکا. چاو لە چاوی کەم دەزانم درۆ ناکات.

- هەر بە چاویدا دەزانی. جگە لەوە بەڵگەیترت نییە؟

- بەڵگەیەکیترم نییە.

- سەبارەت بە تۆمەتبار کردنی ئیسمیر دیاکۆفیش هیچ بەڵگەیەکت نییە جگە لە وتەکانی کاکت و حاڵاتی چاوی؟

- نا، بەڵگەیەکیترم نییە.

دادوەر لێرەدا دەستی لە لێپرسینەوە هەڵگرت. شوێنێک کە شایەدییەکەی ئالیووشا لە سەر خەڵکەکەی دانا، زۆر هیوابڕاوانە بوو. بەرلە محاکەمە، سەبارەت بە ئیسمیر دیاکۆف قسە و باس لە گۆڕێدا بوو، ئەم شتێکی بیستبوو، ئەوی دیکەش ئاماژەی بە شتێکیتر دەکرد، دەیانگوت ئالیووشا بەڵگەی چاکی سەبارەت بەبێ تاوانیی براکەی و تاوانبار بوونی ئیسمیر دیاکۆف کۆ کردۆتەوە، لە کۆتاییشدا دەرکەوت هیچی پێنەبوو، جگە لە باوەڕی ئەخلاقی و برایانە هیچ بەڵگەیەکی دیکەی بە دەستەوە نەبوو.

بەڵام فیتی یۆکۆویچ دەستیکرد بە لێپرسینەوە. ئالیووشا لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە کەنگێ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ باسی ڕق و تووڕەیی خۆی کردووە و گوتوویە لەوانەیە باوکت بکوژێ، بۆ وێنە ئەو وتەیەشی لە دوایین چاوپێکەوتنیان بەرلە ڕووداوەکە بیستبوو، داچڵەکی - دەتگوت تازە شتێکی وەبیر هاتۆتەوە و خەریکە تێیدەگا.

ـ هەر ئێستا ڕووداوێکم وەبیر هاتەوە کە بە تەواوی لە بیرم چووبۆوە. ئەو کاتە لێمڕوون نەبوو، بەڵام ئێستا...

هەر ئێستا دەرکەوت کە بۆ یەکەم جار بیرۆکەیەک بە زەینی گەیشتووە، بە تامەزرۆیی گێڕایەوە؛ ئێوارەی ئەو ڕۆژە لە سەر ڕێگای کلێساکە، لە دوایین چاوپێکەوتنیاندا لە ژێر دارەکە، میتیا لە سینگی خۆی دابوو، «لای سەرووی سینگیَ» چەند جاریشی لەسەریەک لە سینگی دابوو، گوتبووشی کەرەسەی کڕینەوەی ئابڕووی خۆی پێیە، ئەو کەرەسەیەش لێرەدا بوو، لە سەر سینگی. ئالیووشا لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «کاتێک لە سینگی خۆی دا، پێموابوو مەبەستی ئەوەیە لە دڵی دایە، ڕەنگە ورە و هێزێک لە دڵیدا بدۆزێتەوە کە خۆی لە دەست ئەو شوورەییە بەسامە دەرباز کا، کە لە بۆسەیدا بوو و تەنانەت نەیدەوێرا لای منیش دانیپێدابنیَ. دەبیَ ئەو ڕاستییەش بدرکێنم کە ئەو کاتە پێموابوو باسی باوکم دەکا، ئەو شوورەییەش کە تووشی ترس و دڵەخورپەی کردبوو، پێموابوو چوونە گیان باوکمە و دەیهەویَ بیَحورمەتیی پێبکا. هەر ڕاست لەو کاتەشدا بوو کە ئاماژەی بە شتێک لە سەر سینگی کرد، لە بیریشمە ئەم بیرۆکە بە زەینمدا هات کە دڵ لەو بەشەی سینگدا نییە، بەڵکو لە خوارترەوەیە و دەستی لە بەر ملی خۆی دا و بەردەوام ئاماژەی بەو شوێنە دەکرد. ئەو کاتە پێموابوو بیرۆکەیەکی گەوجانەیە، بەڵام ڕەنگە ئەو ئاماژەی بەو توورەکە چکۆڵە کردبیَ کە هەزاروپێنج سەد ڕۆبڵی تێدابووە!»

میتیا هەر لە جێی خۆیەوە و بە دانیشتنەوە هاواریکرد: «وایە، ڕاست وایە، ئالیووشا، دەستم لەو توورەکە چکۆلە دەدا. کە وەک نووشتوو لە ملم کردبوو.»

فێتی یۆکۆویچ ڕۆیی بۆ لای و داوایلیَکرد بێدەنگ بیَ. هەر لەو کاتەشدا وەک چەققە بە ئالیووشاوە نووسا و هەڵیپێچا. ئالیووشا کە بیرەوەرییەکانی هۆشی لێبڕیبوو، بە گڕوتینەوە بیروڕای خۆی دەربڕی و گوتی کە ئەوەی بۆ میتیا بووبووە هۆی شوورەیی لەوانەیە هەر ئەو هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵە بیَ

کە وەک نیوەی قەرزەکەی دەیداتەوە بە کاترینا ئیوانا. بەڵام هەروا لە سەر ئەوە سوور بوو کە قەرزەکە نەداتەوە و بۆ مەبەستێکی دیکە کەڵکی لێوەرگرێ ـ یانی هەڵگرتنی گرووشنکا، ئەگەر لەگەڵی بچێ.

ئالیووشا، بە شڵەژانێکی کتوپڕەوە گوتی: «هەروایە، دەبێ هەرواش بێ. کاکم چەند جار هاواریکرد کە نیوەی ئەو شوورەییە، بە نیوەی ئەو پارەیە (وشەی "نیوە"ی چەند جار دووپات کردەوە) دەتوانێ لەڕێوە خۆی دەرباز بکا، بەڵام بڕوا بەخۆنەبوون بەرۆکی پێگرتبوو... کە پێیوابوو ئەو کارەی لە دەست نایە!»

فێتی یۆکۆویچ تامەزرۆیانە پرسیی: «کەوایە دڵنیای و لێتڕوونە کە بە مست لەو شوێنەی سینگی خۆی دەدا؟»

ـ وەک ڕۆژ لێمڕوونە و دڵنیام، چونکە لەو کاتەدا پێم سەیر بوو: «دڵ لە خوارترەوەیە، بۆ بە مست لەو بەرملەی خۆی دەدا،» ئەو کاتە ئەو بیر کردنەوەی خۆم زۆر بەلاوە گەوجانە بوو... چونکە چاکم لە بیرە ئەو بیر کردنەوەیەم بە شتێکی گەوجانە زانی... ئەو کاتە زۆرم بیر لێکردەوە، بۆیە ئێستا وەبیرم هاتەوە. چۆن دەکرێ تا ئێستا لە بیرم چووبێتەوە! کاتێک گوتی ئەو شتەی پێیە؟ مەبەستی هەر ئەو توورەکە چکۆلە بوو، بەڵام ئەو هەزاروپێنج سەد ڕۆبڵەی بە کاترینا ئیوانا نەدایەوە. کاتێک لە ماکرۆیە قۆڵبەست کرا، هاواریکرد دەزانم، نەقڵەکەیم بیستووە ـ ئەو کارەی بە پڕشوورەییترین کردەوەی ژیانی خۆی دەزانێ، کاتێک دەیتوانی و بۆی دەلوا نیوەی (سەرنجبدەن، نیوەی) قەرزەکەی بە کاترینا ئیوانا بداتەوە، نەیتوانی خۆی ڕازی بکا و دەستی لە دڵی نەبۆوە، بۆیە وای بە چاک زانی لە بەر چاوی کاترینا ئیوانا دز بێ، بۆ ئەوەی دەست لەو پارەیە هەڵگرێ. ئەو قەرزەش بۆ ئەو ئازار و ئەشکەنجەیەکی ڕۆحی بووە!

دادوەر پەڕییە نێو قسەکان. داوای لە ئالیووشا کرد جارێکی دیکە تەواوی ڕووداوەکە بگێڕێتەوە. چەند جاریش لە سەر ئەم پرسیارە پێداگریی کرد کە

ئایا میتیا ئاماژەی بەشتێک دەکرد؟ ڕەنگە هەروا لەخۆڕا بە مست لە سینگی خۆی دابێ.

ئالیووشا گوڕاندی: «بەڵام بە مستی لێینەدا، بە قامکی ئاماژەی بۆ دەکرد و دەستی ئالیرەی خۆی دەدا... چۆن دەکرێ تا ئێستا بە تەواوی لە بیرم چووبێتەوە!»

سەرۆکی دادگا لە میتیای پرسی سەبارەت بە شایەدیی دوایین شایەد دەڵێ چی. میتیا قەبووڵیکرد و گوتی ئاماژەی بەو هەزاروپێنج سەد ڕۆبڵە کردووە کە لەو توورەکە چکۆلەدا وەک نووشتوو لە ملی کردووە و هەڵبەت مایەی نەنگ و شوورەییش بووە. کتوپڕیش گوڕاندی: «شوورەییەک کە ناتوانم حاشای لێبکەم، دزێوترین و شەرماوییترین کردەوەی ژیانم. دەمتوانی بیدەمەوە، بەڵام نازانم بۆ دەستم لە دڵم نەبۆوە. پێموابوو کاتیا بەچاوی دز لێمبڕوانێ باشترە لەوەی ئەو پارەیەی بدەمەوە. شوورەییترین بەشی ئەو کردەوەیەشم ئەوە بوو کە دەمزانی نایدەمەوە! هەق بە تۆیە ئالیووشا! سپاست دەکەم، ئالیووشا! ڕاست وایە.»

لێپرسینەوەی ئالیووشا بەم چەشنە کۆتایی پێهات. لایەنی گرنگ و جێی سەرنجی ئەو لێ پرسینەوەیە ئەمە بوو کە لانیکەم ڕاستییەک ڕوون بووبۆوە، ئەگەرچی ئەم ڕاستییە بەڵگەیەکی زۆر کەمبایەخ بوو، بەڵام بۆ سەلماندنی ئەوەش کە پارەی خۆی بووە و پاشەکەوتی کردووە، هەزاروپێنجسەد ڕۆبڵ بووە و تۆمەتبار لە ماکرۆیەش لە لێپرسینەوەی سەرەتاییدا گوتبووی ئەو هەزاروپێنج سەد ڕۆبڵە «هی خۆی» بووە، دیارە درۆی نەکردووە و تاڕادەیەک کارەکە سووکتر بووبوو. ئالیووشا خۆشحاڵ بوو. لەگەڵ ئەوەی لە خۆشیانا سوور هەڵگەڕابوو، گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی و دانیشتەوە. لە پەستا لە بەر خۆیەوە دەیگوت: «بۆ ئاوا لە بیرم چووبۆوە! چۆن دەبوو لە بیرم بچێتەوە! چی بووە هۆی ئەوەی ئێستا وەبیرم بێتەوە؟»

کاترینا ئیوانا بانگکرا بۆ سەرسەکۆی شایەدیدان. هەرکە پێینایە نێو هۆڵەکەوە جموجۆڵ کەوتە نێو خەڵکەکەوە. ژنەکان دەستیان بە چاو و

چاویلکەکانیاندا دەهێنا، پیاوەکانیش هەموو کەوتبوونە ملەقوتێ و جووڵەجووڵ: تاقمێک هەستانە سەرپێ بۆ ئەوەی جوانتر ببینن. دواتر هەموو گوتیان کاتێک هاتۆتە ژووری میتیا وەک "چۆڕی شیر" سپی هەڵگەڕاوە. کاترینا ئیوانا سەرتاپێ ڕەشپۆش بوو. خاکەڕایانە و تاڕادەیەک شەرمنانە هەنگاوی دەنا. مەحاڵ بوو بە ڕەنگی ڕوخساریدا بۆت دەرکەوێ کە شێواو و پەرۆشە؛ بەڵام ترووسکەی بڕیار لە چاوانیدا دیار بوو، ئەوەشم لە بیر نەچێ زۆربەی خەڵکەکە گوتیان لەو کاتەدا زۆر جوان و دڵڕفێن بووە. ئارام و بەڕوونی قسەی دەکرد. بەجۆرێک کە تەواوی حازریان لە هوڵەکەدا گوییان لێبوو. زۆر لەسەرەخۆ دەدوا، یان لانیکەم هەوڵیدەدا خۆی ئارام و بێخەم بنوێنێ. سەرۆکی دادگا لێپرسینەوەی خۆی بەئەدەب و ڕێزەوە دەستپێکرد، دەتگوت دەترسێ دەست بۆ ئەو پەلکی گوڵەناسکەی هەستی بەرێ، بە باسکردنی چارەنووسە تاڵەکەی بیژاکێنێ. بەڵام کاترینا ئیوانا لە وەڵامی یەکەم پرسیاردا، لێبڕاوانە گوتی کە پێشتر دەزگیرانی تۆمەتبار بووە؛ بە ئارامی گوتیشی: «بە ئارەزووی خۆی لێم جیابۆوە و بەجێی هێشتم...» کاتێک پرسیاری ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەیان کرد کە کاترینا ئیوانا دابووی بە میتیا بینێرێ بۆ خزمەکانی لە مۆسکۆ، ڕاشکاوانە گوتی: «ئەو پارەیەی نەدایە بینێرێ. لەو کاتەدا هەستمکرد کە زۆری پێویستی بە پارەیە... ئەو سێ‌هەزار ڕۆبڵەم پێدا بۆ ئەوەی ئەگەر حەزی لێبوو لە ماوەی ئەو مانگەدا بینێرێ. هەر پێویستیش نەبوو دواتر ئەو قەرزە تووشی دڵەخورپەی بکا.»

نامهەوێ تەواوی ئەو پرسیارانەی لێیکرا و تەواوی وڵامەکانی بەوردی دووپاتبکەمەوە. تەنیا دەچمە سەر کاکڵی شایەدییەکە.

وتەکانی بەم شێوەیە درێژە پێدا: «لە سەر ئەو باوەڕە بووم کە زۆر زوو پارە لە باوکی وەردەگرێ و ئەو مەبلەغە دەنێرێ. چونکە دەمزانی زۆر سادق و بێ‌تەماحە... لەگەڵ ئەوەی ڕاستیشە زۆر وازی وازییە... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆ پارە هیچکات دڵاودڵم نەکردووە و بڕوای لەوە زیاتریشم پێی هەبووە. چونکە دڵنیا بوو ئەو پارەیە لە باوکی وەردەگرێ، لەو بارەوە چەند

جار لەگەڵ من قسەیکرد. دەمزانی ڕقی لە باوکییەتی و هەمیشە لە سەر ئەوباوەڕە بوو باوکی زوڵمی لێکردووە و دەستی بە سەر بەشەماڵەکەیدا گرتووە. من وەبیرم نایە هەڕەشەی لە باوکی کردبێ. دڵنیام لای من باسی ئەوەی نەکردووە. ئەگەر لەو کاتەدا بهاتبایە بۆ لای من، سەبارەت بەو سێهەزار ڕۆبڵە خاترجەمم دەکرد، بەڵام بە داخەوە لەو ماوەیەدا نەهات بۆ دیدەنیم... منیش کەوتبوومە بارودۆخێکی نالەبارەوە و نەمدتوانی بانگهێشتنی بکەم...» بە دەنگێکی پتەو و ڕاشکاوانەوە دیسان درێژەی بە قسەکانی دایەوە: «لە ڕاستیدا هەقم نەبوو بۆ پارە بیخەمە ژێر گوشارەوە، چونکە پێشتر یارمەتیی دابووم و زیاتر لە سێهەزار ڕۆبڵی دابوومێ، هەروا خۆم بە بەر منەتی دەزانی. ئەگەرچی لەو کاتەدا نەمدەتوانی پێشبینی بکەم کە دەکەومە بارودۆخێکەوە و دەتوانم قەرەبووی بکەمەوە و لە منەتی بێمە دەرێ.» بە دەنگێکی جینگزیانەوە قسەی دەکرد. هەر لەو کاتەدا بوو فێتی یۆکۆویچ دەستیکرد بە لێپرسینەوەی.

فێتی یۆکۆویچ، کە هەستی بە شتێکی باش کردبوو، بە ئارامی گوتی: «ئەم ڕووداوە لێرە لە سەرەتای ئاشنابوونتاندا ڕوویدا؟» دەبێ لێرەدا لە کەوانەدا ئەوە بڵێم کە (ئەگەرچی فێتی یۆکۆویچ بە حیسابی کاترینا ئیوانا لە پترزبۆرگەوە هێنابوویان، بەڵام کاترینا ئیوانا مەسەلەی پێنجهەزار ڕۆبڵەکەی پووشبەسەر کردبوو کە ئەو کاتە «لەبەردەمی میتیادا بە چۆکدا هاتبوو» و پارێزەریش لەو بارەوە هیچی نەدەزانی. ئەوەش سەیر بوو تەنانەت کاترینا ئیوانا خۆشی هەتا دوایین سات نەیدەزانی، لە دادگا باسی ئەو ڕووداوە دەکا یان نا، بۆیە چاوەڕوانی ئیلهامێکی لە ناکاو بوو.)

نا، هەرگیز ناتوانم ئەو ساتانە لە بیر بەرمەوە. دەستیکرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە. هەموو شتێکی گوت، تەواوی ئەو ڕووداوانەی میتیا بە ئالیووشای گوتبوو، تەنانەت «بەچۆکدا هاتنەکەشی» و هۆیەکەشی. باسی باوکی و باسی چوونەکەی بۆ لای میتیا. بەڵام باسی ئەو مەسەلەیەی هەر نەکرد کە میتیا بە خوشکیدا هەواڵی لێناردبوو و پێشنیاری کردبوو کە واچاکە

بۆ وەرگرتنی پارەکە کاترینا ئیوانا خۆی بچێ بۆلای. تەنانەت ئاماژەشی پێنەکرد. بە دڵفراوانییەکی تەواوەوە ئەو مەسەلەیەی پووشبەسەر کرد و تەنانەت هەستی بە شەرمیش نەکرد و مەسەلەکەی وا باسکرد کە خۆی بە شێوەیەکی لەناکاو، بەهیوای شتێک چووە بۆ لای ئەو ئەفسەرە لاوە... تاکو داوای پارەکەی لێبکا. کەس شتی وای نەدیوە! هەر لەو کاتەدا کە گوێم ڕاگرتبوو، سڕبووم و ئازای ئەندامم وەلەرزین کەوت. هەموو حازریان گوێ قولاغ بووبوون و هەوڵیاندەدا مووبەموو لە وتەکانی حاڵی بن. ڕووداوێکی بێوێنە بوو. تەنانەت لە کچێکی سەربەخۆ و ڕۆحزلی وەک ئەویش، دان پیانانێکی ئاوا، ئەو جۆرە لەخۆبردوویی و فیداکارییە جێی باوەڕ نەبوو. بۆچی و بۆ کێ؟ بۆ ئەوەی پیاوێک نەجات بدا کە ئەو هەموو بێحورمەتی و سووکایەتییەی پێکردبوو؟ بۆ ئەوەی هەرچۆنێک بێ لانیکەم بڕێک لە سزاکەی داشکێنێ. لە ڕاستیدا قەلافەتی ئەفسەرێکی لاو - بەوپەڕی ڕێزەوە لە هەمبەر ئەو کچە پاک و بەستەزمانەدا تەعزیمی کرد و پێنجهەزار ڕۆبڵەکەی پێشکەش کرد یانی تەواوی دار ونەداری خۆی - بەشێوەیکی هاودڵانە و سەرنجڕاکێش زەق بۆوە. بەڵام... لەدڵمی دابوو، هەستیشمدەکرد ئەم مەسەلەیە لەوانەیە لە داهاتوودا ببێتە هۆی بوختان، (لە ڕاستیدا هەرواش بوو.) دواتر لە سەرانسەری شاردا بوو بە بنێشتە خۆشەکە و بە پێکەنینەوە دەیانگوت ئەو بەسەرهاتە ناتەواو بووە و خاتوو کاترینا هەمووی نەگێڕاوەتەوە - یانی، ئەو ئەفسەرە لاوە وێناچێ «بە تەعزیم و ڕێز و حورمەتێکی خاڵی و خۆڵییەوە» هێشتبێتی ئەو خاتوونە شۆخوشەنگە بڕوا. بەڕێز و ماقووڵترین ژنانی شارەکەمان دەیانگوت: «وای دانێین هەمووشی گێڕاوەتەوە و هیچی لێنەپەڕاندووە و بەسەرهاتەکەش هەر ئەوەیە، بەڵام دیسان لە کچێکی عازەب ناوەشێتەوە ئەو جۆرە هەڵسوکەوت بکا و پێبنێتە ماڵی لاوێکی ڕەبەنەوە، تەنانەت ئەگەر بۆ ناجەتدانی باوکیشی بێ!»

بڵێی کاترینا ئیوانا بەو تێگەیشتوویی و وریاییەوە، نەیزانیبێ خەڵک وا دەڵێن؟ حەتمەن لەوە گەیشتووە، سەرەڕای ئەوەش هاتە سەر ئەوەی هەموو

شتێک بڵێ، هەڵبەت، تەواوی ئەو دڕدۆنگییە دزێو و پڕسووکایەتییانە لەمەڕ هەقیقەتی بەسەرهاتەکەیەوە، دواتر پەرەی سەند و هەر لەو کاتەشەوە هەمووان کەوتنە ژێرکاریگەریی. بەڵام پارێزەر و قازییەکان، لە بێدەنگییەکی پڕ لە ڕێز و تاڕادەیەک شەرمەزارانەدا گوێیان لە کاترینا ئیوانا گرتبوو. دادوەر لە خۆی ڕانەدی تەنانەت پرسیارێکیش سەبارەت بەو مەسەلەیە بکا. فێتی یۆکۆویچ کورتە کڕنۆشێکی بۆ کاترینا ئیوانا برد. کەمتاکورتێ سەرکەوتنی بەدەستهێنابوو! کارەکەی زۆر بە باشی سەری گرتبوو. سەبارەت بە کەسێک کە داروندەاری خۆی کە پێنجهەزار ڕوبڵ بووە بە ئەنگیزەیەکی دەستودڵبازانەوە پێشکەشی بکا و پاشان نیوەشەو بۆ دزینی سێهەزار ڕۆبڵ باوکی خۆی بکوژێ ئەندیشەیەکی دژوارە و لەگەڵ هیچ ڕاستییەک یەکناگرێتەوە. فێتی یۆکۆویچ هەستیدەکرد ئێستا دەتوانێ، لانیکەم تۆمەتی دزییەکە لە سەر میتیا لابا. «پەروەندە»کە ڕەوالێکی جیاوازی بەخۆوە گرتبوو. شەپۆلێک لە هاودڵی بۆ میتیا وەڕێ کەوتبوو. بەڵام سەبارەت بە میتیا... بۆیان باسکردم کە یەک دوو جار لە کاتی قسە کردنی کاترینا ئیوانادا هەستاوەتەپێ و دیسان دانیشتۆتەوە. سەری بەرداوەتەوە و هەردوو دەستی بە بەرچاوییەوە گرتووە. بەڵام کاتێک شایەدی کۆتایی پێهات، لە ناکاو بە دەنگێکی گریاناوی و دەست ڕاداشتن بۆ لای کاترینا ئیوانا، هاواریکرد:

- کاتیا، بۆ ئاوا بەرەو فەوتان پاڵتپێوەنام؟

دای لە هۆڕژنی گریان و هۆڵی دادگاکە دەنگیدایەوە. لە ناکاو دانی بەخۆیدا گرت و دیسان هاواریکرد:

- ئێستا ئیتر مەحکووم بووم!

پاشان بە ددانەچیڕەوە دەستی لە بەر سینگی خۆی هەڵپێکا و قیتوڕەپ لە سەر جێی خۆی دانیشتەوە. کاترینا ئیواناش لە نێو هۆڵی دادگاکەدا مایەوە و لە جێی خۆی دانیشت. ڕەنگی پەڕیبوو، بە خەمباری ملی بەخوزدا گرتبوو.

ئەوانەی لە نزیکییەوە دانیشتبوون، وتیان ماوەیەکی زۆر ئازای ئەندامی دەلەرزی. گرووشنکا بانگکرا.

خەریکم لە ڕووداوێکی کتوپڕ نزیک دەبمەوە کە وێدەچێ ببێتە هۆی لە نێو چوونی یەکجاریی میتیا. چونکە لەو باوەڕەدام، هەموانیش هەر لە سەر ئەو باوەڕەن تەواوی پارێزەرەکانیش دواتر هەر ئەوەیان دەگوت ـ ئەگەر ئەو ڕووداوە نەقەومایە، تۆمەتبار لانیکەم دەبەخشرا. بەڵام ئەوە هەڵدەگرین بۆ دوایی. جارێ چەند وشەیەک سەبارەت بە گرووشنکا.

ئەویش سەرەتا ڕەشپۆش بوو، شاڵێکی ڕەشی گرانبایی لەملی هاڵاندبوو. بە هەنگاوی نەرم و بێدەنگ و لەنجەیەکی ئارام و سۆنەئاسایی کە تایبەتی ژنانی نەرمونۆڵە، ڕۆیی بۆسەر سەکۆی شایەدیدان. چاوی لە سەرۆکی دادگا بڕیبوو، بۆ لای چەپ یان لای ڕاستی نەدەڕوانی. بە بڕوای من لەو کاتەدا زۆر جوانی دەنواند. بەپێچەوانەی ئەوەی دواتر ژنان دەیانگوت، ڕێزەیەکیش ڕەنگی هەڵنەبزڕکابوو. هەروەها دەیانگوت ڕوخساری گرژومۆن و توورە و پڕ لەڕق بووە. بە بڕوای من تۆزێ شێوابوو، ئەویش بەو هۆیەوە کە دەیزانی ڕوانینی ئەم خەڵکە چەندە پشکێنەرە و لەوەش گەیشتبوو کە هەموو تامەزرۆی دەمگۆ و قسە و قسەلۆکن. ئەو زۆر لەخۆبایی بوو و تاقەتی ڕق و بێزاریی نەبوو. یەکێ لەو کەسانە بوو کە لەگەڵ دیتنی ڕق و بێزاری وەک ئەسپەندەر دەپەڕن و لە ئاگری تۆڵەدا دەسووتێن. هەڵبەت شەرم و حەیاش لەگۆڕێدابوو، کەوایە سەیر نەبوو ئەگەر جارجار لەبز و دەنگی دەگۆڕا. تاوێ لەبزی تووڕە و تۆسن و ڕقئەستوورانە بوو، تاوێکیتر نەرم و لەسەرەخۆ و لەخۆبوردوو. جاری وابوو جۆرێک دەدوا، دەتگوت کەوتۆتە ئەولای بێتفاقییەوە و گوێی لە هیچ شتێک نییە؛ وەک ئەوەی هەستبکا: «هەرچی دەبێ با ببێ چش، قسەی خۆم دەکەم...» سەبارەت بە ئاشنایەتیی لەگەڵ فیۆدۆرپاولۆویچ کورت و کرمانجی گوتی: «هەمووی قۆڕیاتە، بۆ خەتای من بوو ئەو دەستی لەکۆڵ نەدەکردمەوە؟» بەڵام دوای دەقیقەیەک هاتەوە قسە: «هەمووی خەتای من بوو. گاڵتەم بە هەردووکیان دەکرد. بە ئەویش و بە

باوکیشی، فریومدان و هەردووکیانم تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشە کرد. هۆکاری ئەو ڕووداوە من بووم.» سامسانۆفیش بە شێوەیەک ناوی هاتە گۆڕێ. گرووشنکا جینگزیانە و ڕووهەڵماڵدراوانە دەستیپێکردەوە: «پێوەندیی بە هیچکەسەوە نییە. ئەو نان بدە و پارێزەر بوو، کاتێک بێکەس و پاپەتی بووم و بنەماڵەکەشم پشتیان تێکردم ئەو باڵی وەسەر کێشام.» سەرۆکی دادگا بە شێوەیەکی بەئەدەبانە پێیگوت وەڵامی پرسیارەکان ڕاست و بێپێچوپەنا بداتەوە و باسی ئەوشتانە نەکا کە پێوەندیی بە باسەکەوە نییە، بۆیە گرووشنکا سوور هەڵگەڕا و چاوی ترووسکەی هات.

ئەو پاکەتە سێهەزار ڕۆبڵەکەی تێدابوو، چاوی پێینەکەوتبوو، بەڵام لەو «قوڕبەسەری چارەڕەشەی» بیستبوو کە فیۆدۆرپاولۆویچ پاکەتێکی هەیە سێهەزار ڕۆبڵی تێدایە. «بەڵام هەمووی گەوجییەتی بوو. من پێکەنینم دەهات. تەواوی دنیاشی پێبدایەم نەدەچووم بۆلای.»

دادوەر لێی پرسی: «مەبەستت لە «قوڕبەسەری چارەڕەش» کێیە؟»

- ئەو خوێڕییە بەڕەڵڵایە، ئیسمیر دیاکۆف، کە ئەربابەکەی خۆی کوشت و دوێشەو خۆی هەڵواسی.

هەڵبەت لەڕێوە پرسیاری لێکرا کە چ بەڵگەیەکی هەیە بۆ ئەو تۆمەتە ڕاشکاوانەیە؛ بەڵام دەرکەوت هیچ بەڵگەیەکی بۆ ئەوە نییە.

گرووشنکا گوتی: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ ئەوەی پێگوتم؛ باوەڕی پێبکەن.» گوتیشی: «ئەو ژنەی لێمان بووە دڕووی مەمووزین، تووشی ئەو فەوتان و چارەڕەشییەی کردووە؛ ڕاستتان دەوێ هەمووی خەتای ئەوە.» دەتگوت لەداخانا دەلەرزێ، ڕق و تووڕەیی بە دەنگییەوە دیار بوو.

دیسان لێیان پرسی مەبەستی کێیە.

- مەبەستم ئەو کچەیە، کاترینا ئیوانا. ناردی بە دوامدا، خولکی کردم بۆ چوکلێت و شیرینی، دەیویست هەڵمخەڵەتێنێ. شەرم و حەیا نازانێ، دەتوانم ئەوەتان بۆ ڕوون کەمەوە...

لێرە سەرۆکی دادگا بە ڕووناخۆشی وریایی پێدا ئاگای لە قسەکانی بێ.
بەڵام ئەم ژنە بەخیلە لە ناخەوە دڵی هەڵدەقرچا و گوێی لەو شتانە نەبوو.
دادوەر بە وەبیرهێنانەوەی بابەتێک لێی پرسی: «ئەو کاتەی لە ماکرۆیە دەستگیر کرا، هەموو دیتیان و بیستیان لە ژوورەکەی ئەوبەر دەرپەڕیت و گوڕاندت: «هەمووی خەتای ئەو بوو. ئێمە پێکەوە دەچین بۆ سیبیریا!» کەوایە ئێوە باوەڕتان کردبوو کە ئەو باوکی خۆی کوشتووە؟»
گرووشنکا لە وڵامدا گوتی: «لە بیرم نییە لەو کاتەدا چ هەستێکم بووە. هەموو هاواریان دەکرد ئەو باوکی خۆی کوشتووە، منیش خۆم بە تاوانبار زانی، پێموابوو لە بەر خاتری من کوشتوویەتی. بەڵام کاتێک گوتی کاری من نییە، لەڕێوە باوەڕم پێکرد، ئێستاش باوەڕی پێدەکەم و هەمیشەش باوەڕم پێیەتی. ئەو کەسێک نییە درۆی بەزرادا بێ.»
فێتی یۆکۆویچ دەستیکرد بە لێپرسینەوە. لە بیرمە جگە لە پرسیاری دیکە، سەبارەت بە ڕاکیتینیش پرسیاری لێکرد و ئەو بیست و پێنج ڕوبڵەی «پێتدا بۆ ئەوەی ئالکسی فیۆدۆرۆویچ کارامازۆف بێنێ بۆلات.»
گرووشنکا، بە ڕق و تووڕەییەوە بزەی هاتێ: «وەرگرتنی ئەو پارەیە سەیر نییە. ئەو هەمیشە بۆ وەرگرتنی پارە دەهات بۆلام: هەموو مانگێ لانیکەم سی ڕۆبڵی بە فێڵ و تەڵەکە لێدەساندم. ئەویش زیاتر بۆ زرەق و بەرق و خۆڕانان: ئەوەندەی بوو کە بتوانێ بەبێ یارمەتیی من بژیوی خۆی دابین کا.»
فێتی یۆکۆویچ، لەگەڵ ئەوەی هەستی بەشێوانی سەرۆکی دادگا کرد، پرسیی: «چی وایلێدەکردی دەرهەق بە ئاغای ڕاکیتین ئەوەندە دەستودڵباز بی؟»
ـ ئاخر ئەو کوڕی پوورمە. بەڵام هەمیشە داوای لێدەکردم ئەوە لەلای کەس باس نەکەم، ئاخر من بۆ ئەو مایەی سەرشۆڕی بووم.
ئەم ڕاستییە هەموانی تووشی سەرسوڕمان کرد؛ نە لە شار و نە لە کلێسە هیچ کەسێک لەوە ئاگادار نەبوو. تەنانەت میتیاش. گوتیان ڕاکیتین

کاتێ ئەوەی بیست لە جێی خۆی وشک بوو و سوورهەڵگەڕا. گرووشنکا بەر لە هاتن بۆ نێو هۆڵی دادگا، بیستبووی ڕاکیتین بە دژی میتیا شایەدیی داوە، بۆیە ئەوداخەی پێ ڕشت. تەواوی ئەو شوێندانانەی قسەکانی ڕاکیتین سەبارەت بە بەردەداری و ئاژاوەی سیاسی لە ڕووسیا، لە سەر خەڵکی دانابوو، بە یەکجاری لە نێو چوو. ڕاکیتین لە بەر چاوی خەڵک بوو بە تۆزی بەر با. فێتی یۆکۆویچ گەشابۆوە: ئەم بابەتەش ڕەحمەتێکی خودایی بوو. لێپرسینەوەی گرووشنکا درێژەی نەکێشا و هەڵبەت شایەدیدانەکەشی شتێکی تازەی تێدا نەبوو، بەڵام شوێنێکی ناخۆشی لە سەر خەڵکەکە دانا؛ کە شایەدیدانەکەی تەواو بوو دوور لە کاترینا ئیوانا، دیسان دانیشتەوە، سەدان چاوی قیناوی و تووڕە تێیڕامابوون. لە سەرەتاوە تا کۆتایی شایەدیدانەکەی، میتیا زمانی نەگەڕا. چاوی لە بەردەمی بڕیبوو، وا دانیشتبوو دەتگوت بۆتە بەرد.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ بانگکرا بۆ شایەدی.

# (٥)

## بەدبەختییەکی کتوپڕ

چاکتر وایە بڵێم ئەو بەرلە ئالیووشا بانگکرابوو، بەڵام دەرگاوان بە سەرۆکی دادگای ڕاگەیاند کە شایەد بە هۆی نەخۆشییەوە ناتوانێ لەو ساتەدا ئامادەبێ. بەڵام تۆزێ بێتەوە سەرخۆ ئامادەیە شایەدی بدا. بەڵام دەتگوت کەس گوێی لەوە نەبووە و دواتر ئاشکرا بوو.

سەرەتا هاتنە ژوورەوەی سەرنجی کەسی ڕانەکێشا. شایەدانی سەرەکی، بەتایبەت ئەو دوو خاتوونە ڕەقیبە لێپرسینەوەیان لەگەڵ کرابوو. خەڵکەکە ئیتر ئەو کونجکاوییەی پێشوویان نەمابوو و کەمتاکورتێ هەستیان بە ماندووبوون دەکرد. هێشتا چەند شایەدی دیکە، کە دوای ئەو هەموو لێپرسینەوەیە، ئیتر وێنەدەچوو زانیاریی زیاتر بەدەستەوە بدەن، پێویست بوو. کات تێدەپەڕی. ئیوان فیۆدۆرۆویچ، بێئەوەی چاو لە هیچکەس بکا، سەری بەردابۆوە و هیواش و بە هەنگاوی ورد، کە لەوە دەچوو لە بیر و خەیاڵێکی خەماویدا نوقم بێ، بەرەو سەکۆی شایەدیدان ڕۆیشت. جلوبەرگەکەی ناحەز نەبوو، بەڵام ڕوخساری لانیکەم شوێنێکی ناخۆشی لە سەر من دانا: زەرد هەڵگەرابوو، ڕەنگی مردووی لێنیشتبوو. چاوی کز و لێڵ؛ سەری هەڵێنا و بە هێواشی چاوی بە نێو دادگاکەدا گێڕا. ئالیووشا هەستا سەرپێ و هەناسەیەکی هەڵکێشا: «پەککو!» ئەوەم لە بیرە، بەڵام هیچکەس نەیدی.

سەرۆکی دادگا پێی ڕاگەیاند کە ئەو لەو شایەدانە نییە کە سوێند بخوا، دەتوانێ وەڵام بداتەوە یان ئەگەر پێیخۆشنییە خۆی لە وڵامدانەوە ببوێرێ،

بەڵام دەبێ لەڕووی ویژدانەوە شایەدییەکەی بدا و... ئیوان فیۆدۆرۆویچ گوێی شلکردبوو و بە ماتی چاوی تێبڕیبوو، بەڵام ڕوخساری وردە وردە بە بزەیەک کرایەوە و هەرکە وتەکانی سەرۆکی دادگا تەواو بوو کە بە سەرسورمانەوە چاوی لێدەکرا، دای لە قاقای پێکەنین و بە دەنگێکی بەرز پرسیی: «دەی، چیی‌تریش؟»

بێدەنگی باڵی بە سەر دادگاکەدا کێشابوو، هیچکەس سریوەی لێوە نەدەهات. شتێکی سەیر لە گۆڕێدا بوو. سەرۆکی دادگا ناڕەحەتیی خۆی دەربڕی و هەر لەو کاتەدا کە چاوی لە زابت دەگێڕا، گوتی:

ـ لەوەناچێ حاڵتان باشبێ!

ئیوان فیۆدۆرۆویچ بە ئارامی و ڕێزەوە لە ناکاو وەڵامی دایەوە: «قوربان، خاترجەمبە. حاڵم باشە و دەتوانم مەبەستێکی سەرنجڕاکێشتان بۆ باسکەم.»

سەرۆکی دادگا، هەروا بە دڕدۆنگییەوە، لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «قسەیەکی تایبەتت بەدەستەوەیە؟»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ سەری داخست، تۆزێ مات بوو، پاشان سەری هەڵێنا و بە منجەمنج وەڵامی دایەوە:

ـ نا... قسەیەکی تایبەتم بەدەستەوە نییە.

دەستیانکرد بە لێپرسینەوە. ئەویش زۆر بە کورتی و شێوەیەک حاشاکردن وەڵامیدەدایەوە، بەجۆرێک کە جار لەگەڵ جار زیاتری بێزاریی پێوە دیار بوو. ئەگەرچی ماقووڵانە وەڵامیدەدایەوە. وەڵامی زۆربەی پرسیارەکانی بە «نازانم» دەدایەوە. سەبارەت بە حیساب و کیتابی میتیا و باوکی هیچ ئاگادارییەکی نەبوو. گوتی: «پێمخۆشنەبوو خۆ لەو کارانە هەڵقوتێنم.» لە زمانی میتیای بیستبوو کە هەڕەشەی لە باوکی کردبوو. نەقڵی ئەو سێ‌هەزار ڕۆبڵەی نێو پاکەتەکەشی لە ئیسمیر دیاکۆف بیستبوو کە بۆ گرووشنکای داناوە.

بە ڕوانینێکی خەماوییەوە، لە ناکاو دەستی لە قسە هەڵگرت: «نا، نا، هیچ، قسەیەکم نییە بە عەرزی دادگای بگەیەنم.»

سەرۆکی دادگا گوتی: «وادیارە حاڵت باش‌نییە. تێدەگەم چ مەبەستێکت هەیە.» پاشان ڕوویکردە دادوەر و پارێزەر تاکو داوایان لێبکا، ئەگەر بە پێویستی دەزانن لێپرسینەوەی لەگەڵ بکەن، بەڵام ئیوان لە ناکاو بە دەنگێکی گڕەوە داوایکرد:

- گەورەم، لێمگەڕێن با بڕوم، حاڵم زۆر خراپە.

دوای ئەو قسانە، بێ‌ئەوەی چاوەڕێی ودمی دادگا بێ، وەرسووڕا تاکو لە دادگا بڕواتە دەرێ. بەڵام دوای هەڵێنانەوەی چەند هەنگاو، بە ئارامی ڕاوەستا، وەک ئەوەی بڕیارێکی کتوپڕی دابێ. بە ئارامی زەردەیەکی گرت و گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی.

- گەرورەم؟ من وەکو کچەلادێییەکە وام... دەزانی چیرۆکەکەی چۆنە؟ «هەڵدەستم، ئەگەر پێمخۆشبێ، دەڕۆم ئەگەر پێمناخۆشبێ.» دەیانویست کراسی بووکێنی لەبەرکەن و بیبەن بۆ کلێسە بۆ ئەوەی بیدەن بە شوو، کەچی لە پەستا دەیگوت: «ئەگەر پێمخوش بێهەڵدەستم، دەڕۆم ئەگەر پێم‌ناخۆش بێ.» ئەو چیرۆکەم لە کتێبێکی فۆلکلۆریدا خوێندۆتەوە.

سەرۆکی دادگا بە لەبزێکی تووڕەوە پرسیی: «مەبەستت چییە؟»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە ناکاو بەستەیەکی پارە لە گیرفانی دەرهێنا. «دەی ئەمە، ئەمەش پارەکە... ئەو پارەیەی لە نێو پاکەتەکەدا بوو» (بەسەر ئاماژەی بەو مێزە کرد کە بەڵگە و شتەکەی لە سەر بوو) باوکم لە سەر ئەوە بە کوشت چوو. ئەو پارانە لە کوێ دانێم؟ ئاغای زابت ها وەرە بیگرە.»

زابت بەستەکەی وەرگرت و دایە دەست سەرۆکی دادگا.

سەرۆکی دادگا بە سەرسوڕمانەوە پرسیی: «ئەگەر ئەمە ئەو پارەیە بێ، لە کوێوە کەوتۆتە دەست ئێوە،

- دوێنێ لە ئیسمیر دیاکۆفی پیاوکوژم وەگرت... بەر لەوەی خۆی بخنکێنێ، لەلای بووم. ئەو باوکمانی کوشتووە، نەک دیمیتری برام. ئەو باوکمانی کوشت و منیش ئەو کارەم پێکرد... کێ هەیە مردنی باوکی خۆی بە ئاوات

نەخوازێ؟ لە ناکاو سەرۆکی دادگا لە دەمی دەرپەڕی: «ئەرێ تۆ خۆت دەزانی دەڵێی چی، تێکەڵت نەکردووە؟»

- پێموایە ئەقڵم پارسەنگ هەڵناگرێ و تێکەڵیشم نەکردووە... زۆریش لە ئێوە باشتر ئەقڵم کار دەکا هەر نازانم چی لەو زەینە چەپەڵەی ئێوە دایە... هەروەها لە تەواوی ئەم ڕوخسارە دزێوانەی دیکەشدا...» ئیوان ڕووی کردە خەڵکەکە و بە ڕق و تووڕەیی و ددانەچیڕەوە گوتی: «باوکم کوژراوە و ئەوانە وادەنوێنن ترسیان لێنیشتووە. لەگەڵ یەکتریش هەروان و خۆیان وا نیشان دەدەن. درۆزنانە! هەموویان مردنی باوکیان بەئاوات دەخوازن، جانەوەرێک جانەوەرێکی دیکە هەڵدەلووشێ... ئەگەر مەسەلەی باوککوژی لە گۆڕێدا نەبوایە، تووڕە دەبوون و بە ڕووترشی بەرەو ماڵ دەبوونەوە. ئەوانە شانۆیان دەوێ! نان و لۆتی بازاڕییان دەوێ. » ئەوە من ئێستا قسە دەکەم! ئاوتان نییە. لەڕێی خودادا چۆڕێ ئاوم دەنێ، گەرووم وشک بووە!» لە ناکاو بە هەردوو دەستی توند سەری خۆی گرت.

زابت لەڕێوە چوو بۆ لای. ئالیووشا هەستا سەرپێ و نەڕاندی: «حاڵی باش نییە. باوەڕ بە قسەکانی مەکەن: یاوی مێشکی هەیە.» کاترینا ئیوانا بێئیختیار هەستا و لە ترسانا لە جێی خۆی وشک بووبوو و چاوی لە ئیوان فیۆدۆرۆویچ بڕیبوو. میتیاش هەستا سەرپێ و تامەزرۆیانە چاوی لە براکەی دەکرد و بە بزەیەکی سەرسوڕماوانەوە گوێی بۆ ڕاگرتبوو.

ئیوان دەستی کردەوە بە قسە کردن: «خەمتان نەبێ. شێت نەبووم، من تەنیا قاتڵم و بەس.» لە ناکاو بە دەلیلەوە گوتیشی: «چاوەڕوانیتان لە قاتڵێک نەبێ زمان پارانەوە بدوێ.» بە شێوەیەکی سەیر دای لە قاقای پێکەنین.

دادوەر بە شڵەژانێکی ئاشکراوە سەری لە سەرۆکی دادگا بردە پێشێ. دوو قازیی دیکەش بە شڵەژاوی دەستیانکرد بە سرتوخورت. فیێتی یۆکۆویچ

---

٣- ڕۆمیەکان داوای نان و لۆتی بازاڕییان دەکرد، قەیسەرانی ڕۆمیش بۆیان دابین دەکردن، بۆ ئەوەی خەڵکی ڕازی ڕاگرن.

هەروا کە گوێی ڕاگرتبوو، گوێقوڵاغ ڕاوەستا: بێدەنگییەکی پڕ لە چاوەڕوانی هۆڵەکەی داگرت. سەرۆکی دادگا بە پەلە خۆی ڕاستەوپاستە کرد:

ـ کاکی شایەد، قسەکانت ڕێی تێناچێ و تێشیناگەین. ئەگەر دەتوانی تۆزێ لەسەرەخۆ بە وردی ڕووداوەکە بگێڕەوە... هەڵبەت ئەگەر قسەیەکت بۆ گوتن پێ بێ. قسەکانت چۆن دەسەلمێنی... ئەگەر لە ڕاستیدا پەرێشانحاڵ بییت؟

«دەردەکە هەر ئەوەیە، بەڵگەم بە دەستەوە نییە. ئەو ئیسمیر دیاکۆفە سەگەش لەو دنیایەی دیکەوە بەڵگەیەک ناخاتە پاکەتێکەوە و بۆتانی بنێرێ. ئێوە جگە لە پاکەت بیر لە هیچ شتێکی دیکە ناکەنەوە پاکەتێکیان بەسە.» ئیوان بە شێوەیەکی مات و خەیاڵاوی بزەی هاتێ و درێژەی پێدا: «شایەدم نییە... مەگین شایەد تەنیا کەسێک.»

شایەدەکەت کێیە؟

ئیوان گوتی: «عالیجەناب، شایەدەکەم کلکی هەیە، ئەوەش بەپێچەوانەی ڕێسای باوە!n'existe point le diabie» لە ناکاو گوتیشی: «گوێی مەدەنێ. ئەو شەیتانێکی هیچوپووچ و فەقیرۆکەیە.» پاشان دەستی لە پێکەنین هەڵگرت و وەک ئەوەی بە شێوەیەکی نهێنی قسە بکا، درێژەی پێدا: «بێگومان لێرەیە، ڕەنگە لە ژێر ئەو مێزەدا بێ کە بەڵگەکانی لە سەرە. ئەگەر لەوێ دانەنیشێ، ئەی لە کوێ دانیشێ؟ گوێتان لە من بێ. پێمگوت نامەوێ بێدەنگ بم، ئەویش سەبارەت بە گۆڕانکاریی کتوپڕی زەویناسی قسەی دەکرد... گەلحو! یاڵڵا ئەو ڕمووزنە نەجات دەن... خەریکی خوێندنی سروود بووە. هەر لە بەر ئەوەیە دڵی بێخەمە! ڕاست وەک ئەو مەستە گەڕۆکەی لە سەر شەقام هاوار دەکا: «وانکا چووە بۆ پترزبۆرگ،» منیش بۆ دوو چرکە چێژ وەرگرتن میلیاردها میلیارد بدەم. من ناناسن! پەکو، سەرلەبەری ئەو مەسەلەیە گەوجانەیە! یاڵڵا بەجێی ئەو قوڵبەستمکەن! خۆ لەخۆڕا نەهاتووم... بۆ، بۆ هەموو شتێک ئاوا گەوجانەیە...»

پاشان بە شێنەیی و ئەگەر بکرێ بڵێین خەمبارانە، دەستیکرد بە چاوگێڕان بەدەوری خۆیدا. بەڵام دادگا بە جارێ شڵەژا بوو، ئالیووشا بە پەلە چوو بۆلای، بەڵام زابتەکە قۆڵی ئیوانی گرتبوو.

ئیوان چاوی لە چاوی براکەی بڕی و گوڕاندی: «بۆ وا دەکەی؟ لە ناکاو شانی زابتی گرت و دای بە عەرزدا. بەڵام پۆلیس لەوێ ئامادەبوون و دەستبەجێ ئیوانیان قوڵبەستکرد. بە تووڕەیی دەینەڕاند. هەتا بردیانە دەرێ، هەر نەڕاندی و کەس نەیدەزانی دەڵێ چی.

دادگا بە جارێ شڵەژا. ئەوەی ڕوویدا هەموویم بە جوانی لە بیر نەماوە. خۆشم تووشی دڵەخورپە بووبووم و نەمدەتوانی پێ و شوێنی مەسەلەکە بگرم. بەڵام دەزانم دوای تاوێک، هەموو شتێک هەمیسان ئارامبۆوە و هەمووان تێگەیشتن چ ڕووداوێک قەوماوە، زابت بۆ سەرکۆنە کردنی فەرمی هاتە نێو هۆڵی دادگاکەوە، ئەگەرچی ماقووڵانە گوتی کە حاڵی شایەد زۆر باش بووە و دوکتۆر سەعاتێک لەمەوبەر فەحسی کردووە، بەڵام بەرلە هاتنە نێو هۆڵی دادگاکەوە لە پەستا قسەی کردووە. بەجۆرێک کە نەکراوە پێشبینیی ئەو بارودۆخە بکرێ ـ ئەویش لە ڕاستیدا، زۆری پێداگری لە سەر شایەدیدان کردووە. بەڵام بەر لەوەی خەڵکەکە خاو ببنەوە و ئەو دیمەنەیان لە بیر بچێتەوە، ڕووداوێکی دیکە قەوما. کاترینا ئیوانا تووشی هێرشی عەسەبی بوو. هۆن هۆن دەگریا و دەیقیژاند، بەڵام نەیدەویست لە دادگا بڕواتە دەرێ. هەوڵیدەدا و دەپاڕایەوە دەرینەکەن. لە ناکاو بە دەنگی بەرز بە سەرۆکی دادگای گوت: «دەبێ شایەدییەکی دیکە بدەم، ئەویش زۆر خێرا...! ئەوەش بەڵگەیەک، نامەیە... هانێ بیخوێننەوە، زووکەن زوو! نامەی ئەو ڕموزنەیە... ئەو پیاوەی هۆ لەوێیە!» ئاماژەی بە میتیا کرد. «ئەوبوو باوکی خۆی کوشت، بە خوێندنەوەی ئەو نامەیە تێدەگەن. بۆی نووسیم چۆن دەیهەوێ باوکی بکوژێ! بەڵام ئەوەی دیکەیان نەخۆشە. مێشکی کار ناکا. سێ ڕۆژە زانیومە شێواوە!» کاترینا ئیوانا، بە دڵەخورپەوە هەروا دەینەڕاند.

زابت نامەکەی لە کاترینا ئیوانا وەرگرت کە بۆ سەرۆکی دادگای ڕاداشتبوو. ئەویش لە سەر کورسییەکە دانیشتەوە و هەردوو دەستی بە دەموچاویەوە گرت، لەگەڵ ئەوەی ئازای ئەندامی دەلەرزییەوە و لە ترسی ئەوەی لە دادگای بەرنە دەریّ، گریانەکەی خۆی دەخواردەوە. هەر بۆیە لە بەر خۆیەوە بە نەرمی فرمێسکی هەڵدەوەراند. ئەو بەڵگەیەی کە ڕادەستی دادگای کرد، هەر ئەو نامەیە بوو کە میتیا لە مەیخانەی میترۆپۆلیس نووسیبووی. ئیوان فیۆدۆرۆویچ وەک «بورهانی بیرکاری» باسی ئەوەی کردبوو، مخابن...! ڕەوتەکە بەو بارەدا شکایەوە و گلۆڵەی میتیا کەوتە لێژی. ئەگەر بە هۆی ئەو نامەیەوە نەبوایە، لەوانە بوو چارەنووسی بگۆڕدریّ و فحێل بیّ، یان لانیکەم سزاکەی زۆر مەترسیدار نەدەبوو. دووپاتیدەکەمەوە، تێگەیشتن لە هەموو ڕووداوە ورد و درشتەکان دژوار بوو. ئەوەی لە درێژەی دادگایی کردنەکەدا ڕوویدا، هەروا لە زەینمدا تێکەڵوپێکەڵ بووە. پێموایە سەرۆکی دادگا ئەو بەڵگەیەی دەستاودەست پیشان هەموو قازی و پارێزەر و لێژنەی داوەران دابوو. تەنیا شتێک کە بە جوانی لە بیرم ماوە، شێوەی لێپرسینەوەیان لە شایەدەکان بوو. کاترینا ئیوانا، لە وەڵامی سەرۆکی دادگادا کە لێی پرسی حاڵت بە تەواوی هاتۆتەوە سەرخۆ یان نا، بیّسەبرانە گوتی: «ئامادەم، بەڵیّ ئامادەم!» هەروەها گوتی: «بۆ وڵام دانەوەتان دانامێنم.» دیار بوو هەروا دەترسیّ، نەکا نەهێڵن شایەدییەکەی بدا. داوایان لێکرد بەوردی بۆیان باسبکا ئەو نامەیە چی بوو و بەپێی چ هەلومەرجێک بە دەستی گەیشتووە.

«ڕۆژێک بەرلە ڕووداوەکە بە دەستم گەیشت، بەڵام ئەوەی ڕۆژی پێشتری نووسیبوو، لە مەیخانە - یانی، دوو ڕۆژ بەرلەوەی ئەو تاوانە ئەنجامبدا.» بە هەناسە بڕکێوە دەنگی هەڵێنا: «چاو لێکەن، لە سەر سیاییەکە نوسیویەتی، ئەو کاتە ڕقی لە من بووە. چونکە ئەو سیّهەزار ڕۆبڵەش بە من قەزدار بوو... ئاخ، لە بەر خوێڕیەتیی خۆی، خەفەتی ئەو سیّهەزار ڕۆبڵە دایگرتبوو و دنیای لە خۆی کردبووە چەرمەچۆلەکە. چیرۆکی ئەو سیّهەزار

ڕۆبڵەش بەمشێوەیە بوو. تکاتان لێدەکەم، گوێم بۆ شلکەن. سێ حەوتوو بەرلەوەی باوکی بکووژێ، بەیانی زووهات بۆ لام. دەمزانی پێویستی بە پارەیە و بۆ چی دەوێ. بەڵێ، بەڵێ - بۆ ئەوەی دڵی ئەو جانەوەرە وەدەستبێنێ و لەگەڵ خۆی بیبا. دەمزانی دەرهەق بەمن غایەن بووە و ئێستاش دەیەوێ لێم جیابێتەوە. ئەوەش من بووم من، کە ئەو پارەیەم پێدا، بەو بۆنەوە پێمدا کە بینێرێ بۆ خوشکم لە مۆسکۆ. چاوم لە چاوی بڕی و گوتم هەرکاتێک پێی خۆشبوو دەتوانێ بینێرێ. «مانگێکیش بخایەنێ گرینگ نییە.» مەگین دەکرێ تێنەگەیشتبێ چاو لە چاو پێمگوت: «تۆ ئەو پارەیەت بۆ ئەوە دەوێ خەیانەتم پێبکەی و لەگەڵ ئەو دەعبایە یەک کەوی، کەوایە فەرموو ئەوەش پارە. خۆم پێتدەدەم. ئەگەر ئەوەندە خوێڕی و بێئابڕوو بووی کە بتوانی وەریبگری، هانێ وەریگرە! دەمویست بیسەلمێنم ئەو چی بوو و چی ڕوویدەدا؟ وەریگرت، وەریگرت و بە شەوێک لەگەڵ ئەو دەعبایە لە ئاوی کرد... بەڵام دەیزانی. دەیزانی لە هەموو شتێک ئاگادارم. خاترجەم بن ئەوەشی دەزانی، دەیزانی بۆیە ئەو پارەیەی دەدەمێ تاکو تاقییکەمەوە. بۆ ئەوەی تێبگا یانی ئەوەندە خوێڕی و بێئابڕوو بووە کە ئەو پارەیە لە من وەردەگرێ - چاوم لە چاوی بڕی، ئەویش چاوی لە چاوم کرد، ئەوانەی هەمووی لە چاومدا خوێندەوە و وەریگرت - پارەکەی لێوەرگرتم و ڕۆیشت!»

میتیا لە ناکاو نەڕاندی: «ڕاست دەکەی کاتیا، چاوم لە چاوت بڕی و دەمزانی بێئابڕووم دەکەی، سەرەڕای ئەوەش پارەکەم لێوەرگرتی. وەک مرۆڤێکی هەرزە و هیچوپووچ هەقتە ڕقت لێمبێ. هەمووتان جێی خۆیەتی ڕقتان لێمبێ، هەقی خۆمە!»

سەرۆکی دادگا دەنگی هەڵێنا: «تۆمەتبار، جارێکی دیکە قسەت لە دەم بێتە دەرێ، فەرماندەدەم لە دادگا بتکەنە دەرێ.»

کاتیا بە هەڵەپڕووکێ لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «ئەو پارەیە بۆ ئەو مایەی ئازار بوو. دەیویست بمداتەوە، ئەوە شکی تێدا نییە، بەڵام بۆ ئەو دەعبایەش پارەی پێویست بوو. هەر بۆیە باوکی خۆی کوشت، بەڵام پارەکەی

منی نەدایەوە و لەگەڵ ئەو جانەوەرە چوو بۆ ئەو دێیە و لەوێ قوڵبەستکرا. ئەو پارەیە دوای کوشتنی باوکی دزیبووی، دیسان لەوێ ئاوای کرد. ڕۆژێک بەرلە کوشتنی باوکی، ئەم نامەیەی بۆ نووسیم. نامەکەی بە مەستی نووسیبوو. هەرکە خوێندمەوە بۆم دەرکەوت. بە ڕق و بێزارییەوە نووسیبووی، هەستی بە دڵنیاییش کردبوو کە تەنانەت ئەگەر باوکیشی بکوژێ پیشان کەسی نادەم. ئەگەر بیزانیبایە ئاشکرایدەکەم بۆی نەدەنووسیم. چونکە دەیزانی نامەوێ تۆڵەی لێبکەمەوە و لەنێوی بەرم! ئێوە خۆتان بیخوێننەوە، بەوردی ـ تکاتان لێدەکەم، زۆر بەوردی ـ با بۆتان دەرکەوێ چۆن خۆی نووسیویەتی و گوتوویە باوکی دەکوژێ و دەزانێ پارەکەشی لە کوێ داناوە. تکاتان لێدەکەم، بەسەریدا تێمەپەڕن، ڕستەیەکی تێدایە: «هەر ئەوەندە ئیوان بڕوا دەیکوژم.» کەوایە، هەر لەپێشدا بیری لە جۆری کوشتنەکەی کردۆتەوە.» کاترینا ئیوانا ئەم ڕستەیەی دوایی بەسەرکەوتنێکی تاڵ و شەرووڕانەوە لە بەر دەمی دادگادا دەربڕی. بەڵێ! دیار بوو دێڕبەدێڕی ئەو نامەیەی خوێندبۆوە و لە مانا نهێنییەکانی گەیشتبوو. «ئەگەر مەست نەبوایە، ئەو نامەیەی بۆ نەدەنووسیم؛ بەڵام بڕوانن، بەرلە تاوانەکە هەموو شتێکی مووبەموو باسکردووە، ڕاست بەوشێوەیە دواتر دەستی بۆ ئەو تاوانە برد.» بە شێوەیەکی شێتانەش گوتی: «سیناریۆیەکی تەواو!»

ئەو ئێستا کاردانەوەی دوایی بەلاوە گرینگ نەبوو، ئەگەرچی، بێئەوەی دڵلەدڵ بدا، ئەو ئاکامەی تەنانەت لە مانگێک لەمەوبەرەوە پێشبینی کردبوو، چونکە تەنانەت ئەو کاتەش، ڕەنگە، لە ڕقدا لەرزیبێ و بیری کردبێتەوە کە ڕۆژی دادگایی نامەکە نیشاندەدا یان نا. ئێستاش ئەوە کەوتبووە ئەولای بێتفاقییەوە. لە بیرمە میرزابنووس نامەکەی بە دەنگێکی بەرز خوێندەوە، پێموایە، ڕاست لەدوای تەواو بوونی قسەکانی، ئەو نامەیە شوێنێکی سەیری لە سەر دانان. لە میتیایان پرسی کە دانی پێدا دەنێ ئەو نامەیەی نووسیوە.

میتیا بە دەنگێکی بەرز گوتی: «نامەی منە، نامەی من! ئەگەر مەست نەبوایەم نەمدەنووسی!... کاتیا، لە بەر زۆر هۆ ڕقمان لە یەکتر بوو، بەڵام

سوێند دەخۆم، سوێند دەخۆم کە تەنانەت کاتێک ڕقیشم لێت بوو، هەر خۆشم دەویستی. بەڵام تۆ منت خۆش نەدەویست!»

میتیا هەروا کە هیوابڕاوانە دەستی خۆی هەڵدەگوشی، خۆی خستە سەر کورسییەکە و دانیشت. دادوەر و پارێزەر دەستیانکرد بە لێپرسینەوەی کاترینا ئیوانا، دەیانویست ڕوون بێتەوە، چ شتێک هانیداوە بەرلەوەی بەڵگەیەکی ئاوا ئاشکرا بکا، بەو لەبز و حاڵەتە جیاوازەوە شایەدیداوە.

کاتیا وەک ژنێکی دەلووکار قیژاندی: «ئەرێ، ئەرێ. درۆمکرد. بەپێچەوانەی ویستی خۆم و ویژدان و ئابڕووم درۆم کرد، بەڵام دەمویست نەجاتیدەم، چونکە ئەو زۆری ڕق لە من بووە و بە سووکی زانیوم! پەککو چ سووکایەتییەکی پێکردووم. هەمیشە بە سووکی زانیوم. ئەوەش بزانن هەر لەو کاتەوە کە بۆ پارە لە هەمبەریا بە چۆکدا هاتم و کڕنۆشم بۆ برد، سووک بووم لەبەرچاوی. دەزانم، هەر ئەو کاتە لەڕێوە هەستمپێکرد، بەڵام هەتا ماوەیەکی زۆر باوەڕم نەدەکرد. زۆر جار لە چاویدا دەمخوێندەوە: «بەویستی خۆت هاتی.» کاتیا ئیتر وەک شێت و هار، بە ڕقێکی ئەستوورەوە دەدوا و کەوتبووە هەناسەبڕکێ: «پەککو، ئەقڵی بەوە نەشکا، بۆ چووم بۆلای؟ چونکە ناتوانێ لە خوێڕییەتی و هەرزەیی زیاتر لە شتێکیتر بگا، منی وەک خۆی چاو لێکرد، پێیوابوو هەموو وەک خۆی وان! تەنیا لە بەر ئەوەش دەیویست زەماوەندەم لەگەڵ بکا، چونکە دەیزانی ماڵ و سامانێکی زۆرم بە میرات پێبڕاوە. هەر لە بەر ئەوە بوو، دەزانم، هەمیشە پێموابوو بەوهۆیەوە دەیهەوێ ژیانی هاوبەشم لەگەڵ پێکبێنێ. ئاخ! ئەوە مرۆڤێکی دڕندەیە! چونکە ئەو ڕۆژە لە بەر ناچاری چووم بۆلای، هەمیشە لە سەر ئەو باوەڕە بووە هەتا ئاخری تەمەنم سەرم لە حاندی هەڵنایە و لە ڕوویا هەست بە شەرمەزاری دەکەم و دەلەرزم. هەقیشیەتی هەتا ئاخری تەمەن بە سووک و چرووکم بزانێ و خۆی لە من بە زیاتر بزانێ. هەر لە بەر ئەوە دەیویست زەماوەندەم لەگەڵ بکا! هەروایە! وەک ڕۆژ لێمڕوونە هەروایە! هەوڵمدا بە ئەشقەکەم بەسەریدا زاڵبم ـ ئەشقێک کە حەد و کەوشەن ناناسێ. تەنانەت

هەوڵمدا چاوپۆشی لە بێوەفاییەکەی بکەم؛ بەڵام هیچ تێناگا، هیچ! هەر بە ڕاستیش چۆن دەیتوانی تێبگا؟ ئەو ڕمووزنە! ئەو نامەیە ئێوارەی ڕۆژی دوایی بە دەستم گەیشت: لە مەیخانەکەوە بۆیان هێنام ـ ئەو ڕۆژەش بەیانییەکەی، تەنیا ئەو ڕۆژە بەیانی دەمویست لێی خۆشبم و چاوپۆشی لە هەموو شتێک بکەم، هەموو شتێک ـ تەنانەت خەیانەتەکەشی!»

سەرۆکی دادگا و دادوەر، هەڵبەت هەوڵیاندا ئارامی بکەنەوە. ناتوانم لەو فکرەش خۆ ببوێرم کە هەموویان هەستیان بە شەرمەزاری دەکرد گوێ لەو جۆرە دانپیانانە دەگرن. لە بیرمە دەیانگوت: «تێدەگەین چەندەت بۆ دژوارە؛ دڵنیابە هاودڵین لەگەڵتا،» سەرەڕای ئەوانەش شایەدییان لە زمانی ئەو ژنە تووڕە و وڕێنەبێژە دەرکێشا. ئەو ئاخری بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا کە زۆر جار وەک بڵێی بۆ تاقەساتێک لەو بارودۆخانەدا ڕوو دەدا، گوتی کە ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە دوومانگی ڕابردوودا، زۆری هەوڵداوە بۆ نەجاتدانی برا «دڕەندە و پیاوکوژ»ەکەی، بۆیە وەک شێی لێهاتووە و بە جارێ تێکەڵی کردووە.

«خۆی ئازاردەدا. هەمیشە هەوڵیدەدا سزای براکەی کەمبکاتەوە و لای من دانی پێدابنێ کە ئەویش هیچ کاتێ باوکی خۆش نەویستووە، لەوانەیە بەئاواتیشەوە بووبێ بمرێ. ئەگەر بزانن چ ویژدانێکی قووڵی هەیە! بە ویژدانی، خۆی ئازار دەدا! هەموو شتێکی پێگوتم، هەموو شتێک! هەموو ڕۆژێک دەهات و وەک تەنیا دۆستی خۆی دەردەدڵی بۆ دەکردم.» کاترینا ئیوانا، جینگزیانە و لە پڕ هاواریکرد: «بۆ من شانازییە کە تەنیا دۆستی ئەوم.» چاوی ترووسکەی هات: «دوو جار چووە بۆ دیدەنیی ئیسمیر دیاکۆف. ڕۆژێک هات بۆلام و گوتی: ئەگەر بەجێی براکەم ئیسمیر دیاکۆف ئەو قەتڵەی بکردبایە (چۆن ئەو دەمگۆیە دەکەوتە سەردەمی خەڵک کە ئەو کارە کاری ئیسمیر دیاکۆفە. ڕەنگە منیش تاوانبار بم، چونکە ئیسمیر دیاکۆف دەیزانی ڕقم لە باوکمە و ڕەنگە باوەڕیشی کردبێ کە مەرگی باوکم بەئاوات دەخوزام؛ ئەو کاتە ئەو نامەیەم دەرهێنا و پیشانمدا. سەتاسەت قانعبوو کە

کارکاری براکەی بووە و زۆریش بەو مەسەلەیە دڵگران بوو. ئەوەشی بۆ تامڵنەدەکرا کە براکەی باوککوژ بێ! حەوتوویەک لەمەوبەر بۆم دەرکەوت ئەو مەسەلەیە خەریکە نەخۆشی دەخا و ڕۆحی ئازار دەدا. چەند ڕۆژ لەمەوبەر لە حزووری مندا قسەی دژمان و قسەی ناحەزی دەکرد. تێگەیشتم خەریکە ئەقڵی لە دەستدەدا. بەملاولادا هەڵدەسووڕا و وڕێنەی دەکرد. دیتبوویان بە کۆڵان و شەقاما دەسووڕێتەوە و لە بەر خۆیەوە قسە دەکا. دوکتۆری مۆسکۆیی دوێنی لە سەر داوای من فەحسیکرد و گوتی خەریکە تووشی یاوی مێشک دەبێ، هەمووشی لەتاوی ئەو، لەتاوی ئەوڕمووزنە وای لێهاتووە! دوێشەو ئاگادار بوو کە ئیسمیر دیاکۆف مردووە! ئەو هەواڵەش وای داترووسکاند و زەبرێکی کاریگەر بوو لە سەر ڕۆحی، بە جارێ شێتی کرد... هەمووشی لەتاوی ئەوڕمووزنە، هەمووشی لە بەر خاتری نەجاتدانی ئەوڕمووزنە تووشی ئەو ئازارە بوو!»

ئاخ، هەڵبەت سەرهەڵدانی ئەو جۆرە دانپیانان و ڕاستیگوتنە لە ماوەی تەمەندا تەنیا یەکجار بۆ مرۆڤ دەلوێ ـ بۆ وێنە لەسەرەمەرگدا کاتی وەرێکەوتن بەرەو پای سێدارە! بەڵام ئەوە خووخدەی کاتیا بوو، ئەو ساتەش لە ژیانیدا لەو جۆرە ساتانە بوو. ئەو هەر ئەو کاتیا فیداکار و لەخۆبوردووە بوو کە بۆ نەجاتدانی باوکی چووە ژێر منەتی لاوێکی خوێڕی و هەڵەخەرجەوە؛ هەر ئەو کاتیایەی بەر لەم شایەدیدانە بە هۆی حەیا و دەمارزلییەوە، باسی کردەوەی کەریمانەی میتیای کرد و لە هەمبەر ئەو عالەمەدا لە خۆی و لە حەیای کچانەی خۆی گوزەرابوو، بەو هیوایە بڕێک لە قورسایی تاوانەکەی کەمکاتەوە. ئێستاش، ئەوا دیسان لەخۆبوردوویی دەنواند، بەڵام ئەمجارە بۆ کەسێکی دیکە و ڕەنگە هەر ئێستا ـ ڕەنگە تەنیا لەم ساتەدا هەستی کرد و تێگەیشت کە ئەو کەسە چەندە لە لای خۆشەویستە! لە بەر خاتری ئەو لە ترسانا لە خۆی گوزەرا، چونکە کتوپڕ بۆی دەرکەوت بوو بەو دانپیانانەی کە ئەو کارە کاری براکەی نییە و باوکی بە دەستی ئەم لە

نێو چووه، به جارێ خۆی فەوتاندبوو. لەخۆبردوویی نواند بۆ ئەوەی ئەو نەجاتبدا. تاکو ناوبانگی به چاکە ڕۆیشتووی ئەو نەجاتبدا.

سەرەڕای ئەوانەش دوودڵییەکی بەسام گازی لە مێشکی پیاو دەگرت - بڵێی کاتیا سەبارەت بە پێوەندیی ڕابردووی خۆی و میتیا درۆیکردبێ؟ - پرسیارەکە ئەمە بوو. نا، کاتێک به دەنگی بەرز گوتی به هۆی ئەو کڕنۆش بردنەوە لەبەر چاوی میتیا سووکبووە، بەئانقەست تۆمەتباری نەکردبوو! خۆی باوەڕی بەوە بوو. تەواو قەناعەتی بەو شتە هێنابوو - ڕەنگە لە کاتی ئەو کڕنۆشەوە - کە میتیای ساویلکە، تەنانەت ئەو کاتەش کە تاریفی دەکرد، لە دڵەوە پێیپێکەنیوە و به چاوی سووک تەماشایکردووە. خۆشەویستیی ئەو بۆ میتیا خۆشەویستییەکی دوو پۆ بوو کە تەنیا به هۆی غرووڕەوە، بەهۆی غرووڕێکی برینداره‌وه بوو، ئەم ئەشقەش هیچکوێی لە ئەشق ناچێ، بەڵکو لە تۆڵە دەچێ. ئاخ! ڕەنگە ئەو ئەشقە دووپۆیە بشبوایەتە ئەشقێکی ڕاستەقینە، ڕەنگە ئەوەش ئاواتی گەورە و گرانی کاتیا بووبێ، بەڵام بێوەفاییی میتیا بە جارێ دڵی بریندار کردبوو، بۆیە دڵی نەیدەتوانی لە میتیا ببوورێ. کاتی تۆڵە بە شێوەیەکی کتوپڕ بەسەریدا زاڵبوو و تەواوی ئەو داخ و وەرهەمانەی لە دڵی ئەو ژنە سووکایەتی پێکراوەدا کەڵەکە بووبوو، لە ناکاو بوو به گڕپژێن و دەرک و دیواری ڕۆحی شەقکرد. ڕاستیی لە میتیا گوت، بەڵام خۆشی پێی تێوەچوو، تێوەگلا. لەگەڵ نیشتنەوەی بڵێسەی ڕقەکەی و دەربڕینی هەستی، کوڵۆکۆی ناخی نیشتەوە و شەرم سەرتاپای داگرت و لەناخەوە هەڵی چۆقاند. دیسان هێرشی عەسەبی ڕووی تێکردەوە: دەستیکرد بە گریان و کەوت بەزەویدا و لە دادگاکە بردیانە دەرێ.

هەر لەو کاتەدا گرووشنکا، بەر لەوەی فریاکەون پێشی پێبگرن، هەڵات بۆ لای میتیا و بەدەم نک و ناڵەوە گوتی: «میتیا دیتت ئەو مارە خاڵ ومیلجوانە چۆنی پێوەدای؟» هەر لەو کاتەدا لە ڕقا دەلەرزی، ڕووی کردە قازییەکان نەڕاندی: «فەرموون، پیشانیدان کێیە!» به ئاماژەیەکی سەرۆکی دادگا بردیانە دەرێ. نەیدەویست بڕواتە دەرێ و خۆی دەکێشا بۆ لای میتیا. میتیاش

ناڵـەیـەکـی لێوە هـات و هـەوڵـیدا بچـێ بـۆلای، بـەڵام لـە جێـی خـۆی دایـان نیشاندەوە

بەڵێ، پێموایە ئەو ژنانەی بۆ دیتنی ئەم شانۆیە هاتبوون، حەتمەن بـەدڵـیان بووە چونکە شانۆیەکی سەرنجڕاکێش بوو. ئەمجار دوکتۆری مۆسکۆیی هاتـە شـەر شـانۆ، پێموایـە سـەرۆکـی دادگـا پێشتر زابتـی ناردبوو بـە شـوێنیدا، بـۆ ئەوەی چاوی بە ئیوان فیۆدۆرۆویچ بکەوێ. دوکتۆر دوای فەحسکردن گـوتی ئیوان تووشـی یـاوێکی قورسـی مێشکـی بـووە، زۆریـش مـەترسیدارە و دەبـێ خێـرا لێرە ڕایگوێزن. لـە وەڵامـی دادوەر و پارێزەردا گـوتی کـە ئیوان پێـرێ خـۆی چـووە بـۆ لای و پێیگـوتـووە کـە نـەخـۆشـییەکـی ئـاوا پـڕمـەترسـیی هـەیـە، بـەڵام گـوێی بـە دەرمـان و چـاوەدێریی پزیـشکـی نـەداوە. دوکتـۆر لـەکـۆتـاییدا گوتی: «دڵنیام حاڵی ڕۆحیی باشنەبوو، خۆی پێیگـوتم لـە کـاتی بـەخـەبـەریدا خـەون دەبینێ، چـەندکـەسی لە سـەر شـەقام دیتووە مردوون و شـەیتان هـەموو ڕۆژێ ئێـواران دەچـێ بـۆ سـەردانـی.» دوکتـۆری بـەناوبانـگ دوای شایەدیدانەکەی لە دادگا چووە دەرێ. ئەو نامـەیـەی کاترینا ئیوانا پێیدابوون، خستیانە سـەر پـەروەندەکە. دوای برێ ڕاوەستان، بڕیاریاندا درێژە بـە دادگـایی کردنەکە بدەن و هـەردوو بەڵگە چاوەڕوان نەکراوەکە (ئەو بـەڵگانـەی لـەلایـەن ئیوان فیۆدۆرۆویچ و کاترینا ئیواناوە دراون) لە شایەدی نامەکەدا بێنن.

بەڵام ناچمە سەر شایەدییەکانی دیکە چونکـە تـەنیا ئـەو قسانەی پێشوویان دووپاتدەکردەوە، ئـەگـەرچـی هـەرکـام بـەپێی تایبـەتمـەندی و خووخدەی خـۆی دەدوا. دووپاتیدەکەمەوە، هەموو ئەوانە لە وتەکانی دادوەردا، کە لەڕێوە بۆتـانی دەگێڕمـەوە، سـەروبـەری وێکهاتـەوە. ئـەوڕووداوە هـەمووانی تووشـی شـڵەژان کردبوو، بۆیـە بێسـەبرانـە چـاوەڕوانی وتـەی دادوەر و پارێزەر بوون. فێتـی یۆکۆویچ دیار بوو شـایەدییەکـەی کاترینا ئیوانا دایچڵـەکاندووە. بـەڵام دادوەر سـەرکەوتبوو. کاتێک شایەدی تـەواو بـوو، دادگا نزیکـەی سـەعـاتێکی پشوودان ڕاگەیاند. پێموایە سـەرۆکی دادگا کاتێک گـەڕایـەوە شـوێنەکەی خـۆی، ڕاسـت سـەعات هەشت بوو، ئیپۆلیت کیریلۆویچی دادوەریشمان دەستیکرد بە ئاخافتن.

# (٦)

## ئاخافتنی دادوەر، هەڵسەنگاندنی کەسایەتییەکان

ئیپۆلیت کیریلۆویچ وا تووشی شڵەژان بووبوو، ئازای ئەندامی دەلەرزی، ئارەقەیەکی سارد نێوچاوانی خووساندبوو. لە پەستا تەواوی لەشی سارد و گەرمی دەکرد و هەر بەو حاڵەوە دەستیکرد بە ئاخافتن. دواتر خۆی باسی کرد کە لەو ساتەدا حاڵی چۆن بووە و چ چەقوچۆیەک دایگرتووە. وەک قوویەک دەیخوێند. ئەم وتانەشی وەکو شاکارێکی باش لە ژیانی خۆیدا چاو لێدەکرد. دیار بوو بە chef d o'euvre {شاکار}ی خۆی دەزانی، chef d oeuvre لە تەواوی تەمەنیشیدا، لە ڕاستیدا نۆ مانگ دواتر بە هۆی دەردەباریکەوە مرد. بۆیە هەر وەک مەعلووم بوو، ئەگەر لەدڵی دابێ کە مەرگی نزیک بۆتەوە، هەقی بووە خۆی بە قوویەک بزانێ کە دوایین ئاوازی خۆی دەخوێنێ. تەواوی دڵ و مێشکی خۆی لە سەر ئەم وتارە دانابوو، ئەو سەلماندبووشی کە خاوەنی دڵ و هەستێکی ناسکە و بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراویش درکاندی کە لانیکەم هەستی بەختەوەری و پاکیی کۆمەڵگا و «پرسیاری هەتاهەتایی»[٤] لەناخیدا حەشار دراوە. پڕشنگدار بوونی وتارەکەی لە سەداقەتی ئەودا بوو. سادقانەش باوەڕی بەسزادانی تۆمەتبار هەبوو؛ بە تۆمەتبار زانینی ئەوی تەنیا و تەنیا وەک ئەرکێکی ئیداری چاو لێدەکرد، لە سزادانی تاوانباردا «لەبەر خاتری ئاسایشی کۆمەڵگا» بە تامەزرۆییەکی سادقانەوە دەلەرزی. تەنانەت ئەو ژنانەی لە دادگاکەشدا

---

٤- مەبەست لەو پرسیارە «بوون یان نەبوون» کە هاملێت لە بەیانی نەفسی خۆیدا باسیدەکا.

حازربوون، ئەگەرچی زۆریان ڕق لە ئیپۆلیت کیریلۆویچ هەستابوو، دانیان پێدانا کە شوێنێکی سەیری لە سەر دانابوون. بە دەنگێکی لەرزۆک و گڕ دەستیکرد بە قسە کردن، بەڵام زۆر زوو گوڕ و تینی هاتەوە بەر و هەتا کۆتایی وتارەکەی بە دەنگێکی بەرز قسەیکرد و دانیشتووانی سەرسام کرد. بەڵام لەگەڵ تەواو بوونی وتارەکەی، هێندەی نەمابوو بێهۆش بکەوێ.

دادوەر ئاوا هاتە قسە: «ئاغایانی ئەندامی لیژنەی داوەران، ئەم پەروەندەیە لە سەرانسەری ڕووسیادا دەنگی داوەتەوە و جموجۆڵی ساز کردووە. بەڵام چی سەیرە و چی بەتایبەت بۆ ئێمە جێی مەترسییە؟ بەتایبەت بۆ ئێمە؟ ئێمە کە ئەو هەمووە خوومان بەو چەشنە جینایەتانە گرتووە! ترسناک بوونەکەشی ئەوەیە، کە ئەو جۆرە کردەوە ڕەشانە تووشی مەترسیمان بکا، ئەوەیە کە تا ئەو ڕادەیە خوومان پێگرتووە، ئەویش نەک تەنیا بەم جینایەتە یان جینایەت و تاوانێکی جیاواز. هۆی ئەو کەمتەرخەمی و سەرساردییەیشمان چییە و ئەم دیاردە زەمانییە چ قاسیدێکی نێوچاوانڕەش هێناویەتی و ڕزگاریمان نایە لەدەستی؟ بڵێی هۆی ئەوەبێ وا نیشاندەین کە خەریکی تاوان و سەرەڕۆیین؟ هۆی ئەوەیە ئەقڵ و خەیاڵ لە کومەڵگادا تووشی کۆنی و سوانی زووڕەس بووە و سەرەڕای کەمتەمەنی لە زەلکاوی گەندڵی و فەوتاندا ئەوق بووە؟ بڵێی هۆی ئەوەبێ بناغە و هێمی ئەخلاقمان تێکشکاوە، یان ڕەنگە بە هۆی نەبوونی بنەمایەکی ئەوتۆوە تووشمان بووبێ؟ ناتوانم وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەمەوە؛ لەگەڵ ئەوەشدا ئەم جۆرە پرسیارانە بۆتە هۆی شڵەژانی ڕۆحمان و هەموو شارۆمەندێکیش حەتمەن ئازاری پێوە دەکێشێ. ئەو بڵاڤۆکە تازە و هێشتا خۆشەویستانە، خزمەتێکی بەرچاو بە کۆمەڵگا دەکەن. چونکە بەبێ ئەوان، لانیکەم لەو ئەخلاقە هیچ و خوێڕیگەرییانە و قینە هەوسار پساندووەکان ئاگادار نابین. باسکردنی ئەو ترس و کارەساتە سامناکە نەک هەر ئەو کەسانەی وەک بەشداریکردن لە دادگاییەکاندا حازر دەبن و لیژنەیەکی تازە دامەزراو دەبن لەم سیستەمەی ئێستادا، بەڵکوو هەموو خەڵکیشی پێئاگادار دەکرێتەوە. ئێمەش ڕۆژانە چیمان

دەویٚ؟ شتگەلیٚک کە ئەم پەروەندەیەی ئیٚستامان لە پاڵیاندا ڕەنگ دەدۆڕیٚنیٚ و زۆر کەم بایەخ دیارە. بەڵام گرینگترین خاڵ ئەوەیە کە زۆربەی ئەو کارەسات و جینایەتە سەرەڕۆیانەی نیشاندەری یاخیگەرییەکی گشتی و پەرەگرە، سەرەڕۆییەک کە لە نیٚو ئیٚمەدا پەرەی سەندووە و ڕیشەی داکوتاوە، ئیتر بۆ بەرخۆدان و بەگژداچوونەوە نابیٚ و زۆر دژوارە.

«ڕۆژیٚک ئەفسەریٚکی جحیٚڵ و وریا لە چینی دەوڵەمەند دەبینین کە لە سەرەتای ژیان و کاردا بە شیٚوەیەکی نهیٚنی و ترسەنۆکانە، بەبیٚ‌ئەوەی تۆزیٚک ئازاری ویژدانی هەبیٚ، کارمەندیٚکی کە سەردەمیٚک نانبدەی بووە، لەگەڵ کڵفەتەکەی دەکوژیٚ، بۆ ئەوەی بەڵگەی قەرزدارییەکەی خۆی و هەرچی پارەی نەغدی لەگیرفاندایە بیدزیٚ؛ «ئەم پارەیە بۆ چیٚژ وەرگرتن و کامڕەوابوون لە دنیای مۆدەپەرەستدا و بۆکاری داهاتووم بەکار دیٚ.» دوای کوشتنی ئەوان، هەریەکیٚ بالنجیٚک دەنیٚتە ژیٚرسەریان و دەڕوا. پاشان قارەمانیٚکی لاو کە بە هۆی ئازایەتییەوە میداڵیای وەرگرتووە، دایکی سەرۆکەکەی و سەرۆکەکە خۆی لە سەر ڕیٚگایەک وەک چەتە و ڕیٚگر دەکوژیٚ، بۆ ئەوەی هاوڕیٚیانی هاندا لەگەڵی یەکبکەون، دەڵیٚ ئەو ژنە «ئەوی وەک کوەڕەکەی خۆی خۆشدەویٚ، هەربۆیە تەواوی ڕیٚنویٚنییەکانی لەبەرچاو دەگریٚ و خۆی ناپاریٚزیٚ.» ئەوەشی بۆ دەردەکەویٚ کە ئەو ڕمووزنە، سەرەڕای ئەوەش ناویٚرم بڵیٚم کە لەم ڕۆژانەدا ئەو ڕمووزنیٚکی بیٚویٚنەیە. کەسیٚکی دیکە تووشی تاوان و جینایەت نابیٚ، بەڵام هەست و ئەندیٚشەی ڕاست وەک ئەو وایە و ڕۆحیٚکی چەشنی ئەو دەگمەنی هەیە. لە بیٚدەنگی و لە خەڵوەتدا بە ویژدانەوە ڕەنگە لە خۆی بپرسیٚ: «دروستکاری چییە و ئایا مەحکوومکردنی خویٚنڕشتن دەمارگرژی نییە؟»

«ڕەنگە خەڵک بەسەرمدا بگوڕیٚنن و بڵیٚن کە نەخۆش و تووڕەم، ناجوامیٚرانە بوختان دەکەم و پیٚی زیادی دادەکیٚشم و وڕیٚنە دەکەم. قەیناکا با وا بڵیٚن ـ خوداش دەزانیٚ ئەگەر واشبیٚ، یەکەم کەس بووم کە شاد دەبم و دەگەشیٚمەوە! ئاخ، بڕوا بە قسەکانم مەکەن، من بە مرۆڤیٚکی نەخۆش بزانن،

بەڵام وتەکانم لە گوێ بگرن؛ ئەگەر تەنیا یەک لە دەی، یان یەک لە بیستی ئەوەی دەیڵێم ڕاست بێ - تەنانەت ئەو کاتەش دەبێ بڵێین هاوارە لە خۆمان! چاو لێکەن. ئاغایان، بڕوانن لاوەکانمان چۆن تووشی تاوان دەبن. بە بێئەوەی پرسیاری هاملێت سەبارەت بە دنیای مەرگ[٥] لە خۆی بپرسێ، بێئەوەی دیاردەی پرسیارێکی وا لە گۆڕێدا بێ، گوایە تەواوی ئەوانەی پێوەندییان بە ڕۆحەوە هەیە و لەوپەڕی گۆڕەکەوە چاوەڕوانمانن، ماوەیەکی زۆرە لە زەینیاندا پاکبۆتەوە و خیز و ڕمڵی وەسەر کشاوە. لە کۆتاییدا، چاو لە سەرەڕۆیی و جینگزی بوونمان بکەن و هەروەها هەوەسبازەکانمان. فیۆدۆرپاولۆویچ ئەو قوربانییە چارەڕەشەی پەروەندەکەی ئەمڕۆمان، کاتێک لەگەڵ زۆربەی ئەوان هەڵیدەسەنگێنی زیاتر وەک منداڵێکی بێتاوان دەچێ. سەرەڕای ئەوانەش هەموومان دەمانناسی، «ئەو لەگەڵ ئێمەدا دەژیا[٦]! »...

بەڵێ، ڕەنگە ڕۆژێک بیریارانی گەورەی ڕووس و فەرەنگ لە ڕەوانناسیی تاوانی ڕووسی بکۆڵنەوە، چونکە بایەخی ئەوەی هەیە خۆی پێوە ماندوو بکەن. بەڵام ئەم لێکۆلێنەوە و توێژینەوانە دواتر لە کاتی پشوودادا، بەڕێوە دەچێ، یانی کاتێک کە چەواشە بوونی تراژیکی ئەمڕۆمان بەجێ هێشتبێ، تاکو ئەو لێکۆڵینەوەیە لەلایەن کەسانێکەوە ئەنجامبدرێ کە ڕوانگە و بێلایەنییان لە کەسانێکی وەک من زیاتر بێ. ئێمە ئێستا یان ترسمان لێنیشتووە، یان وا دەنوێنین کە ترساوین، ئەگەرچی لە ڕاستیدا بە دیتنی ئەو شانۆیە گەزگەز باڵا دەکەین و حەز بەو دڵەخورپە سەیرانە دەکەین کە وامان لێدەکا خۆ بە گوناح و پیازە و دەست و پێ سپیلکەیی و ئاسوودەییەوە ڕانێین. یان، ئاخری وامان لێدێ، وەک منداڵ تاپۆی ترسناک لەخۆمان دوور

---

٥- ئاماژەکردن بە بەیانی نەفسی هاملێت لە پەردەی دووهەمی دیمەنی سێهەمی شانۆی "هاملێت" بەرهەمی شکسپێردا: «... کێ دەیهەوێ ئەم هەموو بارەگران هەڵگرێ، بە ناڵاندن و ئارەقەڕشتنەوە لە ژێر قورسایی تەمەندا، ترسان لە دنیای پاشمەرگ (ئەو سەرزەوییە نەدۆزراوەیەی کە هیچ سەفەرکردوویەکی لێناگەڕێتەوە) هەر ئەوەش ڕۆح و فکری دڕدۆنگ و ئاڵۆز کردووین، هانمان دەدا لەگەڵ هەموو کێشە و ئافەتێک هەڵبکەین و تاقەت بێنین...»

٦- یەکەم دێڕە لە شیعرێکی پووشکین سەبارەت بە شاعیری لەهێستانی، میکی یوویکز.

دەخەینەوە و سەرمان دەکەین بە بن باڵنجەکەماندا، بۆ ئەوەی لە کاتی پشوودان و ڕابواردن و شادییەکانماندا لە بیریان بەرینەوە. بەڵام سەرەڕای ئەوانەش ڕۆژێک دەبێ بەوپەڕی وریاییەوە ژیان دەستپێبکەین، ئێمەش دەبێ خۆمان وەک کۆمەڵگایەک لە بەر چاو بگرین؛ کاتی ئەوە هاتووە کە ئێمەش لانیکەم لە باردۆخی کۆمەڵایەتیمان بگەین، یان لانیکەم ئەو ڕێگایە بگرینە بەر.

«یەکێک لە نووسەرانی گەورەی سەردەمی ڕابردوو، لەکۆتایی گەورەترین بەرهەمیدا ڕووسیا دێنێتە بەرچاوی و لە سەر خێشکێکی تیژتێپەڕی دادەنێ و بەرەو شوێنێکی نادیار بەچوار ناڵ دەیڕەتێنێ، بە سەرسووڕمانیشەوە دەڵێ: «ئاخ، خێشک، خێشکی باڵندەئاسا، کێ تۆی داهێنا!» بە شێوەیەکی مەستانە و لووتبەرزانەش دەڵێ، تەواوی نەتەوەکانی دنیا بەڕێزەوە لەلایەک ڕادەوەستن، تاکو ڕێگا بۆ خێشکی تیژتێپەڕ و بێباک بکەنەوە. ئاغایان، لەوانەیە وابێ، لەوانەیە ئەوان لە قەراغێک ڕاوەستن، بەڕێزەوە یان بەچاوی سووکەوە بڕوانن، بەڵام بەبڕوای منی زەبوون نووسەری گەورە بەرهەمەکەی بەمشێوەیە یان بە هۆی گەشبینییەکی منداڵانە و ساویلکانەوە تەواو کردووە، یان لەترسی سانسۆری ئەوسەردەمە. چونکە ئەگەر کەسایەتییەکان سووباکەویچ و نازدریۆف و چیچیکۆف خێشکەکەیان ڕاکێشایە، نەدەگەیشتە شوێنێکی ژیرانە، جا لێخوڕەکەی هەر کەسێکە با ببێ. تازە ئەو کەسایەتییەنەش بەرەیەکی قەدیمیتر بوون، بەرەی ئێمەش نموونەیەکی زۆر لەوان خراپترە...»

لێرەدا ئیپۆلیت کیریلۆویچ چەپڵەی خەڵک وتەی پێبڕی. بەڵگەی ڕۆشنبیرانەی ئەم ویچواندنەیان بەلاوە پەسندبووە. لە ڕاستیدا چەپڵەکە زۆری نەخایاند، یانی بەوجێیە نەگەیشت سەرۆکی دادگا وریایی بە خەڵکەکە بدا، تەنیا بە ڕقەوە چاوی لەو خەڵکە سەربزێوە دەکرد. بەڵام ئیپۆلیت کیریلۆویچی دادوەر زۆری پێدڵگەرم بوو؛ بەرلەوە قەتی چەپڵە بۆ لێنەدرابوو! لە تەواوی تەمەنیدا نەیتوانیبوو گوێچکەیەک بۆ بیستنی وتارەکەی

٧- گوگول: کۆتایی «گیانی مردوو».

پەیدا بکا، ئێستاش لە ناکاو بۆی هەڵکەتبوو تاکو وتارەکەی بە گوێی تەواوی خەڵکی ڕووسیا بگەیێنێ.

لە دەرێژەی وتەکانیدا گوتی: «ئەم بنەماڵەیەی کارامازۆف کە لە سەرانسەری ڕووسیادا وەک کفری شەیتان دەنگی داوەتەوە، بڵێی چی بێ؟ ڕەنگە لەڕادە بەدەر پێم لێ هەڵبڕیبێ و زۆربڵەییم کردبێ، بەڵام پێموایە هێندێک لە لایەنە بنەڕەتییەکانی چینی خوێندەواری ئەمڕۆمان لە ئاوێنەی ئەو بنەماڵەیەدا دەتوانین بەدیبکەین - ئاخ، نەک تەواوی ڕەگەزەکان، هەڵبەت ئەویش لە وێنەیەکی چکۆلەدا، «وەکو خۆر لە دڵۆپێک ئاودا،» لەگەڵ ئەوەشدا شتێک ڕەنگیداوەتەوە و یان لانیکەم شتێک درکاوە، بیر لەو پیرەپیاوە چارەڕەشە، خراپکار و سەرەڕۆیە بکەنەوە، گەورەی بنەماڵەیە و لەگەڵ ئاکامێکی ئاوا تاڵ و دڵتەزێن بەرەوڕوو بووە! لە بنەماڵەیەکی ڕەسەن و نەجیمە، بەڵام لە بارودۆخێکی هەژارانەدا لەدایکدەبێ. بە هۆی ژنهێنانێکی چاوەڕواننەکراوەوە بڕێ ماڵ و سامانی وەگیر دەکەوێ. پیاوێکی خوێڕی و سووکوچرووک و قەشمەری، خاوەنی هۆش و فامێکی باش، بەڵام گەشە نەکردوو. لە سەرووی هەموو ئەوانەوە، سووتخۆر بوو، کاتێک ماڵ و سامانی پێکەوە نا چاوی سوور بوو. ئەو تایبەتمەندییە خوێڕییانە و نۆکەر سفەتانەی پێشتر هەیبوو، هیچی نەمان، ئەوەی بۆی مایەوە و خووی پیگرت پیازە و سەرەڕۆیی و ڕەشبینی و داوێنپیسی بوو، کە خۆی پێوە ڕادەنا. لایەنی مەعنەوی لە ژیانیدا گەشەی نەکردبوو، ئەگەرچی زۆر بە کەیف و نەشە بوو. ئەوەی لە ژیانیدا بیری لێدەکردەوە هەوەس و داوێنتەڕی بوو، کوڕەکانیشی هەر وا بار هێنا. ئەرکی باوکایەتیی بە هیچ نەدەزانی. بە شتێکی قۆڕیشی دەزانی و گاڵتەی پێدەکرد. کوڕەکانی هەر بە منداڵی دایە دەست نۆکەرەکانی بۆی بەخێو بکەن و زۆریش خۆشحاڵ بوو لەدەستیان ڕزگاری بووە، هەر بە یەکجاری لە بیری بردبرووونەوە و دەتگوت منداڵی نییە. فەلسەفەی پیرەپیاو ئەمە بوو: apres moi le deluge. ئەوە مەسەلەیەکی

---

٨- "دوای من، تۆفان" - وتەی لویی یازدەهەم.

گەورەیە و دژی ئەرکی کۆمەڵایەتی بوو. مەسەلەیەکی تەواو تاکخوازانە و پڕ زیان. «هەر ئەوەندە خۆم لەش‌ساغ بم، خودای دەکرد دنیا ویران دەبوو.» لەش‌ساغیش بوو؛ زۆریش ڕازی، بەهیوابوو بیست‌ساڵی دیکە هەر بەوشێوەیە ڕابوێرێ. فێڵی لە کوڕەکانی خۆی کرد و هەوڵی ئەوەی دەدا گراوەکەشی لە چنگ دەرهێنێ. تەنانەت دەستی بە سەر ماڵ و میراتەکەشیدا گرت کە لەلایەن دایکییەوە پێیبڕابوو. نا، نا، نامەوێ پارێزگاری کردن لە تۆمەتبار هەمووی بخەمە ئەستۆی هاوکاری زانا و زمانپاراوی پترزبۆرگیم. خۆم دان بە هەقیقەتەکاندا دەنێم، چاک دەزانم کە چ داخ و قینێکی لە دڵی کوڕەکەی کردبوو.

بەڵام بەسە، باسکردنی ئەو پیرەپیاوە چارەڕەشە ئیتر بەسە؛ سزای خۆی وەرگرتووە. سەرەڕای ئەوەش لە بیرمان بێ کە ئەو باوک بوو، نموونەیەکیش بوو لە باوکانی ئەمڕۆ. پێتانوایە کە دەڵێم نموونەیەک لە باوکانی ئەمڕۆیە سووکایەتی بە کۆمەڵگا دەکەم، مخابن! زۆربەی باوکانی ئەمڕۆ تەنیا لەولایەنەوە، جیاوازن کە وەک ئەو خۆ بەو پیازە و تاوانەوە ڕانانێن کە ئەو بە ئاشکرا خۆی پێوە ڕادەنا، چونکە خوێندەوارتر و خاوەن‌فەرهەنگترن، بەڵام فەلسەفەکەیان لە بنەڕەتدا هەر ئەو فەلسەفەیەی ئەوە. ڕەنگە مرۆڤێکی ڕەشبین بم، بەڵام بەو ئاکامە گەیشتوون بمبوورن. چاکتر وایە هەر لەپێشدا لە سەر ئەوە پێکبێین، پێویست ناکا بڕوا بە قسەکانم بکەن، باوەڕ بە قسەکانم مەکەن بەڵام لێمگەڕێن با قسەکانم بکەم. لەگەڵ ئەوەشدا لێمگەڕێن ئەوەی دەبێ بیڵێم، بیڵێم و بڕێک با قسەکانمتان لە بیر نەچێ.

«بەڵام ئێستا بێینە سەرباسی کوڕەکانی ئەو باوکە، ئەم گەورەی بنەماڵەیە. یەکێ لەوان ئەم تۆمەتبارەیە کە بەرەوڕوومان دانیشتووە و پاشماوەی قسەکانم سەبارەت بە ئەوە. بە کورتی باسی دووکوڕەکەی دیکەشی دەکەم. ئەو دووکوڕەی دیکە، گەورەکەیان لاوێکی ئەمڕۆییە و خاوەنی خوێندەوارییەکی باڵا و بیرۆکەی بەهێزە، سەرەڕای ئەوانەش ئیمانی

بە هیچ شتێک نەماوە. لە ژیانیدا حاشای لە زۆرشت کردووە، ڕاست وەک باوکی. هەمووومان گوێمان لە قسەکانی بوو، بەڕوویەکی خۆشیشەوە وەرگیرا. هیچ کاتێک بیروڕای خۆی نەدەشاردەوە، هەر بەو هۆیەشەوە ئیزن بە خۆم دەدەم ئێستا سەبارەت بە ئەو تاڕادەیەک بە ڕاشکاوی قسە بکەم، هەڵبەت نەک وەک تاکەکەسێک، بەڵکو وەک یەکێک لە ئەندامانی بنەماڵەی کارامازۆف. کەسێکیتر کە لەگەڵ پەروەندەکە پێوەندییەکی تەواوی هەیە، دوێشەو لە قەراغ شاری خۆی کوشت. ئەویش ئەو نەخۆشە ئەقڵناقیسەیە کە پێشخزمەتی فیۆدۆرپاولۆویچ بوو، وەک دەڵێن ڕەنگە کوڕی ناشەرعیشی بێ، مەبەستم ئیسمیر دیاکۆفە. لە لێپرسینەوەی سەرەتاییدا بە شڵەژاوی و گریانەوە پێیگوتم چۆن ئەو کارامازۆفە لاوە، ئیوان فیۆدۆرۆویچ، ترساندوویەتی و بە جارێ شێتی کردووە. «ئەو پێیوایە لە دنیادا هەموو شتێک ئازادە، لە داهاتووشدا هیچ شتێک نابێ یاساغ بێ ـ ئەوەی هەمیشە فێریدەکردم ئەمە بوو.» پێموایە ئەو گەمژەیە بە پێی ئەو شیمانەیە ئاوەزی خۆی لەدەستدا، هەڵبەت وێدەچێ ئەو فێ لێهاتنە و ئەم ڕووداوە دڵتەزێنەی لە ماڵەکەیاندا قەوما لەم دواییانەدا، بووبێتە هۆی ئەوەی ئەو بڕیارە بدا. بەڵام ئەو گەوجە بیروڕایەکی زۆر سەرنجڕاکێشی دەربڕی، کە ئەو بیروڕایە ئەگەر لەلایەن کەسێکی زیرەکترەوە بوایە، دەبووە هۆی سەربەرزی بۆی، لە ڕاستیدا هەر لە بەر ئەوەیە ناوی دێنم: ئەوەی کتومت چۆتەوە سەر فیۆدۆرپاولۆویچ، بە قەولی خۆمان کوڕی باوکی خۆیەتی، ئەو ئیوان فیۆدۆرۆویچەیە.»

«بەم وتەیە دەست لە باسکردنی کەسایەتیی ئەو هەڵدەگرم، کە باش نییە لەوە زیاتری لە سەر بڕۆم و وەک قشقەڕە بقڕێنم و داهاتووی ئەو لاوە لەقاو بدەم. ئەمڕۆ لەم دادگایەدا دیمان کە وزەی ڕاستەوخۆی هەقیقەت لە دڵی ئەو لاوەدا دەژی و خۆڕانان بە تاوان و پیازە و بێئیمانییەوە دەکا و ئەوەشی بە میرات پێبڕاوە نەک لەڕێی ئاوەز و بیرۆکەی سەربەخۆوە، هەر

ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی سەبارەت بە بنەماڵەکەیان سارد وسڕ بێت و هیچ هەستێکی لەدڵدا نەبێ.»

«بەڵام کوڕی سێهەم، ئەو هێشتا گەنجە و زۆر بەحەیا و خاوەن ئیمانە. جیاوازیشە لەو شیمانەی ژیانە تاریک و فەوتێنەرەی برا گەورەکەی و ڕوونتر بیڵێم، دەگەڕێ تاکو بەو «بیرۆکە خەڵکییانەوە» بنووسێ کە لە جەغزی ڕوانینی چینی بیریاری ئێمە دایە و لە ناخی ئەم ناوە زیرەکانەیەوە سەرهەڵدەدا، ئەو بە کڵێسەوە نووسا و تۆزێکی مابوو ببێتە ڕاهیب. پێموایە ئەو بێئیختیار و زۆر زووش پشتی لەو ناهومێدییە پڕ لە ترسە کرد کە تاقمێکی زۆر لە کەسانی کۆمەڵگای ناشادی ئێمە، کە ترسیان لە خۆ ڕانان بە پیازە و تاوان و کاردانەوە پڕ لە گەندڵییەکەی هەیە و تەواوی سەرەڕۆییەکان بە هەڵە پێوەندی دەدەن بە ڕۆشنگەریی فەڕەنگییەوە. واشیان لێدەکا تاکو بە قەولی خویان بە «خاکی وڵات»ەوە بنووسێن و بەرینەدەن. ئەوان بەجێی ئەوەی ڕاستەوخۆ ئاماژە بە سەرەڕۆیی و گەندەڵێی کۆمەڵگا بکەن، تەواوی بەدبەختی و چارەڕەشیمان لەناوچاوی فەرهەنگی ئەورووپایی دەزانن و هەر وەک منداڵانێک کە لە فریشتە و جندۆکە دەترسن و پەنا بۆ مەمکی وشککردووی دایکیان دەبەن و جگە لە خەوێکی ئارام هیچ ئارەزوویەکی دیکەیان نییە. تەنانەت بۆ دەربازبوون لە چنگ ئەو تاپۆ خەیاڵییانەی کە دەیان ترسێنێ، دەخوازن تەواوی ماوەی تەمەنیان ئۆقرە بگرن. من بەشبەحاڵی خۆم بەختەوەریی ئەو لاوە ژیر و دڵپاکە بەئاوات دەخوازم و هیوادارم دڵپاکی و میهرەبانییەک کە تایبەتی تافی لاوییە و ئەو بەرەو لای بیرۆکەی خەڵکی دەبا، وردە وردە و بە شێوەیەک کە زیاتر بەرچاوە و دەبیندرێ، لەگەڵ سۆفیگەرییەکی کوێرانە و دەمارگرژییەکی سیاسی تێنەکەوێ، چونکە ئەم دوو عەیبە ڕەگەزییە بۆ ڕووسیا لە فەوتانێکی زووڕەس مەترسییدارترە. هۆیەکەشی پێکەوە نەسازان و پیرەوی کردنێکی بێهوودە لە ڕۆشنگەریی فەڕەنگییە، کە براکەی تووشی بووە و زۆریش مەترسیدارە.»

کاتێک باسی دەمارگرژی و عیرفانی کرد، دوو سێ کەس دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان. لە ڕاستیدا ئیپۆلیت کیریلۆویچ بە هۆی زمان پاراوییەوە گەرم داهاتبوو و شوێن و کاتی لە بیر چووبۆوە و وتەکانیشی هیچ پێوەندییەکی بە پەروەندەکەوە نەبوو، ئەوەش بەجێی خۆی کە زۆر لێڵ و تەمومژاوی دەدوا، بەڵام ئەم پیاوە سیلدار و تووڕەیە لە ماوەی تەمەنیدا ئەمجارەی بۆ هەڵکەوتبوو کە بتوانێ بە ئارەزووی خۆی قسە بکا و کوڵوکۆی دەروونی هەڵڕێژێ. خەڵکی دواتر دەیانگوت کاتێک ڕەخنەی لە ئیوان فیۆدۆرۆویچ گرتووە، کەوتۆتە ژێرکاریگەریی ئەنگێزەیەکی بێبایەخ، چونکە ئیوان یەکدووجار لە کاتی مشتومڕدا تووشی تەنگژەی کردبوو. ئیپۆلیت کیریلۆویچ بە وەبیرهێنانەوەی ئەو قسانە، ئێستا هەوڵیدەدا تۆڵەی لێبکاتەوە. بەڵام نازانم ئەو قسەیە ڕاست بوو یان نا. وەلحاسڵ ئەمە پێشەکیی وتەکانی بوو و دوای ئەو ڕاستەوخۆ چووە سەرباسی پەروەندەکە.

ئیپۆلیت کیریلۆویچ لە درێژەی وتەکانیدا گوتی: «بەڵام دێینە سەرباسی کوڕی گەورەی ئەم بنەماڵە هاوچەرخە. ئەویش ئەم تۆمەتبارەیە وا بەرەوڕوومان دانیشتووە. ژیان و کردەوەکانیمان لە بەر دەستدایە و کاتی ئەوە هاتووە هەموو شتێکمان بۆ ڕوون بێتەوە. بەپێچەوانەی براکانی کە ئەوان یەکیان «فەڕەنگیخوو» و ئەویتریان لایەنگری «یاسای خەڵک»ە. وادیارە ئەو ڕاستەوخۆ مەزهەری ڕووسیایە ئاخ، نەک هەموو ڕووسیا، هەمووی نا! ڕووسیای گەشەنەکردوو. سپاس بۆ خودا کە مەزهەری تەواوی ڕووسیا نییە، سەرەڕای ئەوەش نیشاندەری ڕووسیای خۆشەویستمانە و دەنگی ئەو دەنگی ڕووسیایە و بۆن و بەرامەی ڕووسیای دایکمانی پێوەیە. ئێمە لەلایەکەوە پشتمان بە تایبەتمەندیی نەژاد و ڕەگەزی خۆمان بەستووە و لەلایەکیتریشەوە ئاوێتەیەکین لە خێروشەڕ. کەوایە ئێمە لایەنگری فەرهەنگ و "شیلەر"ین. هەربۆیە لە مەیخانە و باڕەکان کێشە و هەرا ساز دەکەین و ڕیشی دۆستانی گەرماو و گوڵستانی خۆمان هەڵدەکەنین. ئاخ، ئێمەش دەتوانین باش و نەجیم بین، بەڵام کاتێک کە هەموو شتێک بە دڵی خۆمان بێ.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەندێشەی باڵا وامان لێدەکا لە خۆمان دەرچین، بەڵام تەنیا کاتێک کە ئەو بیرۆکانە بە پێی خۆیان بێن، یانی لە ئاسمانەوە نازڵ بن و پێویست نەبێ تاوانەکەی بدەینەوە. حەزمان لە دانەوەی تاوان نییە، بەڵام زۆرمان پێخۆشە وەریگرین لە هەموو شتێکیشدا هەر واین. ئاخ، تەواوی شتە چاکەکانی ژیانمان بدەنێ (بە کەمتر ڕازی نابین)، بەتایبەت هیچ لەمپەرێکمان نەخەنە سەر ڕێ، جا ئەو کاتە دەردەکەوێ کە ئێمەش دەتوانین باش و نەجیم بین. چاوچنۆک ببین، بەڵام دەبێ پارەمان هەبێ، پارەیەکی یەکجار زۆر، جا ئەو کاتە دەبینن چەندە دەستودڵبازانە و بێئەوەی دڵمان بۆی بسووتێ، بە شەوێک هەڵەخەرجی وەڕێ دەخەین و هەمووی لە ئاو دەکەین. بەڵام ئەگەر نەتوانین وەدەستی بێنین، دەردەکەوێ کە لە کاتی پێویستیی زۆردا حازرین خۆمانی بۆ بە ئاو و ئاوردا دەین. بەڵام ئەوە هەڵدەگرین بۆ دوایی، واچاکە ڕووداوەکان بەپێی شوێن و کات لەبەرچاو بگرین.»

«سەرتا، کوڕێکی چکۆلە و فەقیر و پاپەتیمان هەیە کە لە حەوشەی پشتەوەی ماڵەکەدا دەخولێتەوە، هەر وەک هاوشاریی خۆشەویست و بەڕێز و ڕەگەز ئاڵمانی، جەنابی هێرتێزنێستێوب فەرموویان. دیسان دووپاتی دەکەمەوە، پارێزەری لە تۆمەتبار ناخەمە سەرشانی کەسێکیتر. من ئامادەم سەرەڕای سزادان، پارێزەریشی لێبکەم. بەڵێ، من مرۆڤم، منیش دەتوانم کاردانەوەی بنەماڵە و منداڵ لە سەر کەسایەتیی کەسێک هەڵسەنگێنم. بەڵام ئەو کوڕە گەورە دەبێ، دەبێتە گەنج و بەرگی ئەفسەری لە بەر دەکا؛ بە هۆی دوئێل و سەرپێچی کردن بۆ شارێکی دوورەدەستی سنووری ڕووسیای پیرۆزکراومان دوور خرایەوە. لەوێ وەک بە پلەوپایەی ئەفسەرییەوە دەست دەکا بە کاری نابەجێ و سەرەڕۆیی. بەڵام چونکە بە کەم قەناعەت ناکات و چاوبرسییە، زۆری پێویستی بە پارە دەبێ، بەرلە هەموو شتێک پارە، هەربۆیە دوای شەڕەدەندووکەیەکی زۆر لەگەڵ باوکی پێکدێن و باوکی شەشهەزار ڕۆبڵی بۆ دەنێرێ. نامەیەکمان لە بەر دەست دایە کە تێیدا هاتووە، ئەگەر ئەو شەشهەزار ڕۆبڵە وەرگرێ ئیتر چاوپۆشی لە هەموو

شتێک دەکا و ئیتر هیچ ماف و میراتێکی لە لای باوکی نامێنێ و دوایی بە کێشەکەیان دێ.

پاشان دیدار لەگەڵ کچێکی بەڕێز و خانەدان و خوێندەوار. ئاخ، نامەوێ وردە ڕووداوەکان دووپات بکەمەوە؛ خۆتان هەموویتان بیستووە. چونکە لێرەدا مەسەلەی شەڕەف و فیداکاری لەئارادایە و من خۆ لەو بارە نادەم. قەڵافەتی ئەفسەرێکی لاو، کوڕێکی هەرزەی دەستبڵاو، لە هەمبەر خاتوونێکی بەڕێز و خانووماندا سەری کڕنۆش دادەنەوێنێ، ئەویش بە شێوەیەکی زۆر هاودڵانە بە چاوی خۆمان دیمان. دیسان ئەو مافە بە خۆم نادەم پڕکێشی بکەم. بەڵام دوای ئەوە بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکرا و هەر لەم دادگایەدا دیمان کە پێچەوانەی ئەوەش ڕوویداوە. یانی ئەو خاتوونە ڕەسەن و بەڕێزە کڕنۆشی بۆ ئەو بردووە. نامەوێ زۆری لە سەر بڕۆم و لێی بکۆڵمەوە، بەڵام هۆکارێکی بووە. هەر ئەو کەسە، بەچاوی فرمێسکاوی و ڕقەوە، گوتی کە بە هۆی ئەو کردەوەیەوە بەچاوی سووک تەماشای کردووە. ئەگەرچی کردەوەیەکی کتوپڕ و نەترسانە بووە، بەڵام بە ئەنگێزەیەکی بەرز و کەریمانەوە ئەو کارەی کردووە. ئەو، ئەو دەزگیرانی ئەوکچە، بەچاوی سووک تەماشای کردبوو. ئەوکچەش کاتێک دەزانێ هەڵیخەڵەتاندووە (وای فریو دابوو کە هەموو شتێکی لێقەبووڵ بکا و تەنانەت ئەگەر خەیانەتیشی پێکرد چاوپۆشیی لێبکاو هیچ نەڵێ) بەئانقەست سێهەزار ڕۆبڵی پێدابوو و بەڕاشکاوی تێیگەیاندبوو کە بۆیە ئەو پارەیەی دەداتێ، تاکو فریویبدا. ئەو پرسیارەش کە لە چاویدا بوو ئەمە بوو: «دەی ئەو پارە وەردەگری یان نا؟ یانی هەتا ئەو ڕادەیە بێئابڕوو بووی؟» ئەفسەری لاو چاوێکی لێدەکا، سووڕ دەزانێ چیی لەدڵدایە. (خۆی لێرە لە هەمبەر ئێوەدا دانیپێدانا کە فکری کچەی خوێندۆتەوە)، ئەو سێهەزار ڕۆبڵە بە بێهیچ مەرج و بەڵێنێک هەڵدەگرێ بۆ خۆی و لە ماوەی دوو ڕۆژدا لەگەڵ گراوی تازە لە ئاوی دەکا.

کەوایە دەبێ باوەڕ بە چی بکەین؟ بڕوا بە دیرۆکی سەروانی لاو بکەین کە بە ئەنگێزەیەکی کەریمانەوە دوایین ڕۆبڵی خۆی دەداتێ و بیری لێناکاتەوە،

واشی دادەنێ لەڕێی ئەشق و پاکیدا بەخشیویەتی، یان لەلایەکیترەوە هەتا ئەو ڕادەیە پڕ لە ڕق و بێزارییە؟ سروشتییە دەبێ نێوانی ئەو دوو جەمسەرە بگرین. بەڵام لەم پەروەندەیەدا ئەوبابەتە جێناگرێ. وێدەچێ ئەو لەلایەکەوە بە ڕاستی نەجیم و جوامێر و لەلایەکیتریشەوە هەرزە و خوێڕی بووبێ، بۆچی؟ چونکە ئەو خاوەنی خووخدەیەکی تۆڵاز و داوێنتەڕانەی کارامازۆفییە ـ ئەوەش ڕاست ئەو شتەیە کە دەمهەوێ پێیبگەم ـ کێ دەتوانێ زۆربەی شتە لێکدژەکان لە خۆیدا کۆکاتەوە و هەر لەو کاتەشدا سەبارەت بە دوو جیهان خەم دایبگرێ، یان بیری لێبکاتەوە. جیهانێک کە لە ژوور سەرمانە و جیهانی بەرزترین ئامانجە، جیهانی ژێرپێشمان یانی جیهانی ناحەزترین و دزێوترین خوێڕییەتییەکان. یەکێک لە شاهیدەکان کە سەعاتێک لەمەوبەر قسەیکرد و لە نزیکەوە بنەماڵەی کارامازۆف دەناسێ ـ مەبەستم ئاغای ڕاکیتینە ـ قسەکانی وەبیر خۆتان بێننەوە: «مانای خوێڕییەتی و ناپاکی بەقەد دەستودڵبازی و پاکی بۆ ئەو مرۆڤە سەرەڕۆ و داوێنپیسانە پێویستە و گرنگایەتیی پێدەدەن.» ئەوەش ڕاستە، ئەوان بەردەوام پێویستیان بەو ئاوێتە ناسروشتییە هەر هەیە. دوو جەمسەر، دوو جەمسەر گەلۆ، لە یەککاتدا، دەنا داماو و دڵشاکاو دەبن و ژیانێکی کوڵەمەرگییان دەبێ، ئەوان دڵفراوانن و بەقەد دڵفراوانیی ڕووسیای دایک شت لە خۆیاندا کۆ دەکەنەوە و تامڵێدەکەن.

گوێبگرن ئاغایانی لێژنەی داوەران، مەسەلەی ئەو سێهەزار ڕۆبڵەمان هێناوەتە گۆڕێ و من دەمەوێ جەسوورانە تاڕادەیەک پڕکێشی بکەم. دەتوانن کەسێکی ئاوا بێننە بەرچاوی خۆتان کە لەگەڵ وەرگرتنی ئەو بڕە پارەیە، ئەویش بەوشێوەیە و بە قیمەتی ئابڕووچوون و شوورەییەکی ئەوتۆ. توانیبێتی هەتا ئەو ڕادەیە پێویستی بە پارە بێ و خۆی بۆ بە ئاو و ئاوردا بدا، لەلایەکیشەوە هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵ بۆ ماوەی مانگێک بە ملیدا هەڵواسێ و بەملاولادا بیگێڕێ! یانی ئەوەندە خۆڕاگر بووە لەوکاتە ناسکانەدا دەستی بۆ ئەو پارەیەی سەرسینگی نەبردووە. کاتی مەستی و سەرخۆشی لە مەیخانەکان، کاتێک بە هەڵەداوان دەچوو دەستی لە بەر سامسانۆف و مادام

خۆخلاکۆف پاندەکردەوە و هەڵدەهات بۆ لای لیاگافی لە چێرماشنیا و هەوڵیدەدا بە هەرشێوەیەکە پاولۆویچی باوکی - دوورخاتەوە. ئەگەر ئەو پارەیەی پێبوایە قەتی ئاوا خۆی تووشی ئازار نەدەکرد کە گراوەکەی بەجێ بێڵێ و بڕوا بەدوای پارەکەدا، دڵنیام دادەنیشت هەتا ئاخری پێی دەگوت: «من لەگەڵتا دێم،» و ئەو کاتە دەیبرد و دەڕۆیشت بۆ شوێنێکی دوورەدەست، تاکو لە چنگ ئەو هەموو بەڵا و ئاپۆرەی دەوروبەری ڕزگاریبێ.

بەڵام ئەو دەست بۆ ئەو تەلیسمەی سەرسینگی نابا، دەی لە بەر چ هۆیەکیش ئاوا دان بەخۆیا دەگرێ؟ هەر وەک عەرزم کردن، دەلیلی سەرەکی ئەوە بوو کە هەرکاتێ گراوەکەی گوتی: «لەگەڵتا دێم و هی تۆم، بۆ هەرکوێم دەبەی بمبە،» پارەیەکی بە دەستەوە بێ بۆ خەرجی ڕێگا. بەڵام دەلیلی یەکەم بە وتەی تۆمەتبار خۆشی، لە هەمبەر دەلیلی دووهەمدا بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو. ئەو گوتی: هەتا کاتێک ئەو پارەیەم پێیە، هیچوپووچ و خوێڕیم، بەڵام دز نیم، چونکە هەرکاتێک پێمخۆشبوایە دەمتوانی بچم بۆ لای دەزگیرانە سووکایەتی پێکراوەکەم و نیوەی پارەکەی پێبدەمەوە و پێیبڵێم: «دیوتە نیوەی پارەکەم لەئاو کرد و دەرکەوت کە مرۆڤێکی خوێڕی و گەندەڵم و ئەگەر پێتخۆشە، هیچوپووچیشم!» (ئەم قسانەم دەقاودەق لە زاری تۆمەتبار بیستووە)، «بەڵام هەرچەندە هیچوپووچ و خوێڕیش بم، دز نیم، چونکە ئەگەر دز بوایەم، ئەو نیوەشم بۆ نەدەهێنایەوە و وەک نیوەکەی‌تری حەپەنۆشم دەکرد!» ئەوە قسە و دەلیل! ئەم پیاو ئاڵەتییە، ئەوەندە بێ‌جەرگ بووە، کە نەیتوانیوە لە هەمبەر وەسوەسەی سێ‌هەزار ڕۆبڵدا، ئەویش بە قیمەتی ئەو شوورەیی و ئابڕووچوونە، خۆڕاگری بکا، کەچی لە ناکاو غیرەتێک لە دەروونی دەزێ، هەزاروپێنج سەد ڕۆبڵ لەگەڵ خۆی بەم‌لاولادا دەگێڕێ بێ‌ئەوەی دەستی بۆ بەرێ. ئایا شتێکی لەگەڵ ئەو خووخدەیەی دامانە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە، یەک دەگرێتەوە؟ نا، من ئەگەر ئیزنم بدەن عەرزتان دەکەم دیمیتری کارامازۆفی ڕاستەقینە لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا چیدەکرد، هەڵبەت بە شێوەیەک کە بە ڕاستی خۆی قانع کردبوو کە ئەو پارەیە وەلا بخات.

لەگەڵ یەکەم وەسوەسە بۆ وێنە، ڕابواردن لەگەڵ ژنێک کە نیوەی پارەکەی لەگەڵ ئەو بەبا دابوو توورەکەکەی هەڵدەپچڕی و وای دانێین سەرەتا سەد ڕۆبڵی لێ دەردێنا، چونکە بۆ دەبێ ڕاست نیوەی ئەو پارەیە، یانی هەزاروپێنج سەد ڕۆبڵ بداتەوە بە خاوەنەکەی. بۆ هەزاروچوارسەد ڕۆبڵ بوایە ئاسمان دەڕووخا؟ ئەو کاتەش هەر دەیتوانی بڵێ خوێڕی و هیچوپووچە، بەڵام دز نییە، چونکە هەزار و چوار سەد ڕۆبڵی بۆ بردۆتەوە. پاشان جارێکی دیکەش توورەکەکەی هەڵدەپچڕی و سەد ڕۆبڵییەکی دیکەی دەردەهێنا و پاشان سەدیی سێهەم و سەدی چوارەم و هەتا ئاخری مانگ دوایین سەدیی دەردەهێنا، هەستیدەکرد ئەگەر تەنیا ئەو سەد ڕۆبڵەش بەرێتەوە بۆ کاترینا ئیوانا، ئامانجەکەی وەدیهاتووە، یانی هەرزە و هیچوپووچە، بەڵام دز نییە. دووهەزارونۆسەد ڕۆبڵم خەرجکردووە، بەڵام لانیکەم سەد ڕۆبڵم هێناوەتەوە و ئەگەر دز بوایەم هەموویم خەرجدەکرد و چاوت پێینەدەکەوتەوە. لە کۆتاییدا کاتێک دەبینێ تاقە گەڵایەکی سەد ڕۆبڵیی پێماوە، چاوێکی لێدەکا و بە خۆی دەڵێ: «بەڕاستی بردنەوەی ئەو سەد ڕوبڵە هیچ بایەخێکی نییە و عەیبیشە، چاکتروایە ئەوەش خەرجکەم!» دیمیتری کارامازۆفێکی ڕاستەقینە، ئەو جۆرەی کە دەیناسین، بەمشێوە هەڵسوکەوتی دەکرد. بەسەرهاتی ئەو توورەکەیە بە هیچ شێوەیەکی لەگەڵ ڕاستی یەک ناگرێتەوە. دەتوانین هەموو شتێک بەڕاست بزانین، بەڵام بە هیچ شێوەیەک ئەوە ناکرێ. بەڵام دواتر دەگەڕێینەوە سەر ئەو باسە.»

دوای ئاماژەکردن بە هەموو ئەو زانیارییانەی سەبارەت بە کێشە و حیساب و کیتابی باوک وکوڕ درابوو، بەو ئاکامە گەیشتن کە ئەو مەسەلەیە بە هیچ شێوەیەک ڕوون نابێتەوە و مەعلووم نییە هەق بەکامیانە. ئیپۆلیت کیریلۆویچ هاتە سەر باسی ئەو سێهەزار ڕۆبڵەی کە زەینی میتیای بە خۆیەوە خەریک کردبوو و لە سەر ئەو باوەڕە بوو باوکی پێی قەرزدارە. بۆیە بە پێی شایەدیی پزیشکەکان لەو بارەوە دەستیکرد بە ئاخافتن.

(٧)

# لێکۆڵینەوەی مێژوویی

پزیشکە پسپۆڕەکان هەوڵیانداوە پێمان بسەلمێنن کە تۆمەتبار شێت و لێوەیە، من دەڵێم ئەو شێت نییە، ئەوەش تەنانەت زۆر خراپترە، چونکە ئەگەر شێت نەبوایە، زیرەکانەتر ئەو کارەی دەکرد. بەڵام سەبارەت بە ماخولیا بوونەکەی، لەگەڵ ئەوەدا کۆکم، بەڵام لە خاڵێکدا، تەنیا لەو خاڵەدا کە پزیشکانی پسپۆڕ ئاماژەیان پێکرد، یانی ئەو کامووسەی سەبارەت بەو سێهەزار ڕۆبڵەیە کە وێدەچێ باوکی پێیقەرزدار بووبێ. سەرەڕای ئەوانەش پێموایە دەتوانین هۆیەکی ساناتر لە تێکچوونی بۆ بدۆزینەوە. من خۆم لەگەڵ ئەو دوکتۆرە لاوە هاوڕام کە دەڵێ تۆمەتبار لە هەموو بارێکەوە ئاساییە و تەنیا توورە و ڕقئەستوورە. خاڵی دروستیش ئەوەیە. ئامانجی تۆمەتباریش لەو ڕقهەستان و توورەییە تەنیا لە بەر ئەو برە پارەیە نەبووە؛ بەڵکو هۆیەکی تایبەتی هەبووە. ئەو هۆیەش ئێرەیی و دڵپیسی بووە!».

لێرەدا، ئیپۆلیت کیریلۆویچ بە وردی سەبارەت بەو دڵدۆڕاوییە نەخسەی تۆمەتبار دووا کە تا ئەو ڕادەیە بۆ گرووشنکا سووتابوو. وتەکانی لەوساتەوە دەستیپێکرد کە تۆمەتبار خۆ دەکا بە ماڵی ئەو «خاتوونە جحێڵەدا بۆ ئەوەی لێیدا.» دادوەر لە قسەکانیدا گوتی: «وتەی تۆمەتبار خۆیەتی بەکاری دێنم. بەڵام بەجێی لێدانی، لەوێ لە بەر پێیدا دانیشت. ئەمە سەرەتای ئاشق بوونی بوو. هەر لەو کاتەدا باوکی تۆمەتباریش دڵی بەو خاتوونە شۆخوشەنگەوە بوو ـ ڕێکەوتێکی نەخس و سەرسووڕهێنەر بوو،

چونکە هەردووکیان هاوکات دڵیان چووە سەری و ئاشقی بوون، ئەگەرچی هەردووکیان پێشتر دیبوویان و دەیانناسی. ئەویش بەهێزترین گڕی هەوەسی لەناخیاندا هەڵگیرساند کە تایبەتی بنەماڵەی کارامازۆفە. دانپیانانی خۆشیم بیستووە: «پێکەنینم بە هەردووکیان هات.» بەڵێ لە ناکاو دێتە سەر ئەوەی هەردووکیان لە خشتە بەرێ. پێشتر ئەو ئارەزووەی لەسەردا نەبوو، بە ئێستا کتوپڕ ئەوەی بە زەین گەیشت و هەردووکیانی خستە داوی ئەشقی خۆیەوە. پیرەپیاو کە ڕۆح و گیانی بە پارەوە بەندبوو، هەر لەڕێوە سێهەزار ڕۆبڵی لاخست تاکو هەرکاتێک گرووشنکا هاتە ژوانی بیداتێ، بەڵام دوای ئەوە زۆر زوو هاتە سەر ئەوەی کە ئەگەر شووی پێبکا تەواوی ماڵ و سامان و ناوەکەی دەڕێژێتە بەر پێی. لەو بارەوە بەڵگەشمان بە دەستەوەیە. سەبارەت بە تۆمەتباریش بڵێم چی، تراژیدیای چارەنووسی ئەو ئاشکرایە؛ لە بەرانبەرماندا دانراوە. بەڵام «پێڕابواردنی» ئەو خاتوونە شۆخوشەنگە ئاوابوو. ئەو جادووبازە تەنانەت تۆزە هیوایەکی بەو لاوە ناشادە نەدا. چونکە هیوا، هیوای ڕاستەقینە، هەتا دوایین سات هەر دریغیی لێکرا، یانی هەتا ئەو کاتەی میتیا لە بەر دەمیا چۆکی دادا و دەستی بۆ لای درێژ کرد، ئەو دەستانەی خوێنی باوکی - ڕەقیبە خیشەسەرەکەی - پێوە بوو. هەر لەو کاتەشدا بوو قۆڵبەستیان کرد. ئەو ژنەش، لە کاتی قۆڵبەستکرانیدا، بە پەشیمانییەکی سادقانەوە گوتی: «منیش لەگەڵ ئەودا بنێرن بۆ سیبیریا. من تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشەم کرد، لە ڕاستیدا من دەبێ سزا بدرێم.»

لاوی زمانپاراو، کە باسمکرد، یانی ئاغای ڕاکیتین، کە بەرپرسایەتیی ڕاڤەکردنی ئەو پەروەندەیەی لە ئەستۆ گرتووە، زۆر بە کورتی هاتە سەر باسی کەسایەتیی ئەو ژنە و گوتی: «هەر لە سەرەتای ژیانییەوە سەرکوێر کراوە، دەزگیرانەکەی فریویدا و بەجێیهێشت. بنەماڵە بەڕێزەکەشی بێبەریان کرد و هەژار و بێکەس مایەوە. پیرەپیاوێک باڵی وەسەر کێشا و هێشتاش هەر ئەو بە پشتیوان و دڵسۆزی خۆی دەزانێ، ڕەنگە دڵە

گەنجەکەی زۆری چاکە تێدا بووبێ، بەڵام زۆر زوو تواتوا بوو. بوو بە حیسابگەری سامسانۆف و پارەی لە سەر یەک هەڵچنی. لە هەمبەر کۆمەڵگادا بێزاری و گاڵتەجاڕیی کردە پیشە.» دوای ئەم زانیارییە لە سەر کەسایەتیی ئەو، بۆمان دەردەکەوێ کە شەیتان ئاسایی بە هەردووکیان پێکەنیوە.

تۆمەتبار دوای مانگێک ئەوینی هیوابڕاوانە و زەبوونیی ئەخلاقی کە لەو ماوەیەدا خەیانەتی بە دەزگیرانەکەی کرد و پارەیەک کە بە شێوەی ئەمانەت پێی سپێردرابوو، نایە تەنگەی باخەڵی و پاشان بە هەڵەخەرجی هەمووی لەئاو کرد. بە هۆی ئێرەیی بردنی بەردەوامەوە وەک شێتی لێهات ـ ئێرەییش بە کێ دەبا؟ بە باوکی! لەوەش خراپتر ئەوەی ئەو پیرەپیاوە شێتە بەو سێهەزار ڕۆبڵە دەیویست دولبەرەکەی وەسەر تەماح بخا و بیخاتە داوەوە. هەر ئەو سێهەزار ڕۆبڵەی کە کوڕە گەورەکەی بەچاوی بەشەماڵی خۆی چاوی لێدەکرد و بەشێک لەمیراتی دایکی بوو، کە باوکی لێیداگیر کردبوو، بەڵێ، دانی پێدادەنێم کە تاملکردنی دژوار بوو؛ مرۆڤی تووشی شێتی دەکرد. مەسەلەی پارە لەگۆڕێدا نەبوو، بەڵکو ئەم ڕاستییە کە ئەم پارەیە بە شاتوشووت و خۆڕانان بەوتاوانە جاڕزکەرەوە لەکار دەکرا بۆ ئەوەی بەختەوەرییەکەی لە نێو بەرێ!»

پاشان دادوەر هاتە سەرئەوەی کە تۆمەتبار چۆن لە سەری داوە باوکی بکوژێ، بیروڕای خۆشی بەڕاستییەکان ڕوون دەکردەوە.

«سەرەتا تەنیا لە نێو مەیخانەکان باسمان دەکرد ـ ئەو مانگە هەر لە سەر ئەوە ڕۆیشتین. ئاخ، ئێمە پێمان خۆشە شان بە شانی هاورێکانمان بچینە پێشێ، هەروەها پێمان خۆشە هەموو شتێک لە لای هاوڕێکانمان بدرکێنین، تەنانەت پڕمەترسیترین و دڕاندانەترین بیرۆکەکانیشمان؛ پێمان خۆشە لە هەموو بیرۆکەیەکدا خەڵکی بەشدار بکەین و لە بەر هۆیەک دەخوازین تەواوی ئەو کەسانەی کە دەیانکەینە مەحرەمی ڕازی خۆمان، بە هاودڵییەکی تەواوەوە لەگەڵمان بەرەوڕوو بن و ببنە شەریکی شڵەژان و

دڵەخورپەکانمان. لایەنی ئێمە بگرن و لە هیچ کارێکدا دژایەتیمان لەگەڵ نەکەن. دەنا ئاڵەتی دەبین، لە دین دەردەچین و لە مەیخانە هەموو شتێک وردوخاش دەکەین و دەیشێوێنین.» (پاشان باسی ڕووداوەکەی سەروان ئیسنگیریف کرا.) «ئەوانەی چاویان بە تۆمەتبار کەوت و قسەکانیان بیست، پێیان وابوو سەبارەت بە باوکی دەستدەکا بە هاتوهاوار و گوڕەگوڕ و شێتبازارییەک وەڕێدەخا و لەوانەیە دەستیش بکا بە هەڕەشە و گوڕەشە.» (لێرەدا دادوەر باسی دیدارەکەی بنەماڵەی کارامازۆفی کرد لە کلێسە و وتوویژ لەگەڵ ئالیووشا و دیمەنی دڵهەژێنی پەلامارەکە، ئەو کاتەی تۆمەتبار دوای شام هێرشی بردبووە سەر ماڵی باوکی.)

دادوەر لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «ناتوانم لێبڕاوانە بڵێم کە تۆمەتبار بەر لەو ڕووداوە قەستی کوشتنی باوکی لەدڵدا بووە. بەوحاڵەش ئەم بیرۆکەیە چەند جار بە زەینیدا هاتبوو و بیری لێکردبووە ـ لەو بارەوە ڕاستییەکان و شایەد و وتارەکەی خۆیمان هەیە.» پاشان گوتی: «برایانی لێژنەی داوەری، دان بەوەدا دەنێم کە هەتا ئەمڕۆ دوودڵ بووم کە تۆمەتبار پێشتر قەستی ئەو کارەی بووە یان نا. تەواو قانع بووبووم کە لەپێشدا چەندین جار دیمەنی ئەو ڕووداوە شوومەی هێناوەتە بەرچاوی خۆی و لێیڕوون بووە کە دەتوانێ ئەو کارە بکا، بەڵام بە وردی بیری لەوە نەکردبۆوە چۆن و کەنگێ ئەو کارە دەکا.

بەڵام تەنیا هەتا ئەمڕۆ دوودڵ بووم، یانی تا کاتێک خاتوو وێرخۆفتیسۆف ئەو بەڵگەیەی دا بە دادگا. خۆتان گوێتان لە قسەکانی بوو: «خۆی پیلانێکە، سیناریۆی پیاوکوژی!» ئەو بەم شێوە باسی نامەنووسینی ئەو تۆمەتبارە ناشادەی لە کاتی مەستیدا کرد. لەڕاستیشدا، بەو نامەیەدا بۆمان دەردەکەوێ کە هەموو ڕووداوەکە بە پێی پیلانی لەپێشدا دارێژرا و بەڕێوە چووە. نامەکە دوو ڕۆژ بەرلە ڕووداوەکە نووسراوە، کەوایە دەتوانین دڵنیا بین کە تۆمەتبار چل و هەشت سەعات بەرلە دارشتنی ئەو پیلانە سامناکەی، سوێند دەخوا ئەگەر ڕۆژی داهاتوو ئەو پارەیە

وەدەستنەهێنێ، باوکی دەکوژێ و ئەو پاکەتە پارەیە لە ژێر باڵنجەکەی دەردێنێ، «بە بزگورێکی پەمەیی بەستراوە، هەڵبەت ئەگەر ئیوان لە ماڵ نەبێ.» « هەڵبەت ئەگەر ئیوان لە ماڵ نەبێ» ـ سەرەنجبدەن؛ دەردەکەوێ بیری لە هەموو شتێک کردۆتەوە و تەواوی بارودۆخەکەی هەڵسەنگاندووە، هەموو شتێکیشی ڕاست بەو شێوە ئەنجامداوە کە نووسیویەتی. کەوایە خاترجەمین کە پێشتر قەستی ئەو کارەی بووە؛ ئەو جینایەتەی بۆ پارە کراوە، ئەو خاڵەش بەڕوونی باسکراوە، یانی بە نووسراوە و ئیمزاوە لە بەر دەستمان دایە. تۆمەتبار خۆ حاشا لە ئیمزاکەی خۆی ناکا.

دەڵێن ئەو کاتی نووسینی نامەکە مەستبووە. بەڵام ئەو قسەیە بایەخی نامەکە کەم ناکەتەوە، تەواو بەپێچەوانە؛ ئەو لە کاتی مەستیدا شتێکی نوسیوە کە کاتی وشیاری پیلانەکەی بۆ داڕشتووە. ئەگەر لە کاتی وشیاریدا پیلانەکەی بۆ دانەڕشتایە، کاتی مەستی ئەوەی نەدەنووسی. دەپرسن: کەوایە بۆ لە مەیخانەکان باسیدەکرد؟ کەسێک کە بۆ جینایەتێکی ئاوا قەستی پێشووی هەبێ، زمانی ناگەڕێ و لە لای هیچکەس نایدرکێنێ. بەڵێ، بەڵام بەر قەستی پێشوو و داڕشتنی پیلان، باسیدەکرد، یانی کاتێک کە دڵی پێوە نەبوو ئەو کارە بکا و تەواو لە سەری ساغ نەبووبۆوە. دوای ئەوە ئیتر زۆری خۆ لە قەرەی ئەو قسە و باسانە نەدەدا. ئەونامەیەی شەوێ لە مەیخانەی میترۆپۆلیس نووسی و بەپێچەوانەی عادەتی پێشووی بێدەنگ بوو، ئەگەرچی خەریکی خواردنەوە بوو. بیلیاردی نەکرد. لە قوژبنێک دانیشت لەگەڵ هیچ کەس نەدوا. لە ڕاستیدا دووکانداریکی لە جێی خۆی هەستاند، بەڵام ئەم کارەی تاڕادەیەک بێئیختیار و بەپێی عادەت ئەنجامدا. چونکە بەبێ وەڕێخستنی کێشە و هەرا نەیدەتوانی بچێتە مەیخانەیەکەوە. ڕاستە لەوانەیە دوای بڕیاردانەکەی هەستی بە نیگەرانی کردبێ کە زۆری باسی پیلانەکەی و قەستەکەی کردووە و هەر ئەوەش دوای بەڕێوەبردنی پیلانەکە، لەوانەیە ببێتە هۆی قولبەستکرانی. بەڵام ڕێگایەکی دیکەی پێ شک نەهاتووە؛ نەیتوانیوە قسەکانی خۆی وەرگرێتەوە، پێشتر بەختەکەی

هێنابووی و دیسانیش دەیهێنێ. خۆ دەزانن ئێمە ئیمانمان بە بەختی بەرزمان هەیە! با ئەوەشتان عەرز بکەم تاوانبار بۆ خۆپاراستن و شوێنەونکێ ئەوپەڕی هەوڵی خۆی داوە. هەر وەک بەو شێوازەی تایبەت بە خۆی دەنووسێ: «سبەینێ حەولی خۆم دەدەم و ئەو پارەیە لە کەسێک قەرز دەکەم. ئەگەر ئەوەشم بۆ جێبەجێ نەبێ، خوێن دەڕێژم.» ئەمەش هەر لە کاتی مەستیدا نووسراوە و دیسان لە کاتی وشیاریشدا بەڕێوەی بردووە. ڕاست ئەو جۆرەی کە نووسیبووی.»

لێرەدا ئیپۆلیت کیریلۆویچ بە وردی باسی هەوڵەکانی میتیا بۆ وەرگرتنی پارە و خۆپاراستن لەو جینایەتەی کرد. هەروەها باسی دیدارەکەی میتیا لەگەڵ سامسانۆف و چوون بۆ لای لیاگافیی کرد، کە هەموویان شایەدییان لە سەر درابوو. «وەزاڵە هاتووە، گاڵتەی پێکراوە، برسی و شەکەت ـ دوای فرۆشتنی سەعاتەکەی بۆ خەرجی ڕێگا (ئەگەرچی دەڵێ هەزاروپێنج سەد ڕۆبڵی پێبووە) ـ خۆرەی ئێرەییش کەوتۆتە گیانی و ترسی ئەوەی بووە کاتێک لە شار چۆتە دەرێ لەوانەیە چاوی ئەوی لێخافڵ بێ و گراوەکەی بچێ بۆ لای فیۆدۆرپاولۆویچ. پاشان دەگەڕێتەوە بۆ نێوشار و بە شادییەوە بۆی دەردەکەوێ کە گراوەکەی نەچووە بۆ لای ڕەقیبەکەی. هەتا ماڵی کۆزماکوزۆویچ سامسانۆف بەڕێی دەکا. (سەیریش ئەوەیە دڵپیسی لە سامسانۆف نەکردووە، کە ئەوە لەباری ڕەوانناسییەوە جێی سەرنجە.) پاشان بە پەلە دەگەڕێتەوە نێو باخچەکەی پشت ماڵی باوکی کە لەوێدا دەچووە بۆسەوە و چاوی لە سەر دەرگاکە هەڵنەدەگرت، نەکا گرووشنکا بچێتە ژوانی باوکی. هەر لەوێ ئاگادار دەبێ ئیسمیر دیاکۆف سەرودڵی لێهاتووە و ئەو خزمەتکارەی دیکەش نەخۆشە ـ کەوایە هیچکەس نییە پێشی پێبگرێ، «عەلامەتە»کانیش دەزانێ ـ تووشی بیرەبیرە دەبێ! هەروا لە هەمبەر ئەو بیرەبیرەیەدا خۆڕاگری دەکا؛ دەچێ بۆ لای خاتوونێک کە ماوەیەکە لەم شارە نیشتەجێ بووە و هەموومان ڕێزی زۆرمان بۆی هەیە، مادام خۆخلاکۆف. ئەم خاتوونە، لەمێژەبووە بە دڵسۆزییەوە ئاگاداری

کاروبارەکانی بووە، ئامۆژگاریی زۆر حەکیمانەی دەکا، بۆ ئەوەی لەو ژیانە ئالۆز و دەستبلاوی و ئەشق و ئاشقییە ناڕەوایە و بەفیڕۆدانی وزەی لاوی لە مەیخانەکان دەست هەڵگرێ و بچێ بۆ دۆزینەوەی کانگای ئاڵتوون لە سیبیریا: «ئەوە دەروویەکە بۆ دەرباز بوون لە دەست وزەی سەرەڕۆیانە و خووخدەی ڕۆمانتیک و کێشە و ئالۆزییەکانی تافی لاویت.»

دوای باسکردنی ئاکامی ئەو وتووویژە و ئەو کاتەی تۆمەتبار ئاگادار دەبێ گرووشنکا لە ماڵی سامسانۆف نەماوەتەوە، ئۆقرە لێ‌هەڵگیرانی میتیای چارەڕەش، کە دڵپیسی و ئێرەیی بڕستی لێبڕیبوو، خەیاڵی ئەوەش کە نەکا گرووشنکا فریویدابێ و ئێستا چووبێتە ژوانی باوکی، ئیپۆلیت کیریلۆویچ دێتە سەرباسی کاردانەوەی نەخسی بەخت. «ئەگەر فینیای کلّفەت پێیبگوتایە گرووشنکا چووە بۆ ماکرۆیە و لە لای دەزگیرانە پێشووەکەیەتی، ئەو ڕووداوە نەدەقەوما. بەڵام لە ترسانا وەک شێتی لێهات و لە پەستا سوێندی دەخوارد و دەیگوت نازانێ لە کوێیە. دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بۆیە نەیکوشت، چونکە زۆری پەلە بوو بۆ ئەوەی گراوە غایەنەکەی بدۆزێتەوە.

«بەڵام سەرنجبدەن، ئەگەرچی ئەو هەمووە تووڕە و تۆسن بوو، بەو پەلەپەلەش دەسکاونگەکەی لەگەڵ خۆی برد. بۆ دەسکاونگ؟ بۆ چەکێکی دیکەی نەبرد؟ بەڵام بەوەدا کە مانگێکی ڕەبەقە بیری لەو پیلانە کردۆتەوە و خۆی بۆ ئامادە کردووە، هەر شتێکی وەبەرچاو بکەوتایە هەڵیدەگرت. لە ماوەی مانگی ڕابردوودا بەو ئاکامە گەیشتبوو کە شتێکی ئاوا کاری دەمانچەیەک دەکا، هەر بۆیە لەڕێوە دەستی دایە و زانیی کارەکەی بەوە جێ‌بەجێ دەبێ. کەوایە هەڵگرتنی ئەو دەسکاونگە بە هیچ شێوەیەک بێ‌ئیختیار و لەخۆڕا نەبووە. پاشان دەچێتە حەوشەی ماڵی باوکی و هیچ ملۆزمێک نابینێ، جگە لە تاریکی و ئێرەیی، هیچ شتێکی دیکەش لە گۆڕێدا نابێ. گومانی ئەوەی گرووشنکا لەوێیە، لەگەڵ ڕەقیببەکەیەتی و لە باوەشیدایە و ڕەنگە ئێستا بەو پێبکەنێ کە ئەو کڵاوەی لە سەری ناوە، وە

هەناسەبڕکێی دەخا. تەنیا هەر گومان و ئێرەیی نەبوو، بۆ لەخۆڕا باسی گومان و ئێرەیی بکەین ـ دەرگای فێڵ و دەهۆ ئاواڵە بوو، ئاشکرا بوو. ئەو حەتمەن لەوێیە، لەو وەتاغە ڕووناکەدا، لەپشت پەردەکەیە. حەتمەن لەوێیە. تۆمەتبار دەیهەوێ پێمان بسەلمێنێ کە بە دزییەوە چۆتە بەرپەنجێرەکە، بەڕێزەوە سەری کێشاوەتە ژوورەکە و لە ترسی ئەوەی نەکا ڕووداوێکی ترسناک و بێئەخلاقانە بقەومێ، بەئەدەبانە کشاوەتە دواوە. هەوڵیشدەدا ئەوەمان پێبسەلمێنێ، ئەویش بە ئێمە، کە لە خووخدەی دەگەین و دەزانین لەو کاتەدا لە چ هەلومەرجێکدا بووە. ئەوەش دەزانین کە ئەو عەلامەتانەی زانیوە کە بە هۆی ئەوانەوە دەتوانێ بچێتە ژوورێ.» لێرەدا ئیپۆلیت کیریلۆویچ باسەکەی ڕاگرت و بە پێویستی زانی ئاماژەیەکیش بە ئیسمیر دیاکۆف بکا و لەو بارەوە شیکردنەوەیەکی کورت بدا بە دەستەوە. بۆ ئەوەی پێوەندیی گوماناویی ئیسمیر دیاکۆف لەگەڵ قاتڵ ڕەشکاتەوە و ئەو بیرۆکە بە تەواوی لە زەینیان دەرهاوێژێ. لەو بارەوە ئەوپەڕی هەوڵی خۆی نواند و هەمووان بۆیان دەرکەوت، ئەگەرچی ئەو گومانە بە شتێکی بێبنەما دەزانێ، گرنگایەتییەکی تەواو بە مەسەلەکە دەدا.

## (٨)

## باسێك سەبارەت بە ئیسمیر دیاكۆف

«سەرەتا، ئاخێزگەی ئەو گومانە چی بوو (ئیپۆلیت كیریلۆویچ ئاوای گوت)؟ یەكەم كەس كە هاواریكرد ئیسمیر دیاكۆف قاتڵە، تۆمەتبار بوو لە كاتی قوڵبەستكراندا. بەڵام لەو كاتەوە تا ئێستا چكۆلەترین دەلیلی بۆ سەلماندنی ئەو تۆمەتە بە دەستەوە نەداوە. ئەو تۆمەتە تەنیا سێ كەس قەبووڵیانە ـ دووبراكەی و خانمی ئیسۆتیلۆف. ئیوان فیۆدۆرۆویچی برای ئەمڕۆكە بێگومان تووشی یاوی مێشك بووبوو، باسی گومان و دڕدۆنگیی خۆی كرد. بەڵام دەزانین لە ماوەی دوومانگی ڕابردوودا لەمەڕ تاوانی براكەیەوە بە تەواوی لەگەڵ ئێمە هاوڕا بوو و هەوڵی نەدەدا لەگەڵ ئەو بیروڕایە دژایەتی بكا. بەڵام ئەوە هەڵدەگرین بۆ دوایی. برا چكۆلەكەیان دانیپیانا كە چكۆلەترین دەلیلی نییە بۆ سەلماندنی ئەوەی كە ئیسمیر دیاكۆف تاوانبارە. تەنیا بە قسە و ڕەنگ و ڕووی تۆمەتباردا بەو ئاكامە گەیشتووە. بەڵێ، ئەو ئەمڕۆ ئەم دەلیلە سەرسووڕهێنەرەی دووجار هێناوەتەوە. قسەی خانمی ئیسۆتیلۆف لە هی ئەویش سەرسووڕهێنەرتر بوو، «ئەوەی تۆمەتبار دەیڵێ دەبێ باوەڕی پێبكەن؛ ئەو مرۆڤێك نییە درۆ بكا.» ئەوە هەموو ئەو دەلیل و هۆیانەیە كە بە دژی ئیسمیر دیاكۆف لەلایەن ئەو سێ كەسەوە شایەدیی لە سەر دراوە. چونكە ئەو سێ كەسە زۆر دڵگرانی چارەنووسی تۆمەتبارن. بە هۆی ئەو بیروڕایانەوە تاوانی ئیسمیر دیاكۆفیش كەوتۆتە سەر زمانان. یانی ئەوە جێی باوەڕە؟ یانی پیاو دەتوانێ بیریشی لێبكاتەوە؟»

لێرەدا ئیپۆلیت کیریلۆویچ بە پێویستیی زانی لە کەسایەتیی ئیسمیر دیاکۆفی ڕەحمەتی، «کە بە هۆی شێتییەوە خۆی لە نێو برد،» بکۆڵێتەوە. ئەوی بە مرۆڤێکی ئەقڵسووک زانی، هێندێکی زانیاریی پڕ لە کەموکووڕی بە دەستەوە بوو، کە ئەندێشەی فەلسەفی و زیاتر لەحەدی خۆی هاوسەنگییەکەی تێکدا، هەروەها بیروڕای هاوچەرخانەی سەبارەت بە ئەرکێک کە بە کردەوە لە ژیانی سەرەڕۆیانەی ئەربابەکەیدا ـ فیۆدۆرپاولۆویچ ـ کە ڕەنگە باوکیشی بێ، وەدەستهێنا، وێدەچێ لە کوڕی دووهەمی ئەربابەکەشی، ئیوان فیۆدۆرۆویچ، کە لەوانەیە بۆ سەرگەرم کردنی خۆی، یان نەدۆزینەوەی ئامانجێکی باشتر، ئەو کارەی کردبێ و وەک ڕابواردن چاوی لێکردبێ. ئیپۆلیت کیریلۆویچ لە شیکردنەوەی قسەکانیدا گوتی: «خۆشی باسی بارودۆخی ڕۆحیی خۆی بۆ کردم کە ئەو چەند ڕۆژە لە ماڵی باوکی ماوەتەوە. بەڵام کەسانێکیتریش لەو بارەوە شایەدیی خۆیان دا تۆمەتبار و گریگۆری ـ یانی تەواوی ئەو کەسانەی بە باشی دەیانناسی.»

«ئەو کاتە ئیسمیر دیاکۆف کە زەبری فێ و سەرودڵ لێهاتن، بناغەی لەشساغیی وەلەرزین خستبوو، «قەوەتی بە جووجەڵەیەک نەدەشکا». تۆمەتبار خۆشی بەرلەوەی بزانێ ئەو وتەیە چەندە بە زەرەدی خۆیەتی، ئەوەی بە ئێمە گوت: «ئەو خۆی دا بە سەر کەوشەکانمدا و لاقی ماچکردم.» هەروەها بەو شێوە بەیانەی تایبەت بە خۆی، سەبارەت بە ئیسمیر دیاکۆف گوتی: «ئەو جووجەڵەیەکی فێدارە.» تۆمەتبار ئەویشی وەک مەحرەمی ڕازی خۆی هەڵبژارد. (وتەکانی خۆی شایەدییە بۆ ئێمە)، بەهەڕەشە و گوڕەشەش ناچاری کرد سیخوڕیی بۆ بکا. وەک سیخوڕێکی ناوماڵ ئەربابەکەی خۆی هەڵخەڵەتاند و بوونی ئەو پاکەتە پارەیەی بۆ تۆمەتبار ئاشکرا کرد، هەروەها ئەو عەلامەتانەی کە تۆمەتبار بتوانێ بە هۆی ئەوەوە بچێتە ژووری. جگە لە گوتنی ڕاستیش هیچ چارەیەکی دکیەی نییە. کاتی لێپرسینەوە، لەحاڵێکدا تەنانەت لە هەمبەر ئێمەشدا دەلەرزی ئەگەرچی لەو کاتەدا ئەشکەنجەگەرەکەی قۆڵبەستکرابوو و نەیدەتوانی ئازاری پێبگەیێنێ ـ گوتی: «ئەگەر پێمنەگوتبایە، دەیکوشتم، لێمڕوون بوو

دەیکوشتم. هەمیشە لە من بەگومانبوو. بە ترس و لەرزەوە تەواوی ڕاز و نهێنییەکانم پێگوت بۆ ئەوەی ئارامی کەمەوە، بۆ ئەوەی تێبگا کە فریویناەدەم و بەوجۆرە گیانی خۆم ڕزگار کەم.» ئەوە ڕاست قسەی ئەوە. هەموویم نووسییەوە بۆ ئەوەی لە بیرم نەچێتەوە. «هەر کە دەیگوڕاند بەسەرمدا، ئەژنۆم وەلەرزین دەکەوت.»

«لەزاتی خۆیدا مرۆڤێکی دروستکار بوو، لەو کاتەوە ئەو چەند ڕۆبڵە پارەیەی ئەربابی دۆزیبۆوە و پێیدابۆوە، تەواو بووبووە جێی متمانەی، هەربۆیە وێدەچێ ئەو لاوە داماوە بە هۆی فێڵکردن لە ئەربابەکەیەوە، کە وەک سەرچاوەی بژێوی خۆی خۆشیدەویست، زۆری هەست بە پەژیوانی دەکرد. بەپێی وتەی شارەزاترین ڕەوانناسان، ئەو کەسانەی نەخۆشیی سەرودڵیان لەگەڵە هەمیشە خۆیان لۆمە دەکەن و زۆر خۆ بە کەمزانن. بەردەوام بەوە دڵگرانن کە دەرهەق بە کەسێک یان شتێک تووشی «تاوان» بوون، ویژدانیان ئازاریاندەدا، زۆڕجاریش بەبێ هۆ شتەکان لە خۆیان گەورە دەکەنەوە و هەموو جۆرە هەڵەو تاوانێک دەدەنە پاڵ خۆیان. لێرەشدا ئێمە لەگەڵ مرۆڤێکی لەوچەشنە تێکەوتووین کە ترس و تۆقین تووشی هەڵە و تاوانی کردووە.

سەرەڕای ئەوەش، لە دڵی چەقیبوو کە ئەو بارودۆخەی لەبەرچاوی زەقبۆتەوە، ئاکامێکی باشی نییە. کاتێک کوڕی دووهەمی فیۆدۆرپاولۆویچ، یانی ئیوان فیۆدۆرۆویچ، ڕاست بەر لە ڕووداوەکە، خۆی ئامادە کردبوو بچێ بۆ مۆسکۆ، ئیسمیر دیاکۆف تکایلێکرد نەڕوا. ئەگەرچی بە هۆی شەرمێونییەوە نەیتوانی هۆی ترسەکەی ڕوونبکاتەوە. دەستیکرد بە ئاماژە کردن، بەڵام ئەو لە ئاماژەکانی نەگەیشت. ئەوەشمان لە بیر نەچێ ئیوان فیۆدۆرۆویچی بە پارێزەر و پشتیوانی خۆی دەزانی و بوونی ئەویش لە ماڵەکەدا زەمانەتێک بوو بۆ ئەوەی ڕووداوێک نەقەومێ. ئەو ڕستەیەی نامەکەی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ وەبیر بێننەوە: «ئەو پیرەپیاوە دەکوژم، هەڵبەت ئەگەر ئیوان لە ماڵێ نەبێ.» کەوایە حزووری ئیوان لە ماڵێدا بۆ هەمووان زامنی نەزم و هێمنایەتی بووە.

بەڵام ئەو لێیدا و ڕۆیی، ئیسمیر دیاکۆفیش سەعاتێک دوای ڕۆیشتنی ئەربابە لاوەکەی، سەرودڵی لێهات. بەڵام ئەوە ڕوون و ئاشکرایە. لێرەدا دەبێ بڵێم کە ئیسمیر دیاکۆف، لە تەنگژەی ترس وناهومێدیدا، لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەی دواییدا هەستیکردبوو کە بە شێوەیەکی زۆر پڕمەترسی و درێژخایەن تووشی گەشکە دەبێ. هەڵبەت ناتوانی ڕۆژ و سەعاتی ئەو نەخۆشییە پێشبینی بکەی، بەڵام هەموو نەخۆشێکی فێدار دەتوانی پێشتر هەستبکا کە لەوانەیە تووشی گەشکە بێ. دوکتۆرەکان دەڵێن. کەوایە لەگەڵ ڕۆیشتنی ئیوان فیۆدۆرۆویچ، ئیسمیر دیاکۆف خەم دایدەگری، هەستدەکا یار و پارێزەری نییە، بۆیە خەمبار و شەکەت دەڕوا بۆ هەمارەکە. بە قالدرمەکاندا دەڕواتە خوارێ و لە خۆی دەپرسێ بڵێی سەرودڵی لێبێ یان نا، دەی ئەگەر لەڕێوە لێی بێ چبکا؟ هەر ئەو پەرۆشییەش، ئەو پرسیارە، لەناخەوە شڵەژاندی و هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی سەرودڵی لێبێ و بە سەرەوە بکەوێتە نێو هەمارەکە و بێهۆش بێ، لەو ڕووداوە تەواو سروشتییەدا، خەڵک زۆر سەرسەختانە هەوڵدەدەن شوێنی درڕدۆنگی و گومان هەڵگرن و بڵێن کە ئەو بە قەستی خۆی بێهوش کردووە. بەڵام ئەگەر ئەو کارەی بە ئانقەست بووبێ، هەرلەڕێوە ئەو پرسیارە دەهاتە پێشێ، کە مەبەستی لەو کارە چی بووە؟ پشتی بە چی بەستووە؟ مەبەستی چی بووە؟ باسی زانستی پزیشکی ناکەم: پێیانگوتووم لەوانەیە زانست ڕاست نەبێ، یان تەواو هەڵە بێ: پزیشکەکان نەیانتوانی فێلێهاتنی ڕاستەقینە و بە ئانقەست لێکبکەنەوە. لەوانەیە واش بێ، لەوانەیە واش بێ، بەڵام وەڵامی پرسیارێکم بدەنەوە: ئەو بۆ ئەو خۆ نەخۆشخستنە چ قەستێکی بووە؟ ئەگەر پیلانی قەتڵی دارشتبێ، ئایا بەر لەوە ویستوویەتی بە خۆ بێهۆشخستن سەرنجی ئەندامانی بنەماڵە بۆ لای خۆی ڕاکێشێ؟

برایانی لێژنەی داوەری، ئەوە بزانن، کە لە شەوی ڕووداوەکەدا ماڵی فیۆدۆرپالوۆویچ پێنج کەسی لێبووە فیۆدۆرپاولۆویچ خۆی (بەڵام دیارە خۆی خۆی نەکوشتووە)؛ نۆکەرەکەشی گریگۆری، هێندەی نەمابوو خۆی بە کوشت بدا؛ سێهەم کەس ژنەکەی گریگۆری، مارتا ئیگناتیفنا بووە، بەڵام زۆر شوورەییە

ئەگەر بیریشی لێبکەینەوە کە ئەو ئەربابەکەی کوشتبێ. دەمێنێتەوە دووکەس - دیمیتری فیۆدۆرۆویچ و ئیسمیر دیاکۆف. بەڵام ئەگەر باوەڕ بە قسەکانی تۆمەتبار بکەین کە قاتڵ نییە، کەوایە حەتمەن ئیسمیر دیاکۆف قاتڵەکەیە. چونکە لایەنێکی دیکە لە گۆڕێدا نییە و ناتوانین کەسێکی دیکەش پەیدا بکەین. هەر ئەمەیە بۆتە هۆی ئەوەی ئەو تۆمەتە بدەنە پاڵ ئەقڵسووکێکی قوڕبەسەر کە دوێنێ خۆکوژیی کرد. ڕاست بەوهۆیەوە تەنیا بەو هۆیەوە، کە کەسێکی دیکە لەو ماڵەدا نەبووە. ئەگەر تارماییی گومان بکەوتایەتە سەر کەسێکی دیکە، ئەگەر شازدە کەسیش لەو ماڵەدا بوایەن، لە سەر ئەو باوەڕەم کە تەنانەت تۆمەتباریش بە شوورەییی دەزانی تۆمەت بداتە پاڵ ئیسمیر دیاکۆف و ئەو شازدە کەسەی بە تۆمەتبار دەزانی. چونکە تۆمەتدانە پاڵ ئیسمیر دیاکۆف وڕێنەیەکە و بەس.

برایان، لێگەڕێن با ڕەوانناسی وەلانێین، با تەنیا ڕاستییەکان لەبەرچاو بگرین و تەنانەت مەنتقیش بنێینە ئەو لاوە، با زانستی پزیشکیش وەلانێین. ڕووبکەینە ڕاستییەکان و بزانین ڕاستییەکان چیمان پێدەڵێن. ئەگەر ئیسمیر دیاکۆف کوشتبێتی، چۆنی ئەو کارە کردووە؟ بە تەنیا کردوویەتی یان بە هاودەستیی تۆمەتبار؟ لێگەڕێن با لایەنی یەکەم لەبەر چاوبگرین و بڵێین بە تاقی تەنیا ئەو کارەی کردووە. ئەگەر ئەوی کوشتبێ، حەتمەن لە بەر قازانجێک بووە. بەڵام خۆ دەزانین ئیسمیر دیاکۆف هیچکام لەو ئەنگیزانەی نەبووە کە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ هەیەتی. نە ڕقی لێی بوو، نە ئێرەیی پێدەبرد، نە... ڕەنگە بۆ وەدەستهێنانی پارە ئەو کارەی کردبێ، بۆ ئەوەی ئەو سێ‌هەزار ڕوبڵەی نێو پاکەتەکەی وەگیر کەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو نهێنییەکان دەدرکێنێ ئەویش لە لای کەسێک کە ئەو هەمووەی حەز لەو بابەتەیە، یانی تۆمەتبار سەبارەت بە پارە و عەلامەتەکان و شوێنی شاردنەوەی پارەکە و پاکەتەکە چی لە سەر نووسراوە و بە چی بەستراوە و لە هەمووشی گرینگتر ئەو عەلامەتانەی پێدەڵێ کە بە هۆی ئەوانەوە دەتوانێ بچێتە ژووری. ئایا ئەو کارەی لە بەر ئەوەکرد کە خۆی پێوە بکا؟ یان ڕەقیبێک هانبدا بۆ ئەو کارە، ڕەقیبێکیش کە تامەزرۆ بوو ئەو پاکەتە پارەیە وەدەستبێنێ؟ دەڵێن: «بەڵێ، لە ترسانا ئەو نهێنیانەی

پێ‌گوتووە.» بەڵام چۆن دەتوانن ئەوەم پێ‌بسەلمێنن؟ کەسێک کە بتوانێ بیر لە کردەوەیەکی ئاوا چەپەڵ و دڕندانە بکاتەوە و پیلانێکی ئاوا داڕێژێ و بەڕێوەشی بەرێ، ڕاستییەک دەدرکێنێ کە بۆ هیچ کەس ڕوون نییە و ئەگەر دەمی خۆی گرێبدایە هیچ کەس بیریشی بۆی نەدەچوو!

نا، هەرچەندەش ترسەنۆک بێ، ئەگەر پیلانی جینایەتێکی ئاوای کێشابێ، هیچ شتێک ناچاری ناکات نهێنی پاکەتی پارە و عەلامەتەکان بدرکێنێ. چونکە ڕاست وەک ئەوە وایە لەپێشدا خۆی بە دەندووک پێوە بکا. ئەگەر ناچاریش بکرایە ڕاستیی ئەوانە بڵێ، دەیتوانی درۆیەک بسازێنێ و لەخۆڕا شتێک پێکەوە بنێ، بەڵام لەو بارەوە زمانی نەدەگەڕا. دووپاتی دەکەمەوە، چونکە لەلایەکی‌ترەوە، ئەگەر سەبارەت بەوپارەیە هیچی نەگوتبایە، جینایەتەکەی بکردایە و پارەکەی بدزیبایە، هیچکەس نەیدەتوانی بە هۆی دزی و جینایەتەوە تۆمەتباری بکا، چونکە جگە لە خۆی هیچ کەسێکی‌تر ئاگاداری ئەوە نەبووە. تەنانەت ئەگەر تۆمەتی قەتڵەکەشی بدرایەتە پاڵ، گومانی ئەوە نەدەکرا قەستێکی‌تری بووبێ بۆ ئەو کارە. بەڵام بەوەدا کە هیچکەس لەو ئەنگیزەیەی ئەو نەگەیشتووە و بەپێچەوانە، هەموو دەیاندی کە ئەربابەکەی زۆری متمانە پێیەتی و لێی خاترجەمە، دوایین کەس دەبوو کە گومانی لێبکرێ، خەڵک لەپێشدا گومانیان لە کەسێک دەبوو کە بۆ ئەو کارە قەست و ئەنگیزەیەکی هەبووبێ. لە کەسێک کە خۆی ڕایگەیاندبوو کە ئەو قەستەی هەیە و بە ئاشکرا باسیکردووە؛ ئەوان لە ڕاستیدا شکیان دەپەڕییە سەر کوڕە گەورەکەی فیۆدۆرپاولۆویچ، یانی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ. ئەگەر ئیسمیر دیاکۆف بیکوشتبایە و پارەکەی بدزیبایە، کوڕەکەی تۆمەتبار دەکرا، ئەوەش بۆ ئیسمیر دیاکۆف زۆر چاک دەکەوت. سەرەڕای ئەوانە ئایا بۆ ئەوە دەبێ پیاو باوەڕ بکا، کەسێک پیلانێکی ئاوای داڕشتبێ و نهێنی پارەو پاکەت و عەلامەتەکان بە کەسێکی دیکە بڵێ؟ بەبڕوای ئێوە ئەقڵی تێدەچێ؟ بۆ ئەوە دەبێ پیاو بڕوا بەشتی وا بکا؟

ئیسمیر دیاکۆف، ڕاست ڕۆژی ڕووداوەکە پیلانەکەی داڕشتووە و فێی لە خۆی هێناوە و لە پلیکانەکانەوە خۆی بەرداوەتەوە ـ بە چ ئامانجێک؟ بەو

ئامانجەی کە بەرلە هەموو شتێک، گریگۆری ویستوویە دەواکەی بەخوا، ئەویش دەبینێ هیچکەس نییە ئاگاداری لە ماڵەکە بکا، پاشگەز دەبێتەوە و گوێقوڵاغ دەبێ. دوای ئەوە، ئەربابەکەی کە دەبینێ هیچکەس نییە پارێزگاریی لێبکا و دەترسێ کوڕەکەی بێت، دوو هێندە وریاتر دەبێ و هەست ڕادەگرێ. پێموایە بەو ئامانجەش کە ئیسمیر دیاکۆف لە چێشتخانەکەوە دەبرێ بۆ ژوورەکەی گریگۆری، یانی لە شوێنێک کە جیا لەوانی دیکە دەخەوت و بە ئارەزووی خۆی هاتوچۆی دەکرد، دەگوێزرێتەوە بۆ ژووری پێشخزمەتەکان، شوێنێک کە هەرکاتێ سەرودڵەکەی لێدەهات دەیانبردە ئەوێ، سێهەنگاو لە قەرەوێڵەکەی گریگۆری و خیزانی دووربوو، هەر لە وەتاغەکەدا پەردەیەکیان کێشابوو و لەو پشت پەردە ڕایان دەکێشا. لەو کاتەوە زانیبوویان ئیسمیر دیاکۆف فێدارە، ئەرباب و مارتائیگناتیفنای دڵنەرم و خاوەن بەزەیی ئەو شوێنەیان بۆ تەرخانکرد کە لەوکاتانەدا بیبەنە ئەوێ و ئاگاداریی لێبکەن. هەر وەک پێشوو دەیبەنە پشت پەردەکە و ڕایدەکێشن، ئەویش دەستدەکا بە ناڵین و وادەنوێنێ کە وەک جاران فێی لێهاتووە، بەوشێوە ئەو شەوە نەیهێشت خەو بچێتە چاویان (هەر وەک گریگۆری و ژنەکەی شایەدییان دا). ئێمەش دەبێ باوەڕ بکەین کە ئەمانە بۆ ئەوە بووە تاکو ساناتر لە جێی خۆی هەستێ و بچێ ئەربابەکەی بکوژێ!

بەڵام دەڵێن ئەو بۆیە خۆی ئاوا هێنا حاڵی جاو و فێی لە خۆی هێنا دا بۆ ئەوەی شکی تێنەکەن، بۆیەش ڕازی پارە و عەلامەتەکانی بە دیمیتری گوت بۆ ئەوەی وەسوەسەی بکا و تووشی ئەو قەتڵە ببێ، کاتێکیش قەتڵەکە کراوە و قاتڵ پارەکەی هەڵگرتووە و هەڵاتووە، کاتی هەڵاتنیش حەتمەن بە هەرا و هاوار خەڵکی لەخەو هەستاندووە، دەبێ بڕوا بکەین کە ئیسمیر دیاکۆف هەستاوە و چۆتە نێو وەتاغەکەوە ـ بۆچی؟ بۆ ئەوەی جارێکیتر ئەربابەکەی بکوژێتەوە و پارەیەک کە دزراوە، هەڵیگرێ و بیبا؟ برایان، پێدەکەنن؟ خەجاڵەتی دەکێشم ئەو قسانە دەکەم، بەڵام ئەگەرچی بۆ باوەڕکردن نابێ و ئاوا پیاو سەری لێی سووڕ دەمێنێ، کەچی تۆمەتبار لە سەر ئەوە سوورە. کاتێک هەڵاتووە و ویستوویە بە نەردەکاندا هەڵگەڕێ، گریگۆریی داوە بە زەویدا سەری شکاندووە و هەرا و

هاواری وەڕێ خستووە. دەڵێ ئیسمیر دیاکۆف هەستاوە، چۆتە وەتاغ و باوکی کوشتووە و پارەکەی دزیوە! لە سەر ئەوە پێداگری ناکەم کە ئیسمیر دیاکۆف پێشتر بیری لەو مەسەلەیە نەکردبێتەوە و پێشبینیی کردبێ کە ئەو کوڕە تووڕە و توندە تەبیعەتە هەروا بێت و بەئەدەبانە سەرێک بکێشێتە ژووری، لەگەڵ ئەوەی عەلامەتەکانیشی زانیوە، بگەڕێتەوە و غەنیمەتەکە بۆ ئیسمیر دیاکۆف بەجێ بێڵێ. برایانی لیژنەی داوەری، ئەو پرسیارەتان زۆر خۆمانە عەرز دەکەم؛ ئەو کاتە چ کاتێک بووە کە ئیسمیر دیاکۆف توانیی ئەو جینایەتەی تێدا ئەنجامبدا؟ پێمبڵێن چ کاتێک بووە؟ دەنا لەخۆڕا ناتوانن تۆمەتباری بکەن.

بەڵام ڕەنگە بە ڕاستی فێی لێهاتبێ، ئەو پیاوە نەخۆشە لە ناکاو چاک دەبێتەوە، گوێی لە هاوارێک دەبێ و دەچێتە دەرێ. دەی - پاشان چی؟ چاوێک لە دەوروبەری خۆی دەکا و دەڵێ: «بۆ نەچم ئەرباب بکوژم؟» دەی ئەو چووزانێ چی قەوماوە، چونکە تا ئەو کاتە بێهۆش کەوتووە. بەڵام ئەم خەیاڵ و گومانانەش ئەندازەی هەیە.

تاقمێک خەڵکی وردبین پێمدەڵێن: «هەروایە، بەڵام ئەگەر ئەوان پێکەوە دەستبەیەکییان کردبێ چی؟ ئەگەر کوشتبێتیان و پارەکەیان بەشکردبێ چی - ئەو کاتە دەڵێن چی؟» بە ڕاستی پرسیارێکی باشە! ڕاستییەکیش کە قەبووڵیدەکەن جێی سەرسووڕمانە. کەسێک تاوان ئەنجامدەدا و لە هیچ بەڵایەک ناپرینگێتەوە و خۆی دەخاتە مەترسییەوە، هاودەستەکەشی لەلایەک ڕاکشاوە و خۆی نەخۆش خستووە، بۆ ئەوەی دەوروبەرییەکان تووشی گومان و دڕدۆنگی بکا و ئەرباب و گریگۆریش بترسێنێ. جێی خۆیەتی سەرنج بدەین و بزانین چ ئەنگێزەیەک بۆتە هۆی ئەوەی ئەم دووهاودەستە پیلانێکی ئاوا دڕندانە داڕێژن.

بەڵام ڕەنگە ئەم هاودەستییە لەلایەن ئیسمیر دیاکۆفەوە کەمتەرخەمیی تێدا کرابێ یان بە زۆری ڕازی کرابێ؛ ڕەنگە ئیسمیر دیاکۆف لە ترسانا قەبووڵی کردبێ و نەیویستبێ بەرگریی لێبکا. پێشبینیی ئەوەشی کردووە بێتو هاوار نەکا یان لە هەمبەر قاتڵدا خۆڕاگری نەکا و هەروا بە ئاسانی ئیزن بدا ئەربابەکەی بکوژن، پاشان دەکەوێتە بەر لافاوی لۆمە و سەرکۆنە، ئیزنی لە دیمیتری

کارامـازۆف وەرگرتـووە کـە خـۆی نـەخۆشـبخات و ڕێـی بـۆ چۆڵبکـات ـ «هەرچۆنێکت پێخۆشە بیکوژە، بۆ من گرینگ نییە.» بەڵام تەنانەت ئەگەر ئاواش بووبێ، چونکە فێ لێهاتنی ئیسمیر دیاکۆف ماڵەکەی تووشی ئاڵۆزی دەکرد مەحاڵ بوو دیمیتری کارامازۆف پیلانکێکی وا قەبووڵبکا. لەگەڵ ئەوەشدا، چاوپۆشی لەو خاڵە دەکەم. وای دادەنێین کە دیمیتری کارامازۆف قەبووڵیدەکا، دیسان بەو ئاکامە دەگەین کە قاتڵ، یانی قاتڵ و هاندەری سەرەکی دیمیترییە و ئیسمیر دیاکۆف هاودەستێک بووە کە لەو کارەدا چالاکیی نەبووە، تەنانەت بە هاودەستیشی حیساب ناکرێ. چونکە لە ترسی گیانی قەبووڵیکردووە، دڵنیاشم دادگا دەتوانێ ڕوونی بکاتەوە، بەڵام ئێمە چی دەبینین؟ تۆمەتبار، کاتێک قۆڵبەستدەکرێ هەرلەڕێوە، ئیسمیر دیاکۆف تۆمەتبار دەکا و هەموو خەتاکان دەخاتە ئەستۆی ئەو. نەک وەکو هاودەستیش، بەڵکو وەک قاتڵ. دەڵێ: «بە تەنیا ئەو کارەی کردووە. کوشتوویەتی و پارەکەی دزیوە. کاری خۆیەتی.» ئەوەیە هاودەست هەرلەڕێوە یەکتری تۆمەتبار دەکەن! شتی وا هەر نابێ! بیر لەو مەترسییەش بکەنەوە کە بۆ کارامازۆف دێتە پێشێ. دوای کارەساتەکە ـ ئەو قاتڵی سەرەکییە و کەسێکی دیکە نابێتە قاتڵی سەرەکی ـ هەر لەو کاتەدا کە هاودەستەکەی لەجێدا کەوتووە، تاوانەکە دەخاتە ئەستۆی ئەو. بەڵام ئەو کەسەی دیکە، یانی ئەو کەسەی لەجێدا کەوتووە، لەوانەیە ئەو کارەی زۆر پێناخۆشبووبێ. لە بەر پاراستنی گیانی دانی بە ڕاستییەکەدا بنێ. «ئێمە هاودەست بووین، بەڵام من قەتڵەکەم نەکرد، بەڵام لە ترسانا لەگەڵی پێکهاتم و ئیزنم پێدا.» چونکە ئەو، یانی ئیسمیر دیاکۆف دەیزانی دادگا بەڕادەی تاوانەکەی خۆی سزایدەدا. بۆیە لێکیدەدایەوە و بەو ئاکامە دەگەیشت کە سزاکەی لە تاوانباری سەرەکی کەمترە. بەڵام دڵنیام بەوشێوە، دانیپێدا نەدەنا، ئەگەرچی قاتڵی ڕاستەقینە لە سەر تۆمتبارکردنی ئەو پێداگری دەکا و دەڵێ ئەو بە تاقی تەنیا ئەو کارەی کردووە.

ئەنجا ئیسمیر دیاکۆف کاتی لێپرسینەوە گوتی خۆی سەبارەت بە پاکەتی پارە و عەلامەتەکان بۆ تۆمەتبار دواوە، دەنا ئەو خەبەری ئەوشتانەی هەر

نەبوو. ئەگەر ئەو لە ڕاستیدا هاودەستی تاوانبارەکە بوایە، ئایا کاتی لێپرسینەوە ئاوا بەتامەزرۆیی و ڕاشکاوانە ئەو قسەیەی دەکرد، یانی دەیگوت خۆی تۆمەتباری لەوانە ئاگادار کردووە؟ بەپێچەوانە، هەوڵیدەدا حاشای لێبکا یان بیشارێتەوە، یان زۆر بە سەرساردی چاو لە مەسەکە بکا. هیچکەس جگە لە مرۆڤی بێتاوان، کە ترسی ئەوەی لەدڵدا نەبوو تۆمەتی هاودەستی لێبدرێ، ئەو کارەی ئەو ناکا. بە هۆی ماخولیا بوونەوە کە ڕەنگە کاردانەوەی ئەو ڕووداوە و نەخۆشییەکەی خۆی وای لێکردبێ، خۆی هەڵواسێ و کۆتایی بە ژیانی خۆی بێنێ. یادداشتێکی بەجێ هێشتووە کە بە شێوازی خۆی نووسیویەتی: «بەپێی ویست و ئیختیاری خۆم کۆتایی بە ژیانم دێنم، خەتای هیچ کەسێکی تێدا نییە.» ئایا چی تێدەچوو بۆ ئەو ڕستەیەکی دیکەی پێزیاد بکا: «قاتڵ منم، نەک دیمیتری کارامازۆف؟» بەڵام ئەوەی نەنووسی. ئایا ویژدانی وایلێکرد خۆکوژی بکا، یان دانپێدانانی تاوان؟

دوای ئەوە چی ڕوویدا؟ هەر ئێستا سێهەزار ڕوبڵیان هێنا بۆ دادگا، خۆشحاڵیشین کە ئەوە هەر ئەو پارەیە کە لە پاکەتەکەدا بووە، ئێستاش ئەو لەهەمبەرماندا لە سەر ئەو مێزە داندراوە و ڕەنگە ڕۆژی پێشوو لە ئیسمیر دیاکۆفی وەرگرتبێ. بەڵام پێویست ناکا ئەو دیمەنە دڵهەژێنە وەبیر بێنینەوە. ئەگەرچی دەمەوێ تۆزێ بیروڕای خۆم دەرببڕم و باسی یەک دوو مەسەلەی کەمبایەخ بکەم، کە لەوانەیە لە ڕوانینی یەکەمدا بە جوانی ئاشکرا نەبێ و نەکەوێتە بەر سەرنج. لەلایەکەوە وێدەچێ ئیسمیر دیاکۆف پارەکەی دابێتەوە و دوێنێ بە هۆی پەشیمانییەوە خۆی خنکاندبێ. (چونکە تەنیا بە هۆی پەشیمانییەوە خۆی هەڵواسی.) هەر دوێنێش لە لای ئیوان دانی بە تاوانەکەیدا ناوە ـ بە وتەی ئیوان فیۆدۆرۆویچ. ئەگەر بە ڕاستی وانەبووە، بۆ ئێستا ئیوان بێدەنگەی لێهێناوە؟ کەوایە، ئەگەر ئەو دانی بە تاوانەکەیدا ناوە، دیسان دەپرسم بۆ لەودوایین یادداشتەدا کە لە پاش خۆی بەجێی هێشتووە، ئەو ڕاستییەی نەدرکاندووە؟ خۆ دەیزانی تۆمەتباری بێتاوان ڕۆژی دوایی لەگەڵ ئەو موحاکەمە ترسناکە بەرەوڕوو دەبێ.

پارە بە تەنیا نابێتە بەڵگە. حەوتووی پێشوو بەڕێکەوت من و دووکەسی‌تر لەو ڕاستییە ئاگادار کراین، کە هەردوو کەسەکە ئێستا لەم دادگایە حزووریان هەیە، گوایە ئیوان فیۆدۆرۆویچ دوو کۆپینی پێنجلەسەدیی کە هەرکامیان پێنجهەزار ڕۆبڵ بووە و لە سەر یەک دەکاتە دەهەزار ڕۆبڵ، ناردوویە بۆ ناوەندی پارێزگا بۆ ئەوەی بیگۆڕێتەوە بە پارە. بۆیە ئەو قسەیەم کرد، بۆ ئەوەی ڕوونیکەمەوە کە هەموو کەس، لە کاتی تایبەتدا دەتوانێ پارەی هەبێ، کەوایە ئەگەر سێ‌هەزار ڕۆبڵی لێ‌هەڵگرێ و لەگەڵ خۆی بیهێنێ، ناتوانێ بیسەلمێنێ کە ئەو پارەیە هەر ئەم پارەیەیە، یانی هەر ئەو پارەیەی کە فیۆدۆرپاولۆویچ لە پاکەتەکەی خستبوو.

«لە ئاکامدا ئیوان فیۆدۆرۆویچ، دوێنێ دوای بیستنی ئەو هەواڵە گرینگە لە زمانی قاتڵ، دانەچڵەکی و هەر گوێشی نەدایە. بۆ لەڕێوە بە دادگای ڕانەگەیاند؟ بۆ هەتا ئەمڕۆ بەیانی دەنگی نەکرد؟ پێموایە هەقی ئەوەم هەیە بڵێم بۆ؟ چونکە لە ماوەی حەوتووی ڕابردوودا نەخۆش کەوتووە: لە لای دوکتۆر و دۆستە نزیکەکانی گوتوویە تووشی ناڕەحەتیی ڕۆحی بووە و تاپۆی مردووان دەبینێ: ئەو خەریک بوو تووشی یاوی مێشک دەبوو، کە ئەمڕۆ بە جارێ لێی‌پیس کرد و برستی لێبڕی. لەو بارودۆخەدا لە ناکاو هەواڵی مەرگی ئیسمیر دیاکۆفی پێدەگا و خێرا بیردەکاتەوە: «ئەو کوڕە مردووە، دەتوانم تاوانەکە بخەمە ئەستۆی ئەو و براکەم ڕزگار بکەم. پارەشم هەیە. چەکەیەک پارە لەگەڵ خۆم دەبەم و دەڵێم ئیسمیر دیاکۆف بەر لەمردن پێیداوم.» دەڵێن ئەو کارە شەرافەتمەندانە نییە: تەنانەت تۆمەتبارکردنی مردوو و نەجاتدانی گیانی براش، شەرافەتمەندانە نییە. وایە، بەڵام ئەگەر لەڕووی تێنەگەیشتنەوە ئەو تۆمەتەی بداتە پاڵ چی؟ دیمەنی پێشووتان دی: حاڵ و باڵی تۆمەتبارتان دی. بەپێوە ڕاوەستابوو قسەیدەکرد، بەڵام بیر و خەیاڵی لە کوێ بوو؟

لەدوای شایەدیدانی ئەو نەخۆشە، بەڵگەکەیان هێنا بۆ دادگا، یانی نامەی تۆمەتبار کە دوو ڕۆژ بەرلە ڕووداوەکە بۆ خانمی وێرخۆفێتیسۆفی نووسیبوو و لەوێدا بە ڕاشکاوی باسی سیناریۆی ئەو قەتڵە دەکا. کەوایە بۆ چاوەڕوانی

سیناریۆیەکی دیکە لەلایەن کەسانێکیترەوە بین؟ جینایەتەکە ڕاست بەپێی ئەو نامەیە بەڕێوە چووە. هیچ کەسیش جگە لە نووسەری نامەکە ئەنجامینەداوە. بەڵێ برایانی لیژنەی داوەری بە بێ‌هیچ بەرگیرەوەیەک ڕوویدا! بەئەدەب و ڕێزەوە لە بەر پەنجێرەکەی باوکمان هەڵنەهاتین، ئەگەرچی تەواو بەو قەناعەتە گەیشتبووین کە گراوەکەمان لە لای ئەوە. نا، ئەوە قەت ڕێی تێناچێ! ئەو چووە ژووری و باوکی کوشت. هەر لەگەڵ چاوی بە ڕەقیبە دزێوەکەی کەوت، ئیتر چاوی بەرایی نەدا و ئاوری بێ‌ئامانی تێبەربوو و کوشتی. بەڵام دوای کوشتنەکەی، کە زۆر وێدەچێ بەو دەسکاونگە لێیدابێ. دوای ئەوەی لە مردنی دڵنیا دەبێ، بە وردی ژوورەکە دەگەڕێ و بۆی مەعلووم دەبێ گراوەکەی لەوێ نییە، پارەکەی وەبیر هاتەوە، دەستیکرد بە ژێر باڵنجەکەدا و دەریهێنا. پارەکەی هەڵگرت و پاکەتەکەی لەوێ فڕێدا، پاکەتە دڕاوەکەش ئەوەتا لە سەر مێزەکەیە.

بۆیە باسی ئەو ڕاستییە دەکەم، دەمەوێ سەرنجتان بۆ لای دیاردەیەکی ئاشکرا ڕاکێشم. ئەگەر ئەو قاتڵێکی خاوەن ئەزموون بوایە و ئەگەر تەنیا بۆ پارە ئەو کارەی بکردایە، ئایا پاکەتی پارەکەی لە پەنا تەرمەکە فڕێدەدا؟ دەی بۆ وێنە ئەگەر ئیسمیر دیاکۆف بۆ وەدەستهێنانی ئەو پارەیە ئەربابەکەی بکوشتبایە، پاکەتەکەی لەگەڵ خۆی دەبرد، بێ‌ئەوەی زەحمەتی هەڵپچڕینی لە سەر سەری تەرمەکە بە خۆی بدا؟ چونکە سووڕ دەیزانی پارەی تێدایە - چونکە لە بەر خاتری خۆی فیۆدۆر پاولۆویچ خستبوویە نێو پاکەتەوە و لاکومۆری کردبوو ئەگەر پاکەتەکەشی لەگەڵ خۆی ببردایە، هیچکەس لە مەسەلەی دزییەکە ئاگادار نەدەبوو. برایانی لیژنەی داوەری، لە ئێوە دەپرسم، ئایا ئیسمیر دیاکۆف ئاوای پیلانەکەی بە ئەنجامدەگەیاند؟ ئایا پاکەتەکەی هەر لەوێ بەجێ دەهێشت؟ نا، ئەو کارە کاری قاتڵێکی توندەتەبیعەت و بە تاڵۆوکەیە - قاتڵێک کە دز نەبووە و بەر لەوەش بە عومراتی خۆی دزیی نەکردووە - پارەکەی لە ژێر باڵنجەکە دەرهێناوە، نەک وەک دزێک کە بیهەوێ بیدزێ، بەڵکو وەک ئەوە پارەکەی خۆی لە دزێک بستێنێتەوە. چونکە ئەو پارەیە بیرۆکەیەک بوو لە زەینی کارامازۆفدا و وەک وەسوەسەیەکی شێتانەی لێهاتبوو. کاتێک ئەو پاکەتەی دەستکەوت کە هیچکات

چاوی پێینەکەوتبوو، دڕاندی بۆ ئەوەی دڵنیا بێ پارەی تێدایە یان نا، بە فڕێدانی ئەو پاکەتە دڕاوە، بەڵگەیەکی پڕ مەترسیی بە دژی خۆی بەجێ هێشتووە. هەمووشی بەوهۆیەوە بوو کە کارامازۆفە، نەک ئیسمیر دیاکۆف چونکە بیری لێنەکردەوە، دەرفەتی بیر کردنەوەشی نەبوو. تێی تەقاند و هەڵات؛ نۆکەری پیر وەدوای کەوت و نەڕاندی؛ نۆکەری پیر گوتی: «بەڵام قەوەی پێی نەشکا و زەبری دەسکاونگەکە کاری خۆی کرد و لە عەرزی دا.

تۆمەتبار بەزەیی پێیدا هات، لە سەر نەردەکە هاتە خوارێ و چاوی لێکرد. باوەڕ دەکەن؟ پێمان دەڵێ بەزەیی پێدا هاتووە، لە بەر دڵسۆزی، گەڕایەوە سەری بۆ ئەوەی بزانێ دەتوانێ کارێکی بۆ بکا یان نا. ئایا ئەو کاتە کاتی دڵسۆزی نواندن بووە؟ نا، تەنیا بەو قەستە گەڕایەوە بۆ ئەوەی دڵنیا بێ تاقە شایەدی جینایەتەکەی مردووە یان زیندوو. جگە لەوە هەر هەست و ئەنگێزەیەکیتر هەبێ ناسروشتییە. ئەوە بزانن کە سەبارەت بە گریگۆری خۆی تووشی زەحمەت کرد، سەری بە دەستەسڕ پاککردەوە و کە دڵنیا بوو مردووە، پەرێشان و شەڵاڵی خوێن بەرەوماڵی گراوەکەی پێی پێوەنا. چۆن بوو بیری لەوە نەکردەوە چنگوپل و سەروچاوی خوێناوییە و لێی ئاشکرا دەبێ؟ بەڵام تۆمەتبار خۆی دڵنیامان دەکا کە تەنانەت بیری لەوە نەکردۆتەوە کە شەڵتانی خوێنە. دەتوانین بڕوا بەوە بکەین، لەڕاست دەچێ. ئەو مەسەلەیە بۆ ئەو جۆرە تاوانبارانە لە کاتێکی ئاوا هەستیاردا دێتە پێشێ. جاری وایە لە خاڵێکدا زیرەکییەکی وا لە خۆیان دەنوێنن دەستی شەیتان لەپشتەوە دەبەستن، لە خاڵێکی دیکەشدا هەموو شتێکیان لە بیر دەچێتەوە. بەڵام ئەو لەو کاتەدا، تەنیا بیری لە شتێک دەکردەوە ـ گراوەکەی لەکوێیە؟ دەیویست دەستبەجێ تێبگا گراوەکەی لەکوێیە، بۆیە خێرا بەرەو شوێنی نیشتەجێ بوونی تێی تووڕاند و بە هەواڵێکی چاوەڕواننەکراو و ناخۆش ئاگادار بوو ـ گراوەکەی چووە بۆ ماکرۆیە بۆ ئەوەی چاوی بە «ئاشقەکەی یەکەم»ی، ئاشقە «هەقدار»ەکەی بکەوێ.»

(٩)

# زێدەوەڕی لە ڕەوتناسیدا. خێشك بە چوارناڵ

## کۆتاییی وتاری دادوەر

ئیپۆلیت کیریلۆویچ بۆ پێشەکیی وتەکانی ڕەوەشتی میژوو‌ییی هەڵبژارد، ڕەوەشتێک کە تەواوی ئاخێوەرانی تووڕە و دەمارگرژ حەزی پێدەکەن و لەو چوارچیوەیەدا بەربەستێک بۆ وتارە شەپۆلئاساکەیان دەبیننەوە. ئەو لەم کاتەدا سەبارەت بە «ئاشقی هەقداری یەکەم»ی گرووشنکا دوا و بیرۆکەگەلێکی سەرنجڕاکێشی بەیان کرد.

«کارامازۆف کە شێتانە ئێرەیی بە هەموو کەس دەبرد، لە ناکاو لە هەمبەر ئەو یەکەم ئاشقەدا خۆی دۆڕاند و هەستی بە وردبوون کرد. ئەوەی بابەتەکەی سەیر و سەرنجڕاکێش کردبوو، ئەوە بوو کە گوایە بیری لەو مەترسییە تازەیە نەکردۆتەوە کە لە وجوودی ئەو ڕەقیبە چاوەڕواننەکراوەدا سەری هەڵداوە. بەڵام وەک مەترسییەکی دوورەدەست چاوی لێکردبوو و کارامازۆف هەمیشە لە ئێستادا دەژی و بیر لە ڕابردوو و داهاتوو ناکاتەوە. وێدەچێ ئەوەی وەک ئەوسانەیەک چاو لێکردبێ. بەڵام دڵەبرینداره‌کەی لەڕێوە تێگەیشت کە ئەم ژنە ڕەقیبەتازەکەی شاردۆتەوە و فریویداوە، چونکە ڕەقیبی تازە بۆ ئەو ژنە ئەوسانە نەبوو، تەنیا هیوای ژیانی بوو. کاتێک لەوە گەیشت لەڕێوە بۆڕی خوارد.

برایانی لێژنەی داوەری، جگە لەو دیاردە چاوەڕواننەکراوەی خووخدەی تاوانبار پاڵپشتێکیتر نییە بۆ قسەکانم، دیاردەیەک کە گوایە خۆشی توانایی

ئەوەی نییە بینوێنێ. لە ناکاو ئارەزوویەکی وا سەرتاپای دادەگرێ کە ناتوانێ خۆڕاگری لەهەمبەردا بکا. ڕێزدانان بۆ ئەو ژنە و ڕێدانی مافی خۆشویستن بۆ ئەو. هەموو ئەوانەشی لەو کاتەدا بۆ دەرکەوت کە لە بەر خاتری ئەو ژنە دەستی بە خوێنی باوکی ئالوودە کردبوو! ئەوەش ڕاستە ئەو خوێنەی کە ڕشتبووی هاواری تۆڵەی کردبوو، چونکە دوای فەوتاندنی ڕۆح و ژیانی لەم دنیایەدا، ناچار بووبوو هەر لەو کاتەدا لە خۆی بپرسێ، ئایا ئێستاش من بەبڕوای ئەو ژنە جادووبازە، ئەو کەسەی لە ڕۆحم خۆشتر دەوێ، لە هەمبەر ئەو ڕەقیبەدا، ئەو «ئاشقەی یەکەم» کە ناتوانێ حاشای لێبکا، چ بایەخێکم هەیە. چونکە ئەم ئەشقەی پێشوو کە بە تەواوی لە کردەوەی ڕابردووی پەشیمان بووبۆوە، ئێستا بە ئەشقێکی تازە و پێشنیاری شەرافەتمەندانە بە وادە و بەڵێنی ژیانێکی نوێ و پڕبەختەوەری، گەڕابۆوە بۆ لای ژنێک کە جارێکی خەیانەت پێکردبوو. ئەویش پیاوێکی چارەڕەش و لێقەوماوە و ئێستا دەتوانی چ بەو ژنە بدا، دەتوانێ چ دیارییەکی پێشکەش بکا؟

کارامازۆف لە هەموو ئەوانە گەیشت، بۆی دەرکەوت بە هۆی جینایەتەکەیەوە و بە هۆی ئەوەوە تاوانبارێکی مەحکوومکراوە، هەموو دەروویەکی لێبەستراوە! ئەو بیرۆکەیەش بە جارێ تێکیشکاند و فەوتاندی. هەربۆیە خێرا ئەو پیلانە دڕندانەیەی داڕشت و بەبڕوای مرۆڤێکی خاوەن خووخدەی کارامازۆفییانە حەتمەن وەک دەروویەک بۆ دەرباز بوون خۆی نواندووە. ئەو دەرووی دەربازبوونەش خۆکوژی بوو. بۆیە بەپڕتاو دەچێ بۆ لای پێرخۆتینی دۆستی کە دەمانچەکانی لە لای بە بارمتە دانابوو، لە ڕێگا بەدەم هەڵاتنەوە پارەیەک لە گیرفانی دەردێنێ کە بۆ وەدەستهێنانی دەستی بە خوێنی باوکی ڕمووده بووبوو. ئاخ ئێستا لە هەموو کاتێک زیاتر پێویستی بە پارە بوو. کارامازۆف دەمرێ، کارامازۆف بە گوللە لە خۆی دەدا و لە یادی هەمووواندا دەمێنێ! بە ڕاستی ئێمە شاعیرین، بەڕاستی، لە تەواوی ماوەی ژیانماندا ئەو وزەیەمان بەفیڕۆ داوە. «بۆلای ئەو، بۆ لای ئەو! لەوێش، ئاخ، تەواوی دنیا بۆ میوانی بانگهێشت دەکەم. میوانداریيەک

وەڕێدەخەم بێوێنە بێ و هەتا ماوەیەکی زۆر لە بیر نەچێتەوە و ببێتە بنێشتەخۆشەی سەرزاری خەڵک! لەگەڵ هاوار و بەزمی مەینۆشان و سەما و ئاوازی مەستانی شاد و ڕووخۆشدا، پەرداخ، پەرداخ، بە سەلامەتیی ژنێک دەنۆشین کە خۆشمان دەوێ و مەتحیدەکەین. هەروەها بە سەلامەتیی بەختەوەریی تازە پەیدابوو دەخۆینەوە! ئەو کاتە، لەڕێوە لە بەر پێیدا، مێشکی خۆمان دەپرژێنین و خۆمان سزا دەدەین! ژنەش هێندێ جار میتیا کارامازۆفی وەبیر دێتەوە و تێدەگا چەندەی خۆشویستووە و بە بەرد لە چۆکی خۆی دەدا!»

لێرەدا لەگەڵ ئەشقێکی زێدڕۆیانە، ناهومێدی دڵناسکییەکی ڕۆمانتیک و مەترسییەکی وەحشییانەی کارامازۆفانە بەرەوڕووین. بەڵێ، بەڵام برایانی لێژنەی داوەری، شتێکی دیکەش لەگۆڕێدایە، شتێک کە لە گیانیدا هاوار دەکا، بەردەوام لە زەینیدایە و خۆ دەنوێنێ و هەتا سەرەمەرگ ژەهرخواردی دەکا ـ ئەو «شتە» ویژدانە، برایانی لێژنەی داوەری، ئازارە سامناکەکەی و خۆسزادانەکەی! داوەرییەکەی، هەموو بە دەمانچە کۆتایی پێدێ، دەمانچە تەنیا ڕێگای دەرباز بوونە! بەڵام «ئەو دنیا» نازانم ئایا کارامازۆف لەو کاتەدا سەبارەت بە دنیای دوای مەرگ پرسیاری لە خۆی کردووە؟ بڵێی کارامازۆفیش وەک هاملێت، سەبارەت بە دنیای پاشمەرگ پرسیاری لە خۆی کردبێ؟ نا، برایانی لێژنەی داوەری، ئەوان هاملێتیان بوو، بەڵام ئێمە تا ئێستا جگە لە کەسانێکی وەک کارامازۆف کەسیترمان نەبووە!»

لێرەدا ئیپۆلیت کیریلۆویچ وێنەیەکی لە کەلوپەلی میوانداری و ئەو دیمەنانەی ڕوویداوە لە ماڵی پێرخۆتینەوە هەتا دەگاتە ماکرۆیە و تەواوی ئەو قسە و کردەوانەی شایەدییان لە سەر بوو، باسیکرد. ئەوەش کاردانەوەیەکی باشی لە سەر خەڵکەکە هەبوو. تاوانی ئەو مرۆڤە هیوابڕاو و وەزاڵە هاتووە، کاتێک کە هەموان ڕاستییەکانیان لێکدایەوە، وەک دیمەنێکی ڕووناک و قەناعەت پێهێنەر کەوتە بەرچاوی هەمووان.

«ئەو چ پێویستییەکی بە خۆپارێزی هەبوو؟ دووسێ جار هەتا ڕادەی دان پیانان، ئاماژەی پێکرد، بەڵام ڕاشکاوانە هیچی نەدرکاند.» (پاشان شایەدی دانی شاهیدان بەدوایدا هات.) تەنانەت گوڕاندی و بەو لادێیەی گوت کە بە فایتوون بردی بۆ ماکرۆیە ـ ئاندری ـ: «دەزانی خەریکی پیاوکوژێک لەگەڵ خۆت دەبەی؟» بەڵام مەحاڵ بوو بۆی بتوانێ ڕاشکاوانە باسی مەسەلەکە بکا، دەبوو بگاتە ماکرۆیە و چیرۆکە ئاشقانەکەی دوایی پێبێنێ. بەڵام چی چاوەڕوانی ئەو پیاوە چارەڕەشە بوو؟ هەر لەگەڵ گەیشتنە ماکرۆیە لە یەکەم ساتدا بۆی دەرکەوت و بە تەواوی تێگەیشت کە ڕەقیبە لەشکان نەهاتووەکەی ڕەنگە بە هیچ شێوەیەک ئاوا لەشکان نەهاتوو نەبێ و خواردنەوەش بە سەلامەتیی ئەوبەختەوەرییە تازەیەی ئەوان پەسند نییە. بەڵام ڕاستییەکان، ئاغایانی لیژنەی داوەری، هەر لەسەرەتای یەکەم لێپرسینەوەوە لە هەمووی ئاگادارن. کارامازۆف بە سەر ڕەقیبەکەیدا زاڵبوو و سەرکەوتنی وەدەستهێنا، لێرەشدا ـ ئاخ ـ لێرەدا ڕۆحی دەکەوێتە قۆناغێکی تازەوە، ڕەنگە سامناکترین قۆناغ بێ کە ڕۆحی پێیدا تێپەڕیوە یان تێدەپەڕێ.

برایانی لیژنەی داوەری، بە دڵنیایی دەتوانین بڵێین کە سروشتی شێواو و وەحشی و دڵی تاوانبار زۆر لە حوکمی دنیایی و عەداڵەتی مرۆڤ زیاتر تۆڵە دەستێنێ. سەرەڕای ئەوەش، عەداڵەت و سزای ئەم جیهانە سزای سروشت کەمدەکاتەوە و سووکیدەکا. لە ڕاستیدا بۆ ڕۆحی تاوانبار لەوساتانەدا زۆریش پێویستە چونکە لە هیوابڕوای نەجاتیدەدا. چونکە ناتوانم ترس و ئازاری ویژدانی کارامازۆف بێنمە بەرچاوی خۆم کە لەو کاتەدا تێگەیشت ژنە خۆشیدەوێ و لە بەر خاتری ئەو «یەکەم ئاشقی هەقدار»ی جواب کرد و میتیای بەرەو ژیانێکی نوێ ڕاکێشا و بەڵێنی بەختەوەریی پێدا، چۆن بووە؟ ئەویش لە چ کاتێکدا؟ کاتێک کە هەموو شتێک گەیشتبووە کۆتایی و هەموو دەرگاکانی لە سەر داخرابوون!

لێرەدا، خاڵێکی گرینگ دێنمەوە بیرتان کە بۆ ڕوون کردنەوەی حاڵ و وەعزی تۆمەتبار لەو ساتەدا پێویستە. ئەم ژنە، ئەم ئەشقەی ئەو، هەتا

دوایین کات، هەتا کاتی قۆڵبەستکرانی میتیا، وەک کێوی قاف وابوو، یانی بەئاواتەوە بوو پێیبگا، بەڵام بە هیچ شێوەیەک دەستی پێیڕانەدەگەیشت و لەگەڵ ئەوانەشدا، بۆ لەو کاتەدا بە گوللە لە خۆی نەدا؟ بۆ چاوپۆشی لە پیلانەکەی خۆی کرد و تەنانەت لە بیری چۆوە دەمانچەکانی لەکوێن؟ ڕاست ئەم ئارەزووی ویساڵە و هیوای بەدڵدارگەیشتنی وازی لەوکارە پێهێنا. لە ماوەی بەزم و ڕەزم و کەیف و نەهەنگەکەیاندا لە پاڵ گراوە خۆشەویستەکەیدا بوو، پێکەوە سەرخۆش بوون و لەبەرچاویشی لە هەموو کاتێک زیاتر جوان و دڵڕفێن بوو، بۆیە دڵی نەهات لێی دوورکەوێتەوە و لە بەر پێیدا نێوچاوانی نایە زەوی. ئەو ئەشقە گەرموگوڕەی بۆ ساتێک جگە لە ترسی قۆڵبەستکران، ئازاری ویژدانیشی لە بیر بردەوە. ساتێک، ئاخ، تەنیا ساتێک. حاڵاتی زەینیی تاوانبارێک کە پابەندی سێ شتە و بە چڕوپڕی شوێنی لە سەر داناوە، دەتوانم هەستپێبکەم و بیهێنمە بەرچاوی خۆم ـ یەکەم ـ شوێندانانی شەڕاب، هەرا و هوریا، دڵەلەرزە، بەزمی سەما و هەڵپەڕکێ و مۆسیقا و ئاواز، ئەو ژنەش، کە شەڕاب گەشاندوویەتەوە، کە سەمای بۆ دەکا و گۆرانی دەڵێ و پێدەکەنێ! دووهەم، هیواداربوون بەوەی کە جارێ ئەو ئاکامە تاڵ و نەخسە دوورە و ئەوانیش لانیکەم هەتا بەیانی نایەن بۆ قۆڵبەستکردنی. کەوایە چەند سەعاتێکی دەرفەت هەبوو. ئەوەشی لێ سەروزیادە! لە چەند سەعاتدا مرۆڤ دەتوانێ بیر لە زۆرشتان بکاتەوە. پێموایە هەستی وەک هەستی ئەو تاوانبارانە وابوو کە بەرەو شوێنی سزادان ڕاکێش دەکرێن. ئەوان شەقامێکی دوور و درێژی دیکەیان لەپێشە کە دەبێ بە بەرچاوی هەزاران کەسدا تێپەڕن، ئەویش زۆر بە گرژی و هەنگاوی خێرا. پاشان بادانەوە بەرەو شەقامێکیتر، لەکۆتایی شەقامەکەشدا دیمەنی دڵهەژێنی سێدارە! پێموایە پیاوی مەحکووم لەسەرەتای سەفەردا، کاتێک سواری عارەبانە دەبێ، ڕەنگە هەستبکا هێشتا ژیانێکی بێکۆتایی لەپێشە. ماڵەکان دوور دەکەونەوە، فایتوون ڕێگا دەبڕێ، ئاخ، ئەو هیچ نییە، هێشتا هەتا پێچی شەقامەکەیتر ڕێگایەکی درێژی لەپێشە و ئەو هەروا بێباکانە چاو لە

دەوروبەری خۆی دەکا، لەو هەزاران مرۆڤە دڵڕەقە دەڕوانێ کە چاویان تێبڕیوە و پێیانوایە ئەویش مرۆڤێکە وەک ئەوان. بەڵام ئێستا کاتی ئەوەیە بەرەو شەقامێکی دیکە باداتەوە. ئاخ، ئەوەش هیچ نییە، هێشتا شەقامێکی تەواوی لەپێشە، ئەگەرچی ماڵانێکی زۆر ماون بەجێیان بێڵێ، هێشتا پێیوایە زۆری ماوە بگاتە کۆتایی ماڵەکان. بەمشێوەیە هەتا کۆتایی شەقامەکە و شوێنی سزادانەکەی زۆری ماوە.

پێموایە حاڵ و ڕۆژی کارامازۆفیش لەو کاتەدا ئاوا بووە. حەتمەن بە خۆی گوتووە: «هێشتا دەرفەتیان بۆ هەڵنەکەوتووە، هێشتا دەکرێ ڕێگەی دەربازبوون پەیدا بکا، ئاخ، هێشتا دەکرێ پیلانێک داڕێژێ بۆ پارێزگاری لەخۆی، ئێستاش، ئێستا ـ ئەو چەندە شۆخوشەنگە!»

ترس وشڵەژان ڕۆحی داگرتبوو، بەڵام توانیی نیوەی پارەکەی وەلا بخات و لە شوێنێک بیشارێتەوە ون بوونی نیوەی ئەو سێهەزار ڕۆبڵەی لە ژێر باڵنجەکەی باوکی دەریهێنابوو، ناتوانێ ڕوون کردنەوەیەکی لەوە باشتر بە دەستەوە بدا. پێشتریش زیاتر لەجارێک چووبوو بۆ ماکرۆیە، لەوێ دوو ڕۆژ لەگەڵ ئەو خەریکی بەزم و کەیف و نەهەنگ بووبوو، ئەوماڵە گەورەی بە دالان و سووچ و قوژبنەکانیەوە دەناسی. پێموایە نیوەی پارەکەی، ماوەیەک بەرلە قۆڵبەستکران لەوێ شاردبۆوە، لە کەلێن و قوژبنێکدا، لە ژێر چەقی ژۆرێکدا، لەسووچێکدا، یان بنمیچێکدا. دەپرسن: بە چ ئامانجێکەوە؟ ڕووداوەکە لەوانەیە زۆر زوو بقەومێ، ئەو هێشتا بیری نەکردبۆوە چۆن لەگەڵی بەرەوڕووبێ. هەلی بۆ نەڕەخسابوو، کەوتبووە دڵەکوتێ و خەیاڵی لای «ئەو» بوو، بەڵام پارە ـ پارە بە هەر شێوەیەک بێ زۆر پێویست بوو! پیاو بە پارەوە پیاوە. ڕەنگە ئەو جۆرە پێشبینییە بۆ داهاتوو لە کاتێکی ئاوادا لەڕوانگەی ئێوەوە سروشتی نەنوێنێ! بەڵام خۆی دڵنیامان دەکا کە مانگێک لەمەوبەر، لە کاتێکی ناسک و پڕدڵەخورپەی دیکەدا، پارەکەی کردووە بە دوو بەشەوە و بەشێکی لە توورەکەیەکی ناوە. ئەگەرچی ئەو وتە ڕاست نەبوو، هەر بەوجۆرەی کە دەیسەلمێنین، دەردەکەوێ کە ئەندێشەیەکی ئاوا بۆ کارامازۆف

ئەندێشەیەکی ئاشنا بووە. لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێک لە لێپرسینەوەدا گوتی کە هەزاروپێنج سەد ڕۆبڵی لە توورەکەیەک ناوە (کە ئەوشتە هەر نەبووە) لەوانەیە ئەو توورەکە چکۆلەی کتوپڕ بە زەیندا هاتبێ. چونکە دووسەعات بەرلەوە پارەکەی کردبوو بە دووبەشەوە و هەتا بەیانی نیوەی لە ماکرۆیە شاردبۆوە، تەنیا لە بەر ئەوەی لە لای خۆی نەبێ. دوو جەمسەر، برایانی لێژنەی داوەری، لە بیرتان نەچێ کارامازۆف دەتوانێ لەکاتێکدا لە سەر دوو جەمسەر هەڵوەستە بکا. ئێمە هەموو کەلێن و قوژبنی ماڵەکە گەڕاوین و پارەکەمان بۆ نەدۆزراوەتەوە. لەوانەیە هێشتا هەر لەوێ بێ، یان لەوانەیە دواتر ون بووبێ و ئێستا لە لای تۆمەتبار خۆی بێ. هەرچۆنێک بێ لە لای «ئەو» بوو، لە بەردەمیا بە چۆکدا هاتبوو، ئەویش لە سەر چرپاکە پاڵ کەوتبوو. کارامازۆف هەردوو دەستی بۆ لای ئەو ڕاکێشابوو و مەستی ئەشق و جوانییەکەی بووبوو ئاگای لە مەحموودی بێزەواد نەبوو. تەنانەت ترپەی پێی ئەو کەسانەشی نەبیست کە چووبوون بۆ قۆڵبەستکردنی. دەرفەتی نەبوو شێوەیەک خوڕاگری لە زەینی خۆیدا ئامادە بکات. خۆشی و زەینیشی خافڵگیر کران.

ئەویش لێرەیە، بەرەوڕووی دادوەر و قازییەکان دانیشتووە کە چارەنووسی لە دەستی ئەواندایە. برایانی لێژنەی داوەری، لە کاتی بەڕێوەبردنی ئەرکەکانماندا جاری وایە ناتوانین لەگەڵ کەسێک بەرەوڕوو بین، بە بڕوای ئەویش ئاوا دژوارە! کاتی هەڵوێستە کردن لە سەر ئەو ترسە حەیوانییە، کاتێک تاوانبار دەبینێ هەموو شتێک بەبا چووە، بەڵام هەروا کێشمەکێش دەکا، هەروا قەستی ئەوەی هەیە گێرەوکێشە ساز بکا، ئەو کاتانەی کە غەریزەی دان بەخوداگرتن لەڕێوە لەناخیدا سەرهەڵدەدا و ئەو بەچاوێکی وردبین و خەمبار و پڕ پرسیارەوە چاوتان لێدەکا، بیر لە ڕوخسار و ئەندێشەتان دەکاتەوە، نازانی لە کام لاوە زەبری لێدەدەن، زەینیشی لە ساتێکدا هەزار پیلان دادەڕێژێ، بەڵام هەروا لە قسە کردن دەترسێ. دەترسێ خۆی پێوە بکا و بەدەمی خۆی ڕاستی لە خۆی بڵێ! ئەم ئازاری ڕۆحە، ئەم تامەزرۆییە بۆ دان بەخۆدا گرتن، ئەم

ساتانەی ڕۆحی مرۆڤی تێدا سووکوچرووک دەبێ، زۆر سامناکە، هێندێ جار تەنانەت قازیش تووشی ئەو ترس و دڵسۆزیە دەبێ و بەزەیی بە تاوانباردا دێ. ئەوەش شتێک بوو کە لەو کاتەدا بەچاوی خۆمان دیمان.

سەرەتا تووشی سەرسووڕمان بوو و لەترسانا چەند جار وشەی زۆر سازشکارانەی بە زاردا دێ. «خوێن! هەقم بووە!» بەڵام خێرا دانی بە خۆیدا گرت. خۆی ئامادە نەکردبوو و نەیدەزانی بڵێ چی، دەبێ چ وەڵامێک بداتەوە، جگە لە حاشاکردنێکی وشک و خاڵی هیچیتری بە زاردا نەدەهات. «من تۆمەتباری مەرگی باوکم نیم.» لەو دەمودەستەدا گردوولکەی ئێمە ئەمە بوو و هیوداربووین پشت ئەو تیرەگە بکەینە مەتەرێز. سەبارەت بە وشەی سازشکارانەی پێشوو بە پەلە دەستیکرد بە ڕوونکردنەوە و گوتی تەنیا بەرپرسی مەرگی گریگۆرییە. «تاوانی ڕشتنی خوێنی ئەو لە ئەستۆ دەگرم، بەڵام ئاغایان کێ باوکمی کوشتووە، کێ کوشتوویەتی؟ ئەگەر من نەمکوشتووە، ئەی کێ کوشتوویەتی؟» گوێتان لێیە، ئەو پرسیارەی لە ئێمە دەکرد. لە ئێمە کە چووبووین هەر ئەو پرسیارە لە ئەو بکەین! گوێتان لێیە، ئەو قسەیە ـ «ئەگەر من نەمکوشتووە» ـ بە چ پەلەپەلێکی خاویلکانە درکاندی، بە چ مەکرێکی حەیوانی و ساویلکەیی و بێسەبرییەکی کارامازۆفییانەوە؟ بە پەلە دانی پێدانا (بەپەلە بوو زۆریش بەپەلە) من نەمکوشتووە و نابێ پێتان وابێ من کوشتوومە! دەمویست بیکوژم، ئاغایان، دەمویست بیکوژم، بەڵام بەوە تاوانبار نابم، من بکوژی ئەو نیم. لە لای ئێمە دانی پێدانا کە ویستوویە بیکوژێ، دەتگوت دەڵێ تێدەگەن چەندە ڕاستوێژم. هەربۆیە زۆر زوو بۆتان دەردەکەوێ کاری من نییە! ئاخ، لەوجۆرە کاتانەدا تاوانبار زیاتر بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ڕواڵەتبین و خۆشباوەڕە.

لەو کاتەدا، یەکێک لە پارێزەران، وەک بڵێی بە هەڵکەوت، پرسیارێکی زۆر سادەی لێکرد: «بڵێی ئیسمیر دیاکۆف نەیکوشتبێ؟» پاشان بە پێی چاوەڕوانیی ئێمە، بەو پرسیارە خافڵگیر بوو، بەرلەوەی بشتیوانێ ساتێکی لەبار بۆ هێنانی ناوی ئیسمیر دیاکۆف هەڵبژێرێ، بە توندی ڕقی هەستا. وەک هەمیشە هەڵات

بۆ ئەو جەمسەرەی دیکە و دەستیکرد بە خاترجەم کردنی ئێمە و گوتی کاری ئیسمیر دیاکۆف هەر نییە و ئەو قەتی ئەو کارە لە دەست نایە. بەڵام باوەڕ بە قسەکانی مەکەن، هەمووی فێڵ و دەهۆیە و بەس. لەڕاسیتدا، بیری هەر لە لای ئیسمیر دیاکۆف بوو. دەیویست بە هەر شێوەیەکە دیسان مەسەلەی ئەو بێنێتەوە گۆڕێ. چونکە لە ڕاستیدا جگە لە ئەو کەسی پێشک نەدەهات. دەستە چەورەکەی خۆی لە سەری هەڵساوێ، بەڵام دواتر ئەو کارەی هەر دەکرد، چونکە دەیزانی جارێ کاردانەوەی نابێ، ڕەنگە ڕۆژی دوایی، یان تەنانەت چەند ڕۆژ دواتر، لە ناکاو دەرفەتی دێنا و هاواری دەکرد: «دەزانن، من لە ئێوە زیاترم شک لە ئیسمیر دیاکۆف بوو، خۆتان خۆ ئەوەتان لە بیرە، بەڵام ئێستا خۆشم دڵنیام ئیسمیر دیاکۆف کوشتوویەتی. ئەرێ هەر کاری ئەوە!» بەڵام جارێ بە حاڵەتێکی خەمبار و وەڕەزەوە دەستیکردووە بە حاشاکردن. لەگەڵ ئەوەشدا، بێسەبری و ڕق هانیدا دەستبکا بە ڕوون کردنەوەیەکی نابەجێ و قسەیەکی کرد کە هیچکەس ناتوانێ بڕوا بکا، لە پەنجێرەکەوە چاوم لە ژوورەکەی باوکم کرد و بەڕێز و ئەدەبەوە کشامە دواوە. لە هەمووشی خراپتر ئەوەیە، ئاگاداری ئەوە بوو گریگۆری زیندووە و شایەدی دەدا.

دەستمانکرد بە پشکنینی و هەموو گیانی گەڕاین. ئەو کارەش زۆری ڕقهەستاند و هەر لەو کاتەشدا هیواداری کرد و بەوە دڵخۆشبوو کە سێهەزار ڕوبڵەکەی پێ نییە، بەڵکو نیوەی پێیە. بێگومان هەر لەوکاتەی ڕق و بێدەنگیدا بوو نەقڵی ئەو توورەکە چکۆلە بە زەینی گەشیت. بێگومان خۆشی دەیزانی ئەوشتە لەڕاستی بەدوورە و هەوڵیدەدا هەرچۆنێکە بیسەلمێنێ و تان و پۆی نەقڵەکە وا پێکەوە بتەنێ وەک ڕاست بنوێنێ. لەوجۆرە کاتانەدا، ئەرکی یەکەم و گرینگترین ئەرکی دادوەر ئەوەیە کە ڕێگا لە خەبابەتی تاوانبار بگرێ و بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو بیخاتە داوەوە. بۆ ئەوەی ئەو بیر و ئەندێشانەی هیوای گەورە و گرانی پێیانە، بە شێوەیەکی سادە و نائاسایی بدرکێنێ. تەنیا بە پرسیاری کتوپڕ و چاوەڕوان نەکراو دەتوانن تاوانبار وەقسە بێنن، بە شێوەیەک کە وا بنوێنێ ئەو پرسیارە بە هەڵکەوت بووە و ڕاستییەکی

نوێ و بارودۆخێکی زۆرگرینگە و پێشتر لێی ئاگادار نەبووە و نەیتوانیوە پێشبینی بکا. ئێمە ئەو ڕاستییانەمان بە دەستەوە بوو، ماوەیەکی زۆربوو ئامادە بوو ـ ئەو شایەدی دانەی گریگۆریش سەبارەت بە ئاوەڵا بوونی دەرگاکە، کە تۆمتبار لەوێوە دەرباز بووبوو. ئەو مەسەلەی بە جارێ لە بیر بردبۆوە و تەنانەت پێی وانەبوو گریگۆری دیویشییەتی.

کاردانەوەکەی سەرسوڕهێنەر بوو. ڕاچڵەکی و هاواریکرد: «کەوایە ئیسمیر دیاکۆف کوشتوویە، کاری ئیسمیر دیاکۆفە!» بەو شێوەیە هەموو شتێکی لێ‌ئاشکرا بوو و ئیتر ڕێگەی حاشاکردن و بەرگریکردن لە خۆی لێبڕایەوە. چونکە ڕوون و ئاشکرایە کاتێک ئیسمیر دیاکۆف دەتوانێ ئەو قەتڵەی کردبێ کە گریگۆریی دابێ بەزەویدا و هەڵاتبێ. کاتێک گوتم گریگۆری بەرلە کەوتن چاوی بە دەرگاکە کەوتووە ئاوەڵا بووە، هەروا کە لە وەتاغی خەوەکەی هاتبووە دەرێ، گوێی لە ناڵە ناڵی ئیسمیر دیاکۆف بووبوو ـ کارامازۆف بە جارێ تێکشکا، هاوکاری بەڕێز و قۆشمەم، نیکۆلای پارفنۆویچ دواتر پێیگوتم کە بە دیتنی ئەو خەریک بووە دەستبکا بە گریان. پاشان تۆمەتبار دەستیکرد بە گێڕانەوەی نەقڵی توورەکەکە ـ باشە، ئێستا گوێ لەو هەقایەتە بگرن!

برایانی لێژنەی داوەری، پێشتر گوتم کە بۆچی ئەو هەقایەتە بە شتێکی ناڕاست و وڕێنەیەکی بێ‌بنەما دەزانم، ئەگەر پیاو لە سەر مەرج بیگوتبایە چیرۆکێکی زۆر نائاسایی دەگێڕمەوە کە هیچکەس نەیبیستبێ و جێی باوەڕیش نەبێ. هەر شتێکی ئاوای دەگێڕایەوە. خراپیی ئەو جۆرە هەقایەتەش لەوەدایە کە هەقایەت‌وێژانی زاڵ، لە بەر هێندێک وردەکاری تووشی سەر لێشێواوی دەبن و شکست دەخۆن و ژیانی ڕاستەقینەش جوانییەکانی خۆییان لێدەستێنێتەوە، ئەم هەقایەت‌وێژە چارەڕەش و بێ‌ورانەش ئەوان وەک شتێکی بێبایەخ لە بیر خۆیان دەبەنەوە. ئەوان بیری خۆیان بەوشتە وردانەوە خەریک ناکەن. شەشدانگی بیر و هۆشیان بۆ داهێنانە مەزنەکەیان تەرخاندەکەن. بۆ کەسێک دەوێرێ شتێکی چکۆلە و بێ‌بایەخیان پێ زیاد بکا؟ بەڵام تاقە ڕێگای خافڵگیرکردنیان هەر ئەوەیە. پرسیار لە تۆمەتبار کرا: «پەڕۆی توورەکە

چکۆلەکەت لە کوێ هێنا و کێ بۆی درووی؟» «خۆم درووم.» «پارچەکەیت لە کوێ هێنا؟» تۆمەتبار بەو پرسیارە زۆر تێکچوو، پێیوابوو بەو پرسیارە کەمبایەخە سووکایەتیی پێکراوە، بڕواشدەکەن ڕەنجانەکەی زۆر سادقانە بوو! بەڵام هەموویان هەروان. :کوتێکم لە کراسەکەم بڕی.» «کەوایە سبەینێ لە نێو کراسەکانتدا ئەو کراسە بڕدراوە دەدۆزینە.» جا بیهێننە بەرچاوی خۆتان برایانی لێژنەی داوەری، ئەگەر بە ڕاستی ئەو کراسە بڕدراوەمان بدۆزیبایەتەوە (بۆ دەکرا ئەو کراسە لە نێو دۆلاب یان یەغدانێکدا بدۆزیتەوە؟) وەک بەڵگەیەک حیسابی لە سەر دەکرا و دەبووە بەڵگەیەکی ئاشکرا بۆ سەلماندنی قسەکانی! بەڵام توانایی ئەو ئەندێشەیەی نەبوو. «لەبیر نییە، پێموانییە لە کراسەکەم بڕیبێ، پارەکەم نایە توێی کڵاوێکی خاوەنماڵەکەم و درووم.» «کڵاوێکی چۆن بوو؟» «بزگوڕە کەتانێکی کۆن بوو لە سەر عەرزەکە کەوتبوو.» «ئەوەت بە جوانی لە بیرە؟» «نا، لە بیرم نییە.» زۆر بەتوندی تووڕە بوو، بیری لێبکەنەوە، سەرەڕای ئەوانەش وەبیری نایە! مرۆڤێک لە دژوارترین ساتی تەمەنیدا، بۆ وێنە کاتێک دەیبەن بۆ پای سێدارە، ئەوشتە ئاساییانەی وەبیر دێتەوە. هەموو شتێکی لە بیر دەچێتەوە، جگە لەو سەربانە سەوزەی کە بەلایدا تێپەڕیوە، یان قشقەڕەیەک لە سەر خاچێک - ئەوەی وەبیر دێتەوە. دروونی ئەو تووڕەکە چکۆلەی لە ئەندامانی بنەماڵەکە شاردەوە، حەتمەن ترسی ئەوەی بووە ئابڕووی بچێ، نەکا کەسێک بچێتە ژووری و بیبینێ دەرزی و دروومانی بە دەستەوەیە، هەر گوێی لەدەنگ و خشپەیەک بوایە هەڵدەهات بۆ بنپەردەکە و خۆی دەشاردەوە. (شوێنی نیشتەجێ بوونەکەی پەردەیەکی لێیە.).»

ئیپۆلیت کیریلۆویچ لە ناکاو گوڕاندی: «برایانی لێژنەی داوەری، بۆ ئەم شتە بێبایەخانەتان بۆ باسدەکەم؟ چونکە دەزانم لەم ساتە بەدواوە تۆمەتبار لە سەر ئەو قۆڕیاتە پێداگری دەکا. لەو شەوە نەخسەوە هەتا ئەمڕۆ دوو مانگ ڕابردووە و هیچی بۆ ڕوون نەکردووینەتەوە، تاقە دەلیلێکی ڕاستەقینە و ڕوونکەرەوەی بە قسە پڕگومانەکانی پێشووی زیاد نەکردووە؛ هەمووشی

قسەی هەڵیتوپڵیتە. «چونکە پیاوێکی شەرافەتمەندم دەبێ بڕوا بە قسەکانم بکەن.» ئاخ، زۆرمان پێخۆشە باوەڕ بکەین، زۆر زۆریشمان پێخۆشە، تەنانەت ئەگەر لە سەر قەولی شەڕەفیش بێ! بۆ ئێمە چەقەڵ و گورگین تینووی خوێنی مرۆڤ بین؟ تەنیا بەڵگەیەکمانن نیشانبدەن بەقازانجی تۆمەتبار بێ و بیسەلمێنێ کە تاوانبار نییە، ئێمە خۆشحاڵ دەبین. بەڵام بەڵگەیەکی ڕاستەقینە و عەینی بێ، نەک وەکو قسەکانی برای تۆمەتبار کە بڕوای بە براکەی کردبوو و دەیگوت کاتێک براکەی بە مشت لە سینگی خۆی داوە، حەتمەن مەبەستی ئەو توورەکە چکۆلە بووە کە بە ملیا هەڵیواسیوە، بەو تاریکە ئاماژەی بەوە کردووە. ئەگەر بەڵگەیەکی تازە ڕادەستی دادگا بکەن زۆر خۆشحاڵدەبین و یەکەم کەس دەبین کە تۆمەتەکان ڕەتدەکەینەوە و تۆمەتبار فحێل دەکەین، بەڵام ئێستا عەداڵەت هاوار دەکا و ئێمە پێداگری دەکەین کە ناتوانین هیچ شتێک ڕەتکەینەوە.»

لیرەدا ئیپۆلیت کیریلۆویچ گەیشتە کۆتایی وتەکانی، دەتگوت ژانیکردووە و کەوتۆتە چەقوچۆ. باسی خوێنێکی دەکرد کە هاواری تۆڵە و قین دەکا، خوێنی باوکێک کە بە دەستی کوڕەکەی ڕژاوە و بە هۆی ئەنگێزەی خوێڕییانەی دزییەوە کوژراوە! ئەو ئاماژەی بە هەماهەنگیی تراژیک و دروەشاوەی ڕاستییەکان کرد.

ئیپۆلیت کیریلۆویچ نەیتوانی دان بە خۆیدا بگرێ و ئاماژە بەم بابەتە نەکا. کە: «هەر وتەیەکیش لە پارێزەرێکی خاوەن مرخ و بەناوبانگ ببیستن، هەرچەندە زمان پاراوبێ و هەست و سۆزی ئێوە بجووڵێنێ، لە بیرتان بێ کە لەم ساتەدا لەبەردەم پەرستگەی عەداڵەت دان. لە بیرتان بێ ئێوە پارێزەرانی عەداڵەتی کۆمەڵگاکەمانن، پارێزەرانی عەداڵەتی ڕووسیای پیرۆز ـ بنەماکەی، بنەماکەی و هەر شتێک کە بە پیرۆزی دەزانن! بەڵێ، ئێوە لێرە لەم ساتەدا نوێنەرانی ڕووسیان، حوکمی ئێوەش نەک بە تەنیا لەم تەلارەدا دەبیسترێ، بەڵکو لە سەرانسەری ڕووسیادا دەنگ دەداتەوە. تەواوی خەڵکی ڕووسیش وەک پارێزەر و دادوەری وڵاتەکەیان حوکمەکەتان دەبیستن و هومێد و هیوابڕوایی ڕووسیا لە گرەوی ئێوەدا دەبێ. ڕووسیا و چاوەڕوانییەکانی

تووشـی ناهومێـدی مـەکـەن. ئـەو خێـشکە نـەخـسەی ئێمـە بـەپڕتـاو ڕەنگـە بەرەوناخی فەوتان بڕوا، تەواوی خەڵکی ڕووسیا ماوەیەکی زۆرە دەستەودوعا دەپاڕێنەوە بۆ ئـەوەی ئـەم تیژ تـێپـەڕینە بێباکانـەیـەی ئێمە کۆتـایی پـێ بـێ. ئـەوەش کاتێک دەگونجێ کە تـەواوی نـەتـەوەکانی دیکـەی جیهان خۆیان لـەو خێشکە دوور ڕاگرن، بۆ ڕێزگرتنیش نا، ئەو جۆرەی کە ئەو شـاعیرە دەڵـێ، لـە ترسـانا. سـەرنـج بدەن، لـە ترسـانا، یـان لـە بـەر ڕق و بێـزاری. زۆر باشیـشە خۆیان دوور ڕاگرن و ڕێگا بەردەن، بەڵام لەوانەیە ڕۆژێک ئەو کارە نەکەن و لە بەر خاتری سەلامەتی و ڕۆشنبیری و ژیاریان دیوارێکی قایم لـە سـەر ڕێی ئەو تاپۆ تیژ تێپـەڕە هـەڵچنن و بـەر بە هێرشـی شـێتانە و بێباکانـەمـان بگرن. دەنگی ڕاگەیاندنی مـەترسیمان لـە فـەڕەنگ بیستووە، ئـەوان وەدەنگ هـاتوون. تووشی وەسوەسەیان مەکەن! بە حوکم پێدانێک کە کوشتنی بـاوک بـە دەسـتی کوڕەکەی بە باش دەزانێ، ئاگری ڕق و بێزارییـان مـەگـەشێننەوە و بـە دەسـتی خۆتان ئێزنگ و ئاوردووی پێوەمەنێن!»

وەلحاسڵ ئیپۆلیت کیریلۆویچ لەگـەڵ ئـەوەی سـادقانە هـەژا بـوو، وتـارەکـەی بـەو داخـوازە ڕوون و ئاشـکرایە کۆتـایی پێهێنا - شـوێنێکی زۆریشی لـە سـەر خـەڵکەکە دانـا. کاتێک وتـەکانی تـەواو بـوو، بـەپـەلـە ڕۆیشتە دەرێ و هـەروەک پێشتر گوتوومـە، لـە وەتاغـەکـەی تـەنیشیتی هۆڵـەکە دەکرێ بڵێین بووراییەوە. دەنگی چەپڵە لێدان لە هۆڵی دادگاوە نەدەبیسترا، بـەڵام ئـەو کـەسـانەی جیددی بـوون زۆر شـاد و ڕازی دیـار بـوون. ژنـان زۆر ڕازی نـەبـوون، ئـەگـەرچـی ئەوانیش زمانپاراوییەکەیان بەدڵ بوو، بـەتایبـەت ئـەوەی سـەبـارەت بە ئاکامی محاکەمەکە دڵگران نەبوون و ئیمـانێکی تـەواویـان بە فیتی یۆکـۆویچی پـارێزەر هەبوو. «ئاخری دێتە زمان و پێیاندەڵێ پووتێک چەن سیەیە.» هـەمـوو چاویـان لە میتیا بڕیبوو. سـەری داخستبوو و دەستی هەڵدەگوڵۆفی و ددانی پێکدا دەنـا، لە ماوەی ئاخافتنەکەی دادوەردا متەقی نەکرد. بەڵام جارجار سـەری هـەڵدێنا و گوێی ڕادەگرت، بـەتایبـەت کاتێک کـە نـاوی گرووشنکا دەهاتـە گـۆڕێ. کاتێک دادوەر بیروڕای ڕاکیتینی سەبارەت بە گرووشنکا گێڕایەوە، بزەیـەکی تـووڕە و

پڕ سووکایەتی نیشتە سەرلێوی میتیا و بە ورتەورتێکی وا کە دەنگی دەبیسترا گوتی: «بێرناردانە!» کاتێک ئیپۆلیت کیریلۆویچ گوتی لە ماکرۆیە کاتی لێپرسینەوە ئازاری داوە، میتیا گوێ قوڵاغ بوو و سەری هەڵێنا. لە شوێنێکدا تۆزێکی مابوو هەستێتە سەرپێ و بنەڕێنێ، بەڵام دانی بە خۆیدا گرت و بە ڕق و بێزارییەوە شانی هەڵتەکاند. خەڵک دواتر باسی ئاخافتنی دادوەر و سەرکەوتنە بەرچاوەکەی لێپرسینەوەی گوندی ماکرۆیەیان دەکرد و ئیپۆلیت کیریلۆویچیان وەبەر پلاری تەشەر و توانج دابوو و بە گاڵتەوە دەیانگوت: «مەگین دەکرێ پیاو ئەو هەمووە سەبارەت بە زیرەکیی خۆی چاووڕاو بکا.»

کۆتایی محاکەمەکە ڕاگەیەندرا، بەڵام بۆ ماوەیەکی کورت، نزیکەی چارەگێک یان بیستدەقیقە. خەڵکەکە دەستیان کرد بە سرتوخورت و پرسیار و وەڵام. بڕێک لەو قسانەم لە بیر ماوە.

لە نێو پۆلێکدا کابرایەک بە لەبزێکی جیددی گوتی: «ئاخافتنێکی بە کاکڵ بوو.» دەنگێکیتر گوتی: «زۆری گرنگی بە ڕەوانناسی دا.»

ـ بەڵام هەمووی ڕاست بوو، لاپ هەقیقەت بوو!

ـ ئەرێ لە ڕەوانناسیدا شارەزایە.

ـ هەمووی بردەوە سەریەک.

دەنگێکی دیکە هەڵیدایە: «ئەرێ ئێمەشی بردەوە سەریەک. لە بیرتانە لە سەرەتای قسەکانیدا ڕاشکاوانە گوتی هەموومان وەک فیۆدۆر پاولۆویچ واین؟»

ـ لەکۆتاییشدا، بەڵام هەمووی قسەکانی هەڵیتوپڵیت بوو.

ـ زۆریش تەمومژاوی.

ـ چاک کەوتبووە ژێر کاریگەریی ئیحساسات.

ـ بێئینسافانەیە، بێئینسافانە، کاکە.

ـ نا، هەرچۆنی دادەنێی، داینێ، بەڵام کارەکەی شارەزایانە بوو. ماوەیەک بوو چاوەڕوان بوو، ئاخری قسەی خۆی کرد هی ـ هی!

ـ بڵێی پارێزەر بڵێ چی؟

لە پۆلێکی دیکەدا بیستم:
- نەدەبوو ئاوا بەو کابرا پترزبۆرگییەوە بدا؛ «دەستەوداوێنی ئیحساساتی ئێوە بێ» - لە بیرتە؟
- ئەرێ زۆر ناحەز بوو.
- زۆریش بەپەلە بوو.
- مرۆڤێکی توورە و تۆسنە.
- ئێمە پێدەکەنین، بەڵام تۆمەتبار لە چ حاڵێکدایە؟
- ئەرێ، بڵێی میتینکا لە چ حاڵێکدا بێ؟
پولێکی دیکە سەریان پێکەوە نابوو:
- ئەو خاتوونە چکارەیە، ئەو قەڵەوە چاویلکە لە چاوە، کە لەو سەرەوە دانیشتووە.
- ژنی ژینراڵێکە، تەلاقی وەرگرتووە، دەیناسم.
- خویەتی، هەر ئەو خاتوونە چاویلکەی لە چاودایە.
- خۆ ئەوەندەش جوان نییە.
- ئاخ، نا، ژنێکی زۆر دەمهەراشە، بزانێ دەمانخوا.
- دوو ڕیز لە پشت ئەوەوە ژنێکی قژزەردی چکۆڵە دانیشتووە، ئەو جوانترە.
- قۆڵبەستکردنی میتیا لە ماکرۆیە کارێکی زۆر زیرەکانە بوو، نا؟
- ئەرێ زیرەکانە بوو. پێشتریش بیستوومە، لە هەرکوێ دادەنیشێ خێرا دەیگێڕێتەوە، کردوویەتە بنێشتەخۆشەکە!
- ئێستاش نەیتوانی خۆی لێببوێرێ. بە شانازییەکی گەورەی دەزانێ.
- مرۆڤێکی ڕقلەزگە، هی - هی!
- ئەرێ، زووش قسە بەدڵەوە دەگرێ. زۆریشی قسەی زل و هەڵەوەڕی کرد.
- ئەرێ، دەیهەوێ وریاییمان پێبدا. لەسەریەک هەولێدەدا وریاییمان پێبدا. خۆ نەقڵی خێشکەکەت لەبیرە؟ هەروەها نەقڵی «ئەوان هاملێتیان هەیە و ئێمەش کارامازۆفمان هەیە!» زیرەکی لە قسەکانی دەباری!

- ئەو دەیویست ماستاو لەبەر لیبرالەکان سارد کاتەوە، زۆریان هیلکە لەبەر دەکا.

- ئەریَ بۆ یاساناسانیش هەروایە.

- ئەریَ، بلّێی فیّتی یۆکۆویچ بلّیَ چی؟

- هەرچی بیلّیَ دەردێک لە سەری گوندنشینەکانی ئێمە کەم ناکاتەوە.

- وابیر دەکەیتەوە.

دەستەی چوارەم:

- ئەوەی سەبارەت بە خێشک گوتی زۆر سەرنجڕاکێش بوو، مەبەستم ئەو بەشەیە کە پێوەندیی بە نەتەوەکانیترەوە هەبوو.

- شتێکیشی سەبارەت بە تاقەتهێنانی نەتەوەکانی دیکە گوت، ڕاست وایە.

- مەبەستت چییە؟

- ئاخر حەوتووی ڕابردوو لە پارلەمانی ئینگلیس یەکێک لە ئەندامان هەستا و سەبارەت بە نیهێلیستەکان پرسیاری لە هەیئەتی وەزیران کرد و گوتی کاتی ئەوە نەهاتووە قۆلّی لیَهەلّمالّن و دەرسێکی عیبرەت بەوتاقمە وەحشییە بدەن؟ ئیپولیت بیری لەوە دەکردەوە، دلّنیام. سەبارەت بە مەسەلەی حەوتووی پێشوو دەدوا.

- کارێکی هەروا ئاسان نییە.

- کارێکی ئاسان نییە؟ بۆ؟

- دەی کرۆنشات دادەخەین و ناهێلّین گەنم بەرنەدەریَ. ئەو کاتە گەنم لەکویَ دێنن؟

- لەئەمریکا. هەر ئێستاش لە ئەمریکای وەردەگرن.

- قسەی قۆڕ دەکەی!

لەپڕ زەنگیان لێدا، هەموو بەپەلە لەجێی خۆیان دانیشتنەوە. فێتی یۆکۆویچ چووە پشت مێزی ئاخافتن.

---

٩- پێگەی هێزی دەریایی، کە پارێزگاری لەدەرووی سنپترزبۆرگ دەکا.

## (١٠)

# وتەی پارێزگاری. شمشێری دووەم

هەرکە قسەکانی ئاخێوەر، پارێزگاری بەناوبانگ لە دادگاکەدا دەنگی دایەوە، هەموو بێدەنگبوون. حازریان هەموو چاویان تێبڕی. زۆر سادە و ڕاشکاوانە دەستیپێکرد، بە حاڵ و هەوایەکی ئارام و خاترجەمەوە، بێئەوەی چکۆلەترین نیشانەی غروور و خۆنواندن بە قسەکانیەوە نەدەبینرا. لە سەر ڕەوانبێژی و زمان پاراوی و بزواندنی هەستی بەزەییی دادوەرەکان پێداگریی نەکرد. وەک کەسێک وابوو کە لە نێو کۆڕی هەواڵ و هاوڕێیانی هاودڵی خۆیدا قسە دەکا. دەنگی بەرزی لەدڵ دەنیشت و سەداقەت و ساکاری بەدەنگییەوە دیاربوو. بەڵام هەمووان بۆیان دەرکەوت کە ئاخێوەر لەوانەیە لە ناکاو پەنا بۆ بەزەیی و پاڕانەوە بەرێ و «دەرگای دڵ بە وزەیەکی نەوێژراو بکاتەوە» قسەکانی لەقسەی ئیپۆلیت کیریلۆویچ ڕێکوپێکتر نەبوو. بەڵام بە وردبینییەکی زیاتر و لەسەرەخۆتر قسەی دەکرد. شتێکی بەدڵی ژنەکان نەبوو: ئەو بەردەوام بۆ پێشەوە دادەهاتەوە، بەتایبەت لە سەرەتای ئاخافتنەکەیدا. ناکرێ بڵێین دادەهاتەوە، بەڵکو دەتگوت سیلە لە بیسەرانی دەگرێ، پشتەدرێژەکەی هەتا نیوەی دەنووشتاندەوە، دەتگوت نێوەڕاستی ئەوپشتە درێژ و باریکەی فەنەری تێدایە کە دەیتوانی ئاوا دابێتەوە.

سەرەتا وتەکانی پچڕپچڕ و دەتوانین بڵێین بە شێوەیەکی ئاسایی و مەنتقی نەبوو، ڕاستییەکانی جیاواز لە یەکتر هەڵدەسەنگاند، ئەگەرچی

---

١٠- دێڕە شیعرێکی پووشکین: «لەوەڵامی نامەیەکی بێناونیشاندا.»

لەکۆتاییدا ئەو ڕاستیانەی هەموو پێکەوە پێوەند دایەوە. دەکرێ وتەکانی بکەین بە دوو بەشەوە، بەشی یەکەم داگری ئەو بەڵگانە بوو کە تۆمەتەکەی ڕەد دەکردەوە و هێندێ جار تانە و توانجی پێوەبوو. بەڵام لە بەشی دووهەمدا لە ناکاو لەبز و شێوەی ئاخافتنەکەی گۆڕی و خستییە باری بەزەیی و دڵۆڤانی. وایدەنواند کە خەڵکەکە هەموو چاوەڕوان و تاسە و تامەزرۆیی وەلەرزینی خستوون.

فێتی یۆکۆویچ ڕاست چووە سەرباسی سەرەکیی وتەکانی و ئاوا دەستی پێکرد و گوتی ئەگەرچی لە پترزبۆرگ ئیشی پارێزەری دەکا، لەجارێک زیاتر نەچووە بۆ شارەکان تاکو پارێزەری لەوتۆمەتبارانە بکا کە بەبڕوای خۆی بێتاوانن، یان لانیکەم لەپێشدا هەستیان بە بێتاوانی کردووە. لە ڕوون کردنەوەی وتەکانیدا گوتی: «هەر لەم پەروەندەیەی ئێستادا ئەوەم بۆ هاتۆتە پێشێ. هەر لەویەکەم ڕاپۆرتانەی ڕۆژنامەکاندا مەسەلەیەک لەپێشدا بەقازانجی تۆمەتبار سەرنجی ڕاکێشام. وەلحاسڵ شتێک لە هەموو شتێک زیاتر سەرنجی ڕاکێشام، ڕاستییەک بوو کە لەکاری پارێزەریدا دێتەپێشێ، بەڵام قەومانەکەی بەم شێوە تایبەتی و زێدەڕەوییانەی لە پەروەندەیەکی وەک ئەم پەروەندەیەدا هەیە، دەگمەنە. دەبێ لەکۆتایی وتەکانمدا بێمە سەرباسی ئەم تایبەتمەندییە، بەڵام هەر لەم سەرەتایەوە ئەو کارە دەکەم، چونکە کەمئەزموونیی من لەوەدایە ڕاست دەچمە سەربابەتی سەرەکی و تیرەکانم لەتیردانێدا ڕاناگرم و لە ئاخافتندا دەست بە وشەوە ناگرم و زێدەڕەوی دەکەم. ئەم مەسەلەیە ڕەنگە لەلایەن منەوە چاونەترسانە بێ، بەڵام لانیکەم سادقانەیە. ئەوەی لە زەینمدایە ئەمەیە: بڕێک بەڵگە هەیە بە زیانی تۆمەتبارە، هەر لەو کاتەدا ئەگەر بە شێوەیەکی جیاواز هەڵسەنگێندرێن، ڕەنگ دەگۆڕن. ئەم پەروەندەیەم لەڕێی ڕۆژنامە و ڕاپۆرتەکانەوە ناسی و بەوردی کەوتمە پێوشوێنی. جارلەگەڵجار زیاتر سەرنجی ڕادەکێشام، تائەوەی لە ناکاو لەلایەن خزم و کەسانی تۆمەتبارەوە داواکارییەکم بە دەست گەیشت، کە پارێزەری لەو پەروەندەیە وەئەستۆ بگرم. بە هەشتاو هاتم بۆئێرە و لێرە

بەتەواوی بەوقەناعەتە گەیشتم کە پارێزەریی لێبکەم. بۆیەشم قەبوولکرد تاکو ئەو زەنجیرە بەڵگە سامناکە پسپس بکەم و نیشانیان بدەم کە هەموو بەڵگەیەک بە شێوەی جیاواز سەرنجی بدرێتێ، خەیاڵی و نەسەلمێندراوە.»

پارێزەر بەو شێوە دەستیکرد بە قسەکردن و گوتی:

«ئاغایانی لیژنەی داوەری، من لێرە پیاوێکی غەریبەم و هەربۆیە دەتوانم سەبارەت بە کاردانەوەیەک کە خەڵکی ئەم شارە لە سەر کەسێک هەیانە، بە شێوەیەکی بێلایەنانە داوەری بکەم. تۆمەتبار کە پیاوێکی سەرەڕۆ و توندەتەبیعەتە، هیچ بێحورمەتی و سووکایەتییەکی بەمن نەکردووە. بەڵام لەم شارەدا ڕەنگە سووکایەتیی بە سەدانکەس کردبێ و زۆرکەسی لە خۆی توورە و ڕەشبین کردبێ. هەڵبەت دەزانم خەڵکیش هەقیانە بەدژی ڕاوەستن و ڕقیان لێبێ، چونکە تۆمەتبار ڕقئەستوور و سەرەڕۆیە. لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا بەشدارییدەکرد، تەنانەت لەماڵی دۆستی زۆربەڕێزم جەنابی دادوەریش بەگەرمی پێشوازیی لێدەکرا.

(زۆر چاک سەرنجبدەن. دووسێ کەس لە نێو حازریاندا بەم قسەیەم پێکەنین، بەڵام خێرا دانیان بەخویاندا گرت، بەڵام هەموو تێگەیشتن. هەموومان دەزانین دادوەر بەپێچەوانەی ویستی خۆی ڕێگای بە میتیا دەدا بچێتە ماڵی. چونکە ژنەکەی حەزی بەهاموشۆی دەکرد ـ هەڵبەت خێزانی دادوەر ژنێکی زۆرپاک و بەڕێزە، بەڵام پێچەقێن و وازیوازییە، هەر لەخۆڕا دەیویست لەگەڵ بیروڕای مێردەکەی دژایەتی بکا. سەرەڕای ئەوەش میتیا زۆری هاتوچۆی ماڵەکەیان نەدەکرد.)

پارێزەر لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «بەو حاڵەشەوە دەتوانم بەدڵنیایی بڵێم کە جەنابی دادوەر ئەگەرچی خاوەنی بیرێکی سەربەخۆ و خووخدەیەکی بێلایەنانەیە، وێدەچێ دەرهەق بە تۆمەتباری چارەڕەش تووشی دەمارگرژییەکی نابەجێ و ڕەشبینانە بووبێ. ئەوەش زۆر ئاساییە؛ ئەم پیاوە چارەڕەشەش مستەهەقی ئەودەمارگرژی و ساردییە بووە. ئەخلاقێکی سووکایەتی پێکراو و لەسەروو ئەوەشەوە هەستێکی جوانیناسانەی

سووکایەتی پێکراو، زۆر جار بێبەزەییە. دادوەری بەڕێز لە وتەکانیدا لێکدانەوەیەکی زۆر توندی لە سەر خووخدە و ئاکاری تۆمەتبار هەبوو، کە هەمووومان گوێمان لێبوو. بیروڕای توند و ڕەخنەگرانەی ئەو بەڕێزە لە سەر پەروەندەکە بە ئاشکرا دیار بوو. کەچی بۆ ڕوون کردنەوەی چۆنایەتیی بابەتەکە، چووە سەر خاڵگەلێکی باریکی ڕەوانناسانە، بەڵام ئەگەر کەمترین دەمارگرژیی ئاگادارانە و ڕەشبینیشی دەرهەق بە تۆمەتبار ببووایە ئەو کارەی نەدەکرد. بەڵام لەوبەستێنەدا شتێک هەیە کە تەنانەت لەباری ڕەشبینی و ناعەداڵەتییەوە زۆر لەوە خراپتر و پڕمەترسیترە. ئەوەش لەکاتێکدایە کە غەریزەی هونەری، یان بە وتەیەکی‌تر، ئارەزووی خولقاندنی بەرهەمی هونەری ـ بۆوێنە نووسینی ڕۆمان ـ بەتایبەت ئەگەر خودا ناسینی ڕۆح و ڕەوانی پێ‌بەخشیبێتین، لەڕێ هەتڵەمان دەکا. بەرلەوەی بەرەو ئێرە وەڕێ بکەوم، لە پترزبۆرگ وریاییان پێدام و خۆشم لەوە ئاگادار بووم: کە لەگەڵ ڕەقیبێکی زۆر زانا و خاوەن مرخ تێدەکەوم، کە وردبینی و ڕەوانناسیی ئەو بەڕێزە لە کۆڕ و کۆبوونەوە قەزاییەکاندا ساڵانێکە ناوبانگی دەرکردووە. ڕەوانناسی ئەگەرچی زۆر زانستێکی قووڵە، بەڵام وەک شمشێری دوودەم وایە.» (خەڵکەکە پێدەکەنن) هەڵبەت داوای لێبووردن دەکەم کە ئاوای هەڵدەسەنگێنم و پێکی دەگرم؛ ناڵێم زمان پاراوم و خۆشمی پێوەڕانانێم. بەڵام دەتوانم هەموو وتەکانی دادوەر بخەمەوە سەریەک و نموونەی لێدەرکێشم.

«تۆمەتبار کە بە نێو ئەو باخە تاریکەدا هەڵاتووە، بە نەردەکاندا هەڵدەگەڕێ، پێشخزمەت لاقی دەگرێ و ئەویش بە دەسکاونگ دەکێشێ بەسەریدا و لە سەر عەرزی تخێڵی دەکا. پاشان بازدەداتە خوارێ و نزیکەی پێنج دەقیقە لە ژوور سەری هەڵدەترووشکێ و دەیهەوێ بزانێ کوشتوویەتی یان نا. دادوەر نایهەوێ قەبووڵی بکا کە تۆمەتبار لەبەر دڵسۆزی گەڕاوەتەوە سەر گریگۆری. دەڵێ: «ئەو جۆرە هەستە لەکاتێکی ئاوادا مەحاڵە، شتی‌وا هەرنابێ، ئەو بۆیە گەڕایەوە سەری بۆئەوەی دڵنیابێ شاهیدی کردەوەکەی مردووە یان زیندوو، بەو شێوەیەش نیشانی نەدا کە قەتڵی کردووە، چونکە

لەبەر هیچ هۆیەکیتر نەدەگەڕایەوە.» لێرەدا لەگەڵ ڕەوانناس تێکەوتوون؛ بەڵام لێگەڕێن با هەر ئەوزانستە بگرین و بە شێوەیەکی دیکە پێوەندی بدەین بە مەسەلەکەوە، ئاکامەکەشی وێدەچێ هەر بەو شێوەیە بێ. دەڵێن قاتڵ بۆیە بازیدا تاکو بۆی دەرکەوێ شاهیدەکە زیندووە یان نا، لەگەڵ ئەوانەشدا، هەروەک دادوەر خۆشی بەڵگەی بۆ هێنایەوە، لە نێو ژووری متاڵاکردنی باوکیدا بەڵگەیەکی سەرسوڕهێنەر، پاکەتێکی دڕاو کە لە سەری نووسراوە سێ هەزار ڕۆبڵی تێدایە، بەجێ دێڵێ. «ئەگەر ئەو پاکەتەی لەگەڵ خۆی ببردایە، هیچ عیبادبەشەرێک لەوپاکەتە و پارەکەی نێوی ئاگادار نەدەبوو و بەندی زۆر بەئاسانی دەیتوانی حاشای لێبکا.» ئەوانە قسەی دادوەر خۆیەتی. کەوایە لەلایەکەوە سەرساردییەکی تەواو بەرچاو دەکەوێ، پیاوێکی لەونلێگۆڕاو لەترسانا هەڵاتووە و بە بەجێهێشتنی ئەو پاکەتە بیانووی داوەتە دەستیان، دوودەقیقە دواتر کەسێکیتری کوشتووە و بەوەدا هەقمانە بە مرۆڤێکی دڵڕەق و خاوەن دۆلاب و دهۆی بزانین. بەڵام تەنانەت ئەگەر ئەوەشمان قەبووڵبێ، بەبڕوای من، وردەکاریی ڕەوانناسی ئەو حوکمە دەکا کە لە بارودۆخێکی تایبەتدا وەک هەڵۆیەکی قەفقازی، چاوتیژ و خوێنخۆر بم و لە هەلومەرجێکیتریشدا وەک جرجەکوێرەیەکی ترسەنۆک وابم. بەڵام ئەگەر ئەوەندە خوێنخۆر و فیڵاوی بم کاتێک کەسێک دەکوژم بگەڕێمەوە سەری و بزانم زیندووە تاکو بەزەرەدی من شایەدی بدا، بۆ دەبێ پێنجدەقیقە لە ژوور سەری قوربانییەکە ڕاوەستم و بە بەرەوڕوو بوون لەگەڵ چەندشایەدی دیکە خۆم تووشی مەترسی بکەم؟ بۆ دەبێ بە خاوێن کردنەوە خوێن و خوڕی سەری دەستەسڕەکەم لەخوێن هەڵکێشم، تاکو دوایی ببێتە بەڵگەیەک بەدژی خۆم؟ ئەگەر ئەو هەتا ئەو ڕادەیە دڵڕەق و فیڵاوی بووە بۆ هەر بەودەسکاونگە چەند زەبری دیکەی لە سەری ئەو خزمەتکارە پیرە نەدا بۆئەوەی بە یەکجاری بیکوژێ و دڵی خۆی لەمەڕ شایەدەوە ئاسوودە بکا؟

«لەلایەکیتریشەوە، ئەگەرچی بەپەلە گەڕایەوە سەر شایەدەکە بۆئەوەی بزانێ زیندووە یان نا، شایەدێکی دیکەی هەر لەوێ بەجێهێشت، یانی ئەو

دەسکاونگەی کە لە ماڵی فینیا هەڵیگرتبوو و ئەوان دەیانتوانی ئەو ئاسنەواڵەیە بناسنەوە و شایەدی بدەن کە لەماڵی ئەوان دەستی داوەتێ و بردوویەتی. لەوە ناچێ ئەو دەسکاونگەشی لەبەر کەمتەرخەمی یان پەلەپەل لە سەر ڕێگاکە فڕێدابێ، نا، چەکەکەی تووڕ هەڵدابوو، چونکە پازدەهەنگاو لەولای شوێنەکەی گرێگۆرییەوە دۆزیمانەوە. بۆ کارێکی ئاوای کرد؟ لەبەر ئەوەی کوشتنی خزمەتکارێکی پیر تووشی خەم و کەسەری کردبوو؛ دەسکاونگەکەشی لەبەر تووڕەیی و قین تووڕ هەڵدا و نەحلەتی کرد لەوچەکە چەپەڵ و مەرگاوییە. حەتمەن وابووە، دەنا چ هۆیەکی دیکەی هەیە فڕێدانەکەی؟ ئەگەر میتیا توانایی ئەوەی بووبووایە کە بە کوشتنی کەسێک هەست بە خەم و بەزەیی بکا، بۆمان ڕووندەبێتەوە دەستی لە کوشتنی باوکیدا نییە. ئەگەر ئەوی بکوشتبایە، قەت بەهۆی بەزەیییەوە نەدەگەڕایەوە سەر قوربانییەکی دیکە؛ هەر گوێشی نەدەدایە و مێشێکیشی میوان نەدەبوو. شکیشی تێدانییە ئەو کاتە بێبەزەییانە دەڕۆیشت و ئاوڕیشی لێنەدەدایەوە. یان دەگەڕایەوە و بەجێی ئەوەی پێنج دەقیقە کاتی خۆی لە ژوور سەری پیرەخزمەتکار بەفیڕۆ بدا، بە زەبرێکی دیکە مێشکی لەبەریەک دەبرد. هەر لەبەر ئەوەش بوو هەتا ئەو کاتە ویژدانی پاکبووە و بۆ هەستی بەزەیی دەرگای ڕۆحی ئاواڵە بووە. لێرەدا لەگەڵ ڕەوانناسییەکی جیاواز بەرەوڕووین. برایانی لیژنەی داوەری، من بە ئانقەست ئەم شێوەیەم لەبەر چاو گرتووە، بۆئەوەی نیشانی دەم کە دەتوانین بە ڕەوانناسی هەموو شتێک بسەلمێنین. بەڵام دەبێ بزانی چۆنی بەکار بێنی. ڕەوانناسی تەنانەت جیددیترین مرۆڤیش وا لێدەکا دەستبکا بە هۆنینەوەی هەقایەت، ئەویش تەواو بێئیختیارانە. ئاغایان، من باسی ڕەوانناسیی پڕلەزێدەوەڕی دەکەم، یان کەڵکوەرگرتنی خراپ لە ڕەوانناسی.»

دەنگی پێکەنین و پەسندکردنی قسەکانی، بەقیمەتی ڕیسوابوونی دادوەر، دیسان لە نێو دادگاکەدا کەوتە بەرگوێ، نامەوێ بەوردی وتەکانی دادوەر بگێڕمەوە، تەنیا بەشێک لە وتەکانی دێنمەوە.

(١١)

## پارەی چی و دزیی چی؟

پارێزەر لە وتەکانیدا ئاماژەی بەشتێک کرد کە سەرنجی هەموانی ڕاکێشا. ئەو بوونی سیٚهەزار ڕۆبڵە نەخسەکە و لە ئاکامدا گریمانەی دزرانەکەی، بەتەواوی ڕەتکردەوە.

ئاوا هاتە قسە: «برایانی لیژنەی داوەری، تایبەتمەندیی بەرچاوی ئەم پەروەندەیە سەرنجی هەموو چاوەدێرێکی تازە ڕادەکێشیٚ، بەشەرتێک دەمارگرژانە چاوی لیٚنەکا. یانی تۆمەتی دزی و مەحاڵ بوونی سەلماندنی ئەوەی شتێکی بۆ دزی لێبووبیٚ. بە ئێمەیان گوتووە کە ئەو پارەیە - سیٚهەزار ڕۆبڵ - دزراوە، بەڵام هیچکەس نازانیٚ پارەیەکی وابووە یان نا. چۆنمان نەقڵی ئەو پارەیە بیستووە و کیٚ دزیویەتی؟ تەنیا کەسێک کە دیویەتی لەپاکەتەکە خراوە و لە لێپرسینەوەی سەرەتاییدا باسیکرد، ئیسمیر دیاکۆف بوو. بەرلە ڕووداوەکە نەقڵی ئەو پاکەتە پارەیەی بۆ تۆمەتبار و ئیوان فیۆدۆرۆویچی برای گێڕاوەتەوە. بە خاتوو ئیسۆتیلۆفیش وترابوو. بەڵام هیچکام لەو سیٚکەسە چاویان بەپارەکە نەکەوتبوو، هیچکەس جگە لە ئیسمیر دیاکۆف نەیدیبوو.

لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێشیٚ، ئەگەر ڕاستە پارەیەک لەگۆڕێدا بووە و ئیسمیر دیاکۆف دیویەتی، دوایینجار کە دیتی کەنگیٚ بوو؟ ئەگەر ئەربابەکەی ئەو پاکەتەی لەژێربالٚنجەکەی دەرهێنابیٚ و بیٚئەوەی ئەو ئاگادار بکا، خستوویەتەوە نێو سندووقی پارەکانی چی؟ سەرنجبدەن بەپێی گێڕانەوەی ئیسمیر دیاکۆف، پارەکەی ناوەتە ژێربالٚنجەکەی؛ ڕەنگە تۆمەتبار

لەژێربالنجەکە دەریهێنابێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەتانی و باڵنج و دۆشکی سەر چرپاکە دەستی لێنەدرابوو. ئەو مەوزووعەش لە شایەدنامەکەدا تۆمار کراوە. تۆمەتبار بە بێئەوەی جێوبانەکەی تێکدابێ، پارەکەی چۆن دۆزیوەتەوە؟ ئەی چۆن بەوچەنگ و پلە خوێناوییەوە مەلافەی سپی و خاوێنی سەرچرپاکە هەروا خاوێنە و پەڵەی خوێنی پێوەنییە؟ بەڵام دەڵێن پاکاتەکە بۆ لەچەقی ژوورەکەدا کەوتووە؟ بەڵێ، واچاکە چەند وشەش لەوبارەوە بدوێین. تارادەیەک تووشی سەرسوورمان بووم کە بیستم دادوەری لێزان و خاوەن مرخ جەنابی ئیپۆلیت کیریلۆویچ، کاتێک هەوڵیدەدا تۆمەتبارکردنی ئیسمیر دیاکۆف بە هیچ نەزانێ و بایەخی پێنەدا، بەئارەزووی خۆی ـ سەرنجبدەن، بەئارەزووی خۆی بڵێ: بەڵام ئەو پاکەتە، هەروەها بۆ لە سەر عەرزەکە فڕێدراوە؟ هیچ عیبادبەشەرێک ئاگاداری ئەو پاکەتە و پارەکەی ناوی نەدەبوو، ئەگەر وابێ تۆمەتبار دزیویەتی. هەربۆیە ئەو کاغەزە دڕاوە بە نووسراوەکەی سەریەوە، هەروەک دادوەر ڕای خۆی لە سەر داوە، تەنیا بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی لە سەر دزی پێداگری بکەن. «ئەگەر وانەبێ هیچکەس لەودزییە و ڕەنگە لەپارەکەش ئاگادار نەبوایە.» بەڵام بەپێی ئەوڕاستییە کە ئەو پاکەتە دڕاوە لەوێ کەوتووە، حەتمەن دەبێ لە سەر ئەوە سووربینەوە کە پارەی تێدا بووە و دزراوە؟ لەگەڵ ئەوەشدا دەنگی نارەزایەتی بەرز دەبێتەوە کە ئیسمیر دیاکۆف پارەی نێوپاکەتەکەی دیوە. بەڵام لەئێوە دەپرسم، دوایین جار کە ئەو پارەیەی دیوە کەنگێ بووە؟ من لەگەڵ ئیسمیر دیاکۆف قسەمکرد، دەیگوت دوو ڕۆژ بەر لە ڕووداوەکە دیویەتی. کەوایە بۆ دەبێ بیر لەوە نەکەینەوە کە فیۆدۆر پاولۆویچی پیر، کە شێتانە چاوەڕوانی هاتنی دڵبەرەکەی بووە و ئارا و قارای لێهەڵگیراوە و دەرگای لە سەر خۆی گاڵەداوە، هەرخۆی پاکەتەکەی هەڵپچڕیبێ و پارەکەی دەرهێنابێ و خۆی پێوە خافڵاندبێ: «ئەو پاکەتە بەکاری چی دێ. باوەڕیش ناکا پارەی تێدایە، بەڵام کاتێک چەکەیەکی پارەی سێهەزار ڕۆبڵی نیشاندەم، زۆر چاکتری شوێن لە سەر دادەنێ و لەخۆشیانا دەمی ئاو دەکا.» هەربۆیە

پاکەتەکە دەدڕێنێ پارەکەی دەردێنێ و پاکەتە دڕاوەکە فڕێدەدا.» بەوپێیە کە دەزانێ خاوەنی ئەوە، بۆ بەجێهێشتنی ئەو بەڵگەیە خۆی شلوێ ناکا.

گوێبگرن برایان، ئەم بۆچوونەش وەک تەواوی بووچوونەکانی دیکە ڕێی تێدەچێ و دەتوانین بەڕاستی بزانین. بە چهۆیەک دەبێ باوەڕمان بەو بۆچوونە نەبێ؟ کەوایە ئەگەر ئەو بۆچوونە ڕاستبێ، تۆمەتی دزی دەبێ هەڵوەشێتەوە و وەلا بنرێ؛ چونکە ئەگەر پارەیەک لەگۆڕێدا نەبووبێ، دزییش نەکراوە. ئەگەر ئەو پاکەتە دڕاوە بکرێتە بەڵگە کە پارەی تێدابووە، بۆ لە سەر پێچەوانەی ئەوە پێداگری نەکەم کە بۆیە ئەو پاکەتە دڕاوە هەروا کەمتەرخەمانە لەوێ فڕێدراوە، پێشتر خاوەنەکەی پارەکەی لێدەرهێناوە؟ بەڵام دەڵێن ئەگەر فیۆدۆر پاولۆویچ خۆی پارەکەی دەرهێناوە، چیی لێ کردووە؟ بۆ کاتێک پۆلیس ماڵەکەیان پشکنی نەیان دۆزییەوە؟ بەڵام بەشێکی پارەکەیان لە مجرییەکی چکۆلەدا دۆزییەوە، بەشەکەی دیکەشی ڕەنگە هەر ئەو ڕۆژە بەیانی عەسری ڕۆژی پێشوو دەریهێنابێ و بە شێوەیەکی دیکە کەڵکی لێوەرگرتبێ؛ ڕەنگە پیلان و ویستەکەشی گوڕیبێ، بێئەوەی بەپێویستی بزانێ ئیسمیر دیاکۆف لەو پاشگەز بوونەوەی ئاگادار بکا. ئەگەر کەمترین گریمانە بۆ ئەو مەسەلەیە لەگۆڕێدا بێ، چۆن دەتوانین ئاوا لێبڕاوانە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ تۆمەتبار بەدزی قەتڵبکەین. ئەوە ئیتر وەک هەقایەت و ئەوسانەی لێدێ. ئەگەر پێداگری لە سەر دزرانی بکەن، دەبێ ئەو شتە نیشانبدەن، یان لانیکەم بیسەلمێنن کە شتێکی وا هەبووە. بەو حاڵەشەوە هیچ کەس چاوی بەوپارەیە نەکەوتووە.

«ماوەیەک لەمەوبەر لە پترزبۆرگ لاوێکی هەژدەساڵانە، کە لە نێو بازاڕدا دەستفرۆشیی دەکرد، بەڕۆژی ڕوون بەتەورێکەوە خۆدەکا بە دووکانێکی سەڕڕافیدا و زۆر نەترسانە کابرای دووکاندار دەکوژێ و هەزاروپێنج سەد ڕۆبڵ هەڵدەگرێ و دەڕوا. پێنج سەعات دوای ڕووداوەکە قۆڵبەست دەکرێ و تەنیا پازدە ڕوبڵی خەرجکردبوو و پاشماوەی پارەکەی هەر لەباخەڵدا بووبوو. کاتێک شاگرد دووکانەکە دوای ڕووداوەکە دەگەڕێتەوە، بەوردی

پۆلیس ئاگادار دەکا و پێیان دەڵێ چەندە پارە دزراوە و چەند گەڵا و چەند کوتە ئاڵتوون بووە. ئەوانیش ڕاست ئەو پارە و ئاڵتوونانە لەگیرفانی تاوانباردا دەدۆزنەوە. تاوانباریش چاری نامێنێ و دان بەتاوانەکەیدا دەنێ. برایانی لێژنەی داوەری بەوە دەڵێن بەڵگە. چونکە ئەوە پارەکە لەبەر چاوە، دەستی لێدەدەی، دەیبژێری و ناتوانی حاشای لێبکەی. ئایا ئەم پەروەندەی ئێستاش وایە؟ بەڵام ئەوەتان لەبیر نەچێ لێرەدا مەرگ و ژیانی مرۆڤێک لەگۆڕێدایە و دەبێ چارەنووسی مەعلووم بکرێ.

«بەڵێ، دەڵێن تۆمەتبار ئەو شەوە خەریکی عەیش و نۆش و هەڵەخەرجی بووە؛ مەعلوومیش بوو کە هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵی پێبووە ـ ئەو پارەیەی لەکوێ هێناوە؟ بەڵام چونکە لە هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵ زیاتری پێنەبووە و هەزاروپێنجسەد ڕۆبڵەکەی‌تری دیار نەبووە. بە لەبەر چاوگرتنی کات، هەر لە لێپرسینەوەی سەرەتاییدا دەرکەوت کە تومەتبار دوای ڕۆیشتن لەلای کڵفەتەکانی گرووشنکا، ڕاست ڕۆیشتووە بۆ ماڵی پێرخۆتین و هیچکوێی دیکە نەچووە. بەو شێوە بۆمان دەردەکەوێ لە هیچ کوێ بەتەنیا نەبووە و ناکرێ بڵێین نیوەی پارەکەی لەشوێنێکی نێوشار شاردۆتەوە. هەر بەوپێیە جەنابی دادوەر پێیوایە میتیا نیوەی سێ‌هەزار ڕۆبڵەکەی لە کەلێن و قوژبنێکی ماکرۆیە حەشار داوە. ئاغایان بۆ نەڵێین لە ڕەش‌چاڵەکانی ئادولفۆدا شاردوویەتەوە؟ بڵێی گومانێکی ئاوا زۆر لەڕاستی بەدووربێ؟ سەرنجبدەن، ئەگەر ئەو گومانە لە نێو بچێ کە پارەکە لە ماکرۆیە نەشاردراوەتەوە، تۆمەتی دزی لەگۆڕێدا نامێنێ، چونکە دیارنییە ئەو هەزاروپێنجسەد ڕۆبڵە چیی بەسەرهاتووە. بە چ مۆجزەیەک وندا بووە و چۆن دەسەلمێندرێ کە زیندانی بۆ شوێنێکی دیکە نەچووە؟ ئێمەش دەمانهەوێ بەخەیاڵ و بۆچوونێکی هەقایەت‌ئاسایی ژیانی مرۆڤێک لە نێو بەرین!

---

١١- ڕۆمانێکی گۆتیک ئان‌ڕادکلیف، بەناوی ئەسراری ئادۆلفۆ کە ئەو کاتە لە ڕووسیا بەناوبانگ بووە.

«دەڵێن زیندانی نەیتوانیوە ڕوونی بکاتەوە کە ئەو هەزاروپێنجسەد ڕۆبڵەی لەکوێ هێناوە و هەمووش دەزانن کە پێش ئەو شەوە کۆپکێکی پارە پێنەبووە. بەڵام بفەرموون کێ دەیزانی؟ تۆمەتبار زۆر ڕاشکاوانە و بەڕوونی گوتی پارەکەی چۆن وەدەستهێناوە. ئاغایان ئەگەر لەوبارەوە بیروڕای من دەپرسن، دەڵێم کە ڕوونکردنەوەی تۆمەتبار ڕاستە و وێناچێ درۆ بکا، قسەکانیشی لەگەڵ خووخدەی بەتەواوی یەکدەگرێتەوە. جەنابی دادوەر لە نێو تەلیسمی ئەوسانەکەی خۆیدا گیری خواردووە. دەڵێ: پیاوێکی بێئیرادەیە، خۆی ڕازیکردووە بڕێک پارە لە دەزگیرانەکەی وەرگرێ، ئەویش ئاوا بەسووکایەتییەوە پێیدا. ناکرێ نیوەی پارەکەی لە توورەکەیەک نابێ و زارکەکەی دووریبێ و لەملی کردبێ، چونکە ئەگەر ئەو کارەشی کردبێ هەر دوو ڕۆژ بووە. دوای دوو ڕۆژ هەڵیپچڕیوە و گەڵایەکی سەد ڕۆبڵی لێدەرهێناوە، بەمشێوەیە هەموو پارەکەی لە مانگێکدا خەرجکردووە. لە بیرتانە تەواوی ئەو وتانەی بە لەبزیکی ئاوا دەربڕی و هیچجۆرە دژایەتییەکی پێکنەهێنا. بەڵام ئەو مەسەلەیە بە شێوەیەکی دیکە ڕووی دابێ چی؟ ئەگەر ئەوسانەیەکیتر ڕێکبخەن، ئەویش سەبارەت بە کەسێکیتر چی؟ ڕاستوایە، خۆتان کەسێکی دیکەتان داتاشیوە.

«ڕەنگە بڵێن شایەدەکان گوتوویانە ئەو بەڕۆژێک تەواوی ئەو سێهەزار ڕۆبڵەی خەرجکردووە کە خاتوو وێرخۆفتیسۆف مانگێک بەرلەڕووداوەکە پێی داوە، بەوپێیە نەیتوانیوە ئەو پارەیە بکا بە دوو بەشەوە. بەڵام ئەو شایەدانە کێن؟ دادگا بایەخی شایەدییەکانی لەبەر چاو گرتووە؟ لەگەڵ ئەوەشدا پارەی کەم بە دەست کەسێکی دیکەوە زۆر دەنوێنێ، هیچکام لە شایەدەکانیش پارەکەیان نەبژاردووە، بەڵکو هەموو ڕواڵەتی پارەکەیان قەرساندووە. ماکسیمۆف شایەدیی دەدا کە تۆمەتبار بیستهەزار ڕۆبڵی بە دەستەوە بووە. برایانی لیژنەی داوەری، دیوتانە ڕەوانناسی شمشێری دوودەمە. واچاکە ئێستا ئەو شمشێرە وەرگێڕم، با بزانین بە چ ئاکامێک دەگەین.

«مانگێک بەرلەڕووداوەکە، خاتوو کاترینا ئیوانا سیٚ‌هەزار ڕۆبڵی داوە بە زیندانی تاکو بەڕێی پۆستە بۆی بنێریٚ بۆ مۆسکۆ. بەڵام پرسیار لێرەدایە: ئایا ڕاستە کە ئەو پارەیە بە شێوەیەکی ئاوا پڕسووکایەتی ـ بەوتەی دادوەر ـ پێیدراوە؟ یەکەم ڕوونکردنەوەی خاتوو وێرخۆفتیسۆف لە سەر ئەو مەسەلەیە جیاواز بوو، تەواو جیاواز. لە ڕوونکردنەوەی دووهەمدا تەنیا گوێمان لە هاتوهاواری پڕ لە ڕق و بێزاری بوو، بێزارییەک کە دیاربوو لەمێژە لەدڵیدا پەنگی خواردۆتەوە. هەروەها ئەوڕاستییەش کە شایەد لەیەکەم شایەدیی خۆیدا ڕاست نەڕۆیشتووە، کەوایە هەقمانە بەوئاکامە بگەین کە شایەدیی دووهەمیش بەپێچەوانەی ڕاستی بووە. دادوەر خۆی لەقەرەی ئەو باسە نادا، (خۆی گوتەنی) ناوێریٚ خۆ لەقەرەی بدا. منیش ناچمە سەر ئەوە، بەڵام با شتێکتان عەرز بکەم، ئەگەر کەسێکی ماقووڵ و ئادابزان، کە خاتوو کاترینا ئیوانا زۆر بەڕێزە و بێگومان کەسێکی وایە، ئەگەر ئەو کەسە لە دادگا کتوپڕ ئیزن بە خۆی بدا کە لەشایەدییەکەی یەکەمی پاشگەز بێتەوە ـ ئەویش بەو قەستەی تۆمەتبار لە نێو بەریٚ ـ دیارە شایەدییەکی ئەوتۆ ناتوانیٚ بیٚ‌غەرەزانە بیٚ. ئایا هەقی ئەوەمان نییە پێمانوابیٚ ژنێکی تۆڵەخواز لەوانەیە لەقسەکانیدا زێدەڕەویی کردبیٚ؟ بەڵیٚ زۆریش وێدەچیٚ، بەتایبەت ئەو کاتەی سەبارەت بە سووکایەتی و شکاندنی کەسایەتیی تۆمەتبار زێدەڕەویی کرد و گوتی ویستوویە بەپێدانی ئەو پارەیە سووکی بکا. نا، ئەو پارەیەی بە شێوەیەک پێدا کە وەرگرتنەکەی ئابڕوو چوون و سووکایەتیی بەدواوە نەبووە. بەتایبەت بۆ مرۆڤێکی کەمتەرخەمی وەک دیمیتری فیۆدۆرۆویچ. لە هەمووشی گرینگتر، تۆمەتبار بەهیوابوو زۆر زوو ئەو سیٚ‌هەزار ڕۆبڵە لە باوکی وەرگریٚ کە پێی قەرزداربوو. ئەوەش سەرسارديی ئەو دەگەیێنیٚ. بەڵام هەر ئەو سەردسارديیەی بووە هۆی ئەوەی تائەو ڕادەیە دڵنیابیٚ کە باوکی قەرزەکەی دەداتەوە، یان دەیگەیێنێتە دەستی، هەربۆیە دەتوانیٚ پارەیەک کە خاتوو کاترینا ئیوانا پێی‌سپاردبوو، بە ئاگاتای خوشکی بگەیێنیٚ و لەژێر منەتی بێتە دەریٚ.

«بەڵام دادوەر نایهەوێ قەبووڵیبکا کە تۆمەتبار هەر ئەو ڕۆژە نیوەی پارەکەی وەلاخستووە و لەتوورەکەیەکی چکۆلەی ناوە. دەڵێ، خووخدەی ئەو وانییە، هەر ناشبێ هەستێکی وای ببێ. لەگەڵ ئەوانەشدا خۆی باسی خدە و سروشتی بەربڵاوی کارامازۆفی دەکرد؛ سەبارەت بە دوو پاژی زێدەڕەوی و کەمتەرخەمی ـ کە کارامازۆف دەتوانێ لە یەک کاتدا بیر لە هەردوو لا بکاتەوە ـ دەدوا. کارامازۆف خاوەنی ئەو سروشتە دوولایەنەیە و بە شێوەیەک لەنێوان دوو بێسنووریدا خەریکی کەوتن و هەستانەوەیە، کە تەنانەت کاتێک بەهێزترین تاسە بۆ کەیف و نەهەنگ گیانی دادگرێ، ئەگەر لەلایەکی دیکەوە شتێک بەزەینیدا بێ، دەتوانێ دان بە خۆیدا بگرێ. لەلایەکیتریشەوە ئەوین، ئەو ئەوینەی کە لەدڵیدا بڵێسەی ساندبوو و لەبەر خاتری ئەو ئەشقە پێویستی بە پارە بوو؛ ئاخ، بۆ مەوزووعێکی زۆر گرینگتر لە کەیف و ڕابورادن لەگەڵ گراوەکەی.ئەگەر گراوەکەی پێیبگوتایە: «من تەنیا تۆم دەوێ، فیۆدۆر پاولۆویچ بە هیچ نازانم،» ئەو کاتە دەبوو پارەی بە دەستەوە بێ و بتوانێ لەگەڵ خۆی ببیا. ئەمەش زۆر گرینگترە لە کەیف و ڕابواردن. ئایا کارامازۆفێک ناتوانێ لەوە بگا؟ ئەم دڵەخورپەیەش ڕاست ئەو شتە بوو کە تووشی بووبوو ـ وەلاخستن و شاردنەوەی ئەو پارەیە بۆ ڕۆژی تەنگانە بۆ دەبێ نائاسایی بێ؟

«زەمان ڕابرد و فیۆدۆر پاولۆویچ ئەو سێهەزار ڕۆبڵەی بە کوڕەکەی نەدا؛ بەپێچەوانە، بەگوێی گەیشتەوە کە باوکی دەیهەوێ لەوگوژمە پارەیە بۆ فریودانی گراوەکەی ئەو کەڵک وەرگرێ. لەدڵی خۆیدا گوتی: «ئەگەر فیۆدۆر پاولۆویچ ئەو پارەیەم نەداتێ، لەبەر چاوی کاترینا ئیوانا سووکدەبم و بە دز دەردەچم.» ئەو کاتە بە دالغەیدا هات بچێ بۆلای خاتوو وێرخۆفتیسۆف و ئەو هەزاروپێنجسەد ڕۆبڵەی بەملیدا هەڵیواسیبوو، لەبەردەمی داینێ و بڵێ: «من هیچوپووچ و خوێڕیم، بەڵام دز نیم.» کەوایە لێرەدا بەڵگەیەکی دوولایەنەمان بە دەستەوەیە کە بۆ وەک چاوی خۆی ئاگادارییی لەو پارەیە کردووە؟ بۆ ئەوتوورەکە چکۆلەی نەدڕاندووە و هەرجارێ گەلایەکی سەد ڕۆبڵیی

لێدەرهێنێ؟ بۆ دەبێ حاشا لەهەستی شەڕەف و ویژدان بکەین لەناخی تۆمەتباردا؟ بەڵێ ئەو ویژدان و شەڕەفی هەیە، بەڵام دەزانین جێگۆڕکێی پێکراوە. ئەوەش دەزانین کە زۆر جار هەڵە ڕوودەدا. سەرەڕای ئەوەش هەیەتی و دەگاتە سنووری ئەشق و شەیدابوون؛ ئەوەشی سەلماندووە.

«بەڵام ئێستا مەوزووعەکە پێچەڵاوپووچتر دەبێ؛ ئازاری ئێرەییبردنەکەی لەڕادەبەدەر دەبێ و ئەو دووپرسیارە مێشکی پڕتاویاوی زیاتر و زیاتر ئازار دەدا: «ئەگەر پارەکەی کاترینا ئیوانا بدەمەوە، چۆن دەتوانم گرووشنکا هەڵگرم و بڕۆم؟» ئەگەر لە ماوەی ئەو مانگەدا بە شێوەیەکی وەحشیانە هەڵسوکەوتی دەکرد، مەشرووبی دەخواردەوە و لەمەیخانە کێشە و هەرای سازدەکرد، ڕەنگە هۆی ئەوە بووبێ لەناخەوە ئارا و قارای لێهەڵگیراوە و خۆی بە داماو وبێدەرتان زانیوە و ئازار ڕۆحی هەڵچوقاندووە. ئەم دووپرسیارە وا لەدەروونیدا ڕەگاژۆ دەکا، ئاخری بەرەوچاڵی هیوابڕاوی ڕایدەکێشێ. دواییینجار براچکۆلەکەی نارد بۆ ماڵی باوکی بۆئەوەی ئەو سێهەزار ڕۆبڵەی بۆ وەرگرێ، بەڵام بێئەوەی چاوەڕێی وەڵام بێ، خۆی کرد بە ماڵی باوکیدا و لەبەر چاوی چەند شایەد پیرەپیاوی کوتا. دوای ئەوەی بێهومێد بوو. بۆی دەرکەوت کە ناتوانێ ئەو بڕەپارەیە لە هیچکەس وەرگرێ؛ دوای ئەو لێدانە دەیزانی باوکی ئەو پارەیەی ناداتێ. هەر ئەو ئێوارەیە لەسینگی خۆیدا، لەو شوێنەی سینگی کە توورەکەی پارەکەی پێوەبوو، سوێندیشی بۆ براکەی خوارد کە هۆکاری بە خوێڕی دەرنەچوونی لە ئیختیاردایە، بەڵام هەروا خوێڕی و هیچوپووچ دەمێنێتەوە، چونکە پێشبینی دەکرد کەڵک لەو کەرەسەیە وەرناگرێ، توانایی ئەو کارەشی نییە و لەگەڵ خووخدەی ئەو یەکناگرێتەوە. بۆ، بۆ جەنابی دادوەر بڕوا بە ئالکسی کارامازۆف ناکا، کە ئاوا ڕاست و سادقانە و ئاوا دڵنیاکارانە شایەدیی دا؟ بۆ ناچارم دەکا، باوەڕ بەپارەی حەشاردراو لە کەلێن و قوژبنی ڕەشچاڵەکانی کۆشکی ئادۆلفۆدا بکەم؟

«هەر ئەو ئێوارەیە، دوای وتوویژ لەگەڵ براکەی، تۆمەتبار ئەو نامە نەخسەی نووسی. هەر ئەو نامەیەش بۆتە بەڵگەیەکی زۆر گەورە و

سەرسووڕهێنەر کە تۆمەتبار دزیی کردووە! «دەستی داوا بۆ لای هەموو کەس درێژ دەکەم و ئەگەر ئەو گوژمە پارەیەم وەدەستنەکەوێ، هەر لەگەڵ ڕۆیشتنی ئیوان باوکم دەکوژم و ئەو پاکەتە لە ژێر باڵنجەکەی دەردێنم کە بە بزگوڕێکی پەمەیی بەستراوە.» بە ئێمەیان گرتووە کە ئەوە سیناریۆی بێکەموکووڕیی قەتڵەکەیە، کەوایە کار کاری ئەو بووە. دادوەر نەڕاندی: «هەموو شتێکی بەو شێوەیە ئەنجامدا کە نووسیبووی.»

«بەڵام بەرلە هەموو شتێک، دەبێ بڵێم ئەو نامەیە نامەی مرۆڤێکی سەرخۆشە و بەوپەڕی تووڕەییەوە نووسیویەتی؛ لەلایەکیتریشەوە سەبارەت بەوپاکەتە دەبێ بڵێم بەپێی قسەکانی ئیسمیر دیاکۆف نووسیویەتی. چونکە خۆی ئەو پاکەتەی نەدیوە؛ هەروەها ڕاستە نامەکەی نووسیوە، بەڵام چۆنی دەسەلمێنن کە کارێکی وایکردووە؟ ئایا زیندانی ئەو پاکەتەی لەژێرباڵنجەکە دەرهێنا؟ بڵێی پارەکەی دۆزیبێتەوە؟ بڵێی بەڕاستی پارەیەکی وا بووبێ؟ بڵێی بۆ وەدەستهێنانی ئەو پارەیە ـ ئەگەر لەبیرتان بێ ـ ئاوا بە تووڕەیی خۆی کردبێ بە ماڵی باوکیدا؟ بۆ دزی نەدەچوو بۆ ئەوێ، بەڵکو بۆ دۆزینەوەی مەوزووعێک، دەیویست بزانێ ژنێک کە ئارا و قارای لێهەڵگرتبوو، لەکوێیە. هێرشی نەدەبرد بۆ ماڵی باوکی کە سیناریۆکەی بەڕێوە بەرێ، بۆئەوەی نووسراوەکەی بە ئەنجامبگەیەنێ، یانی نەک بۆ دزییەک کە پێشتر بیری لێکردبێتەوە، بەڵکو بە شێوەیەکی کتوپڕ، لەبەر ڕق و ئێرەیی هێرشی برد. بەڵێ! دەڵێن: بەڵام کاتێک گەیشتە ئەوێ و فیۆدۆر پاولۆویچی کوشت، پارەکەشی دزی. بەڵام ئاخری باوکی خۆی کوشت یان نا؟ من تۆمەتی دزی بەتوندی ڕەتدەکەمە. ئەگەر چۆنییەتیی دزییەکە دەرنەکەوێ و تێگەیشتنی مەحاڵ بێ، ناتوانی لەخۆڕا کەسێک بەتاوانی دزیکردن تۆمەتبار بکەی: ئەوە ڕێسایەکی گشتییە. بەڵام ئایا بێئەوەی دزی بکا کوشتی، ئاخری کوشتی یان نا؟ ئەوە سەلمێندراوە؟ بڵێی ئەمە هەقایەتێکی هەڵبەستراو نەبێ؟

(١٢)

## قەتڵیش لەگۆڕێدا نەبوو

«برایانی لیژنەی داوەری، ئیزن دەخوازم وەبیرتان بێنمەوە کە ژیانی مرۆڤێک لەمەترسیدایە و ئێوە دەبێ زۆر وردبین بن. بیستوومانە دادوەر خۆشی تەسیقی کردووە کە لە پێشدا ئاگادارانە بیر لەو تاوانە کرابێتەوە و هەتا ئەمڕۆش هەر سەبارەت بەو مەسەلەیە و تاوانی تۆمەتبار دڕدۆنگ بووە. هەتا ئەو کاتەی نامە دێزەکە ڕادەستی دادگا کرا، هەروا دڕدۆنگ بوو. «هەموو شتێک بەوپێیەی نووسراوە، بەڕێوە چووە.» بەڵام دیسان دووپاتی دەکەمەوە، تۆمەتبار بۆ ئەوە خۆی کرد بەماڵی باوکیدا، دەیویست گراوەکەی بدۆزێتەوە و خەمی ئەوەی بوو چووبێتە ژوانی باوکی. ئەوڕاستییەش حاشای لێناکرێ. ئەگەر ئەو لەماڵەکەی خۆی بوایە، تۆمەتبار بۆ هیچ کوێیەکیتر نەدەچوو و لە لای ئەو دەمایەوە و بەو شێوەیە ئەو کارەی بەڕێوە نەدەبرد کە لە نامەکەدا نووسیبووی. شێوەی هەڵاتنەکەشی چاوەڕوان نەکراو و بەهەڵکەوت بووە، هەتا ئەو کاتە زۆر وێدەچێ ئەو نامەیەشی هەر لەبیر نەمابێ کە بە مەستی نووسیبووی. دەڵێن: «ئەودەسکاونگەی هەڵگرت.» لە بیریشتانە بناغەی دنیایەک ڕەوانناسی لەدەوری ئەو دەسکاونگە داڕێژرا - بۆ تۆمەتبار ناچار بوو بەچاوی چەکێک بڕوانێتە ئەو دەسکاونگە و هەڵیگرێ؟ لێرەدا بیرۆکەیەکی زۆر کەمبایەخ بەزەینم گەیشت: ئەگەر ئەو دەسکاونگە لەبەر چاو نەبوایە، ئەگەر لە سەر مێزەکە دانەندرایە و لە نێو دۆڵابەکەدا بووایە، ئەو ڕووداوە دەقەوما؟ ئەگەر وا بوایە تۆمەتبار چاوی پێی نەدەکەوت و بە دەستی بەتاڵ و بەبێ چەک لەوێ دەڕۆیشت و دڵنیام کەسی

نەدەکوشت. کەوایە چۆن دەتوانین دەسکاونگێک بکەینە هۆ بۆ چەکدار بوونی تۆمەتبار و پێمان وابێ قەستی پێشووی بووە؟

«بەڵێ، بەڵام لە مەیخانەکانیشدا باسی کوشتنی باوکی دەکرد و دوو ڕۆژ بەرلەوە، ئەو شەوەی نامەکەی نووسی، زۆر ئارام و لەسەرخۆ بوو و لە نێو مەیخانەکەدا تەنیا لەگەڵ دووکانداریک شەڕیکرد، چونکە «کارامازۆف باکی لەشەڕ و قرە نەبوو»! بەڵام وەڵامی من ئەوەیە کە ئەگەر بەپێی نامەکە پیلانی قەتڵێکی ئاوای داڕشتبێ، لێمڕوونە لەگەڵ دووکانداریکیش بەشەڕ نەدەهات، یان وێدەچێ سەری بەمەیخانەدا نەکردبایە، چونکە کەسێک کە پیلانی جینایەتێکی ئاوا داڕێژێ، بەشوێن هێمنایەتی و تەنیاییدا دەگەڕێ، بۆئەوەی خۆی لەنێو بەرێ، لە بیستەران و بینەران پارێز بکا، بۆئەوەی لەبیران بچێتەوە، ئەویش نەک ئەوەی پێشتر حیسابی بۆ کردبێ، بەڵکو لەڕووی غەریزەوە. برایانی لێژنەی داوەری، ڕەوشتی ڕەوانناسی شمشێری دوودەمە و ئێمەش دەتوانین کەڵکی لێوەرگرین. بەڵام باسی کێشە و هەرای مەیخانەکان لە ماوەی ئەو مانگەدا، مەگین تائێستا کەممان بیستووە منداڵان، یان پیاوانی سەرخۆش لە مەیخانە دێنە دەرێ و دەگوڕێنن: «دەتکوژم»؟ ئەگەرچی ئەو شاتوشووتەش دەکەن بەڵام هیچکەس ناکوژن. بەڵام ئەو نامە دێزە، پێتان وانییە ئەوەش ڕق و هەڵچوونێکی مەستانەیە؟ ئەوەش هاواری کەڵەشیری لاری نییە لەدەرەوەی مەیخانە: «دەتکوژم، هەمووتان دەکوژم.» هەرئەوەیە. بۆدەبێ وانەبێ؟ چ هۆیەکی هەیە ئەگەر ئەو نامەیە بە جێی قسەی هەڵیتوپڵیت، «نەخس»ی پێبڵێین؟ بەوهۆیەی کە باوکی کوژراوە، بەوهۆیەی شایەدێک تۆمەتباری دیوە چەکی بە دەستەوە بووە و بەنێوباخەکەدا هەڵاتووە و بە دەستی ئەو دراوە بە زەویدا و سەروچاوی شەڵاڵی خوێن بووە: کەوایە هەموو شتێک هەر ئەو جۆرەی لەنامەکەدا پیلانی بۆ داڕێژرابوو بەڕێوە چوو، ئەو نامەیەش «وڕێنە» نەبوو، بەڵکو «نەخس» بوو.

«ئێستا شوکر بۆخودا، گەیشتووینەتە خاڵی ڕاستەقینە: «بەوەدا کە لەنیوباخەکەدا بوو، حەتمەن باوکی خۆی کوشتووە.» تەواوی ڕێگاکان بۆ

خوازیاری سزا لەم چەند وشەیەدا حەشار دراوە: «بەوەدا کە... بوو، کەوایە حەتمەن.» ئەگەریش «حەتمەن» لەئارادا نەبووایە، تەنانەت ئەگەر ئەو لەوێش بووبێ؟ چی؟ ئاخ، تەسیقی دەکەم کە زەنجیرەی ڕوون کردنەوەکان ـ دەقاودەق ـی قسەکان پیشاندەری شتێکە. بەڵام تەواوی ئەوڕاستییانە با بەجیاجیا و بێئەوەی چاو لەپێوەندیی نیوانیان بکەین، پێیاندا بچینەوە. بۆوێنە، مەقامی دادوەری بۆ باوەڕ بە قسەکانی تۆمەتبار ناکەن، کە دەڵێ لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەی باوکی بووە و هەڵاتووە؟ لەبزی توانجئامێزی دادوەر سەبارەت بە هەستی پڕلە ڕێز و «ئایینی» کە لە ناکاو تۆمەتبار لەدڵیدا هەڵسوکەوتەکەی بەئەدەبانە بێ، وەبیر بێننەوە. بەڵام ئەگەر شتێکی لەوچەشنە ـ ئەگەر نەڵێین حورمەتی باوکایەتی، بەڵکو ناوی بنێین هەستی خۆفی ئایینی ـ لەگۆڕێدا بووبێ چی؟ کاتی لێپرسینەوەی سەرەتایی تۆمەتبار ڕاست ئەو قسانەی کردووە: «لەو کاتەدا حەتمەن دایکم دوعای بۆ کردووم.» بەم شێوەیە هەرکە دڵنیا دەبێ خاتوو ئیسۆتیلۆف لەلای باوکی نییە، بە هەشتاو ڕادەکا. جەنابی دادوەر نارەزایەتی دەردەبڕێ: «بەڵام کوا بەتەماشاکردن لەپەنجەرەوە بۆی مەعلووم دەبێ؟» بۆ بۆی مەعلووم نابێ؟ بۆ؟ تۆمەتبار هەرکە تەقەی لە پەنجێرەکە هەستاند و عەلامەتەکانی دا، پەنجێرەکە کرایەوە. دەی حەتمەن فیۆدۆر پاولۆویچیش شتێکی گوتووە، قسەیەک کە تۆمەتباری دڵنیا کردووە کە گراوەکەی لەوێ نییە. بۆدەبێ هەموو شتێک ئەو جۆرەی کە دەیهێنینە بەرچاوی خۆمان و بیر لێدەکەینەوە، ئەو جۆرەی کە زەینمان ناچار دەکەین بڕوا بکا، لەبەر چاو بگرین؟ لەوانەیە هەزاران شت لەم دنیایەدا ڕوو بدا کە لەبەر ناسکترین هەست و خەیاڵ ڕادەکا.

بەڵێ، بەڵام گریگۆری دیتی کە دەرگاکە کراوەتەوە و بەوپێیە دەبێ تۆمەتبار حەتمەن لە ژووری بووبێ و کەوایە ئەو کوشتوویەتی. جائێستا سەبارەت بەو درگایە، برایانی لێژنەی داوەری... جوان سەرنجبدەن ئێمە لەمەڕ ئاوەڵابوونی ئەو دەرگایەوە تەنیا شایەدێکمان هەیە، ئەویش لەو کاتەدا نەخۆش و بێهێز بووە و... بەڵام گریمان دەرگاکە ئاوەڵا بووبێ؛ وای دادەنێین تۆمەتبار بۆ

پارێزگاریکردن لە خۆی حاشای لێکردووە، کە لەبارودۆخێکی وادا و بۆ کەسێکی وەک ئەو شتێکی ئاساییە، بڵێین درۆی کردووە؛ گریمان چووبێتە نێوژوورەکەی باوکیشییەوە ـ دەی پاشان چی؟ چۆن دەتوانین بەوئاکامە بگەین، کە چونکە ئەولەوێ بووە، فیۆدۆر پاولۆویچ بە دەستی ئەو کوژراوە؟ لەوانەیە وەک تێسکەی تفەنگ خۆی کردبێ بەژووریدا و هەموو وەتاغەکان گەڕابێ؛ لەوانەیە پاڵی بە باوکییەوە نابێ و لێشیدابێ؛ بەڵام هەرکە بۆی دەرکەوتووە خانمی ئیسۆتیلۆف لەوێنییە، لەخۆشیانا پێی پێوەنابێ و هەڵاتبێ. کە دیارە باوکی نەکوشتووە. ڕەنگە هەر بەو هۆیەوە خۆی لەداوی وەسوەسە ڕزگار کردبێ، چونکە ویژدانی پاک بووە و باوکی نەکشتووە، زۆرخۆشحاڵ بووە. هەستێکی بێوێنە ناخی داگرتووە، هەستی بەزەیی و دڵۆڤانیی بووە و ساتێک دواتر، لەبەر شادی و جەزم بوون گریگۆری داوە بەزەویدا و گەڕاوەتەوە بۆ یارمەتیی.

«دادوەر بەزمانێکی تەڕ لە ماکرۆیە باسی شڵەژانی ڕۆحیی تۆمەتباری بۆکردین: کاتێک ئەشق لەبەردەمی ڕسکا و بەرەو ژیانێکی نوێ بانگیکرد و دەروویەکی نوێی بۆ کردەوە، ئەویش لەکاتێکدا کە بەجارێ هیوابڕاو بووبوو، چونکە تەرمی خوێناوی باوکی بووبووە لەمپەری ڕێگای و لەولای تەرمەکەشەوە سزادان. سەرەڕای ئەوانەش دادوەر ئەشقی پێڕەاو بینی و بە پێی شێوازی خۆی، هاتە سەر باسی مەستییەکەی و تاوانبارێک کە بەرەو شوێنی سزادان و کوشتنەوە ڕاکێش دەکرێ، هەروەها گوتی هەتا شوێنی ترسناکی سزادان ڕێگایەکی دوور و درێژی لەبەرە و... بەڵام دیسان لە جەنابی دادوەر دەپرسم ئایا قارەمانێکی خەیاڵیت نەخوڵقاندووە؟ یانی تۆمەتبار ئەوەندە دڵڕەق و بێبەزەییە کە دوای کوشتنی باوکی بەچنگ و پلی خوێناوییەوە بیر لە ئەشق و وفڕوفێڵ بکاتەوە بۆ دەرباز بوون؟ نا، نا، نا! هەر لەگەڵ بۆی دەرکەوت گراوەکەی خۆشی دەوێ و بانگیکرد بۆلای خۆی و مزگێنیی بەختەوەرییەکی نوێی پێدا، هەر ئەو کاتە، ئەگەر داخی کوشتنی باوکی لە سەر دڵی بووایە، ئەنگێزەی خۆکوشتنی دووبەرانبەر و سێبەرانبەر هەست پێدەکرد. ئاخ، نا، لەبیری نەدەچۆوە دەمانچەکانی لە کوێیە! من تۆمەتبار دەناسم:

پێوەندی دانی ئەو دڵڕەقییە بە میتیاوە، لە لایەن جەنابی دادوەرەوە، لەگەڵ خووخدەی ئەو یەکی نەدەگرتەوە. خۆی دەکوشت، سوڕ دەزانم.، خۆی دەکوشت. ڕاست بەوهۆیەوە بوو کە «دۆعای دایکی نەجاتی دابوو،» ئەو دەستی لە کوشتنی باوکیدا نەبوو، هۆی خەفەت و شڵەژانی ئەو شەوەی لە ماکرۆیە تەنیا گریگۆری بوو، لەبەرخودا دەپاڕایەوە ئەو پیرەپیاوە چاکبێتەوە و زەبرەکەی کاریگەر نەبووبێ، لە چنگ ئەو ئازاری ویژدانە ڕزگاریبێ. بۆدەبێ شرۆڤەی ئەوڕاستییانەمان قەبووڵ نەبێ؟ چ بەڵگەیەکی جێیباوەڕمان بە دەستەوەیە کە باوەڕ بە تۆمەتبار نەکەین؟ بەڵام دیسان دەپرسن: «تەرمی باوکی لەوێیە! ئەگەر نەیکوشتووە و هەڵاتووە، ئەی کێ کوشتی؟»

دووپاتیدەکەمەوە، تەواوی مەنتقی دادوەری هەر لەم خاڵەدایە. جگە لە ئەو کێ کوشتی؟ کێ هەیە بتوانین ئەو تۆمەتەی بدەینە پاڵ؟ هیچکەسی دیکە نییە. برایانی لیژنەی داوەری، ئایا ڕاستی وایە؟ پێتان وایە سەداسەد کاری ئەوە و دەستی هیچ کەسی دیکەی تێدا نییە؟ بیستوومانە کە جەنابی دادوەر ئەو کەسانەی بە قامک بژاردووە کە ئەو شەوە لەماڵەکەدا بوون. ژمارەیان پێنج کەس بوو. قەبووڵمە کە سێ کەسیان ئەو کارەیان لە دەست نەهاتووە - کوژراوەکە و گریگۆریی پیر و ژنەکەی. کەوایە دەمێنێتەوە دووکەس، تۆمەتبار، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ و ئیسمیر دیاکۆف. دادوەر بە لەبزێکی کارتێکەرانە گوتی کە تۆمەتبار ئاماژەی بە ئیسمیر دیاکۆف کردووە، چونکە هیچ کەسی تر نەبووە بتوانێ ئەو تۆمەتەی بداتە پاڵ، کەسێکی شەشەمیش لەماڵەکەدا بوایە، تەنانەت تارمایی کەسی شەشەم، لەڕێوە دەستی لە تۆمەتبار کردنی ئیسمیر دیاکۆف هەڵدەگرت و شکی دەپەڕییە سەر ئەو کەسە. بەڵام، برایانی لیژنەی داوەری، بۆ من پێچەوانەی ئەو مەسەلەیەتان بۆ ڕوون نەکەمەوە؟ دوو کەس گومانیان لە سەرە، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ و ئیسمیر دیاکۆف. من پارێزەری زیندانیم و مافی ئەوەم هەیە بڵێم بۆ تۆمەتباری دەکەن، چونکە بە هیچ شێوەیەک ئیسمیر دیاکۆف تۆمەتبار ناکەن و پاکانەی بۆ دەکەن. ڕاستە تەنیا چوارکەس، زیندانی و دووبراکەی و خانمی ئیسۆتیلۆف ئیسمیر دیاکۆفیان

تۆمەتبار کرد. بەڵام کەسانێکیتریش هەن کە تۆمەت دەدەنە پاڵی: تێگەیشتنی گوماناوی، درڕدۆنگی و ڕاپۆرتی لێڵ و تەمومژاوی لەگۆڕێدا هەیە. هەروەها ئاوێتەیەک لە ڕاستەقینەی زۆر ئاشکرامان بە دەستەوەیە کە، قەبووڵی دەکەم، لێبڕاوانە نین و دەبنە هۆی شک و گومان. ڕاست ئەو ڕۆژەی ڕووداوەکە بۆ شەوێ قەوما، ئەو سەرودڵی لێدێ، کە سەبارەت بە ڕاست بوونی ئەو ئازارە دادوەر بە ئەرکی سەر شانی خۆی زانیوە پارێزگارییەکی پیاوانەی لێبکا. دوای ئەوەش خۆکوشتنی کتوپڕی ئیسمیر دیاکۆف شەوی بەرلەمحاکەمە. پاشان شایەدیی سەرسوورهێنەری ئیوان فیۆدۆرۆویچ لێرە ـ لە دادگا ـ کە بەو قەناعەتە گەیشتبوو تاوانبار ئیسمیر دیاکۆفە، ئەمڕۆ چەکەیەکی پارە ڕادەستی دادگا کرد و بە ئاشکرا ڕایگەیاند کە ئەو قاتڵە. ئاخ، منیش وەک قازییەکان و جەنابی دادوەر لە سەر ئەو باوەڕەم کە ئیوان تووشی یاوی مێشک بووە و ڕوونکردنەوەکەی هەواڵێکی لێبڕاوانەیە تاکو تاوانەکە بخاتە ئەستۆی کەسێکی مردوو، بۆئەوەی براکەی نەجات بدا. بەڵام دیسان ناوی ئیسمیر دیاکۆف هاتۆتەوە گۆڕێ، دیسان دەلیل و هۆی پڕلە ڕاز و نهێنی لە گۆڕێدایە. هیچ شتێکی نائاشکراش نەماوە و ئەگەر بشبێ ئاشکرا هەردەبێ. بەڵام ئێستا ناچینە سەر ئەوە هەڵیدەگرین بۆ دوایی.

«دادگا بڕیاری داوە درێژە بە محاکەمەکە بدا، بەڵام ئیزن دەخوازم چەند وشەیەک سەبارەت بە کەسایەتیی ئیسمیر دیاکۆف بدوێم، کە دادوەر زۆر بە وردی و لێهاتوویی ڕاژەیکرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەی مەتحی لێهاتووییەکەی دەکەم، ناتوانم لەگەڵی هاوڕا بم. قسەم لەگەڵ ئیسمیر دیاکۆف کردووە و دەبێ بڵێم شوێنێکی زۆر جیاوازی لە سەر من دانا. ڕاستە مرۆڤێکی لاواز و بێداروبارە، بەڵام لە بارەی ورە و خووخدەوە تا ئەو ڕادەیەش زەعیف نەبوو کە جەنابی دادوەر باسیکرد. ئەو ترس و لەرزەش کە جەنابی دادوەر ئەوەندەی پێداگری لە سەر دەکرد، من دیاردەیەکم لەو ترسە پێوە نەدی. ئەوەی پێوەم دی ڕەشبینی و درڕدۆنگیی لەڕادە بەدەر بوو، کە لە ژێر دەمامکی سایلۆحی و هۆش و زۆرزانیدا شاردبوویەوە. دادوەر زۆر سەرسارد و سادە بووە کە ئەوی وەک مرۆڤێکی

ناهیر و ئەقڵسووک هاتۆتە بەرچاو. شوێنێک کە لە سەر منی دانا، زۆرباش خاترجەمی کردم: یانی بۆم دەرکەوت زۆر مرۆڤێکی دەخەزدار و ڕقلەزگە، لەڕادە بەدەر بەخیل و ڕکوونی و هەلخوازە، زۆریش چاوبرسی و تامەزرۆی پێگە و مەقامە. زۆرم پرسیار و لێکۆڵینەوە ئەنجامدا: لە بنەچەک و ڕەگەزی خۆی بێزار بوو، زۆریشی پێشوورەیی بوو، هەرکات وەبیری دەهاتەوە کوڕی «لیزاوتای بۆگەنیو»ە، دەکەوتە ددانەچیڕە و بێزی لە خۆی هەڵدەستا. بێحورمەتیی بە گریگۆری و ژنەکەی دەکرد، کە بە ساوایی ئاگادارییان لێکردبوو. ڕووسیای تف و نەحلەت دەکرد و بە ئاواتەوە بوو بچێ بۆ فەڕەنسا و ببێتە فەڕەنسی. هەمیشە دەیگوت ئەو هەلەی بۆ نارەخسێ و پارەیەکی وای بە دەستەوە نییە بۆ ئەو کارە. پێموایە جگە لەخۆکوشتن چارەیەکیتری نەبوو، چونکە زۆر مرۆڤێکی لەخۆڕازی و بەدبین بوو و هیچ کەسی خۆشنەدەویست. پێیوابوو فەرهەنگ و ژیار یانی جلوبەرگی جوان و تازە و کراسی خاوێن و پۆستاڵ و پێڵاوی بۆیەکراو. بەوەدا کە دەیزانی کوڕی ناشەرعیی فیۆدۆر پاولۆویچە (لەو بارەوە بەڵگەمان هەیە)، ڕەنگە بە دیتنی بارودۆخی خۆی و ئەو سێ کوڕەیتری ئەربابەکەی، ڕقی هەستابێ، کە ئەوانە هەموو شتێکیان هەیە و ئەو هیچی نییە و دەبێ خزمەتکاری ئەوانیش بێ. ئەوان هەموو ماف و هەقێکیان بوو، میرات و بەشەماڵیان بوو، ئەویش ئاشپەزێک بوو و هیچیتر. خۆی پێیگوتم یارمەتیی فیۆدۆر پاولۆویچی داوە کاتێ پارەکانی خستۆتە پاکەتەکەوە. چارەنووسی ئەو پارەیە - پارەیەک داهاتووی ئەوی دابیندەکرد - ڕەنگە تووشی ڕق و بێزاری کردبێ. دەمزانی ئەو سێهەزار ڕۆبڵەی دیوە کە هەمووی گەڵای تازە و گوڵلەپشت بوون. (بەئانقەست لەوبارەوە پرسیارم لێکرد.) پێموایە باش نییە پارەی زۆر پیشان مرۆڤی بەئێرەیی و تامەزرۆی پێگە و مەقام بدرێ! یەکەم جاربوو چاوی بەو هەموو پارەیە دەکەوت بە دەستی کەسێکەوە. دیمەنی چەکە ڕۆبڵی گوڵلەپشت لەوانەیە شوێنێکی خراپ، بەڵام بەبێئاکامی لە سەر بیر و خەیاڵی دانابێ.

دادوەری خاوەن مرخ و لێهاتوو، لەڕادەبەدەر وردبینانە، تەواوی دەلیلە ڕازی و ناڕازییەکانی سەبارەت بە مەسەلەی تاوانەکەی ئیسمیر دیاکۆف بۆ

بـەیـانکردین، بـەتایبـەت لیمـانی پرسـی کـە ئیـسمیر دیـاکۆف بـۆ ئـەوخـۆ نەخۆشخستنە چ ئەنگیزەیەکی بووە. بەڵام لەوانەیە خۆی نەخۆش نەخستبێ، بەڵکو بە شێوەیەکی سروشتی فێی لێهاتبێ و هەروا سروشتیش هاتبێتەوە سەرحاڵی ئاسایی و چاک بووبێتەوە، ڕەنگە بە تەواویش چاک نەبووبێتەوە، بەڵکو خەریک بووبێ وەهۆش بێتەوە - هەر ئەو جۆرەی کە بۆ نەخۆشە فێدارەکان دێتە پێشێ.

جەنابی دادوەر دەپرسێ لە چکاتێکدا ئیسمیر دیاکۆف توانیویەتی ئەوتاوانە ئەنجامبدا؟ بەڵام دەستنیشان کردنی ئەو کاتە زۆر سانایە. ڕەنگە هەر ئەو کاتەی کە گریگۆری بەهێز و قەوەتی خۆی هاواریکرد: «باوککوژ!» لەخەو ڕاچەنیبێ (چونکە ئەو تەنیا خەوی لێکەوتبوو - چونکە هەمیشە خەوێکی قورس بەدوای فێلێهاتنەکەدا دێ.) لەو بێدەنگی و تاریکەشەوەدا هاوارێکی وابەرز لەوانەیە ئیسمیر دیاکۆفی لەخەو هەستاندبێ، کە وێدەچێ لەو کاتەدا خەوەکەی زۆر قورس نەبووبێ. ڕەنگە سەعاتێک پێش ئەوەش بە شێوەیەکی سروشتی خەبەری بووبێتەوە. لە پێخەوەکەی دێتەدەرێ و بەدەم خەوەوە بەرەولای هاوارەکە وەڕێ دەکەوێ، بۆئەوەی بۆی دەرکەوێ چباسە. بەهۆی سەرودڵلێهاتنەکەوە هێشتا سەری لەگێژەوە هاتووە. هێشتا بەتەواوی خەو بەرینەداوە، بەڵام هەرکە دەگاتە نێوباخەکە، دەڕوا بۆ بەر پەنجێرە ڕووناکەکە و ئەو هەواڵە ناخۆشە لە ئەربابەکەی دەبیستێ کە ڕەنگە بە دیتنی ئیسمیر دیاکۆف خوشحالیش بووبێ. لەڕێوە زەینی دەکەوێتە کار. ئەربابەکەی بە شڵەژاوی هەموو شتێکی بە وردی بۆ دەگێڕێتەوە، وردە وردە لە زەینە پەرێشانەکەیدا ئەندێشەیەک زەق دەبێتەوە - ئەندێشەیەکی ترسناک، بەڵام خاپێنەر و زۆریش مەنتقی. کوشتنی پیرەپیاو و هەڵگرتنی ئەو سێهەزار ڕۆبڵە و هێنانی بە سەر دیمیتری فیۆدۆرۆویچدا. جگە لە ئەربابی لاو دەکرێ تۆمەت بدەیە پاڵ کێ؟ جگە لە ئەو کێیتر هەیە؟ ئەو لەوێ بووە و بەڵگەی تەواویش لەدەستدایە. بۆی دەردەکەوێ کە هیچکەس گومان لەو ناکا. لەوانەیە تاسە و مگێزی ئەو پارەیە بەسەریدا زاڵبووبێ. هەلەکەشی زۆر لەبارە و چاکی بۆ

هەڵکەوتووە. ئەو ئەنگێزە کتوپڕانە سەرهەڵدەدەن و ئارا و قارای لێ هەڵدەگرن، ئەوەش زیاتر بۆ کەسانێک دێتە پێشێ کە پێشتر بیریان لەو تاوانە نەکردۆتەوە کە دەیانهەوێ ئەنجامیبدەن. وێدەچێ ئیسمیر دیاکۆف چووبێتە ژووری و ئەندێشە و پیلانەکەی یەکلایی کردبێتەوە. بەچی دەبێ کوشتبێتی؟ دەی، ڕەنگە بەردێکی لەنێوباخەکە هەڵگرتبێ و لەگەڵ خۆی بردبێتی. بەڵام بۆچی و بە چئامانجێک؟ دەی دیارە تەماحی ئەو سێهەزار ڕۆبڵە، چونکە ئەو پارەیە دەتوانێ داهاتووی دابینبکا و بە ئاواتەکەی بگەیەنێ، ئاواتی بوونە فەڕەنسی. پێموانییە قسەکانم هەڵە و نابەجێ بن زۆر وێدەچێ ئەو پارەیە هەبووبێ. ڕەنگە تەنیا ئیسمیر دیاکۆف زانیبێتی لە کوێ حەشار دراوە، ئەربابەکەی لە کوێ دابینیکردووە. پارەکەش لە نێو ئەو پاکەتە دڕاوەدا بووە.

«تاوێک لەمەوبەر دادوەر لەڕوون کردنەوەی قسەکانیدا زۆر بەوردی گوتی تەنیا دزێکی بێئەزموونی وەک کارامازۆف پاکەت لە سەر زەوی فڕێدەدا و کەسێکی وەک ئیسمیر دیاکۆف وەک بەڵگەیەکی تاوان بەجێی ناهێڵێ، لەگەڵ ئەوەی گوێم بۆ شلکردبوو، بۆم دەرکەوت کە مەبەستێکی زۆر ئاشنایە دەیبیستم و بڕوام پێ بکەن، ڕاست ئەو بەڵگە هێنانەوەیە، ڕاست ئەو بۆچوونە، کە کارامازۆف چۆن هەڵسوکەوت دەکا، دوو ڕۆژ لەمەوبەر لە ئیسمیر دیاکۆفم بیست. هەر ئەو کاتە قسەکانی سەرنجی ڕاکێشام. بیرم کردەوە کە سایلۆحییەکەی ساختەیە و دڵاودڵی دەکرد و دەیویست ئەو ئەندێشەیەم بەجۆرێک بخاتە دڵ و زەینەوە کە پێموابێ بیرۆکەی خۆمە. بە وتەیەکی‌تر، دەیویست پێمی تەڵقین بکا. ئایا هەر ئەم ئەندێشەیەی بە چێرۆک تەڵقین نەکرد؟ ئەو ئەندێشەیەی بە چێرۆکێکی زۆر بەمرخ و بەرهەڤیش نەخستە دڵمانەوە؟

«دەپرسن: کەوایە ئەو پیرێژنە، ژنەکەی گریگۆری چی؟ ئەو شەوە بەردەوام گوێی لەناڵە و وڕێنەی ئەو پیاوە نەخۆش و فێدارە بووە. بەڵێ گوێی لەناڵە بووە، بەڵام شایەدییەکی ئەوتۆ ڕێزەیەک جێی باوەڕ نییە. ژنێکم دەناسی سکاڵای دەکرد کە سەگێک شەوێ تابەیانی لە حەوشەکەیان دەوەڕێ و نایەڵێ خەو بچێتە چاوی. بەڵام دەرکەوت ئەو گەماڵە بەستەزمانە تەنیا دووسێ جار

وەڕیبوو. ئەوەش سروشتییە. ئەگەر کەسێک لەخەودابێ و ناڵەیەک ببیستێ، ڕادەچەنێ، بەوڕاچەنینەش، ناڕەحەت دەبێ، بەڵام دیسان خەوی لێدەکەوێتەوە. دووسەعات دواتر دیسان ناڵەیەک دەبیستێ، ڕادەپەڕێ و دیسان خەوی لێدەکەوێتەوە؛ دوای دووسەعاتیتر دیسان بیستنی ناڵەکە و ڕاچەنین و خەوتنەوە ـ لەسەریەک سێجار. بەیانیی ڕۆژی دوایی ئەو کەسە دەستدەکا بە سکاڵا کە شەوگاری ئەو شەوە کەسێک ناڵاندوویە و نەیهێشتووە خەو بچێتە چاوی. دەبێ هەرپێشیوابێ: چونکە مەودای دووسەعاتە خەوەکەی لەبیر نامێنێ، بەڵکو تەنیا ڕاچەنینەکەی لەبیر دەمێنێ، هەر بۆیە وا هەستدەکا کە ئەو شەو خەوی لێنەکەوتووە.

«دادوەر دەپرسێ: بەڵام بۆ، بۆ ئیسمیر دیاکۆف لەدواینن نامەکەیدا دانی بەو تاوانەیدا نەناوە؟ «بۆ ویژدانی هانیدا هەنگاوی یەکەم هەڵێنێتەوە، بەڵام هەنگاوی دووهەم هەڵنەهێنێتەوە؟» بەڵام ویژدان تۆبە دەگەیەنێ و خۆکوژ لەوانەیە هەستی بە تۆبە نەکردبێ و تەنیا هەستی بە ناهومێدی کردبێ. تۆبە و ناهومێدی دوو شتی لێک جیاوازن. کەسێک کە هیوابڕاوە لەوانەیە ناسازگار و تۆڵەئەستێن بێ و خۆکوژ، دەستبداتە خۆکوشتن، لەوانەیە دەرهەق بەوکەسانەی کە لە ماوەی تەمەنیدا ئێرەیی پێبردوون، هەست بە ڕق وبێزارییەکی زیاتر بکا.

«برایانی لێژنەی داوەری، خۆ لەحوکمی ناهەق ببوێرن! تا ئێستا ئەوەی عەرزم کردوون، کامەی هەڵە و نائاسایی بووە؟ خەتایەک لە بەڵگەکانمدا بدۆزنەوە، لەکوێدا پێم خوار داناوە و لە ڕاستی و یاسام لاداوە. ئەگەر بەڵگە هێنانەوەکانم ڕێژەیەکی شیمانە لێدەکرێ، مەحکوومی مەکەن. سوێند بەتەواوی پاکی و پیرۆزییەکانی دنیا، ئیمانم بە تەواوی ئەو ڕاڤە و لێکۆڵینەوانە هەیە کە لەمەڕ ئەو ڕووداوەوە بە دەستمەوە داوە. ئەوەی بۆتە هۆی تووڕەیی و شڵەژانم ئەوەیە کە لە نێو ئەو هەموو بەڵگانەدا کە جەنابی دادوەر بەزەرەدی تۆمەتبار داوییە بە دەستەوە، تەنانەت یەکدانەیان ئاشکرا و حاشا هەڵنەگر نییە. لەگەڵ ئەوانەشدا تۆمەتباری چارەڕەش ئەو هەموو بەڵگەیە لەنێوی دەبا.

ئەرێ، زۆر بوونی بەڵگەی تاوان سەرسوڕهێنەرە: خوێن، خوێنێک کە لەقامکی دەچۆڕێ، کراسی شەلاڵی خوێن، شەوێکی تاریک کە هاواری «باوککوژ» لەدڵیدا دەنگیدایەوە و پیرەپیاوێکی کوڵوڵ بە سەری شکاوەوە کەوتووە بە زەویدا. دوای ئەوەش ئەو هەموو ڕوونکردنەوە و قسە و ئاماژە و هاوارانە! ئاخ! ئەمەش کارتێکەرییەکی سەختی لێدەکەوێتەوە و دەتوانێ زەین تووشی دەمارگرژی بکا؛ بەڵام برایانی لیژنەی داوەری، بڵێی بتوانێ زەینی ئێوەش تووشی دەمارگرژی بکات؟ لەبیرتان بێ کە تواناییەکی تەواوتان پێدراوە، توانایی پێونددان و هەڵپساندن. بەهەر چەندە توانایی زۆرتر بێ، بەرپرسایەتیش بەو ڕادەیە دژوار دەبێ. تەنانەت هەنگاوێک لەوەی گوتوومە پاشگەز نابمەوە. بەڵام وایدانێن بۆ ساتێک لەگەڵ مەقامی دادوەری دەبمە هاودڵ و هاوڕاز، پارێزگاری کەسێکیشم کە دەستی بەخوێنی باوکی سوور بووە. دووپاتی دەکەمەوە، ئەوە تەنیا شیمانەیەکە و بەس؛ تەنانەت ڕێژەیەکیش گومانم لە بێتاوانیی ئەو نییە. بەڵام گرینگ نییە، وای دادەنێین کە تۆمەتبار مەحکووم بە تاوانی باوککوژییە. تەنانەت ئەگەر واشبێ، تکاتان لێدەکەم گوێم بۆ ڕاگرن. لەدڵم دایە شتێکی‌ترتان پێبڵێم، چونکە هەستدەکەم کێشەیەکی گەورە لەدڵ و دالْغەتان دایە. برایان، ببوورن کە ئاماژە بە دڵ و زەینتان دەکەم، بەڵام دەمهەوێ هەتا کۆتایی سادق و خۆمانە هەڵس‌وکەوت بکەم. وا چاکە هەموومان ڕووڕاست بین!»

لێرەدا چەپڵەیەکی توند وتەکانی هەڵبڕی. لەڕاستیدا، پارێزەر دوایین وشەکانی بە سەداقەتێکەوە دەربڕی کە هەموو هەستیانکرد شتێکی گرنیگی بۆ وتن پێیە و دەیهەوێ بیدرکێنێ. بەڵام سەرۆکی دادگا بە بیستنی دەنگی چەپڵە، بە دەنگێکی بەرز هەڕەشەیکرد ئەگەر جارێکی دیکە دووپاتی بکەنەوە، هەموویان لە دادگا دەکاتە دەرێ. دەنگەکان دامرکان و فێتی یۆکۆویچ بەدەنگێکی تازە و پڕهەستەوە و بە لەبزێکی جیاواز لەئاخافتنەکەی پێشووی دەستیکردەوە بە قسەکردن.

(١٣)

## ڕێگری ئەندێشە

فێتی یۆکۆویچ بەدەنگێکی پتەو و ئاهەنگدار گوتی: «برایانی لێژنەی داوەری، خۆ تەنیا هەڵچنینی بەڵگە نییە کە هەڕەشەی فەوتان لەتۆمەتبار دەکا، نا، ئەوەی کە لەڕاستیدا هەڕەشەی لەنێوچوون لەتۆمەتبار دەکا ڕاستییەکە و بەس ـ تەرمی باوکی. ئەگەر ئەو پەروەندەیە پەروەندەیەکی ئاسایی بووایە، پێداچوونەوەی جیاجیای هەرکام لە بەشەکانی، بەبێ کەم بایەخ بوون و کەموکووڕی چۆنییەتیی بەڵگەکان، تۆمەتەکانتان ڕەتدەکردەوە؛ یان لانیکەم، بۆ لەنێوبردنی ژیانی مرۆڤێک، بەهۆی دەمارگرژییەک کە سەبارەت بە ئەو لەگۆڕێدایە و بەداخەوە شیاوی ئەوەش هەیە، دڵاودڵ بووایەن. بەڵام ئەم پەروەندەیە پەروەندەی قەتڵێکی ئاسایی نییە، پەروەندەی باوککوژییە. هەر ئەوخاڵەش شوێن لە سەر زەینی خەڵک دادەنێ، ئەویش بەڕادەیەک کە بێبایەخ بوون و کەموکووڕیی بەڵگە تەنانەت بۆ زەینێکی کە بەبێ دەمارگرژیش کەمتر بێبایەخ و ناقیس دەبێ. تۆمەتبارێکی وا چۆن فحێل دەبێ؟ ئەگەر کەسێکی بە دەست چووبێ و ڕزگاربێ لە سزادان چی؟ ئەوەش شتێکە کە هەموو کەسێک، کەم تا کورتێ بە شێوەیەکی غەریزی، لەدڵیاندا هەستیپێدەکەن.

«بەڵێ، ڕشتنی خوێنی باوک ترسناکە ـ باوکێک کە بنۆسی بوونم بووە، خۆشی ویستووم، ژیانی خۆی بۆ من تەرخانکردووە، لەسەردەمی منداڵییەوە تائێستا مشوورخۆرم بووە. لە ماوەی ژیانیدا لەبیری بەختەوەریمدا بووە و شەریکی شادی و سەرکەوتنەکانم بووە. کوشتنی باوکێکی وا ـ لە خەیاڵیشدا ناگونجێ. برایانی لێژنەی داوەری، باوک چییە؟ باوکی ڕاستەقینە؟ مانای ئەو وشە گەورەیە چییە؟ ئەم ناوە ئەندێشەیەکی مەزنی لەپشتەوەیە. هەرئێستا

هەتا ڕادەیەک ئاماژەمان پێکرد کە باوکی ڕاستەقینە چییە و دەبێ چی‌بێ. لەوپەروەندەیەدا کەئێستا پێوەی سەرقاڵین و دڵی‌وەژان خستووین - لەوپەروەندەی ئێستادا، باوک، فیۆدۆر پاولۆویچ کارامازۆف، لەگەڵ واتایەک کە هەرئێستا سەبارەت بە باوک باسمانکرد، یەکناگرێتەوە. کە هۆی چارەڕەشییە. لەڕاستیدا، هێندێک لە باوکان سەرتاپا چارەڕەشین. واباشە ئەو چارەڕەشییە هێندێک وردتر پێداچوونەوەی بۆ بکەین. برایانی لێژنەی داوەری، سەرنجدان بەگرنگایەتیی بڕیارێک کە ئێوە دەیدەن، نابێ لە هیچ شتێک ڕوو وەربگێڕین. ئەرکی تایبەتی ئێمەیە کە نابێ وەک منداڵان و ژنانی تۆقیو، لە هیچ بیرۆکەیەک سڵبکەین و ڕووی لێوەربگێڕین هەر ئەو جۆرەی کە دادوەری خاون مرخ و لێهاتوو بەختەوەرانە بەیانیکردووە.

«بەڵام ڕەقیبی بەڕێزی من (کە بەرلەوەی زمانم بگەڕێ ڕەقیبم بوو) لەدرێژەی ئاخافتنە گەرموگوڕەکەیدا چەند جار ئاشکرایکرد: «من پارێزگاری لە تۆمەتبار ناخەمە ئەستۆی پارێزەرێک کە لەپترزبۆرگەوە هاتووە. من دادوەرم، بەڵام، پارێزەریشم!» چەند جاری ئاماژە بەوە کرد، بەڵام لەبیری نەبوو بڵێ ئەم تۆمەتبارە ترسناکە بیستوسێ ساڵی ڕەبەق بەرمنەتی محیبەتی مرۆڤێک بێ کە نیوکیلۆ پستەی بۆکڕیوە، پێتانوایە ناکرێ کەسێکی وا بیستوسێ ساڵی تەواو لەبیری مابێ کە لەحەوشەی پشتەوەی ماڵی باوکی - هەروەک پزیشکی دڵۆڤان هێرتێزنێستیۆب گوتی - «پێخاوس» بە پانتۆڵێکەوە کە بە تەنیا دوگمەیەک بەندبوو» غار بدا؟

«ئاخ، برایانی لێژنەی داوەری، چ پێویست دەکا وردتر بڕوانینە ئەم «چارەڕەشی»یە، بۆ شتێکی کە هەموومان دەیزانین دووپاتیبکەینەوە؟ تۆمەتبار کاتی هاتن بۆئێرە، لەماڵی باوکی لەگەڵ چی بەرەوڕوو بوو، بۆ دەبێ ئەو بەچاوی دێوەزمەیەکی دڵڕەق و لەخۆڕازی ببینن؟ ئەوە سەرەڕۆ و هەوسار پساندووە، وەحشی وسەربزێوە - هەربۆیەش ئێستا دادگاییی دەکەین - بەڵام کێ بەرپرسی ژیانی ئەوە؟ سەرەڕای خووخدەی بێوێنە و دڵی چاکەخواز و پڕهەستی، کێ بەرپرسی بارهێنانی ئەوە و بەچەشنێکی شیاو

نەیعاملاندووە؟ ئایا بە شێوەیەکی باش و ماقووڵانە کەسێک باری هێنا؟ کەسێک بوو بیخاتە سەررێگەی ڕاست و زەینی بەخوێندن و زانین ڕووناک بکاتەوە؟ کاتی منداڵی خۆشەویستیی لە کەسێک دیوە؟ تۆمەتبار وەک حەیوانێکی کێوی بەڕەڵڵا کرا. دوای ساڵانێکی زۆر دەردی دووری، ڕەنگە تامەزرۆی دیتنی باوکی بووبێ. بە وەبیرهێنانەوەی سەردەمی منداڵی، لەوانەیە هەزاران تاپۆی ترسناک و تۆقێنەر کە چنگیان نابووە ئەوکی خەون و خەیاڵە منداڵانەکەی، ویستبێتی ئەوانە لە خۆی بتارێنێ و بە ئاواتەوە بووە سەر بەسنگی باوکییەوە بنێ و باوەشی پێدا بکا و لێیببووری! دەی چی چاوەڕوانی بوو؟ لەگەڵ تانە و توانج و گومان لێکردن و گرفتی ماڵی بەرەوڕوو بوو. ژیانێکی تاڵ و داهاتوویەکی لێڵ. جگە لەقسەی شەیتانی و پڕلە ناهومێدی و ڕەشبینی کە هەموو ڕۆژێ کاتی «مەستی» گوێی لێدەبوو، هیچیتری نەدەبیست. ئاخری بۆی دەرکەوت کە باوکی بە پارەی ئەو خەریکە گراوەکەی لێهەڵدەفریوێنێ! ئاخ، برایان، ئەوە ئیتر زۆر قێزەون و زاڵمانەیە! زۆر کارێکی ناحەز و دزێوە. ئەو پیرەپیاوە بەردەوام سکاڵای لەدەست کوڕەکەی دەکرد و دەیگوت زاڵم و دڵڕەقە و ڕێزی باوکایەتی لەبەر چاو ناگرێ. لە نێو خەڵکدا بەخراپە باسیدەکرد، هەستی دەڕووشاند و ناونیتکەی لێهەڵدەدا و بوختانی پێدەکرد و هەموو چەشنە فێڵ و تەڵەکەیەکی ساز دەکرد و بەشە قەرزەکانی ئەوی دەکڕییەوە و کارێکی دەکرد نەتوانێ بیداتەوە، بۆئەوەی بکەوێتە بەندیخانە.

«برایانی لێژنەی داوەری، کەسێکی وەک ئەم تۆمەتبارە کە من بوومەتە پارێزەری، لەڕواڵەتدا تووڕە و سەرەڕۆ و یاخین، بەڵام لەڕاستیدا، زۆر دڵناسکن و دان بەخۆیاندا دەگرن و نایدرکێنن. پێمەکەنن، بەوبیرۆکەیەم پێمەکەنن! دادوەری خاوەنمرخ زۆر بێبەزییانە پێکەنینی هات بە ئەشقی تۆمەتبار، کاتێک گوتی ئاشقی بەرهەمەکانی شیلەرە ـ ئەشقێکی «جوان و پیرۆز» ـ بەڵێ ئەو جۆرە سروشتانە ـ ئاخ، ئیزنم بدەن بۆ بەرەڤانی لەوسروشت و خووخدانە قسە بکەم ـ کە بە شک و گومانێکی زاڵمانەوە لێیان

دەڕوانن ـ ئەو سروشتانە بەپێچەوانەی سەرەڕۆیی و ڕق و تووڕەییان، زیاتر تینووی خۆشەویستی و چاکە و عەدالەتن ـ بێئیختیار تامەزرۆی ئەوە، بێئەوەی خۆشیان بزانن، بەلام هەرچۆنێک بێ تامەزرۆن. لەڕواڵەتدا تووڕە و تۆسن و ئاڵەتین، بەڵام هەڵگری ئەوەش هەن، ئاشقی ژنێک بن، ئەویش بە ئەشقێکی بەرز و پیرۆزەوە. دیسان پێمپێمەکەنن، ئەم مەسەلەیە گەلێجار لەگەڵ ئەو چەشنە خدە و سروشتانە یەک دەگرێتەوە. بەڵام ئەوان ناتوانن تاسە و حەزەکانیان کە ـ هێندێ جار زۆر ترسناکە ـ بیشارنەوە، ئەمەش وەبەرچاو دەکەوێ، بەڵام مرۆڤی ناوەکی نابیندرێ. ئاگرپژێن زوو دادەمرکێ؛ بەڵام ئەو مرۆڤە بەڕواڵەت تووڕە و سەرەڕۆیە لەپاڵ بوونەوەرێکی شەریف و بەرز و پیرۆزدا بە دوای ژیانێکی نوێدا دەگەڕێ، بۆئەوەی خۆی پاک بکاتەوە، چاک بێ، بەشەرەف و ئابڕوومەند بێ، یانی «بەرز و پیرۆز و جوان»، ئەگەرچی ئەم وتەیە بۆتە هۆی پێکەنین و لچهەڵقورتاندنی تاقمێک.

«هەرئێستا گوتم کە نامەوێ پرکێشی بکەم و بچمە سەرباسی دەزگیرانەتیی تۆمەتبار لەگەڵ خانمی وێرخۆفتیسۆف. بەڵام ئیزنم بدەن با شتێک بڵێم. ئەوەی بیستمان، شایەدی نەبوو، بەڵکو هەڵچوونی ژنێکی ورووژاو و تووڕە و تۆڵەئەستێن بوو، ئەو نەیدەویست ـ ئاخ، نەیدەویست! تۆمەتبار سەرکۆنە بکا، چونکە بۆی تێچاندووە! ئەگەر ڕێزەیەک دەرفەتی بیرکردنەوەی هەبوایە، ئەو شایەدییەی نەدەدا. وریابن و باوەڕ بەقسەکانی مەکەن! نا، تۆمەتبار ئەو جۆرەش کە ئەو باسیدەکا وانییە، ئەو قەت ئەوەندە دڕ و دڵڕەق نییە! مرۆڤ خۆشەویست شەوی لە خاچدرانەکەی گوتی: «من شوانێکی باشم، شوانی باش گیانی لەپێناوی مەڕەکانی دادەنێ و ناهێڵێ هیچکامیان لەنێوبچێ» قەت مەخوازن ڕۆحی مرۆڤێک بە دەستی ئێمە لەنێوبچێ!

«هەرئێستا پرسیم مانای «باوک» چییە و گوتم کە وشەیەکی بەرز و پیرۆزە، ناوێکی خۆشەویستە. بەڵام، برایان پیاو دەبێ وشەکان سادقانە

[12]- ئینجیلی یوحەننا، بەشب دەهەم.

بدرکێنێ و من به پڕکێشییەوە دەمهەوێ شتەکان بەناوی ڕاستەقینەی خۆیان بخوێنمەوە، بەدروستی ناودێریان بکەم: باوکێکی وەک کارامازۆفی پیری کوژراو بۆئەوە نابێ ناوی باوکی لێبنێی، شیاوی ئەوناوە نییە. خۆشویستنی باوکێکی ناهێژا مەحاڵە. چۆن دەتوانی خۆشتبوێ؟ ناکرێ ئەشق لەهیچ بخولقێنی: تەنیا خودا دەتوانێ لەهیچ شتێک بخولقێنێ.

«یەکێ لە پێغەمبەران، بەدڵێکی پڕلەگڕی ئەشقەوە دەنووسێ: «ئەی باوکان، منداڵانی خۆتان تووڕە مەکەن.» لەبەر خاتری تۆمەتبار نییە ئەو قسانە دەگێڕمەوە، ئەوە بۆ تەواوی باوکانە با گوێیان لێبێ و لە گوێی گرن. کێ هەقی پێداوم کە مەوعیزە بۆ باوکان بکەم؟ هیچکەس. بەڵام وەک مرۆڤێک و شارۆمەندێکی ئێوە لێتان دەپاڕێمەوە ـ Vivos Voco [١٤] ـ زۆر لەم دنیایەدا نامێنین، ئەو هەموو کارە شەیتانییە دەکەین، ئەو هەموو وتە شەیتانییە بە دەممانەدا دێ. کەوایە وەرن هەتا پێکەوەین، کاتێکی لەبار و هەلێکی باش بڕەخسێنین و بە باشی لەگەڵ یەک بدوێین. ئەوەش کارێکە کە من دەیکەم: هەتا لێرەم، ئەو دەرفەتە دەقۆزمەوە. ئەم شوێنەیان بەخۆڕایی پێنەداوین ـ تەواوی خەڵکی ڕووسیا گوێیان لە دەنگمانە! تەنیا بۆ ئەو باوکانە قسە ناکەم کە لێرە دانیشتوون، بانگەوازم بۆ هەموو باوکانە: «ئەی باوکان، منداڵانی خۆتان تووڕە مەکەن.» ئەرێ، واچاکە سەرەتا خۆمان فەرمانی مەسیح بەڕێوە بەرین و ئەوسا چاوەڕوان بین منداڵەکانیشمان بەڕێوەی بەرن. دەنا، باوک نین، بەڵکو دوژمنی منداڵەکانمانین، ئەوانیش منداڵی ئێمە نین، بەڵکو دوژمنانن، هەر بە دەستی خۆشمان ئەوانمان کردۆتە دۆژمنی خۆمان. «هەر بەوپێوانەیەی خۆتان پێتان پێواوە، بۆ ئێوەشی دەپێون[١٥].» ئەوە قسەی خۆم نییە، ئینجیل دەفەرمێ. چۆن دەتوانین ڕەخنە لەمنداڵەکانمان بگرین، ئەگەر بەوپێوانەیەی خۆمان بمان پێون؟

---

١٣- ڕیسالەی پۆلسی پێغەمبەر بۆ ئەفسەسیان، بەشی شەشەم.

١٤- «زیندووەکان بانگ دەکەم.»

١٥- ئینجیلی لۆقا، بەشی شەشەم.

«ماوەیەک لەمەوبەر لە فەنلاند، شکیان پەڕییە سەرکڵفەتێک کە بە دزییەوە منداڵی بووە. خستییانە ژێرچاوەدێری، لەقوژبنی ژوورێکدا لەپشت کۆگایەک کەرپووچدا، سندووقێکیان دییەوە کە هیچکەس خەبەری لێی نەبوو. سندووقەکەیان کردەوە، تەرمی منداڵێکی تێدابوو، کە کڵفەتەکە کوشتبووی. هەر لەوسندووقەدا ئێسک و پرووسکی دوو منداڵی دیکەشیان دییەوە، کە ژنە دانیپیانا خۆی کاتی لەدایکبوون کوشتبوونی. برایانی لیژنەی داوەری، ئایا ئەوە دایکە؟ ڕاستە ئەو منداڵانەی بووە، بەڵام ئەرکی دایکایەتیی بەجێهێناوە؟ ئایا کەسێک دەوێرێ ناوی پیرۆزی دایک لەو ژنە بنێ؟ ئاغایان، وەرن با جەسوور بین، وەرن با تەنانەت بێباکیش بین. ئەرکی سەرشانمانە لەم کاتەدا وا بین. لە برێک وشە و ئەندێشە نەترسین ـ وەک ژنانی بازرگانی مۆسکۆیی کە لە «ئاسن» و «گۆگرد[١٦]» دەترسن . نا، وەرن بیسەلمێنین کە پێشکەوتی ئەو چەند ساڵەی ڕابردوو شوێنی لە سەر داناوین، وەرن ڕاشکاوانە بڵێین: باوک ئەو کەسە نییە منداڵێک دروستدەکا، بەڵکو کەسێکە کاتێک منداڵەکەی دەبێ، ئەرکی باوکایەتیی بەجێ دێنێ.

«ئاخ، هەڵبەت مانایەکیتر، لێکدانەوەیەکیتر بۆ وشەی «باوک» لە گۆڕێدایە. کە بەپێی ئەوە پێداگری دەکەن و دەڵێن هەر باوکێک، ئەگەر دڕندە و دێوەزمەش بێ، ئەگەر دوژمنی منداڵەکانیشی بێ، هەر باوکمە، چونکە دروستیکردووم. بەڵام ئەمە وەک واتایەکی عارفانەیە کە بەئاوەزم ناتوانم تێیبگەم. بەڵکو دەتوانم بەهۆی ئیمانەوە قەبووڵیبکەم، یان باشتر وایە بڵێم لە سەر ئیمان، وەک زۆربەی ئەو شتانەیتر کە تێیناناگەم، بەڵام ئایین فەرمانم پێدەدا کە ئیمانم پێیان هەبێ. بەڵام ئەو کاتە وا باشترە بەدەر لە سەنتەری ژیانی ڕاستەقینە ڕابگیرێ. لەسەنتەری ژیانی ڕاستەقینەدا کە لە ڕاستیدا هەق و مافی خۆی هەیە، بەڵام ئەرکیشمان دەخاتە سەرشان، لەو بەستێنەدا ئەگەر بمانهەوێ مرۆڤ بین ـ لەڕاستیدا مەسیحی بین ـ دەبێ لە سەر بنەمای بیر و

---

١٦- شانۆنامەی «ڕەشەبا» بەرهەمی ئیسترافسکی «ئاسن» و «گۆگرد» وەک دیاردەی خورافات و کۆنەپەرەستی دیار دەکەون.

باوەڕێک چالاکی بنوێنین کە ڕوونکردنەوەی ئەزموون و ئاوەزی پێوەبێ، کەڵکی شرۆڤە و لێکدانەوە تێپەڕبێ؛ بە کورتی و بە کوردی دەبێ ماقووڵانە هەڵسوکەوت بکەین، نەک شێتانە، جۆرێکیش نەبێ پێمانوابێ لەخەون و وڕێنەداین، نەکا ئازار بە کەسێک بگەیەنین، خراپی لەگەڵ بجووڵێینەوە و لەنێوی بەرین. ئەو کاتەیە کە کارەکەمان خوداپەسندانە دەبێ، یانی جگە لەعارفانە، ماقووڵانە و مرۆڤدۆستانەش...»

لێرەدا دەنگی چەپڵە لە هەموو لایەکی دادگاوە بەرز بۆوە، بەڵام فێتی یۆکۆویچ دەستی ڕاتەکاند، وەک ئەوەی لەبەریان بپاڕێتەوە نەپەڕنە نێوقسەکانی و لێیگەڕێن باسەکەی تەواو بکا. بێدەنگی دیسان دادگاکەی داگرتەوە. پارێزەر درێژەی بەقسەکانی دا.

برایانی لێژنەی داوەری، پێتانوایە منداڵەکانمان کاتێک باردێن و دەستدەکەن بە مژیوەری، دەتوانن لەوجۆرە پرسیارانە پارێز بکەن؟ نا، ناتوانن، ئێمەش دەیانخەینە تەنگژەوە و بیروڕای خۆمانیان بەسەردا دەسەپێنین. دیمەنی باوکی نەشیاو پرسیارێکی تاڵ و جەرگبڕ دەخاتە زەینییەوە، بەتایبەت کاتێک کە باوکی لەگەڵ باوکانی بیۆێنە و هێژا هەڵدەسەنگێنێ. وەڵامی دیاریکراوی ئەو پرسیارەش ئەمەیە: «ئەو دروستی کردی و تۆ گۆشت و خوێنی ئەوی، کەوایە وەزیفەتە خۆشتبوێ.» لاوێک، بێئیختیار لە خۆی دەپرسێ: «بەڵام ئەو کاتە دروستیکردم، خوشیویستم؟ ئایا لەبەر خاتری خۆم دروستیکردم؟ لەو کاتەدا، لەوساتەی تاسە و هەوەسدا، یان ڕەنگە لەئاوری مەشرووبدا، منی دەناسی، تەنانەت ئاگای لەڕەگەزم بوو، یان تەنیا حەزی مەیَنوشینی بۆجەستەی من گوێستەوە ـ لەوە زیاتر چیی بۆ کردووم... لەکاتێکدا دوای ئەوە هەربیریشی لێنەکردوومەتەوە؟»

«ئاخ، ڕەنگە پێتانوابێ ئەم پرسیارە تۆسن و زاڵمانەیە، بەڵام نابێ چاوەڕوانیمان لەزەینی لاوێک هەبێ کە لەچوارچێوەیەکی دیاریکراودایە. «ئەگەر خووخدە لە دەرگاوە وەدەرینێی، لە پەنجێرەوە دێتەوە.» لە

هەمووشی گرینگتر. وەرن با لە «گۆگرد» و «ئاسن» نەترسین، بەڵکو لەمەڕ پرسیارەوە لە سەر بنەمای ئاوەز و مرۆڤایەتی بڕیار بدەین، نەک لەڕووی بیرۆکەی عارفانەوە. لەمەڕ ئەوەوە چۆن بڕیار دەدرێ؟ چاکە ئاوا: باشترواپە کوڕ لەهەمبەر باوکیدا ڕاوەستێ و بپرسێ: «باوە. پێمبڵێ بزانم بۆدەبێ تۆم خۆشبوێ؟ باوە، پێمنیشاندە کە دەبێ خۆشمبوێی.» جا ئەگەر ئەو باوکە بتوانێ وەڵامی بداتەوە و دەلیلێکی باشی بۆ بێنێتەوە، ئەو کاتەیە کە پێوەندی باب و فرزەندی دەبێتە پێوەندییەکی ڕاستەقینە و سروشتی و بناغەکەی دەمارگرژییەکی عارفانە نییە، بەڵکو بنەمایەکی ماقووڵانە و بەرپرسانە و مرۆڤدۆستانەی هەیە. بەڵام ئەگەر وا نەکا، دەبێ دەست لەپێوەندیی بنەماڵە دابشۆی. ئەو ئیتر بۆ کوڕەکەی باوک نییە و کوڕە هەقیەتی بەچاوی بێگانە و تەنانەت دوژمن چاوی لێبکا. ئاغایانی لێژنەی داوەری، پێگەی ئێمە دەبێ مەکتەبی ئەندێشەگەلێکی دروست و سالم بێ.»

لێرەدا دەنگی چەپڵەلێدان هۆڵی دادگای داگرت و بەجۆرێک بوو کە کۆنترۆڵ نەدەکرا و هێندە شێتانە چەپڵەیان لێدەدا پارێزەر لە وتاردان وێستا. هەموو خەڵکەکە چەپڵەیان لێنەدەدا، بەڵکو نیوەیان و ڕەنگە زیاتر لەنیوەشیان. دایکان و باوکان چەپڵەیان لێدەدا. دەنگی هاوار و سەرسوڕمان لە نێو ڕیزی تایبەتی ژنانەوە دەبیسترا و دەسرەیان هەڵدەسووڕاند. سەرۆکی دادگا بەتووڕەیی قامکی بە زەنگەکەدا نا. دیاربوو لەدەست ئەوخەڵکە ئیمان هەردەبووە، بەڵام ئەمجارە هەڕەشەی دەرکردنی لێنەکردن. تەنانەت کەسایەتییە پایەبەرزەکان و پیرەپیاوانی ئەستێرەداریش کە لەپشت قازییەکانەوە لەشوێنێکی تایبەت دانیشتبوون، چەپڵەیان بۆ پارێزەر لێدا و دەسرەیان هەڵسووڕاند. بەجۆرێک کە کاتێک ژاوەژاوەکە دامرکایەوە، سەرۆکی دادگا هەمیسان هەڕەشەی دەرکردنیانی دووپاتکردەوە. فێتی یۆکۆویچ شاد و سەرکەوتوو درێژەی بەقسەکانی دا.

«برایانی لێژنەی داوەری ئەو شەوە سامناکەی کە ئەمڕۆ زۆری باسکرا، لە بیرتانە، یانی ئەو شەوەی کە کوڕە بەسەر نەردەکاندا بازیدا ماڵی باوکی و

لەگەڵ دوژمنە ئەشکەنجەگەرەکەی، یانی ئەو کەسەی ژیانی پێبەخشیبوو، بەرەورووو بوو. تەواو لە سەر ئەوە جەخت و پێداگری دەکەم کە بۆ پارە خۆی بەماڵی باوکیدا نەکرد: تۆمەتی دزی، هەروەک پێشتریش سەلماندم، وڕێنەیە و بەس. بۆ کوشتنی فیۆدۆر پاولۆویچیش نەچوو. لێمڕوونە نەبۆ دزی چوو، نەبۆ پیاو کوشتن. ئەگەر پیلانێکی وای بە دەستەوە بوایە، لانیکەم خۆی بە چەک تەیار دەکرد. خۆ دەمانچەشی هەبوو. دەسکاونگەکەش هەروا دەستیدایە، بێئەوەی خۆشی بزانێ چدەکا. وایدانێین لەپەنجەرەکەی داوە و باوکی هەڵفریواندووە، گریمان ڕێگای بۆکراوەتەوە بچێتە ژووری - گوتووشمە کە باوەڕ بەوچیرۆکەخەیاڵییە هەر ناکەم، بەڵام قەیناکا با وابێ، گریمان وایە. ئاغایان، سوێند بەتەواوی پاکییەکانی دنیا، ئەگەر ئەو کەسە باوکی نەبوایە، بەڵکو کەسێکی ئاسایی بووایە، دوای گەڕان بە نێو ژوورەکاندا و دڵنیا بوون لەوەی کە ئەو ژنە لەوێ نییە، بەپەلە دەردەپەڕی بێئەوەی ئازار بە ڕەقیبەکەی بگەیێنێ. ڕەنگبوو لێیدا، یان پاڵیپێوەبنێ، لەوەش زیاتر هیچی نەدەکرد، چونکە نەبیری لەوکارە کردبۆوە، نەدەرفەتیشی هەبوو. ئەو تەنیا دەیویست دڵنیابێ گراوەکەی لەوێیە یان نا. بەڵام باوکی، باوکی! دیتنی باوکی، باوکێک کە لەمنداڵییەوە ڕقی لێیبوو، دوژمن و ئەشکەنجەگەری بوو، ئێستاش بووبووە ڕەقیبی، هەرئەوەشی بەسبوو لەدین دەرچێ! هەستێکی پڕلەڕق و بێزاری، ئارا و قارای لێهەڵگرت و بەسەریدا زاڵ بوو، خوێن بەریچاوی گرت، لە ساتێکدا وەک ئاگری بەپووشو گڕی گرت! ئەنگێزەیەکی شێتانە بوو، بەڵام ئەنگێزەی سروشتیش بوو، بۆیە ئۆقرەی لێبڕی و نەیتوانی خۆ لەبەر ئەو وزەیەدا بگرێ (وەک هەموو شتەکانیتری سروشت) دەیتوانی تۆڵەی پێشێلکردنی یاسای ئەبەدی بکاتەوە. بەڵام تەنانەت ئەو کاتەش نەیکوشت ـ لەوە دڵنیام و بەدەنگێکی بەرزیش ڕایدەگەیێنم! ـ نا، لە کاتی هەڵچوونی ڕق و بێزاریدا، دەسکاونگەکەی هەڵێنایەوە، نەک بە قەستی ئەوەی بیکوژێ، نا نەیدەویست بیکوژێ. ئەگەر ئەو دەسکاونگە گلاوەی بە دەستەوە نەبووایە، ڕەنگبوو تەنیا بیدا بە زەویدا، بەڵام نەیدەکوشت، کاتی هەڵاتن

نەیدەزانی ئەو پیرەپیاوەی کە دابووی بەعەرزیدا، کوشتوویەتی یان نا. قەتڵێکی ئاوا قەتڵ نییە. قەتڵێکی ئاوا باوککوژی نییە. نا، کوشتنی باوکێکی ئاوا ناکرێ باوککوژیی پێبڵێی. تەنیا بەهۆی دەمارگرژییەوە دەتوانین قەتڵێکی ئاوا بە باوککوژی بزانین.

«بەڵام من لەناخی دڵمەوە دیسان لێتان دەپاڕێمەوە؛ ئایا ئەو قەتڵە بەڕاستی ڕوویدا؟ برایانی لیژنەی داوەری، ئەگەر ئەو مەحکووم بەسزا بکەین، بە خۆی دەڵێ: «ئەمرۆڤانە بۆ بارهێنان و دەرس خوێندنم هیچ کارێکیان نەکردووە، بۆ باشکردنی چارەنووس و نیشانیدانی ڕێگای ڕاست و بە مرۆڤ کردنم هیچ هەوڵێکیان نەداوە. ئەم مرۆڤانە هیچ خواردەمەنی و شەڕابێکیان پێنەداوم، لەبەندیخانە و کاتی لێقەوماویدا سەردانیان نەکردووم و ئێستاش دەمنێرن بۆ بەندیخانە بەکاری دژوارەوە. سەربەسەر هاتووینەوە، ئێستا ئیتر هیچیان پێقەرزدارنیم و هەتا دنیا بەدنیایە هیچ شتێک بەکەس قەرزدارنیم. ئەوانە ناپاکن و منیش ناپاک دەبم. ئەوانە زاڵمن و منیش زاڵم دەبم!» برایان، ئەوەی دەیڵێ ئەمەیە. سوێندیش دەخۆم بە مەحکوومکردنی ئەو کارەکەی بۆ ئاسان دەکەنەوە: ویژدانی ئاسوودە دەکەن، نفرین لەو خوێنە دەکا کە ڕشتوویەتی و ئاخوداخی بۆ هەڵناکێشێ. لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگای ئەوەی لێدەبڕنەوە کە ببێتە مرۆڤێکی نوێ، چونکە پاشماوەی ژیانی هەر بەناپاکی و دڵکوێری دەمێنێتەوە.

«بەڵام دەمهەوێ بزانم دەتانەوێ سزایەکی قورسی بەسەردا بدەن. سامناکترین سزا، لەگەڵ ئەوەشدا نەجاتیبدەن و گیانی تووشی ئازار بکەن؟ ئەگەر بتانهەوێ بەڕەحمەت تێکی بشکێنن! جا دەبینن و دەبیستن چۆن وەلەرزین دەکەوێ و ترسی لێدەنیشێ. «چۆن دەتوانم لەهەمبەر ئەوڕەحمەتەدا تاقەت بێنم؟ کوا تاقەتی ئەو هەموو ئەشق و خۆشەویستییەم هەیە؟ پێتانوایە شیاوی ئەوەبم.» ئەمەیە ئەوەی لەخوتانی دەپرسن. ئاخ، ئەو دڵە دەناسم، ئەو دڵە وەحشی و بەئەمەگە! لە هەمبەر ڕەحمەتی ئێوەدا کرنۆش دەبا؛ تینووی کردەوەیەکی گەورە و پڕلەدڵۆڤانییە، هەڵدەگیرسێ و

ڕادەپەڕێ. مرۆڤگەلێک هەن کە لەچوارچێوەی تەنگەبەری خۆیاندا تەواوی مرۆڤایەتی سەرکۆنە دەکەن. بەڵام یەکێک لەو مرۆڤانە بەڕەحمەت بۆڕ بدەن، خۆشەویستی و دڵسۆزیی نیشانبدەن، تف لە ڕابردووی خۆی دەکا، بۆچی؟ چونکە زۆری ئەنگێزەی چاک لە دڵدایە. دڵی مرۆڤێکی ئاوا دەکرێتەوە و دەبینێ خودا دڵۆڤانە و مرۆڤەکانیش چاک و بەئینسافن. ترس دایدەگرێ، لەژێرباری پەشیمانی و ئەرکێکدا کە لەوە بەدواوە دەکەوێتە سەرشانی پشتی دەچەمێتەوە. ئەو کاتە ئیتر نالێ: «سەربەسەر هاتینەوە،» بەڵکو دەڵێ: «لەبەر چاوی هەموو مرۆڤەکان تاوانبارم و لە هەموو کەس خوێڕی و ناچیزەترم.» بەفرمێسکی توبە و دڵەخورپەیەکی لەشتاوێنەوە دەڵێ: «هەموو خەڵکی لە من چاکترن، ویستیان نەجاتم دەن، نەک لەنێوم بەرن!» ئاخ، بەڕێوە بردنی ڕەحمەت بۆ ئێوە زۆر ئاسان بوو، چونکە بە نەبوونی بەڵگەی ڕاستەقینە زۆرتان بۆدژوارە ڕایگەیێنن: «ئەو تاوانبارە.» فحێل کردنی دە تاوانبار چاکترە لە سزادانی بێتاوانێک! گوێتان لێیە، گوێتان لێیە ئەودەنگە پڕشکۆیە لەسەدەی ڕابردووی پڕ شانازیمانەوە دێ؟ لە سەر منی بچووک نییە وەبیرتان بێنمەوە بوونی دادگای ڕووسیا تەنیا بۆ سزادان نییە، بەڵکو بۆنەجاتدانی گیانی تاوانبارانیشە! لێگەڕێن با نەتەوەکانی دیکە لەبیری کوشتنەوە و بەڕێوەبردنی ڕاشکاوانەی یاسادا بن، ئێمە چنگ لەڕۆحی مانا گیر دەگەین - نەجاتدان و چاککردنەوە و هێنانەوە سەررێی هەڵەشە و ڕێلێونبووان. ئەگەر ئەوە ڕاست بێ، ئەگەر ڕووسیا و عەدالەتەکەی ئاوا بێ، هیوادارم سەرکەوتوو بێ! هەولمەدەن بە خێشکی هەوسار پساو کە تەواوی نەتەوەکان بە بێزارییەوە پارێزی لێدەکەن، بمانترسێنن. خێشکێکی هەوسار پساو نییە، بەڵکو فایتوونی شاهانەی ڕووسیایە کە بەشکۆ و ئارامییەوە بەرەو مەزڵی خۆی بەڕێوەیە. چارەنووسی تۆمەتبار لە دەستی ئێوەدایە، چارەنووسی ڕووسیا لە دەستی ئێوەدایە. بەرەڤانیی لێدەکەن، نەجاتیدەدەن، دەیسەلمێنن کە کەسانێک هەن پارێزگاریی لێدەکەن و بە دەستی کەسی خۆی دەسپێرن!»

## (٤)

# لادێیەکان قورس و قایم ڕادەوەستن

فێتی یۆکۆویچ وتەکانی خۆی بەمشێوەیە کۆتایی پێهێنا، خەڵکەکە هەست و سۆزیان وەک سێڵاو هەستابوو و نەدەنیشتەوە. بە هیچ شێوەیەک پێشیشی نەدەگیرا: ژنان دەگریان، زۆر لە پیاوانیش دەگریان، تەنانەت دووکەس لەو کەسایەتییە گرینگانەی نێو دادگاش فرمێسکیان هەڵوەراند. سەرۆکی دادگا تەسلیم بوو، تەنانەت لێدانی زەنگەکەشی وەدرەنگ خست. هەروەک دواتر ژنان گوتیان: «دامرکاندنەوەی ئەو هەست و سۆزەی خەڵک وەک ئەوەبوو بیانهەوێ شتێکی زۆر پیرۆز دامرکێننەوە.» ئاخێوەر خۆشی دڵی پڕ بووبوو. هەر لەو کاتەدابوو ئیپۆلیت کیریلۆویچ بۆناڕەزایەتی دەربڕین هەستا. خەڵکەکە بەڕق و بێزارییەوە چاویان لێدەکرد. ژنان دەستیانکرد بە سرتوخورت: «چی؟ ئەوە دەیهەوێ بڵێ چی؟ یانی هەر بەڕاست دەوێرێ ناڕەزایەتی دەربڕێ؟» بەڵام ئەگەر ژنانی دنیا، تەنانەت ژنەکەی خۆشی، ناڕەزایەتییان دەربڕیبایە، لەو کاتەدا نەیاندەتوانی پێشی پێبگرن. ڕەنگی بزڕکابوو، وا شڵەژابوو، کەوتبووە هەناسەبڕکێ و دەلەرزی. تەنانەت چەند وشەی سەرەتای قسەکانی کەس لێی تێنەگەیشت، نەیدەتوانی بە ڕوونی باخێوێ و زووزوو قسەکەی لێدەشێوا. بەڵام زوو وەخۆهاتەوە. لەو دوایین وتانەی ئەو تەنیا چەند ڕستەتان بۆ دەگێڕمەوە.

«... ڕەخنەم لێدەگرن کە هەقایەتی خەیاڵیم هەڵبەستووە. بەڵام ئەم بەرەڤانییەی جەنابی پارێزەریش هەرئەوەیە و بەو پێیە هەقایەت لە سەر هەقایەتە! تەنیا شتێکی کەمبوو، ئەویش شیعر بوو. فیۆدۆر پاولۆویچ،

لەکاتێکدا چاوەڕوانی گراوەکەیەتی، پاکەتی پارەکە دەدڕێنێ و فڕێیدەداتە سەرچەقی ژوورەکە. تەنانەت ئەوەی لە کاتی ئەو کردەوە سەرسوڕهێنەرەدا بەدەمیدا هات، بۆی گێڕاینەوە. ئەی ئەوە خەیاڵ نییە چییە؟ چبەڵگەیەکیشمان بە دەستەوەیە کە خۆی پارەکەی هەڵگرتووە؟ کێ گوێی لەقسەکانی بووە؟ ئیسمیر دیاکۆف، ئەو گەمژەی ئەقڵسووکە، دەبێتە پاڵەوانێکی بایرۆنشێوە و لەبەر زۆڵییەتیی خۆی تۆڵە لەکۆمەڵگا دەکاتەوە ـ ئەمە هەقایەتێکی بە شێوەی بایرۆن نییە؟ کوڕێکیش کە خۆ دەکا بەماڵی باوکیدا و دەیکوژێ، بێئەوەی بیکوژێ، هەقایەتێکی خەیاڵی نییە ـ تۆقێنەرەکەی نەزیلەیەکمان لێدادێنێ و خۆشی ماناکەی نازانێ. ئەگەر کوشتی، ئەوە کوشتوویەتی و بڕایەوە. مانای کوشتنی ئەو، بێئەوەی کوشتبێتی، نازانم چییە و تێیناگەم ـ کێ سەری لەوە دەردەچێ؟

«پاشان، وریاییمان پێدەدا کە ئەم شوێنە شوێنی ئەندێشەگەلی دروست و سالمە و لەم شوێنەوە «ئەندێشەگەلی سالم» وتەی ژیرانە دەبیستین کە «باوککوژی» بە باوککوشتن بزانی دەمارگرژییەکە و بەس! بەڵام ئەگەر باوککوژی دەمارگرژییە و ئەگەر هەموو منداڵێک ناچاربێ لە باوکی بپرسێ، بۆ دەبێ خۆشی بوێ، چیمان بە سەر دێ؟ بنەمای کۆمەڵگا چیی بە سەر دێ؟ بنەماڵە چیی بە سەر دێ؟ دەردەکەوێ کە باوککوژی ترسێنەری ژنە بازرگانەکانی مۆسکۆیە؟ خۆشەویستترین و پیرۆزترین پشتیوانی بۆ چارەنووس و داهاتووی عەداڵەتی ڕووسی بە شێوەیەکی لاڕێ و گەوجانە پیشانمان دەدرێ بۆ ئەوەی بە ئامانجێک بگەین ـ پاکانەیە بۆ شتێک کە ناتوانی پاکانەی بۆ بکەی. پاریزەر هاوار دەکا: «ئەی خەڵکینە، بەهۆی ڕەحمەتەوە تێکی بشکێنن؛» بەڵام ئەمە ئارەزووی تاوانبارە و سبەینێ دەیبینن چۆن تێکشکاوە. ئایا پارێزەر بە داواکارییەکی وشک و خاڵی بۆ فحێل بوونی تاوانبار شەرم و حەیا داینەگرت؟ پێتان چۆنە بۆ سەربڵێندی و شانازیی «باوککوژ» دامەزراوەیەکی خێرۆمەند بینا بکەین بۆ ئەوەی کارە جوانەکەی بۆ بەرەی داهاتوو وەک یادگار بمێنێتەوە؟ ئایین و ئینجیل

هەڵەچنی دەکرێ ـ دەڵێن ئەمە عیرفانە، مەسیحییەتی ئیمە تەنیا مەسیحییەتێکە کە بۆتە فەرمانبەر و چاولەبەری ئاوەز و مەنتق. هەربۆیە قەڵافەتی درۆیینەی مەسیحمان لەهەمبەردا قیت دەکەنەوە! پارێزەر دەگورێنێ: «هەر بەو پێوانەیەی دەیپێون، بۆ ئێوەشی دەپێون،» هەر لەرێوە بەوئاکامەش دەگا کە مەسیح فێرمان دەکا تاکو بەو پێوانەیەی بۆ ئێمە پێوراوە، بیپێون ـ ئەویش لە شوێنی هەقیقەت و فامی دروستەوە! تەنیا شەوی بەر لە مژولیایش سەر بە نێو ئینجیلدا دەکەین، تاکو لەگەڵ نووسراوەکانی ئاشنابین، چونکە هەرچۆنێک بێ ڕەسەنە و لەوانەیە بۆ هەڵخڕاندنی هەستی خەڵک و شوێندانان لەسەریان بەکاربێ، بەو وتانە تووشی سەرسووڕمانیان بکەین ـ هەمووشی بۆئەوەی بە ئامانجەکەمان بگەین! بەڵام ئەوەی مەسیح فەرمانمان پێدەدا شتێکی تەواو جیاوازە: ئەو فەرمانمان پێدەدا لەئەنجامدانی ئەو کارە پارێز بکەین، چونکە دنیای ناپاک خۆی ئەو کارە دەکا، بەڵام ئێمە ناچارین لێبوردوو بین و بەو بارەی دیکەدا بیسووڕێنین، ئەویش نەک بۆ ئەشکەنجەگەرەکانیشمان هەر بەو پێوانەیە بیپێوین کە ئەوان بۆ ئیمەی دەپێون. ئەوەیە ئەوەی خوداکەمان فێری کردووین، فێری نەکردووین بەرگریکردن لە عەولاد بۆ ئەوەی نەهێڵین باوکی خۆی بکوژێ، دەمارگرژییە. ئێمەش لە پێگەی هەقیقەت و فامی دروستەوە، ئینجیلی پەروەردگارمان هەڵەچنی ناکەین، پەروەردگارێک کە پارێزەر هەر بەوە پەسندە دەکا کە ئەو ئاشقی لە خاچدانی مرۆڤایەتییە، ڕاست بە پێچەوانەی تەواوی خەڵکی ئۆرتۆدۆکسی ڕووسیا کە ئاوای پێدەڵێن: "چونکە تۆ خودای ئێمەی!"»

لێرەدا سەرۆکی دادگا هەڵیدایە و پێشی بەو ئاخێوەرە بەجەرگە گرت، داواشی لێکرد زێدەڕەوی نەکا و پێی زیادی دانەکێشێ و... هەر ئەو جۆرەی کە لەبەینی سەرۆک دادگاکاندا باوە و دەتوانن فەرمانبدەن. خەڵکەکە شڵەژابوون: تەنانەت بیروڕای زۆر تووڕە و تۆسنانە دەکەوتە بەرگوێ. فێتی یۆکۆویچ نەیدەویست وەڵامیبداتەوە؛ تەنیا کارێکی کە کردی ئەوەبوو چووە سەرسەکۆکە و دەستی نایە سەردڵی خۆی و بەلەبزێکی خەمبارانە، چەن

قسەی غروورئامێزی بەدەمدا هات. دیسان بەلەبزێکی پڕلەسووکایەتی و کینایە ئاماژەی بە «دیرۆک دارێژی» و «ڕەوانناسی» کرد و لەجێی خۆیدا گوتی: «ژووپیتێر، تۆ ڕقت هەستاوە، کەوایە لەهەڵەدای،» بووە هۆی ئەوەی خەڵکەکە دەستبکەن بە پێکەنین، چونکە ئیپۆلیت کیریلۆویچ بە هیچ شێوەیەک لە ژووپیتێر نەدەچوو. ئەنجا فێتی یۆکۆویچ، سەبارەت بەوتۆمەتەی کە باوککوژی فێری بەرەی لاو دەکا، بەپۆز و دەمارێکەوە گوتی تەنانەت وەڵامیشی ناداتەوە. لەمەڕ ئەو تۆمەتەشەوە کە باسی بیروباوەڕی ئۆرتۆدۆکسی و دانانی مەسیح بەجێی «خودا» و وەک «ئاشقی لەخاچدانی خەڵک»، هەروەها شتێکی ئاوا لە «پێگەی هەقیقەت و فامی دروست» نابێ هەرباسبکرێ، گوتی: «ئەمە تەڵقینێکی تاکەکەسییە و چاوەڕوانیم لە دادگا هەیە ئیزن نەدا بەوتۆمەتانە، سووکایەتی بەئابڕووی منی وەفادار بەخاک و وڵات بکرێ.» بەڵام سەرۆکی دادگا لێرەدا لەدەمی ئەویشی دا. بەڵام پارێزەر لەگەڵ چەپڵە و هاواری خەڵکەکە، بە کڕنۆشێک کۆتاییی بەوڵامنامەکەی هێنا. ئیپۆلیت کیریلۆویچیش بۆ هەتاهەتایە لەبەر چاوی ژنانی شارەکە کەوت.

پاشان تۆمەتبار ئیزنی پێدرا قسە بکا. میتیا هەستا سەرپێ. بەڵام زۆرکەم دووا. لەش و ڕۆحی شەکەت بووبوو و خەریکبوو لە پێ دەکەوت. ئەو سەربەستی و حاڵ و هەوا و هێزەی سەرلەبەیانی کاتی هاتن بۆدادگا بە هەڵسوکەوتییەوە دیاربوو، کەمتاکورتێ لە نێو چووبوو. وایدەنواند کە ئەو ڕۆژە لە کڵی تاقیاری هاتۆتە دەرێ و بۆ پاشماوەی تەمەنی شتێکی زۆر گرینگ، کە هەتا ئەو کاتە تێینەگەیشتبوو، فێربووە. دەنگی کزبوو، وەک پێشوو نەیدەنەڕاند. وتەکانی ئاهەنگێکی تازەی پێوە دیار بوو، کە لێوڕێژ بوو لە شکست و خاکەڕایی و تەسلیم.

ئاغایانی لێژنەی داوەری، بڵێم چی؟ ئێستا کاتی داوەرییە، هەستدەکەم دەستی خودا لە سەر سەرمە! کاری مرۆڤێکی خەتاکار گەیشتۆتە کۆتایی! بەڵام لەدەرگانەی خودادا دووپاتیدەکەمەوە، من دەستم لەکوشتنی باوکمدا نییە و ئەو تۆمەتە لە من مەدەن! بۆ دوایین جار دووپاتیدەکەمەوە من قاتڵی

ئەو نەبووم! من هەڵەیەکم کرد، بەڵام لایەنگری چاکە بووم. هەمیشە هەوڵمدەدا سەرم داخەم و ڕێگەی ڕاست و چاکەکاری بگرمە بەر، بەڵام وەک جانەوەرێکی وەحشی دەژیام. زۆر سپاسی دادوەر دەکەم، زۆرشتی سەبارەت بەمن گوت کە نەمدەزانی؛ بەڵام ئەم وتەیە ڕاست نییە کە باوکی خۆمم کوشتبێ، دادوەر بەهەڵە چووە. پارێزەرەکەشم سپاسدەکەم. گوێم لەقسەکانی گرتبوو، دەستمکرد بە گریان. بەڵام ئەم وتەیە ڕاست نییە کە من باوکی خۆمم کوشتبێ، پێویستیش نەبوو ئاوا بیربکەنەوە. باوەڕ بەقسەی پزیشکەکانیش مەکەن.تەواو ئەقڵم لەسەرخۆیە، بەڵام دڵگرانم. ئەگەر واز لە من بێنن، ئەگەر ئیزنمبدەن بڕۆم، دوعاتان بۆدەکەم. دەبمە مرۆڤێکی باشتر. لەبارەگای خودادا قەولی شەڕەفتان پێدەدەم کە مرۆڤێکی باشبم! ئەگەر مەحکوومم بکەن شمشێرەکە لە سەری خۆمدا دەشکێنم و لەتوکوتەکەی ماچدەکەم. بەڵام واز لە من بێنن، خوداکەمم لێمەڕفێنن! خۆم دەناسم، یاخی دەبم! دڵگرانم، ئاغایان... وازم لێبێنن!

میتیا وەک ئەوەی لاقی شلبووبێ و خۆی پێڕانەگیرێ کەوت بەسەر کورسییەکەدا؛ دەنگی لەگەروویدا کپ بوو؛ زۆر بەزەحمەت دوایین ڕستەی دەربڕی. پاشان قازییەکان بەپێویستیان زانی وتووێژەکە دوایی پێبێنن و داوایان لە هەردوولا کرد ئاکامی محاکەمەکە بخەنەوە سەریەک. بەڵام ناچمە سەر لایەنە وردەکان. ئاخری ئەندامانی لیژنەی داوەری هەستان و بۆ تەگبیر و ڕاوێژ چوونە وەتاغێکیتر. سەرۆکی دادگا زۆر ماندوو بووبوو، هەربۆیە بەدەنگێکی کز دوایین داواکاریی خۆی لە لیژنەی داوەری کرد: «بێلایەن بن، نەکەونە ژێرکاریگەری و زمانپاراویی پارێزەر، هەموو بەڵگە و بۆچوونەکان هەڵسەنگێنن، لەبیرتان نەچێ بەرپرسایەتییەکی گەورەتان لەئەستۆیە،» و... هتد.

ئەندامانی لیژنەی داوەری چوونە دەرێ و دادگا بە شێوەی کاتی تەعتیل بوو. خەڵک دەیانتوانی لەجێی خویان هەستن و بەملا و بەولادا بڕۆن و بیروڕا بگۆڕنەوە و لە چایخانەکە تۆزێ لێویان تەڕ کەنەوە. درەنگوەخت بوو،

نزیکەی سەعاتێکی شەو لادابوو، بەڵام هیچکەس دادگای بەجێ نەهێشت و بڕوا بەدوای کاری خۆیدا؛ هەموو کەوتبوونە دڵەڕاوکێ و وچان و پشوودانیان هەر لەبیر نەبوو. هەموو بەدڵەکوتێوە چاوەڕوانییان دەکێشا؛ ئەگەرچی، لەوانەیە ئەم قسەیە فشەش بووبێ، چونکە ژنان بێئۆقرەییەکی شێتانە دایگرتبوون و دڵیان پەرۆش نەبوو. پێیانوابوو حوکمی فحێل بوونی تۆمەتبار یەکجارییە. هەموو خۆیان بۆ ساتێکی پڕشادی و خۆشیی گشتی ئامادە کردبوو. ئەوەشم لەبیر نەچێ، لە نێو پیاوەکانیشدا زۆرکەس بڕوایان بوو حوکمی فحێل بوونەکەی حەتمییە. تاقمێک شاد و ڕازی بوون، دەستەیەکیش گرژومۆن نێوچاوانیان تێکنابوو، تاقمێکیش مەیموونەکەیان تۆپیبوو و پێیان خۆش نەبوو فحێل بێ. فێتی یۆکۆویچ لە سەرکەوتنی خۆی خاترجەم بوو. دەستەیەک لە دەوری کۆزیلکەیان بەستبوو و پیرۆزباییان لێدەکرد و ماستاویان لەبەر سارد دەکردەوە.

هەروەک دواتر بۆیان باسکردم، ئەو بە تاقمێکی گوت: «تاڵێکی نادیار هەیە کە پارێزەر و ئەندامانی لێژنەی داوەریی پێکەوە پێوەند دەدا. ئەویش کاتێک کە ئەو تاڵانە شکڵیان گرتبێ، پیاو لە کاتی وتاردانددا هەستیپێدەکا. لەوانە ئاگادار بووم. دەزانم هەن. ئێمە بەئامانج گەیشتووین. خاترجەمبن.»

پیاوێکی تێکسمڕاوی خێڵ، کە یەکێک لە مالیکانی ناوچەکە بوو، خۆی لەو دەستەیە نزیککردەوە کە خەریکی مشتومڕ و مقۆمقۆ بوون و گوتی: «ئێستا لادێییەکانی ئێمە دەبێ بڵێن چی؟»

- بەڵام هەموویان لادێیی نین. چوار میرزابنووسی دەوڵەتیان لەگەڵدایە.

یەکێک لە ئەندامانی شورای ناوچەکە، هاتە ڕیزی ئاپۆرەکەوە و گوتی: «ئەرێ، هەروایە.»

- نازاریف، ئەو بازرگانە خاوەن میداڵیایەی کە یەکێک لە ئەندامانی لێژنەی داوەرییە، دەیناسن؟

- جا بۆ؟

- مرۆڤێکی زۆر تێگەیشتووە.

ـ بەڵام زۆر کەمدووە.

ـ چەقەسرۆیی ناکا، بەڵام چاکتر. پێویست ناکا ئەو کابرا پترزبۆرگییە دەرسی دادا؛ خۆی دەتوانێ دەرسی هەموو پترزبۆرگییەکان دادا. باوکی دوازدە منداڵە. بیری لێبکەنەوە!

یەکێک لە کارمەندە لاوەکانی ئێمە لە گرووپێکیتردا گوتی: «ئەرێ هەر بەڕاست بڵێی فحێلی بکەن؟»

کابرایەک بەدەنگێکی بەرز و ڕاشکاوانە گوتی: «حەتمەن فحێلی دەکەن.»

کارمەندی لاو گوتی: «بەڕاستی مایەی شەرم و ئابڕووچوونە ئەگەر فحێلی بکەن! وایدانێین ئەوی کوشت. باوکمان هەیە تا باوک! ئەو کاتە شێت بووبوو... ڕەنگە تەنیا دەسکاونگەکەی هەڵسووڕاندبێ پیرەپیاوەکەی دابێ بەزەویدا و جگە لەوە هیچ کارێکیتری نەکردبێ. بەڵام جێی داخە کە ناوی ئەو ئیسمیر دیاکۆفە خوێڕییەیان هێنایە گوڕێ، چونکە تەنیا شیمانەیەکی پووچ بوو! ئەگەر بەجێی فێتی یۆکۆویچ بووایەم، ڕاست و ڕەوان دەمگوت: ئەوی کوشت؛ بەڵام بێتاوانە، خۆ دنیا کاولنەدەبوو!»

ـ هەر ئەو کارەشی کرد، بەڵام نەیگوت: « خۆ دنیا کاول نەدەبوو!»

سێهەمین کەس گوتی: «نا، میخاییل سێمیۆنیچ ئەوەشی گوت.»

ـ ئاغایان، لەڕۆژانی پارێزدا ژنە ئاکتەرێکی شارەکەمان، کە مێردە تۆلازەکەی خۆی سەربڕی بوو، فحێل بوو.

ـ ئاخری کاری بڕینەکەی تەواو نەکرد.

ـ فەرق ناکا، کاری بڕینەکەی دەستپێکردبوو.

ـ بیروڕاتان سەبارەت بەومنداڵانە کە باسیکرد، چیبوو؟ مەحشەربوو، نا؟

ـ مەحشەر!

ـ هەروەها سەبارەت بە عیرفانیش!

کەسێکیتر هاواریکرد: «ئاخ، عیرفان بەتوون. لەمڕۆ بەدواوە چاو لەچارەنووسی ئیپۆلیت بکەن. ژنەکەی لە سەر میتیا سبەینێ چاوی دەردێنێ.

ـ ژنەکەی لێرەیە؟

ـ جا ئەوە قسەیە؟ ئەگەر لێرە بوایە هەر لێرە لە دادگا چاوی دەردێنا.
ددانئێشە لەماڵێ بەستوویەتەوە. هی، هی، هی!
ـ هی، هی، هی!
لە نێو گرووپێکیتردا:
ـ پێمۆایە ئاخری میتنکا فحێل دەکەن.
ئەگەر سبەینێ مەیخانەی مترۆپۆلیس ژێرەوژوور بکا، پێم سەیرنییە. هەتا دە ڕۆژ لەسەریەک دەخواتەوە!
ـ نەحلەت لەشەیتان!
ـ دەستی شەیتان لەکاردایە. بۆ شەیتان کوێ لەئێرە باشتر.
ـ ئاغایان دانی پێدادەنێم کە زۆر زمانپاراوانە قسەیکرد. سەرەڕای ئەوەش، شکاندنی سەری باوک بە دەسکاونگ کارێکی دروستنییە! ئەگەر ئاوا بڕواتە پێشێ دەزانی چیمان بەسەردێ؟
ـ عارەبانە، عارەبانەتان لەبیرە؟
ـ ئەرێ؛ خێشکی کردە عارەبانە!
ـ سبەینێش، ئەگەر بە مەسڵەحەتی بزانێ، عارەبانە دەکاتە خێشک.
ـ لەم سەردەمەدا چەندەمان مرۆڤی وریا هەیە. مەگین لەڕووسیا عەداڵەتێک هەیە کە بتوانین پێیبگەین؟
لەپڕ زەنگ لێدرا. ئەندامانی لێژنەی داوەری ڕاست لەسەعاتێکدا بەبێزیاد و کەم، ڕاوێژیان کرد. هەر لەگەڵ ئەوەی خەڵکەکە لەجێی خۆیان دانیشتنەوە، بێدەنگییەکی کڕوکپ باڵی بەسەر دادگادا کێشا. لەبیرم نییە ئەندامانی لێژنەی داوەری چۆن هاتنەوە نێو هۆڵی دادگا. وەلحاسڵ پرسیارەکان بەڕێکوپێکی دووپات ناکەمەوە، ڕاستییەکەی هەر لەبیریشم نییە. تەنیا وەڵامی یەکەم و گرینگی سەرۆکی دادگام لەبیرە: «ئایا تۆمەتبار چوو بۆدزی و بەپێی قەست و پیلانی پێشوو قەتڵەکەی کرد؟» (دەقی وشەکانیم لەبیر نییە.) بێدەنگی دیسان دادگای داگرتەوە. وتەبێژی لێژنەی داوەری، جحێڵترین کەسیان

لەوچوار میرزابنووسەی دەوڵەت، بەدەنگێکی فەسیح و بەرز بێدەنگییەکە تێکچڕژاند و ڕایگەیاند:

- بەڵێ، تاوانبارە!

هەر ئەو وەڵامەشی بۆ هەموو پرسیارێک دووپاتدەکردەوە: « بەڵێ، تاوانبارە!» ئەویش بە بێڕێزەیەک چاوپۆشی کردن. هیچکەس ئەو چاوەڕوانییەی نەبوو؛ زۆربەی خەڵکەکە پێیانوابوو میتیا فحێل دەبێ و دەبەخشرێ. بێدەنگیی هەروا بەسەر هۆڵەکەدا زاڵبوو، هەموو خەڵکەکە مات بووبوون: هەم ئەوانەی پێیان خۆشبوو مەحکووم بکرێ، هەم ئەوانەش کە بەئاواتەوە بوون وەبەر عەفوو بکەوێ، بەڵام سەرسوڕمانەکەیان تەنیا چەند ساتێکی خایاند، قرموقاڵ و ژاوەژاوێک بە دوایدا سەری هەڵدا. زۆربەی پیاوەکان شاد و ڕازیبوون. تاقمێک بێئەوەی هەوڵبدەن خۆشحاڵییەکەیان بشارنەوە لەپەستا دەستیان هەڵدەگوڵۆفی. ئەوانەش کە دژی حوکمەکەی دادگا بوون، هەموو مات بوون و دیاربوو شکستیان خواردووە. شانیان هەڵدەتەکاند و خەریکی مقۆمقۆ و سرتوخورت بوون. دەتگوت هێشتا لە مەوزووعەکە نەگەیشتوون. بەڵام چۆن باسی حاڵوباڵی ژنەکان بکەم؟ پێموابوو هەر ئێستا ئاژاوەیەک وەڕێ دەخەن. سەرەتا بڕوایان نەدەکرد. پاشان لە ناکاو ئەم پرسیارە لە دادگادا دەنگیدایەوە: «یانی چی؟ پاشان چی؟» هەموو هەستان. دەتگوت دەیانهەوێ سەبارەت بە حوکمەکە لێکۆڵینەوە ئەنجامبدەن. هەر لەو کاتەدا، میتیا لە ناکاو لەجێی خۆی هەستا و دەستی هەڵێنا، بەدەنگێکی دڵهەژێن هاواریکرد:

- بەخودا و بەڕۆژی سامناکی جەزا سوێند دەخۆم من باوکم نەکوشتووە! کاتیا، لێتخۆشدەبم! برایان، دۆستان، بەزەییتان بەحاڵی ژنێکیتردا بێتەوە!

ئیتر نەیتوانی درێژە بەقسەکانی بدا و دەستیکرد بە گریان، گریانێک کە لە هەموو لایەکی دادگاکەوە دەبیسترا، ئەویش بەدەنگێک دەگریا کە هیخۆی نەبوو، دەنگێکی تازە و سەرسوڕهێنەر کە خودا دەزانێ لەکوێوە پێیبڕابوو. لەدوورترین سووچی دادگاکەوە، لەپشت ڕیزی ژنەکانەوە، ناڵەیەکی دڵتەزێن

هەستا ـ گرووشنکا بوو. توانیبووی بەرلەدەستپێکردنی خوێندنەوەی حوکمەکەی دادگا، ئیزنی هاتنەژووریێ وەرگرێ. گریانەکەی زۆر جەرگبڕ بوو، لەوانەبوو هەمووان بگریێنێ. میتیایان برد. خوێندنەوەی دەقی حوکمەکەیان هەڵگرت بۆ ڕۆژی دوایی، ژاوەژاو و زەنازەنا هۆڵیدادگاکەی داگرتبوو. خەڵکەکە هەستابوون و دەیانویست بڕۆنە دەرێ. ئیتر ڕانەوەستام، بەڵام لە کاتی هاتنەدەرێدا لەبیرمە لە سەر پلیکانەکان گوێم لەچەند وشە بوو:

ـ سەفەرێکی بیستساڵەی لەبەرە و دەبێ لە کانگا ڕایبوێرێ!

ـ یانی حوکمەکە یەکجارییە!

ـ بەڵێ، لادێییەکانمان قورس و قایم ڕاوەستاون.

ـ میتنکای ئێمەشیان ئاوا تەفروتونا کرد!